کۆکراوەی هەمموو بەرگەکان

پرۆژەی ( ١٠٠ ) کتێبی کوردی - ٥٨

دانراوی : شەماڵ عبدالرحمن موفتی

ئامادەکردنی: عادل شاسواری

# کۆباسەکانی میحراب






# کۆباسەکانی

# میحراب

١ - ٧

دانراوی

شەماڵ عبدالرحمان موفتی

ئامادەکردنی

عادل شاسواری

١٤٢٨ ك – ٢٠٠٨ ز

- ناوی کتێب: کۆباسەکانی میحراب
- دانراوی: شەماڵ عبدالرحمن موفتی
- ئامادەکردنی: عادل شاسواری
- بەرگی (١-٧)
- دیزاین: عادل شاسواری
- ژ. سپاردن: ( ٥٥ ) ی ١٩٩٦ی دراوەتێ
- تیراژ: ( ٣٠٠٠ ) دانە
- نۆبەی چاپ : حەوتەم



## پێشەکی

زیاتر لەهەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوپێش تائێستا بەچەکێکی مەزن کە (نوێژ)ە لەگەڵ دوژمنێکی غافڵ گیرو کۆڵنەدەر کە ئەهریمەنە (شەیتان)، موسڵمان جەنگی خۆی لە (میحراب)دا رادەگەیەنێت.

لەوساتەوە کەئادەمی هەیە ئەم دوژمنەش هەیەو هەردەم لەبۆسەی گەردنبەنددایە بۆ ئەوەی بتوانێ زاڵ بێ بەسەریداو بیکاتە دۆستی خۆیو دوژمنی خوا.. بۆ ئەوەی لەخشتەی ببات و وەکو (خۆی) لە (ڕەزامەندیو بەزەیی خوا+ بەهەشت+ ئاسوودەیی) تەرکی بکات و بیکاتە هاوڕێی هەمیشەیی (ناڕەزایی و تووڕەیی خوا + دۆزەخ + نائارامی).

میحرابیش لەمزگەوتدا سەنگەری ئەم جەنگەیە لەگەڵ ئەو دوژمنە بێ پشوو سەرسەختەدا. ئەوەتا وشەی (محراب) لەسەرچاوەی (حرب)ەوە وەرگیراوە، کە (جەنگ) ئەگەیەنێت.

ئەگەر کەمێك قوڵتر ڕۆبچین لامان ڕوون دەبێتەوە کە جیاوازی هەیە لەنێوان (حرب، معرکە)دا. (حرب) وەك (جەنگ) گەورەترو مەودای فراوانترو کوشندە ترەو هۆردووی زۆرترو ئەنجامیشی لەبەرچاو ترە لە (معرکە - شەڕ) کە ئەمیان زیاتر ناوخۆیی یان شەڕی ئیقلیمی دەگرێتەوەو بەکەم نەفەس ترو بچوکترو کەم زیانتر دەخەملێنرێت لەچاو جەنگدا وەك جەنگی جیهانی یەکەم یان دووەم.. جا بۆیە شوێنگای جەنگ لەگەڵ شەیتاندا بە (میحراب) هاتووە:

خودی ئەو جەنگە گەورەیەو ئالیەتەکانیشی بەنرخن چونکە ئیش لەسەر بەبەهاترین ئەندامی مرۆڤ دەکەن کە (دڵ)ە.. ئیتر (نوێژکردن) بێت یا (وتاردان) و (کۆڕبەستن) بێت بۆ چەمکە ئیسلامیەکان و ڕوونکردنەوەیان.

ئەو دوژمنەی کەڕووبەڕووی دەبینەوە (شەیتان)ە، نابێ لەکەمتەرخەمی یەوە بەبچوك سەیر بکرێت" چونکە:

لەسەرەتادا (شەیتان) لەبەر زۆری پەرستش و عیبادەتی بۆ خوای گەورە خراوەتە ڕیزی فریشتەوە.. کەچی لەبەر (کبر) و خۆ بەگەورە زانینی و یاخی بوونی لەفەرمانی خوا (جل جلالە) لەڕەحمی خوا دەرکراوە.

بەم پێیەبێ شەیتان (مرتد)و هەڵگەڕاوەیە لەڕێبازی خوا نەك هەر بێ باوەڕو (ملحد) بووبێ. چونکە جیاوازی (مرتد و ملحد) ئەوەیە کەیەکەمیان گورزی کوشندەترە بۆ موسڵمان چونکە نهێنی و ڕازی ئایینی خوایی لەلا ڕوونە بەڵام بە (فەرمانی خوا) هەڵس و کەوت ناکات، بۆیە زیانی بۆ موسڵمان زیاترە لە (ملحد)، چونکە ئەشێت ئەم هیچ لەئایینی خوا نەزانێ و لەنەزانی و نەشارەزایی یەوە کافر بێت بەڕێبازی خوا.

شەیتان بەتەمەنترین هەڵگەڕاوەی ئایینی خوایە لەژیانداو زۆرترین شارەزایی هەیە لەتەمەنی پێغەمبەران و پەیامداران و صاڵحان و..هتد، چەندەها گوناهی بەپیاو چاکان و موسڵمانانی ڕێگای خوا کردووە، بەکورتی ئەگەر زیرەکیش نەبێ هێندە ئەزموونی گەلاڵە کردووە، بتوانێ موسڵمانی نامخلص هەڵبخەڵەتێنێ و موسڵمانی مخلصیش هەرگیز لێ ی ئەمین نەبێت.

لێرەوە دەگەینە ئەوەی: چۆڵکردنی سەنگەری جەنگ (میحراب) لەبەرامبەری شەیتاندا گەورەترین مەترسی دۆڕاندنی جەنگە... یان کەم بوونەوەی هۆردووی

  


باوەڕداران لەدەرەوەی ئیمامی میحراب دیسان ئەگەری نوشوستی جەنگی جەماعی لەگەڵ شەیتاندا نزیك دەكاتەوە.

ئەو میحرابە پیرۆزەی پێغەمبەری خوا (د.خ) كە مامۆستا (شەماڵ موفتی) ئەو وتارە بەپێزو بەبرشتانەی تیا پێشكەش دەكات هەمان ئەو ململانێ و ڕووبەڕووبونەوە نیشاندەدات.

ئەو (میحراب)ەی كەلەماوەی چەند ساڵی تەمەنیداو لەو مزگەوتە هێلان ئاسایەی فیكرو زانست و پەروەردەدا توانی دەنگی ئەو هەق و ڕاستی یە بەنەرمی و سەمفۆنیا ئاسا بەشنەو نەشئەیەكی خۆش سازانە بگەیەنێتە گوێ ی دڵی چەندان كەسی رۆشنبیرو دەستەبژێر (نوخبە) و جەماوەری زانستمەندی ئەم كوردستانە بێ نازەمان...

كە هەر ئەو جەماوەرە بەرفراوانە هۆشیار و تامەزرۆیەش هانی ئێمەی دا بۆ كۆكردنەوەو نووسینەوەی كاسێتی بەرنامەكان، بۆ ئەوەی هەرچی زیاتر بەرگری مانەوەی پێ ببەخشرێت و ئەو هۆگرە بەرێزانەیش زیاتر بەهرەمەند بكات لەئەڵقەكانی كەبەیەكجار گوێ لێ بوون تاسەیان لێی ناشكێت، بەهیوای ئەوەی كەهەر كەس لەم پرۆژەیەدا دەستی هەبووە لەدانانی لاقیتەیەك بۆ بەرنامەكە، وێنە گرتنی، گواستنەوەی، ئامادەبوون و كۆڕگەرم كردنی، بینین و بیستن و،خوێندنەوەی... هتد خوای گەورە هەمووان ببەخشێت.

لەئەمڕۆی ژیانی پێشكەوتنی تەكنۆلۆژیو پەیڤینی ژیارەكان و تۆڕی ئەنتەرنێت و بەكاربردنی ڕێژەیەكی زۆری هاردی كۆمپیوتەر بۆ یاریدەدان و جێبەجێ كردنی ئەقڵی مرۆڤی سەددەی ٢١ و پەخش و بلاوكردنەوەی سەدان كەناڵی ئاسمانی دەنگ و ڕەنگ و هەزاران ڕۆژنامەو گۆڤاری هەمەڕەنگی فرەدەنگی زۆر بواری دنیای ڕۆژنامەگەری وای كردووە گەردەلوولی بەتەوژمی مەعریفی و كلتوری و ئیعلامی

سەرنجی دیدەکان بۆ لای خۆی بچنێتەوەو رامانەکانی فیکر بـۆ لای خـۆی گـاز بکـاو تواناکانی نووسین و تەعبیر لەسەر تەوژمی خۆی ئاراستەو سەرقاڵ بکات.

لەئـەمڕۆدا جیـا لەهـەموو قۆناغـە رابردووەکـانی مێـژوو، مرۆڤـی رۆشـنبیر دەکەوێتە ناو تەونێکی رۆشنبیری واوە کە راگەیاندنی زاڵی هاوچـەرخ ئەیـچەرخێنیٚو بەئاستەم ئەتوانێت لـە کەرەسـتەو فاکتـەرە تەکنۆلۆژیـەکان سـوودمەند ببێـت و لـە ماددەو بابەتە زیـان بەخـشەکان پارێزراوبێـت... بەواتایـەکی تـر ئـەبێت موسـڵمانی رۆشنبیری ئەمڕۆ لەناو تەونی رۆشنبیریو فیکری بەچەندەها تـەوژمی جیـاوازو هـزرو مەبەستی پێشینە چنراوی هاوچەرخدا بتوانێ بـەدوای (شوناسـی ئیـسلامی سـەردەمی ئاشتی)دا بگەڕێو لەناو ئەم تان و پۆی جەنجاڵی و بوخارەدا بیدۆزێتەوەو چـاوێك بـۆ مێژوو هەڵخاو لەنێو ئەو هەموو فەتح و غەزاو قیتال و عەقدوو عەهـد صـولح و فـەزا جـەنگ ئامێزانـەی سـەردەمی گەشـەکردنی ئیـسلام و گەیانـدنی بـە وولاتـانی دەرو دراوسێ سەردەمە بەراییەکانی تـرازان لـە شـوراو هـەوڵ بـۆ کۆکردنـەوەی شـارای ماددیو وەرچەرخانی خەلافەت بۆ شانشینی ئەمەوی و عەباسی و عوسمـانی و تێکـەڵ بوونی ستەم و ئازادیو ئیجتهادو ئیـشتهار یـەك دەنگـی و بێـدەنگی و پـەیامی خـواو پەیامی هەواو.. هتد دروست کردنی ئاشوب لەبری فەتح و غەزاو جـەنگ لـەپێناوی بەرژەوەندی شوێنی جەنگ لەپێناوی رەزامەندی خوای گرتەوەو بوخارێك لـە حـوزن و حەسرەت دروست بوو کە ئاسان ئاشتی پەیامی خوای تیا ناناسرێتەوە... ئایا پەیامی خوای گەورە بۆ ساتەوەختی ئاشتی چی پێیە؟ بۆ بوژاندنەوەی پەیڤین و شارستانیەت و مەدەنیەت چ پرۆژەیەك لـە گەنجینـەی ئیـسلامدایە؟ ئایـا بـەدەر لـە مـەرگ دۆسـتی لەپێناوی گەیاندن و بەرزکردنەوەی ئایینی خوا جێ شوێنێك هەیـە بـۆ ووچـان دان و سەکۆیەك هەیە بۆ دەربڕینی ڕای ئازادو ماوەیەك هەیە بۆ پرۆژەی زانستی و پێشکەش

کردنی شۆڕشێك بۆ پێشخستنی بواری شارستانی و مەدەنی کۆمەڵگەی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی؟

بەبێ موجامەلە ئایا تاچەند باسەکانی زانست لەناو کۆباسەکانی ئایینی ئیسلامدا جێ بەخۆیان دەگرن و پێکەوە هەڵئەکەن؟ ئایا زانست و ئایین پێکەوە تەبان یان ئایین خۆی بەزانست دا هەڵئەواسێ لەپێناوی ئەوەی تەمەنێك بۆ خۆی زیاد بکات و ماوەیەکی تریش درێژە بەژیان بدات؟ بە واتایەکی تر ئایا ئەم پەیوەندیەی نێوان ئایینی ئیسلام و زانست تاکتیکە یان حەقیقەت؟ ئایا موسڵمانانی ئەمڕۆی گۆڕەپانی پێشبڕکێی ژیارەکان و سەردەمی جیهانگەرایی و دواترۆپکی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بواری ماددی ئەتوانن وەڵامی ئەو پرسیارانە بە بەڵێ و بەڵگەکانیان بە مەلوسی پیشان بدەن و چەند باسکارێك پێشکەش بە تریبۆنەکانی بینین و بیستن و خوێندن بکەن و چەند باسێك لەم بوارەدا بخەنە ڕوو کە هێندە گیانی بەهێزیان تیادابێت بەرگەی پرسیارەکانی ئەم نەوەیە بگرن؟ لەبەر گومانەکاندا نەلەرزن؟ لەژێر مایکرۆسکۆپی تاقیگەکاندا دەرچن...؟ پرسیارەکان لەناو مەنزوومەیەکی هاوچەرخدا جەیان دێت، زۆر بواری ئیسلام بۆ جارێکی تر خراوەتەوە بەر تیرۆژی پرسیارو دڕندۆنگی و گومان.. ئایا پەروەدەی ئیسلام بۆ نەوەی ئەمڕۆ هەمان پەروەردە ئەسپارتیەکەیە کە ئەیەوێت دواجار ئەو کەسە سەربازێکی گوێ ڕایەڵ و عاقڵ بێت و هیچ پێویستی بە بەکاربردنی لێکدانەوەکانی خۆی نەبێت؟. یاخود ئەتوانێت بۆ ئەمڕۆیەکی دنیای ئازادی مرۆڤێکی وا پەروەردە بکات ئەسینیانە دەرچێت و بتوانێ لە شتەکاندا رای هەبێو ئازادانە بڕیار بدات و توانای بیریو زهنی خۆی بەکارببات و لێی تەوق نەبێت؟! ئەمەو چەندەها پرسیاری تر جەستەی مەعریفی ئیسلامی بوونی ئەمڕۆ توێ توێ ئەکەن و بەدوای وەڵامی تینوشکێنی نەوەی ئەمڕۆدا ئەگەڕێن و ئەپرسن ئایا ئیسلامی ئەمڕۆ هەر

موجەللەداتی کتێبی (فیقە) لە بواری چۆنیەتی نوێـژو ڕۆژو حـەج و زەکـات ئەخاتـە بازاڕەوە (کە ئەوانە کەم نین و مەبەست بێ بەهابوونیان نیە) یـان ئـەتوانێت بەرنامـەو کتێب لـە بوارەکانی سایکۆلۆژیو حاڵەتە دەروونییە هەژێنراوەکانی ئـەمڕۆی جـەنجاڵ بخاتە بەر دیدەی گەنجان و ڕۆشنبیرانەوە؟، ئایا ئیسلامی ئەمڕۆ ئـەتوانێت بەشـێوەیەکی تر باس لە هەڵسوکەوت و پەیوەندی نێوان کـوڕان و کـچان بکـات؟ یـا قـسەکردن لەسەر ئەو بوارە تەنها لـە یەك دوو فەرموودەی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم چـڕ دەبێتەوە کە ئەوە شوێنی گومانەو دەبێ مرۆڤـی موسـڵمان خـۆی لێ بپارێزێـت.. ئایـا ئیسلامی ئەمڕۆ ئەتوانێ باس لـە ئاشتییەکی گەورە بکات لەسایەی دەسەڵاتی ئیـسلامی دا کە هەردووك پێکەوە عیلمانییەك و ئیسلامیەك خاوەن ماف و ئەرکی یەکسان بـن؟ بەڵام نەك تەنها باسێکی تیۆری بەڵکو بە پراکتیکی نموونەیەکی ئاوا پێشکەشی جیهـان بکات؟ ئایـا لـەبواری کۆمەڵایەتیـدا ئیـسلامی ئـەمڕۆ ئـەتوانێ وەڵامـی پرسـیارەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵگا بداتەوە یان بەجۆرێ لە جۆرەکانی سنوور کێشان لە چوارچـێوە دەنرێو بێ دەنگی جێگای یەك دەنگـی ئەگرێتـەوە؟ ئەمانـەو چـەندەها پرسـیاری تـر مێروله بە بیرو مێشکی ئەمڕۆی نەوەی نوێ ئەکەن و گەنجانێکی کردووەتە گەڕیـدەو موسافیری وڵاتی فیکرو مەعریفەی تینوشکێن و بەهیوای وەڵامـی پرسـیاری (ئیـسلام لەسایەی ئاشتی)دان، ئایا تا چەند مرۆڤ ئەتوانێ لەسایەی ئیـسلامدا بـۆ مـەرگ بـژی ئەتوانێ ئەوەندەش هێمن و ئارام بەدوای خەونەکانی بکەوێو هیواو ئاواتەکانی بێنێتـە دی؟

لەم ڕووانەوە باسکاری بەڕێز مامۆستا شەماڵ موفتی دەکۆشێ بەو نەفەسە نوێیـەو بـەو هەناسە قوڵە شارستانی و هاوچەرخەوە بۆ ئـەمڕۆ کۆباسـەکانی میحـراب لەچـەندین باسی ووردو هێمندا نەخش بکاو لە سێ تەوەرەی گشتیدا کۆیـان بکاتـەوەو وەڵامـی

**چمکێك لـە پرسـیارەکانی ڕۆژ بداتـەوە.. سـێ تـەوەرە.. سـێ گرێژنـە تـان و پـۆی باسەکانی ئەم کۆباسانە دەچن:**

**تەوەرەی زانستی / کە خۆی لە ئیعجازی زانسـتی لـە قورئـان و سـوننەت و تیـشك هاوێشتنە سەر باس و لێکۆڵینـەوەی زانـستمەندان لـە دکتـۆر و پـسپۆڕەکانی بـوارە جیاوازەکانی زانست دا دەبینێتەوەو گەشتێکی تێژتێپەڕو ئاکام بەخشە بـۆ ئـەو بـاس و خواستانە.**

**تەوەرەی پەروەردەیی / کە لە دەروازەی بابەتی دەروونی و ڕەوشتی و ئاکاری و ئایینە پاکیزەکان ئەدات و لەوێوە بۆ چاکسازی باری دەروونی و ئاکـاری گـەنجان و لاوان دەکۆشـێو پـشت بـە ڕاڤـەو شـیکردنەوەی ئایەتـەکان و فـەرموودەکان دەبەسـتێو وەرردەگرێو حیکمەتی پێشینەو پاشینەیان لێ ئەخاتە بەر تیرۆژی لێکدانەوەوە.**

**تەوەرەی کۆمەڵایەتی/ ئەو پرسیارانەی کە ڕەخنەئامێزن بۆ جەستەی کۆمـەڵ و هـەوڵ ئەدەن کۆمەڵ بەرەو ئاستێك ئاراستە بکەن ئەمڕۆی لە دوێنێ و سپێدەی لە هەنووکـە باشترو پێشکەوتوو تر بێ ئەورووژێنێو نەرم و هێمن ئەنگوست ئاماژە بەچەندین دەردی کۆمەڵایەتی و جەستەی بونیادی کۆمەڵ ئەکات و کۆمەڵگە لە هەر ئەگەرێك ئاگادرا ئەکاتەوە کە زام لە کەشتی سەفەری پێـشکەوتن و شارسـتانیەتدا دروسـت بکـات و ئازار بە باڵی هاوچەرخ و ژیان دۆستی و ئاشتی ویستی و ئایین پەروەری بگەیەنێت.**

**ئەم سێ خاڵە سەرەکیە سێ گرێژنەی جددین کە پرسی چـمکێك لـە نـەوەی ئـەمڕۆ هەڵگریەتی... هەر لـەو ڕووەشەوە بۆ خزمەت کردن بە هەرچی مانەوەی زیاتری ئەم کۆباسە هاوچەرخانەی مامۆستا ئێمەش دەست لە دەست و قوەت لە خوا قۆڵمـان لێ هـەڵماڵی و کەوتینـە نووسـینەوەو داڕشـتنەوەو تـەرقیمی ئایەتـەکان و تـەخریجی فەرموودەکان و لـەم کارەشماندا چەندین خوشك و برای بەڕێز هاوکاریان کردووین تا**




ئەم کارەمان بەئەنجام گەیاندووە، کە ئەکاتە "٥١" باسی نێو کۆباسەکانی میحراب و لە رابردوودا بەحەوت بەرگ چاپ و بلاوکراوەتەوە ئەمەی بەردەستت کۆکراوەی ئەو حەوت بەرگەی رابردووە بە ئومێدی ئەوەی کە بتوانین بەرگی تری لێ ئامادە بکەین. .

لەئاکامدا نزایەکی خێریش بکە بۆ هەرکەسێك کە رۆلی هەبووە لەگەیاندنی ئەم کۆباسانە بۆ بەردیدەی بەرێزت. . بەتایبەت مامۆستا شەماڵی ئازیز و منی بەندەی موحتاجی دوعا. . لەکۆتاییشدا داواکارین خوای گەورە لەهەموومانی قبول بکات و پاداشتی بە ئیمزای لێخۆشبوونمان بداتەوە.

ئەگەر هەر رەخنەو پێشنیارێکیش کە خزمەت بەزیاتر دەولەمەندکردنی ئەم پرۆژەیە بکات کەرەم بفەرموون، لەئەرکی ماندووبونتان سوپاس دەکەین... لەکۆتاییدا لەخوای میهرەبان دەخوازین ئێمەو ئێوەش نگرۆی بەزەیی و رەحمی بێ پایانی خۆی بکات و بەنووری دیداری خۆی شەرەفیابمان بکات و لە فیردەوسدا گرۆمان کات. .

سەرکەوتنیش هەر لەخواوەیە.

وأخر و دعوانا ان الحمد لله رب العالمین

**عادل شاسواری**

adilshaswary٢٠٠٠@yahoo.com

٢٠٠٨ / ٤ / ٢٧

# پێشەکی دانەر

الحمد لله... ربی اجعلني أعمل صالحاً ترضاه، وأدخلني برحمتك في عبادك الصالحين.. اللهم إجعل عملي هذا خالصاً لوجهك الكريم... اللهم آمين.

لەراپەڕین و بزاوتی هەر نەتەوەیەکدا، هێندەی ئاکام و هەنگاوە پتەوو تۆکمەکانی دوای بزاوتەکە گرنگە... هێندە خودی بزاوتەکە گرنگ نیە.

هەمووان بڕوایان وایە: کە (هوشیاری) هەناسەی ڕاپەڕین و بزاوتەکانە...

منیش لەم کۆباسانەمدا کۆشاوم بۆ ئەوەی هۆشیاری بەرامبەر بەخوا زیاد بکەم و لەم کارەشمدا تەنها مەبەستم خوایە...

ئەمیش تاوەکو ئەم هۆشیاری یە ببێتە هۆی ئەوەی کەهەموو زاناو تێکۆشەرێك شوێنی خۆی بگرێ... جا ئەو کاتە قەڵەم و ڕمەکان هەریەکەیان بەزمانی خۆیان دێنە گۆ... پێکرا دەکەونە پەیڤین... جا ئەو کاتە ئەم میللەتە لاپەڕەیەکی نوێی نەمری تۆمار بکات، پاش خەوو بێ ئاگاییەکی قوڵ.

تائەو کاتەش:

ئەم پریاسکەی شتوومەکانەم

ئەم بینایی چاوانەم

ئەم کرشەی ڕۆشنبیریەم

ئەم شارای تەمەنەم

ئەم کۆباسانەی میحراب، بەو پەڕی ئەمانو وەفاو خۆشەویستییەوە، پێشکەش بەبەهاری دڵانی بڕوادار. سابەشکم ببێتە ڕۆشنکەرەوەی ڕێگەی هەموو ئەوانەی بەتونێلی ژیاندا ڕەت ئەبن. بەئومێدی ئەوەی خوێنەرانی، بێبەشمان نەکەن لەپاڕانەوەیەکی ئاورنگ ئاسای بەرەبەیان، تا گیانمان لای پەروەردگاری باڵا شادو سرور بێت.

پاشان، پێویستە: سپاردەی زانستی بۆ هەموو وتەیەك، بگێڕڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، یا بەلای کەم بانگەشەی خاوەنداریتی نەکرێ.. هەربۆیە خوێنەری بەڕێز ئاگادار ئەکەمەوە:

زۆری ئەو شتانەی لەکۆباسەکانمدا (المحاضرات) پشتم پێ بەستوون چەندین کتێب و کاسێتی دەنگی جۆراو جۆر بوون کە برایانی دڵسۆز لەچەند لایەکەوە بۆیان ڕەوانە کردووم، جگە لەکاسێتی ڤیدیۆی ڕەنگی تۆمار کراوی کەناڵە ئاسمانیەکان کەبراکانم لەتەلەفزیۆنی یەکگرتوو بۆیان تۆمار کردووم.

خوا پاداشتی هەموو ئەوانە بداتەوە کەبەشداریان کردووە لەفێربونم دا ئەوانەشی بەشداربوون لەگەیاندنی ئەو زانیاریانەی کە خوای گەورە فێری کردووم و گەیشتوونەتە بینەران و بیسەران و خوێنەران و هۆگران.

جزاهم الله عنا كل خير في الدنيا والآخرة وصلى الله على معلمنا الخير وأسوتنا الحسنة سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

شەماڵ موفتی

٢٨ / رەمەزان / ١٤١٨

## باسی یەکەم

## دادپەروەری

دادپەروەری کاتێك نەمێنێت، ستەم دێتە شوێنی، ان الله یأمر بالعدل و الإحسان لەم پێناوەدا خوای گەورە ستەمی حەرام کردووە.. (یا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي و جعلته محرما بينكم فلا تظالموا)[1] لەم فەرموودە (قدسی)یەدا خوای گەورە فەرموویەتی: بەندەکانم.. من ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردووە و لە نێوان ئێوەشدا بە حەرامم داناوە ستەم لەیەك بکەن.

---

[1] - ١٦٧٩٤٢عن النبي صلى الله عليه وسلم ، فيما روى عن الله تبارك وتعالى أنه قال " يا عبادي ! إني حرمت الظلم على نفسي وجعلته بينكم محرما . فلا تظالموا . يا عبادي ! كلكم ضال إلا من هديته . فاستهدوني أهدكم . يا عبادي ! كلكم جائع إلا من أطعمته . فاستطعموني أطعمكم . يا عبادي ! كلكم عار إلا من كسوته . فاستكسوني أكسكم . يا عبادي ! إنكم تخطئون بالليل والنهار ، وأنا أغفر الذنوب جميعا . فاستغفروني أغفر لكم . يا عبادي ! إنكم لن تبلغوا ضري فتضروني . ولن تبلغوا نفعي فتنفعوني . يا عبادي ! لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم . كانوا على أتقى قلب رجل واحد منكم . ما زاد ذلك في ملكي شيئا . يا عبادي ! لو أن أولكم وآخركم . وإنسكم وجنكم . كانوا على أفجر قلب رجل واحد . ما نقص ذلك من ملكي شيئا . يا عبادي ! لو أن أولكم وآخركم . وإنسكم وجنكم . قاموا في صعيد واحد فسألوني . فأعطيت كل إنسان مسألته . ما نقص ذلك مما عندي إلا كما ينقص المخيط إذا أدخل البحر . يا عبادي ! إنما هي أعمالكم أحصيها لكم . ثم أوفيكم إياها . فمن وجد خيرا فليحمد الله . ومن وجد غير ذلك فلا يلومن إلا نفسه . " وفي رواية " : إني حرمت على نفسي الظلم وعلى عبادي . فلا تظالموا . " الراوي :أبو ذر الغفاري - خلاصة الدرجة :صحيح - المحدث :مسلم - المصدر :المسند الصحيح - الصفحة أو الرقم ٢٥٧٧ :

چەمکی دادپەروەری لە ئیسلامدا زۆر فراوان وبەرینە و هەموو بوارێك دەگرێتەوە، دادپەروەری لە ئیسلامدا تەنها بە میللەتێك یاخود توێژەرێکەوە نەبەستراوەتەوە.. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

(كُلاًّ نُّمِدُّ هَـٰٓؤُلَآءِ وَهَـٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ ﴿٢٠﴾) الإسراء /٢٠.

پێشتر ئاماژەمان بەوە کردوە کە مرۆڤایەتی دوو کۆمەڵگایە، کۆمەڵگایەك رەزامەندن بە شەریعەتی خوای گەورە، کە پێی دەوترێ کۆمەڵگای ئیمان، وە کۆمەڵگای دووەم ئەو کۆمەڵگایەیە کە رەزامەند نین بە شەریعەتی خوای گەورە، پێی دەوترێ (کۆمەڵگەی کوفر).

هەریەك لەم دوو کۆمەڵگەیە، خوای گەورە بەشیان ئەدات و دەفەرموێ:

( وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾) الإسراء/ ٢٠

واتە: بەخشینی من حەرام نەکراوە لەسەر کەس.. خوای گەورە یاسای داناوە بۆ رووەك بۆ ئەمام، کە پێویستی بە پلەیەکی گەرمی دیاریکراو و رادەیەکی دیاریکراو لە شێ هەیە.. بە هەمان شێوەش بۆ پێویستییەکانی تری گەشە کردنی رووەك لە ئاو و، تیشکی خۆر.. گەر ئەمانە لەهەر شوێنێك هاتنە دی، ئەوا ئەو ئەمامە گەشە دەکات، بەبێ گوێدان بەوەی کە ئەو زەوییە، زەوی (کوفر)ـە، یاخود زەوی (ئیمان)ـە، ئەمانە بەلای خوای گەورەوە گرنگ نین، (ولا يجرمنكم شنآن قوم على أن لاتعدلوا إعدلوا هو أقرب للتقوى) هەرچەندە بەرامبەرەکەشت ستەمی کرد، تۆ ستەم نەکەیت و هەمیشە دادپەروەر بە.. لە یەکێك لە فەرموودە

قودسیەکاندا خوای گەورە دەفەرموێت (وعزتي وجلالي لأنصرنك ولو بعد حين)[٢]

لەم فەرموودەیەدا خوای گەورە بە ستەم لێکراو (مظلوم) دەڵێت: سوێند بە عزەت و جەلالی خۆم سەرت ئەخەم یا دوای ماوەیەکیش بێت... ئیتر ئەو کەسە ستەم لێکراوە خاوەنی هەر دینێك بێت، لەبەرئەوەی مرۆڤە و زوڵمی لێکراوە، دادپەروەریی خوای گەورە وا پێویست دەکات کە یارمەتی بدات و پشتگیری لێ بکات.. پێغەمبەری خوا (د.خ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت (إتقوا دعوة المظلوم، فإنه ليس بينها وبين الله حجاب، ويفتح لها أبواب السماء ويقول لها وعزتي وجلالي لأنصرنك و لو بعد حين)، واتا خۆتان بپارێزن لە نزا و پاڕانەوەی ستەم لێکراو، چونکە نزا و سکاڵای ستەم لێکراو (مظلوم) قبوڵە و رەت ناکرێتەوە.. ئیتر ئەو کەسە ستەم لێکراوە لێرەدا دیار نەکراوە کە ئیمان دارە یاخود نییە، مادام مرۆڤە نابێت ستەمی لێ بکرێت.

---

٢ - ٥٢٠٩٧ثلاثة لا ترد دعوتهم : الصائم حتى يفطر ، والإمام العادل ودعوة المظلوم ، يرفعها الله فوق الغمام ، وتفتح لها أبواب السماء ويقول الرب : وعزتي وجلالي لأنصرنك ولو بعد حين الراوي :أبو هريرة - خلاصة الدرجة :ضعيف - المحدث :الألباني - المصدر :ضعيف الترغيب - الصفحة أو الرقم ٥٨٣

– ١٩٦٣٦٤ ثلاثة لا ترد دعوتهم الصائم حين يفطر والإمام العادل ودعوة المظلوم يرفعها الله فوق الغمام وتفتح لها أبواب السماء ويقول الرب وعزتي وجلالي لأنصرنك ولو بعد حين الراوي :أبو هريرة - خلاصة الدرجة] :إسناده صحيح أو حسن أو ما قاربهما - [المحدث : المنذري - المصدر :الترغيب والترهيب - الصفحة أو الرقم ٢/١١١







دادپەروەری مەسەلەیەکی باوەڕ و عەقیدەیە لای ئێمەی موسڵمان خوای گەورە فەرمانمان پێ دەکات بە دادپەروەریی و دەفەرموێت (إن الله يأمر بالعدل و الإحسان...) تەنانەت لە گفتوگۆشدا فەرمانی داوە بە دادپەروەریی و دەفەرموێت (وإذا قلتم فاعدلوا..) لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (د.خ) هاتووە (بئس مطية الرجل زعموا)[٣] لەوە خراپتر نییە کە مرۆڤ قسە بکات و بڵێت وایان وت، ئەمە زۆر گوناهە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت (يأيها الذين آمنوا إن جاءكم فاسق بنبأ فتبينوا...) نەك هەر کەسێك هات و قسەیەکی بۆ کردی، راستەوخۆ قسەکەی بلاًو بکەیتەوە، بزانە ئەو کەسەی کە خەبەرەکەت بۆ دەهێنێت کێیە؟ وە بەڵگەی راستی قسەکەی چییە؟ ئیتر ئەو هەواڵدەرە، کەسێکە، یاخود دەستگایەکی راگەیاندنە.. نابێت هەرچییەکت بیست بلاًوی بکەیتەوە، بۆئەوەی لەم نێوەندەدا ستەم و ناحەقی دروست نەبێت و راگەیاندنی ستەمکار دروست نەبێت.

دادپەروەری لە تاکە کەسدا:-

دادپەروەریی دەچوێنم بە سەقفێك، سەقفێکی مەعنەویی کە لەسەر تاکە کەسە، لەسەر خێزانە، لەسەر کۆمەڵگایە، لەسەر حکومەتە... کە بنەماکانی سەقفی دادپەروەری نەما، ئەوکات ئەو سەقفە مەعنەوییە دەڕوخێت وستەم جێی دەگرێتەوە، بەرنامەیەکی داوینەتێ، کە قورئانی پیرۆزە.. نەخشەی بۆ چۆنیەتی جێبەجێ کردنی هەموو جۆرە غەریزەکان کێشاوە، بۆئەوەی لە دادپەروەرییەکەدا بمێنێتەوە...

---

٣ - ١٠٨١٥٩ بئس مطية الرجل زعموا
الراوي :أبو قلابة عبدالله بن زيد الجرمي - خلاصة الدرجة :صحيح - المحدث : الألباني - المصدر :صحيح أبي داود - الصفحة أو الرقم ٤٩٧٢

(وكذلك جعلناكم أمه وسطا لتكونوا شهداء على الناس) راڤەكەرانی قورئـانی پیرۆز (المفسرون) سـەبارەت بـە راڤـەی (وسـط) دەفـەرموون: عـادل، دادپـەروەر، واتـە: میللەتێکی دادپەروەر بن، هەمیشە راستی (الحق) بڵێن، با خۆشتان بەو راستیە زەرەر مەنـد بـبن.. لـەو غەریزانـەی کـە خـوای گـەورە مرۆڤـی پـێ بەهرەمەنـد کردووە، بۆ نموونە غەریزەی (سێکس) کە لـە ژن و پیـاودا هەیـە... خـوای گـەورە نەخشەی کێشاوە بۆ چۆنیەتی جێبەجێ کردنی، کە ئەویش لـە رێگـەی شـووکردن و ژن هێنانـەوە (إفراط و تفريط) واتـە زیـادە ڕەوی و کـەم ڕەوی دەتخاتـە بازنـەی ستەمەوە.. بتـەوێت ئـەم غەریزەیـە جێبـەجێ بکـەیت لـە رێگەیـەکی جگـە لـەم رێگەیە، ئـەوا دەچیتە نـاو بازنـەی ستەمەوە و دەچیتە نـاو ناموسی خەڵکیـەوە، بتەوێت نەیشی کەیت، ئەوا دەچیتە ژیانی گۆشەگیرییەوە، کە ئەویش هەر ستەمە و لە ئاینی ئێمەدا ئەو شتە نییە. (ورهبانية إبتعدوها ما كتبنها عليهم).

یـەکێکی تـر لـە غـەریزەکان، غـەریزەی برسـێتییە، یـاخود بڵـێین حـەزکردن لـە خـواردن و خواردنـەوە... هەسـتی برسـێتی لـە مرۆڤـدا هەیـە و پـاڵ بـە مرۆڤـەوە دەنێت کە بچێت نان بخوات.. ئەویش لە قورئانـدا نەخـشەی بـۆ کێـشراوە و خـوای گەورە دەفەرموێت (وكولوا وأشربوا ولاتسرفوا...) واتە بخۆن و بخۆنەوە لە خواردن و خواردنەوەی حەڵاڵ، بەڵام ئیسرافی تیا نەبێت.

پیاو چاکێك باوکی لە ژیاندا مابوو.. وتی کوڕی خۆم ئەمـشەو نەنوسـتم، هێنـدەم خواردبوو شەوێ تووشی (الامتلاء) بوو بـوم و هەناسـەم بـە ئاسـانی بـۆ نەئـەدرا... پیاو چاکەکە بە باوکی وت، باوکە خـوا رەحمـی کـرد کـە نـەمردی، چونکە ئەگـەر بمردیتایە نوێژم لەسەر نەدەکردی، وەك خۆکوژ (منتحـر) حـسابت بـۆ دەکـرا کـە خۆتت کوشتووە! پێغەمبەری خوا (د.خ) دەفەرموێت (ماملأ ابن ادم وعاءا شرا مـن بطنه. بحسب ابن ادم لقيمان يقمن صلبه فإذا كـان لامحالـة فـاعلا فثلث لطعامـه و

ثلث لشرابه و ثلث لنفسه).پێشەوایان ترمذي و ئیبن و ماجە و ئیبن و حبان لە صحیحەکەیاندا گێڕاویانەتەوە.

ئەم جەستەیەی ئێمە پێویستی بەپلەی گەرمی هەیە (کالوری) ئەو هێندە بخۆ کە لەشت دەبات بەڕێوە.. کاتێك دەخۆیت گەدەت بکە بە سێ بەشەوە بەشێکی بۆ خواردن، بەشێکی بۆ خواردنەوە.. بەشێکی بە بەتاڵی بهێڵەرەوە.

یەکێکی تر لە غەریزەکان کە خوای گەورە مرۆڤەکانی پێ بەهرەمەند کردووە، غەریزەی ئازایەتی لە هەڵوێست. سیفەتێکی مرۆڤی زۆر بەرزە.. سەرچاوەیەکە بۆ زۆر خوڕەوشتی جوان، ئەمەش کە لە بازنەی دادپەروەریی دەرچوو زیادەڕەوی و کەمرەوی تێدەکەوێت، دەکەوێتە بازنەی ستەمەوە، ئەو ئازایەتییە کە زۆر دەبێت دەبێتە دەست درێژی کردن (تهور)، دەبێتە فاکتەرێك بۆ پێشێل کردنی مافی خەڵکان... کاتێکی کەم دەبێتەوە و (تفریط)ی تێ ئەکەوێت، دەبێتە ترسنۆکی و زەلیلی، بۆیە خوای گەورە داوامان لێدەکات کە لە (وسطیة)دا بمێنینەوە و ئەو ئازایەتییە لە بازنەی دادپەروەریدا بمێنێتەوە.

سیفەتی بەخشین (انفاق)، خوای گەورە دەیەوێت هەموو موسڵمانێك فێری ئەوە ببێت، بەشێك لەکاتی خۆی بداتە کۆمەڵگاکەی، بەهەمان شێوە بەشێك لە زانیاری و عیلمەکەی بەشێك لە پارەکەی بەشێك لە رەنجی خۆی..

خوای گەورە مرۆڤ فێر دەکات بۆئەوەی کەسێکی بەخشندە دەربچێت، بەڵام ئەگەر ئەم سیفەتە زیادەڕەوی تێکەوت، دەچێتە بازنەی ستەمەوە و دەبێتە (اسراف) دەبێتە (تبذیر): (إن المبذرین کانوا إخوان الشیاطین...) کە دەچێتە ئەو رادەیەی، کە ئەو پارەیەی سەرفی دەکەیت، لەسەر حسابی خێزانەکەت و، لەسەر حسبی داهاتووە، خوای گەورە ئەمەی پێ خۆش نییە، لەهەمان کاتدا کاتێك سەرف کردن کە کەمڕەوی تیا کرا واتە: کاتێك ئەو پارەیە دەگیرێ و نادرێت بە

کەس لەو کاتەدا ئەو مرۆڤەی بەم چەشنە بێت، دەبێتە مرۆڤێکی ڕژد، واتە ڕەزیل ئەو کەسانەی چروك و ڕژدبن بە هیچ جۆرێك بۆنی بەهەشت ناکەن.

ئینجا بیربکەرەوە لە کاریگەری ئەو کەسانەی کە دەگەڕێن بۆ ئەوەی ئارەزووی زایەندی (الشهوه الجنسیه)یان جێبەجێ بکەن لە دەرەوەی حەلاڵ، چ زیانێك ئەدەن لە کۆمەڵگای ئادەمی!!. مرۆڤی ڕژد و چروك، چەند زیان ئەدات لە کۆمەڵگا!، هەروەها مرۆڤی موسریف وەك زیانی زۆریشی هەیە بۆخۆی چەند زیانیش دەدات لە کۆمەڵگا!!.. ئەمانە هەموویان لە دەرئەنجامی دەرچوونە لە بازنەی دادپەروەری.

دادپەروەری لە خێزاندا:-

دابەشکردنی ئەم سێ خاڵە سەرەکییە لە خێزاندا بەشێوەیەکی دادپەروەرییانە سەقفێکی دادپەروەریی بۆ خێزان دروست دەکات، کە ئەو سێ خاڵەش بریتین لە:

* دراو (پارە)
* خۆشەویستی
* کات.

بەلاّم کاتێ ئەمانە بە دادپەروەرییانە دابەش ناکرێن، ئەوا ئەو پیاوە کاتەکانی بۆ خۆی سەرف دەکات و لە کاتەکانی ژیانی بەشی منداڵەکانی و بەشی خێزانەکەی تێدا نییە، یاخود بە پێچەوانەوە، ئەو ئافرەتەی کاتەکەی لە ماڵی باوکی بەسەر دەبات و کات نادات بە منداڵەکانی و هاوسەرەکەی یاخود ئەو منداڵانە کاتیان نییە لەگەڵ دایك و باوکیان بەسەر بەرن.. ئەمانە سەرجەمیان چوونەتە بازنەی ستەمەوە یاخود لە بەخشینی (دراو)دا بەو منداڵەت دەبەخشی و بە منداڵەکەی ترت نابەخشیت کە هاوتەمەنن، (لێرەدا مەبەستمان یەکسانی نییە لە بەخشینی ماددیدا بەشێوەیەکی ڕەها)، چونکە ئەمە پەیوەستە بە پێداویستی منداڵەکە،

بۆنموونـه منـداڵێکت لـه زانکۆدا وەك ئـەو منداڵـەت نییـه کـه نەچۆته مەکتـەب، ئەمیان پێویستی بە بەخشینی ماددی زیاتر هەیە، بـەلآم بـۆ ئـەوی تریـان سـەرف کردنی کات و بەخـشینی سـۆز بـۆی زیـاتر پێویـستە، فەرموودەیـەکی پێغەمبـەری خوا هەیە (د.خ) کە تیایدا دەفەرموێت (إتقوالله وأعدلوا بين أولادكم..) سـاکارترین نموونە دەهێنینەوە، کاتێك منداڵێکت ماچ دەکەیت، ئەبێ منداڵەکەی تریشت مـاچ بکەیت، ئەگەر نا ئەوا منداڵەکەی ترت دڵی لـه خـۆی دا ئـەمێنێت، هـەر منـداڵێك هەستی کرد کە براکەی یان خوشکەکەی زیاتر لەو خۆشەویست تـرە لـەلای بـاوکی یاخود لەلای دایکی، ئەوا ئەو دایك و باوکە گوناهبارن، ئەوە لێرەدا زوڵم لە نێـوان دایکەکە، یاخود باوکەکە، لەگەڵ جگەرگۆشەکانیاندا روو ئەدات بۆیـه جارێکی تـر جەختی لەسەر ئەکەینەوە کە ئـەبێ خۆشەویـستی و دراو و کـات لـه خێزانـدا زۆر بە دادپەروەرانە دابەش بکرێت.

خوای گەورە لە چەندین ئایەتی قورئانی پـیرۆزدا ئامـاژە دەکـات بـەوەی کـه دەبـێ پیاو زۆر بەباشی مامەڵە بکات لەگەڵ خێزانەکەیدا، بەهیـچ جۆرێك نابێـت ئـازاری بدات، جا ئەو ئازارە دەروونی بێت یاخود جەستەیی.

دەرئەنجامەکانی نەبوونی دادپەروەری لە کۆمەڵگەدا

لـه بـەرواری (١٩٩٧/٤/١) ریفرانـدۆمێك لـه نەمـسا سـازدرا. . لـه سـاڵی (١٩١٢)ـەوە ئافرەتـانی نەمـسا دەیانـەوێت مـافی خۆیـان دەسـتبکەوێت، لـه شەسـتەکاندا تـەنها توانیـان مـافی دەنگـدان بەدەسـت بهێـنن، بـەلآم ئێمـەی گـەلی موسـڵمان ئـەو کێـشەیەمان نییـه، کـه نەمـسا لـەناو جەرگـەی ئـەوروپای بـەناو پێـشکەوتن خـواز هەیـەتی، شـیاوی ئامـاژە پێکردنـه ئـەو ریفرانـدۆمـەی کـه لـه (١٩٩٧/٤/١) دەسـتی پێکرد داواکارییان چەند خاڵێك بوو کە پێویست بوو کاری جدی بـۆ بکرێـت، لـەو

خاڵانـەدا داوای ئـەو مافانـەیان دەکـرد کـە (١٤٠٠) لەمەوبـەر ئیـسلام بـە ئـافرەتی بەخشیوە، لە گرنگترینی ئەو خاڵانەدا هاتبوو:

١- داوانەکەن کە پارێزراو بن لەو دەست درێژییـەی کـە دەکرێتـە سـەریان لەلایـەن پیاوانـەوە بـە جۆرێکی وەهـا یاسـایەك دەربچێ و ببێتـە ئاسـتەنگێك لـە بـەردەم پیاوانـدابۆ ئەنجامـدانی ئـەو جـۆرە دەسـتدرێژییانە، بـەڵام گـەلانی موسـڵمان لـەو جۆرە کێشانە زۆر بەدوورن.

٢- داوا ئەکەن کە ئافرەتان لە موچەدا وەکو پیاو بن... ئەم راستییە لای زۆر کەس ونە، بۆنموونە کوڕێك و کچێك کۆلیژێك، یاخود پەیمانگایەك تەواو ئەکەن... کاتێ دادەمەزرێن لەهەمان فەرمانگە و لە هەمان ژووردا هەردووکیان بۆ نموونـە پێیـان دەوترێ ژمێریار یان هەر ناوێکی تر، بەڵام لـە مووچـەدا، موچـەی پیاوەکـە (٣٠٪) زیاترە لـە موچـەی ئافرەتەکە، دیـارە ئـەم دیاردەیـەش لـە هـەموو ئـەوروپادا بـەم شێوەیەیە کە باسکرا، بەڵام گەلانی موسڵمان لەو کێشانە بەدوورن.

**چەمکی یەکسانی و رەهەندی دادپەروەریی:-**

چەمکی (یەکسانی) بە تێگەیشتنی ئێمەی موسڵمان زۆر جیـاوازە لـەو تێەیـشتنەی کە ئەوان واتە (رۆژئاوا) هەیانە بۆ (یەکسانی)، ئەوان لـەوەدا یەکسانیان کـردوون کە ئەبێ هەمان ئەرك وەکو یەك ئەنجام بدەن، بەڵام لە مووچەدا وەکو یەك نین.

یەکـسانی لـە ئیـسلامدا رەچـاوی چـەند بـارودۆخێکی بـۆ دەکـرێ.. واجباتـەکان ئەگۆڕێن بـە گـوێرەی بـارودۆخ.. مرۆڤێـك کـە جـێگیر (مقـیم)بـێ جیـاوازە لەگـەڵ مرۆڤێکی گەشتیار (مسافر)دا، هەرهەمان مرۆڤ کاتێ لـەناو مـاڵ و منـاڵی خـۆیی و نیشتمانی خۆیـدا بێـت زۆر جیـاوازە لـە کاتێکدا کـە گەشـتێك ئـەنجام ئـەدا، کـاتێ سەفەری کرد بۆ نموونە نوێژەکانی کورت ئەکرێنەوە، رۆژووی لەسەر لائەچێ.. لە ئیسلامدا واجبات بەگوێرەی بارودۆخە، تێگەیشتنی رۆژئاوا بۆ چەمکی (یەکسانی)

لەسەر بناغەی بەرژەوەندییە، بەڵام چەمکی یەکسانی و تێگەیشتن بۆی، لەسەر بناغەی دادپەروەرییە لە ئیسلامدا، وەلەسەر بناغەی ئیمان و باوەڕە.

دادپەروەری لە مێژووی ئیسلامدا:-

شاری (حمص) ماوەیەك دوژمنان توانیان لە موسڵمانانی بسەننەوە، پاشان موسڵمانان دوای ماوەیەك کەوتنە خۆیان و شارەکەیان رزگار کرد، ئاشکرایە کە داگیرکەر بێت بۆ هەر وڵاتێ یان بۆ هەر شارێك، بەهیچ جۆرێك جیاوازی لە نێوانیاندا ناکات و هەموویان بە دوژمن دائەنێت، ماڵی زۆریان تاڵان کرد.. پاش ئەوەی کە ئیسلام هاتەوە کاتی زەکات و جزیە و خەراج هات پاش ماوەیەك، هاوڵاتییە مەسیحییەکان جزیەیان هێنا، ئەوەبوو والیەکە لێی وەرنەگرتن، وتی ئەو پارەیەی کە لە ئیسلامدا لە (أهل الذمة) وەرئەگیرێ و دوایی لە خزمەتگوزاری گشتیدا سەرف ئەکرێ، ئەو پارە وەرگرتنە بۆ پاراستن و ئاسایش و ئارامییانە، لەبەرئەوەی ئێمە نەمان توانیوە ماڵتان بپارێزین، بە چ ڕوویەکەوە دەبێت پارەتان لێ وەربگرین!! بەڵێ بەم شێوەیە ئەبێ دادپەروەری لە ئیسلامدا.

پێغەمبەری خوا (د.خ) جارێکیان یەکێك لە هاوەڵانی لە خزمەتیدا بوو کە ناوی (عوقبە) بوو، ئەو عوقبەیە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (د.خ) بەسەفەر رۆیشتین و شەومان بەسەردا هات، پاشان پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی پێم: بوەستە، پاشان لەسەر حوشترەکە دابەزی، منیش وام دەزانی پشوویەك ئەدات، کەچی پێی فەرمووم سەرکەوە، بەڵام (عوقبە) کە ئەدەبی لە پێغەمبەری خوا وەرگرتووە، چۆن سەرئەکەوێ بۆسەر حوشترەکە و پێغەمبەری خوا (د.خ) لە خوارەوە بێ؟! بۆیە دوودڵ مایەوە، فەرمووی سواری حوشترەکەی تۆ ببم ئەی پێغەمبەر خوا (د.خ) ؟! ئەویش فەرمووی بەڵێ، وەچەند جارێکیش جەختی کردەوە لەسەر ئەم قسەیە بۆیە وتم و دووبارەم کردەوە، سواری حوشترەکەی تۆ

ببم ئەی پێغەمبەر خوا (د.خ)؟! ئەویش فەرمووی بەڵێ سەرکەوە بۆسەر پشتی حوشترەکە.. بۆیە منیش ناچار بووم سەرکەوم.. چونکە ئەترسام لەوەی کە خەشم و قینی خوا بباریێ بە سەرمدا، لەکاتێکدا فەرمانم پێ ئەکات سەربکەم و منیش بە قسەی نەکەم.. بۆیە سەرکەوتمە سەر حوشترەکە و بینیم، پێغەمبەری خوا (د.خ) بە دەستە پیرۆزەکانی خۆی حوشترەکە رائەکێشێ، پێغەمبەری خوا (د.خ) ڕوانیبووی کە (عوقبە) ماندوو بووە، بۆیە ئەم کارەی ئەنجامدا.

بەراستی ئەمەیە پێشەوا.. ئەمەیە دادپەروەری و. . ئەمەیە سەرۆکی وڵات، ئەمەیە دادپەروەری ئیسلام و فەرمانڕەوایی ئیسلام..

عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ رازی بێت) ئەمەی جێبەجێ کرد لە فەتحی قودسدا، خۆیی و یەکێك لە هاوەڵەکانی دوو یا سێ جزء قورئانیان دەخوێند، ئاوەی کە لەسەر حوشترەکەیە دائەبەزی و، ئەوی تر سەرئەکەوت.. ئەوەندە جزئیان خوێند، پاشان هەردووکیان بەپێ ئەڕۆیشتن بۆ ئەوەی حوشترەکەش پشوو بدات.

لە ساڵێکدا باران نەئەباری و خەڵکی هەموو برسی بوون، عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ رازی بێت) قۆڕەی سکی ئەهات لە برساندا، ئەیفەرموو بە نەفەسی خۆی: هەتاکو بەیانی وابکەی، رۆن نییە، و رۆن ناخۆیت، چونکە میللەتەکەت رۆن ناخوات و میللەتەکەت برسیەتی.

دادپەروەریی و عەدالەتی ئیسلامی تەنها لەم دەرفەتە کەمەدا ناتوانین باسی بکەین، چونکە نموونەمان هێندە زۆرن، بەڵام تەنها تیشکێکمان خستە سەریان.

دادپەروەری لە کۆمەڵگەدا:-

لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆدا بەداخەوە دادپەروەریمان زۆر کەم تیادا بەدی ئەکرێ، بۆیە بەم شێوەیەی ئێستامان لێ بەسەر هاتووە، ڕێز لە هەندێ کەس دەگرین کە شایەنی ڕێز نین، وە زۆر کەسمان بیرچۆتەوە.

هەزاران کەس هەن کە مامۆستا بوون، کە بۆ ماوەی (٣٠ - ٤٠) ساڵ خزمەتیان هەبووە و ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆماوەی تەنانەت پێنج دەقیقە ناپاکیان لەوانەیە نەکردووە، فلسێکی حەرام نەهاتۆتە گیرفانیان، بەڵام ئێستا خانە نشین بوون و سەر و برۆیان سپی بووە، کەس ناچێت بەلایاندا، ناوی زاناکان نازانین، ئەگەر ڕۆڵی زانایان و پێشەواکانمان زیاتر نەبن لە ڕۆڵی کەسانی تر کەمتر نین، کەچی ناویان فەرامۆش کراوە، زۆر کەس قوربانی داوە بە گیان و جەستەی خۆی لە پێناوی میللەتدا، کەچی خەڵکی نایناسن (بەداخەوە)، ئەمە زوڵمە.. ئەمە زوڵمی کۆمەڵگەیە ئەیکات لە خۆی، وە بۆ زانینتان، کاتێک کە مرۆڤ هەستی کرد کە زوڵمی لێکراوە، ئیتر هەستی نەتەوایەتیشی تێدا نامێنێت.

دوژمنان دوو جۆر خەڵك بەکاردەهێنن و ئەیانکەن بە سیخوڕ (جاسوس) لەو دوو جۆرەکەسەش:

١- بەد ڕەوشت ٢- ستەم لێکراو.

مرۆڤێك ژیانی خۆی پێشکەش بە میللەت ئەکات و قوربانی ئەدات، دوایی، میللەتەکە بەهیچی نازانێت، ئیتر ئەم مرۆڤە چۆن نەخۆش ناکەوێت؟ چۆن تووشی پەشیمان بوونەوە (ردة) نابێت بەرامبەر بەو میللەتە؟ بۆیە زوڵمێکی گەورەیە کە ئەو کەسانە نەخوێنینەوە، بە تایبەت هەندێك کەس ئەگاتە پلەی شەهیدی کۆمەڵگە نایخوێنێتەوە، ئەوە گوناهە، ئەوە زوڵمی کۆمەڵایەتی بەو شێوەیە دروست ئەبێت.

زوڵم لە حکومەتیشدا کە ئەو بنەما دادپەروەرییانە بەکار نەهێنێت، بەیەك چاو سەیری ئەو کەسانە نەکات کە ئەم لێی بەرپرسن و لەژێر دەسەلاتیدان، سەقفی دادپەروەریە کە ئەڕوخێت.. بیمە لە ئەمن و ئاسایش و، بیمە لە دابین بوونی خۆراك بیمە لە داهاتوو، بیمە لە تەندروستی و، بیمە لە کۆمەڵگە و، بیمە لە فێر کردن (تعلیم).. ئەو حکومەتەی ئەمانە دابین ئەکات، لە دوایدا گوێڕایەڵی ناکرێ لەلایەن کۆمەڵ و میللەتەوە.

تیشکێك بۆسەر ستەم:-

ئەم دادپەروەرییەی کە هەروا تیشکێکی ئاساییمان خستە سەری، هەرکە بریندار ئەبێ نەزیفی زوڵم هەڵئەکا، جێ بە ماف لێژ دەکات، خێرا زوڵم دێتە شوێنی.

زوڵم سێ جۆرە:

١- جۆرێکیان خوای گەورە هەرگیز لێی خۆش نابێت.

٢- جۆرێکیان خوای گەورە لێی خۆش ئەبێت.

٣- جۆرێکیان خوای گەورە وازی لێناهێنێ.

ئەو زوڵمەی کە خوای گەورە لێی خۆش نابێ، بریتییە لە (لادانی بیر و باوەڕ) بۆ نموونە، پەنا بەخوا باوەڕ نەهێنان بەخوای گەورە، یان بەناوەکانی یاخود بە سیفەتەکانی، یان بە کردەوەکانی یان هاوەڵی بۆ بڕیار بدەی (إن ألله لايغفر أن يشرك به) ئەو جۆرە زوڵمە خوای گەورە لێی خۆش نابێت.. کە (الطب النفسي) لە ئاستی کۆنفرانسی جیهاندا گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە گەورەترین نەخۆشی (نەفسی) دەرونی کە تووشی مرۆڤ ببێت بریتییە لە (کوفر)، چونکە کوفر ئینکار کردنی ئەو نیعمەتانەیە کە خوای گەورە بەسەر مرۆڤدا باراندویەتی.

شای ئێران بە هەموو هێزێکی ئاسمانی و وشکانی و دەریایی، نەیتوانی پارێزگاری لە کورسیەکەی خۆی بکات، بە چەپڵە راویان نا، بینیومانە کە چەندە لەو (ظالم)

زۆردار و ستەم کارانە چییان بەسەر هاتووە، (بومەدین) کە (٦٨) پزیشك لە هەموو جیهانەوە هاتن، نەیانتوانی بۆ تەنها خولەکێك تەمەنی درێژ بکەن، هەرچی دەمارێك لە لەشی دا هەبوو بەکاریان ئەهێنا بۆ دڵی، بەڵام رەتی ئەکردەوە.

بینیومانە چەند لەو پاشایانەی سەرزەوی، کوڕیان جگەر گۆشەیان مردووە و هیچیان بۆ نەکراوە تووشی زەلیلی و نەخۆشی ترسناکی وەکو شێرپەنجە (سرطان) بوون، لەبەرئەوەی هیچ کەسێك ناتوانێ ئەو بەخششانەی کە خوای گەورە پێی داوە بپارێزێت.

زوڵم بە پلە گەورەکەی ئەو (کفر)ـەیە کە مرۆڤ (پەنا بەخوا) واز لە ئیمانەکەی بهێنێت، ئێمەی ئیماندار ئەو شتانەی کە بەرامبەرمان روو ئەدات بەرژەوەندییەکانمان دەخەنە مەترسییەوە، وەك: زیانی ماددیمان لێ ئەکەوێت.. لێمان ئەمرێت.. خۆشەویستمان لێ دوور ئەکەوێتەوە.. پارچەیەکی جەستەمان لەناو ئەچێت.. قاچێکمان ئەپەڕێت، باوەڕمان وەهایە کە ئەمە پێی ئەوترێ (قەدەر)، (مقدر) واتە نووسراو، (أصاب) واتە بەری کەوت، خوای گەورە ئەفەرموێ بەرت ئەکەوێ، تۆ چۆن ئەڵێی بەرم ناکەوێ (موصیبەت) لە (أصاب)ـەوە هاتووە لە (لوح المحفوظ)دا ئەو قەدەرەی کە روودەدات، نوسراوە، بەمە مرۆڤی موسڵمان سەبوری دێت و ئەڵێت: خوای گەورە ئەمەی لە چارەم نووسیوە، بەڵام بێ باوەڕ چۆن چارەسەری گرفتەکانی ئەکات؟! بۆ نموونە من مرۆڤێکم بەسەر شوێنێکدا دەڕۆم و مینێك (لوغم) ئەتەقێتەوە و هەردوو قاچم ئەپەڕێنێت. کە ئیمانداربم دەڵێم ئەمە خوای گەورە لە چارەی نووسیوم.. وره بەرنادەم و مەعنەویاتم ناڕوخێ، بەڵام مرۆڤی بێ باوەڕ چۆن بەرگەی ئەوە ئەگرێ.. (إنهیار) ئەکات.. خۆشەویستێکمان کە ئەفەوتێ و ئەمرێ، زۆر شتێکی سانا و ئاساییە لای ئێمەی

موسڵمان.. بەڵام مرۆڤی بێ باوەڕ چۆن لێکی ئەداتەوە؟ ناتوانێت، لەبەرئەوە گەورەترین نەخۆشی دەروونی کە تووشی گرۆهی ئادەمیزاد ببێ، کفرە و بێ باوەڕییە.

ئەو زوڵمەی جۆری دووەم کە خوای گەورە لێی خۆش ئەبێ بریتییە لە کەمتەرخەمی لە پەرستشەکاندا (العبادة).. مافەکانی خوای گەورە بەسەر بەندەکانی خۆیدا کە تەمەڵی تیا ئەکرێ و بە کەم و کورتی جێبەجێ ئەکرێ بە مەرجێ دوایی تەوبەیەکی (نصوح) رێک و پێک بکرێت و ئەو لادانە راست بکرێتەوە، خوای گەورە لەو زوڵمە خۆش ئەبێ.

جۆری سێهەم لە زوڵم کە خوای گەورە وازی لێ ناهێنێت، بریتییە لە زوڵمی مرۆڤ بۆ مرۆڤ.. جابری کوڕی عبداللە فەرموودەیەکی بیست کە ئەفەرموێت (مافی کەس بەسەر کەسەوە نامێنێت) وتیان ئەمە کەی پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی، کێ گوێی لێبووە و کێ گێڕاویەتییەوە؟!وتیان عبدالله کوری ئونەیس، وتی: لە کوێیە؟ وتیان: سەفەری کردووە و لە شامە واتە لە وڵاتی شامە، چوو حوشترێکی کڕی، ئەو مەسەلانە لە نێوان شارستانی ئەو سەردەمە و ئێستادا وا باشە کەمێك لێیان بزانین، کە ئەوترێ حوشترێکی کڕی، واتە بە تێگەیشتنی ئەمڕۆ چاکترین و تازەترین مۆدێلی ئۆتۆمبیلی کڕی... رۆیشت ماوەی (٣٠) رۆژ لە میوانخانە (ئوتێل) نەنوستووە... ماوەی (٣٠) شەو لەو بیابانە ژیانی خۆیی خستووەتە مەترسیەوە چونکە ئەگەری ئازاری پێوەدانی دووپشك و مار و دڕندەی هەبووە.. هەروەها مەترسی جەردەو رەشەبا و ونبونی هەبووە.. هەتا ئەیدۆزێتەوە لە وڵاتی شام.. لە دەرگا ئەدات و هەواڵ ئەدەن بە عبدالله کوڕی ئونەیس ئەڵێن: جابری کوڕی عبداللە هاتووە.. لە خۆشیدا قاچی لە دشداشەکەی ئەگیرێ و خەریکە بەدەمدا ئەکەوێ، ئەڕوات و بەخێرهاتنی ئەکا و باوەشی پێدا ئەکات و ئەڵێت:

براکەم! واهاتووم ئەڵێن فەرموودەیەکی پێغەمبەرت (د.خ) هەیە، گوایە تۆ گێڕاوتەتەوە و تۆ بیستوتە؟! بە نیسبەت مافی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤدا، ئەڵێت بەڵێ، ئەڵێت، بۆم بڵێ، ئەڵێت حەزرەت فەرموویەتی: (يناد الله يوم القيامة ملائكته فيقول يا ملائكتي أنا الملك، أنا الديان...)[٤] ئەی فریشتەکان من خاوەنی ئەم هەموو کەونەم.. من پادشای هەموو کەونم.. من (مدبرم).. واتای فەرموودەکە ئەڵێت جائیز نییە بۆ هیچ کەس لە ئەهلی جەهەنەم کە بچێتە جەهەننەم، ئەگەر مافێکی هەبێت بەسەر یەکێك لە ئەهلی بەهەشتا هەتا بۆی وەرئەگرم.. خوای

---

٤ - ٥٧٦٤٨عن عبد الله بن عقيل بن أبي طالب أن جابر بن عبد الله حدثه ، قال بلغني حديث عن رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم لم أسمعه منه ( قال فاتبعت بعيرا فشددت عليه رحلي فسرت إليه شهرا حتى أتيت الشام ، فإذا هو عبد الله بن أنيس الأنصاري ، فأرسلت إليه أن جابر على الباب ، قال فرجع إلي الرسول ، فقال : جابر بن عبد الله ؟ فقلت نعم ، قال فرجع الرسول فخرج إلي فاعتنقني واعتنقته ، فقلت : حديثا بلغني أنك سمعته من رسول الله صلى الله عليه وسلم في المظالم لم أسمعه ، فخشيت أن أموت أو تموت قبل أن أسمعه ، فقال : سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول : يحشر الله العباد يوم القيامة أو قال يحشر الله الناس – قال وأومأ بيده إلى الشام – عراة غرلا بهما ، قلت ما بهما ؟ قال ليس معهم شيء ، قال : فيناديهم بصوت يسمعه من بعد كما يسمعه من قرب أنا الملك أنا الديان ، لا ينبغي لأحد من أهل الجنة أن يدخل الجنة ، وأحد من أهل النار يطلبه بمظلمة ، ولا ينبغي لأحد من أهل النار أن يدخل النار وأحد من أهل الجنة يطلبه بمظلمة حتى اللطمة ، قال : قلنا كيف هذا وإنما نأتي غرلا بهما ؟ قال بالحسنات والسيئات

الراوي :عبدالله بن أنيس الجهني - خلاصة الدرجة :حسن - المحدث :ابن القيم - المصدر :مختصر الصواعق المرسلة - الصفحة أو الرقم ٤٨٩

گەورە بەرگری لە کار ئەکات، چونکە مەسەلەکە دادپەروەرییە.. وە کەسیش بۆی نییە لە ئەهلی بەهەشت بچێتە بەهەشت، مافێکی مابێ لای کافرێك، هەتاوەکو ئەو مافەیشی بۆ وەرئەگرمەوە.. هەتا چەپۆکیش بە زوڵم حسابە.

دادپەروەری لە جێبەجێکردنی بەرنامەی خوادایە:-

مەسەلەی حەق و دادپەروەریی، شتێك نییە بڵێیت خەڵاتێکە کەسێك، لایەنێك ئەیدا پێت و ئەبێتە خاوەن ماف و حەق.. حەق شتێك نییە بە زەبر و زەنگ.. بە داگیرکردن ببێتە خاوەنی.

حەق چۆن پەیدا ئەکرێت؟ حەق یەکێکە لە ناوەکانی خوای گەورە، ئەنجامی جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانی هەر کەسێکە.. هەر کۆمەڵێکە.. هەر میللەتێك، ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکات، ئەگاتە حەق. پیرۆزترین ئەرکی سەرشانی ئادەمیزاد جێنشینی خوای گەورەیە (خليفة) لەسەر زەویدا، جێبەجێکردنی بەرنامەکەی خوای گەورەیە، من و تۆ لە هەزاران خاڵدا یەك ناگرین، بۆچوونمان جیایە.. ئارەزووەکانمان جیایە، ویستمان جیاوازە، کەواتە ئەبێ شتێکی نەگۆڕ جیامان بکاتەوە جیاوازی (خلاف) چارە بکات لە نێوانماندا.. ئەگەر ئەو نەگۆڕە یاسایەك بێ من دامنابێ، ئەوا رەنگدانەوەی ئارەزووکانی منی پێوە دیارە.. ئەگەر تۆش دات نابێ، ئارەزووەکانی تۆی تیایە.. هەرگیز من قایل نابم پێی، تۆیش بە یاساکەی من قایل نابیت، بەڵام ئەگەر دروستکەر و بەدیهێنەری من و تۆ ئەو یاسایەی دانابێ، بێگومان ئەو یاسایە هیچ جۆرە ئارەزوویەکی مرۆڤی تێدا نییە، بۆیە گەورەترین زوڵم، فەرامۆش کردنی مەنهەجی خوای گەورەیە، خوای گەورە ئەفەرموێت: (یاداود إنا جعلناك خليفة في الأرض فاحكم بين الناس بالحق) واتە تۆمان کردە خەلیفە.. خەلیفە واتە وەکیل، وەکیلی پێغەمبەرەکانیت (على نبينا و عليهم الصلاه والسلام)، بۆیە بەشەرییەت بێ پێشەوا نابێت، وە حوکم بکە لە

نێوان خەڵکیدا بە حەق، واتە بە مەنهەجی خوای گەورە، وە ئەو فەرمانە تەنها بەئەو نەوتراوە، بەڵکو بە هەموو پێغەمبەرێك وتراوە بە پێغەمبەری خۆشمان وتراوە (وإن أحكم بينهم أنزل الله ولاتتبع أهوائهم فيضلونك عن سبيل الله).

دادپەروەری و بەها کۆمەڵایەتییەکان:-

ئیسلام لە عەقیدە و بیر و باوەڕەوە کە دێت بۆ جێبەجێ کردنی. . وەك بڵێین لە تیۆرەوە بۆ پراکتیك، خوای گەورە لە رێی شەریعەتەکەیەوە کۆمەڵێ بەهای بۆ داناوین.. ئەبێت ئەو بەهایانەمان تیادا بێت، وە بۆچونەکانی هەموو بوارێکی ژیانی بۆ رێك خستووین لە ئیسلامدا تصورات و جیهان بینی و بۆچوونی ئامادەکراو هەیە، تەصەوری مرۆڤ بەرامبەر بە باوکی و دایکی و خێزانی ومنداڵی و بە گەل و نیشتمانەکەی و بە مردن و بە دراوسێ و بە دوارۆژ.. هەموو بوارێکی ژیان، ئیسلامی پیرۆز تەصەورێکی بۆ ئەو موسڵمانە دروست کردووە.. هەروەها بەهای کۆمەلایەتی بۆ دیاری کردووە ئەبێت وەری بگرێ، پاشان ئەتوانێ ئیسلامەتییەکە بهێنێتە دی.

سەرچاوەی بەها کۆمەلایەتییەکان چوارن:

١- دادپەروەری.

٢- ئازایەتی (بەو پێناسەیەی باسکراوە).

٣- داوێن پاکی.

٤- ئارامگرتن.

دمیان بەڵکو سەدان رەوشتی جوان لەم چوارەوە هەڵئەقوڵێ، بۆ نموونە راستگۆیی، کە لە پێغەمبەریان پرسی (د.خ) (جائیزە موسڵمان درۆ بکات؟) فەرمووی نەخێر[٥].. واتە درۆ دژی ئیسلامەتییە.

ئەمانەت، سیفەتێکە ئەگەر نەما لە مرۆڤدا، نەما لە خێزاندا، نەما لە کۆمەڵدا، ئەوا ئەو کۆمەڵە، لەسەر کەناری چاڵی مردن و تیاچونن، جێبەجێ نەکردنی ئەرکی سەرشان و ونبوونی ئەمانەت، واتە (خیانة)، ئەمانەت و راستگۆیی، ئەم سیفەتانەی کەباسی ئەکەین و هەموو رەوشتێکی جوان ئیسلام فەرمانمان پێئەکات کە بەشێك بێت لە کەسایەتیمان، نەوەك بەرگێك بێت لەبەری بکەین و لەگەڵ وەرزدا بیگۆڕین وەك لە جیهانی سیاسەتدا.. هەر رۆژەی بە شەپۆل و مەوجێك و هەر رۆژەی بە قەناتێك قسە ئەکەین.. سیاسەتمەداران و زلهێزەکان، هەتا دوێنێ بوو (مۆبۆتۆ سیسیسیکۆ) لە زائیر بۆماوەی (٢٢) ساڵ ئەمریکا پشتی گرت، میللەت دژی وەستاو میللەت نیوەی ولاتەکەی رزگار کرد، وەبەرەو پایتەخت رۆیشتن، بۆیە ئەمریکا راستەوخۆ دوای ئەم رووداوانە رایگەیاند کە باوی دیکتاتۆر نەماوە و ئەبێت ئەو سەرکردەیە لابچێت، ئەی بۆچی پێشتر ئەمریکا ئەو قسەیەی نەئەکرد؟! و بگرە خۆیشی بەرەسمی تا پێش هەفتەیەکیش پشتگیری لێ ئەکرد!!.

---

٥ - ٥٨٧٨١سألت رسول الله صلى الله عليه وسلم , فقلت : يا رسول الله هل يزني المؤمن ؟ قال : قد يكون ذلك قال : يا نبي الله , هل يكذب المؤمن ؟ قال صلى الله عليه وسلم : لا ثم أتبعها صلى الله عليه وسلم بقول الله تعالى } : إنما يفتري الكذب الذين لا يؤمنون بآيات الله { النحل : ١٠٥ .
الراوي :عبدالله بن جراد العامري) صحابي - (خلاصة الدرجة :إسناده ضعيف - المحدث : العراقي - المصدر :تخريج الإحياء - الصفحة أو الرقم ٣/١٦٧

لە ئیسلامدا ئەم تەکتیکانە نییە، هەمووی بنەما و بناغە ڕێژییە بیر و باوەڕە، هەروەها لەو بەهایانەی کە ئەبێ موسڵمان تیایدا بێ بۆ ئەوەی بتوانێ ئیسلامەتی بەرجەستە بکات، وەفاوپەیمانە.

هەموو ئەزانین کە پێغەمبەر (د.خ) ماوەی (١٣) ساڵ هەوڵی ئەدا بۆ ئیسلامەتی، سی و ئەوەندی کەس باوەڕی پێ کرد، پاشان بڕیاریدا کە مەڵبەندی بانگەوازەکەی بگوێزێتەوە بۆ (مەدینە).

ئەو سەرکردانەی کە دژ بە پێغەمبەر (د.خ) وەستابوون و ئەشکەنجەی هاوەڵانیان ئەدا، ئەوانەی کە پێیان ئەوت شاعیرە.. ساحیرە. شێتە (پەنا بەخوا).. ئەمانەتیان هەبوو لەلای پێغەمبەر (د.خ)، حەزرەت ئەو دوو شتەی تێکەڵ نەکرد، باوەڕ نەکردنی ئەوان بە ئیسلامەتی، و بە پێغەمبەرایەتی (محمد) (د.خ) تێکەڵی نەکرد لەگەڵ ئەو مافی ئەمانەتیەیان کە هەیانە لەلای ئەو، بۆیە (علی) هێشتەوە بۆ ئەوەی ئەو ئەمانەتانە بگێڕێتەوە بۆ ئەوان، ئەمەیە سیفەتی ئەمین و ئومانی لە موسڵماندا!!.

هەر لەو کۆچ کردنەدا، باوك و کوڕێك کە ئیمانداربوون و لە هاوەڵان بوون کۆچیان کرد بەرەو وڵاتەکەی (محمد المصطفی) (د.خ) لە ڕێگا گیران ئەو کۆمەڵەی ئەوانیان گرت، هەموو خزمی یەکتر بوون و بیانکوژن خزمی خۆیانن، بیانگێڕنەوە بۆ مەککە، سبەینێ لە شوێنێکی ترەوە ڕانەکەنەوە و ئەچنەوە بۆ مەدینە، بەڵام دڵنیان کە ئەم هاوەڵە بەڕێزانە خاوەن مەبدەئین و خاوەن ڕەوشتی بەرزن.. جا پەیمانمان بدەنێ کە ئێوە بەشداری جەنگ ناکەن دژ بە ئێمە، وە ئێمەش بەرەڵاتان ئەکەین، چونکە محمد نیازی هەیە سوپایەك کۆکاتەوە و دژمان بوەستێ، ئەگەر پەیمانمان بدەنێ و بەشداری ئەو سوپایە نەکەن، ئێمە بەرەڵاتان ئەکەین، ئەوانیش پەیمانیان دانێ و ڕۆشتن.

کاتێـک گەیـشتنە خزمـەتی پێغەمبـەر (د.خ) لەوکاتـەدا خـەریکی سـازکردنی سـوپایەك بـوو، ئـەم رووداوەیـان بـۆ گێڕایـەوە لەکاتێکـدا پێویـستی بـە هـەموو موسڵمانێك هەبوو، فەرمویّ: پەیمانی خۆتان ببەنە سەر لەگـەڵیان بەشـدار مـەبن لەم شەڕەدا، ئەمەیە خوڕەوشتی ئیسلامیی!.

**بنەرەت و وشە و پرۆگرامی خوایە:-**

ئەم دینە داوای ئیرادەی پۆڵاینمان لێ ئەکات بەم خوڕەوشت و سیفەتانە دیـن بـڵاو ئەبێتەوە، بیر لە قورسی ئەو ئەمانەتە بکەرەوە کە خوای گەورە خستیە سەرشانی پێغەمبەر (د.خ)، لەوکاتەی کە خوای گەورە ئەمانەتی دا بە پێغەمبەر (د.خ).

جاری وا هەیە برادەرێك ئەڵێت ئاگاداری شتـەکانم بکـە تـاوەکو ئەچـم نوێژەکـەم دەکەم و دێمەوە، مێزێکە و تۆزێ شەکری لەسەرە، یاخود تەنەکەیەك رۆنـە لـەناو بـازاڕ، ئـەو کابرایـە بـەجێی ئـەهێڵێت بەسـەرتا، بەشـێك لـە هەسـتت، بەشـێك لـە هۆشت سەرف ئەبێ بۆ پاراستنی ئەو سپاردەیە، ئەی ئەگـەر زۆرتـر بـوو، و ئەگـەر هی سێ چوار کەسێك بوو، ئەگاتـە ئاسـتێك ئـیتر هـەموو هۆش و هـەموو مێشکت لەگەڵ ئەو ئەمانەدایە، بەڵام پێغەمبـەر خـوا (د.خ) ئەمانـەتێکی پـێ سـپێردرا کـە گۆڕینی روی مێژووبوو لە کاتێکدا ئەو ئەمانەتەی پێی سپێردرا خاوەن پلە و پایە نەبوو، خاوەن پارە نەبوو، سەرۆکی خێڵ و تیرە نەبوو، تەنها هەر خۆی بوو.

ئـەمان بیـستووە رۆژێـك لـە رۆژان وتبێتـی، خوایـە گیـان چـۆن ئـەم بانگـەوازە رابگەیەنم؟! ئەی زانی کـە خـوای گـەورە هـەموو شـتێکی بـۆ روون ئەکاتـەوە، ئـەو هۆکارانەی کە ئەیتوانی لە جیهانی هۆکاردا بکاری بهێنێ، بـەکاری ئـەهێنا لـەکاتی حەج کردندا کە ئەم هۆز و عەشیرەتانە ئەهاتن بۆ حەج، لەگەڵ سـەرکردەکانیاندا دائەنیشت و هـەوڵی ئـەدا کـە بـبن بـە ئـیسلام، جگـە لـەم کاتانـە، خـۆی تەشـریفی پیرۆزی ئەبردە دەرەوەی مەککە و سەردانی عەشیرەتەکانی دەکرد، هەتا وای لێهات

له (طائف) تووشی ئەو نارەحەتییە بوو، كە بەرد باران كراو راویان ناو پێی پیرۆزی بریندار بوو، وای لێهات كە یاساغ بوو كە بگەڕێتەوە بۆ (مەككە) و وتیان نابێت بێتەوە ناو شار.. هەموو ئەسبابێك پچڕا، بەلآم تەماشای ورەی ئەو پێغەمبەرە (د.خ) بكە لە دوعاو نزاكانیدا ئەیفەرموو: (خوای گەورە تەنها تۆ لەمن زویر مەبە ئیتر ئەم شتانە گرنگ نین)، بەورەو ئیرادە، بە ویستی پۆلآیین، ئەم دینە (تحقیق) ئەبێ بەو رەوشتە جوانانەی كە باسمان كرد، كە ئەڵێن دین (تحقیق) ئەبێ، واتە بە حەق (تحقیق) ئەبێ، واتە دادپەروەریی ئەبێتە واقیعێكی بینراو و بیستراو، نابێتە تەنها شتێكی تیۆری (نظری)، بۆیە لێرە تەماشا ئەكەین جاری وا هەیە حەق (غائب) و نادیار ئەبێ دادپەروەریی دیار نامێنێ و زوڵم دێتە شوێنی، خۆی بنەمایەكی یان بناغەیەكی هەیە كە ئەو بنەمایە رووخا ئیتر غەیب ئەبێ وەكو چۆن دونیا تاریك ئەبێ رووناكیەكە ئەڕوات و شەو دێتە شوێنی، بەلآم ئەسڵ و بنەڕەت نوور و روناكییەكەیە.. ئەسڵ حەقەكەیە.. ئەسڵ مەنهەجی خوایە، خوای گەورە ئەفەرموێ (وجعل كلمة الذین كفرو السفلی) بەلآم بۆ وشەی خۆی (جعل) بەكار ناهێنێت و ئەفەرموێ (وكلمة الله هي العلیا) ئەسڵ وشەو پرۆگرامی خوایە، واتە، ئەوەی ئەسڵە تەندروستییە، نەخۆشی حاڵەتێكی كاتییە.. ئەسڵی ژیانیش دادپەروەرییە.. بەلآم كە مرۆڤ، مرۆڤی موسڵمان، مەرجەكانی جێبەجێ نەكات بێگومان حەقەكە ون ئەبێ، وە ناحەقی دێتە شوێنی.. هەموو بیرو باوەڕێك.. هەموو بیردۆزێك بەهای تایبەتی خۆی هەیە كە جێبەجێی ئەكات لە ژیاندا.

جا ئەوانەی كە بونیادی بەهای كۆمەلآیەتی دەنێن لەگەڵتا، را جیاوازی تیا دروست ئەبێت، بۆ نموونە تۆ ئەڵێی راستگۆیی باشە ئەو ئەڵێت كەی باوی ئەو جۆرە شتانە ماوە؟! تۆ ئەڵێیت ئەمانەت باشە، نابێت خیانەت بكەین، ئەو گاڵتە

بەو بەهایەی تۆ ئەکات، تۆ هیچ سەیر نەبێت لەلات، چونکە سەرچاوەی بیروباوەڕەکەی تۆ لەگەڵ سەرچاوەی بیرو باوەڕەکەی ئەودا جیاوازە و وەك یەك نییە.. ئەگەر هەمو نرخەکانی ئەو وەك هەموو نرخەکانی تۆ بێت.. کەواتە ئەویش وەك تۆ دەعوە و بانگەواز دەکات بۆ ئەم دینە.. کەواتە ئەویش هەوڵئەدابۆ ئیسلامەتی، لەبەرئەوە کە ئەبینین خەڵکێکی بێ باوەڕ نرخیان پێیە دژ بە نرخەکانی تۆیە زۆر زۆر شتێکی ئاسایی و سروشتییە، چونکە سەرچاوەکان جیاوازن...بیر و بۆچوونەکان غەیری ئیسلامین، ژیان گۆڕەپانێکە بۆ ململانێی فکری و بۆ (صراح المتناقضات) ئەمە فەلسەفەیەکی (هیگل)ـە... مارکسیەتیش لەوێوە پێکهاتووە و ئەو فکرانەی وەرگرتووە... یاخود یەکێکی وەکو داروین کە ئەڵێت (مان بۆ بەهێزە) ئیتر ئەمە خۆی لەخۆیدا فکرەیە، هەندێ نرخی ئەوێ کە جێبەجێی ئەکات و ئەیکات بە واقع.. فەلسەفەیەکە دوایی خەڵك لەسەری ئەڕوات.

فرۆید هەموو رەوشت وهەڵسوکەوتێکی مرۆڤ بە (جنس) تەفسیر و راڤە ئەکات.. مارکس دێت هەموو شتێك بە ئابورییەوە گرێ ئەداتەوە.. لەگەڵ رێزدا بۆ ئەم بیرو باوەڕانە، چونکە ئێمە خورەوشت و نەریتمان وایە وەك موسڵمان بەرامبەر سفر ناکەین.

بەلأم رۆژگار سەلماندی کە هەموو فکرێك ئەگەر تەماشای مرۆڤ بکات لە تەنها یەك گۆشەوە، ئەوا ئەو فکرەیە (تەمەن کورتە).. کامیان ئەگری هەموو چەند سەدەیەك ئەژی و یاخود بەشێکی ناگاتە سەدەیەکیش ئیتر خۆی ئەپوکێتەوە و ئەو بیروباوەڕە نامێنێت، ئەی بۆچی ئیسلامەتی ماوە؟! لەبەرئەوەی ئیسلامەتی یاخود ئیسلام وەکو دینی خوای گەورە بایەخی داوە بە مرۆڤ لە هەموو بوارێکەوە و بایەخی داوە بە کۆمەڵ و گرۆهی ئادەمیزاد لە هەموو بوارێکەوە... سەرەڕای

ئەوەیش دینی خوای گەورە، مەنهەجی خوای گەورەیە، ئەوەی بە ئیسلام کراوە، وەك بیروباوەڕ ئەگەر یەك لە ملیۆنێك ئەوەی بکردایە بەهەر بیروباوەڕێکی تر.. بەرگەی مانگێکی نەئەگرت.. ئەوەی کراوە بەسەرکردە و کەسایەتی ئیسلامییەکان، بکرایە بەهەر گەلێکی تر ئێستا لە مێژوویشدا ناوی نەئەما.. سەرەڕای ئەم هەموو پیلان و مەکرە کە ئەکرێ بەم دینەدا ئەبیستین و ئەڵێن: موسڵمان لەناو مۆسکۆدا (٨٠٠) هەزار کەسن، موسڵمانان ئەمڕۆ لە فەڕەنسا (٣) ملیۆنن، لە ئەڵمانیا (٢) ملیۆن و نیون.. لە ئەمریکا (٨) ملیۆنن، وامەزانە ئەمانە هەموویان کۆچەرین و لە وڵاتی ئیسلامیەوە ڕۆیشتوون، ژمارەیەکی زۆریان خەڵکی ئەوێن و دانیشتووی ئەوێن، ئەگەر ئێمە کۆنەپەرست بین، یەکێکمان ئەوێ قەناعەتمان پێ بکات (وامرهم شورى بينهم)مان بۆ لێك بداتەوە، چ کۆنە پەرستییەکی تیایە؟ قەناعەتمان پێ بکات.. کە دەرکەوتووە هەموو شارستانییەك کە ئەوپەڕی ڕاقی ترین شارستانییەتی بێ لە (شوری) دروست ئەبێ، (شوری)، واتە خوێندنەوەی خەڵکی تر و خوێندنەوەی بۆچوونی تر.. ڕێزلێنان لە بیر و باوەڕی تر..

پرس و ڕا، ئەگەر ئێمە دینێکی دواکەوتوومان هەبێ لە ساڵەکانی هەشتادا وەزیری تەعلیمی یابان موسڵمان بوو.. ئەوە کەسێکی (عەوام) نییە، لە ساڵی (١٩٩٣)دا ڕاگری کۆلیژی پزیشکی لە تایلاند ناوی (تاجاتان تاجاسۆن) لە زانکۆی (چانگ مای).. ماوەی (٣) ساڵ دیراسەی قورئانی ئەکرد پاش سێ ساڵ باوەڕی هێنا و موسڵمان بوو.

ئەم ڕاستییە نابێت غافڵ و بێ ئاگابین لێی، چونکە دونیا یان خۆشییە یا ناخۆشییە، حاڵەتی سێهەمی نییە، ئەگەر خۆشی ڕووی تێکردین، ئەڵێین (الحمدلله هذا من فضل ربي ماشاء ألله لاحول ولاقوة إلا بالله) بەمە نیعمەتەکە دەبەستیتەوە،

ئەگەر ناخۆشیش رووی تێکردین ناڕەحەتی و ناخۆشییەکە هەر جۆرێك بێت، ئەگەر ترس بوو! (حسبنا الله ونعم الوکیل) ئەگەر مەکر بوو! (وأفوض أمری إلی الله إن الله بصیر بالعباد) غەم و پەژارە بوو (لاإله إلا أنت سبحانك إني كنت من الضالمين) ئەمانە هەموویان وەلآمیان هەیە لە قورئاندا.. لە حاڵەتی غەم و پەژارەدا وەك حەزرەتی یونس (علیه السلام) کە لەناو سکی حوتەکەدا بوو، ئەو دوعایەی کرد کە لە پێشەوە باشمان کرد ئەی کێ ئەو دوعایەی بۆ گێڕاوینەتەوە؟ خوای گەورە خۆی گێڕاویەتەوە، بەو تاریکە شەوە لەو دەریا قوڵەدا لەناو سکی ئەو حوتەدا، کێ ئاگاداریەتی جگە لەخوا؟! خوای گەورە باسی ئەکات و ئەفەرموێت (لاإله إلا أنت سبحانك إني كنت من الضالمين) (واستجبنا له ونجيناه من الغم و كذلك ننجي المؤمنين) دوعاکەیمان قبوڵ کردوو رزگارمان کرد لەو پەژارە و ناخۆشییە، هەموو باوەڕدارێکیش ئاوەها رزگار ئەکەین، واتە ئەم دوعایە زۆر پیرۆزە..

ئێمە لە سانەوی بووین دەرسی بایۆلۆجیمان هەبوو، مامۆستاکە باسی حوتی بۆ دەکردین وتی: تیرەی گەروی ئەو حوتە (٣٠سم)، زەلام واتە مرۆڤ قوت نادات، باوەڕ مەکەن بە چیرۆکی یونس، منیش (١٧) ساڵ بووم لەو کاتەداو دەستم هەڵبڕی و وتم: چۆن باوەڕ ناکەیت بە قورئان و بەم شێوەیە کەمێك توندڕەویم تیادا بوو.. مامۆستاکەش وتی: ئەمە عیلمە لەسەر تەختەکە وێنەیەکی گەورەی کرد و وتی ئەمە حوتە و نوکتەیەکی داناو وتی: ئەمە مرۆڤە خۆی زۆر گەورەیە، بەلآم گەروی (٣٠سم)ە، مرۆڤ قوت نادات، ئیترعیلم وا ئەڵێت تۆ کەیفی خۆتە باوەڕ ئەکەیت یان نا، هاتمەوە زۆر ناڕەحەت بووم، ئیمامی مزگەوتەکەمان یەکسەر زانی زۆر ناڕەحەتم لێی پرسیم وتم: شتێکی وەها هەیە وتی وەرە.. منی بردە ماڵی خۆیان دوا گۆڤاری (الصین جدیدە)ی دامێ کە لە چین دەرچووبوو.. لە

گۆڤارەکــەدا حوتێکیــان گرتبــوو بــە (٨) ســلنگ بەرزکراوەتــەوە.. دەمەکــەیان کردۆتــەوە کۆڵەکەیان بـۆ دانـاوە، نـەك تـەنها مـرۆڤ بـەڵکو لاندرۆڤـەرێك چـووتە ژوورەوە، وەکـو لـە وێنـەی ئـەو گۆڤـارەدا تیایـابوو، سـەقفی لاندرۆڤەرەکـە هێـشتا مابوو بەر قورگی حوتەکە بکەوێت، وتـی ئەمـە ببـەرەوە و پیـشانی مامۆسـتاکەتی بدە، هەر حەزم دەکرد کە سبەینێ بێت، بۆئەوەی خێرا ئەو گۆڤارەی بۆ ببـەم، بـو بە سبەینێ و بۆم برد، ئەویش پێش من خوێندبوویەوە، وتی بەڵێ راسـتە تـاوەکو ئـەو رۆژە عـیلم بـاوەڕی نەئـەکرد کـە حـوت مـرۆڤ قـوت بـدات، بـاوەڕ بکـەن بـەو چیرۆکە.

لێرەدا مەبەسـتمان ئـەوە نییـە کـە عـیلم بیـسەلمێنێ یـان نەیـسەلمێنێ، زۆر شـتمان هەیە لە قورئاندا، ئەگـەر عـیلم نەیـسەلمێنێ گـرنگ نییـە لای ئێمـە سـبەینێ هـەر دانی پیا ئەنرێت.

# باسی دووەم
# تەکفیر نەکردنی کۆمەڵگا

**خوای گەورە سێ هێزی داوە بە مرۆڤ:**

**١- هێزێك لە جەستەدایە.**

**٢- هێزێکی فیکری کە لە ژیریدایە.**

**٣- هێزێکی دەروونی (شعوری).**

**ئێمە هەمووومان جەستە و بەدەنمان نەخۆش ئەکەوێت، وە نەخۆش کەوتووین، نەخۆشییەکان هەندێکیان بۆمان ئەگوێزرێتەوە لە خواردنی پیسەوە، لە هەوای پیسەوە، لە مێرو و میکرۆباتەوە، هەندێك ئامادەیە بۆ نەخۆشی بەشێوەیەکی بۆماوەیی (الوراثیة) بۆمان ئەگوێزرێتەوە.**

**توێژینەوەی نوێ لە زانستی پزیشکیدا زۆر شت ئەگەڕێنێتەوە بۆ (وراثة) بۆماوە.. یەکێك باوکی لە تەمەنی (٤٠) یان (٤٥) ساڵیدا تووشی شەکرە بوبێت، مانای وەهایە کە ئەو کەسەش ئامادەیی تێدایە بۆ ئەو نەخۆشییە، یاخود دایکی لەتەمەنێکی زۆر کەمدا کۆچی دوایی کردووە بە نەخۆشی دڵ، ئەگەرێکی زۆر هەیە کە ئەو کەسەش ئەو ئامادەبوونەی تیادابێت بۆ ئەو نەخۆشییانە.. واتە ئەم نەخۆشییانە چ لە دەرەوە بێت بۆ مرۆڤ، یاخود خۆی ئەم نەخۆشیەی هەبێت، ئەبێت ئەو مرۆڤە هەوڵبدات خۆی بپارێزێت.. یەکێك لە نیشانەکانی شارستانییەت ئەوەیە کە لە نێوان دووماوەی دیاریکراودا مرۆڤ بچێت بۆلای بزیشك و کۆمەڵێ فحوصات بۆ هەموو ئەندامەکانی لەشی ئەنجام بدات.. پەستانی**

خوێنی وەربگرێت و فەحصی خوێنی بکات (إن لبدنك عليك حقا)[٦] پێویستە مرۆڤ پارێزگارییەکی باشی ئەم کەشتی گیان و مێشکەی بکات.

بەلاّم خۆزگە بەهەمان توانا و بەهەمان بۆچوون، مرۆڤ هەوڵ بدات نەخۆشییەکانی دەروونی خۆی بدۆزێتەوە . نەخۆشییە فیکرییەکانی خۆی بدۆزێتەوەو چارەسەریان بکات.

وەکو لە فەرموودەی (الصحیح)دا هاتووە، ئیمان، بە کرداری چاك بەرز ئەبێتەوە، سەرپێچی خوای گەورە واتە (گوناه) نزم ئەبێتەوە.

ئێمەش پێویستە جاربەجار بڕۆینە لای ئەو پزیشکە تاکو بزانین پەستانی ئیمانمان چۆنە؟ شەکرەی ئیمانمان چۆنە؟ هیمۆگلۆبینی ڕەوشتمان چۆنە؟ ئایا لە سنوری شەرع دەرچووە یان نا؟! وە پزیشکەکەمان حەزرەتی محمد المصطفی (د.خ) فەموودە و فەرمایشتەکانی هەموویان لەبەر دەستماندایە، ئەوە بکەین بە پێوەرێك بۆ پێوانی فیکر و سۆزمان.

جا ئەوەی کە زانایانی موسڵمان هەستیان پێکردووە، چەند نەخۆشییەك هاتووەتە ناو عەقڵی هەندێك موسڵمانی وڵاتی ئێمە، وە ڕەگێکی داکوتاوە لە عەقڵیاندا، دەستێکی بێگانەش هەیە پاڵ بەم نەخۆشییەوە دەنێ، کە بڵاو بێتەوە لە کوردستانی ئازیزماندا.. لەونەخۆشییە فیکریانە:

---

٦ - ١١٤٠٧٨آخى النبي صلى الله عليه وسلم بين سلمان وأبي الدرداء ، فزار سلمان أبا الدرداء ، فرأى أم الدرداء متبذلة ، فقال لها : ما شأنك ؟ . قالت : أخوك أبو الدرداء ليس له حاجة في الدنيا . فجاء أبو الدرداء ، فصنع له طعاما ، فقال : كل ، قال : فإني صائم ، قال : ما أنا بآكل حتى تأكل ، قال : فأكل ، فلما كان الليل ذهب أبو الدرداء يقوم ، قال : نم ، فنام ، ثم ذهب يقوم ، فقال : نم ، فلما كان من آخر الليل ، قال سلمان : قم الآن ، فصليا ، فقال له سلمان : إن لربك عليك حقا ، ولنفسك عليك حقا ، ولأهلك عليك حقا ، فأعط كل ذي حق حقه ، فأتى النبي صلى الله عليه وسلم فذكر ذلك له ، فقال النبي صلى الله عليه وسلم : صدق سلمان الراوي :أبو جحيفة السوائي) صحابي - (خلاصة الدرجة- صحيح - المحدث :البخاري - المصدر :الجامع الصحيح - الصفحة أو الرقم١٩٦٨

یەکەم / کافرکردنی کۆمەڵگایە.. لاوێکی موسڵمان یەك دوو نامیلکە و کتێب ئەخوێنێتەوە.. یەك دوو کەس ئەبینێت، ئیتر وەها ئەزانێ کە هەموو شتێك تێگەیشتووە، پێوەرێك دائەنێ، وەئەوەی کە هاتووچۆی مزگەوت نەکات بە کافری دائەنێت.

ئەم جۆرە نەخۆشییە لە وڵاتی ئێمە دروست نەبووە، بەڵکو لە شوێنێکی ترەوە هاتووە، بەتایبەت ئەو وڵاتانەی کە زۆر ئازاری موسڵمانانیان داوە و هەندێکیشیان شەهید بوون لەژێر ئازار و ئەشکەنجەی بەندیخانەکاندا.. وەکاتێك ئازاد کراون، جۆرە رقێکیان لەدڵدا بۆ دروست بووە بەرامبەر بەو حکومەتەی کەسزای داون، حکومەتەکانیان بەکافر داناوە، وە ئەو میللەتەش لەبەرئەوەی کە بێ دەنگ بووە و بەهیچ جۆرێك بەرگری لەمان نەکردووە، بەم شێوەیە میللەتەکەشیان کردووە بەکافر، ئەم جۆرە فیکرە چەوتە هاتووە لە مێشکی هەندێ موسڵمانانی وڵاتی ئێمەدا چەسپ بووە.

ئێمەش هەوڵ ئەدەین پشت بەخوای گەورە بە بژاری شەریعەتی پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەو گژوگیایە لەمێشکیان لابەرین، بۆ ئەوەی ئەمامی ئیمان سەلامەت بێت، پێیان ئەڵێین: کە لە پێغەمبەری خوایان پرسی (د.خ) ئیمان چییە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە شایەتی بدەیت لەسەر تاك و تەنهایی خواو شایەتی بدەیت لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (د.خ) نێردراوی خوایە، بۆیە وتی (شهادة) ئەو مرۆڤە داخڵ ئەکاتە ناو بازنەی ئیسلام.. ئەگەر ئەو خاڵە گرنگ نەبوایە، پێغەمبەری خوا (د.خ) هێندە داکۆکی نەئەکرد لە (ابو طالب)ی مامی کەشایەتمان بهێنێت، چونکە ئەو شایەتمانە ئەیگوێزێتەوە لە وڵاتی (کفر)ەوە بۆ سنوری ئیمان...

بۆیە بەو جۆرە کەسانە ئەڵێین: بەچ حەقێك بە چ بەڵگەیەك میللەتێکی گەورە، کۆمەڵگەیەکی گەورە کافر ئەکەیت؟! ئیمان شتێکە لە دڵدایە وەتەنها خوای گەورە

پێی ئەزانێت، ئێمە رووی دەرەوەمان لەسەرە..هەزاران خەڵك هەن لە کەسوکارمان لەم میللەتە ئەرکەکانی ئیسلام بەجێ ناهێنن، بۆمان نییە پێیان بڵێین (کافر)، کە وتی (لاإله ألا ألله محمد رسول الله) ئیتر ئەو مرۆڤە موسڵمانە، بەڵام بەجێ هێنانی فەرزەکان کە لە دیندا پێی ئەوترێت (ما معلوم من الدين بالضرورة) ئەکەوێتە دوو حاڵەتەوە:

١- بەجێی ناهێنێت، لەبەر ئەوەی کاتی نییە، لەبەرئەوەی کەمتەرخەمی ئەکات، یاخود لەبەر تەمەڵی. . ئەوە زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەوەی کە بەجێی ناهێنێت، چونکە باوەڕی پێی نییە.. بۆ نموونە لە کەسێك ئەپرسن بۆ نوێژ ناکەیت، ئەڵێ بۆم ناکرێ کاتم نییە و باوەڕی هەیە بە نوێژ، بەڵام نایکات، ئەوە پێی ئەوترێت (عاصی) واتە یاخی.. یان پێی ئەوترێت (فاسق) پێی ناوترێ (کافر).

٢- بەڵام ئەوەی نکوڵی لە نوێژ و فەرزەکانی تری ئیسلام ئەکات و ئەوەی پێی ئەوترێت (مامعلوم من الدين بالضرورة) ئەوە خۆی خۆی کافر ئەکات.. جا ئەو جۆرە کەسانە کە بەرەش بینی سەیری کۆمەڵگا ئەکەن، فەرموودەیەکیان بیر ئەخەینەوە کە پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێ (ئەو موسڵمانە کە نەعلەت ئەنێرێت بۆ موسڵمانێك ئەبێت ئەو لەعنەتە ساغ ببێتەوە بەسەر یەکێکیاندا) یان ئەوەی کە قسەکەی کردووە، یان ئەوەی کە قسەکەی پێ وتراوە.. ئەم لەعنەتە بەرز ئەبێتەوە بۆ بارەگای خوای گەورە، لە رێگەی ئەو چاودێرانەوە کە خوای گەورە دایناون لەسەر شانمان.. ئەگەر لە (لوح المحفوظ)دا ئەوەی کە قسەکەی پێ وتراوە نووسرابوو کافر، لەوانەیە ئەو کەسە تووشی هیچ گرفتێك نەبێت، بەڵام ئەگەر نەنوسرابوو؟! ئەوا ئەو لەعنەتە دێتە خوارەوە بۆسەری ئەوکەسەی کە قسەکەی کردووە و پێی کافر ئەبێت، ئەگەر تەوبە نەکات و بمرێت، بە کافری ئەمرێت.

ئیمان، ئەگەر کەسێك شایەتمانی هێنا بە زمان، ئەوا پێی ئەوترێ ئیماندار، بەڵام بەشەکەی تر کە جێبەجێی ئەکات یان نایکات، ئەگەر نەیکردوو ئیمانی هەبوو بەو شتانە، ناتوانێت پێی بڵێیت کافر، لە عەقیدەی طحاویدا لە خاڵی (٥٧ - ٥٨) دا ئەفەرموێت: هەرچی ئەهلی قیبلە هەیە هەر گوناهێك بکات تۆبوێت نییە پێی بڵێیت کافر، تەنها مەگەر ئەو کەسە بڵێت ئەو گوناهە حەڵاڵە.. تەنها لەو حاڵەتەدا کە حەلاڵ ئەکات بە حەرام، ئەوە خۆی خۆی کافر ئەکات.

دووەم / جۆرێکی تر لەو نەخۆشییەی کە زۆر لە موسڵمانان ئەکەونە پلەیەك لە رەشبینی و نائومێدییەوە (یأس)، ئەڵێ ئەم کۆمەڵگەیە بەمن چارە ناکرێ... کۆمەڵگاکە بەکافر دانانێت، بەڵام لێیان بێ ئومێد ئەبێ و ئەڵێت ئەم هەموو هەڵە و گوناهە بەمن چارە ناکرێت، ئەڵێت لە ماڵی خۆمدا دائەنیشم و زیکر و یادی خوای گەورە ئەکەم، حەقم نییە بەسەر خەڵکەوە.. بەراستی ئەمە جۆرێکە لە گۆشە گیری، بەو جۆرە کەسانە ئەڵێن: گۆشە گیری (إنعزالية) ئەمیش دوو بەشە:

١- بەشێکیان دەروونیە.

٢- بەشێکیان لە کرداردایە.

ئەم دوو شتە تێکەڵ ئەکرێن، هەمووومان ئەزانین موسڵمان کە ئەچێ تێکەڵی لەگەڵ خەڵکیدا ئەکات، و سەرێکی بازاڕ ئەدات، ئیتر زیانی پێ ئەگات.. حەرام ئەبینێ.. حەرام ئەبیستێ.. هەست و دەروونی بریندار ئەبێ.. فکری ئازاری پێ ئەگات گیرفانی ئازاری پێ ئەگات، فێڵی لێ ئەکرێت..ئەمانە هەموومان لە ژیانی رۆژانەماندا هەستی پێ ئەکەین، هەموو ئیماندارێك ئازاری پێ ئەگات.. ئەو گۆشە گیرییە دەروونیە (شعوریە) ئەبێت لە هەمووماندا هەبێت لەناخی دڵمانەوە ئێمە هاوار ئەکەین و ئەڵێین (کۆمەڵگا) من لە هەموو داب و نەریتێکی ناشیریندا لەگەڵتا نیم.. (کۆمەڵگا) من لەگەڵ ئەو، سوو خواردنەنیم، کە پێغەمبەری خوا

(د.خ) ئەفەرموێت: یەك درهەم سوو گوناهەكەی لای خوای گەورە بەسی و شەش جار زینا حسابە لەگەڵ دایكتدا[٧].. لە حەدیسێكی تردا: لەگەڵ دایكتدا ئەو تاوانەت لە بانی كەعبە ئەنجام دابێ!! ئێمە هەموو ئەبێ ئەو هەستەمان هەبێ: كۆمەڵگەی ئێمە هەموو بێ بەرین لەو كردارەتان.. بێ بەرین لەو قومار بازیەی كە ئەكرێ.. لەو زوڵمەی كە ئەكرێ.. لەو بەرەڵاییەی كە ئەكرێ. . لەو عەرە قفرۆشتنەی كە ئەفرۆشرێت و ئەكرِدرێت و ئەخورێتەوە و ئەم هەموو (محرمات)اتە ئێمە هەموو دژ بەو شتانە ئەوەستین، بەڵام ئەم گۆشە گیریە دەروونییە نابێ تێكەڵی ژینی رۆژانەمان و كردارمانی بكەین..

ئایین پێمان ناڵێت مەرجە كە تۆ مرۆڤی (فاسق)ت خۆش بوێت، خوای گەورە یاخود پێغەمبەر (د.خ) فەرمانمان پێ ناكات ئێمە ئەبێت (فاسق) و (فاجر)مان خۆشبوێت. . بەڵام ئەبێ بشزانین كە ئەمانە مافیان هەیە بە سەرمانەوە و واجباتێك هەیە لەسەرمان بەرامبەریان، باوك و دایك هەرچەندێك خراپبن، ئەبێ تۆ لەگەڵیاندا باش بیت، تەنها لەیەك كاتدا مرۆڤی باوەڕدار بۆی هەیە كە بەقسەی دایك و باوكی نەكات.. ئەگەر فەرمانت پێ بكەن كە غەیری خوای گەورە بپەرستیت.. (وإن جاهداك على أن تشرك بي ماليس لك به علم فلا تطعهما..) بەهەمان شێوە خوای گەورە فەرمانمان پێ ئەكات كە لەگەڵ دایك و باوكماندا بژین بە (معروف) (وصاحبهما في الدنيا معروفا..) پێناسەی (معروف) ئەوەیە: هەموو واجبێك پێی ئەوترێ معروف.. ئیتر ئەو باوك و دایكە با هاو فكرت

---

٧ - ٧٣٦٣٣درهم ربا يأكله الرجل وهو يعلم ؛ أشد من ستة وثلاثين زنية .
الراوي :عبدالله بن حنظلة بن أبي عامر - خلاصة الدرجة :صحيح - المحدث :الألباني - المصدر :صحيح الترغيب - الصفحة أو الرقم ١٨٥٥

نەبن.. با هاو دینت نەبن، مەرجە باوەڕدار لەگەڵیاندا باش بێت... کاتێك دێینە سەر دراوسێ، چەندین فەرموودەی پیرۆز هەیە کە باسی دراوسێ ئەکات (مازال جبريل يوصيني بالجار حتى ظننت أنه سيورثه...)[8] حەزرەت ئەفەرموێ: هێندە جبرەئیل ئامۆژگاری کردم کە چاك بم لەگەڵ دراوسێکەمدا وام ئەزانی میراتی بەرئەکەوێت.. هەروەها لەفەرموودەیەکی شیرینی تردا پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێ (والله لايؤمن.. قيل من يارسول الله؟ قال من لايؤمن جاره بوائقه)[9] واتە سوێند بەخوای گەورە ناگەنە پلەی ئیمانی راستەقینە، تاوەکو دراوسێکانتان پارێزراو نەبن لە زیانی ئێوە.. هەروەها لە شوێنێکی تردا ئەفەرموێت (والله لايؤمن من بات شبعانا وجاره جائع..)[10] واتە سوێند بەخوای گەورە، کەسێك بە

---

[8] - ٢٠٣٥٩٤أن عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما ذبحت له شاة في أهله فلما جاء قال أهديتم لجارنا اليهودي أهديتم لجارنا اليهودي سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول مازال جبريل يوصيني بالجار حتى ظننت أنه سيورثه.

الراوي :عبدالله بن عمرو بن العاص - خلاصة الدرجة :روي هذا المتن من طرق كثيرة - المحدث : المنذري - المصدر :الترغيب والترهيب - الصفحة أو الرقم ٣/٢٢٦

[9] رياض الصالحين/رقم: ٣٠٧صحيح رواه بخاري و مسلم. بەڵام بەمەتنێکی کەمێ جیاواز.

[10] بەچەند مەتنێکی جیاواز هاتووە: - ٢١٢٨٣٨ما آمن بي من بات شبعانا وجاره جائع بجنبه وهو يعلم به / الراوي :أنس - خلاصة الدرجة :منكر - المحدث :الذهبي - المصدر : حقوق الجار - الصفحة أو الرقم ٧٣ : - ٧٥٧٠٥ما آمن بي من بات شبعانا وجاره جائع إلى جنبه وهو يعلم / الراوي :أنس بن مالك - خلاصة الدرجة :صحيح لغيره - المحدث : الألباني - المصدر :صحيح الترغيب - الصفحة أو الرقم ٢٥٦١

باوەڕدار نادرێتە قەڵەم لای خوای گەورە ئەگەر بەتێری بمێنێتەوە و دراوسێکەیان برسی بێت..

دراوسێ هەر ئەوەندە نییە دیوار بە دیوارەوە بێت، فەرمانبەریت لە فەرمانگەیەك، فەرمانبەرەکانی دەوروبەرت فەرمانبەری ژوورەکانی دەوروبەرت دراوسێتن.. لە کارگەیەکدا کار ئەکەیت هۆڵەکانی ئەملاولات دراوسێتن.. ئیتر لە ئیسلامدا دیاری نەکراوە، دراوسێکەت هاوفکرتە، یاخود هاوفکرت نییە، دژت وەستاوە یاخود دژت نییە، لەبەرئەوە پێویستە ئێمە گۆشەگیری دەروونی و گۆشەگیری لە کردار و جووڵەدا لە یەکتر جیا بکەینەوە.. لەئیسلامدا گۆشەگیری لە کرداردا ڕەوا نییە، پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێ: چاکترین کەس، ئەو کەسەیە کە سوودی هەیە بۆ خەڵك واتە بۆ هەموو کەسێك. .

سێیەم: نەخۆشی سێهەم خێر نەکردن لەگەڵ غەیری ئەوانەی کە پابەندی تەواویان بە دینەوە نییە.. ئەڵێت ئەو خێرە بۆ بدەم بەو خۆ موسڵمان نییە، ئەم ڕستەیە (خۆ موسڵمان نییە) زۆر گەورەیە کە لە دەم دێتە دەرەوە، چونکە خوای گەورە کۆمەڵگای کردووە بە دوو بەشەوە (هو الذي خلقكم فمنكم كافر ومنكم مؤمن) خوای گەورە نەیکردووین بەسێ بەشەوە، بەڵکو یان باوەڕدارین یان کافرین کاتێك ئەوترێ ئەو کەسە موسڵمان نییە واتە کردووتە بە کافر واتە لەعنەتت لێکردووە.. مرۆڤ گەر ئاگادار نەبێ پێی کافر ئەبێت.. جا لێرەدا فەرموودەیەکی پێغەمبەر هەیە (د.خ) ئیمامی ئەحمەد و ترمذی و لەفزەکەی هی ابن ماجەیە ریوایەتی ئەکەن ئەڵێت (المؤمن الذي يخالط الناس ويصبر على أذاهم خير من المؤمن الذي لايخالط الناس ولايصبر على أذاهم) واتە: ئەو ئیماندارەی کە تێکەڵ بە خەڵك ئەبێت و بەرگەی زەرەر و زیانیان ئەگرێت زۆر پلەی بەرزترە

لای خوای گەورە لەو ئیماندارەی کە گۆشە گیرە تێکەڵی لەگەڵ خەڵکیدا ناکات. .. ئەمەش رێبازی پێغەمبەرانە (علی نبینا و علیهم الصلاة والسلام) ئەبێت بچینە ناو کۆمەڵگەوە و چاکەکاربین، بەڵام ئەگەر تۆ لەگەڵ کۆمەڵێکی نوێژ کەردا دابنیشیت و تێکەڵیت لەگەڵ ئەم و ئەودا نەبێت، ئەوە چۆن چاکەکاری دروست ئەبێت؟! بەڵام دراوسێکەت کە مافی هەیە بەسەرتەوە کەس و کارەکەت خزمت.. ئامۆزایەکت هەیە با نوێژ نەکات، ئەبێت لە تەنگانەدا فریای بکەویت.. بەو جۆرە خەڵك لە موسڵمان تێئەگات..

ئیمامی أعظم (أبو حنیفة) (خوای لێ رازی بێت)، ئاشکرایە کە ئەم پیاوە (نیعمان بن ثابت بن زوطي) (٤٠) ساڵ نوێژی بەیانی کردووە بە دەستنوێژی بانگی خەوتنان! دوای ئەوەی کە هەتاو دەرکەوتووە.. دوای ئەوەی کە نوێژی (ضحی)ی کردووە، چێشت هەنگاو نوستووە.. هەتا بانگی نیوەڕۆ، ئەوە هەموو نوستنەکەی بووە! دراوسێیەکی جوولەکەی هەبووە، ئەو دراوسێ جوولەکەیە ئەیزانی کە (أبو حەنیفە) شەو نانوێت و خەریکی پەرستش و شەونوێژ و نووسینە.. گۆرانی و هەراو دەنگە دەنگی ئەکرد بۆئەوەی بێزاری بکات.. ماوەی چەند ساڵ بەم شێوەیە بوو، لەبەر مافی دراوسێیەتی رۆژێك لە رۆژان ئەبوحەنیفە سەرزەنشتی ئەو پیاوەی نەکرد، سێ شەو لەسەر یەك بوو ئەبو حەنیفە سەیر ئەکات دەنگە دەنگی کابرا نییە، بۆ رۆژی چوارەم چوو لە دەرگای ماڵەکەیانی داو خێزانی ئەو جوولەکەیە هاتە دەرێ، ئەبو حەنیفە سەلامی لێکرد و ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە و وتی: مێردەکەت دیار نییە؟! ئافرەتەکەش دەستی کرد بە گریان و وتی: بە سەرخۆشی لەسەر شەقام گیراوە و براوە بۆ بەندیخانە.

ئاشکرایە لای بەڕێزتان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا هەموو فەسادێکی ئاشکرا یاساغ ئەکرێ لەناو ماڵی خۆیدا ئازادی هەیە هەرچیەك ئەکرێ، بەڵام مافی گشتی

یاخود بڵێین رژێمێکی گشتی هەیە نابێت تێك بدرێت، ئیتر ئەم سەرخۆش بووە و لەوانە قسەی ناشیرینی کردبێت، گیراوە، ئەبو حەنیفە لەبەر مافە دراوسێیەتی ئەڕواتە کۆشکی خەلافەتی ئیسلامی، وە خەلیفە زۆر خۆشحاڵە کە ئەبو حەنیفە رووی کردۆتە کۆشك، داوای لێبوردن ئەکات و ئەڵێ ناتوانم دابنیشم، بەلاّم ئەو تکایەم هەیە کە دراوسێیەکی جولەکەم گیراوە، لەبەر خاتری من ئازادی بکەن، ئەمیری ئیمانداران ئەڵێت: لەبەر خاتری تۆ چی لە بەندیخانەدا هەیە و لەسەر ئەو تاوانە گیراوە من ئازادیان ئەکەم کە نزیکەی (٤٠) کەسێك ئەبن.. خەبەرەکە ئەبرێت بۆ کابرای جولەکە و ئەڵێن ئەبو حەنیفە فریای تۆ کەوت و لەبەر خاتری تۆش ئەم هەموو تاوانبارەی تر ئازاد کرا، دێت بۆلای ئەبو حەنیفە پێی ئەڵێت: من چەند وەختە ئازارت ئەدەم.. چەند وەختە بێزارت ئەکەم، تۆ بۆچی ئاوا باش بوویت لەگەڵم؟! ئەویش ئەفەرموێ: دینەکەم فەرمانم پێ ئەکات کە بەو شێوەیە بم، کابرا ئەڵێت: دینێك بەم شێوەیە بێت، مەرج بێ بێمە سەر ئەم دینە، کابرا شایەتمانی هێناو موسڵمان بوو.

بۆیە موسڵمان نابێت گۆشە گیری هەبێت لە کرداریدا.. لە هەست و دەرونی خۆیدا نەهی ئەو هەموو خراپە و تاوان و بەد رەوشتییە ئەکات، بۆ نموونە هەندێ دوکاندار میوەیەك، سەوزەیەك، هتد جوانی داناوە، هەتا ئاوڕ ئەدەیتەوە، دوو سێ شتی خراپی لەگەڵدا تێکەڵ ئەکات، لە فەرمانگەکەماندا خراپەکاری هەیە.. لە هەموو شوێنێك بەرتیل خواردن هەیە.. ئێمە نکوڵی ئەمانە ئەکەین، بەلاّم کە دێتە سەر ژیانی کرداریمان، هەر کەسێ داوای یارمەتی لێکردین ئەبێ دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەین.. هەر کەسێ پێویستی پێمان بوو، پێویستە بچین بە دەمیەوە.









لێرەدا چەند شتێك بیری بەڕێزتان ئەخەینەوە کە فەرمودەی صەحیحن کە پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێت: (الكلمة الطيبة صدقه)[11] بەم شێومیە وشەی جوان و چاك بە (صدقه) ئەژمێردرێت، بۆ هەرکەسێکی پێشکەش بکەیت (صدقه)یە.

ئێمە لە ژیانماندا تووشمان بووە بە خەڵکێکی زۆر خراپەوە، هەر بە دڕندە هاتوونەتەبەرچاومان، ئەبێ بزانین کە مرۆڤ راستەوخۆ چاوەکانی خێر نابینن، ئێمە نەگەیشتووینەتە پلەی پیاوچاکان و (أولياء) تاکو بتوانین یەکسەر خەڵکی بناسین.. ئەو لێهاتوویی و لێوەشاوەییەی کە خوای گەورە ئەیبەخشێ بە خۆشەویستانی خۆی، ئێمە نەگەیشتووینەتە ئەو پلەیە، بەڵام ئەبێ ئارام بگرین لەکاتی مامەڵە کردنماندا لەگەڵ خەڵکیدا، وردە وردە دڕندەی وا هەبووە، کە تێکەڵی لەگەڵیدا ئەکەیت، سەیر ئەکەیت لە ژینگەیەکدا ژیاوە، کە هەر لە منداڵیەوە هەوای درۆو کەڵەکەبازی و فێڵ وئەم جۆرە شتانەی هەڵمژیوە و بۆتە تەم و مژێك بەسەر دڵیەوە.

پێویستە ئێمە لەگەڵ خوای گەورەدا راست بین، بتوانین کلیلی دڵی ئەو مرۆڤەمان لەلایەن خوای گەورەوە دەست گیر ببێت کە ئەو کلیلەمان دەستکەوت، تەماشا ئەکەین ئەو مرۆڤە دڕندەیە ئەبێتە کەسێکی ملکەچ بۆ خوای گەورە.. و ئەبێتە گەنجینەیەکی خێر. نەفسی خۆمان نەکەینە پێوەر و بڵێین ئەو کەسە خراپە و

---

[11] - ٢٢٥٤كل سلامى من الناس عليه صدقة ، كل يوم تطلع فيه الشمس ، يعدل بين الاثنين صدقة ، ويعين الرجل على دابته فيحمل عليها ، أو يرفع عليها متاعه صدقة ، والكلمة الطيبة صدقة ، وكل خطوة يخطوها إلى الصلاة صدقة ، ويميط الأذى عن الطريق صدقة

الراوي :أبو هريرة - خلاصة الدرجة] :صحيح - [المحدث :البخاري - المصدر :الجامع الصحيح - الصفحة أو الرقم:٢٩٨٩

- ١٤٣١٦٩الكلمة الطيبة صدقة

الراوي :أبو هريرة - خلاصة الدرجة] :صحيح - [المحدث :ابن حبان - المصدر :المقاصد الحسنة - الصفحة أو الرقم ٣٧٨ :

**ئەو کەسەباش نییە و هەوڵدان لەگەڵیدا بێ هودەیە و ئێمە دەبێ لەگەڵ هەموو کەسێك هەوڵبدەین ڕێنموویی (هدایة) لە خوای گەورەوەیە و نابێ چاوەڕوانی ئەنجام بکەین و ئەبێ ئێمە ڕەنجی خۆمانی لەگەڵدا سەرف بکەین.**

**لە صەحیحی بۆخاری موسلیمدا هاتووە (من لایرحم الناس لایرحمە ألله)[١٢] واتە: ئەوەی ڕەحم نەکات بە هەموو کەسێك، خوای گەورە ڕەحمی پێ ناکات.**

**هەروەها فەرمودەیەکیش هەیە کە زۆربەمان بیستومانە ئەڵێت: ئافرەتێك هەمیشە بە ڕۆژوو بوو، شەو نوێژی ئەکرد، هەمیشە دوعا و زیکری ئەکرد، بەڵام پشیلەیەکی بەند کردبوو وە خواردنی نەدایە و ئەو پشیلەیە بە برسێتی فەوتا، پێغەمبەری خوا ئەفەرموێت ئەو ئافرەتە لە ئاگردایە.**

**ئەم دینەی ئێمە یاساغی کردووە ئازاری گیانلەبەرانیش بدەین، ئەی ئەبێ ئازاردانی مرۆڤ چەند گوناهەکەی گەورەبێت؟! ئەبێت هەواو نەفسمان نەکەینە پێوەر، چونکە ئەوە جۆرێکە لە دواکەوتوویی.. هەروەها لە فەرموودەیەکی پیرۆزی تردا هاتووە (لاتنزع الرحمة إلا من شقي) واتە: تەنها لە کەسی سەرگەردان بەزەیی و ڕەحم دەسەنرێتەوە.**

---

[١٢] هەرچەندە ئەم فەرموودە زۆر بیستراوە بەڵام لەسەرچاوەکانی فەرمووده‌دا نەمدۆزیەوە، لەگەڵئەوەشدا ئەم فەرموودەیە هەمان مانا دەدات بەدەستەوە: - ١٨٤٧٦٣ **إنه من لايرحم لا يرحم /الراوي :أبو هريرة - خلاصة الدرجة :صحيح - المحدث :مسلم - المصدر :المسند الصحيح - الصفحة أو الرقم ٢٣١٨**

## باسی سێیەم
## بەهاکان لە روانگەی شارستانیەتە جیاوازەکانەوە

لێرەدا ئەمانەوێت تیشکێك بخەینە سەر هەندێ بەهاو دید و بۆچوونی ئیسلامی سەبارەت بە مرۆڤ و بە ژیان.. لە ئیسلامدا هەموو جۆرە مرۆڤێك مافی و رێزی تایبەتی خۆی هەیە، نەك تەنها مرۆڤ، بەڵكو شوێنیش لە ئیسلامدا رێزی تایبەتی خۆی هەیە، وەكو ئەو شوێنانەی كە خوای تێدا ئەپەرسترێ.. ئەو شوێنەی كە عیلمی تیادا وەرئەگیرێ.. ئەو شوێنەی كە نەخۆشی تیادا تیمار و چارەسەر ئەكرێ.. ماڵ رێزی هەیە، بەهەمان شێوە كاتیش رێزی تایبەتی خۆی هەیە.. كاتی پەرستنی خوای گەورە.. كاتی (سجدە).. كاتی نزاو پاڕانەوە.. كاتی عیلم وەرگرتن.. كاتی فریاكەوتنی خەڵك.. كاتی بەرگری لە نیشتمان.. كاتێك كە دایك شیر ئەدات بە منداڵ.. كاتی ڕەمەزان.. كاتی حەج.. ئەمانە هەموو رێزی خۆیان هەیە.

هەر پەیوەندییەك لەگەڵ خوای گەورە پێی ئەوترێت (ذكر).. فەرموودەی تر كە ئەو واتایە ئەگرێتەوە، هەر كۆمەڵێك لەئیمانداران كۆبن لە ماڵێك، لە خانەیەك لە خانەكانی خوای گەورە، یادی خوای تیادا بكەن، خوای گەورە رەحمەتی خۆی ئەڕژێنێ بەسەریاندا و فریشتەكان دەوریان ئەدەن.

قانونێكی لوبنانی سەرنجی راكێشام، ماددەی (٤٧٣ - ٤٧٤ - ٤٧٥) سزا دائەنێ بۆ هەركەسێك كە پیلانی تێكدان دابنێت بۆ هەر كۆمەڵێ كە خوای گەورە بپەرستن واتە عیبادەتی خوای گەورە بكەن.. ئیتر هەر هۆز و هەر دینێك بێت.. هەر پەرستگایەك بێت، هەر كەسێ تێكیان بدات واتە (تشویش) بخاتە سەریان، قانوون

یاسای لوبنانی سزای بۆ داناوه.. هەر ئەڵێیت لە فەرموودەی بەرزی ئیسلامەوە وەرگیراوە.

ئەم ڕێز و حورمەتانەی کە باسی دەکەین، بۆتە یاساو بۆتە بەند لە مافی مرۆڤدا، ئەو وڵاتە زلهێزانە زۆر بە جوانی جێبەجێی ئەکەن بۆ خۆیان، بەڵام بۆ جگە لە خۆیان هەر مەرەکەبێکە و لەسەر کاغەزە!

تا ساڵی (١٩٢٥) کێشەیەك هەبوو کە مەکینەی ئۆتۆمبیل ئەوانەی بەبەنزین کاردەکەن دەنگی زۆرە.. لەم ساڵەدا واتە ساڵی (١٩٢٥) ماددەیەکیان دروست کرد کە پێی ئەوترێ (Tetra Ethyl Lead) ئەمە ماددەیەکی قورقوشمیە، تێکەڵ بە بەنزین ئەکرێ، ئیتر ئەو دەنگە لە ئۆتۆمبیلدا دروست ناکات پاش چەندین ساڵ و لە حەفتاکاندا بۆیان دەرکەوت کە ئەو قورقوشمە لەگەڵ دوکەڵی ئۆتۆمبیلەکەدا ئەگزۆزیدا دێتە دەروە.. ئەچێتە ناو خوێنی مرۆڤەوە، بەتایبەتی منداڵ، چونکە ماددەیەکی قورسە، چڕیەکەی لە هەوادا زیاترە و ئەنیشێ، لەبەرئەوەی کە منداڵ باڵا کورت ترە لە گەورە، ئەو زیاتر زیانی پێئەگات. هاتن سەد هەزار منداڵیان لە چەندین ولایەت، وەرگرت، پاش فەحس کردن بۆیان دەرکەوت (٣٠٪)یان، واتە سێ هەزار منداڵ ڕێژەی قورقوشم لە لەشیاندا زیاترە لەوەی کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی دایناوە، بۆیە ڕاستەوخۆ بڕیارێکی فیدراڵی دەرچوو بە ڕەزامەندی کۆنگرێس، کە ئەبێت ئەو ماددەیە نەمێنێت.. بەڵام ئەمە لە ڕووی ئابووریەوە تەکلیف زۆر ئەکات و بلیۆنەهای تێ ئەچێت، وتیان: تەندروستی منداڵەکانمان لە هەمووی گرنگترە، بۆیە خێرا ئەو بەنزینەیان دانا کە ( Free Lead)ی پێ ئەوترێ، واتە قورقوشمی تیادا نییە ڕێژەی ئۆکساندنەکەی سەرو (٩٥)ـە.

بەڵام ئێستاش ئەمریکا ئەو مادەیە دروست ئەکات و بە هەزاران تەن ئەنێرێت بۆ ئێمە.. چونکە منداڵی ئێمەیان بەلاوە گرنگ نییە، بەڵام بۆ خۆی بەنزینە چاکەکە بەکار دەهێنێت، ئەو مافی مرۆڤەی کە باسی لێوە ئەکەن، تەنها بۆ خۆیانە.. ئەو قومبەلەیەی دای بەسەر هێرۆشیما و ناکازاکیدا! ناوی دەوڵەتێکم پێ بڵێ کە ئەوروپی بێت و دژ بە بەکارهێنانی ئەو قومبەلەیە وەستا بێت کە ئەمریکا دای بەسەرهێرۆشیما و ناکازاکیدا؟! کەس قسەی نەکرد!

بۆ نموونە کاتێك مۆز بە هێشوو بە سەوزی لێ ئەکرێتەوە، دەرمانێکی پیا ئەکەن و ئەیخەنە ناو نایلۆنەوە و ئەینێرن بۆ ولاتان، دەرکەوت کە ئەو ماددەیەی ئەدرێ لە مۆز بۆنەوەی مێروو تێی نەدات و خراپ نەبێت، ئەو ماددەیە ناهێڵێت هیچ مێروویەك زیان لە مۆزەکە بدات، بەڵام هەر کەسێ ئەو ماددەیەی هەڵمژی ئەوا نەزۆك ئەبێت، زیاتر لە حەوسەد کرێکار لە یەکێك لە ولاتەکانی ئەمریکای لاتینیدا منداڵیان نابێ، بەهۆی ئەوەی ئەو دەرمانەیان هەڵمژیوە.. کەچی ئەمریکا تائێستاش دروستی ئەکات، بەڵام بۆخۆی نا، بەڵکو ئەینێرێت بۆ ولاتانی تر.

هەموو ولاتانی جیهان بڕیارێکیاندا لە حەفتاکاندا دروشمێکیان بەرز کردەوە (Clean water for evry one) واتە: ئاوی پاك بۆ هەموو کەسێك.. ڕۆژانە (٣٠٠٠٠)کەس لە جیهاندا ئەمرێت لەبەرئەوەی ئاوی پاك نییە بیخواتەوە، ملیارێك و ئەوەندە مرۆڤ ئەو ئاوەی کە دەیخواتەوە پاك نییە.. چەندین دەردی بۆ دروست ئەکات و ئەبێتە هۆی مردنیان.

ولاتانی جیهان بڕیارياندا کە پارە کۆبکەنەوە و پرۆژەیەکی ئاوا گەورە و مرۆیی، کە ئاو یەکێکە لە مافەکانی مرۆڤ ئەمریکا و بەریتانیا ڕەزامەندییان نەنواند، ئێستاش ئەو پرۆژەیە جێبەجێ نەکراوە، وارائەگەیەنن کە خۆیان مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ بریتییە لە خواردن و پۆشاك و سەقفێك کە بحەوێتەوە لە

ژێریدا.. ئاویان پشت گوێ خستبوو.. هەمووی چەند ساڵێکە ئاوی پاك بوومتە مافێکی مرۆیی و نووسیویانە، بەلاّم قورئانی پیرۆز (١٤) سەدە لەمەو پێش باسی ئەکات و بە ئادەم ئەڵێت ئەتنێرینە شوێنێکەوە برسیت نابێت، تینوت نابێ و بێ بەرگ نابی هەتاو لێت نادات هۆکاری خانووبەرەی تیادایە ئەو بەهایانەی کە ئێمە هەمانە، بۆ چوون و (تصورات)ی لێ پەیدا ئەبێ، جیاوازە لەگەڵ بۆچوونی ئەوروپیدا، چونکە بەها مرۆییەکانی ئەوان جیاوازە.. هەموو مرۆڤێك پێویستی دەروونی هەیە، بەم کالاّی مرۆڤییە، ئەو پێویستییەی پڕ نابێتەوە.

بە درێژایی مێژوو لە هەمو گۆی زەمیندا دێیەك نییە پەرستگایەکی تیادا نەبووبێ، بۆ ئەوەی پێویستی دەروونی مرۆڤ پڕ بکاتەوە، بەلاّم هی وا هەیە شوێن پێغەمبەرێك کەوتووە و ئەو پەرستاگایەی بۆ یەکتاپەرستی بەکارهێناوە، هی واش هەیە کە سەری لێ شێواوە و، بەشێومیەکی چەوت هەوڵی داوە ئەو پێویستییە پڕ بکاتەوە.. بە درێژایی مێژوو هەیان بووە بەردی پەرستووە، یاخود شاخیان پەرستووە. . ئاژەڵ و ئەستێرمیان پەرستووە.. گرنگ ئەوەیە ئەمە پێویستی مرۆییە..بۆیە ئەم شارستانیەتەی رۆژئاوایە، ئەیەوێت بەهای خۆی بەسەر ئێمەدا بسەپێنێت و ئەیەوێت بتگۆڕێت بە هەموو جۆرێك، بەلاّم پێش ئەوەی باسی شارستانیەتەکە بکەین، بزانن کە ئەو شارستانیەتە دوو رووی هەیە:

١- روویەکیان روویەکی زانستی و تەکنەلۆژییە و بەرهەمی ماددیە، ئەوە هیچ گلەییمان نییە، بەڵکو سوپاسیان ئەکەین و رێزی ئەوە ئەگرین، چونکە ئەو بەرگەی لەبەرماندایە هی ئەوانە.. ئەو ئامێرانەی کە بەکاری ئەهێنین هی ئەوانە.. ئەو ئۆتۆمبیلەی هاتووچۆی پێ ئەکەین هی ئەوانە، وەرنەگرتنی ئەو تەکنۆلۆژیایە، جۆرێکە لە دوا کەوتوویی.

٢- بەڵام ئەوبەشەی تر واتە رووەکەی تری ناردنی بەها مرۆییەکانە، ئەوە بە هەموو جۆرێك ئەبێت دژی بووەستین، گۆڕینی ویژدان.. ئەکەم بە گەنجینەیەك، بەهای باو و باپیرانمانی تیایە، ئەو نرخە شارستانیەتیەی کە هەزاران ساڵە دەگوێزرێتەوە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر، بە میراتی هاتووەبۆ ئێمە ئێمە نابێت ناپاکی و خیانەتی لێ بکەین.. کام کەس ئەگریت لە میللەتەکەماندا و لە کوردەواریدا، با نوێژیش نەکات هەزاران بەهای جوانی تیایە، ئەمانە هەموویان تۆون، هەندێ تۆو تاوەکو نەخرێنە گڵەوە بڕێکی دیاریکراو لەشێ هەڵئەمژێ و بڕێکی دیاریکراو گەرمی هەڵئەمژێ، ناتەقێتەوە، ئەو کەسانەی کە نوێژ ناکەن و پابەندبوونیان نییە بۆدین، ئەو تۆوانەیان نەکەوتووەتە شوێنێکەوە بگەشێتەوە، کاتێك لێیان ورد ئەبینەوەبۆ پرسە (تعزیە) ئەچن.. و بەتەنگ خەڵکەوەن، ئەو نرخە مرۆییانە گوێزراوەتەوە و گەیشتووە پێیان.

بەڵام دوژمنان ئەیانەوێت ئەو نرخانە لابەرن و نرخی تربهێننە جێگەی، کە نرخی تر هاتە شوێنی، ئیتر دید و بۆچوونەکان ئەگۆڕن، ئێستا لەوانەیە زەحمەت بێت لای هەموو کوردێك کە خۆی و خێزانەکەی بە جلێکی کورتەوە بچنە دەرەوەی دوکان و مەلە بکەن لەبەرچاوی خەڵکدا، هیچ کوردێك ئەم کارەی بۆ ئەنجام نادرێت، بەڵام کە بەهاکان گۆڕرا، ئەوکاتە ئەکرێت.

لەبۆچوونی ئیسلامیماندا ئەمە چۆن راڤە ئەکەین؟ ئەڵێین: لە بۆچوونی ئەم دینەماندا بۆ ژیان و مرۆڤ و هەموو روداوێك بۆ هەموو دیاردەیەك ئەبێ بۆچوونێکی ئیسلامیمان هەبێت و بزانین دینەکەی خوای گەورە ئەڵێت چی!

ئەڵێت هەموو خراپەیەك (فساد) هۆیەکەی چوار شتە:

١- نەزانین.

٢- زوڵم.

٣- ئارەزووەکان.

٤- تورەبوون.

کە بەهای برایەتی نەزانێ و بەهای ئەم دینە نەزانێ، واتە مرۆڤێکی نەزانە، بەهای قوربانی دان.. بەهای ئازایەتی.. بەهای لێبوردن.. بەهای وەفا.. و بەهای سەخاوەت نەزانێت واتە ئەو مرۆڤە، مرۆڤێکی نەزانە.

زوڵمیش لەلای هەمووان روون و ئاشکرایە، وەئارەزووەکان کە ئێستا بووەتە شتێك و ئەپەرسترێ، ئەگەر سەیری شارستانیەتی رۆژئاوا بکەین، دەبینین بەهۆی ئارەزووەوە چی بەسەر هاتووە! کە ئەوترێ شارستانیەتی رۆژئاوا، واتە ئەوروپا و بەتایبەت ئەمریکا.. (١١) ملیۆن کەس هەیە لە ئەمریکا بەرەسمی تووشی کەئابە بوون، زۆربەشیان دەرمانەکەیان بۆ ناکڕدرێت، چونکە پاکەتەکەی بە (٦٠)دۆلارە، ئەوانەی کە تووشی نەخۆشی عەقڵی ئەبن، واتە عەقڵیان تێك ئەچێت و ژیریان تێك ئەچێت، (٥٥٪)ی قەرەوێڵەی نەخۆشخانەکانیان داگیر کردووە، نزیکەی (٧٥٠) هەزار کەسن.. لە هەموو رۆژێکدا بەهۆی شوێن کەوتنی ئەم ئارەزووانەوە (٨٤) ئافرەت لە ئەمریکا دەستدرێژی ناموسی لێ ئەکرێت لەلایەن کەسێکەوە، یان کۆمەڵێکەوە بە زۆر!! لە هەمو خولەکێکدا (٢٩) کەس ئەکوژرێت.. ساڵی (١٩٨٦) (٥،٤) ملیۆن خەڵك فەوتا، بەهۆی ئارەزووەکانیانەوە!!

* دۆلار و مەکینە و بەرهەم و رای گشتی.. ئەمانە بوونەتە بتێك و رۆژانە ئەپەرسترێن، لەبەر ئەوە بۆشاییەکی رۆحی زۆر گەورە هەیە کە بەم جۆرە شتانە پڕناکرێتەوە.. ئەو ئەستێرەیەی کە ماوەیەك لەمەوبەر بە شێوەیەکی کلکدار دەرکەوت، لە هەندێ کتێبی رۆژئاواییەکاندا نوسراوە کە لە ئاخرزەماندا بەلای زەویدا ئەڕوات بەرەو بەهەشت ئەچێت، جا مرۆڤ ئەو مرۆڤەیە کە خۆی بکوژێ، بۆ ئەوەی رۆحەکەی بچێتە ناوی و بچێتە بەهەشت!.

چەندین کەس بە کۆمەڵ خۆیان کوشت، کە زۆربەیان رۆشنبیرن.. هەرچەندە منداڵی (٥) ساڵانیان تیادا بوو، بەڵام سەرۆکەکەیان تایبەت مەندبوو لە بواری مۆسیقادا و تەمەنێکی باشی هەبوو، تەنها یەك جار باسیان کرد، بەڵام ئەگەر ئەم رووداوە لەلای ئێمە رووی بدایە، بەهەموو جیهاندا بڵاویان ئەکردەوە.. ئەمە بۆشاییەکی رۆحییە و نازانن بەچی پڕی بکەنەوە.

(٧٥٪)ی ئەو پیاوانەی کە خێزانیان هەیە لە رۆژئاوادا، خیانەت لە خێزانەکانیان ئەکەن.. رێژەی تەڵاق لە ساڵی (١٩٤٠)دا (٢٠٪) بوو، لە ساڵی (١٩٤٦)دا بوو بە (٣٠٪) وە لە ساڵی (١٩٤٨) دا بوو بە (٤٠٪) لە ساڵی (١٩٧٥) دا (١٩٪)ئەمریکا تلیاکیان ئەکێشا.. لە ساڵی (١٩٧٨)دابوو بە (٤٩٪).. ئێستا نازانین لەسەرو پەنجاکانیش تێپەڕیوە! ساڵانە (١٥) هەزار ملیۆن دۆلار سەرف ئەکەن بۆ ئەوەی زیاد نەکات.. ئەی باشە ئەم خەڵکە تلیاك بۆ ئەکێشێ؟! خۆیان (٢٥٠) ملیۆنن لە ساڵەکانی چلەکاندا (٤٢) ملیۆنیان بە بەردەوامی (مشروبات)یان ئەخواردەوە، کە بە بەردەوامی ئەخواتەوە و ناتوانێ بە هیچ کارێك هەڵسێت، ئەبێ ئێستا ئەو رێژەیە چەند بێت؟!

دووبارەی ئەکەمەوە کە بواری تەکنۆلۆژیا زۆر پێشکەوتووە، وڵاتێکن (١٢٢) کۆلیژی پزیشکیان هەیەو، بۆ نموونە فەرەنسا سەدەو نیوێك لەمەوپێش پەیمانگای بۆ شوانەکان هەبوو! بۆئەوەی ببنە شوانێکی چاك ئێمە نکوڵی ئەمانە ناکەین، بەڵام باسی بەها مرۆییەکان ئەکەین کە بە هەموو جۆرێ نەهێڵن بێتە ناومانەوە.. جاری وەها هەیە بە فیلمێك چەند بەهایەکمان ئەفەوتێ، سەیری چەند فیلمێکیان ئەکەین، بەهای تردێتە شوێنی، بەهای خۆخۆیی و من گەرایی و نرخی ماددیەت و نرخی جنس و باوەڕ بەهێز.

ئێمەی موسڵمان گرفتمان لە بەهادا نییە، هێندەمان بەها هەیە، لە قورئان و سوننەتەوە بۆمان هاتووە، بەڵام گرفتمان ئەوەیە، چۆن ئەم نرخە بهێنینە سەردەم و بیهێنینە واقعەکەوە؟! پێویستیمان بە فکری کرداریە لەمەدا کەمتەرخەمین..

چەند نموونەیەکی بەها ئیسلامییەکان.

لەبەهاکاندا چەند نموونەیەك دەهێنینەوە، بۆ نموونە بەهای برایەتی، کە قورئانی پیرۆز ئەفەرمویێت (إنما المؤمنون إخوة) پێغەمبەری خوا (د.خ) بەچ فکرەیەکی کرداری ئەم بەهایانەی هێنایە دونیاوە؟! هات موسڵمانەکانی کرد بەبرا لە کۆچ کردووە کان و پشتیوانەکان کاتێك دەستوری دەوڵەتی دارشت، یەکەم خاڵی دەستورەکە ئەوەبوو کە کردنی بە برا.. ئێمە ئەمڕۆ چ فکرەیەکی کرداریمان هەیە، تاوەکو نرخی برایەتی بچەسپێنین لەناو خۆماندا؟! تەنهاقسەمان هەیە، فکرەیەکی کرداریمان کوا، کە ئێمە بکات بەیەك و بمانکات بەبرای راستەقینە، کەم و کورتیەکەمان ئا لێرەدایە..

بەهای رزگارکردن لە فشاری کۆمەڵایەتی.. پێویستە لەسەر موسڵمان کە هێزی کۆمەڵ لەسەر موسڵمان لابەرێت، لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ) سەلمانی فارسی بەندە (کۆیلە) بوو، هەموو موسڵمانان پەرۆش بوون بۆی، کە لەناو کۆمەڵگاکەی خۆیانەوە رایکرد، پێغەمبەری خوا (د.خ) فەرمووی سەلمان برۆ موکاتەبە بکە لەگەڵ خاوەنەکەتدا، خاوەنەکەی داوای (٢٠٠) مسقاڵ زیوی کرد، لەگەڵ ٣٠٠ نەمامی دار خورما، بۆشی بنێژن، ئینجا ئازادی دەکات، هەموو پارەیان کۆکردەوە، پێغەمبەری خوا (د.خ) بەدەستی پیرۆزی خۆی نەمامەکانی بۆ ئەناشت بۆ ئەوکابرایە.. بۆئەوەی سەلمان بێتە ناو ریزی موسڵمانانەوە و ئازاد بێت.. فکرە کرداریەکە ئاوەها بوو ئایا ئێمە ئەمرۆ چ فکرەیەکی کرداریمان هەیە ناخۆشی و

تەنگانەلابەرین لەسەر براکانمان.. ئیشی نییە ئیشی بۆ بدۆزینەوە.. گیرفانی بەتاڵە شتێك بۆ گیرفانی پەیدا بکەین؟ ئەم جۆرە بیرکرنەوانەمان نییە، بەڵکو تەنها قسە ئەکەین، بۆیە ئاوەها دوا ئەکەوین..

بۆیە ئەبێ هەوڵ بدەین ئەوفکرە کردارییە دروست بکەین ودەست بخەین، لەم دەستە ومستانە رزگار ببین، ئێمە بەهای بیمەی کۆمەیەتیمان هەیە (تکافل الإجتماعي) منداڵێکی کچی بچکۆلە ئەبوبەکری صدیق (خوای لێ رازی بێت) ئەیخستە سەر سنگی، ئەیویست بیخاتە ناو دڵیەوە لێیان پرسی، ئەمە کچی خۆتە؟ فەرمووی: ئەمە کچی پیاوێکە لە خۆم پیاوترە! کچی سەعدی کوڕی رەبیع بوو کە لە شەڕی (ئوحود)دا شەهید بوو، ئەوها هاتن منداڵەکانیان بەخێو کرد! فکرە کردارییەکەی ئەو سەردەمە بۆ بەدیهێنانی ئەو نرخە، بەو شێوەیە ئەبوبەکر کردوویەتی، ئێمە ئەمڕۆ کە موسڵمانێك ئەمرێ، چ فکرەیەکی کرداریمان هەیە بۆ خزمەتی منداڵەکانی؟!

دوا بەها لە کۆتاییدا، کە دونیا یان ژیان ئامانج نییە بەنیسبەت موسڵمانەوە، بەڵکو هۆکارێکە بۆ رازیکردنی خوای گەورە.

سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب، بە دەوری کەعبەدا تەوافی کرد، هیشامی کوڕی عبد الملك کە خەلیفەی موسڵمانان بوو لە دیمەشقەوە هاتبوو بۆ مەککە، لەناو حەرەمی شەریفی کەعبەدا قسەی لەگەڵدا کردو وتی سالم شتێکم لێ داوا بکە بۆت جێبەجێ بکەم، سالم وتی ئەی ئەمیری بڕواداران من شەرم ئەکەم داوای شت بکەم کاتێ من لەناو ماڵی خوادام! دوای (تەواف)ەکە چووە دەرەوە، ئەو دوای کەوت، لە کۆڵانێکدا گرتیەوە، وتی سالم داوای شتێکم لێ بکە بۆت جێبەجێ بکەم وتی: لە کاروباری دونیادا، یان لە کاروباری قیامەت؟ خەلیفە تەریق بووەوە وشەرمەزار بوو، چونکە کاروباری قیامەتی پێ ناکرێ، وتی بێگومان لە کاروباری

دونیادا، سالم وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران من لە خاوەنەکەیم داوا نەکردووە، لەتۆی چۆن داواکەم؟! ئەو فکرە کردارییە ئاوەها جێبەجێ کراوە، ئێمە ئەمڕۆ چیمان پێیە؟

## باسی چوارەم

## ئەو پرسیارانەی کە لەخۆ ئەکرێن

چەند پرسیارێك هەیە، هەموو مرۆڤێك کاتێك کە فام ئەکاتەوە، لەخۆی ئەکات، (کێ ؟) ( بۆ ؟) (چۆن ؟) ( چی ؟) کێ دروستی کردووم؟ بۆچی منی دروست کردووە؟ کێ ئەم بونەوەرەی دروست کردووە؟ چۆن کۆنترۆڵی ئەکات؟ کێ من ئەبات بەڕێوە؟ هەزاران جۆر کارلێك لە لەشی مرۆڤدا ڕووئەدات لە ڕژێن و هۆرمۆنات و هەرس کردنی خواردن و هەڵمژینی خواردن و کۆنترۆڵی چەوری خوێن و ئامێری پاراستنی خوێن و لیمف و هەناسەدان و دمیان و سەدان هەزار شتی ئاوەها کەویستی تۆی تیا نییە.. هەموو کەسێك ئەو پرسیارانە لەخۆی ئەکات، بەڵام ئێمە ئەوکێشانەمان نییە، چونکە ئیسلام هەمووی بۆ چارەسەر کردووین، ئەو کەسەی بیەوێت وەڵامی دەست کەوێت لە دەرەوەی ئیسلام، هەرگیز دڵنیا نابێت.

سێ یابانی چوون بۆ میصر، یەکێکیان مامۆستای سانەوی بوو، یەکێکی تریان پزیشك.. ئەوەی تریشیان بەڕێوەبەری کۆمپانیایەك، چوون بۆ ئەزهەر بۆ دیراسەتی ئیسلام پاش ئەوەی بوون بە موسڵمان.. ئەم سیانە کە باسیان ئەکەین، خۆ هەر تەنها ئەم سیانە نین موسڵمان بووبن لە ژاپۆندا، هەزاران هەن لەوانە وەزیری خوێندنی باڵا کە پێش ساڵی (١٩٩٠) موسڵمان بوو، هۆی موسڵمانبوونی ئەم سیانە تێپەڕینیان بوو بەلای مزگەوتی (تۆکیۆ)دا، کاتی نوێژی جەماعەت بوو، چۆنێتی ڕیز بوونی موسڵمانان لە نوێژدا و بەیەکەوە جوڵەکردنیان دوای ئیمام، بوو بەهۆی ئەوەی بیربکەنەوە و بزانن ئەمانە کێن ؟ چ دینێکن؟

پێشەوایان کێیە؟ پاك و خاوێنی مزگەوتەکە و پاك و خاوێنی ئەو ئیماندارانە و چۆنیەتی ریزبوونیان لە هیچ دینێکدا بەو شێوەیە نییە.. چون پرسیاریان کرد لەهاو زمانی خۆیان لە موسڵمانە یابانییەکان، بۆیان باسکردن کە ئیسلامەتی چییە! وردە وردە دراسەی ئیسلامیان کرد، باسی کرداری چاك و شوێنی کرداری چاك لە شەریعەتدا زۆر سەرنجی راکێشان و بوو بەهۆی ئەوەی کە ئیمان بهێنن.

کرداری چاکە بەشێکە لە عەقیدەی ئیسلام و موسڵمانان.. نزیکەی (٣٦٠) جار لەگەڵ ئیماندا لە قورئانی پیرۆزدا چەندبارە بووەتەوە (الذین آمنوا وعملوا الصالحات) (من آمن وعمل صالحا) جا کرداری چاکە بە شێوەیەکی گشتی دەکرێت بە دووبەشەوە، بەشێکیان پێی ئەوترێ کرداری ئایینی کە بریتیین لە نوێژو رۆژوو صەدەقات و زیکری خوای گەورە و. .. هتد.

بەشەکەی تری پێی ئەوترێ کرداری چاکەی دونیایی، کە هەموو جۆرە خزمەتگوزارییەك.. هەموو یارمەتییەك.. هەموو پەیوەندییەکی مرۆیی ئەکەوێتە ئەو بازنەیەوە. کە فرمێسکی منداڵێك ئەسڕیت، دەست ئەهێنیت بەسەری منداڵێکی بێ باوکدا.. هەتا نەخۆشخانە و قوتابخانە دروست کردن، ئەمانە هەموویان لەو بازنەیەدان.

ئیسلام وامان تێدەگەیەنێت کە کرداری چاکە پەساپۆرتێکە بۆ گەیشتن بە بەهەشت.. ڤیزەی ئەو بەهەشتە.. کرداری چاکە لە دینی ئێمەدا هەموو بوارێکی ژیانی گرتووەتەوە، کاسبی ئەکەیت بەکرداری چاکە حسابە واتە کاسبی حەڵاڵ.. ئەو پارووە نانەی کە دەستت ئەکەوێت و ئەیخەیتە دەمی خێزانەکەتەوە، وەك پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێت: ئەو پارووە نانەی دەیخەیتە دەمی خێزانەکەتەوە، بە پەرستش و عیبادەت ئەژمێردرێت، بەهەمان شێوە (الکلمة الطیبة صدقة) قسەی چاکە کە لێرەدا دیاری نەکراوە لەچ کات و شوێنێکدا بێت، قسەی

خێروچاکە، هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێکدا خێرە، ئەوانەی کە پسپۆڕی بواری دەروونناسین ئەڵێن وتەی چاك کاریگەرییەکی زۆری هەیە بۆ بەرزکردنەوەی ورەی مرۆڤ... گەش بینی بە ووشە دروست ئەبێت، بە پێچەوانەشەوە وشەی خراپ یان ڕەشبینی، ئاینی ئیسلام دژی ئەوەستێت.. دژی فاڵە.. دژی دەست خوێندنەوەیە.. دژی قاوە گرتنەوەیە.. دژی هەمو خورافیاتێکە، بۆ نموونە ئەڵێت: سەرم ناتاشم لەبەرئەوەی سێ شەممەیە، یان ئەمڕۆ خێر نایەتە ڕێگەم کوندە پەپوم بینیوە.. ئەمانە هەمووی حەرامە.. چونکە ئەمانە دروستکراوی خوان و شەو و ڕۆژیش دروستکراوی خوایە.

کردەوەی چاکە مەرجێکە لەمەرجەکانی تەوبە.. هەموو ئەزانین کە ئیمان بریندار ئەبێ بە کرداری ناشرین.. پێویستە ئەو ئیمانە چاك بکرێتەوە بە کردەوەی چاك و تەوبە.. پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێت (كل بني آدم خطاء وخير الخطائين التوابون)[13] واتە هەموو گرۆی ئادەمی هەڵە ئەکات وەچاکترینیان ئەوانەن کە تەوبە ئەکەن و زوو ئەگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورە.. جا تەوبەش مەرجی هەیە، لەمەرجەکانی ئەبێت کرداری چاکەی لەگەڵدا بێت، خوای گەورە ئەفەرموێت.. (وإني لغفار لمن تاب وآمن وعمل صالحا ثم آهتدى) واتە: من لەو کەسانە ئەبوورم کە ئەگەڕێنەوە بۆلای من، کە ئیمان ئەهێنن و کرداری چاك ئەکەن و ڕێبازی هیدایەت وەرئەگرن..

---

[13] - ٩٤٦٤ ٤كل بني آدم خطاء وخير الخطائين التوابون
الراوي :أنس بن مالك - خلاصة الدرجة :حسن - المحدث :الألباني - المصدر :صحيح ابن ماجه - الصفحة أو الرقم ٣٤٤٧

کردەوەی چاك بەهایەکی ژیارییە، کە دەوڵەتی ئیسلامی کاتی خۆی بەوە دروست بووە.. هەموو راپەڕینێکی ئیسلامی لەسەر بنەمای کردەوەی چاك دروست ئەبێت، لە ئیسلامدا کۆمەڵێك بەها هەیە وەکو: ئەمانەت و ئازایەتی و داوێن پاکی و خواناسی و هتد... پێویستە لەسەرمان ئەم بەهایانە دابەزێنین بۆ واقیع وبیکەینە راستییەك، بەڵام ئەگەر تەنها بەباس بڵێین ئیسلامەتی وەهایە، خەڵك زۆر باوەڕ ناکات.. خەڵك ئەیەوێت شت لە موسڵمان ببینێت.. لەبەرئەوە ئێمە پێویستمان بە پرۆژەیە، پێویستمان بە فیکری نوێیە کە ئەم بەهایانەی پێ دابەزێنینە سەر واقیع، بۆ نموونە ئەمانەت، ئێمە وا ئەڕوانین بۆ ئەمانەت کە بنەمای گەشەپێدانە.. گەشەپێدان سێ مەودای هەیە مەودایەکیان رۆشنفیکرییە و مەودایەکیان ئابوورییە و مەودایەکیان کۆمەڵایەتییە، ئەگەر ئەم سێ بوار و مەودایە مرۆڤی ئەمینی تێدا نەبێت ئەم پرۆژانە هیچیان سەرکەوتن بەدەست ناهێنن.. کام پرۆژە لە جیهاندا ئەبینیت کە سەرکەوتوو ئەبێت ئەوە نەخشە بۆ کێشانەکەی تەواو بووە و مرۆڤی ئەمینی لەسەر بووە، بەڵام ئەگەر مرۆڤی ئەمین نەما گەشەپێدان لەو کۆمەڵەدا نامێنێت، کەواتە ئێمە ئەبێت پرۆژەمان هەبێت، بیسەلمێنین کە ئێمە ئەمینین.. لە جیهاندا ملیۆنەها کەس هەیە، کە ئاڵتون و زیو و پارەی زۆری هەیە، لەبەرئەوەی کەسی ئەمینی نییە، ئەیشارێتەوە، ئەو شاردنەوەیە لە ئایینی ئێمەدا حەرامە (الذین یکنزون الذهب و الفضة ولا ینفقونها فی سبیل الله فبشرهم بعذاب الیم) نابێت سەروەت و سامان خەزن بکرێت، بەڵکو ئەبێت بڕوات بۆناوکۆمەڵ و ببێتە سەرمایە.. کە بوو بە سەرمایە و بووە پرۆژە، خێری بۆ خاوەنەکەی و خێری بۆ کۆمەڵیش ئەبێت.

خوای گەورەئەو کرێکارە ئەمینە ئەکات بە هۆکارێك بۆ رزقی خاوەنەکەی و بۆئەویش.. بەڵام ئەگەر ئەمانەت نەما ئەو پرۆژانە و گەشەپێدان نابێت،

راستگۆیی چۆن ئێمە ئەیهێنینە واقیعەوە؟ تەنها ئەبێت فکری سەردەممان هەبێت، ئەبێت رۆژنامەیەکت هەبێت راستگۆیی تیابێت، تەلەفزیۆنێکت هەبێت راستگۆیی تیابێ، رادیۆیەکت هەبێ راستگۆیی تیا بێت، بەم جۆرە و بەم بۆچوونە هاوچەرخانە ئەتوانین ئەو فکرە ئیسلامییە بهێنینە ئەم سەردەمەوە.

بەهای دراوسێ:-

بەهایەکی ترمان هەیە، هاوسێیەتی.. پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێت (من كان يؤمن بالله وباليوم الآخر فلا يؤذ جاره...)[١٤] واتە: ئەوەی باوەڕی بەخواو رۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێکەی نەدات...

ئێمە با تەنها واتێنەگەین کە هاوسێ ئەو کەسەیە کە خانووەکەی بە تەنیشت خانووەکەی تۆوەیە، سواری پاس ئەبیت، ئەو کەسەی دێتە لاتەوە هاوسێتە.. نابێ شانی لێبدەیت.. نابێت پێڵاوەکانمان بدەین لە جلەکانییەوە.. با ئەو شتانەی کە کڕیومانە، نەهێڵین بەر جلەکانی بکەوێت.. نابێ جگەرەبکێشیین و دوکەڵەکەی بچێت بەسەرو چاویدا.. قسە لەگەڵ یەکێکدا مەکە، دەنگەکەت ئازاری ئەو دراوسێیەت بدات.. ئێمە ئەبێ بەو شێوەیە لەئیسلام تێبگەین.. بە دیار عەرەبانەیەکەوە شتێك ئەکڕین، ئەو کەسەی کە لە پێشتەوەیە و شتەکە ئەکڕێت هاوسێتە و ئازاری مەدە.. پارەکە پێش ئەو مەدە و شتەکە پێش ئەو هەڵمەگرە.. بزانە ئەم دینەمان چەند بەهای ژیاری تیایە، بەڵام ئێمە جێبەجێمان نەکردووە.

ئەو هاندەرەی کە پاڵ بە مرۆڤەوە ئەنێت کە کرداری چاکە بکات ئیمانە.. بەداخەوە کەسانێك هەن ئەڵێن ئیمان مرۆڤ بەنج و بێ ئاگا ئەکات، نەخێر، تەنها

---

[١٤] - ١٥٧٢من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يؤذ جاره ، ومن كان يؤمن بالله واليوم الأخر فليكرم ضيفه ، ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيرا أو ليصمت
الراوي :أبو هريرة - خلاصة الدرجة] :صحيح - [المحدث :البخاري - المصدر :الجامع الصحيح - الصفحة أو الرقم:١٦٣٦

ئیمان پاڵ بە مرۆڤەوە ئەنێت کە کرداری چاك بکات و بەڵکو ژیانیشی لەپێناوی ئەو ئیمانەدا ئەفەوتێ بە تەمەن و بە سامان، تەمەنی ئەفەوتێنێ لەپێناو ئەو شتە کە باوەڕی پێیەتی.

**بڕوا بوون بە غەیب:-**

ئیمان تەنها هاندەرە بۆ ژیانی ژیاری.. لە مەرجەکانی ئیمان، ئەبێ باوەڕمان هەبێ بە غەیب کە بەشێکی لەدونیادا دێتە دی بە گوێرەی پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگایە... غەیب ئەو شتەیە کە هەستیارەکان هەستی پێ ناکەن، ئەوە پێی ئەوترێ غەیب.. بەڵام خوای گەورە لە نێوانی دوو ماوەدا شتێك بۆ مرۆڤ دەرئەخات، ئەزانێت لەو قۆناغەدا پێویستی پێیەتی، مرۆڤایەتی کە ژمارەی زۆر بوو، ئەوکاتە نەخۆشی ئەیان فەوتێنێت.. بۆیە خوای گەورە ڕێنمویی کەسانێکی کرد بۆدروستکردنی میکرۆسکۆب و بووبە هۆی دۆزینەوەی میکرۆب، میکرۆب کە هۆیەکە بۆ نەخۆشی، چارەسەر کرا، هەروەها هەموو ماوەیەك خوای گەورە شتێك دەرئەخات، کە یارمەتی ئەدات بۆ گەشەپێدان و گواستنەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی بەرزتر، بەشێکی ئەو غەیبە دەرناکەوێت تاکو قیامەت.. بەشێکی تر هەیە جگە لە خوا و جگە لە هەندێ پێغەمبەران کەسی تر نایزانێت. . بەشێکی تر هەیە کە هەندێ هۆکار هەیە ئامادەتکرد غەیبەکە دەرئەکەوێت.. وەکو حاڵەتی جیهاد لەگەڵ دوژمندا، دوژمنێك کە باوەڕ نەکات بە دین و بە قورئان و بە پێغەمبەر(د.خ) و ئەیەوێ خاکت داگیر بکات.. لەوکاتەدا تۆ دێیت بە ئیمانێکی پاکەوە و بە ڕاستگۆیی ڕوو ئەکەیتە جیهاد و ڕووئەکەیتە ئەو دوژمنە، هەموو هۆکارێکی سەربازی و ڕێکخستن ئامادە ئەکەیت، پاشان خوای گەورە فریشتە ئەبارێنێت بەسەرتا بە دەقی قورئانی پیرۆز.. تا ئەم دەقیقەیە فریشتەکە شتێکی غەیبییە، بەڵام کە کەوتیتە ئەو قۆناغەوە ئەم شتانەت هەمووی جێبەجێ کرد

لەپێناوی خوای گەورەدا، غەیب بەخششێکی خواییە، بابیرکەینەوە، ئەگەر بزانین کەی ئەمرین، زۆر سەرگەردان ئەبین، ئەو راستیانە بەخششێکی گەورەیە، ئەگەر تۆی خوێنەر منت بناسیایە وەکو ئەو ناسینەی کە خۆم ئەناسم لەگەڵما نەئەبوویت.. خوای گەورە عەیب و عاری ئێمەی داپۆشیوە..

پێغەمبەری خوا(د.خ) ئەفەرموێ: ئەگەر بۆ یەکتری دەربکەون و راستییەکانی یەکتر بۆتان ئاشکرا بێت، کەس رێز لەکەس ناگرێت، تەنانەت کەس کەس نانێژێت.. وە هەموو کەسێ بەرامبەرەکەی بەگلاو ئەزانێ.. کەواتە غەیب سیستەمێکی زۆر رێك و پێکە لە ژیاندا بۆی دروست کردووین.. بەخشش و فەزڵێکی خوای گەورەیە بەسەرمانەوە، لەوشتانەی کە ئەکەوێتە سنوری غەیبەوە، نیشانەی نزیك بوونەوەی قیامەت، هەندێکیان پێیان ئەوترێ نیشانە بچووکەکان. و هەندێکیشی پێی ئەوترێ نیشانە گەورەکان، کەچی تائێستا رووی نەداوە، وەکو پەیدابوونی دووکەڵ و پەیدابوونی ئاژەڵ کە قسە ئەکات وە پەیدابوونی دەجال و هاتنە خوارەوەی حەزرەتی (عیسا) (سەلامی خوای لێبێت) و دەرکەوتنی (محمد مەهدی) و هەڵهاتنی خۆر لە رۆژئاواوە.. بەڵام نیشانە بچوکەکان ئەکرێن بەسێ بەشەوە: بەشێکی هاتنە دی و روویاندا و کاتی بەسەردا رۆی.. و بەشێکی هاتووەتە دی و ئێستاش بەردەوامە.. و بەشێکی هێشتا نەهاتووەتە دی.. لەوانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ) روویدا، لەت بوونی مانگ بوو بە فەرموودەی صەحیح.. وە فەرمووی: پێغەمبەرانی درۆزن پەیدا ئەبن و فیتنەی گەورە پەیدا ئەبێت و حەزرەتی حوسەین شەهید ئەبێ.. ئەمانە هاتنە دی.. حیمایەکانی حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففان رایانکێشان و لەسەر قەبرانی موسڵمانان نەیانناشتن، بەڵکو سەگ خواردنی..







لەو نیشانانەی تر کە ئێستا روو ئەدات، بۆ هاوەڵان غەیب بوو، بەڵام بۆ ئێمە ئێستا بووەتە واقیعێك ئەوەیە کە موسڵمانان خراپەکارییان تێ دەکەوێت و ئوممەتی ئیسلام و خاکی ئیسلام پارچە پارچە ئەکرێت و تەرازووەکان تێك دەچن.. چ تەرازووی خۆراك.. چ تەرازووی دادوەرەکان کەلە دادگادا بەکاری ئەهێنن.. چ ئەو تەرازووە بەڕێوەبردنانەی کە بەکاردێت.. تەنها باسی وڵاتی خۆمان ناکەین، بەڵکو لە جیهاندا و لەو وڵاتانەی کە زۆر پێشکەوتوون لە رۆژنامە و گۆڤارەکانیاندا بەرچاومان ئەکەوێت کە دادوەری زۆر بەناوبانگ هەیە، کە بەرتیلی وەرگرتووە... وە ئافرەت جلی وەها لەبەر ئەکات وەها یاری بە قژی ئەکات کە پشت ملی دەربکەوێت و بەرزی ئەکاتەوە و رووتن و جلیشیان لەبەردایە، واتە جلەکانیان یان کورتە، یان تەسکە، یان تەنکە، پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێ: ئەم ئافرەتانە ناچنە بەهەشت و بۆنی بەهەشتیش ناکەن، ئەمانەمان هەموو دیوە و ئەبینین بەچاوی خۆمان، داواکارین کە خوای گەورە رێنموویمان بکات و، تەوبە بکەین.. چونکە مەسەلەی پۆشاك و حیجاب، شتێك نییە زاناکان وتبێتیان، خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی (يأيها النبي قل لأزواجك و بناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن).. خوای گەورە ئەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر، خێزانەکانت وە کچەکانت و ئافرەتانی ئیمانداران ئەبێ خۆیان داپۆشن، ئیتر ئەمە شتێك نییە بڵێین بۆچوونی کەسێکە یان مەزهەبێکە، ئەمە دەقی قورئانە.. دینەکەمان ئەگەر بیکەین بەسێ بەشەوە، بەشێکی پێی ئەوترێ ئەگۆڕ.. مەسەلەی رەوشت و بەهاکان و بیروباوەڕ، ئەمانە ناگۆڕێن کە ئەڵێین ئەمانەت.. کە ئەڵێین راستگۆیی.. کە ئەڵێین داوێن پاکی. تا رۆژی قیامەت ئەم سیفەتانە بەرێزن.. نابێ چاوەڕێی ئەوە بکەین کە رۆژێك لە رۆژان ئیسلام بڵێت داوێن پیسی شتێکی باشە، یان درۆ باشە، ئەمانە ئەگۆڕن.. (لاإله إلا الله محمد رسول الله)

ئەمە نەگۆڕە، بەڵام ئەو بەشەی کە پەیوەندی بە گۆرانکاریەکانی ژیانەوە هەیـە و پەیوەنـدی بـە پێـشکەوتنی کۆمەڵگـەوە هەیـە.. ئەمانـە لەوانەیـە گـۆڕان روویـان تێبکات، چونکە پەیوەندی بە بواری (اجتاهد)ەوە هەیە..

یەکێکی تر لە نیشانەکان ئەوەیە کـە موسـڵمان سـەلام لـە موسـڵمان ناکات، تـەنها مەگەر بیناسێت، لەکاتێکدا سەلام بۆ هەموو ئەوانەیە کە ئەیناسێت و نایناسـێت.. ئەمەش هاتووەتەدی.

نیشانەیەکی تـر پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی.. بـۆ نموونـە مامێکت هەیـە یـاخود خاڵێکت لـەم شـارەدایە، لەوانەیـە بـە شـەش مـانگ سـەری لێ نـەدەیت.. هـەروەها ئەفـەرموێ: وەهـای لێـدێت بوومەلـەرزە زۆر نـەبێت وە بەتایبـەت کـە ئـافرەتی گۆرانی بێـژ پەیـدا ئـەبێ و ئاشـکراکردن و حـەلاڵکردنی خـەمرو مەشوربات، ئـیتر ئەوە نزیك بوونـەوەی قیامەتـە.. حـەزرەتی عائیـشە ئەفـەرموێ: ئایـا تیـا ئەچـین ئەگەر پیاوچاکمان تیادا بێت؟ ئەفـەرموێ: بـەڵێ، ئەگـەر پیـسی زۆر بـوو بـە پیـاو چاکەوە ئەفەوتێ..

قیامەت لـە قورئانـدا نـاوی زۆرە.. (یـوم الجمـع) (یـوم التنـاد) (الطامـة) (الصاخة) هتد..خوای گەورە لە زیندوو بوونەوەدا کەسی لەبیر ناچێت، لەیەکەم مرۆڤەوە تـا کۆتا مرۆڤ کۆئەکاتەوە، بێ ئـەوەی کـەس بـەجێبهێڵێت هـەموویان ئـەڕۆن بـۆ ئـەو دادگایی کردنە..

هەنـدێ کـەس هەیـە رەخنـەمان لێ ئـەگرن و ئـەڵێن: ئێـوە خـەڵك ئەترسـێنن بـە قیامـەت و بـە دۆزەخ و ئـەم جـۆرە شـتانە.. ئەوانـە ئیـسلام وەرنـاگرن.. عەقیـدە وەرناگرن.. زۆر باسی ئیمانمان کردووە کە چۆن ئەبێتـە دینەمۆیـەك کـە پـاڵ بـە ئیمانداراەوە بنێت و ئیش بکات، پاڵی پێوە ئەنێ دونیا ئاوەدان بکاتەوە، پاڵی پێـوە ئەنێ بەتەنگ براکەیەوە بێت.. بەڵام ئەو کەسانەی کـە کۆمـەڵگایان بـیر ئەچێت،

ئـەو كەسـانەی نیـشتمانەكەیان فـەرامۆش ئەكـەن.. ئـەو كەسـانەی كـە واز لـە لێپرسراویەتی ئەهێنن.. ئەبێ ئێمە بیریان بخەینەوە بەداگایی خوای گەورە، بەوە راست ئەبنەوە، بەڵام ئەو كەسەی رێك هاتووە و شوێن پێغەمبەر كەوتووە (د.خ) ئەوە لە جەهەننەم ناترسێ، ئەوە ئارەزوو ئەكات كە ئەو ژووانـە زوو كـاتی بێـت.. ئارەزوو ئەكات كـە زوو زەنگـی تاقیكردنـەوە لێ بدرێت، تـاوەكو زوو بڕوانامەكـەی وەبگرێ.

ئیمانـدار خـوای خـۆش ئـەوێ، ئیمانـدار پێغەمبـەری خـۆش ئـەوێ (د.خ) بـەدەقی قورئـانی پـیرۆز، ئـەو كەسـەی كـە شـوێن پێغەمبـەر (د.خ) بكـەوێت، خـوای گـەورە خۆشـی ئـەوێت (قـل إن كنـتم تحبـون الله فـاتبعوني يحبـبكم الله) ئەگـەر شـوێن پێغەمبـەر بكـەون (د.خ) ئـەوە نیـشانەی ئەوەیـە كـە خـوای گـەورە ئێـوەی خـۆش ئـەوێ، چ بەخـشش و نیعمـەتێك هەیـە لەسـەر زەویـدا خـوای گـەورە ئەیـدات بـە ئیماندار و كافر، تەنها بەخششی ئیمان نەبێ، نایدا بە یەكێك كـە خۆشـی نـەوێت، ئەوەی كە ئیمانی هەیە مژدانەی خۆی وەرگرتووە.. لەبەرئـەوە بـڕوادار لـە دۆزەخ ناترسێت، ئیماندار ئەڵێت (مرحبـا بـالموت).. ئیمانـدار ئـەو بۆچوونەی لا دروست بووە و دڵنیایە كە خوای گەورە لە دایك و باوكی بەرەحم تره بۆی..

لە یەكێك لە جەنگەكاندا، لەبەردەمی پێغەمبەر (د.خ)و هاوەڵانـدا ئافرەتێـك پێـی وترابوو كە كوڕەكەت شەهید بووە، قـەدەر وەهابوو كوڕەكـەی خـۆی بینـی لەگـەڵ پێغەمبەردا (د.خ) لەباوەشی كردوو ماچی كرد.. فەرمووی ئێوە باوەڕ ئەكـەن ئـەم ئافرەتە كوڕەكەی خۆی هەڵبداتە ناو ئاگرەوە؟ وتیـان نـەخێر شتی وەها نابێـت.. فەرمووی مژدەتان پێ بدەم، كـە خـوای گـەورە بـۆ ئیمانـدا زۆر زۆر لـەو دایكـە بـۆ كوڕەكـەی بـەرەحم تـره.. ئـیتر ئێمـە لەچـی ئەترسـین؟! ئێمـە كـە باسـی دۆزەخ ئەكـەین بـۆ ئـەو كەسـانەی كـە تەوبـەیان نـەكردووە، پێیـان ئـەڵێین خـوای گـەورە

(شديد العقاب)ە، بەڵكو راست ببنەوە و بێنە سەر رێ.. هەروەها خوای گەورە مژە ئەدات بە ئیماندار (ألا إن أولياء الله لا خوف عليهم ولاهم يحزنون لهم البشرى في الحياة الدنيا..) هەر لە دونیادا موژدە ئەدەین بە باوەڕداران کە دڵنیا بن کە ئێوە تووشی تەنگ و چەڵەمەی جیهانی بەرزەخ و زیندوبوونەوە و بڵاوکردنەوە و حەشر و دانانی میزان و وەرگرتنی کتاب و پردی (صراط)، ئەمانە زیانتان پێ ناگەیەنێ.. لە نوێژدا دوعایەك ئەکەین.. ئەوەی هەست بەو هەیبەتە بکات لە نوێژدا، خوای گەورە لە قیامەتدا نایترسێنێ کە ئەچێت بۆ دادگای خوایی.. مرۆڤ دوو پێگەیشتنی هەیە لەگەڵ خوای گەورەدا.. یەکێکیان لە دونیادا لە نوێژدایە، ئەوەی تریان لە قیامەتدا لەبەردەم دادگاکەیدا.. کە لە نوێژدا هەست بەم هەیبەتە کرا.. ئەو کاتە ئەو ترسەت نامێنێ و ئەمین ئەبیت (فمن كان يرجو لقاء الله فليعمل عملا صالحا ولايشرك بعبادة ربه أحدا) ئەوەی کە ئەیەوێ ئەو چاو پێکەوتنە بکات لەگەڵ خوای گەورە باکرداری چاکەی پێ پێ و رووپامایی نەبێت. وە دڵنیا ئەبێ لەوچاو پێکەوتنە و پێی خۆشحاڵ ئەبێ..

لە دونیادا دوو مەرج هەیە بۆ دیدەنی و چاوپێکەوتن.. یەکێکیان ژووانە (موعد).. یەکێکی تریان هۆی گەیشتنە بۆ ئەو شوێنی ژووانە لەگەڵ خوای گەورە بریتییە لە کرداری چاك وەتەنها بۆ خوای گەورە و بەدڵسۆزی ئەنجام درابێ.. لەوکاتەدا کە ملیۆنەها خەڵك زۆر ئەترسن، مرۆڤی باوەڕدار دڵنیایە.. لەبەرئەوەی ئێمە خەڵك ناترسێنین بە جەهەننەم، چونکە ئێمە (إن شاءالله) ئێمە دورترین ئوممەتین لە جەهەننەمەوە.. یەکێ شوێن پێغەمبەر بکەوێ (د.خ) دوور ترین کەس ئەبێت لە دۆزەخەوە..

هەروەها رەوشت شتێکی فراوانە و بنەمای کردەوەی چاکە.. رەوشتی تاکەکەس و ناوخێزان و کۆمەڵگە و رەوتی ئابووری و مامەڵە و رەوشتی ناو بازاڕ و بازرگانی و



بەڕێوەبردن و سیاسی و ڕەوتی دەوڵەت ئەمانە هەموویان وایەرەکانیان ئەگەڕێتەوە بۆ یەك مۆلیدە کە پێی ئەوترێ ئیمان.. بەلاّم جگە لە بڕواداران وایەرەکانیان چووتەوە بۆ شوێنێکی تر.. لە ڕۆژی قیامەتدا کردارەکانی ئەوان ناخوێنرێتەوە.. زۆرجار ئەبینین مرۆڤێك یان کۆمەڵێکی بێ باوەڕ کاری چاك ئەکەن، بەلاّم ئایا لە قیامەتدا کێشیان هەیە؟ نەخێر، بەگوێرەی ئەم ئایەتانە.. (والذين كفروا أعمالهم كسراب بقيعة يحسبه الضمان ماء حتى إذا جائته لم يجده شيئا). . واتە ئەوانەی کە بێ باوەڕن کردارییان وەکو تراویلکەیەکە کە نزیك ئەبێتەوە هیچ نییە و بەهیچ شێوەیەك لەلای خوای گەورە نەنووسراوە، چونکە مەرجی کردەوەی چاك کە ئیخلاّسە بۆ خوای گەورەیە.. و ئەبێ سوودی هەبێ بۆ خەڵك لە سنووری شەریعەتدا.. کەسێك یان کۆمەڵێك دەیان و سەدان هەزاران شتیان کردووە، کە بە ڕووکەش خێرە، بەلاّم لای خوای گەورە نەنوسراوە، چونکە مەرجی کردەوەی چاکی تێدا نییە.. خوای گەورە ئەفەرموێت (مثل الذين كفروا بربهم أعمالهم كرماد إشتدت به الريح في يوم عاصف لايقدرون مما كسبوا على شيء ذلك هو الضلال البعيد..) واتە ئەو بێ باوەڕانە کردارەکانیان وەك خۆڵەمێشێك وەهایە، کە ڕەشەبایەکی بەهێز دێت پەرش و بلاّوی ئەکاتەوە بۆی کۆناکرێتەوە، بەو شێوەیە ئەڕوات و ئەفەوتێ..

هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێت (قل هل ننبئكم بالأخسرين أعمالا الذين ظل سعيهم في الحياة الدنيا وهم يحسبون انهم يحسنون صنعا...) واتە ئایا بۆتان باسکەین کێ سەرگەردانە لە قیامەتدا، ئەوانەی کە هیچ کردارێکیان لە دونیادا نەنوسرا، بەلاّم بە عەقڵی خۆیان وائەزانن ئیشی چاك ئەکەن و ئەوان لەسەر ڕێی ڕاستن، ئائەوانە سەرگەردانن، بۆیە چی نەخۆشی و ماندوێتی و مەراق و خەفەت و دڵتەنگی و زیانی ماددی و مەعنەوی کە لە ژیاندا توشمان ئەبێ.. ئەوانە نامەی

کردەوەکانمان پاك ئەکاتەوو هیچ خەفەت نەخۆن.. وە ئەو کەسەی کە بەوە پاك نەبێتەوە، بە گیانەلاّ و رۆژێشان پاك ئەبێتەوە، وە ئەوکەسەی بە گیان کێشان پاك نەبێتەوە، بە نوێژی جنازە پاك ئەبێتەوە، بە گۆڕ و شاری ناو قەبر پاك ئەبێتەوە..جا زیندووبوونەمان هەیە، ئەو زیندووبوونەوەی کە بەچاوی خۆمان چەند جار بەچاوی خۆما لە رووەکدا ئەیبینین.. سەوز ئەبێ و زەرد ئەبێ و ئەبێتە پووش و نامێنێ و دێتەوە و، لە سالێکدا ئەو چوار وەرزە تێمان ئەگەیەنێت کە زیندووبوونەوەی ئادەمیزاد هەیە، بەلاّم دەوری رووەك سالاّنەیە، دەورەکەی مرۆڤ لەوانەیە (٧) سالێك بێت.. هەر ئەبێ بگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە، بەلاّم گرنگترین شتئەوەیە کە کرداری چاکت پێ بێ و خالصا بۆ خوای گەورە بێ، پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێ (من حلف علی یمین وهو فاجر لیقطع بها مال امرء مسلم لقي الله عزوجل وهو علیه غضبان) واتە: ئەو کەسەی سوێندی درۆ ئەخوات لە پناوی ئەوەی شتێك ببچڕێت لە برایەکی ئایینی خۆی، ئەوە لە قیامەتدا خوای گەورە بە تووڕەیی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەکات..

تووڕەبوونی، واتە خوای گەورە قسەی لەگەڵ ناکات و گوێی لێ ناگرێ و پاکی ناکاتەوە.. جا ئێمە ئەگەر رەوشتمان ئیسلامیی راستەقینە بێت، ئەم جۆرە مامەلاّنە هیچیان نامێنێت.. ئایا دوای ئەم هەموو روونکردنەوەیە چ شتێك لەئیمان پێویست ترە؟!

## باسی پێنجەم
## بەڵگە مێژوویەکان لە قورئانی پیرۆزدا

سەرچاوەی ئەم باسەمان کتێبێکی زانستی تورکییە بەناوی(گەلە لەناوچووەکان)، پسپۆڕانی زانستی شوێنەوارناسی و پسپۆڕانی جیۆلۆجی لە روانگەیەکی زانستییەوە ئەم کتێبەیان داناوە، بەراوردی دەکەین لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، بۆ نموونە:

١. *قەومی عاد:-*

لاپەڕە(٥٨) باس لە قەومی عاد دەکاتو... دەڵێت: زانایەکی ئینگلیزی ناوی(تۆماس) بوو، هەوڵو کۆششێکی زۆری دا لە باشووری رۆژهەڵاتی سعودیە، شوێنێکی دیاریکرد کەلەو شوێنەدا کاتی خۆی شارێك هەبووە کە هەمووی لم دایپۆشیوە، عەرەبەکان پێی دەڵێن(أوبر). پاشان زانایەکی ئەمریکی هات کە ئەو کتێبەی خوێندەوە، زۆر هانیدا کە بچێت بگەڕێ بەشوێن ئەو شارەدا، ئەو زانایە ناوی(نیکۆلاس کلاپ) بوو، رۆیشت بۆ ئەو شوێنە، بەڵام ئەوەی کاریگەریەکی زۆری هەبوو بۆ دۆزینەوەی شارەکە، نەخشەیەکی بەتلیمۆسی دۆزیەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ(٢٠٠ ساڵ) پێش زایین، لەکتێبخانەی(هانتن تن)لە زانکۆی کالیفۆرنیا، چ رێگەو رێچکەی بازرگانی وڵاتەکانی جیهان هەیە هەمووی لەو نەخشەیەدا هەبوو، لەلایەکی ترەوە وێنەی بۆشایی ئاسمانی لە رێکخراوی(ناسای فەضایی) کە لەم کتێبەدا وێنەیەکی تێدایە، چەند تیرێکی شینی تێدا بەدی دەکرێت، کە گوزارشت لەوەدەکات هەموو رێچکەکان لەیەك شوێندا یەك دەگرن، واتە ئەوە شوێنی شارەکەیە.

دەستی کرد بە چاڵ هەڵکەندنو لە ساڵی(١٩٩٠)دا شارەکە دۆزرایەوەو، ئەم هەواڵە بەهەموو جیهاندا بڵاوبۆوە. پاشان لە وێنەیەکی تردا دەریخستووە کە لە ساڵی(١٩٩٣) هەموو شارەکەی ئاشکرا کرد، کە شوێنەوارێکی زۆری تێدایە دەیسەلمێنێ کاتی خۆی کشتوکاڵێکی زۆر کراوە لەو شارەدا، جۆگەی گەورەو



سیستمێکی ئاودێری زۆر رێكو پێکی هەبووە، وا مەزندە دەکرێت کە دانیشتوانی ئەو شارە(٢٠٠٠٠٠ دووسەد هەزار )کەس بووبن.

یەکێکی تر لەو دۆزراوانەی نیکۆلاس کە سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە کە پایەی زۆر گەورەو سەیری تێدایە کە لە هیچ شارو شارۆچکەیەکی دەورووبەری لەو پایانەی تێدا نەبووە، قورئانی پیرۆزیش زۆر باسی باخو باخاتی ئەو وڵاتە دەکات.

ئەم سیفەتانەی لەم داهەیە بەسەر شاری(ئیرەم) دا دەچەسپێ، کە دەفەرموێت:

(إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ۝٧ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ ۝٨ )[١٥]

ئەو پایە بەرزانەی کە لە هیچ وڵاتێکی دەورووبەریدا نەبووە لەو شوێنەدا دۆزراونەتەوە، قەومێکی ستەمکار بوونو، بە قسەی پێغەمبەرەکەیان نەکردووە کە حەزرەتی(هود)بوو(سەلامی خوای لێبێت)، هەروەها دەستدرێژیان لە دراوسێکانیان کردووەو دەسەڵاتێکی گەورەیان هەبووە. وە خاوەنی ئەم دروشمە بوون(من أشد منا قوة)؟!، واتە غرورو لەخۆبایی بونێکی زۆریان هەبووە، جا قورئانی پیرۆز دەفەرموویێت؛ خوای گەورە ئەم قەومەی لەناوبرد بەهۆی بایەکی توندو تیژەوە کە لی لەگەڵدا بوو، لم(حاصب)[١٦]، واتە: هەڵگری زیخێکی زۆر ورد.

ئەم زانا بەرێزانە کە هۆی لەناوچوونی ئەم شارستانیەتە شیدەکەنەوە دەڵێن؛ رەشەبایەکی زۆر بەهێزو لماوی کتو پڕ هاتووەو هەموو شارەکەی داپۆشیوە، وەکو ماڵەکانی داپۆشیوە خەڵکەکەشی فڕێ داوە، وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێ؛

(كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٍ ۝٧ )[١٧]

خەڵکەکە لە رەگو ریشەوە دەردەهێنێ، پاڵیان پێوە دەنێ، هەڵیان دەدا بەملاو بەولادا، رەقیان دەکاتەوە، لە قورئانی پیرۆزدا

سەبارەت بە لەناوچوونی قەومی عاد(ریح) بەکاردێنێت، واتە(با)،(ریح) ئەگەر بەتاك هاتبێت بۆ غەزەبو توورەیی بەکاردێت، وە ئەگەر بە کۆ هاتبێت(ریاح) ئەوا

---

[١٥] الفجر ٧
[١٦] حاصب: ئەو رەشەبا بەهێزەیە کە وردە زیخ لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێ
١٧ الحاقة ٧

به مەبەستی خێرو بەرەکەت دێت.

(وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ ﴿٢٢﴾)[١٨]

بۆ نموونە:

(ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ ﴿٤١﴾)[١٩]

یان دەفەرموێت:

(رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾)[٢٠]

لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت:

(رِيحًا صَرْصَرًا ﴿١٦﴾)[٢١]

(وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَـٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾)[٢٢]

حەوت شەوو هەشت ڕۆژ ئەم بایە بەردەوام بوو، هەموو ماڵو کێڵگەو باخو باخات داپۆشرانو خەڵکەکەش بەملاو بەولادا فڕێ دەدران، سزای ئەوە بوو کە دژ بە یاساو پرۆگرامی پەروەردگار وەستان.

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە لێکچوونێکی زۆر هەیە لە نێوان ئەم دۆزراوانەو دەقەکانی قورئانی پیرۆزدا.

*٢ ـ قەومی ثەموود:*

---

١٨ الحجر ٢٢

١٩ الذاريات ٤١

٢٠ الأحقاف ٢٤

٢١ فصلت ١٦

٢٢ الحاقة ٦ ـ ٧

پاشان دێینە سەر باسکردنی ەومی(ثەموود) کە لە لاپەڕە(٧١)دا هاتووە، ئەم قەومە لە مێژوودا دەکەونە ش لەناوچوونی قەومی عاد، شوێنی ئەم قەومە دەکەوێتە باکووری حیجازواشووری(شام)ەوە، پێیان دەڵێن(قەومی صالح)، چونکە پێغەمبەرەکەیان ناو(صالح)بووە،(سەلامی خوای لێبێت)، هەروەها قورئانی پیرۆز بە(أصحاب الحر) ناویان دەبات،(حجر) لە(حَجرە)وە وەرگیراوە، واتە(ژوور)، کە لەناو چیاکانهەڵیان کەندووە لەشێوەی سەدان خانوو ماڵ کە تێیدا ژیاون.

جوگرافی ناسی یۆنانی بەناوی(pliny پلینی) لەپێش زایینــدا ناوی(DEMOTHA RE HEGRA/ دۆمیثاری هێگرا)، تەرجەمەکەی بە عەرەبی(أصحاب الحجر)ە، قورئانیش ئەم ناوەی بەکارهێناوە...

وەك دەفەرموێت

(وَكَانُوا۟ يَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾)[٣٣]

دەردەکەوێت ئەوەندە قەومێ بەهێز

بوون چیاکانیان هەڵدەکەندوەخش و نیگاریان تێدا دەکێشاو لەناویدا دەژیان، وە لەناوچوونیان بەهۆی دەنگێوە بوو، عاد بە ڕەشەبا لەناوچوون، بەڵام(ثمود) بە دەنگ لەناو چوون، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

(فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴿٨٣﴾)[٣٤]

زاناکان دەفەرمون: پێدەچێ ئەم دەنگە لە ئاسمانەوە بووبێ، لەشێوەی هەورە گرمەیەکی زۆر بەهێزدا یاخود لەزەوییەوە بووبێت لە شێوەی زەمین لەرزەیەك کە دەنگی داوەتەوە لەناو ئە چیایانەداو لەناوچوون.

فەخری رازی لە تەفسیری گەورەدا دەڵێت: (إما رجفة الأرض أو رجفة قلوب)،چونکە قورئان لە شێنێکی تردا دەفەرموێت:

---

[٣٣] الحجر ٨٢

[٣٤] الحجر ٨٣

(فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ )[٢٥]

تەحەدداى حەزرەتی صاڵحیان کرد، داوای موعجیزەیەکیان کردو موعجیزەکەیان دیاریکردو وتیان ئەو بەردە ببێتە وشترێك، بێتە بەردەم ئێمەو ئاوس بێت بەچکەیەکی ببێت کە لە خۆی گەورەتر بێت، ئەمانە هەمووی هاتنە دی بەمەرجێك ئەو ڕۆژەی ئەو ئاژەڵە ئاو دەخواتەوە ئەمان نابێت ئاو بخۆن، پێویستە ڕۆژێك پێش ئەوە ئاویان بۆخۆیان دابین کردبێت، وە خۆشی دەڕوات بۆ لەوەڕگاو خۆراکی خۆی پەیدا دەکات.

وە ئەوڕۆژەی قەدەغەکراوە ئەمان ئاو بخۆن، شیر دەخۆن، کە هەموو دێیەکە لەو حوشترەی وەردەگرێت، پاش ماوەیەك هاتن سەریان بڕیو دووچاری خەشمو قینی خوای گەورە بوون، کە ناوی لێنرا(رجفه)، واتە: (لەرزە)، ئیتر لەرزینی دڵ بێت، یان لەرزینی زەوی، گرنگ ئەوەیە ئەم میللەتە بەم جۆرە لەناوچوون.

(ئیبن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) کاتێك کە چوو بۆ تەبوك ساڵی(٩ی کۆچی) بەوێدا ڕۆیشتن، بینی هەندێك لە یارانی ئەو ئاوەیان بەکارهێناوەو هەویریان پێ شێلاوە، داوای کرد نوێژی بە کۆمەڵ ئەنجام بدەنو خەڵکەکەی کۆکردەوەو عەرزی کردن کە ئەمە شوێنێکە نابێت زۆر تێیدا بمێننەوە، شوێنی ستەمکارانە، وە ئەگەر لێرەشدا مانەوە هیچ نەبێ هەستێکی حەزینتان هەبێت، بۆ ئەوەی خوای گەورەش ئێمە بەو شێوەیە لەناو نەبات، وە دەبێت ئەو هەویرە بدرێ بە ئاژەڵەکان، نابێت موسڵمانان بیخۆن، وە ئاوەکانیان هەمووی ڕشت، وە فەرمانی کرد بچنە سەر ئەو کارێزەی کاتی خۆی ئاژەڵەکە لێی خواردۆتەوە.

لە فەرمودەیەکدا هاتووە( لا تدخلوا مساكن الذين ظلموا أنفسهم إلا أن تكونوا

---

[٢٥] الأعراف ٧٧ ـ ٧٨

باكين حذرا أن يصيبكم مثل ما أصابهم ثم زجر(ناقته) فأسرع حتى خلفها)[٣٦]، وه خۆشی نەمایەوە بە وشترەکەیەوە بە پەلە پەل بەوێدا تێپەڕی.

بێینە سەر باسی بابلیەکان، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) باسی خواوەندی مانگو هەسارەکانو رۆژی کردووەلەگەڵ میللەتەکەیدا، هەر لەم کتێبەدا وێنەیەکی تێدایە کە دەردەکەوێت مانگیان پەرستووە، کەواتە باسکردنی قورئان لەسەر پەرستنی مانگو خۆر و هەسارە راستیەکی زانستیەو دۆزراوەتەوەو جەخت لەسەر راستی و دروستی قورئانی پیرۆز دەکات.

*٣ ـ قەومی لوط:*

لوط (سەلامی خوای لێبێت) خوای گەورە ناردی بۆ چەند دێیەك، پێی دەڵێن (المؤتفكات) ناوی دێکان لە سەرچاوەیەکەوە بۆ سەرچاوەیەکی کە جیاوازە، ئەم پێنج دێیە بەتایبەت دێی(سدوم) رەوشتێکی زۆر ناشیرین لەناویاندا بڵاو بوو، ئەویش(نێربازی) بوو.

خوای گەورە حەزرەتی(لوط)ی بۆ ناردن ـ (لوط) دەبێتە برازای پێغەمبەر ئیبراهیم ـ تا ئەو رەوشتە ناپەسەندە لەناویاندا ریشەکێش بکات و بت پەرستی واز لێبێنن، بەڵام قەومەکەی بەقسەیان نەکرد، لە روانگەی زانستەوە ئەم دێهاتانە دەگەونە چوار دەوری(دەریای مردو) لە فەلەستینی داگیرکراودا... ئەو لێکۆڵینەوەو راپۆرتانەی لەم کتێبەدا کراوە، لە روانگەیەکی زانستی رووتەوەیەو هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامو ئایینەکانی ترەوە نیە.

پرۆگرامێکی زانستی پوخت جێبەجێ کراوە لەلایەن دوو پسپۆڕی گەورەی جیهانییەوە، یەکێکیان(ئەڵمانی)یەو ناوی(پرۆفیسۆر وەینەر کیلەر)ە، کە دەڵێت: تەقینەوەیەکی گەورە بووە لەگەڵ هەورە گرمەو پاشان بوومەلەرزەو بورکان).

زاناکەی تر ناوی(بیکەر)ە دەڵێت: دوو بورکانی زۆر ترسناك روویداوە پاشان بوومەلەرزەیەكو هەڵگەڕانەوەی زەوی، وە نغرۆ بوونی دێی(سدوم).

بۆ زیاتر روونکردنەوە دەبینین لە وێنەیەکی ئەو کتێبەدا کە لە مانگی

---

[٣٦] صحيح مسلم ج ١٨ ص ١١٠٠

دەسـكـردەوە وەرگـیراوە، لـە دوو بـەرزایی جیـاوازەوە لـە بەشـی سـەرەوە دەریـای مردوومان پیشان دەدات، لە خوارەوە زمانێكی سپی هەیە كە شوێنی(دێـی سـدوم)ە كە خوای گەورە لەناوی بـردوونو شـوێنەواری شارسـتانی و ئێـسقانی مرۆڤـی تێـدا دەردەكـەوێت.هـەروەها لـە وێنەیـەكی تـردا شـیكردنەوە زانـستییەكەی ئـەو زانایـە نیشان دەدات، سكێچێكی گەورەی تێدایە كە گركانێكی بچووكو گڕكانێكی گـەورەی تێدا بەدی دەكرێت.

بـەهۆی هاتنـە دەرەوەی گڕكانەكـەوە زەویەكـە نغـرۆ بـووەو پاشـان لـەخوارەوە هەڵگەڕانەوەی زەویەكە دەردەخات.

سـەرنج بـدە یەكـەم قۆنـاغ بـارینی ئـاگرە بەسـەر دێیەكـەدا، وە قۆنـاغی دووەم بومەلـەرزەو نغـرۆ بـوونی زەویەكەیـە، وە هەڵگەڕانـەوەی زەویەكـەش قۆنـاغی سێیەمە.

خاڵی لێكچوو لە شیكردنەوەی ئەم دوو زانایـەدا تەقینەوەیـەكی سـەیر روویـداوە . بیگومـان هـەموو تەقینەوەیـەك دەنگێكـی سـەیرو گـەورەی لەگەڵدایـە كـە دڵو گوێچكەی مـرۆڤ بەرگـەی ناگرێـت... هـەروەها بوركـانو بوومەلـەرزە لەهـەمان كاتداو پاشان سێهەم خاڵ كە هەڵگەڕانەوەی یەكجاریە.

بـا ببێنـە سـەر قورئـانی پـیرۆز بـزانین چۆن وەصفی لەناوچوونی قـەومی(لـوط) دەكات

(فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ )[٣٧]

(صیحە) واتە: دەنگ، ئایا ئەو تەقینەوەیەی ئەوان باسی دەكەن دەنگ نیە؟، ئەمە بەشی یەكەمی ئایەتەكە.

بەشی دووەمی

(فَجَعَلۡنَا عَـٰلِيَهَا سَافِلَهَا ﴿٧٤﴾ )[٣٨]

ئـەو دەڵێـت هەڵگەڕاوەتـەوە، قورئـان دەفـەرموێت هەڵمانگێڕانـەوە، سـەرووی

---

[٣٧] الحجر ٧٣

[٣٨] الحجر ٧٤

دێیەکەمان هەڵگێڕایەوە.

بەشی سێیەمی

(وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾)[29]

پاشان بارانێکی ئاگرینمان باراند بەسەریاندا، واتە پاش ئەو دەنگە بەهێزە بوومەلەرزەیەك هەڵگەڕانەوەیەك روویداوە، لەقورئانی پیرۆزدا باسکراوە، ئەم شوێنە پێی دەوترێت(أدنى الأرض)[30]، ئەمە نزمترین شوێنە لە زەویدا، وە بەشێوەیەکی زانستی سەلمێنراوە کە ئەم شوێنە زیاد لە(٤٠٠ مەتر) لە ژێر ئاستی دەریای ناوەڕاستەوەیە.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت

(فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَـٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ ۖ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾)[31].

(ئەمری خوا) واتە(فعلی خوا) چونکە خوای گەورە لەسەرووی کاتە( فوق الزمان)وەیە، وە هەموو فەرمانێکی بە(کن) دەست پێدەکات.. (کن فیکون).. لەبەر ئەوە(أمر و فعل)ی خوا جیاوازیەکی کاتیان لەنێواندا نیە، کە فەرمانەکەی خوای گەورە گەیشت دێیەکە هەڵگەڕایەوەو بارانێکی ئاگرین بەسەریاندا باری.(سجیل) لە زمانی عەرەبیدا(کل شدید صلب)دەگەیەنێت، واتە: هەموو شتێکی پتەوو بەهێز، وە ئەو بەردە کە باریوە بەسەریاندا راڤەکەران دەڵێن: زۆر ورد بووە، لە تەفسیری (بیضاوي)دا دەڵێت: بەردەکانی هێندەی دەنکە گەنمێك بوون...) (إبن کثیر) دەڵێت: زۆر ورد بووەو کە کێشاویەتی بەسەر ئەو تاوانبارانەدا لەخوارەوە

---

[29] الحجر ٧٤
[30] الروم١
[31] هود ٨٢ ـ ٨٣

هاتۆتە دەرەوە، هێندە بە تەوژم بووە).
لە تەفسیری(رازی)دا دەڵێت: ئەوەندە کردارییان ناشرین بووە خوای گەورە بەسێ جۆر سزا لەناوی بردوون، وەك قەومەکانی تر نەبوون بە یەك سزا لەناویان بەرێت، بۆ وشەی (منضود) ئیبن عەباس دەفەرموێت: واتە(یەك لەدوای یەك)، کە ئەم بەردە ئاگرینە دەبارێ بەسەریاندا(مسومە)، واتە: ناوی تاوانبارەکەی لەسەرە، ئەمە هیچ عەجایبێکیی تێدا نیە، چونکە ئەمڕۆ مرۆڤایەتی گەیشتۆتە ئاستێك موشەکێك دروست دەکات لەکیشوەرێکەوە دەیهاوێژێ بۆ کیشوەرێکی تر بەرنامەیەکی داڕێژراو دەخاتە ناویەوە، بەهۆی کۆمپیوتەرەوە، پێی دەڵێ کە پاش ئەوەندە هەزار و سەد کیلۆمەترو ئەوەندە مەتر دەگەیتە بینایەك ئەبێ بچیتە فلان پەنجەرەوە. دەبینی ئەو مووشەکە هەزاران کیلۆمەتر دەڕواتو بەرنامەیەکی تێدایەو لە پێشی پێشەوە کامێرایەکی تێدایە، کاتێك کە دەگاتە ئەو بینایە ئەو وێنەیە دەباتە ژورێ بەراوردی دەکات، ئەو پەنجەرە نیە کە پێی وتراوە، دەسووڕێتەوە بە چواردەوری بیناکەدا تا ئەو پەنجەرەیە دەدۆزێتەوە، مرۆڤێك گەیشتبێتە ئاستێك فەرمانداری بکات بەسەر شتو شوێنو کاتدا، ئایا خوای گەورە چۆن ناتوانێت فەرمانداری بکات بەسەر نیشتەجێبووەکەیدا کە(مرۆڤە)؟؟!.
لەبەر ئەوە زۆر ئاساییە (ولا أعجب في أمر الله) کە ئەو زیخانە ناوی تاوانبارانی لەسەر بووبێت، هەروەها دەفەرموێت:
(مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ ۖ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾)[٣٢]
ئەم سزایانە دوور نیە لە هیچ قەومێکی ستەمکار کە بگەنە ئەو ئاستە.
هەروەها لەو دێیەدا پاشماوەی ئێسقان دۆزراوەتەوەلە قووڵایی(١٥ - ٢٥) مەتر هەزاران جێپێی ئەو قەومە دۆزراوەتەوە کە رایان کردووە، پاشان ئەو جێیانە بۆتە بەردو بۆ ئەوەی دەرسو ئامۆژگاری لێ وەرگرین.
هەروەها جۆرە بەردێکی سپی کە(بازڵت)ی پێدەڵێن، لە هەموو جیهاندا لە قولایی(٦٠٠ مەتر) دایە لە ژێر رووی زەویدا، کەچی لە شوێنەواری دێی(سەدوم)دا

---
[٣٢] هود ٨٣

لای دەریای مردوو لەسەر رووی زەویە.خوای گەورە دەفەرموێت

(وَتَرَكْنَا فِيهَآ ءَايَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ )[٣٣]

ئێمە بەلگەیەكمان تێیدا بەجێ هێشتووە بۆ ئەوانەی لە سزای دۆزەخ دەترسن.
وە خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت:

(إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ )[٣٤]

بەهەمان شێوە ئەمەش

بەلگەو هاندەرێكە بۆ ئەو كەسەی ورد دەبێتەوە لە مەسەلەیەك (إستنباط)ی تێدا دەكات و دەگاتە راستی بەهۆی عەقلّو دەروونێكی پاكەوە.
شایانی باسە لە روانگەی قورئانی پیرۆزەوە لەناو چوونی ئەم پێنج دێیە (المؤتفكات) بریتیە لە دوو بەش:

١. رزگار بوونی حەزرەتی(لوط)و ئەو ئیماندارانەی كە باوەڕیان پێهێناوە.
٢. دابەزینی سزاكەیە.

قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە كە خوای گەورە فریشتەی نارد بۆ حەزرەتی لوط (سەلامی خوای لێبێت)، وتیان ئێمە فریشتەینو كاتی سزای خوا نزیك بۆتەوە، وەك وتمان ئەوان رەوشتی زۆر ناشرینیان هەبووە، كاتێك كە دەچن بۆ لای حەزرەتی(لوط) لە شێوەی مرۆڤ و لاوی زۆر جواندا دەبنە میوانی، ئەویش زۆر خەفەتبار دەبێت، چونكە خێزانەكەی خۆی بلاّوی دەكاتەوەو دەلێت: میوانی جوانمان هەیە، بۆیە قورئان دەفەرموێت(إلا امرأتك) ئێمە هەمووتان رزگار دەكەین بەلاّم ژنەكەت رزگار ناكەین.
لەم سەرچاوەیەدا ناوی دێیەكان هاتوون:
(سەدوم)و(كۆمۆرا)و(سیوایا)و(عامورا)و(دۆما)
لە سەرچاوەیەكی تریشدا[٣٥] ناوەكان بەم شێوەیە هاتوون:

---

[٣٣] الذاريات ٣٧
[٣٤] الحجر ٧٥
[٣٥] محەممەدە كوڕی قورەضی دەڵێ

(سەدوم)و(صەعبە)و(صەعود)و(غەمرە)و(دەوحا)

ناوەكان گرنگ نین، بەڵكو پەند لە ناوەڕۆكەكەیدایە كە قورئانی پیرۆز ئیشارەت بەوە دەكاتو دەفەرمویّت:

(وَجَآءَهُۥ قَوۡمُهُۥ يُهۡرَعُونَ إِلَيۡهِ وَمِن قَبۡلُ كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ)[٣٦]

بەهۆی ئەم هەڵوێستە ناشیرینەی خێزانو قەومەكەی

حەزرەتی(لوط)

(سِيٓءَ بِهِمۡ ﴿٧٧﴾)[٣٧]

واتە: ئەوەندە خراپەیان لەگەڵ كردو عەزێتی دەروونیان دا نەیدەزانی چۆن بەرگری لە میوانەكانی بكات

(أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ ﴿٧٨﴾)[٣٨]

ئایا پیاوێكی ئاقڵو ژیرتان تێدا نیە پیاوەتی و مەردایەتی هەبێت؟!. بەڵام ئەوانیش زۆر بە هێمنی پێیان وت:

(قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ ﴿٨١﴾)[٣٩]

ئێمە فریشتەی خواین

(لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَ ﴿٨١﴾ )[٤٠]

ناگەن بە تۆ، ئەبوایە بوترایە(لن يصلوا إلينا)، چونكە مەبەستەكە ئەوانن، بەڵام بۆ ئەوەی تێبگات بەهیچ جۆرێك دەستیان ناگات بەمان خەفەت مەخۆ، ئێمە بۆ ئەوە هاتووین كە پێت بڵێین ئەم شەو خۆتو ئیماندارەكان ـ جگە لە خێزانەكەت

---

[٣٦] هود ٧٨

[٣٧] هود ٧٧

[٣٨] هود ٧٨

[٣٩] هود ٨١

[٤٠] هود ٨١

ـ دەرچن‌و دوور بکەونەوە، چونکە هەتاو دەرکەوت خوای گەورە سزاکەیان بۆ دەنێرێت.

لێرەدا خەڵکەکە بەهەڵەداوان رادەکەن، چونکە پاڵپێوەنەری راستی ئاشکرا نیە کەسێکی دیاریکراو نیە کە بە خەڵکەکەی وتبێت بڕۆن، چونکە لەوەو پێش بەردەوام بوون لەسەر ئەم کردارە ناشیرینەو بۆتە خەصڵەتێك تیایاندا.

قورئانیش دەفەرموێت:

(يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡۚ إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ ﴿٨١﴾)[41]

ئێوە بڕۆن‌و کەس ئاوڕ نەداتەوە، ئاوڕدانەوەی ماددی ئاوڕدانەوەی مەعنەوی و سەرخوار نەکەنەوەو خۆشت لەدوای

دواوە ببە، با کەس دوانەکەوێت لە ئیماندارەکان، وە ئاوڕدانەوەی مەعنەویش نەبێت بیر لەماڵ‌و سامان‌و رابردوو بکەیتەوە یان بیر لە یادەوەرییەکانی ناو ئەو دێیە بکەیتەوە، دوای ئەوەی ئەوان کەوتوونەتە ناوچەیەکی ئارامەوە خوای گەورە سزاکەی دەبارێنێت بەسەریاندا، زاناکان دەفەرمون: لە ساڵی(١٨٠٠ی پێش زایین) رووی داوە...

لە ساڵی(٢٥ی پێش زایین) شاری(پۆن پی) لە ئیتالیا نزیك شاری(ناپۆلی) ئەو مرۆڤانەی کە بەدەسەلاتی خوای گەورە بوونەتە بەرد کراون بە بەرگی ئەم کتێبە. ئەم شارە شوێنێکی هاوینە هەوارو سەیرانگا بووە، وە فاحیشەو کرداری ناشیرین بە ئاشکرا تێیدا دەکرا، خوای گەورە سزایەکی بۆ ناردن بریتی بوو لە گڕکانێك،[42]، ئەوەبوو بەهۆی ئەو چیایەی کە لە نزیك ئەو شارە بوو، گڕکانێك بە تەوژمێکی زۆر توندو تیژ، تێیدا هەڵگیرسا، تا ئەو پەڕی شارەکە گەیشت، پاشان

---

[41] هود ٨١

[42] مامۆستایەك لە زانکۆی بەغداد ئەمەی بۆ گێڕامەوە، کە دکتۆرای لە جیۆلۆجیادا هەیە.

ئەو بەردە ئاگرینانە بارین بەسەریاندا، تا کەسیان دەرنەچێت، بەم جۆرە هەموویان سووتانو بەرد باری بەسەریانداو هەموویان داپۆشران.

لەم ماوەیەی دواییدا بەهۆی هەڵکەندنی زەوی یەکەوە دۆزرانەوە کە ماڵی دەیەهای تێدابووە نانیان دەخوارد، بەڵام هەموویان کراون بەبەرد، وە وەك لە وێنەیەکیاندا دیارە کە خەڵکی شارەکە خەریکی فاحیشەو کرداری ناشیرینن.

هەروەها لە وێنەیەکی تردا مرۆڤێك پیشان دەدات کە لەسەر شەقامێك بووە کتوپڕ لەبەردەکان بەری کەوتووە، خستوویەتی بە زەویدا، گەر سەرنج بدەین تەنها کراسێکی لەبەردایە.

عادەتی ئەم خەڵکە وابووە کە عەورەتیان دەرکەوێت... زۆر کەس دەچێت بۆ مۆزەخانە سەیریان دەکات کەچی کەسیان پەند وەرناگرن.

## باسی شەشەم
## ئیعجازی قورئانی پیرۆز

ئەگەر[٤٣] نەزانی خۆمانو سەر لێتێکدانی بێگانە نەبوایە، راستی قورئان زۆر بە روونو ئاشکرایی بۆ هەموو میللەتان دەردەکەوت، بەڵام بەداخەوە نەزانینو نەفامی وایکردووە کە موسڵمانان ئەمڕۆ لەچاو میللەتانو گەلانی تردا دواکەوتوو بن.خۆزگە هەموو موسڵمانێك لە قورئان تێبگەیشتایە... قورئان گوفتاری خوا یەو (متكلم) زاتی (الله)یە... زاتی(الله)ش زەمەن کاری تێناکات

(لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾ )[٤٤]

قورئانی پیرۆزکتێبی ڕێنمویی خوای گەورەیە بۆ مرۆڤایەتی... بەڵام ئاساییی ئەگەر(إعجازات)ی زانستی و رەوانبێژیو مێژوویی تێدا بێت... بە تیشك هاوێژیەکی خێراو بەقەدەر ئەوەی ماوەمان هەبێت لەدەرخستنی گەورەترین پەرچوویانی زانستی لە قورئان نیشان دەدەین:

**لە بواری فەلەکو فیزیادا:**

راستیەك هەیە کە هەتا مرۆڤ بەرز بێتەوە، پاڵەپەستۆی هەوا کەمتر دەبێتەوە، چونکە ڕێژەی ئۆکسجین کەمتر دەبێتەوە... لە سوورەتی(الأنعام)دا ئایەتی ژمارە(١٢٥) خوای گەورە(١٤) سەدە لەمەوپێش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات(ومن يرد أن يضله يجعل صدره ضيقا حرجا كأنما يصعد في السماء).

راستی تاریك بوونی گەون... قورئانی پیرۆز ئاماژە بەو تاریکییە ئەداو دەفەرموێ

---

[٤٣] ئەم باسە لە هۆڵی رۆشنبیری پێشکەش کرا.

[٤٤] يس ٧٠

لەسوورەتی(الحجر) ئایەتی ژمارە(١٤ ـ ١٥) (ولو فتحنا عليهم بابا من السماء فظلوا فيه يعرجون لقالوا إنما سكرت أبصارنا بل نحن قوم مسحورون).

دەرگا هەیە بۆ دەرچوون... ماوەیەکی کەم لەمەوبەر مانگێکی دەسکردی جولەکە فەشەلی هێنا، چونکە لەو دەرگا تایبەتیانەوە نەچووبوە دەرەوە... ئەم دەرگایانە بەشێوەی(مستقیم)ن و دەبێت بەشێوەی کەوانی ئەو کەشتیە دەربچێتو جوڵەیەکی(عروجی) هەبێت. جا ئایەتەکە دەفەرموێت

(لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا ﴿١٥﴾)[45]

، واتە: وەکو ئەوە وەهایە چاومان داخرا بێت ئەوەندە تاریکە. لە کتێبی(STARS AND PLANETS)دا کە سەرچاوەیەکی زانستیە،( IAN RID PATH)دایناوە، بە روونی لەو بارەیەوە ئاماژە بەم راستیە کراوەو وێنەی تایبەتی تێدایە سەبارەت بە تاریك بوونی گەردوون.

خوای گەورە دەفەرموێ:

(وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ )[46].

سەبارەت بە فراوانبوونی گەردوون بووەتە

راستیەکی زانستی، گەردوون یەکەمجار پارچەیەك رووناکی بووە، کە(بیردۆزی بیگ بانگ)ی پێدەوترێ... ئێستا هەموو زاناکان پشتگیری ئەو بیردۆزە دەکەن... دەنگی ئەو تەقینەوەیە ئەمڕۆ لەسەر زەوی تۆمار دەکرێ کە دەهەزار ملیۆن ساڵ(١٠٠٠٠٠٠٠٠٠)لەمەوپێش روویداوە، واتە: ئەم گەردوونە سەرەتایەکی هەیە، لەهەمان سەرچاوەی زانستی پێشوودا دەتوانین بە وێنەوە دەرك بەو راستیە بکەین کەون فراوانو گەورە دەبێت، هەتا دەگاتە راددەیەك، پاشان دیسان دەست دەکاتەوە بە بچووك بوونەوە،

(يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ

---

[45] الحجر ١٥

[46] الذاريات ٤٧

خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾)[٤٧]

، بەڵێنێکی خوا یەیە دوایی دیسان دەکەوێتەوە هەمان قۆناغ.

لە ئایەتی ژمارە(٣)ی سوورەتی(ملك)دا ئیعجازێکی تری قورئانی پیرۆز بەدی دەکرێ: (الذي خلق سبع سماوات طباقا ما ترى في خلق الرحمن من تفاوت فارجع البصر هل ترى من فطور)، لە(مفردات الألفاظ القرآن) کە(راغب الأصفهاني)داینا‌وە، دەفەرموێ: مانای(تفاوت)(الأختلاف في الأوصاف)... لێرەدا مانای چڕی دەگرێتەوە، ئەم گەردوونە کە گەورەو فراوان دەبێت، پێویستە چڕیەکەی دابەزێت، بەڵام خوای گەورە دەفەرموێت ( ماترى في خلق الرحمن من تفاوت)، جیاوازی نادۆزیتەوە لە چڕیدا، بەڵکو چڕیەکەی جێگیرەو ناگۆڕێت... ئەم ئایەتە دەیسەلمێنێ کە چڕی گەردوون نەگۆڕە... بەهەمان شێوە زانستیش سەلماندی کە چڕی گەردوون نەگۆڕە. تۆپەڵێك(گاز) هەیە لە گەردووندا کە ئەگەر بە خێرایی رووناکی برۆیت بە(١٥ ساڵی رووناکی) لەم ناوچە تۆپەڵە گازیە تێپەڕ دەبیت... ئەم گازە دەوری رەحم دەبینێ، ماددەی نوێ دەخاتەوە ناو گەردوون بۆ ئەوەی چڕیەکەی بە نەگۆڕو جێگیری بمێنێتەوە... سەدان خۆرو ئەستێرە لەمەوە دروست دەبێت، لەم(M٤٢شۆریۆن نیبیۆلا)وە دروست دەبێت.

لەبواری کشتوکاڵدا:

راستیەك هەیە کە هەتا زەویەك بەرز تر بێت کشتوکاڵ کردن سەرکەوتنی زیاترە، شتێك هەیە پێی دەوترێ(DRANGE/درێنج)، واتە: (بزل)ی ئاو، ئەو ئاوە بۆ ئەوەی لە ناوچەی رەگی رووەکەکاندا نەمێنێتەوەو رەگەکان دانەڕزێنێ، هەتا خێراتر بێتە خوارێ سەلامەت ترە بۆ ئەو رووەکە، واتە کشتوکاڵ کردن لە بەرزایدا سەرکەوتنی زیاترە، خوای گەورە نموونەیەك دەهێنێتەوە

(وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثۡبِيتٗا مِّنۡ

---

[٤٧] الأنبياء ١٠٤

أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ ﴿٢٦٥﴾)[٤٨]

وشەی (ربوة)، واتە: (بەرز).

سەبارەت بە شوێنی ئاو، ئاو سوكنا دەكات لەناو گڵدا، لە سوورەتی(المؤمنون) ئایەتی ژمارە(١٨) خوای گەورە دەفەرموێ: (وأنزلنا من السماء ماء بقدر فأسكناه في الأرض وإنا على ذهاب به لقادرون)، (بقدر) ئەمڕۆ زانست دەڵێت: هەموو چركەیەك(١٦ ملیۆن تەن) ئاو دەبارێت بەسەر جیهاندا... ئەمڕۆ كە ئەو(قەدەرە) دۆزراوەتەوە... پاشان ئەم ئاوە سوكنای كردووە... خاسیەتێك هەیە لە(تربە)دا پێی دەوترێ(POROSITY/پۆرۆسیتی/النفاژیە)، ئەمە ئاوەكە خەزن دەكات... یاسایەك هەیە پێی دەوترێ(FIELD CAPACITY/ فایڵد كەپاسیتی/السعە الحقلیە) هەموو زەویەك بە باران بێت، یان ئاو دەدرێ، بەهەر رێگەیەك بێت، برێك بۆ خۆی هەڵدەگرێو برەكەی تری دەڕوات بەرەو خوارو تێكەڵی(ناخاو) دەبێت... خوای گەورە یاسایەكی لەوێدا داناوە سوكنایە، وشەی(سوكنا) هەمیشە دەڵێت(يفيد التضيق والحركة تفيد الأنطلاق والوسع) كە مرۆڤ دەیەوێت بجوڵێتەوەو كارێك بكات، پێویستی بە بۆشاییەكی گەورەو قەبارەیەكی گەورەیە، ئەگەر ویستی سوكنا بكات، سوكنای مادیمان هەیە، كە خانووە، وە سوكنای مەعنەویمان هەیە كە خێزانە،

(وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا ﴿٢١﴾)[٤٩]

، سوكنای ئەم ئاوە لەناو گڵدایە، لەناو مولولەیەكدا پێی دەوترێت(مایكرۆپۆرت).

راستیەكی تر هەیە كە هەموو ماددەیەكی خۆراكی رووەكی لە كلۆرۆفیلەوە دێت، كلۆرۆفیل ماددەیەكی سەوزە. لە پێكهاتەكانی ئاو زۆر پێویستە بۆ پێكهاتنی كلۆرۆفیل بە سەرنجدانێكی وردی ئەم ئایەتە لە سوورەتی(الأنعام) ئایەتی(٩٩) ئەم راستیە دەردەكەوێت: ( وهو الذي أنزل من السماء ماء فأخرجنا به نبات كل

---

[٤٨] البقرة ٢٦٥

[٤٩] الروم ٢١

شيء فأخرجنا منه خضرة)، وشەی: (خضرة) واتە(سەوز)(مادەی کلۆرۆفیل)... هەموو جۆرە میوەو دانەوێڵەیەك لەو سەوزەوە دێت، راڤەی ئەم ئایەتەو تەواوکەرەکەی زیاتر ئەم چەمکە روون دەکاتەوە.

لەبواری جیۆلۆجی دا:

لە جیۆلۆجی دەریادا راستیەك دۆزرایەوە بەهۆی مانگە دەستکردەکانو وێنە گرتنو زانستێکی نوێ کە پێی دەوترێ(التحسس عن بعد)، لە دەریای ناوەڕاستدا کە پەیوەندی دەکات لەگەڵ زەریای ئەتڵەسیدا لە گەروی(جبل طارق)دا، راستیەك دەرك پێکراوە، کە ئاوەکە فەحص دەکەن، رێژەی خوێی ئەملا لەگەڵ ئەولا جیاوازەو بەچاویش بەریەك دەکەون... رێژەی ئۆکسجینی تواوە لە ئاوی دەریای ناوەڕاستدا جیاوازە لەگەڵ زەریای ئەتڵەسیو لە پلەی گەرمیشدا، خوای گەورە دەفەرموێت ـ لە سوورەتی(الرحمن) ئایەتی(١٩ ـ ٢٠) ـ: (مرج البحرين يلتقيان بينهما برزخ لا يبغيان)، لە کۆنگرەیەکی زانستیدا بە ڤیدیۆ ئاماژە بە شاخێکی هەرەمی دەکرێت کە لەژێر(جبل طارق)دایە، ئەو ئاوە کە دێت دەگەڕێتەوە، بەڵام لەسەرەوە بە رووکەش تێکەڵ دەبێت، بەمانگی دەسکرد ئەگەر بۆی بڕوانرێ ئەو شاخە زۆر ئاشکرایە، ئەو دیوارەی کە لەنێوانیاندایە ناهێڵێت تێکەڵی یەکتری ببن.

لە قورئاندا دەفەرموێت:

(وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ﴿٧﴾)[٥٠].

واتە: رەگمان داناوە بۆ چیاکان. هەر بەهەمان ئەم زانستە هەموو چیایەك کە لەسەر زەویدا دەبینرێ، (١/٣) (سێ یەك)ی بالآی خۆی یان(٢/٣)(دووبەش لە سێبەش)ی بالآی خۆی رەگی هەیەو، زانستی ئەمڕۆ بەوێنە رەگەکەی پیشان دەدات.

*٤. لەبواری زانستی زیندەوەرانی بچووکدا:*

---

[٥٠] النبأ ٧

وشەی(العنکبوت) واتە(جاڵجاڵۆکە)... ئەم وشەیە لە رووی زمانەوانیەوە (مذکر)ە، بەڵام خوای گەورە بە مێینە بەکاری دەهێنێت:

(مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِۖ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾)[٥١]

(تاء التأنيث) بۆ (العنکبوت) دادەنێ، دەرکەوت لەم سەدەیەدا کە ئەو جاڵجاڵۆکەیەی تەنافەکان دروست دەکات مێینەیە.. وە لەهەمان کاتدا لاوازترین خێزان خێزانی(العنکبوت)ە، ئەگەر بزانن و عیلمیان هەبێت... دەرکەوت کە جاڵجاڵۆکەی نێرینە پاش ئەوەی کرداری جووت بوون لەگەڵ مێینەدا ئەنجام دەدات، مێینەکە دەیکوژێت و لاشەکەی دەخاتە ژێر گڵەوە، لەگەڵ گەراکانیدا تێکەڵی دەکات، کە گەراکان دەتروکێن لاشەی باوکیان دەخۆن.

دەربارەی مێش، خوای گەورە لە سوورەتی(الحج ـ ئایەتی ژمارە ٧٣) دەفەرموێت: (وإن يسلبهم الذباب شيئا لا يستنقذوه منه ضعف الطالب والمطلوب)، واتە: ئەگەر مێشێك شتێکیان لێ بفڕێنێ، ناتوانن لێی بسێننەوە، چونکە یەکسەر ئەو ماددەی گلوکۆزە یان هەر ماددەیەکی تری شەکر، کاتێك ئەم مێشە رایدەکێشێ، تێکەڵ بە ئەنزیماتی خۆی دەبێت، لەرووی پێکهاتنی کیمیاییەوە ئەو ماددەیە دەگۆڕێت و ناتوانرێت وەکو یەکەمجار وەربگیرێتەوە.

دەربارەی مێروولە، کە خوای گەورە دەفەرموێ مێروولە قسە دەکات،

(قَالَتۡ نَمۡلَةٞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٨﴾)[٥٢]

---

[٥١] العنکبوت ٤١
[٥٢] النمل ١٨

ئەمە لە گۆڤارێکی زانستیدا دەرچووە( SCINCE IN THE U.S. S.R) باسێك کراوە کە ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەتی دەریکردووە لە هەشتاکاندا کە مێرووله تا ژمارە(٦٠) شارەزایە.

*لەبواری پزیشکی ڤێتێرنەری:*

لە پزیشکی(ڤیتێرنەری)دا هاتووە کە سەربڕین سوودێکی زۆری هەیە بەپێچەوانەی خنکاندنی ئاژەڵو(منقوذة)، سەرنەبڕینی زیانێکی زۆری هەیەو هۆکاری تر هەموو زیانی هەیە.

*لە بواری پزیشکی مرۆییدا:*

ئەگەر وردبینەوە لە مێشکی مرۆڤ دەردەکەوێ کە لە مێشکدا ئەو ناوچەیە لە پێشەوەیە کە کە پێی دەوترێ ( ناوچەی بیستن یان عەقڵی بیستن)، پاش ئەو واتە لە ناوەڕاستدا(ناوچەی قسەکردن)دێتو پاش ئەویش ناوچەی بینینە.. جا بۆیە قورئانی پیرۆز(سمع وبصر) بەکاردێنێت، بەو ڕێکخستنە بەبێ ئەوەی پاشو پێشی ناوەکانیان بکاتو هەرگیز(بصر) پێش ناخات، چونکە لەپێشەوە(سمع) هەیە.. هەروەها زنجیربەندیێکی تریش هەیە کە لە قورئاندا نەگۆڕاوە

(صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ ﴿١٨﴾)[٥٣]

کاتێك(سمع) تێك دەچێت کەڕی دروست دەبێت، ناوچەی (speech) واتە (قسەکردن) کە تێك دەچێت لاڵی دروست دەبێت، وە ناوچەی (بینین) کە تێك دەچێت کوێری دروست دەبێت،(سمع و بصر) لە قورئاندا چەند بارە بۆتەوە، لە سورەتی(الأسراء ـ ئایەتی ٣٦، یونس ـ ئایەتی ٣١، هود ـ ئایەتی ٢٠، النحل ـ ئایەتی ٧٨، المؤمنون ـ ئایەتی ٧٨، السجده ـ ئایەتی ٩)، لە هەموو ئەو ئایەتانەدا بەو زنجیربەندیە هاتووە بەڵام(صم بکم عمی) لە سوورەتی(البقره ـ ١٨)و(البقره ـ ١٧١)،(الأنعام ـ ٣٩)،(الأنفال ـ ٢٢)، هەر بەو زنجیربەندیەیە.

---

[٥٣] البقرة ١٨ ، البقرة ١٧١

(إعجاز)ێکی ترمان هەیە سەبارەت بە(الأعصاب) لە پێستدایە، گۆشت هەست بە ئازار ناکات، ئازار هەمووی لە پێستدایە... خوای گەورە دەفەرموێت:

(إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿٥٦﴾)[٥٤]

ئەم ئایەتە بووەتە هۆی موسڵمان بوونی راگری کۆلیژی پزیشکی(چانگ مای) لە(تایلاندا) کە تایبەتمەندە لە بواری پێستدا... ئەوانەی کە پزیشکن دەزانن کە سوتانەکە دەچێتە پلە(٣)، واتە بەرەو گۆشتەکە دەڕوات، ئازاری زۆر زۆر کەم دەبێتەوە، تا دەگاتە ئاستێك ئیتر ئازاری نامێنێت، چونکە ئەو دەمارانەی ئازارەکە دەگوێزنەوە، ئازار ناگوێزنەوە، لەکاتێکدا کە سوتاون... خوای گەورە لە باسی سزای دۆزەخدا دەفەرموێت: کە گۆشتی بێبڕوایان نەگاتە ئەو قۆناغەی کە ئیتر لەبەر سوتاندنی زۆر هەست بە ئازار نەکەن، پێستەکانیان بۆ دروست دەکرێتەوە، بۆ ئەوەی بە بەردەوامی ئازارەکە ببینن.

ئیعجازێکی پزیشکی ترمان هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت:

(وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖ... ﴿٢٢٨﴾)[٥٥]

پرۆفیسۆرێك لە فەرەنسا شەش کتێبی(TEXT BOOK)ی داناوە، واتە(کتێبی سەرچاوە) کە دەخوێنرێ، لە باسی زانستیدا کە بەکارهات ئەو باسە زانستییە دەردەچێت، ئەم پرۆفیسۆرە شەش سەرچاوەی داناوە(TVM persad)... سەبارەت بەم ئایەتە قورئانییە لێیان پرسی کە بەراوردی بکات لەگەڵ یاسای فەرەنسیدا بۆ ئافرەتی تەڵاق دراو،(٣٠٠ رۆژ) دادەنێ کە شووبکات بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی کە منداڵدانی ئەو ئافرەتە منداڵی تێدا نیە، بەڵام قورئانی پیرۆز

---

[٥٤] النساء ٥٦

[٥٥] البقرة ٢٢٨

سێ(حیض)ی داناوه، ئەم پرۆفیسۆره دەفەرموێ: (دەگونجێ ئافرەت خولێکی مانگانەی بەسەردا بڕواتو سك پڕیش بێت، وه دەگونجێ دوو خولی مانگانە تەواو بکاتو سکی پڕ بێت، بەڵام هەرگیز ناگونجێت سێ خولی مانگانە تەواو بکاتو سکی پڕ بێت... ) بۆیە دانی نا بە راستی قورئانو بە هەڵەیی یاسای فەڕەنسیدا.

راستیەکی ترمان هەیە دەفەرموێ:

(وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴿٢٣٣﴾)[٥٦]

خوای گەورە واجبی کردووه بە شێوەیەکی زۆر جوان سەبارەت بە دایك کە دەبێت شیر بدات بە منداڵ بۆ ماوەی دو ساڵ... هەموو دونیا ئێستا ـ تەنانەت رێکخراوی تەندروستی جیهانیش ـ بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە شیری دایك دەبێت بدرێت بە منداڵان.دەرکەوتووە ئەو شیرە رۆژانە دەگۆڕێو پێکهاتەکانی دەگۆڕێ بە گوێرەی تەمەنی ئەو منداڵە... وە ماددەیەکە هەرسی ئاسانە... وە پاکژە... هەروەها پلەی گەرمییەکەی بەو شێوەیە بۆ منداڵەکە پێویستە لە زستانو لە هاویندا... ئەنتی بایەتیکو کۆمەڵێك دژی تێدایە کە زۆر زۆر پێویستە بۆ ئەو منداڵەو بۆ دوارۆژیشی کە بەرگەی نەخۆشی بگرێت... لە ساڵی(١٩٩١ ـ ١٩٩٢)دا، مامۆستایەکی زانکۆی میصری نامەی دکتۆرای هێنایەوە لەسەر ئەوەی دەزگای بەرگری لە مرۆڤدا لە دوو ساڵیدا تەواو دروست دەبێت... منداڵ دەزگای بەرگریەکەی گەشە دەکات تا تەمەنی دوو ساڵی، پاشان کۆتایی دێت... قورئان دەفەرموێت: (حولین کاملین)،(دوو ساڵ دەبێت شیر بدات)،(لمن أراد أن يتم الرضاعة) بۆ ئەوەی شیردانەکە تەواو بێت لەگەڵ تەواوی دەزگای بەرگریدا... سەبارەت بە دایکەکەش کە شیر دەدات، هۆرمۆناتی تایبەت دروست دەبێت بۆ ئەوەی منداڵدانی بگەڕێتەوەباری ئاسایی خۆی، چونکە ئەو منداڵدانە نۆ مانگ کشاوەو، نۆ مانگە ئەو ماسولکانەی منداڵدان هیلاکن، بەهۆی شیردانەوە یارمەتی دەدات کە

---

[٥٦] البقرة ٢٣٣

ڕەحمی(منداڵانی) بگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی... ئەو دایکانەی شیر دەدەن بە منداڵانیان کەمتر ئامادەییان تێدا دروست دەبێت بۆ توش بوون بە نەخۆشی شێرپەنجە، هەتا ئەو ئافرەتانەی کە شیری خۆیان نادەن بە منداڵەکانیان، یان ماوەیەکی کەم شیریان داوەتە منداڵەکانیان... جگە لەوەی کە ئافرەت شیری دا (حیض)ی دەوەستێتو ڕێکخستنی وەچەو نەوەکانیش فەراهەم دێت...

هەروەها جۆرە هۆگریو خۆشەویستیو سۆزێکی تایبەت دروست دەبێت لە نێوان دایکو منداڵەکەدا... هەروەها دەرکەوتووە کە کەوانی دەمی و کاکیلەی ئەو منداڵەی شیری دایك دەخوات ددانەکانی زۆر زۆر ڕێكو پێكو ئاساییە، بەڵام ئەو منداڵەی فێری مەمکە مژە بووە، کەوانی دەمی و ددانەکانی ناشیرینو باریك دەردەچێت.

(إعجاز)ێکی ترمان هەیە سەبارەت بە ئاو

(وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّ ﴿٣٠﴾)[٥٧]

هەموو زیندەوەرێك لە خانە پێکهاتووەو، خانە سایتۆپلازمی تێدایە لە(٧٠٪ ـ ٨٠٪)ی پێکهاتەی سایتۆپلازم ئاوە.

با بێینە سەر سوودی خورما سەبارەت بە ئافرەتی سکپڕو زەیستانەوە... قورئانی پیرۆز دەیگێڕێتەوە لە موعجیزەی لەدایك بوونی حەزرەتی عیسادا(علیه السلام)

(وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴿٢٥﴾)[٥٨]

(رطب)واتە(خورما)

(فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗا ﴿٢٦﴾)[٥٩]

ئەمڕۆ پزیشکەکان شەکراو دەدەن بە ئافرەت کە تازە منداڵی بووە، یان خەریکە

---

[٥٧] الأنبياء ٣٠
[٥٨] مريم ٢٥
[٥٩] مريم ٢٦



دەبیێت، بۆ ئەوەی ئەو وزەیەی ئەو منداڵدانە کاری دەکات خێرا قەرەبووی بداتەوە، دەرکەوت لە خورمادا ماددەیەك هەیە پێی دەڵێن(پرۆستا گلاندین PROSTA GLANDIN.) ئەم ماددەیە وا لە منداڵدان دەکات کاری خۆی بەجوانی بکاتو بچێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی... ماددەیەکە هەرسی ئاسانەو پەستانیش دادەبەزێنێو وادەکات کە کەمترین خوێن لەو ئافرەتە بێتە دەرێو کۆڵۆن هێمن دەکاتەوە... ئەو کۆرپەلەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ:

يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ[60]

واتە: ئێوە لە سکی دایکتاندا بەسێ پەردە داپۆشراون... زانستی پزیشکی ـ لە توێکاریدا ـ دەڵێت: سێ پەردەیە، یەکەمیان پێی دەوترێت: ئەمنیۆتك، دووەم: کۆرنیۆتك مێمبرین، سێیەم: دیسد یوەڵ.

(سَنُرِيهِمْ ءَايَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ﴿٥٣﴾)[61]

---

[60] الزمر ٦

[61] فصلت ٥٣



# باسی حەوتەم
# ئیعجازی زانستی لەقورئان و سوننەتدا

بەشی یەکەم[٦٢]:

پەرجوو (معجزە) تەنها هۆکارێك نەبووە کە پێغەمبەران پشتیان پێ بەستبێ بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی خوا لە سەر زەویدا، بەڵکو هەموو پێغەمبەرێك کە هەوڵی داوە ئەرکی سەرشانی بگەیەنێتە میللەتەکەی، لەسەر سێ تەوەرە هەوڵی داوەو کارەکەی ئاڕاستەی جەماوەر کردووە:

تەوەرەی یەکەم: عەقڵ

وروژاندنی عەقڵی ئەو جەماوەرەیە بۆ پرسیارکردنو گەڕان بەدوای ئەو شتانەدا کە ئاسۆی فیکریو عەقڵی ئەو خەڵکە موتوربە دەکات بە زانست پەروەری، ئیدی هەر لەدروستکردنی گۆزەیەکەوە تا جیهانو مرۆڤ لە دروستکەرو بەدیهێنەری بپرسێت... میکانیزمو هۆکاری تێگەیاندنی هەر پێغەمبەرەو لەگەڵ میللەتەکەیدا بەستراوە بە تواناو ئاستی فیکریو زانستیو هۆشیاری گەلەکەیەوە.

تەوەرەی دووەم: سۆز

وا لەو جەماوەرە دەکات کە سۆزی بجوڵێ و بجۆشێ... بۆپاراستنی یەکێتی ریزەکانی خۆیان... بێگومان هەموو پێغەمبەرێکیش بە زمانی گەلەکەی خۆی قسەی کردووەو بێگانە نەبووە بە گەلەکەی.

تەوەرەی سێیەم: پێشەوایەتی لە رەفتارو کردار(عمل)دا

---

[٦٢] سەرچاوەکانی ئەم کۆباسە بریتییە لە :

أ - کۆمەڵێك کۆباسی مامۆستا (عبدالمجید الزنداني) لە ساڵی ١٩٨٧ دا بەناونیشانی (المعجزة المتجددة في القرآن والسنة) بڵاوی کردۆتەوە.

ب - العلم والأعجاز دکتۆر دلاوەر محمد صابر ١٩٩٨ ، مامۆستای مایکرۆبایۆلۆجی لە زانکۆی سلێمانی و صلاح الدین و دهۆك.

ئەوپێغەمبەرە خۆی پێشەوای جێبەجێکردنی کرداری فەرمانەکانە کە لەلایەن خواوە هێناونی، خاوەن رەوشتو ئەدگارێکی پێشینەی جوانەو ئەرشیفی کردارو رەفتاری رەنگینە بە ویقارو سەنگینی دوور لەو شتانەی کە لە خەڵکی نەرێ دەکات. رابردوویەکی جوانی هەیەو هەموو هۆکارێکی پێشەوایەتی تێدایە.

سەرەڕای ئەم سێ تەوەرە سەرەکییە خوای گەورە پاڵپشتیەکو پشتگیریەکی بۆ دەنێرێ کە پێی دەوترێت(پەرجوو - معجزە) بۆ ئەوەی ئەو میللەتە هەموو توێژەکانی باوەڕبهێنن بەو پێغەمبەرەو لە رۆژی قیامەتدا هیچ جۆرە بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەبێت بڵێن ئێمە ئاگادار نەکراینو هەواڵمان پێ نەگەیەنراوەو بێئاگاین.

بەڵام دەبینین(پەرجوو - معجزە)کە کاریگەری نەوە دوای نەوە کاڵ دەبێتەوە، بەو واتایەی گرۆی ئادەمی کە دێت ئەو(معجزە) حسسیانەی نەبینیوە، بەڵکو باوکی بۆی دەگێڕێتەوە،بەڵکو گرۆی سێیەم کە دێت،بەتەواوی دەبێتە(بیسەر لەبری بینین)و خۆی هیچی لە(معجزە) نەبینیوە... وردە وردە دوای ماوەیەك قسەی تر دەبنە میوانی بابەتەکەو مۆڵەت بۆ دروست بوونی گومان خۆش دەبێتو کاریگەری(معجزات)یەکجار کاڵ دەبێتەوە.

جا لەبەر ئەوەی کە دوای(محەممەد) پێغەمبەر(ﷺ) پەیامنێری تر نایەتو شەریعەتی تر نایەت، وە بۆ ئەوەی گەلی پایان بێبەش نەبن لە(پەرجوو - معجزە) دوا پەیامی خۆی کە بەناوبانگە بە قورئان(موعجیزە چن) کردووە... لەناو خودی پەیامەکەدا(ئیعجازی) داناوە، چ لەڕووی رەوانبێژییەوە، چ لەڕووی مێژووییەوە، چ لە رووی زانستییەوە... هتد، کە بگونجێ لەگەڵ هەموو گۆڕانکاری زەمکانێك[٦٣]. وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (لا تنقضي عجائبه)[٦٤]، هەموو نەوەیەك بەشی خۆی هەیە لە(معجزات)ی قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر.

*١ - هەورو تەرزە:*

---

[٦٣] واتە زەمانو مەکان.

٦٤ ئەم فەرموودەیە بەم شێوەیە (ولا تنقضي لا تفنى عجائبه) هاتووە لەم سەرچاوانەدا: أ - رواه الدارمي في فضائل القرآن ٢٥/١ ب - رواه الترمذي في ثواب القرآن /١٤

له ساڵی ١٩٨٥ کۆمەڵێك له زانایانی ئەمریکا لە کەشناسیدا لێکۆڵینەوەیەکیان کرد لەسەر(هەور) بەهۆی چەندان ئامێری پێشکەوتووەوە، لە ئەنجامدا بۆیان دەرکەوت کە ئەو هەورەی هەڵگری(تەرزە)یە شێوەکەی شاوڵیو چیاییو شاخاوییەو جیاوازە له هەوری ئاسایی.

هەروەها ئاکامێکی تریان بەدەست هێنا که ئەمەبوو:

تەنها ئەو هەورانەی هەڵگری تەرزەن خاوەن بروسکەن. هەورە بروسکە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو هەورە تەرزەی پێیە، خۆ ئەگەر تەرزەی پێنەبوو بروسکەی نییە.

راڤە زانستییەکەشی ئەمەیە:

ئەو دڵۆپە ئاوانەی لەدۆخی شلیەوە دەچنە دۆخی رەقو دەبنە تەرزە، شوحناتێکی کارەبایی لەسەر تەرزەکەدا بڵاودەبێتەوە بەشێوەی سپارکێك کۆدەبێتەوەو وەك پزیسکێك یان بروسکەیەك دەردەکەوێت.

ئەوەشیان ووت: کەدەبێت رێژەی گەرمی ئەو هەورە زۆر سارد بێت بەراددەی(١٠ ـ ٢٠) ژێر سفری سەدی.

جا ئێستا با سەیری قورئانی پیرۆز بکەینو بزانین سوورەتی(نور) چەند جوان ئەم دوو خاڵە باس دەکات کە ئەم زانایانە پێی دەگەن: برگەی یەکەم ئاکامی یەکەمی تێدایە کە دەفەرموێت:

(وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ ﴿٤٣﴾)[٦٥]

واتە: (خوای گەورە لە ئاسمانەوە لەشێوازی جۆرە شاخێكو چیایەکەوە تەرزە دەبارێنێ)

(فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ﴿٤٣﴾)[٦٦]

برگەی دووەمی ئایەتەکە هەواڵی دووەمی تێدایە:

---

[٦٥] نور ٤٣

[٦٦] نور ٤٣

(يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَـٰرِ ﴿٤٣﴾)[٦٧]

سنا: له زمانی عەرەبیدا واته(لمعان)، درەوشانەوەو بریسكە.

ئایەتەكە واتـه: ( درەوشـانەوەی ئـەو بروسـكەیە دەگەڕێتـەوە بـۆ(برقیـه) خـودی تەرزەكە،(ئەو ـ ه ـ هاء ـ دەگەڕێتەوە بۆ ـ برد ـ تەرزە ـ كە).

*٢ـ باران بارین:*

له شەستەكاندا كه ئێمه له پلەكانی ناوەندیدا بووین، زۆر عـەزێتمان دەخـوارد بەدەسـت هەنـدێك هەواڵـەوە كـه لەڕێگـەی ڕۆژنامـەو رادیـۆوە بڵاودەكرایـەوەو دەهاتو دەنگۆی بوو بەوەی كه كۆمپانیا هەیـه لـه ئـەمریكا بـاران دەفرۆشـێ، كـه ئەمەش پێچەوانەی دەقێكی قورئانی پیرۆزە كه دەفەرموێت:

(إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ ﴿٣٤﴾)[٦٨]

ئەمه لەو پێنج كلیله غەیبیەیه كه كەس نایزانـێ، چونكه سـەرەڕای ئـەم ئایەتـه پـیرۆزەش پێغەمبـەری خۆشەویـستمان(صـلی الله علیـه وسـلم) لـه فەرمودەیەكیـدا دەفەرموێت: (مفـاتيح الغيـب خمـس لا يعلمهـا إلا الله، لا يعلـم مـافي غـد إلا الله، و لا يعلم ما تغيض الأرحام إلا الله، وما يعلم أحد متى يأتي مطر إلا الله، و ماتدري نفس ماذا تكسب غدا، وما تدري نفس بأي أرض تموت).

ئێمه وەك موسڵمان لەوە ئاگادارین كه قورئانی پـیرۆزو فـەرمودەی(صـحیح) لـه چەند شوێنو جێگادا ئاماژە به گەورەیی زانـستو ئـەركی مـەزنی زانـست دەكـەنو فەرمانمان پێدەكەن كه هەمیشه لـه هـەوڵی ئـەوەدا بـین زانـستەمەند بـین، بۆیـه بەلامانەوە چاوەڕوان نەكراوو نەشیاوە ڕۆژێك له ڕۆژان وا دەركەوێت ئایەتێك یان

---

[٦٧] نور ٤٣

[٦٨] لقمان ٣٤

فەرمودەیەکی(صحیح) پێچەوانەی حەقیقەتێکی زانستی بێت.

ئێمە وەك موسڵمان باوەڕمان بە پێشکەوتن‌و گۆڕانکاری‌و بەرەوپێشەوەچوونی زانستی‌و تەکنۆلۆجی هەیە، هەر بۆ نموونە: باوەڕمان بەوە هەیە کە مانگە دەسکردەکان گەشتی بۆشایی ئاسمان دەکەن‌و تەنانەت لە حەفتاکاندا یەکێك لەومانگە دەسکردانە تایبەت مەند بوو بە ئیشوکاری مۆسکۆ، وە وەکو ئەوەی وێنەی ئەو سەیارانەی دەگرت کە نایاسایی دەکەن‌و تەنانەت ژمارەی سەیارەکانیشی یاداشت دەکرد.

باوەڕمان بەوە هەیە کە لەمسەری جیهانەوە بۆ ئەو سەری جیهان دەتوانرێت بەهۆی ئامێری تەکنۆلۆجیەوە بە دەنگ‌و رەنگەوە پەیوەندی بکرێت، یان دەرهێنانی چاو لە مردووەوە ناشتنی لەچاوی کەسێکی نابینای زیندوداو پاش نەشتەرگەری بۆ کردنی بینایی بۆ بگەڕێتەوە، هەروەها باوەڕمان بەوە هەیە کە بەهۆی ئامێری پێشکەوتووەوە دەتوانین ژێر زەوی ببینین، کە ئامێرەکە پێمان دەڵێت لە ئەوەندە مەتر قوڵاییدا کانزا یاخود نەوتی تێدایەو بڕی نەوتەکەشمان پێدەڵێت، بڕوامان بەمانە هەمووی‌و لەشێوەی ئەمانەش زیاتر هەیە، بەڵام بڕوامان بەوە نییە کە مرۆڤ بتوانێ باران ببارێنێ.

هەرواش بووە، چەند مانگێك دوای ئەو هەواڵ‌و دەنگۆیە، هەر لەناو ئەمریکا گرفتێك دروست بوو، دەیان‌و سەدان کەس لە کشتیاران‌و خاوەن زەویەکان کە کڕیاری باران بوون لە کۆمپانیاکان، بۆیان دەرکەوت ئەو شتە نە واقیعی بوو، نەڕاست بوو، بۆیە سەدان سکاڵا درا بە دادگاو هێندە سکاڵاو نارەزایی زۆر بوو لەسەریان، کار گەیشتە ئەوەی(نەتەوە یەکگرتووەکان) بەرەسمی داوای لە پسپۆڕانی خۆی کرد لێکۆڵینەوەیەك بکەن لەسەر ئەم کێشەیە.

پاش پشکنین‌و توێژینەوەیەکی زۆر قووڵ، لە هەشتاکاندا(نەتەوە یەکگرتووەکان) بەیانێکی رەسمی بڵاوکردەوە کە تیایدا هاتبوو: باران بارین لەڕێگای مرۆڤەوە یان کۆمپانیاوە بونیادێکی زانستی نییە، بەڵکو چەواشەکردنێکی قۆپیە ئامێرو ساختەکارانەیەو میتۆدێکی زانستی نییە، هەر بۆیە کۆمپانیاکانیش داخران‌و نەمان.

لێرەدا زیاتر ئەوەمان لەلا روون بۆوە کە نەگونجاوە حەقیقەتێکی زانستی لەگەڵ ئایەتێك یان فەرمودەیەکدا پێچەوانە بوەستێتەوە... بەڵام هەندێك کات(تیۆرێك، گریمانەیەکی زانستی) پەیدا دەبێت کە دەشێت بەرامبەر بە دەقێکی قورئانی یان چەمکی فەرمودەیەك سەنگەر بگرێتو دژە هزر بێت، لەم کاتەدا زمکانی تیۆرەکە رۆڵی هەیەو دەبینین بە ماوەیەك پاشتر زەمەنی بەسەردەچێتو هەر خۆی هەڵدەوەشێتو دەپووکێتەوە، تاوەکو(پاسایەك، راستیەکی زانستی) دێتە ئاراوەو بە ملکەچیەوە دێتە خزمەتی ئایەت یان فەرمودەکە.

لە(یەکەمین ئەنجومەنی پەرجووی زانستی بۆ قورئان) (المؤتمر الأول إعجاز العلمي للقرآن) لە پاکستان ساڵی ١٩٨٥، کە کۆمەڵێکی زۆر لە پسپۆڕانی جیهان بانگهێشت کرا بوون، بەتایبەت لەو زانایانەی کە نیشتەجێی ئەمریکاو ئەوروپانو دوورن لە ئیسلام، دوورن لە میکانیزمی ئیسلامیو ژیاری ئیسلامیو خوێندنو راگەیاندنی ئیسلامی، ئەگەر روونکردنەوەیەکیشیان پێگەیشتبێ لەسەر ئیسلام بەهەڵەو چەواشەکارییەوە پێیان گەیشتووە.

یەکێك لەو پسپۆڕانە کە پسپۆڕی کەش ناسییە، ناوی(د. فۆت)ە، لەبارەی بارانەوە پرسیاریان لێکرد، ئەویش لە وەڵامدا وتی: بەهۆی تەکنۆلۆجیای پێشکەوتووەوە گەیشتووینەتە رادەیەك لەوانەیە بزانین بۆ سبەینێ(پلەی گەرما) چەندە، رادەی شێ چەندە، پاڵەپەستۆی هەوا چەندە، بەڵام مەسەلەی باران جێگیر ناکرێ، چونکە پەیوەستە بە(با)وە،(با)ش هەزاران فاکتەری هەیە کە کاری تێدەکات، بۆیە رێژەی زانینی جێگیر نییە.

مامۆستا(عبدالمجید الزندانی) چاوپێکەوتنێکی کرد لەگەڵ بەڕێوبەری گەورەترین پەیمانگای لێکۆڵینەوەی کەشناسی لە ئەمریکادا، (ئەو پرۆفیسۆرە -٢٠٠- هەڵگری بڕوانامەی دکتۆراو -١٥٠- ئەندازیاری لەو پەیمانگایەدا لە ژێر دەستدایە) سەبارەت بە باران هەمان پرسیاری لێکرد، کە تاچەند مرۆڤ تونای ئەنجامدانی پرۆسەی باران بارینی هەیە.

وتی: رەگو ریشەیەكو بنەمایەکی زانستی نییە. چونکە ئەگەر وابوایە ئەوا کۆمپانیاکانی ئێرە دەیانتوانی لەو شوێنەدا باران ببارێنن کە پاودەرو تەپوتۆزەکە

به فرۆكه دەكەن بەسەر گەواڵە هەورەكاندا بەڵام تا ئێستا لەو شوێنەدا ئەوان ئەو پرۆسەیە ئەنجام دەدەن نە باران باریوە، نە بەردەوامیش بووە.

٣ ـ رەشكە:

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەربارەی رەشكە دەفەرموێت: (إن في الحبة السوداء شفاء من كل داء إلا السام ةالسام الموت)[٦٩]، عائیشە(خوا لێی رازی بێت)دەفەرموێت: وما السام؟، فەرموی: (الموت)، واتە: (رەشكە دەرمانە بۆ هەموو دەردێك).

ئەم فەرمودەیە هاندەرێكە بۆ بەكارهێنانی رەشكە، كە لە كوردەواری خۆماندا دەكرێت بەنانی تیریەوە.

بۆ رامانێك لەم فەرمودەیە دەخوازین پرسیارێك لە خۆمان بكەین؛ ئایا بۆ هەموو دەردێك كە روودەكاتە مرۆڤ چ بەشێك لە مرۆڤ دژ بەو نەخۆشییە دەوەستێت؟!، چ شتێك لە مرۆڤدا بەرگری دەكات، دەچێتە سەنگەری بەرامبەرەوە دژ بە هۆردووی نەخۆشی؟.

ـ تەنها(ئامێری بەرگری)یە بەم ئەركە هەڵدەستێت، كە پێكهاتووە لە(خرۆكە سپیەكانی ناوخوێن) كە پێیان دەوترێت(IMUNE/ ئیمیون سیستم)(جهاز المناعە) وە بریتییە لە چەند پۆلو جۆرێك لە(خرۆكەی سپی) لەوانە: (NATURAL KILLERS،LYMPHOCYTE ،FAGOCYTE) (فاگۆسایتەو لەمفۆسایتەو ناچرەڵ كیلەرز)و...هتد.

پرۆفیسۆرێكی موسڵمان بەناوی(د. أحمد القاضي) لە ئەمریكا لە رازی ئەم فەرموودەیە تێگەیشتووە كە پەیوەندیەك هەیە لەنێوان(رەشكەو ئامێری بەرگری مرۆڤ)دا، لێكۆڵینەوەیەكی لەسەر مرۆڤێكی لەش ساغو مرۆڤی تووش بوو بە نەخۆشی شێرپەنجە ئەنجامدا... دوانزە مرۆڤی خۆبەخشی لەش ساغی(فحص) كرد دوو جۆر خرۆكەی سپی وەرگرت لە خوێنیان:

---

[٦٩] ئەم فەرمووده (صحيحة)و چەندین راوی ریوایەتیان كردووە، وەك: (البخاري في الطب/٧) و (مسلم في السلام ٨٨/٨٩) و(الترمذي في الطب /٥) و (إبن ماجة في الطب/ ٥/٩) و (الأمام أحمد في مسنده/ ٢/٢٤١/٢٦١/٢٦٨...).

١- پێی دەڵێن: ( T- LYMPHOCYTE).

٢- پێی دەڵێن: NATURAL KILLERS، واتە: بکوژانی سروشتی، ئەمانە پەلاماری هەموو تەنێکی بێگانە دەدەن کە دێتە لەشەوە، وەك(میکرۆب، پارچە ئاسن، تەنی زیندوو، یان نازیندوو).

هەموو بەیانیانو ئێوارانێکیش(یەك غرام) رەشکەی پێدەدان، بەیانیان کەوچەکە چایەكو ئێواران کەوچکە چایەك، بەدان بیکرۆژنو قووتی بدەن...

پاش ماوەیەکی کەم دووبارە فەحصی کردنەوە، بۆی دەرکەوت:

١- لە هەموویاندا( T- LYMPHOCYTE) بە رێژەی ٧٢٪ زیادی کردووە.

٢- هەروەهاNATURAL KILLERS بە رێژەی ٧٣٪ زیادی کردووە.

بەم جۆرە دەرکەوت(رەشکە) ئامێری پاراستن لە مرۆڤی لەش ساغدا دەوروژێنێتو چالاکتری دەکات.

لە بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەیدا هات، هەندێك هەنگوینی تێکەڵ کرد لەگەڵ رەشکەکەداو، دای بەو مرۆڤانەی تووشی(شێرپەنجە) بوون، پاشان سیریشی پێدان بۆی دەرکەوت:

١- لەهەموویاندا( T- LYMPHOCYTE)بەرێژەی ٢٠٠٪ زیادی کردووە.

٢- هەروەها NATURAL KILLERS بەرێژەی ٣٠٠٪ زیادی کردووە.

بەم بۆنەیەوە لە ساڵی ١٩٨٧ دا خەڵاتی لەلایەن(رۆناڵد ریگن)ەوە وەرگرت، چونکە رۆناڵد ریگن خەڵاتی دانابوو بۆ هەر زانایەکی ئەمریکی کە دەرمانێك بدۆزێتەوە بۆ بەهێزکردنو چالاك کردنی(ئامرازی بەرگری مرۆڤ)، بۆ بەرەنگاری لە نەخۆشی(الأیدز)دژ بە ڤایرۆسی(H.I.V)، لە لاپەڕە(٧١)ی کتێبەکەی

(د. دلاور دا العلم والأعجاز) ئاماژە دەکات بە گۆڤارێکی زانستی بەناوی(EXPERIMENTAL HEMATOLOGY)ژمارە(٢١) ساڵی ١٩٩٣(لاپەڕە ١١٨٦) کە تیایدا هاتووە:

زانا ئەمریکیەکان بۆیان دەرکەوت کە لەم کاتەدا تەنها رەشکە دەتوانێت(شێرپەنجە) لەناو ببات، بۆیە هاتن لە پەیمانگایەك کە تایبەتە بە( لێکۆڵینەوە لەسەر شێرپەنجە) لە ویلایەتی(نۆرپ کارۆلاینا).

**ئەو زانایانە[٧٠] دەڵێن:**

**پاڵفتەی ئەم رووەکە(رەشکە) کە بە لاتینی پێی دەڵێن( NIGELLA SATIRA) بەکارمان هێناوەو گەیشتوینەتە ئەم سێ ئەنجامە:**

**١. هەموو خرۆکەیەکی(ئامێری بەرگری مرۆڤ) دەوروژێنێو چالاکی دەکات.**

**٢. هەموو جۆرەکانی خرۆکەی سپی لە لەشی مرۆڤدا زیاد دەکات.**

**٣. بەشێوەی پراکتیکی دەرکەوت کە لەماوەی(ئین کیوبێیشن/ماوەی سکپڕی)دا خانەی شێرپەنجەیی دەکوژێتو لەناوی دەبات(پاڵفتەی رەشکە تەنها شتێکە بتوانێت خانەی شێرپەنجەیی بکوژێت)، بۆیە ئێمەش جەختی لەسەر دەکەینەوە**

(وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾)[٧١]

**بەشی دووەم:**

***٤ـ ئاسودە بوون بەهۆی قورئان خوێندنەوە:***

**زانای پسپۆڕ(د. أحمد القاضي) لە ئەزموونێکیدا لەسەر ئەو مرۆڤانەی حاڵەتێکی دەروونی نائاساییان هەیە کە پێی دەڵێن(تێنشن، گرژبوونی دەرونی، توتر العصبی)، ئەو کەسانەی کرد بە دوو گروپەوە:**

**١. ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە(ئایینی ئیسلام) نیەو، ئایینێکی تریان هەیە وەکو مەسیحی یان جوولەکە، پیرو گەنجو ژنو پیاو.**

**٢. ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە(ئایینی ئیسلام) هەیەو موسڵمانن.**

**کۆمەڵی یەکەمی هێناوە بۆ ژوورێکی هێمنو بە ریکۆردەرێك قورئانی پیرۆزی بۆ لێداون... جا بۆ ئەوەی بزانرێت رادەی کاریگەری کاسێتە تۆمارکراوەکان لەسەر دەروونی ئەم مرۆڤانە چەندە، بەچەند کەناڵێك پشکنینەکە ئەنجام دەدرێت، چونکە جێگای ئاماژە پێکردنە ئەو کەسەی کە تووشی(گرژبوونی دەروونی) دەبێت:**

---

[٧٠] ناوی زاناکان لە کتێبی (العلم والأعجاز)دا لاپەڕە (٧)دا یاداشت کراون، تەنانەت ئەم پەرەگرافەش بە دەقە ئینگلیزیەکەی نووسراوە.

[٧١] النجم ٣ ـ ٤

١.(تا)و گەرمی پێستی زیاد دەكات.

٢. توانای كارەبایی لەشی مرۆڤەكە زیاد دەكات.

٣. لێدانی دڵی زیاد دەكات.

ئامێر هەیە بۆ پێوانە كردنی ئەم سێ خاڵەی سەرەوە... ئەو كەسە كە دێتە ژوورەوە، ئامێرەكان دەبەستن بە لەشیەوەو لەوێوە دەبەسترێتەوە بە كۆمپیوتەرێكەوە تا بزانن ئایا خوێندنی قورئان بەسەریاندا لە رێژەی گرژبوونەكەیان دادەبەزێنی؟.

لە ئەنجامدا دەركەوت:

١. بۆ ئەوانەی كە باوەڕیان بە ئیسلامی پیرۆز نەبوو ٦٠٪ی گرژبوونەكەیان دابەزی.

٢. بۆ ئەوانەی كە موسڵمانن ٩٧٪ رێژەی گرژبوونەكەیان دابەزی.

هەندێك كەس گومانی لەوە هەبوو كە رازی سەركەوتنی ئەم ئەزموونە لە شیرین زمانی عەرەبیەكەدا بێت نەك لە خودی قورئانەكەدا...

بۆیە(د. أحمد القاضي)هەمان ئەزموونی دووبارە كردەوە بەسەر كۆمەڵێك نەخۆشدا، لەهەردوو گروپەكە، بەڵام لەبری كاسێتی قورئان كۆمەڵێك شیعری عەرەبی سەردەمی نەزانی(أمرئ القيس)و كەڵەشاعیرانی بەناوبانگی عەرەبی بەكارهێناو خوێنرانەوە بەسەریاندا، بەڵام هیچ رۆڵێكی لەبەرچاویان نەبوو.

هەندێكی تر وتیان، كە خوێندنی(مرتل) كاریگەری خۆی هەیە بۆیە قورئانەكە شوێنەواری بەجێ دەهێشت،(د. أحمد)یش شیعرەكانی كرد بە(ترتيل) بەڵام دیسان هیچ رۆڵێكوگرنگیان نەبوو لە دابەزینی رێژەی گرژ بوونەكە.

لە ئەنجامدا روون بۆوە كە نەزمانی عەرەبی و نە تەرتیل و ئاوازەكە كاریگەریان نیە لەسەر دەروونی خەڵك، بەڵكو رازی ئەم كردیشمەیە تەنها خودی قورئانەكە خۆیەتی.خوای گەورە جل جلاله لە سوورەتی(الأسراء)دا دەفەرموێت:

(وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ

ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ )[٧٢]

ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە ئاماژەیـەکی تێدایـە بـۆ ئـەم مەسـەلەیە کـە خـوای گـەورە لـە قورئاندا دەفەرموێ (شفاء) دەنێرین نەك(علاج).

*٥ ـ گۆشتی ئاژەڵی پیس خۆر:*

لێکۆڵینەوەیـەکی نـوێ کـراوە، کـە جـەخت دەکات لەسـەر ئـەوەی ئـەو (باڵنـدە، مەڕومالأت، رەشەوڵاخ)ەی کە پیسایی بخوات لەگـەڵ ئالیکەکەیـدا، ئـەو پیسـاییە چ میکرۆبەکەی چ ژەهرەکەی( نەریخۆڵە، نە ورگ، نە گـەدە)ی ئـەو ئاژەڵـە ناتوانێـت لەناوی ببات... بەڵکو دەگوێزرێتەوە بۆ نـاو خـوێنی ئـەو ئاژەڵـەو ئینجـا دەچـێتە گۆشتییەوەو ئەگەر شیرداریش بوو دەچێتە شیرەکەیەوە.

وەکو نەخۆشی(مانگا شێتە ـ جنون البقر) کە لە(بریطانیـا) پەیـدا بـوو لـە ئـەوروپا بـڵاو بـۆوە... وە یـان لـە باڵنـدەدا وەکـو ئـەو نەخۆشـیەی لـەم مـاوەی رابردوودا[٧٣] لە تـایوان بڵاوبۆوە لـەناو مریشکدا کە زۆر ترسـناك بـوو تـا گەیـشتە یابانیش. جا ئەگەر مرۆڤ گۆشتی ئەم جۆرە ئاژەڵو باڵندانە بخوات دەچێتە لەشـی مرۆڤەکەشەوە.

لەم بارەیەوە(عەبدوڵای کوڕی عومـەر)(خـوا لێـی رازی بێـت) دەگێڕێتـەوە لەسـەر زمانی پێغەمبەرەوە(ﷺ):

(نهی رسـول الله عـن أكـل لحـوم الجلالـة وشـرب لبنهـا)[٧٤]، واتـە: ( پێغەمبـەر نـەرێی کـردووە لـە خـواردنی گۆشـتی جەللالـەو خواردنـەوەی شیرەکەشـی)،(جلالـە): ئـەو ئاژەڵەیە کە گەڕۆکەو پیسایی دەخوات.

---

[٧٢] الأسراء ٨٢

[٧٣] واتە هەر لە ساڵی ١٩٩٨ دا

[٧٤] ئەم فەرموودەیە بەم شێوەیە: (نهى رسول الله صلى الله عليه وسلم عن لحوم الجلالة وألبانها) هاتووە لەم سەرچاوانەدا: ( أبو داود في باب الجهـاد /٤٧ والأطعمـة ٢٣/٢٤ والأشـربة ١٤) والترمـذي في الأطعمة ٢٤) و( النـسائي في ٤٤/٢٢٣) و (إبـن ماجـة في الـذبائح /١١) و(الأمـام مالـك في الأضـاحي ٣٨) و ١٠الأمام أحمد في مسند ٢١٩٥/ ٢٥٢/٢٤١)

*٦ ـ جیاوازی سەگو پشیلە:*

پێغەمبەر(ﷺ) لەچەندین فەرمودەدا نەرێی کردووەلە نزیك کەوتنەوە لە لووتی سەگ، وەك دەفەرموێت: ( لا تدخل الملائكة بيتا فيه كلب و لا صورة)[٧٥]، واتە: ( فریشتە روو ناکاتە ماڵێك کە سەگ یان بتێکی تێدا بێت کە بپەرسترێت).

هەروەها دەربارەی ئەو(لەگەنو سینیو قاپو قاچاغو جام)ەی کە سەگ دەمی بۆ بردبێو زمانی لێدابێ فەرمویەتی کە حەوت جار بشۆرێت، وە(مستحب) وایە کە یەکێك لەو جارانە بە(قوڕ) بێت.

لێیان پرسی ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەی دەربارەی پشیلە؟.

فەرموی: ( إنها ليست بنجس، إنها من الطوافين عليكم و الطوافات[٧٦])[٧٧]، واتە: (پشیلەی نێرو مێ پاكو خاوێنەو پیس نیە).

با ئەم فەرمودەیە بخەینە بەر تیرۆژی زانستی ئەمڕۆ ١٩٩٨، دەبینین کە چەندین لێکۆڵینەوە لە بواری جیۆلۆجی و(البیطریة)دا هەیەو جەخت دەکەن لەسەر ئەوەی کە سەگ(٥٠) جۆر نەخۆشی دەگوێزێتەوە، بەڵام تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە کە بڵێت: پشیلە هیچ نەخۆشیەك دەگوێزێتەوە!، بێجگە لە پیساییەکەی کە ئەویش هەر خۆی دەیکات بەژێر زەوییەوە.

*٧ ـ خواردنی جۆ[٧٨]:*

چەند زانایەکی ئەڵمانی لێکۆڵینەوەیەکیان کردووە دەربارەی (خواردنی جۆ) وەك لێنان بەشێوەی شلەو شۆربا، گەیشتوونەتە چوار خاڵ:

---

[٧٥] چەندین راوی ئەم فەرموودەیان ریوایەت کردووەو (صحیح)ە، وە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (البخاري في بدء الخلق ٧/١٧) و (أبو داوو في اللباس/٤٥/٤٤) و(الترمذي في الأدب/٤٤) و (النسائي في الطهارة/١٦٧ والصيد ٢٠/١٩) و(الأمام مالك في الأستئذان/٨/٦)

[٧٦] لەم سەرضاوانەدا هاتووە: (أبو داود في الطهارة /٣٨)و (الترمذي في الطهارة /٦٩)و (النسائي في الطهارة /٥٢ وفي المياه /٩)و ١٠الأمام مالك في الموطأ /١٣) و(الأمام أحمد في مسنده ٣٠٩/٣٠٣/٢٢٦)وە لە ریوایەتی (إبن ماجة في الطهارة /٣٢)بەم شیوقیة هاتووە: (إنها ليست بنجس. هي من الطوافين أو الطوافات) وە بەچەند شێوەیەکی تر کە نزیکن لەیەکەوە لەو سەرچاوانەدا هاتووە.

[٧٧] کاسێتی ژمارە (٢) لە زنجیرەی ( المعجزة المتجددة في القرآن والسنة)م. الزنداني

[٧٨] العلم والأعجاز . لاپەڕە ٩٥ دەقی ئەم لێکۆڵینەوەیە بە ئەڵمانی لەم کتێبەدا دەست دەکەوێت.

١. تووشی رەقبوونی خوێنبەرەکان نابێت.
٢. تووشی بەرز بوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن نابێت.
٣. تووشی بەدخۆراکی کانزایی نابێت.
٤. تووشی قەبزی نابێت.

ئێستاش با بێینە سەر فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) بزانین لەم بارەیەوە چی دەفەرموێت: عائیشە(خوا لێی رازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

(كان رسول الله(ﷺ) إذا أخذ أحدا من أهلهالوعك أمر بالحساء من الشعير فصنع ثم أمرهم فحسوا منه ثم يقول: إنه ليرتو فؤاد الحزين ويسروا(عن) فؤاد السقيم كما تسروا إحداكن الوسخ بالماء من وجهها)[٧٩]، عائیشە(خوا لێی رازی بێت) دەڵێت: ئەگەر یەکێك لە کەسو کاری پێغەمبەر(ﷺ) لاوازو نەخۆش بووبێت، پێغەمبەر فەرمانی داوە کە(شۆربایەکی جۆ) لێبنێنو هەمووی لێی بخۆن، ئینجا فەرمویەتی: ئەمە دەرد لەسەر دڵ لادەباتو دڵ بەهێز دەکات).

ئەو زانا ئەڵمانیەش گەیشتۆتە ئەو ئاکامە کە ئەو(زەیتی جۆ)یە دەردەهێنن‌و دەکرێت بە شێوەی(کەبسول)و دەدرێت بە خەڵك، بۆ پارێزگاری لەو چوار خاڵەی کە لەپێشدا ئاماژەمان پێدا... پزیشك رۆژانە نزیکەی (٤ ـ ٦) کەبسول بۆ نەخۆشان دەنووسن.

سەبارەت بە چۆنیەتی لێنانی(جۆ)وە، بەرێژەی(یەك بڕ جۆ) بۆ(پێنج بڕ ئاو)دەکوڵێنرێ تاوەکو(٤/٥)( چوار بەش لە پێنج بەش)ی ئاوەکە نامێنێ‌و(ئاوو جۆ) یەکسان دەبن • لەبەر ئەوەی کە خۆراکێکی ناخۆشەو بەشێوەی ئاسایی مرۆڤ ئارەزووی لێ نیە، بۆیە دەتوانرێت بەهۆی پیازو تام خۆشکەری ترەوە

---

[٧٩] ئەم فەرمووەدەیە لە لاپەڕە (٢٥٤)ی (الطب النبوي) (لأبن قيم الجوزي)دا هاتووە کە (د. دلاوەر) وەك سەرچاوەیەك ناوی بردووە لە (العلم والأعجاز) لاپەڕە(٩٥)، بەڵام ئەم فەرمووەدەیە (ضعيف)ەو (ترمذي) ریوایەتی کردووە لە (باب الطب /٢)وە (إبن ماجه) ریوایەتی کردووە لە (باب الطب) و (الأمام أحمد ٣٢/٦)دا ریوایەتی کردووە بەڵام (ضعيف)ە.







برازێنرێتەوە بکرێت بۆنەوەی بخورێت[٨٠].

**٨ ـ *مێش*[٨١]:**

لە ساڵی(١٩٨٧)دا راگری کۆلیژی زانست لە زانکۆی(ملك عبدالعزیز) کەناوی(دکتور نبیە باعیشی)یە، لە تاقیگەیەکی ئەو زانکۆیەدا ئەم تاقیکردنەوەی کردووە.

**هەنگاوی یەکەم:**

(مێش)یان هێناوە لە بۆشاییەکدا ئابلۆقە دراوەو ژێرەکەی ئاوی پاکژ کراوە، تا وردە وردە ماندوو بووە کەوتۆتە ئاوەکەوە... پاشان(مێش)ەکەیان فڕێ داوەو،دە (دڵۆپە ئاو)یان دەرهێناوەو هەر دڵۆپەی خراوەتە شوشەیەکەوەو پێی دەوترێت(ئاگار)(شوێنێکی تایبەتە بۆ ـ میکرۆبەکان ـ کە تیایدا بەشێوەیەکی خێرا نەشو نما دەکەن) کە قەپاغێکی پاکژکراوی هەیەو دادەخرێتو دەخرێتە(حضانة)یەکەوە[٨٢].

**هەنگاوی دووەم:**

مێش دەکەوێتە ئاوەوە، یەك جار نوقمی دەکەنو پاشان فڕێی دەدەنو(١٠ دڵۆپە ئاو) دەردەهێنرێتو بەهەمان شێوەی هەنگاوی یەکەم هەڵدەگیرێت.

**هەنگاوی سێیەم:**

دووجار نقووم دەکرێت.

**هەنگاوی چوارەم:**

سێ جار نقووم دەکرێت.

---

[٨٠] لە کتێبی (الحقائق الطبية في الأسلام ـ د. عبدالرزاق الكيلاني) لاپەڕە ٩٧ جەخت لەسەر ئەم گرنگیانەی (بەکاربردن جۆ) دەکاتو بە زیادەی ئەوەیش دەڵێت: بەرگری مرۆڤ بەرامبەر بە شێرپەنجە زیاد دەکات.

[٨١] (د. عبد المجيد الزندان)ی بەچاوی خۆی ئەم ئەزموونی تاقیگەییەی بینیوە لە ساڵی ١٩٨٧دا.

[٨٢] ئەم کارە پێی دەوترێت (عملية زرع الميكروب) ـ کرداری چاندنی میکرۆب ـ کە بە ئامێری نەشونماکردنی میکرۆب (جهاز حضانة ـINCUBATOR ـ دەکرێت، خودی کردارەکەش پێی دەوترێت ـINCUBATION ـ کە لە ناوەندێکی چاندنی میکرۆبدا دەکرێت کە پێی دەوترێت (MEDIA)

پاش ماوەیەك نموونەكان دەهێنن، هەر هەنگاوە بەجیا:

١ـ ئەو نموونانەی كە مێشەكە نقووم نەكراوە(هەر ١٠ نموونەكە) جۆرەها رەنگە لە سەوزو سوورو شینو قاوەیی...هتد. كە نیشانەی ئەوەیە دەیەها جۆر(میكرۆب) لەو ئاوەدا هەبووە بەهۆی میكرۆباتی مێشەكەوە.

٢ـ كە مێشەكە نقووم كراوە، زۆر جیاوزە لە حاڵەتی یەكەم، چونكە میكرۆبەكان زۆر كەمترن.

٣ـ دیسان زۆر زۆر كەمترن.

٤ـ تاكە تاكە میكرۆبی تێدایە، كە ئەوەش ترشەڵۆكی ناو گەدە لەناوی دەبات.

لەم بارەیەوە پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) لە فەرمودەیەكیدا دەفەرموێت: (إذا وقع الذباب في شراب أحدكم فليغمسه (كله)ثم ينتزعه، فإن في أحدى جناحيه داء وفي الأخرى شفاء)[٨٣]، واتە: ( ئەگەر مێش كەوتە ناو شلەمەنیەكتانەوە نوقمی بكەن، یەكێك لە باڵەكانی دەردی تێدایەو ئەوی دیكەشیان شیفا)

٩ ـ *رێنوێنی لەسەر ئاوی وەستاو:*

پرۆفیسۆر(د. نیلسۆن)ی بەریتانی(F.R.C.S،M.R.C.P )ئەو تاقیكردنەوە بە دكتۆرەكان دەكاتو بڕوانامەیان دەداتێ، لە یەكێك لە گوتارەكانیدا بەرامبەر قوتابیەكان دەڵێت:

ـ (ئەگەر مرۆڤەكان لەسەر رێنوێنیەكانی ـ محەممەد ـ بڕۆن، ئەوا كەس تووشی نەخۆشی نابێت) جا بۆ نموونە باسی نەخۆشی(بەلهارزیا)[٨٤] دەكات، كە میكرۆبەكەی دەگوێزرێتەوە بۆ(ئاو)، ئەو ئاوە مرۆڤ یان دەیخواتەوە یان مەلەی تێدا دەكات، یان لەڕێی(پێست) یان لەڕێی(دەم)ەوە ئەو میكرۆبە دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو مرۆڤە.

هەر ئەم پرۆفیسۆرە لە گوتارەكەیدا ئاماژە بۆ فەرمودەیەكی پێغەمبەر(صلى الله

---

[٨٣] لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (البخاری ٣٢٩/٢، و ٤/٧١ـ٧٢) و(الدارمی ـ ٩٩/٢) و(إبن ماجه ـ ٣٥١٥) و (أحمد ـ ٣٩٨/٢)

[٨٤] بەلهارزیا ئەو نەخۆشیەیە كە لەگەڵ (إدرار)دا خوێن دادەنێ.

**عليه وسلم) دەكات كە لەم بارەيەوە دەفەرموێت: ( لا يبولن أحدكم في الماء الدائم الذي لا يجري ثم يغتسل منه)[85]، واتە: ( نەخەڵەتابن میز بكەنە ئاوێكی وەستاوەوەو پاشان بچن خۆتانی تێدا بشۆن).**

**خوای گەورە بە بێباوەڕان دەڵێت**

(سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ )[86]

**واتە: ( ئێمە بەڵگەكانی خۆمان پیشانی ئەو بێباوەڕانە دەدەین تا بۆیان دەركەوێت ئەمە راستەو لەلایەن خوا وەیە)، وە بەئیماندارانیش دەڵێت:**

(وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا ﴿٩٣﴾)[87]

**(بڵێن سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە، كە ئایەتەكانی بە گوێرەی زەمكانیو پێشكەوتنی رۆژ تیشك دەبەخشنو ئیدی دەبنە مەعریفەتو زانیاری بۆمان).**

---

**[85] ئەبو هورەیرە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە(صحيح)ەو لەچەندین سەرچاوەدا هاتووە وەك: (البخاري في باب الوضوء/٦٨) و (مسلم في الطهارة ٩٤ ـ ٩٦)و (أبو داود في الطهارة ٢٦) و(الترمذي في الطهارة ٥١) و(النسائي في الطهارة ٤٥ ـ ١٢٩) و (إبن ماجة في الطهارة ـ ٣٥)**

**[86] فصلت ٥٣**

**[87] النمل ٩٣**

# باسی هەشتەم
# پەرجووی زانستی نوێ

**ئەم کۆباسە ئیعجازی قورئانیو سوننەی پێغەمبەر (ﷺ) دەخاتە بەر تیرۆژی زانستی نوێوە لەم بوارانەدا:**

**بەشی یەکەم:**

**دوو زاراوە هەیە یەکەمیان پێی دەڵێن (پەرجووی زانستی/ الأعجاز العلمي)، ئەوی تریشیان (راڤەی زانستی/ التفسير العلمی)، راڤەی زانستی ئەوەیە: زانست شتێك دەدۆزێتەوەو دەگاتە ئەنجامێك (تیۆرێك، یاسایەك)، دەبینین گونجانێك هەیە لە نێوان ئەم ئاکامە زانستییە لەگەڵ ئایەتێك یان فەرمودەیەکی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم)، بەمە دەڵێن (التفسير العلمی).**

**بەڵام (الأعجاز العلمي) (تحدی)دەکات، لۆژیکێکی قورئانییە یان فەرمودەیەکی صەحیحە، لەبوارێکی دیاریکراودا تەحەددا دەکات، پاش ماوەیەك عیلم دەیسەلمێنێ ئەو شتە ئاوەهایە کە ئەو وتی، ئەمە پێی دەوترێت (الأعجاز العلمي).**

***١ ـ بواری پزیشکی[٨٨]:***

**لە ئایەتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت:**

(وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِي

---

[٨٨] **پرۆفیسۆرێکی کەنەدی هەیە بەناوی (د. کیپ مور)کە چەندان کتێبی گرنگی هەیەو لە کۆلیژە پزیشکیەکانی جیهاندا دەخوێنرێن بۆ هەشت زمان وەرگێڕدراون، لە چاپی سێیەمدا بە شانازیەوە چەندان ئایەتو فەرمودەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم لەبارەی پزیشکیەوە بەکار بردووە، هەروەها بەسێ ئەڵقە باسی لە ئیعجازی قورئان کردووە لە تەلەفیزۆنی کەنەدا، لێشیان پرسیوە: کەواتە تۆ باوەڕت هێناوە، ئەویش وتی: هیچ قورسایی تێدا نیە ئەو باوەڕ هێنانە، وتیان: تۆ مەسیحیت؟، وتی: مەسیحو محەممەد قوتابی یەك قوتابخانەن.**

قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً
فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا
ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴿١٤﴾)[٨٩]

**ئەم قۆناغانەی قورئانی ئیرۆز باسی دەكات:**

**( ١ـ سلالة، ٢ـ نطفة، ٣ـ علقة، ٤ـ مضغة)یە.**

**زانستە پزیشكییەكان لەم دە ساڵەی دواییدا سەلماندیان كە ئەم قۆناغانە بەم شێوەیەیە، بۆ دروست بوونی مرۆڤ.**

**١ـ (سلالة)، لە زمانی عەرەبیدا واتە( قلیل من الماء) كەمێك لە ئاو(أستلة الحیمن)لە ئاوەكە هاتە دەرەوە، یان: (أستلة البویضة)هێلكۆكەكە هاتە دەرەوە، پاشان سێ جۆر (نطفة)مان هەیە:**

**١ـ(نطفة) (تۆو)ی نێرینە.**

**٢ـ (نطفة)ی مێینە.**

**٣ـ (نطفة)ی ئەمشاجمان هەیە، كە بریتیە لە تێكەڵ بوونی هەردوكیان.**

**پاشان دوای ئەوە دەچێتە قۆناغی (علقة) (كرمۆكە)، (علقة) واتە كرمی ژێر زەوی، بەهۆی وێنە گرتنی ئەم قۆناغانە لەناو سكی دایكدا بە ئامێری زۆر پێشكەوتووەوە دەركەوت كە پاش (نطفة) ـ كە بێگومان (نطفة) كاتێك دەردەكەوێت كە زیاتر لە نیو ملیۆن جار گەورە بكرێت، ئینجا دەبینرێت، لە هەشت سەد هەزار جار گەورەكردندا ئینجا تۆوی پیاو دەردەكەوێت ـ، (علقة)كەش (لیچ لایك) (LEACH- LIKE)ی پێدەڵێن بە ئینگلیزی، واتە لە كرم دەچێت، قۆناغی (مضغة)مان هەیە، (مضغة) واتە (جووراو)، بنێشت یان گۆشت لە دەمی مرۆڤێكدا بجورێتو بیهێنیتە دەرەوە چۆنە لە قۆناغێكدا ئەو مرۆڤە لەوە دەچێت، بە ئینگلیزیەكەشی پێی دەڵێن (CHEW LIKE)(چوو لایك)، واتە:**

---

**[٨٩] المؤمنون ١٢ـ ١٤**

(جووراو)، عیلم تا ماوەیەکی کەم لەمەوپێش دەیوت: گۆشت دروست دەبێت پاشان ئێسقان، قورئانی پیرۆز ١٤٠٠ ساڵە دەفەرموێت: ئێسك دروست دەبێت پاشان دادەپۆشرێت بە گۆشت، بەهۆی ئەو ئامێرە پێشکەوتوانەوە دەرکەوت یەکەم جار ئێسکەکە دروست دەبێت پاشان دادەپۆشرێت بە گۆشت.

- ئیعجازێکی ترمان هەیە: خوای گەورە دەفەرموێت:

(خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ﴿٦﴾)[٩٠]، دروستان دەکەین، ئەندازەگیریتان دەکات لەناو سکی دایکتانداو بەچەند قۆناغێکدا دەڕۆن، بەڵام داپۆشراون بەسێ پەردە لە تاریکیدا.زانستی پزیشکی دۆزیەوە ئەو کۆرپەیە لە سکی دایکیدایەتی داپۆشراوە بەسێ پەردە:

یەکەمیان: کە راستەوخۆ جەنینەکەی داپۆشیوە، پێی دەڵێن(ئەمینۆن) (AMINION)

دووەمیان: پێی دەڵێن(کۆریۆن) (CORION)

سێیەمیان: پێی دەڵێن (دسدیوەڵ)(DESIDUAL)

ئایا (محمد المصطفى) (صلى الله عليه وسلم) ئەو ئامێرانەی هەبووە؟

ئەمە بەڵگەو حوججەیەکە بەسەر ئەو کەسانەی باوەڕیان بە قورئان نیە، شایانی باسە ئەم سێ پەردە زۆر پێویستیان بە تاریکی هەیە، رووناکی خراپە بۆیان، بەتاریکی گەورە دەبن، بەپێی گەورەبوونی ئەو کۆرپەیە خۆی، خوای گەورە وشەی (ظلمات)بەکاردەهێنێت، واتە(تاریکی)، لە تاریکیدا ئەو پەردانە گەورە دەبن بەپێی گەورە بوونی ئەو (جنین)ە.

بیرو بۆچوون وابوو کە ئافرەت رەگەزی منداڵ دیاری دەکات، ئەو بۆچوونەش زانستی پزیشکی سەلماندی کە هەڵەیەو، بە تەنها نەئافرەت نە پیاو ئەو دەورە

---

[٩٠] الزمر ٦

نابینن.

- لە زانستی فیزیادا سەلمێنراوە کە خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا لە راستەوە بۆ چەپە، واتە: (بە پێچەوانەی سوڕانەوەی میلی کاتژمێرەوە)یە(ANTI CLOCK WISE)(ئەنتی کلۆکوایز)، وە هەروەها سوڕانەوەی زەوی بە دەوری ڕۆژدا هەر بە پێچەوانەی میلی کاتژمێرەوەیە، ئەلیکترۆن لە خانەدا بە پێچەوانەی میلی کاتژمێرەوە بەدەوری ناوکدا دەسوڕێتەوە، لە حەفتاکاندا زانایەکی سویدی بەناوی (لینارد لینسن) بەهۆی ئامێری زۆر پێشکەوتووەوە(مایکرۆ فۆتۆمیتری)پێدەڵێن، توانی وێنەی هێلکۆکەی ئافرەت بگرێت، ئەو (سپێرم)انەی دەوریان داوە، بە پێچەوانەی میلی کاتژمێرەوە بەدەوری هێلکۆکەدا دەسوڕێنەوە، ئەمانە بۆ ئەوەیە مرۆڤ بیر بکاتەوە، دروستکەری ئەو سپێرمانە هەمان دروستکاری ئەلکترۆنەکەو، بوونەوەرو هەموو هەسارەکانی تریشە، کە دەسوڕێنەوە بە دەوری خۆردا، دیسان ئەو (ئەنتی کلۆکوایز)ە کە سوڕانەوەی پێچەوانەی میلی کاتژمێرەوەیە، بۆچی خوای گەورە وای دروست کردووە؟

بۆ ئەوەی بزانرێت کە خالقی هەموو دروستکراوەکان (الله)یە، ئەو پەرستشە پیرۆزەی کە روکنێکە لە روکنەکانی ئاینەکەمان بریتیە لە (حەج)، کەعبەی پیرۆز دەکەوێتە لای چەپتەوەو بە پێچەوانەی کاتژمێرەوە دەسوڕێیتەوە.

- ئیعجازێکی ترمان هەیە، زانایانی (طب)ی لە ئەمریکاو ئەوروپا کە موسڵمان نین، گەیشتنە ئەنجامێك کە تەمەنی کۆرپەی مرۆڤ کە (٤٢) رۆژ تەواو دەکات، چالاکیەکی کارەبایی لە سکی ئەو دایکەدا پەیدا دەبێت، دوای (٤٢) رۆژەکە شتێك لەسەری منداڵەکەدا دروست دەبێت کە پێی دەوترێت (قەدی مێشك) کە لێپرسراوە بەرامبەر بیستن... بینین...تامکردن...بۆنکردن...وە سەرماو گەرما...زبریو نەرمی، ئەمانە هەمووی لەو بەشەدایە کە پێی دەڵێن: (قەدی مێشك)(BRAIN STEM)، کەی دروست دەبێت؟

پاش تەواو کردنی (٤٢) رۆژ، کێ ئەم قسەیەی کردووە، زاناکانی ئەمریکاو ئەوروپا، شتێکە هیچ را جیاوازی تێدا نیە، لە (٤١) رۆژەکەدا ئەو هێما کارەباییە

**ناداتو له (٤٢) رۆژەكەدا ئینجا دەیدات.**

**بــا بــچینه خزمــەت فەرمودەیــەكی پێغەمبــەر(صــلی الله علیــه وســلم) كــە دەفەرموێت:(إذا مر بالنطفة إثنان وأربعون لیلة بعث الله إلیها ملكا فصورها و خلق سمعها و بصرها و جلدها ولحمها و عظامها، ثم قال: یا رب! أذكر ام أنثی؟)[٩١]، واتـە: پاش ئەوەی ئەو كۆرپەلەیە (٤٢) رۆژ تەواو دەكات لـە سكی دایكیـدا خـوای گـەورە فریـشتەیەك دەنێرێـت بەرنامەیـەكی پێیـە، بیـستن‌و بیـنین‌و پێـستو گۆشـتو ئێسكەكانی بۆدیـاری دەكـات، كـە سـەرەتای دروسـتبوونی (مێـشك)ە، ئینجـا پاشـان دەفـەرموێت: خـوای گـەورە نێرینەیـە یـان مێینـە؟، واتـە رەگـەزی ئـەو كۆرپەلـە هێشتا دیاری نەكراوە، زانستی پزیشكیش وەها دەڵێت، كە ئەمانە هەمووی دروست دەبێت پاشان رەگەزی نێرینە یان مێینە دروست دەبێت...**

- **ئیعجازێكی ترمان هەیە، زانستی پزیشكی دۆزیـەوە كـە ئـەو شـوێنەی مـرۆڤ بەكاری دەهێنێت بۆ فێڵ، بـۆ كـرداری ناشـیرین، ناوچـەی نێوچـەوانە لـە مێـشكدا، ئەو مۆخـەی كـە كەوتۆتـە دەوروبـەری ناوچـەوانەوە كـە بـە عـەرەبی پێـی دەڵـێن (مراكز توجیه الثابت وسلوك الخاطيء)ئـەو مەڵبەنـدەی كـە بەرپرسـە لـە كـرداری ناشیرین‌و فێڵ‌و درۆ كەوتۆتە پێشی مێشكەوە لەژێر ناوچـەواندا. خـوای گـەورە ش لە قورئاندا دەفەرموێت(نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾)[٩٢].**

- **مێشكی مرۆڤ لەناو سكی دایكیـدا دروسـت دەبێـت، لـەنێوان(١٦ - ٢٠)هـەمین هەفتە، خانەكانی هەمووی دروست دەبێت كە ژمارەیان (١٣ هەزار ملیۆن) خانەیە، ئیتر دوای ئەوە یەك خانەی تر دروست نابێت، واتـە كـە بیـستەمین هەفتـە تـەواو دەكات لـە سـكی دایكیـدا شـتێكی زیـادە دروسـت نابێـت لـە مێـشكیدا بـەڵكو بـەرەو كەمی دەڕوات، زانست سەلماندی كە مێشكی مـرۆڤ دوو بەشە لای چەپو لای راست،**

---

[٩١] **ئەمە درێژەی فەرموودەكەیە: فیقضي ربك ما شاء، ویكتب الملك، ثـم یقـول: یـا رب! أجلـه. فیقول ربك ما شاء، و یكتب الملك، ثم یقول یارب ! رزقه، فیقضي ربك ما شاء، ویكتب الملك، ثم یخرج الملك بالصحیفة في یده، فلا یزید علی ما أمر ولا ینقص.**
**صحیح المسلم/ ص ٢٠٣٧/ كتاب القدر/ ج٤/ دار أحیاء الكتب العربیة/ محمد فؤاد عبدالباقي.**

[٩٢] **العلق ١٦**

ئەو بەشەی لای راست بەرپرسیارە لە کۆنترۆڵکردنی بەشی لای چەپی مرۆڤ وە ئەو بەشەی کە کەوتۆتە لای چەپ کۆنترۆڵی لای راست دەکات، بەڵام شتەکە بەو ئاسانییە نیە، بەڵکو زۆر ئاڵۆزە،بەڵکو بواری تایبەتمەندیو پسپۆری لە هەشتا بوار زیاترە لە مێشکدا، ئاواز دەکەوێتە لایەکەوە، لەبەرکردنی وشە دەکەوێتە لایەکی ترەوە، ناسینەوەی خەڵك دەکەوێتە شوێنێکی ترەوە... ئاڵۆزیەکی زۆر سەیری تێدایە.

بەڵام هەمووی تۆمار دەکرێت، هەر خۆشەویستییەك، هەر رقو حەسادەتو پیاوەتیو نیەتی باشو نیەتی خراپ، هەمووی لەو دۆسیانەدایە، لایەنی ناوەوە تۆمار دەکرێتو دەخرێتە گەنجینەوە، پیریش بیت هەر دەخوێنرێتەوە، ئەگەر تۆش بۆت نەخوێنرایەوە لەو دنیادا ئەیدەنە دەستت بۆت دەخوێنرێتەوە، زۆر کەس هەیە کە پیر دەبێت شتی بیر نامێنێت، ئەوەناگەیەنێت کە سڕراوەتەوە، نەخێر... زۆر جار کەسێکی بەساڵاچوو بە گەنجی شتێکی نووسیوە پێی بڵێ بیخوێنەرەوە لەگەڵ ئەوەشدا دەستنووسی خۆیەتی بۆی ناخوێنرێتەوە، چاوی لاواز بووە، ئەوە ناگەیەنێ شتەکە نەماوە، شتەکە ماوە خۆی بۆی ناخوێنرێتەوە ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ ۝٢٣﴾[93]، رۆژێك دێت هەمووی بیر دەخەنەوە.

ئایەتێك دەفەرموێت: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ۝١٧﴾[94]، ئەو دوو فەرمانبەرەی

خوای گەورە کە لەسەر شانمانن کە پێویستە شەرمیان لێ بکەین، ئەو کردارانەی کە دەیکەیت لەناو مێشکدا، نیەتی باشو نیەتی خراپ، هەستی پێدەکەن، ئایا بەشی لای چەپ یان بەشی لای راستی مۆخ بێت ئەوان دەینووسن، کرداری چاکەو نیەتی باش راستەوخۆ ئەو فریشتەیە دەینووسێ، کرداری خراپیشت فریشتەکە ناینووسێ، چاوەڕێ دەکات بەڵکو تەوبە بکەیت، ماوەیەکی

---

[93] الفجر ٢٣

[94] ق ١٧

دیاریکراوی بەسەردا دەڕوات، ئەگەر پەشیمان نەبوویتەوە ئینجا دەینووسێت، ئەمە (کتاب مرقوم)ە کە دەدرێتە دەستت لە قیامەتدا.

• ئیعجازێکی ترمان هەیە، (سمع)و (بصر)و (فؤاد) بەو شێوە ریزبەندیە هاتووە لە قورئاندا؟.

هەمیشە (سمع) یەکەم جارە (بصر) دووەم وە (فؤاد)سێیەم جارە، (سمع) واتە بیستن، (بصر) واتە بینین، (فؤاد)واتە عەقڵ، حیکمەت چییە لەم ریزبەندیە؟.

یەکەم:

بزانە کە (سمع) بەتەواوەتیو ڕێكو پێکی دروست دەبێت پێش لەدایك بوون بە ماوەیەکی کەم، منداڵ کە لەدایك دەبێت بیستنی زۆر تەواوە، بەس چاوی نە ماوەی (چوار ـ شەش) مانگ ئینجا چاوی (ضبط) دەبێت، بەڵام عەقڵەکەی زۆر زۆر درەنگ دەکەوێت.

دووەم:

زانستی پزیشکی دۆزیەوە، مێشکی مرۆڤ (مۆخەکەی) ئەو مەڵبەندەی نزیك بەدەمو چاوەکەیە مەڵبەندی بیستن لەوێدایە، وە مەڵبەندی (بصر) کەوتۆتە دواوە، هەمیشە خوای گەورە بیستنەکە پێش دەخات، و کەباسی چاوو گوێچکە دەکات، چاو لەپێشدا ناو دەبات پاشان گوێچکە.

سێیەم:

بیستن زۆر جار بە شێوەی تاك دێت، بەڵام بینین (ابصار) بەشێوەی (کۆ) دێت، بۆ نموونە لە مەجلیسێکدا کەسێك قسە دەکات، یەك مەودای (سمع) هەیە بۆ هەموویان، بەڵام هەر تاکێکی هەر کۆڕێك مەودای (بصر) خۆی جیاوازە، هەر کەسێك لە گۆشەیەکی تایبەتەوە تەماشای قسەکەر دەکات.

چوارەم:

(صم بكم عمی) چەندین جار ئەم ریزبەندیە هاتووە لە قورئاندا (کەڕ، لاڵ، کوێر)، زانستی پزیشکی لەم ماوەیەدا شتێکی دۆزیەوە ئەویش ناوچەیەکە پێی دەڵێن (وێرنیکا)، لەناو مێشکدایەو لێپرسراوی لاڵییە کەوتۆتە نێوان کەڕیو کوێرییەوە.

• ئیعجازێکی تر (بَلَىٰ قَـٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ۝٤)[٩٥]

سەبارەت بە مۆری پەنجەوە، هی هیچ مرۆڤێك لە مرۆڤێکی تر ناچێت، پرۆفیسۆرێك بەناوی( ئەلیسن) شتێکی تری لە مرۆڤدا دۆزیەوە کە پێی دەوترێت (بصمة الکهربائیة)، فیلمی زۆر هەستیار دەهێنێت مرۆڤێك پەنجەی دەخاتە سەرو ژمارەیەك دەخوێنێتەوە، دوای کەمێکی تر هەمان مرۆڤ پەنجەی دەخاتەوە سەر ژمارەیەکی تر دەخوێنێتەوە، کە پەیوەندی بە باری دەروونی ئەو کەسەوە هەیە.

(بَلَىٰ قَـٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ۝٤)[٩٦]

کە زیندووی دەکەینەوە نەك هەر بە بێبایەخیەکەوە، بەڵکو ئەو وردەکاریەشی لەگەڵدا دروست دەکەینەوە، کە ئەم ئایەتەیان بەو دکتۆرە وت لە ساڵی(١٩٨٦) دا لە کۆنگرەی قاهیرەدا، موسڵمان بوونی خۆی راگەیاندو، وتی کە ئەمە شتێکە خۆم لەم ساڵانەدا دۆزیومەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا محەممەد (صلى الله علیه وسلم) پێش هەزارو چوار سەدو ئەوەندە ساڵ وتبێتی، ئەمە قسەی ئەو نیە، کەواتە ئەم قورئانە لەلایەن خوای گەورەوەیە، بۆیە ئەم دکتۆرە موسڵمان بوو، شایەتمانی هێنا.

• زۆر جار لە قورئاندا وتراوە، دڵ تەنها ئۆرگانە لە لەشی مرۆڤدا کە بشپچڕێت لە مێشك هەر ئیشی خۆی دەکات، دڵ خانەکانی دیواری نیە کە لێکیان جیابکاتەوە بۆ ئەوەی کە لەریەوە هەمووی بلەرێتەوە.

(دڵ) تەنها ئەندامی لەشە کە تووشی شێرپەنجە نابێت.هەندێك جار مرۆڤێك بەهۆی لێدانی ئۆتۆمبیلێکەوە، ئەگەر ئۆتۆمبیلەکەش بەسەریدا بڕوات بەڵام دڵەکە هەر لێدەدات، ئەو دڵە دەیبڕنو دەمارەکان دەهێننە دەرێ هەر لێدەدات.دڵی مرۆڤێکی ساغ کە بە کارەساتێك یان هەر هۆیەك بێت دەری دەهێننو دەیخەنە سنگی کەسێك کە نەخۆشی دڵی هەبێت، دڵە کۆنەکەی دەردەهێننو دڵە تازەکەی

---

[٩٥] القیامة ٤
[٩٦] القیامة ٤

لەجێـــدا دادەنـــێن، تـــەنها خـــوێن بـــەرو خوێنهێنـــەرەكان دەدورنـــەوەو دەمارەكـان(NERVES)نادورنـەوە، كەچـی دەسـت دەكاتـەوە بـە لێـدان و ئـەو مرۆڤە سوودی لێوەردەگرێت.

**روونكردنەوەیەك دەربارەی ترپەی دڵ:**

ئەگەر لە پزیشكێك بپرسی: هۆكاری ترپەی دڵ چییە؟
لــە وەڵامــدا دەڵێــت: هۆكارەكــەی (A.V.NODE)[٩٧]ە، واتــە: فەرمانێكــە لــە (A.V.NODE)ەوە بەشێوەیەكی گشتی دەدرێت بە ماسولكەكانی دڵ
ئەگەر بپرسین: ئەی ئەو لە كوێوە فـەرمان وەردەگرێت؟، لـە وەڵامـدا دەڵێن: لە (S.A.NODE)[٩٨]ەوە فەرمان وەردەگرێت.
ئەگەر بەردەوام بین لە پرسیارو بڵێین: ئـەی(S.A.NODE)فـەرمان لـە كوێـوە وەردەگرێت؟، ئەگەر بڵێن: مێشك.
وانیە، چونكە لە نەشتەرگەری دڵدا پەیوەندی نامێنـێ لەنێوان (دڵ)و (مێـشك)دا، ئەو دەمارانەی كە هەن هەموویان دەبڕدرێن، ئەگەر دەڵێن: هەر لەخۆیەوە.
ئەوە نیشانەی دان نانە بـەوەدا كـە ئـەم گرێیـە ( S.A.NODE) وەك دیـسكێكی كۆمپیوتەرێك وایە و نهێنییەكانی خوای گەورەی تێدایە.
هـەر ئـەو مرۆڤە لـەكاتی دروسـت بوونیـدا كە دڵـی بـۆ دروسـتكراوە لـەلای خـوای گــەورە نووســراوە ( S.A.NODE) چــەند بلیــۆن جــار ترپــە (پــەڵس - PULSE)لێدەدات... لە دواهەمین ترپەدا كە دەوەستێن ئیتر هێز نیە ئیشی پی بكاتەوە.

---

[٩٧] ئەم (AVN)ە كورتكراوەی ئەم سێ وشەیەیە: (ATRIO VENTRICULAR NODE)(ئـاتریۆ ڤێنتركیولـەرنۆد) ئـەم گرێیــە بەرپرسی ترپەی دڵە
[٩٨] گرێیەكـە لـە ناوچــەی گوێـچكەلەی راسـتی دڵدایــەو كـورتكراوەی ئــەم دوو وشــەیەیە: (SINOATRAL NODE) - ساینۆ ئاتریەڵ نۆد ..

بەشی دووەم:

لەتەوراتدا (مەبەست ئەم تەوراتەی ئێستایە)، دەڵێ ئەو درەختەی کە حەزرەتی ئادەم میوەی لێ خوارد، درەختی زانیاری بوو، درەختی زانست بوو، درەختی مەعریفەت بوو، لەبەر ئەوە خوای گەورە سزای داو دەری کرد لە رەحمەتی خۆی، وەرگرتنی عیلم پێی دەوترێت یەکەم گوناه کە ئادەم کردبێتی، بەڵام لای ئێمە یەکەم ئایەت (إقرا)ە، یەکەم ئایەتی قورئانی پیرۆز (ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١)[99]ە، لەیەکەم ئایەتەوە ئیسلامی پیرۆز هانمان دەدات بۆ وەرگرتنی زانست، عیلمو مەعریفەت بوو بە هۆی شەرەفو کەرامەتی حەزرەتی ئادەم، خوای گەورە خۆی فێری کرد، چۆن خوای گەورە عیلم دەبەستێتەوەو مەنعی دەکات لە مرۆڤ؟، (وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ۝٣١)[100] هەموو عیلمێکی فێرکرد کە پێویست بێت بۆ ژیانی سەر زەوی، وە رێزی زانایان ئاشکرایە لە دینەکەماندا، لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە دەفەرموێت (شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِ ۝١٨)[101]، لە ئایەتێکی تردا (إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ ۝٢٨)[102]،

وشەی (عیلم)وموشتەقاتی وشەکە (٧٨) جار لە قورئانداوتراوە.

کە لە یەهودیەك یان نەصرانیەك بپرسی: موعجیزاتی دینەکەت چییە؟، دەڵێت: ئینجا من لە کوێوە عەصای مووسا دەتوانم بهێنم، یان لە کوێ (عیسا)م دەست دەکەوێت (سەلامی خوای لێبێت)کە موعجیزاتەکەیم پیشان بدات، دەست بهێنێ

[99] العلق ١
[100] البقرة ٣١
[101] آل عمران ١٨
[102] الفاطر ٢٨

به سەر چاوی کوێرداو چاکی بکاتەوەو، دەست بەسەر مردوودا بێنێ زیندووی بکاتەوە، موعجیزاتەکانیان کاتی بووە، خوای گەورە دەفەرموێت

(وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾)[١٠٣]

هەموو قەومێك خوای گەورە یەكێكی بۆ داناون هۆكار بێتو هیدایەتو ڕێ ڕوونكەرەوەیان بێت، بەڵام لەبەر ئەوەی خوای گەورە كە (علیم)و (علام)ەو عیلمی غەیبی هەیەو عالی غەیبە، دەزانێت كە ئیتر دنیا بەرەو نزیك بوونەوە دەڕوات، گەلانی زەوی بەرەو یەكترناسین دەڕۆن، وە هۆكاری هاتووچۆ هەمووی بەرەو پێشكەوتن دەڕوات، وە جیهانی پەیوەندی پتەو دەبێت، لەبەر ئەوە محەممەد (صلی الله علیه وسلم)ی كرد بە دوا پێغەمبەرو پەیامەكەی كرد بە دوا بروسكەی ئاسمان بۆ سەر زەوی، دەفەرموێت:

(وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾)[١٠٤].

لەو ئیعجازانەی پشت بە خوای گەورە باسی دەكەین لێرەدا:

٢ ـ *فەلەكو گەردوونناسی:*

چەند موسڵمان چوون بۆ طوكیۆ، چاوپێكەوتنێكیان كرد لەگەڵ زانایەكی گەورەی ئەوێ، كە بەڕێوبەری (بنكەی چاودێری هەسارە ـ ڕوانگە ـ مرصد ـ)ی طوكیۆیە، ناوی (یۆشیدی كوزایی)یە، لێیان پرسی وتیان: ئەم دنیایە، ئەم گەردوونە چۆن دروست دەبێت؟.ئەویش بانگی كردن سلایدێكی پیشان دان، كە ئەو تەلیسكۆبە (فضائي)یانەی (هەبڵ)و بێجگە لە (هەبڵ) گرتوویەتی، تەپوتۆزی پیشان دەداو لەدوورەوە ملیۆنەها... ملیارەها كیلۆمەتر لە ئێمەوە دوورە،(بێگومان ماوەی ـ فضائي ـ بە كیلۆمەتر حیساب ناكرێت، بە ساڵی ڕووناكی ـ السنه الضوئیة ـ دەپێورێت)، پێی وتن: ئەو تەپوتۆزە دەبێتە هۆی دروستبوونی ئەستێرەی نوێو هەسارەی نوێو...هتد، گەردوونیش لەوانە دروست بووە.

---

[١٠٣] رعد ٧
[١٠٤] الأنبياء ١٠٧



ئـەمانیش پێیـان وت: بـەڵام لـە قورئانـدا دەڵـێ لـە دووکەڵـەوە دروست بـووە، وە نوسخەیەکی تەرجومەکراویان پیشان دا کە تەرجومەی ئەو ئایەتەیە

(ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ )[١٠٥]

وشەی (دخان) واتە (دوکەڵ)، ئـەوانیش دەڵێن (تـەپو تـۆز)، هەنـدێك لـە زاناکان دەڵێن: (تەمو مژ)، ئەم زانایە (یوشیدی کوزایی) بـیری کـردەوەو وتـی: ( بەڕاستی جوانترینو راسترینو وردترین وشە: دوکەڵە، چونکە تـەم ساردەو، تـەپوتۆز پلـەی گەرمی نیـە، بـەڵام دوکـەڵ پلـەی گـەرمی هەیـە، وە ئـەو شتـەی کـە دەیبیـنن لـەو سلایدەدا پلەیەکی گەرمی زۆر گەورەی هەیە رۆژێلێ دروست دەبێت، ئەستێرەی لێ دروست دەبێت، مـن پێتـان دەڵێم راسترین وشـەی عیلمـی کە بـەکار بێت بۆ دروست بوونی گەردوون (أشهد بالله) دوکەڵە، ئەمـە شـایەتی عالمێکە کە موسڵمان نیە، ئەو شایەتیەی داوە.

*٣ ـ جیۆلۆجی (قوڵایی دەریاکان):*

- لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت:

(أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ )[١٠٦]

خوای گەورە باسـی (دەریـا) دەکـات، باسـی دەریایـەکی قـوڵ دەکـات، دەڵێت لـەو شوێنەدا ئەگـەر مـرۆڤ دەستی خـۆی دەربێنـێ نایبینـێ، ئـەم قسەیە لـە قورئانـدا وتراوە هەزارو چوارصـەد ساڵ لەمـەو پـێش، تـازە عـیلم شتێکی بـۆ دەرکـەوتووە، بێگومان مەلەوانی ژێر ئاو ئەوپەڕی ئەگەر بتوانێت تا قوڵایی (٣٠ مەتر) ئـەتوانێ

[١٠٥] فصلت ١١

[١٠٦] النور ٤٠

بچێتە قوڵاییەوە، بەڵام خوار ئەوە ناتوانێت، ئەو پاڵەپەستۆیە ئازاری دەداتو لەوانەیە بیکوژێ، ئەوانەی زۆر دەچنە قوڵایی ئاوەوە، تووشی نەخۆشی دڵ دەبن، تووشی نەخۆشی تر دەبن، تەنها دەبێت بە (غواصە) بۆ قوڵایی زۆر بڕۆنە خوارەوە، عیلم چی دۆزیەوە لەم چەند ساڵەی دواییدا؟، تیشکی خۆر کۆمەڵێك شەپۆلی تێدایە، بەشێك لە شەپۆلەکان پێی دەوترێت شەپۆلی بینراو، شەپۆلە بینراوەکان کە لەژێر سوورەوە دەست پێدەکات تا سەروو وەنەوشەیی.

لەدوای (١٠ مەتر) قوڵایی ڕەنگی سوور نامێنێ، دوای (٥٠ مەتر) ڕەنگی زەرد نامێنێ، دوای (١٠٠ مەتر) ڕەنگی سەوز نامێنێ، دوای (٢٠٠ مەتر) ڕەنگی شین نامێنێو هیچ شتێك نامێنێ، واتە مەلەوانێك ئەگەر بریندار بێت لە ژێر (١٠ مەتر)دا، واتە ئەگەر لە (١٢ مەترو ١٥ مەتر)دا بریندار بێتو سەیری خۆی بکات خوێنەکەی سوور نابینێ، بەڵام ئەگەر بە (غواصە)بڕواتە خوارێو شتێکی وابکاتو دەستی خۆی بێنێتە دەرێ نایبینێ، چونکە ئەو تیشکی ڕۆژە ئەو ڕەنگانەی لە قوڵاییدا نیە (سبحان الله) ئەمەش یەکێکە لە ئیعجازی قورئانی پیرۆز.

- دیسان هەر لە (جیۆلۆجی دەریا) دا ئیعجازێکی ترمان هەیە ئایەتێکی پیرۆزە (مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ )[١٠٧]

عیلمی (بحار)، عیلمی جیۆلۆجیای دەریاکان، بەهۆی بەکارهێنانی ئامێری زۆر پێشکەوتووەوە، عیلمێکی تازە پەیدا بووە پێی دەڵێن (التحسس عن بعد)، (هەست کردن لە دوورەوە ) لە مانگە دەسکردەکانەوە سەرچاوە دەگرێ، کە لێکۆڵینەوەی زەویو دەریاو ژێر دەریا دەکەن، تیشکی لێدەداتو تیشکەکە دەگەڕێتەوە بۆ کۆمپیوتەرێك وێنەکەی دەکاتو دەڵێت: فلان کانزای تێدایە، شێوەکەی وایە.ناوچەیەك هەیە، گەروویەکە لەنێوان (دەریای ناوەڕاست)و (زەریای ئەتڵەسی)دا پێی دەوترێت (گەروی ـ جبل طارق ـ) هەزاران ساڵە هەیە، بەڵام تازە بۆیان دەرکەوتووە کە لەژێر ئەو گەروەدا گردێکی گەورە هەیە بەچاو نابینرێ،

---

[١٠٧] الرحمن ١٩ ـ ٢٠

وەك سێگۆشەیەك وایە، پێی دەوترێت (جبلارتەر هێڵ)( GIBLARTAR HILL) هەر بەناوی (جبل طارق)ەكەوەیە بەس ناویان ناوە گرد، شاخ نیە گردە لەناو دەریاكەدا، ئەمەش بە لێكۆڵینەوەی (أقمار صناعی) ئەو گردەیان دۆزیوەتەوە، ئەگینا بەچاو دیار نیە، ئەوە (برزخ)ەكەشە قورئانی پیرۆز باسی دەكات ناهێڵێ ئاوی دەریای ناوەڕاست لەگەڵ ئاوی زەریای ئەتڵەسیدا تێكەڵ ببن، سبحان الله.

لە چارەكی دووەمی ئەم سەدەیەدا، زانایان سەدان مەڵبەندی وەرگرتنی زانیاری جیۆلۆجیان دانا لە شوێنە جیاجیاكانی سەر بە دەریاو زەریاكان، لەناو جەزیرەی بچووك، یان لە بەلەمو پاپۆڕەكاندا، فەرمانبەریان بلاوكردەوە لەكاتی دیاریكراودا بەشەو بە رۆژ، بۆ لێكۆڵینەوەو سەرنجو تێبینی كردنی ئاوە جیاوازەكان لە دەریاو زەریاكاندا.

پاش ئەوەی كە ئەم زانیاریانە كۆكرانەوە، نەخشەیەكی جوگرافیان دروست كرد، ئەو نەخشەیە لە (١٩٤٢) دا دروست كرا، خەتی سپی هاتووە بە زەریای هیندیدا، چەند خەتێكی سپی بە ئەتڵەسیداو بە زەریای هادیدا... ئەمانە پێیان دەوترێت: (سنووری ئاوەكان)، هەر لەناو ئاوەكەدایە، ئەم لای ئاوەكە لەگەڵ ئەودیودا جیاوازی هەیە لەناو یەك (زەریا)دا.

پلەی گەرمی ئەملا لەگەڵ ئەولادا جیاوازی هەیە، رێژەی خوێ لەملا لەگەڵ ئەولا جیاوازی هەیە، پلەی توانەوەی ئۆكسجینی ئەملا لەگەڵ ئەولا جیاوازی هەیە، وە ئەو گیانەوەرو روەكانەی لە ملا دەژین جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوەی ئەولا، جگە لە چڕی ئاوەكەش، ئەم راستییە دوای ساڵی ١٩٤٢ دۆزرایەوە، قورئانی پیرۆز ١٤٠٠ ساڵ لەمەو پێش باسی دەكات (بینهما برزخ لا یبغیان)، قەت ئەم ئاوە تێكەڵ نابێت لەگەڵ ئاوەكەی تردا، ئەم خاسیەتی خۆی دەپارێزێو ئەویش خاسیەتی خۆی دەپارێزێ، دەبینین ئاو (ـ بۆ نمونە ئەوەی ـ جبل طارق ـ)ەكە ئاوەكە لە دەریای ناوەڕاستەوە دەچێت بۆ زەریای ئەتڵەسی بەسەر ئەو گردەدا دەڕوات ئاوەكە سیفاتی ئاوی ئەتڵەسی وەردەگرێت، ئەو ئاوەی كە لە ئەتڵەسییەوە دێتە ناو دەریای ناوەڕاست سیفاتی ئاوی ناوەڕاست وەردەگرێت، هەمیشە ئەو جیاوازیە

هەیە لەو ناوچەیەدا گەرمایی ئەم تێکەڵ نابێت لەگەڵ ئەودا، سوێری ئەم لەگەڵ ئەودا جیاوازی هەیە، چڕی ئاوەکە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەملاو ئەولادا.

• هەر لەناو عیلمی جیۆلۆجیدا دەبینین، چەند موسڵمانێك چوون سەرێکیان دا لە گەورە پرۆفیسۆری جیهانی (باڵمەر)، کە پسپۆڕی زانستی جیۆلۆجییە، پێیان وت ئێمەی موسڵمان باوەڕمان وایە کە نزمترین شوێن لەسەر رووی زەوی ئەو شوێنەیە کە سوپای رۆمانەکانو سوپای فارسەکان خۆیان دا بە یەکدا، ئەویش لای (بیت المقدس)ەوەیە.بە ئاماژەو بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت:

(غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ ۝ )[108]

(أدنى) لە زمانی عەرەبیدا دوو واتای هەیە . ( زۆربەی وشەکانی قورئان دو واتایان هەیە)، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (أوتيتمفاتيح كل شيء)[109] واتا: (کلیلی هەموو شتێکم پێدراوە، یان وشەیەك کە بەمن دراوە کۆمەڵێك واتای هەیە)، کۆمەڵێك واتای هەیە .، (أدنى ) یەکێك لە واتاکانی: نزیکترین خاڵە بۆ دورگەی عەرەب، ئەو واتایە دەگرێتەوە لە تەفسیری قورئاندا، زۆربەی موفەسیرین ئەو واتایەیان بەکارهێناوە کە نزیکترین شوێنە بۆ دورگەی عەرەب، واتایەکی تری هەیە لە زمانی عەرەبیدا (أدنى) واتا (أخفض) نزمترین شوێن، کابرای پرۆفیسۆر وتی: نەخێر چەندین شوێن هەیە لە جیهاندا لەویّ زۆر نزمترە.

وتیان: ئێمە قورئانەکەمان دەڵێت ئەویّ نزمترە.

وتی: وەرن من ئەتڵەستان بۆ دێنم، کە زۆر شوێن هەیە لەویّ نزمترە، ئەتڵەسەکەی هێنا، ئەو ئەتڵەسەی کە پرۆفیسۆرەکانی دنیا کۆبوونەتەوە ئینجا دروستیان کردووە، سەهمێك هاتووە بۆ ناوچەی (بيت المقدس) لەلای دەریاچەی

---

[108] الروم ١

[109] فيض القدير/ ج٣ ص ٦٩ ، ذمارة ٢٧٧٦ (اوتيت مفاتيح كل شيء إلا خمس - إن الله عنده علم الساعة...الآية. للطبراني في الكبير عن إبن عمر.
فيض القدير شرح الجامع الصغير / نوسينى محمد المدعو عبدالرحمن المناوي، الجامع الصغير: للحافظ جلال الدين عبدالرحمن السيوطي/ ١٩٧٢/ ط٢/ دار المعرفة/ بيروت - لبنان).

(طبرية)وه، نووسراوه به (WORLD LOWEST POINT)(نزمترین خالّ له رووی زەویدا)، کابرا وتی ئەمە تازە دۆزراوەتەوە، ئەم ئەتلەسە تازەیە بەهۆی ئامێری زۆر زۆر وردەوە دۆزراوەتەوە، کە ئەو ناوچەیە لە فەلەستین نزمترین شوێنە لە رووی زەویدا، ئێوە چۆن زانیتان؟، محەممەد (صلی الله علیه وسلم) چۆن زانی؟، جیهازی نەبووە، شتی نەبووە، کەواتە خوای گەورە لەپشت محەممەدەوە وەستاوە، خوای گەورە فێری کردووە(اللهم صلي على محمد وعلى آل محمد).

• یەکێکی تر لە ئیعجازەکانی قورئان ئەوەیە کە زۆرئایەتی بەگوێرەی کات دەڵێی ئەو کاتە دابەزیوە، وەك ئەم ئایەتە کە دەڵێی ئێستا دابەزیوە:

(ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ ﴿٤١﴾)[110]

(فەساد دەرکەوت لە وشکانیو ئاودا بەهۆی دەسکردی مرۆڤەوە) من دێم تەفسیری دەکەم دەڵێم: فەسادی ماددی باس دەکەم، فەسادی مەعنەوی هەموو جیهان باسی کردووە.

دەریای ناوەڕاست (١٢٠) شاری لەسەرە، ساڵی (٥٠٠ ملیۆن تەن) خاشاك دەڕێژرێتو فڕێ دەدرێتە ناو ئەو دەریا بەستەزمانەوە، دەبڕۆ ئەو دەریایە بەراورد بکە لەگەڵ (٥٠) ساڵ لەمەوپێشدا بزانە چەندە پیس بووە!، (ظهر الفساد في البر والبحر)، بڕۆ سەیری خاك (زەوی کشتوکاڵی)بکە، لەهەموو وڵاتانی جیهان بزانە چەند پیس بووەبەهۆی کەرەستەی کیمیاویەوە، بەهۆی ئەشیعەوە، بەهۆی تەقینەوەی چرنۆبڵەوە، بەهۆی بەکارهێنانی کەرەستەی ژەهراویەوە (بما كسبت أيدي الناس)، بەهۆی خەڵکەکەوە ئەم هەموو کارگەیە هەیە، بێگومان ئەو (١٢٠) شارە نزیکەی (٥٠٠ ملیۆن) کەسی تێدا دەژی، زبڵو خاشاكو پاشەڕۆی ئەم (٥٠٠ ملیۆن)ە دەرژێتە ناو ئەم دەریا بەستەزمانەوە، شایانی باسە کە لەم (١٢٠) شارە،٩٠٪ ی خاشاکەکە تەنها لەم سێ دەوڵەتەوەیە (ئیسپانیا، ئیتاڵیا، لەگەڵ فەرەنسا)، ئەم سێ دەوڵەتە (ليذيقهم بعض الذي عملوا لعلهم يرجعون)،کەمێك تووشیان دەکەین بەڵکو بگەڕێنەوە، من ئەم ئایەتە وا دەزانم ئێستا نازڵ بووەو، بۆ

---

[110] الروم ٤١

ئەم كاتە دابەزیوە، قورئانی پیرۆز لەگەڵ (تطور)ی مرۆڤدایە( لاتنقضي عجائبه) هەتا ئاستی رۆشنبیریت بەرزتربێت ئایەتەكە بەو ئاستە تەفسیر دەكەیت، دوای ئەو بەرز دەبیتەوەو تەماشا دەكەیت شتی تازەتر پەیدا دەبێت.

بەشی سێیەم:

لە روانگەی ئیعجازی عیلمیەوە لە خزمەتی چەند ئایەتو فەرمودەیەكی پێغەمبەردا دەبین (صلی الله علیه وسلم).خوای گەورە دەفەرموێت:

(ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾)[111]

خوای گەورە باسی هەنگو سوودەكانی دەكات، ئەو ئیعجازانەی لێرەدا بەدی كراوە:

*٤ ـ هەنگوین:*

تەنها جارە خوای گەورە سروش بەكاردێنێ بۆ دروستكراوێكی نا(مكلف)( وأوحى ربك إلى النحل)، سروش بەكارهاتووە بۆ دایكی مووساو فریشتەو پێغەمبەرانو پەری، بەڵام تەنها دروستكراوێك كە (مكلف) نەبێتو وشەی (أوحى)ی بۆ بەكارهاتبێ (هەنگ)ە.

تەنها ئەم (شفا )ە لەم ئایەتەدا بۆ تەندروستی لەش بەكار هاتووە. بەڵام شیفاكانی تر شیفای (دەروونو عەقڵ)ە.

هەروەها (اتخذي من الجبال بيوتا ثم كلي ) لێرەدا شێوازی (مؤنث) بەكارهاتووە. (١٤) سەدە لەمەوپێش قورئان وتویەتی ئەو هەنگەی هەڵاڵەی گوڵەكان كۆدەكاتەوە مێیە، زانست سەلماندی ئەو هەنگانە پێیان دەوترێت (شغالات)و نێرینە هەرگیز ناچێت بەلای هەڵاڵەداو هەنگوین دروست ناكات.

---

[111] النحل ٦٩

خوای گەورە دەفەرمویت (شراب مختلف ألوانه) کۆمەڵێك سوود لە هەنگ وەردەگیرێ یەکێکیان: هەنگوینەکەیەتی.

دووەمیان: هەنگوینێکی تایبەتە خۆراکی شاهەنگەکەیە.

سێیەمیان: ئەو مێومیە کە لەناو کورەی هەنگدایە.

چوارەمیان: ئەو زەهرەیە کە لەکاتی پێوەداندا دێتە لەشی مرۆڤەوە، ئەویش بەشێکە لە شیفا .

ئەمرۆ لە چەند وڵاتێکی (رۆمانیا ـ چین ـ روسیا) کە ئەو وڵاتانە باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام نییە، نەخۆشخانەی تایبەتی هەیە بۆ ئەو نەخۆشیانەی بە بەرهەمەکانی هەنگ چارە دەکرێن، وە پێیان دەڵێن (ئی پێرە پی/EOITHERAPY)،( چارەکردن بە بەرهەمەکانی هەنگ) (التداوی بمنتجات النحل)، بەداخەوە ئێمەی موسڵمان قورئانەکەمان چواردە سەدە پێش ئێستا باسی کردووە، بەڵام ئەو چارەسەرانەمان فەرامۆش کردووەو بێگانە بەکاری دەهێنن.

هەروەها زانست دۆزیویەتییەوە کە خۆراکی شای هەنگ (ئەنتی بۆدی/ ANTIBODY)تێدایە کە چەند ماددەیەکە زۆر بەکەڵکە بۆ نەخۆشی.

یەکەم گەل کە هەنگوینیان بەخێوکردووە کوردەو یەکەم میللەت لە مێژوودا کە هەنگی ماڵی کردووەو سوود لە هەنگوینەکەی وەرگرتبێت کوردە( ئەمە قسەو بۆچوونی رۆژئاوایە)، بەڵام بەداخەوە (٣٠٠٠ ساڵ) لەمەوپێش چۆن هەنگمان بەخێوکردووە هەر هەمان شێوەیە کە ئێستاش بەکاردێتو هیچ پێشکەوتنێکی بەسەردا نەهاتووە وەك گەلانی تر پێی هەڵدەستن.

ئەگەر بە مایکرۆسکۆب سەیری هەڵاڵەی گوڵ بکەین پاش ماوەیەك دەفەوتێتو تێك دەچێت، سایتۆپلازماکەی بەرەو پێشەوە دەڕواتو وەکو مویەکی لێدێتو دەفەوتێت.زاناکان چاودێری پوورەی هەنگیان کردووە، ئەو هەڵاڵەیە بۆ ماوەیەکی زۆر لەناو شانەکانی هەنگدا بۆماوەیەکی زۆر بەبێ خراپ بوون دەمێنێتەوە، وەك خۆراك بەکاری دەهێنن.

پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر کە چەند پرۆفیسۆرێك پێی هەستاون، یەکێك لەوانە (دکتۆر عبدالحلیم مشرف)ە کە خەڵکی میصرە.بۆیان دەرکەوتووە کە لەناو هەنگویندا ئەنزیمێك هەیە پێی دەڵێن (گلۆکۆز ئۆکسیدەیس/ GLUOCOSE OXIDASE)، ئەم ئەنزیمە ئەو گلۆکۆزەی لەناو هەنگوینەکەدایە شیدەکاتەوەو دەیگۆڕێت بۆ ($H_2O_2$) هایدرۆکسید پیرۆکسایدی پێدەڵێن، ئەویش ماددەیەکی کوشندەیە بۆ میکرۆبات، واتە ئەوە هۆی لەناو نەچوونی هەڵاڵەیەو ناهێڵێت هیچ میکرۆبێك نزیکی بکەوێت.

نەخۆشیەك هەیە پێی دەڵێن (ژەهراوی بوونی ئافرەتی دوو گیان)، لەو حاڵەتی ژەهراوی بوونەدا هەنگوین کاریگەریەکی باشی هەیەو چارەسەری دەکاتو بەکاردێت بۆ دابەزینی پەستانی خوێنو کەمکردنەوەی (ترشی یۆریك)، ئایا پێغەمبەری خوا چۆن ئەمانەی زانیوە، ئەگەر سروشی پەروەردگار نەبێت؟.

*٥ ـ ئاسن:*

هەندێك موسڵمان سەردانی وەکالەتی فضائی ئەمریکیان کرد بە مەبەستی چاوپێکەوتنی پرۆفیسۆر (ئارم سترۆنگ) ـ کە زانایەکی ـ نەصرانییە، وتیان: باسی ئاسنمان بۆ بکە، وتی: لەناو زانایانی فیزیایی ئەتۆمی ڕێککەوتوین لەسەر ئەوەی کە هەموو ماددەکان کە ژمارەیان نزیکەی (١١٨) توخمە، هەمووی لەسەر زەوی دروست بووە، جگە لە (ئاسن)، چونکە پێویستی بە وزەیەکە بۆ پێکەوە نووسانی پرۆترۆناتو نیۆترۆناتی یەك ئەتۆم لە ئاسن، کە دەکاتە چوار ئەوەندەی وزەی کۆمەڵەی خۆر، لەبەر ئەوە توخمێکە لە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆر دروست بووەو، پاشان باریوەتە سەر زەوی، قورئانی پیرۆزیش چی بەکار دەهێنێت بۆ (ئاسن) (وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ ﴿٢٥﴾)[١١٢].

(وأنزلنا)لەناو هەموو توخمەکاندا بۆ ئاسنی بەکارهێناوە، (فیه بأس شدید)، (بأس)واتە(هێز)،دەبینین: لە قەڵغانی دەبابەو هێلیکۆپتەری سەمتکو لە تانکو تۆپدا ئاسن بەکاردێت.

---

[١١٢] الحدید ٢٥



- له مرۆڤ و ئاژەڵی شیردارردا، لەناو خوێندا ئاسن هەیە، هەموو بیستوومانە کە کەسێك خوێنی کەمەو بێهێزە ـ واتە هیمۆگلۆبینی کەمە ـ پاشان تووشی نەخۆشی(ئەنیمیا)(فقر الدم)دەبێت.

هیمۆگلۆبین لە دوو وشە پێکهاتووە:

(هێم) واتە (ئاسن)، و( گلۆبین) ماددەیەکی پرۆتینیە لەش دروستی دەکات، بەڵام ئاسنەکە لە خۆراکەکەوە بۆی دێت، ئەمانە یەك دەگرن.

ئاسن کاری هێنانە ژوورەوەی ئۆکسجینە لە سیەکانەوە بۆ هەموو خانەکانی لەشو کردنە دەرەوەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە، (فیه بأس شدید)ئەوەی بە ڕێژمیەکی گونجاو باش ئاسن لەلەشیدا بێت چالاکیو تەندروستییەکی باشی پێوە دیارە، بەڵام ئەو کەسەی ڕێژەی ئاسن لەلەشیدا کەم بێت دەبینین لاوازەو بەکەمترین ئیش ماندوێتی پێوە دیارە، بێگومان ڕێژەی ئاسن لە لەشی پیاودا زیاترە وەك لە ئافرەتدا.

- ئاسن دوو شێوازی هەیە:

(Fe++/ حەدیدۆز)و (Fe+++ /حەدیدیك).

بەشێوەی حەدیدیك لەش هەڵی نامژێت، بەڵام لە شێوەی حەدیدۆز لەش هەڵی دەمژێت، کە خانەکان پێویستیان بە ئاسن دەبێت، جگەر بەشێوەی حەدیدیك خەزنی کردووە دەگۆڕێت بۆشێوەی حەدیدۆزو، دەڕوات بۆ ئەو شوێنەی پێویستی پێیەتی، کە دەچێتەوە ناو خانەیەك دەگۆڕێتو شیدەبێتەوە بۆ (حەدیدیك) بۆ ئەوەی ون نەبێت، ئەمە کێ ئەم میکانیزمەی کرد؟!.

ماددەی ئاسن لە جگەرو سپڵو نیسکو نۆکدا زۆرە، ئافرەت لە (حیض)دا زۆر لەو ماددەی ئاسنە ون دەکات، بۆیە پێویستی بە خۆراکی باش هەیەو، هەروەها ئافرەتی دوو گیان چی ئاسن لەلەشیدا هەیە دەچێت بۆ ئەو کۆرپەیە، لەبەر ئەوە پێویستە سەوزەو جگەرو نۆك نیسك زۆر بخوات، ئینجا کە پزیشك فەحصی کردو زانی کە هیمۆگلۆبینی کەمە ئەو کاتە بەشێوەی عیلاج ئاسنی دەداتێ.

(فیه بأس شدید) (بأس) واتە هێزو تواناو ئەگەر لە مرۆڤدا کەم بۆوە ئەوە ئەو مرۆڤە بێ هێز دەبێت.

*٦ ـ سیواك:*

پێغەمبەر لە فەرمودەیەكدا دەفەرموێت: (السواك مطهرة للفم ومرضاة للرب)[١١٣]، واتە: سیواك پاكژكەرەوەیە بۆ دەمودانو خوای گەورەش پێی خۆشە بەكاری بهێنی.

(دكتۆر وەصفی حەمزە) لە زانكۆی قاهیرە لێكۆڵینەوەیەكی ئەنجامدا، هات سیواكێكی خستە ناو ئاوەوە بۆ ماوەی دوو سەعات بەجێی هێشت، پاشان پاڵاوتی، ئینجا ئەو پاڵاوتەیەی بەكارهێنا لەگەڵ ئەو بەكتریایانەی كە دەبنە هۆی ئیلتیهاباتی پووكو كلۆری دان، بینی (٩٠ ـ ١٠٠٪) لەناویان دەبات.

ئەو پاڵاوتەیەیان شیكردەوە، تا بزانن ئەو ماددەیە چییە دەبێتە هۆی لەناوبردنی ئەو بەكتریایە، دەركەوت ماددەیەكە پێی دەڵێن( بێنزایڵ ئایزۆسایڵ تاینایت). لە فەرمودەیەكی پێغەمبەردا ئەو مانایە دەبەخشێ كە دەفەرموێت: ( لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم باسواك عند كل صلاة)[١١٤]، واتە: ئەگەر بمزانیایە میللەتەكەم ناڕەحەت نابێت فەرمانم پێدەكردن پێش هەموو نوێژێك سیواك بەكار بهێنن.

كاریگەری ماددەی ناو سیواك نزیكەی (٢ كاتژمێر)دەمێنێت، سەرەڕای ئەوەش زانایەك دەری خستووە دانەكانی فڵچەی سیواك تەنها ئەوە نییە وەك فڵچەیەكی ئاسایی زبر بێتو بەس، بەڵكو وەك (قصب) ناوەوەی كلۆرەو پاشماوەی خۆراكی ناو دەم هەڵدەمژێتو پاكی دەكاتەوە.

*٧ ـ پاڵەپەستۆی هەوا:*

لەم دەساڵەی كۆتاییدا دەركەوتووە كە چەند توێژێك هەیە لە بەرگی هەوادا (ترۆپۆسفیر) (میزۆسفیر) (ستراتۆسفیر)(TRAPOSPHERE،

---

[١١٣] فيض القدير/ شرح الجامع الصغير/ ج ٤ لاپەڕە ١٤٧ ژمارە ٤٨٣٢ لە (أبي أمامة)وە(ابن ماجة) ریوایەتی كردووە، (صحيح)ە، لە (أبي بكر الشافعي) (أمام الأحمد) ریوایەتی كردووە، وە هەروەها لە (عائشة)وە (إمام الأحمد) (النسائي) (ابن حبان) (الحاكم) ریوایەتیان كردووە.

[١١٤] فيض القدير/ شرح الجامع الصغير/ج ٥ لاپەڕە ٣٣٨ لە (أبی هريرە) وە (أمام الأحمد، بخاری، مسلم، ترمذي، ابن ماجه) ریوایەتیان كردووە، وە (زيد بن خالد)ەوە (أمام الأحمد، أبو داود، النسائی) ریوایەتیان كردووە(صحيح)ە.

(STRANOSPHERE،MESOSPHERE)، کـه تـا بـەرز بیتـەوە پاڵەپەستۆی هەوا کەم دەبێتەوە.
قورئانی پیرۆز (١٤)سەدە لەمەوپێش دەفەرموێت: (مرۆڤ ئەگەر بەرز بێتەوە بۆ ئاسمان تەنگە نەفەس دەبێت).
باسی ئەو کەسانە دەکات کە بەویستی خۆیان فەرمانی خوای گەورە فەرامۆش دەکەنو پرۆگرامی تر هەڵدەبژێرن بۆ ژیانیانو ئیسلام هەڵنابژێرن، ناتوانن بەشێوەیەك ژیان لێك بدەنەوە کە دڵنیا بن، ڕافەی دەرەوەی ئیسلام هەرگیز تینوێتی دەروونی مرۆڤ ناشکێنیو، هەمیشە لە گومانو دڵەراوکێدا دەژی.
خوای گەورە لە باسیاندا دەفەرموێت:
(وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿١٢٥﴾)[15]

ئەوانە لەکێ دەچن؟، لە کەسێك دەچن بەرزدەکرێنەوە بۆ ئاسمانو تەنگەنەفەس دەبن.ئاشکرایە ئەو کەسانەی دەچنە گەشتێکی ئاسمانیەوە، دەبێت ئەو کەشتیە ئاسمانیە پەستانەکەی کۆنترۆڵ کرابێت، ئەگینا ئەو مرۆڤانە لەناودەچن، لەبەرزبوونەوەیەکی کتوپڕدا کە بەرز دەبێتەوە بۆ ئەو شوێنە پاڵەپەستۆی ئەو توێژە نزمترە لە پاڵەپەستۆی خوێنی مرۆڤەکەی ناوی، ئەو خوێنە دەیەوێت لەناو هەموو دەمارەکانیدا بێتە دەرەوە، تا یەکسان بێت لەگەڵ پەستانی دەرەوەدا، ئینجا ئەو هەموو لوولانەی کە لەناو سیەکاندان هەموویان دەئاوسێن، کە ئاوسان ئەو برە هەوایەی لەناو سیەکاندایە کەم دەبێتەوەو تەنگە نەفەس دەبێت.
ئەو ئۆکسجینەی پێویستە بگاتە خوێنو خانەکانی لەش بەش ناکاتو شین دەبێتەوەو تەنگە نەفەس دەبێت.
قورئان دەفەرموێت:
(ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿١٢٥﴾)[16].

---

[15] الأنعام ١٢٥

*٨ ـ حەرام کراوەکان:*

**خوای گەورە هەندێك شتی حەرام کردووە، (أنما الخمر والميسر والأزلام رجس من عمل الشيطان فاجتنبوه لعلكم تفلحون)، لەو حەرام کراوانە:**

**(خمر) واتە (مسكرات)، ئەو خواردنەوانەی کە هۆشی مرۆڤو تەرکیزی کەم دەکاتەوە، لە کتێبێکی ئینگلیزیدا بەناونیشانی (زە وۆرڵد ئەلمەناك ئەن بووك ئۆڤ فاکت ـ ١٩٩٢/ THE WORLD ALMANAC AND BOOK OF FACTS)باسی مەشروبات دەکاتو دەڵێت: کار دەکاتە سەر جیهازی مەرکەزی عەصەبی، یەکەم جار کار دەکاتە سەر ئەو بەشانەی کۆنترۆڵی نەفسو هەڵسوکەوتی دەستکەوتوو دەکات، ئەو مرۆڤە بەرەو هەڵسوکەوتێکی نامرۆڤانە دەبات، کە پێی دەڵێن (عدائی)(شەڕانگێزی)، واتە ئەو هاوسەنگییە کەسێتییەی تێدا هەیە تێکی دەداتو ئەو کەسەی کە مەشروبات دەخواتەوە تووشی کەمبوون پاشان نەمانی هۆش دەبێتو پچڕبوونی هاوکاری ماسولکەکانوکەمبوونەوەی چالاکی (جهاز الذاكرة/MEMORY SYSTEM)(میمۆری سیستم)، دەبێتو شتی باش بیرناکەوێتەوە لەحاڵەتی سەرخۆشیدا، هەروەها تووشی لاوازی بڕیار دەبێتو ناتوانێت بڕیارێکی کتو پڕ بدات، چونکە کۆنترۆڵەکەی لاواز بووەو، ئەگەر بە هەمیشەیی بخواتەوە لەوانەیە (تلف)ی بەردەوامی لە دەماغدا تووش بێتو زیان دەدات لەو بەشەی مێشك کە کۆنترۆڵی هەناسەدان دەکات، ئەگەر ئەو کەسە ئافرەت بێتو دووگیان بێتو رێژەیەکی زۆر بخواتەوە منداڵەکەی بە زکماکی نائاسایی (مشوه) دەردەچێت، لە عەقڵو لەشو هەڵسوکەوتیدا.**

**ئەو کەسەی بە بەردەوامی ماددە مەستکەرەکان بخواتەوە کاریگەری داوو دەرمانی پزیشکی لەسەر کەمدەبێتەوە، لە ئەڵمانیا ساڵانە (١٥ هەزار) کەس بە کارەساتی ئۆتۆمبیل دەمرن، زۆربەی ئەو شۆفێرانەی دەمرن سەرخۆش بوونو، هەر لە ئەڵمانیا ساڵانە (١٨ هەزار) کەس خۆیان دەکوژن، کە زۆربەیان سەرخۆشن.**

**لە بەریتانیا ساڵانە (٢٥ هەزار) کەس دەمرێت یان دەکوژرێت بەهۆی خواردنەوەوە.**

---

**[١١٦] الأنعام ١٢٥**

**لە ئەمریکا ساڵانە (٢٥ هەزار) کەس هەربەهەمان هۆکار.**
**خوای گەورە بەبێ سوود خواردنەوەی بێهۆشکەری حەرام نەکردووە.**

***٩ ـ مێرووولە:***

**خوای گەورە دەفەرموێت:**

(ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾)[117].

**باسی ئەوە دەکات کە مێرووولە قسە دەکات، (١٤ سەدە) لەمەوپێش.**
**مێرولەیەکی سەرۆك بە مێرولەکانی تر دەڵێت: خۆتان بشارنەوە چونکە حەزرەتی سولەیمان‌و سەربازەکانی هاتوون نەبادا پێیان پێدا بنێن‌و بێئاگابن، ـ واتە لە نیەتیاندا نیە عەزێتتان بدەن، بەڵام چاوی لێتان نیە ـ، خۆی ناشارێتەوە چونکە سەرۆکە، سەرکردە دەبێت هەمیشە لە شوێنی مەترسیدا بێت‌و، ببێتە سەرمەشقی فیداکاری‌و گیان بەختی بۆ گەلەکەی.**
**چەند ساڵێك لەمەوپێش لە گۆڤارێکی رووسیدا کە ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەتی بڵاوی دەکاتەوە بەناونیشانی (SCIENCE IN THE U.S.S.R) (ساینس ئین ذە یو ئێس ئێس ئار).**
**(گۆڤارێکی زانستیە جیاوازی هەیە لەنێوان گۆڤاری ئاسایی‌و زانستیدا، کە توێژینەوەیەك یان لێکۆڵینەوەیەکت لە گۆڤارێکی زانستیدا بینی١٠٠٪ راستە، چونکە گەر ئەو لێکۆڵینەوەیە رێك‌و پێك‌و باوەڕ پێکراو نەبێت بڵاوی ناکاتەوەو ئەگەر (٢ ـ ٣) لێکۆڵینەوەی ئەو پسپۆڕە بڵاوبکرێتەوە ئەوا پلەی زانستی بەرز دەبێتەوە).**
**لێکۆڵینەوەیەك کرابوو لەسەر مێرووولە، جۆرێك لە مێرووولە ناوی (فۆرمیکا)یە، کە قەبارەی کەمێك گەورەیە، چەند هەزارێکیان لەم جۆرە مێرووولەیە هێناوەو، لە**

---

[117] النمل ١٨

شووشـەیەكدا دایـان نـاوەو دەرگایـان بـۆ دروسـت كـردووە، وەكـو پـردێـك، پاشـان وردەكارییەكی بازنەییان بۆ كردووە وەكو سوكانی ئۆتۆمبیـل وایـە، لـەو بازنـەیـەدا شەسـت لوولـەی تێدایـە، لـەو (٦٠) لوولـەیـەدا یـەكێكیان شـیلەی شـەكری تێدایـەو ئەوانی تر بەتاڵن.

دەرگاكـەیان كردۆتـەوە مێرولەیـەكیان هێنـاوە خـستوویانەتە نـاو بازنـە لوولەدارەكـەوە گـەڕاوە... گـەڕاوە بـەناو هەموویانـدا تـا دەگاتـە ئـەو لوولـەیـەی شیلەكەی تێدایە، تێر تێر شیلەی خواردووە پاشان گەڕاوەتەوە.

تێبینـی دەكـەن لـە گەڕانەوەیـدا كـە بەسـەر پردەكـەدا دەڕوات بـۆ شـارەكەی خـۆی دەرگاكـەیان كردۆتـەوە ڕێیـان داوە كـە مێروولەیـەكی تـر بێتـە دەرێ، ئـەم مێرولەیەی كە هاتۆتە دەرێ برسیەتی ئەمیش تێرە، بەرامبەر یەك وەستاونو بە شاخەكانی كێشاویەتی بـە شـاخەكانی ئـەوی تـردا بـۆ مـاوەی سـێ خولـەكو نیـو، پاشان ئەو مێرولە تێرەیان لابردووە كە بە ماوەیەكی زۆر شیلەكەی دۆزیەوە، ئـەم سـێ خولـەكو نیـوە گفتوگۆیـە پێـی وتـووە كەوتۆتـە فـلان شـوێن، ئـەمیش بـێ دواكـەوتن ڕاسـتەوخۆ دەچـێتە ئـەو شـوێنەی شـیلەكەی تێدایـە، ئەمـە زانـست سەلماندیو هاتە سەر ئەوەی كە بڵێت قورئـان ڕاسـتە، مێرولـە زمـانی هەیـە قـسە دەكات، بەڵام ئەو زمانە چۆنە؟، ئەوە بابەتێكی ترە، (إنما هم أمم أمثالكم)، (وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٍۚ ﴿٣٨﴾)[118]

ئەمانە هەموو گەلو میللەتن، بەڵام شێوازی دەربـڕینو گفتوگۆو هـەڵسوكـەوتیان لە ئێمە جیاوازە، تێبینی ئەوەش كراوە كە هەموویان بـە پێچەوانەی كاتژمێرەوە دەگەڕێنەوە.

تێبینی یەكی تریش كراوە كە تا (٦٠) دەتوانێت بـژمێرێتو لـەوە زیـاتر لێـی تێـك دەچێت، ژمارەی لەوە زیاتر لە مێشكیدا هەڵناگیرێت.

---

[118] الأنعام ٣٨



***١٠ ـ جاڵجاڵۆکە:***

**لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:**

(كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِ ﴿٤١﴾)[١١٩].

**(تاء التأنیث) بەکار دەهێنێت بۆ جاڵجاڵۆکە، واتە قورئان دەفەرموێت: مێیە، لەم سەدەیەدا زاناکان بۆیان دەرکەوت کە ئەو جاڵجاڵۆکەیەی ئەم تەنافە دروست دەکات مێیەو نێر دروستی ناکات.**

**پاشان دەفەرموێت:**

(وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِۖ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ)[١٢٠]

**لاوازترین ماڵو خێزان ماڵی جاڵجاڵۆکەیە چونکە نێرینەی تێدا نیە، هەر لە کاتی زاوزێکەدا کە لێ دەبێتەوە مێینەکە دەیکوژێو دەیخاتە ژێر خاکەوە لە نزیک گەراکانیەوەو کە گەراکان هەڵدێن لەشی باوکیان دەخۆن.**

***١١ ـ نهێنی ژمارە:***

**دەست پێکردنی ئەو سوورەتانەی کە دەفەرموێت (ألم، ألر، عسق، کهیعص، طە، یس) پێی دەوترێت (فواتح السور)، مامۆستایەك بەناوی (رشاد خەلیفە)وە لە ئەمریکا خۆیو خێزانەکەی پێنج ساڵ خەریکی لێکۆڵینەوەیەك بوون بە کۆمپیوتەر، هەندێك راستی ئیعجازاتی ژمارەییان بۆ دەرکەوت:**

**١ـ هەر سوورەتێك بەو پیتانە دەست پێبکات ئەو پیتانە لەهەموو پیتێك زیاترن لەو سوورەتەدا.**

**٢ـ هەروەها کۆی ئەو پیتانە دابەش دەکرێت بەسەر (١٩) داو باقی نامێنێتەوە، بۆ نموونە لە سوورەتی (البقرە) بە (ألم) دەست پێدەکات، پیتی ئەلف لە هەموو**

---

[١١٩] العنكبوت ٤١

[١٢٠] العنكبوت ٤١

پیتەکانی سوورەتی (البقرە)زیاترە، (٥٥٩٢) جار پیتی ئەلفی تێدایە، (لام)ەکە (٣٢٠٤) جار، (میم)ەکە (٢١٩٥) جار.

هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)دا کە بە (ألم) دەست پێدەکات، ئەلفەکە لە هەموو پیتەکان زیاترە (٢٥٧٨)جارە، (لام)ەکە (١٨٨٥) جار، (میم)ەکە (١٢٥١)ە.

٣ ـ ئەم ژمارانە بۆ نموونە (ألم) یان (عسق) کۆدەکەیتەوە، دابەش دەکرێت بەسەر (١٩) دا ژمارەی لێ نامێنێتەوە.

بۆ نموونە سوورەتی (ق) (ق والقرآن المجید)، (٥٧) جار وتراوەو، (٥٧) یش دابەش دەکرێت بەسەر (١٩)دا.

(طه) پیتی (ط)لەگەڵ (ه) دا کۆدەکەیتەوە (٣٤٢) جار وتراوەو ئەویش بەسەر (١٩)دا دابەش دەکرێت.

(ن والقلم وما یسطرون)، (ن) (١٣٣)جار وتراوە، ئەویش دابەش دەکرێت بەسەر (١٩)دا.

(ألمر)(١٥٠١) جار وتراوە، دابەش دەکرێت بەسەر (١٩)دا.

ئەم هەمووە رێکەوت بوو؟!؟

(بسم الله الرحمن الرحیم)ی هەموو قورئان کۆبکەرەوە دابەش دەبێت بەسەر (١٩)دا.

وشەی(اسم)(١٩) جار لە قورئاندا وتراوە (١٩)ش دابەش دەکرێت بەسەر (١٩)دا.

(الله) (٢٦٩٨) جار وتراوە دابەش دەکرێت بەسەر (١٩)دا.

(الرحمن) (٥٩) جار وتراوە.

٤ ـ چەند تێبینییەك:

ئەقڵو نوور بەقەدەر یەك وتراوە لە قورئاندا، هەریەکەی (٤٩) جار وتراوە.

(زکاة)و (برکات) بەقەدیەك وتراوەو هەریەکەیان (٣٢) جار.

(مصیبە)و (شکر) یەکی (٧٥) جار هاتوون.

(برد) سەرما و (حر) گەرما هەریەکەیان (٨٨) جار، ئەمانە هەمووی رێکەوت بوو؟!

**(ڕۆژ) (٣٦٠) جار، مانگ (١٢) جار وتراوەو (١٢) مانگیش لە ساڵێکدا.**

**ژیانو مردن هەریەکەیان (١٤٥) جار.**

**دنیاو ئاخیرەت یەکی (١١٥) جار.**

## باسی نۆهەم

## ئەو هێلاّنەی کە مرۆڤایەتی پیّ بەڕێوە دەڕوات

**خوای گەورە دەفەرموێت:**

**(وفي الأرض ايات للموقنين وفي أنفسكم أفلا تبصرون)الذاريات / ٢٠- ٢١.**

**باس لە هێڵەکانی بەرگری کۆمەڵ ئەکەین، چۆن خوای گەورە ئامێری پاراستنی داناوە بۆ جەستەی مرۆڤ، کە بیپارێزێت لە میکرۆبات ونەخۆشی... لە دەستەوە دەست پێدەکات.**

**لە کتێبێکدا خوێندمەوە، پرۆفیسۆرێکی سۆڤیەتی کەناوی (پێترۆف)ە، ئەڵێت: میکرۆبات خراوەتە سەر لەپی دەستی مرۆڤ کە قەترەیەك بووە و ئەم قەترەیە بە هەزاران میکرۆبی هەڵگرتووە.. دوای شەش دەقیقە بە ئامێری مایکرۆسکۆب بۆی روانیوە، بینیویانە تاکە تاکەی زیندووە، دوایی بۆی دەرکەوت، کە پێستی لەپی دەستی مرۆڤ ماددەیەك دەرئەدات، کە میکرۆب ئەکوژێت.. لەوێوە ئامێری پاراستن دەست پیّ دەکات، کە ئەوە هێڵی یەکەمە... ماددەی لیك لەناو دەمدا، خۆی لەخۆیدا ماددەیەکی پاکژە.. هەروەها رژێنەکانی ناو گەدە، ئەو ترشەڵۆکەی ناو گەدە، کە ئەویش زنجیرەیەك لە میکرۆبات لەناو ئەبات.. ئەگەر میکرۆبێك توانی بەم هێلاّنەدا رزگاری بێت، ئەوە بێگومان لەناو ئامێری لیمفاویدا و لە خوێندا لەناو ئەبرێت.. لە کۆمەڵگاداخوای گەورە سێ هێڵی داناوە.. وهێڵی یەکەم، هێڵی بیروباوەڕە.. هێڵی دووەم، هێڵی هێزی دڵە یاخود (ضمیر) واتە ویژدان.. یاخود سۆز.. یا پێی ئەڵێن هۆش.. هێڵی سێهەم: پێی ئەوتریّ رەوشتی کردارەکی،**

یاخود هەڵس و کەوتی میللەت، ئەگەر ئەم سێ هێڵە رووخا، ئیتر ئەو میللەتە نامێنێت.. واتە: هەموو بەهاکانی لەدەستداوە.. کاتێك خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە، بۆئەوەی کە ئەم سێ هێڵە بۆ میللەت و گەلەکانیان تەواو بکەن، کە سەرەتا لە فیکرو بیرو باوەڕەوە دەست پێ ئەکەن لە (لاإله إلا الله)وە دەست پێ ئەکەن، ئەوکات چی بۆ چوون و لێکدانەوە و خوێندەوەی دەوروبەر هەیە، لەو (لاإله إلا الله)وە دەس پێ ئەکەن، ئەو بەها ئاسمانییانە دێتە مێشکی مرۆڤەوە، وردە وردە ئەچێتە ناو دڵ و دەروونیەوە، ئیتر سەرڕێژ ئەکات بە کرداری جوان.. واتە ئەم سێ هێڵە بەم چەشنە دروست ئەبێ، بەلاّم مەسەلەی فیکری نوێ کە دێتە ناو کۆمەڵەوە، ئەمە شتێك نییە، کە ئەمرۆ دروست بوو بێت، بەڵکو فیکری دژیەك هەیە فیکری نوێ هەر لە سەرەتای دروستبوونی مرۆڤەوە، چونکە مرۆڤ تەنها بە ژیری لە ئاژەڵ جیا ئەکرێتەوە، وە بەرهەمی ژیریش فیکرە..

ئەگەر هاتوو مرۆڤێك، لەبەر هەر هۆیەك بێت، ئەگەر فیکرێکی وەرگرت، دژ بە دین و باوەڕ، یەکتاپەرستییەکەی بوو، ئەوا ئەبێت واز لە باوەڕەکەی بهێنێت و ئەوفیکرە بکاتە باوەڕ، ئەوکاتە چی (متعلقات) هەیە لە دید و بۆچوون و بیروباوەڕ، ئەبێ ئەوانیش هەموو وازی لێبهێنێت، ئەمەش بێگومان حاڵەتێکی هەروا ئاسایی و سانا نییە، لەو حاڵەتەدا کە ئەو مرۆڤە ئەو بیروباوەڕەی ئەگۆڕێ، لەناو دڵیدا ئەڵێت: بۆ وا ئەکەیت؟! جاران رێزمان لەفلاّنەکەس ئەگرت، بەلاّم ئێستا رێزی لێ ناگرین.. جاران ئەو خێرانەمان ئەکرد، بەلاّم ئێستا نایکەن؟! جاران ئەو خراپەیەمان نە ئەکرد، کەچی ئێستا ئەیکەین، بۆ..؟ بۆ..؟ بۆ..؟ و لەم پرسیارانە خوای گەورە دەربارەی ئەو مرۆڤانە ئەڵێت: خاوەن نەفسی (لوامة) واتە ئەو نەفسە لۆمە و سەرزەنشت ئەکات.. ئەو مرۆڤە لە ململانێی نێوان هەست و سۆز و، عەقڵ و ژیرییایەتی، چونکە فیکرێکی نوێ هاتووەتە مێشکییەوە.

ورده ورده ئـەم ململانێیـە، زۆربـەی جار ژێـری (عـەقڵ) ئەیباتـەوە، ئـەو فیکـره ئـەڕوات بـەناخی دەروونـی ئەومرۆڤـەدا و زاڵ ئـەبێت بەسـەر ویـژدانا و نقـومی ئەکات، پاشان خەبەری ئەکاتەوە و ئەیکات بە نەفسێکی (أمارة بالسوء) واتە مێشك و دڵ، کـاتێ پـڕ بـوو بـە فیکرێکـی چـەوت، بێگومـان لـەو حاڵەتـەدا ڕەوشـتە کردارەکییەکەش چەوت ئەبێت.. کە گەیشتە ئەو قۆناغە، هێـزی بـەرگری سێیەم، کە بریتییە لە فشاری کۆمەلایەتی لە هەموو کۆمەڵگایەکدا کۆمەڵە خەڵکێك هەن، ریـش سـپی و. . زانـان، ئەمانـە هەڵوێـستی خـەڵك راسـت ئەکەنـەوە، ئـەو راستکردنەوەیە گـەر نـەما، ئـەو کۆمەڵگایـە ئەکەوێتـە حاڵەتێکەوە کـە قورئـانی پـیرۆز نـاوی ئـەنێت بـە (فـترە) لەوکاتانـەدا، خـوای گـەورە هـەموو جارێـك پێغەمبەرێکی ناردووە بۆ دروست کردنەوەی ئەو سێ هێڵە بۆ جاری دووەم.

بارودۆخی عەرەب و مرۆڤایەتی ئەم سێ مەرجەی تێدا بەدی ئـەکرا، روخانـدنی فیکرو ویژدان و، نەمانی ڕەوشتی چاکە بەشێوەیەکە کردارەکی، نەمانی چاکسازان و چاکسازی، فیکری عەرەب لە نەمـەتێکی چەوتدا بـوو، وە وژیـدانیان ویـژدانێکی نزیك بوو لـە مـردوەوە، هـەروەها زۆربـەی ڕەوشـت و ئاکاریـان، کـارێکی نـەفامی و نەزانی بووە وەکو قورئان باسی ئەکات.. بۆ نموونە کابرایەك ئەهات گوێی کۆیلـەو بەندەکەی خۆی ئەبڕی، تەنها لەبەرئەوەی درەنگ هاتووە بەدەمیەوە، بەڵام کـەس پێی نـە ئـەوت بۆچی وا ئەکـەیت یـاخود بـەدار زۆری لێ ئـەدا و ئەیکوشـت، کـەس نەبوو بڵێت بۆچی وائەکەیت؟!

خەڵکەکە بۆچوون و بیروباوەڕێکی چەوتی لە مێشکدا بـوو، ئـەم دەوڵەمەنـدە وەك خاوەنی مەڕوماڵاتەو هەرکاتێ مەڕێکی بهێنا سـەری ئـەبڕی، بـۆ خـواردنی خـۆی، یاخود بۆ میوانێکی خۆی، کەس پێـی ناڵێت بۆچـی وا ئەکـەیت، ئەمـەش کۆیلـە و بەنـدەیەکی خۆیەتی و پارەی پێداوە، سەری ئەبڕێت، ئارەزووی خۆیەتی! خـەڵکی

بەم چەشنە بیریان ئەکردەوە، بەم جۆرە مرۆڤ مرۆڤی ئەچەوساندەوە، لەو بارودۆخەدا خوای گەورە پێغەمبەری (د.خ) بۆ ناردن.. تاوەکو بیروباوەڕیان بۆ ڕاست بکاتەوە.. بۆئەوەی ئەو عەقڵە گلاوە بهێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست.. ئەو ویژدانە نوستووە بەئاگا بهێنێتەوە.. ئەو ڕەوشتە چەوتە ڕاست بکاتەوە.

ویستی خوا وەها بوو کە (محمد) (د.خ) لە شوێنێکدا بنێرێت، کە سەرچاوەی هاوەڵ بڕیاردانە بۆ خوای گەورە.. واتە بەرووکەش، ئەگەر لەهەر هۆزێکی تردا ببوایە، ئیسلامەتی زوو گەشەی ئەسەند.. چونکە خەڵك لە هەموو دورگەی عەرەبدا ئێرەییان بە قورەیش ئەبرد، ئەمان بە ڕۆژی ڕووناك ناتوانن مەودایەکی کەم ببڕن، ئەوان شەو ڕۆژ و زستان و هاوینیان بۆ ئەبوو وەکو لە قورئاندا لە سورەتی قورەیشدا خوای گەورە ئاماژەی پێ ئەکات و کەس پەنجەی بۆ ئەبردووە، تەنها لەبەرئەوەی کە خاوەنی (بیت)ن و قورەیشن.. پێغەمبەری خوا (د.خ) لە هەر هۆزێکی تر ببوایە و ئەو بارودۆخەی بۆ بانگەوازەکەی بقۆستایەتەوە، ئەوا زوو بە زوویی بانگەوازەکەی بلاّو ئەبوویەوە، بەلاّم خوای گەورە ویستی وابوو کە (محمد) (د.خ) لە مەڵبەند و سەرچاوەی (کفر)دا پەروەردە ببێت و لەوێدا هەوڵ بدات، لە سەخترین شوێن، بەلاّم لەهەمانکاتدا ئەگەر پێغەمبەر (د.خ) سەرکەوتوو بوایە لە مەککەدا، ئەوکاتە، ئەمڕۆ خەڵکی پەیدا ئەبوون لە مێژوونووسان ئەیان وت، شتێکی زۆر زۆر ئاساییە، چونکە قورەیشییەکان سیاسین و سەرکردەی عەرەبن و زۆر بە ئاسایی سەرکردایەتی عەرەبییان کردووە، زانیویانە ئەمە (ئەم دینە) سوودی تیایە (محمد)یان بۆ خۆیان قۆستوەتەوە، بۆئەوەی سەرۆکییەکە بۆ خۆیان بمێنێتەوە، بۆئەوەی ئەو قسەیە ئەکرێ، خوای گەورە ویستی وابوو کە پێغەمبەر (د.خ) سەرنەکەوێت لە مەککە و لەوێدا ئایینەکەی بلاّو نەبێتەوە، وەماوەی (١٣) ساڵ هەموو دەروازەیەکی لێ داخرا، بەڵکو لە شوێنێکی تر ئەم دینە

بـەهێز بـوو، ئـەویش مەدینـە بـوو وە لەوێـدا پـشتیوانی پەیـداکرد و لـەوێوە ئیسلامەتی بۆ هەموو جیهان بڵاوبوومەوە..

فیکر و بیروباوەڕ چەشنی با وەهایە، سنوور نازانێ و میللەت ناناسێ واتە بـا چۆن ئەڕوات، ئەوهاش فیکـری ئـەڕوات بـۆ دەورووبـەر، فیکـری نـوێ، ئێمـە نابێـت لێـی بترسین.. ئەمڕۆ بەهۆی ئەوە کە هۆکارەکانی گواستنەوەی مـرۆڤ ئاسـان بـووە بـۆ پەیوەنـدی کـردن.. لـە دورتـرین خـاڵ لەسـەر زەویـدا پەیوەنـدی ئـەکرێت لەگـەڵ ئەوپەڕی زەویدا، بە چرکەیەك.

چـەند سـوپایەك پەیـدا بـوو، کـە سـوپای ڕاگەیانـدنی پـێ ئـەڵێن، ئەمانـە نـاڵێین: ڕۆژانە، بەڵکو دەقیقە بە دەقیقە فیکری نوێ بڵاوئەکەنـەوە لـە هـەموو جیهانـدا.. ئێمەی موسڵمان بۆئەوەی ئەو سێ هێڵەی پێشتر باسمان کرد، بپـارێزین، بەتایبـەت هێڵـی بیروبـاوەڕ.. ئـەو فیکـرە نوێیانــە کـە دێـت ئەگـەر لـە خزمــەتی بــەها ئاسامانییەکاندا بن و قییەمی خواین، ئەوە حیکمەتێکە و ئەبێت بـەکاری بهێـنین، وە ئەگەر بزانین دژ بەوەیە، ئەوا ئـەبێت چارەسـەری بـۆ بدۆزینـەوە و، خـەڵکیش هۆشـیار بکەینــەوە، کــە ئاگــاداری خۆیــان بــبن لــەم ئەفکارانــە کــە دێــن، هــەموو فیکرەیەك وەکو پێغەمبـەری خـوا (د.خ) ئەفـەرموێت: (الحکمـة ضـالة المؤمن أنـي وجد ها فهوا حق الناس بها)[121].

واتــە.. دانــایی فیکـری جـوان لـەلای موسـڵمان وەکـو ونبویـەکی وەهایـە، کاتێـك ئەیدۆزێتـەوە، خـۆی لـە هـەموو کەسـێك زیـاتر مـافی هەیـە کـە بـۆ خـۆی بێـت.. ئیسلامی پیرۆز هەر کـە خـوای گـەورە دروسـتی کـردووە، لەسـەر بناغـەی ژیـری و زانست و عیلم دروستی کردووە و بونیادی ناوە، ئەوەتا یەکـەم وتـە لـە قورئانـدا و

---

[121] ئەم فەرموودەیە بەم شێوەیە لە سنن ابن ماجة / کتاب الزهد، باب الحکمة – دا هاتووە: الکلمة الحکمة ضالة المؤمن، حیثما وجدها فهو أحق بها.کە ئەبی هریرە دەیگێڕێتەوەو ژمارەکەشی(٤٢٥٦)ە.

لـه یەکـەم ئایـەت و لـە یەکـەم سـورەت، یەکـەم وشـەش حـەزرەتی جوبـرەئیـل گەیاندنی بە پێغەمبەری خوا (د.خ) لە قورئاندا، وشەی (إقرأ) بوو، واتە بخوێنە.. زانست و شارەزایی وەربگرە.. خۆت و دەوروبەرت بخوێننەوە و یەکتری بناسن.. وە بە (قلم) خامە سوێندی خواردووە و سورەتێکیشی بەو ناوەوە ناوناوە، کەواتە ئەم دینەمان لەسەر بناغەی ژیری (منطق) دروست بـووە، بیروبـاوەڕی یـەکتا پەرستی زۆر ئاسـانە، پەیوەنـدی نییـە بـە ئاسـتی رۆشـنبیری مرۆڤـەوە، لـە رۆشـنبیر تـرین کەس هەتا عەوام ترین کەس.. (لاإله إلاألله) وەرئەگرێت وتێی ئەگات، چونکە باسی گەورەترین راستی بوون ئەکات.. ئەم باوەڕ پێ ئەکرنە وردە وردە دێتە نـاو دڵـەوە و جێگیر ئەبێ لە دڵدا، خۆشەویستی ئەم دینە و ئـەم پێغەمبـەرە (د.خ) دێتـە نـاو دڵەوە، پاشان سەرڕێژ ئەکات بەشێوەی کرداری جوان..بەشێوەی هەڵوێـستی جـوان، کـە گـەورەترین و رێـك و پـێکترین ژیـار (حـضارة)ی دروسـت کـرد.. ئیـسلام بـە گەواهی دانی دوژمنانی ئیسلام.

کەواتە ئەم دینـەی ئێمـە هـەر فیکرێکـی تـر دێـت دژی ناوەسـتێت و بـەخێرهاتنی ئەکات، ئەگەر لە بەرژەوەندی بەهاکانی خوای گەورە بێت، بەڵام هەندێ بیروباوەڕ پەیدابوو، کە دژ بە دیانەتـە، یـەکێك لەوانـە (داروین) بـوو.. دارویـن فیکرەیـەکی نوێی هێنا کە رووپۆشـی کردبـوو بـە زانـست، ئـەو فکرەیـە پێـی ئـەوترێ (تطور)، ئەڵێت شت نییە لە بونـەوەردا کـە جـێگیر و نـەگۆڕبێت، هـەموو شـتێك دەگـۆڕێـت، ئـەم بیروبـاوەڕەی کـە هێنـا، واتـە بـیردۆزی (ثیـوری) دەقـاو دەق (١٨٠) پلـە دژ بـە بیروباوەڕی کەنیسەبوو، کەنیسە ئـەڵێت: هـەموو شـتێ لە بوونـەوەردا جـێگیرە و، ئـەمیش پێـچەوانەی کەنیـسە بـوو، وردە وردە خـەڵك ناچـار بـوو کـە بـاوەڕ بـە بیردۆزەکـەی دارویـن بکـات، چـونکە ئـەبینێت کـە دونیـا ئـەگۆڕێت و کەنیـسەش ئەڵێت: هیچ شتێك ناگۆڕێت، ناچار (بۆیە ئەڵێم ناچار، چونکە مەسیحییەکان لە



بیروباوەڕیاندا وەکو ئێمەن و زۆر ڕێزیان هەیە بۆ مرۆڤ وە باوەڕیان وەهایە، کە پیرۆزترین دروستکراوی خوا، لەسەر زەمیندا مرۆڤە)، لە کاتێکدا داروین ئەڵێت مرۆڤ لە مەیموونەوە هاتووە و ڕێزی ئەشکێنێت.. بە مرۆڤ ئەڵێن..مەیموونی بێ تووک.. داروینیەت بەم چەشنە ئەڕوانێتە مرۆڤ!. ئەو بیرە نوێیە کە هاتە ناو کۆمەڵگای ئەوروپاوە، ناچار هەموو کۆمەڵگا باوەڕی پێ هێناو دژ بە کەنیسە وەستا، بەڵام ئەو دژایەتییە کەمتر بوو لەگەڵ ئێمەدا، ئیسلام ناڵێت هەموو شتێك جێگیرە و ناڵێت هەموو شتێك دەگۆڕێت، بەڵکو ئەڵێت: لەناو مرۆڤدا، هەندێ سیفەت و خەسڵەت هەیە دەگۆڕێت، و هەندێکیشی ناگۆڕێت.. لەبوونەوەریشدا هەندێ لایەن و بوار هەیە ئەگۆڕێت، و هەندێکیشی ناگۆڕێت.. وە هەر هەموویان یاسای خوای گەورە بەڕێوە ئەبات.

ئەم بیری داروینە چووە ناو بواری کۆمەڵایەتییەوە و چووە ناو سیاسەت و ئابووریەوە و ڕێگەی دا بە هەموو کەسێك کە فێڵ بکە شتێکی جێگیر نییە، بەو واتایەی کە شتێك نییە بۆی بگەڕێتەوە و پێی بووترێ ڕەوشت و بەها، و هەموویان دەگۆڕێن.. قوتابخانەی لێ دروست بوو.

داروینیەت ئەڵێت: دروستبونی بەدیهێنراوان واتە کرداری ئەندازەگیری، شتێکی زاتییە و پەیوەندی بە خواوە نییە و ویستی خوای لەسەر نییە و شتێکە خۆی خۆی دروست ئەکات، ئەمە لە بایلۆجییەوە چووە دەرەوە و هاتە ناو دینەوە وئازاری دین ئەدات.

نەك تەنها مەسیحی، بەڵکو ئازاری هەموو دیندارێك ئەدات.

دووەم ئەڵێت: سروشت کوێرانە کار ئەکات. . ئەم جۆرە چەمکانە (مفاهیم) وا لە هەموو دیندارێك ئەکات، مەسیحی بێت یان موسڵمان، کە باوەڕی بەخوای گەورە لاواز بێت.. ئەمە بەهۆی دۆزینەوەی بیردۆزی (تطور)، بەڵام پاش داروین بە

ماوەیەك زەڕڕە دۆزرایەوە، کەبچوکترین یەکەی بوونە! تەماشا ئەکەن بلیۆنەها ساڵ لەمەوپێش ئەو قورقوشمەی هەبووە، ئێستاش هەمان قورقوشمە.. ئەو گۆگردەی هەبووە، ئێستاش هەمان گۆگردە.. هەر توخمێك هەیە لەسەر زەوی هیچیان گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە. (مندلیف) یەکێك بوو لەو زانایانەی کە خشتەی خولی دانا، شتێکی دۆزییەوە کەپێی ئەوترێ ژمارەی پرۆتۆنەکانی ناو (نەواتی زەڕڕە) ناوکی ئەتۆم، کە هەموو توخمێك ژمارەیەکی دیاریکراوی هەیە و ناگۆڕێت و نەگۆڕاوە.. ئەم راپۆرتە زانستییە دژ بە داروینیەت وەستا وە بگرە بوو بە یاساش..

پاش ماوەیەکی تر خانەی مرۆڤ و گیانلەبەر و رووەك، بە میکرۆسکۆب لێی کۆڵرایەوە و باسی لەسەر کرا، دەرکەوت کە شتێکی زۆر زۆر سەرسوڕهێنەرە، هەموویان یاسا کۆنترۆڵی کردوون..

کرۆمۆسات (سیفاتی بۆماوەیی) دۆزرایەوە.. ئەی مرۆڤ! تۆ کە لە خانەیەکەوە هاتوویت، ئافەرین خانە کە بتوانێ سیفاتی دایك و باوك و باپیرانت بۆ بگوێزێتەوە.. پاشان ئەو خانەیە زیاد ئەکات تا ئەگاتە (١٠) خانە واتە (یەکێك و سیازدە سفری لەبەردەم دایە) ئەم خانانە وەهایان لێدێت، کە هەندێکی ببێ بە چاو، هەندێکی ببێت بە گوێ، هەندێکی ببێت بە خوێن، هەندێکی ببێت بە ئێسقان، هەندێکی ببێت بە پێست، ئەمە چ بەرنامەیەکی بۆ دارێژراوە؟!!!! لەوەش گرنگتر، ئەو سیفاتانە ون ناکات و ئەیگوێزێتەوە بۆ نەوەی دواتریش.. دەرکەوت کە رژێمێکی زۆر سەرسوڕهێنەر هەیە لە بوونەوەر و مرۆڤدا..

هەروەها راپۆرتی زانستی تر بە جیهازێك هەیە کە تەمەنی ئێسقان ئەخوێنێتەوە، کە (half life)ی پێئەڵێن کە پێوەری تەمەنی کاربۆنە، جۆرە مرۆڤێکیان دۆزییەوە کە هی (٣٠) هەزار ساڵ لەمەوبەر بوو، کە لە ئاسیاو ئەفریقا







وئەوروپا ژیاوە بەئێسکە پەیکەری و باڵایدا حسابی بۆ نەکەن، ئەم مرۆڤە زۆر جوان مردووی ناشتووە، زۆر ڕێزی لە مردوو گرتووە، واتە باوەڕی بە قیامەت هەبووە، ئەی کەواتە ئێستا مرۆڤ کە ڕێز لە مردوو ئەگرێت، شتێك نییە کە تازە دروست بووبێ، بەڵکو ئەمانە سیفەتێکن کە جێگیرن لە مرۆڤدا.. ئەمڕۆ کە مرۆڤ منداڵی خۆی خۆش ئەوێت، ئایا مرۆڤی کۆن منداڵی خۆی خۆش نەویستووە؟! ئەگەر خۆشی نەویستایە، چۆن مرۆڤایەتی هەتاوەکو ئێستا ئەما، و کێ ئەو منداڵانەی ئەپاراست؟! ئارەزووی مرۆڤ بۆ خواردن و رەگەزی بەرامبەر، ئەمانە هەموویان جێگیرن لە مرۆڤدا، هەروەها ئارەزوو کردنی تەمەن درێژی و کۆبوونەوە لەگەڵ خەڵکانی تردا، هەروەها تەماع.. ئەم هەموو سیفاتانە دەرکەوت کە هەموویان نەگۆڕن لە مرۆڤدا، ئەمەی کە گۆڕا چییە؟ جاران لەوانەیە بە گەڵای درەخت پان بە پەڕی هەندێ باڵندە خۆی داپۆشیبێ، وردە وردە توانی ئامێرێك دروست بکات، کە ڕاو بکات.. وەك ڕاوی کرد سوودی لە پێست و خوری ئاژەڵ وەرگرت و ئەوەی کرد بە بەرگ، پاش ماوەیەك توانی شت بچێنێت و بیکات بە بەرگ و دواتر و پاش چەند قۆناغێك ئامێریان دروست کرد کە قوماشی دروست ئەکرد، ئەوەی کرد بە بەرگ، ئێستاش لەسەر مۆدێل ئەڕوات رووکاری دەرەوە گۆڕاوە، بەڵام ناخی و ناوەوەی جێگیرە....

جاران بەپێ ئەڕۆشتن، بەڵام پاشتر کەزانی دار نوقمی ناو ئاو نابێت، هات کۆمەڵێك داری پێکەوە نوساند، جۆرە بەلەمێکی دروستکرد بۆ هاتووچۆی ئاوی. هەروەها هەندێ ئاژەڵی گرت، بینی هەندێکیان ماڵی ئەبن توانی هەندێکیان بەکار بێنێت بۆ گواستنەوە بەم جۆرە بەلەم.. فڕۆکە.. کەشتی ئاسمانی و. . لەوانەیە ماوەیەکی تر گەشت بکات لە شوێنێکی تر بڕوات بۆ دەرەوەی زەوی.

جاران لە ئەشکەوتدا ئەژیا، دواتر خانووی لەگڵ دروست کردوو پاشان بە کۆنکرێت و لەدواییدا کۆشك و تەلار... لەبەرئەوە ئێمە ئەبێت دووشت تێکەڵ نەکەین، ئەوانیش (متغیر) و (ثابت). ئەوەی کە جێگیرە، فەرمانەکانی خوای گەورەیە.. بەڵام ئەوەی دەگۆڕێ شێوازی گەیاندنی ئەم شەریعەتەیە بە خەڵك... بۆ نموونە لەو بەها ئاسمانی و خوایی و ئیسلامیانەی کە چوەتە ناو خوێنمانەوە، برایەتییە.. دادپەروەرییە.. خۆشەویستییە.. سۆز و بەزەییە.. هاوکارییە.. ئەو موسڵمانانەی کە باوەڕی هێنابوو بە ئیسلام، و ئەم بەهایانە هاتووەتە ناو دڵییەوە، سەرڕێژی کردووە و کردوویەتی بە رەوشتێکی کردارەکی، کە بیستوویەتی فلاَن کەس هەژارە، یەکسەر بیری کەوتووەتەوە ئەمە برایەکی ئاینییە، و ئەبێ رەحمم هەبێ بەرامبەری، هاتووە دوو سێ ئیزرەم گەنمی داوە بە کۆڵیدا و لەبەر دەرگاکەیدا داناوە و لە قاپیەکەی داوە و رایکردووە، بۆ ئەوەی نەزانن کێیە، چونکە مەرجی کردووە چاکە ئەوەیە کە زوو خێر بکەیت و دوای نەخەیت، نەوەك شەیتان زەفەرت پێ بەرێت و رێگریت بکات.. هەروەها نهێنی بێت و باسی نەکەیت. ئەم مرۆڤە هاتووە و چاکەکەی کردووە و برایەتی و هاوکاری و سۆز و بەزەیی و. .. بەو شێوازە جێبەجێ کردووە، وردە وردە کۆمەڵگای ئیسلامی گەورە بوو کارەکە بوو بە کارێکی بە کۆمەڵ لە رێی زانایەکی دین یان ریش سپییەك ئەکرا، ئەو پارمەتییانە لای ئەو کۆ ئەکرانەوە کە کۆمەڵێك هەبوو بەکاری ئەهێنا بۆ دابەشکردنی خێر.. کە دەوڵەتی ئیسلامی پلە بە پلە لە رووی بەرێوە بردنەوە پێشکەوت، کارەکە درا بەدەست ولایەتەکان و (والی) ئەم کارەی ئەکرد.. ئایا ئەمرۆ من و تۆ گەر بمانەوێت بیسەلمێنین بۆ جیهان، کە ئێمە سۆز و بەزەیی، بەشێکە لە بوونمان، کە ئێمە باوەڕمان بە هاوکاری هەیە؟ ئایا ناتوانین؟ بێ گومان ئەتوانین..

خوای گەورە ئەفەرموێ: (و تعاونوا على البر و التقوى ولا تعاونوا على الإثم و العدوان)[١٢٢] یەکێك لە موفەسیرەکان (بر) و (تقوى) زۆر جوان راڤە ئەکات و ئەڵێت: (بر) واتە هەرچی میللەت پێی رازی بێت.. (تقوى): واتە هەرچی خوا پێی رازی بێت ئەم دوو مەرجە لە هەر بوارێکدا کۆبووەوە، ئەبێت تۆ لەو بوارەدا هاوکاری بکەیت، نەك تەنها هەرچی میللەت پێی رازی بێت، بەڵام سنوورێکی ترمان هەیە، کە ئەورازی بوونە لەگەڵ رازی بوونی خوادابێت وشەرعی بێت، ئەبێت لەو بوارەدا هاوکاری بکەیت.

کەواتە ئەم چەمکە قورئانییە نەگۆڕە، بەڵام چۆنی جێبەجێ بکەم؟ ئایا وەکو ئەو هاوەڵەی کە لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا کردوویەتی ئەمڕۆ کۆتایی سەدەی بیستە، ئەبێ بە شێوازی ئەمڕۆ جێبەجێی بکەم.

گەر بڕوانینە هەموو جیهان، ئەبینین هەموو بەشێوەی دامەزراوە کار ئەکات بە شێوەی رێکخراوی جیهانی کارئەکات.. کەواتە ئەبێ من رێکخراوێك دابمەزرێنم، بێ باوك بەخێو بکات، بۆئەوەی بیسەلمێنم بۆ جیهان کە من بەزەیم بە منداڵدا دێتەوە، رێکخراوێك دروست بکەم، بۆئەوەی بیسەلمێنم بەزەیم هەیە بەرامبەر بە منداڵ.. رێکخراوێك دروست بکەم، ئاستی رۆشنبیری ئافرەت بەرز بکاتەوە و هۆشی ئافرەت بەرز بکاتەوە و زوڵم بەرامبەر ئافرەت نەهێڵێت، نەك تەنها بە گوفتار یان بە شەخسی، ئەمە پەیڕەو و پرۆگرامی ئەوێت و، نەخشەی فیکری نوێی ئەوێت، بەم جۆرە بۆ شێوازی هەموو بەهایەك..

رەحم و بەزەییەکەی پێغەمبەر (د.خ) بۆ منیش بووە! رەحم و بەزەیی ئیسلامەتی ئەروات بۆ ئاژەڵ و رووەك، لە حاڵەتی جەنگدا کە پێی ئەوترێ (أحكام عرفيه) ئیتر یاسا نامێنێت، لەو حاڵەتەشیدا، بڕوانە ئامۆژگارییەکانی ئەبو بەکر

---

[١٢٢] المائدة / ٢

و عومەر کە بۆ سوپاکانیان کردووە، ئەڵێن: درەخت نەبڕنەوە و ئاژەڵ و بێ چەك نەکوژن.. ئەبێت تۆ بێیت بپارێزیت، تاوەکو کۆچ نەکەن و لە وڵاتەکە رانەکەن.. ئەو پەپولانەی لە وڵاتەکەتدان بیانپارێزیت.. ئەو رووەکە کێویلەیە بمێنێت، بەچی ئەمێنێ؟ بە نەسوتانی خاکەکە و نەرووخاندنی شوێنەکە، بەم جۆرە ئەیسەلێنی بەشێوەیەکی سەردەمیانە و تازە، کە بیروباوەڕەکەت هەروەکو خۆیەتی.. بەڵام ئەبێ شێوازی جێبەجێ کردنەکەت بەشێوەی دامەزراوە (مؤسسة) بێت، پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەگەر ئەمڕۆکە خوای گەورە بیناردایە، سواری حوشتر ئەبوو یان سواری ئۆتۆمبیل ئەبوو؟.. تەلەفزیۆنی نەئەبوو؟ ئەو مەڵبەندەی حەزرەت دەوامی تێدا دەکرد ئامێری چاپی تیادا نەئەبوو؟ فاکسی نەئەبوو؟ بێگومان ئەمانەی بەکار ئەهێنا..

تەلەفزیۆنی دانەنا تاوەکو لەگەڵ خەڵکیدا بدوێ؟ فیکری نوێ کەلە بەرژەوەندی بیروباوەڕەکەماندایە، ئەبێت بەخێرهاتنی لێ بکەین.

یەکتر ناسین ئامانجە لە دینی ئێمەدا: (یاأیها الناس إنا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوبا وقبائیل لتعارفوا)[١٢٣] بەهۆی ئینتەرنێتەوە زۆر کەس موسڵمان بووە.. موسڵمان کە بەکاری ئەهێنێت، پەیوەندی ئەکات و دینەکەی خۆی بڵاوئەکاتەوە لەرێی ئەو تۆڕەوە، زۆر کەس ئەیەوێت بزانێت ئیسلامەتی چییە، گومان هەیە، تۆ گومانەکانی بۆ ناهێڵیت، ئیتر موسڵمان ئەبن.

بەڵام بەداخەوە زۆر پرسیاری ئیسلامی، بێگانە وەڵامی ئەداتەوە مەڵبەندەکانی لاهووت لە زانکۆی مەسیحیەکان وەڵامی پرسیاری ئیسلامی ئەدەنەوە، چونکە موسڵمانان بێ ئاگان و نەچوونەتە ناو ئەو تۆڕەوە، بەڵام ئێستا ئەیانەوێت وێستگەیەکی سەربەخۆی ئیسلامی دابنێن کە پێی ئەڵێن: (محطة القرضاوي

---

[١٢٣] الحجرات / ١٣

للإنترنيت)، هەرچی فتوا هەیە داخڵی ئینتەرنێتەکەی نەکەن، بۆئەوەی هەمو جیهان لەوێوە ئەو فتوایانە وەربگرێ لەسەر مەزهەبی سوننە...



# باسی دەهەم

# نزاو پاڕانەوە لـە پەروەردگاری مەزن

**لە مەرجەکانی دوعا کردن:**

**١- هاوار بەریَ بۆ خوای گەورە بە ناوەکانی خۆی.**

**٢- سەڵەوات بدەیت لە گیانی پێغەمبەر (د.خ).**

**٣- تەنها لە خوای گەورە پێداویستییەکانت داوا بکەیت.**

**٤- کاسبیەکەت حەلاڵ بێت.**

**٥- دڵت بوغزی تیا نەبێت.**

**٦- دڵت گوناهی تیا نەبێت.**

**٧- حەققی خەڵکت نەخواردبێت.**

**٨- سیقەت هەبێ بەخوای گەورە لەکاتی دوعاکەدا.**

**٩- دڵت ئامادەبێت.**

**١٠- پەلەنەکەیت لە وەڵامدانەوەی خوای گەورە، هەندێ ئادابی تریش.**

**پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: (إن الله لایستجیب لدعاء المرء مالم یجعل، فیقول فدعوت فلم یستجب لي)[١٢٤]**

**خوای گەورە دوعای ئەو کەسە قبوڵ ناکات کەبڵێ دوعام کردو خوا قبوڵی نەکرد، قەت ئاوها نەڵێیت، چونکە کاتی وەڵامدانەوە خۆت دیاری ناکەیت، خوا (سبحانە وتعالی) دیاری نەکات، قەت وەها نەڵێیت، لەو مەرجانەی تریش کە باسمان**

---

**[١٢٤] رواه البخاری**

نەکردووە، ئەرکێکی کۆمەڵایەتییە و لەسەر شانی هەمووانە، هەرچی ئینسانێ کە عاقڵ بوو ژیر بوو لە کۆمەڵی ئیسلام، ئەرکێکی کۆمەڵایەتی لەسەر شانە، ئەگەر لێپرسراویەتی زیاتر بوو لەسەر ئەو ئەرکەکەی قورس تر دەبێ، کەس نییە ئەرکی لەسەر شان نەبێ پێغەمبەری خوا (د.خ) دەفەرموێت (کلکم راع وکلکم مسؤل عن رعیته)[١٢٥] وەکو باسمان کرد لە ساناترین شتەوە هەموو کەسێ ئەتوانێ لە کارەبا ئیقتصاد بکات، لە ئاوا، منداڵێك دەبینی دارلاسیکی پێیە بەرگری بکە بەم جۆرە ئەرکی سەر شانە هەموو کەسێ ئەتوانێ پێی هەستێ، چاوەڕوانی ئەوەمەکە شتی بچووك و گەورە حکومەت بۆت چارە بکات بەتایبەتی شتی پەروەردەیی، خۆت لێپرسراوی لە ماڵ و منداڵی خۆت لێپرسراوی لەو کەسانەی کە بەخێویان دەکەیت، لێپرسراوی لەو کەسانەی کە بە قسەت ئەکەن ئەو کەسانەی کە بەخێویان دەکەیت، لێپرسراوی لەو کەسانەی کە بەقسەت ئەکەن ئەو کەسانەی کە وەلایەتت هەیە لەسەریان، ئەو کەسانەی کە گوێت لێ ئەگرن، چونکە ئەگەر فەساد بڵاوبووەوە، ئەم هەموو مەرجانەش ئەگەر هەبێ دیسان دوعاکەت قبوڵ نییە، پێغەمبەری خوا (د.خ) دەفەرموێت (والذي نفسي بيده لتامرون بالمعروف و لتنهون عن المنكر أو ليوشكن الله يبعث عليكم عقابا منه ثم تدعونه فلا يستجيب لكم)[١٢٦] یان ئەبێ فەرمان بکەن بە چاکە و نەهی بکەن لە خراپە، کە ئەمە ئەرکی سەرشانی ئوممەتی (محمد)ە (د.خ)وە ئەو خێر و مەوقیعە بەرزەی کە درا بە ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ) لەبەر مەرجی (فەرمان بەچاکە و نەهی لە خراپە کردنەبوو)، ئەگەر واز لەوانە بهێنن بەزووترین کات خوای گەورە مرۆڤە خراپەکان دەکات بە دەسەڵاتدار بەسەریاندا، ئەوسا

---

[١٢٥] البخاري / ج١/ص ٢١٥ – ریض الصالحين / عدد٢٨٦ و ٣٠٢

[١٢٦] (جامع الترمذي) عدد ٢١٩٦

پیاوچاكان دووعادەكەن (فلایستجب لهم) دوعاكانیان قەبوڵ نابێ حەزرەتی عائیشه (رەزای خوای لەسەر بێت) پرسیاری كرد ئەی پێغەمبەری خوا (أنهلك وفینا الصالحون؟) ئایا خوای گەورە لەناومان دەبات ئەگەر پیاوچاكانیشمان لەناودا بێت.؟! فەرمووی بەڵێ ئەگەر هاتوو خراپەكارییەكە زۆربوو، كە فەساد بگاتەئاستێك ببێتە دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی هەمووومان لێپرسراو دەبین، چونكە دیاردەكە فەسادە ئیتر فەسادەكە لە ئیداری و كارگێڕیدا بێت یاخود لە ئابووریدا بێت، لە سیاسەتدا بێت یان كۆمەڵایەتی دابێ، لە هەچ بوارێكی ژیانا بێ بە شەوو رۆژێك دروست نابێ هەڵبەتە ئەوە من چاوم لێ پۆشیوە، تۆ چاوت لێ پۆشیوە، ئەو كەسە خیانەتێكی كردووە، ئەو كەسەی تر خیانەتێكی كردووە هەتا تەشەنەی كردووە، لەبەر ئەوە هەموو لێپرسراو دەبین لە حاڵەتی ئەو واقیعە.. بێینە سەر قورئانی پیرۆز كە دوعای زۆر زۆری تیایە، كە پەروەردگار لە چەندین شوێنا فێرمان دەكات كە چۆن هاواری بۆ بكەین لە حاڵەتی غەم و پەژارا ئیتر لە هەموو حاڵەتەكان تەماشائەكەی لە قورئان و لە سوننەتی پێغەمبەردا (د.خ) ئەمانە روون بوونەتەوە، دوعا عیبادەتێكی زۆر بەرزە، ئاوا بە سووكی سەیری مەكەن (الدعاء مخ العبادة)[١٢٧] ناوەڕۆكی عیبادەتە، چونكە زاتی خۆت ئەڵێەدەیتە باوەشی رەبانیەتی خوای تعالی و زاتی خۆت مان دەگرێت لەبەر دەروازەی رەحمەتی خوای گەورەدا ئەمەش پەیوەندییەكی زۆر بەرزە، قورئان فێرمان دەكات لە حاڵەتی نارەحتی لەشدا كە ئینسان نەخۆش دەكەوێت و ئازاری دەبێ دوعاكەی حەزرەتی ئەیوب بكات (رب إني مسني الضر وأنت أرحم الراحمين)[١٢٨] بەو مەرجانەی كە باسمان كرد و دڵت ئامادەبێت و یەقینت هەبێ كە خوای گەورە وەڵامت ئەداتەوە،

---

[١٢٧] عن انس بن مالك / جامع الترمذي / عدد ٣٤٩٩

[١٢٨] الأنبياء - ٨٣

بەدڵێکی پاك و ناوەڕۆکی پاك (نەك حەقی خەڵکت خواردبێ و دوعا بکەیت)، (نەك جلوبەرگەکەت حەرام بێت و دوعا بکەیت)، بەومەرجانەی کە باسمان کرد خوای گەورە دوعای حەزرەتی ئەیووب ئاسا یەکسەر وەڵام ئەداتەوە.. (فاستجبنا له فکشفنا ما به من ضر) وەڵامما دایەوە و ئەو نارەحەتیەمان لەسەر لابرد، لە حاڵەتی ترسا ئایا خۆت ئەترسی یان قەومەکەت ئەترسێ، ترسێکی فەردییە یاخود ترسێکی جەماعییە، قورئان فێرمان دەکات کە بڵێین (حسبنا الله ونعم الوکیل) هۆکاری بۆنەی ئەمە پاش شەڕی ئوحود بوو بە دوو ڕۆژ، شەڕی ئوحود کە لە سەرەتادا موسڵمانەکان سەرکەوتن وە لەقەد پاڵی پشتی گۆڕەپانی جەنگەکەوە پێغەمبەری خوا (د.خ) بیست قوتابی خۆی دانابوو کە لەویا بەرگری بکەن لە هۆردووی پشتەوە نەبادا کافرەکانیان بۆ بێت، پاش ئەوەی جەنگەکە کۆتایی پێ هات لەو بیست کەسە چواردەیان هاتنە خوارێ، ئەوانیش ئیجتهادێکیان کرد و وتیان، ئەم فەرمانە بۆ کاتی شەڕ بووە ئێستا شەڕ کۆتایی هاتووە، کەچوونە خوارەوە خالیدی کوڕی وەلید هەستی بەمە کرد و لە پشتەوە گەڕایەوە ئەو شەشەی شەهید کرد و لەدواییدا حەفتا موسڵمان شەهید بوون ودانی پیرۆزی پێغەمبەر(د.خ) شکێنرا و ئەو حەلەقەی (مغفر)ە چوو بە رومەتی موبارەکیدا و دەمووچاوی خوێناوی بوو و کارەساتێکی زۆر گەورە تووشی موسڵمانان بوو، لەو حاڵەتە سەخت و ناخۆشەدا کە بێگومان شەڕی ئەو وەختە وەك شەڕی ئێستا نەبوو، بەڵکو رووبەروو بوونەوە بووە یەعنی ئەزانی کێ قۆڵی بڕیوی، ئەزانی کێ شمشێرەکەی داوە بە گوێتا و گوێی بڕیوی، ئەزانی کێ چاوی کوێر کردووی، رقێکی زۆر هەبووە لە نێوان جەماوەردا پێغەمبەر (د.خ) دوای دوو ڕۆژ کەوتەڕێ بەرەو شوێنێك پێی ئەڵێن (حمراء الأسد) شاخێکی ناخۆشە، جا بیر بکەرەوە لە ورەی موسڵمانان، زۆربەیان بریندارن، ماندوون و شەکەتن. سەرەڕای ئەوەش لە

ڕێگادا (٧٠٠ موونافیق گەڕانەوە (یەعنی ژمارەی موسڵمانان کەم بووە)، کاروانێك لە عەرەبەکان بەو ناوەدا ڕۆشت (بنی عبد قیس)یان پێ ئەوتن، ئەبوو سوفیان کە هەتا ئەوکاتە ئیمانی نەهێنابوو پێی وت: تەنها ئەم خەبەرە بگەیەنە لەشکرەکەی (محمد) پێیان بڵێ، کە ئێمە وا لەشکرێك ئەهێنین ئەمجارەیان تاقیان ناهێڵین، بەرامبەر بەوە من مێوژتان دەدەمێ مێوژیش فوتێکی زۆر بەنرخ بووە، خورما لە هەموو شوێنێك دەست دەکەوت، بەلام مێوژ لە هەموو شوێنێك دەست نەدەکەوت، هەر بەوە غافڵی کردن، بۆیە ئەم جەنگە دەرونیە ئەم شایعەیە کاربکاتە سەر موسڵمانان، خەبەرەکەیان هێنا موسڵمانانیش لەو وەزعەدا کەچی (سبحان الله) زۆر هەستیان بە بەرزبوونەوەی ئیمان کرد، خوای گەورە لە قورئاندا مەدحیان دەکات، کە دەفەرموێ: (الذين قال لهم الناس إن الناس قد جمعوا لكم فاخشوهم فزادهم إيمانا وقالوا حسبنا الله ونعم الوكيل) ئەو قوتابیانەی پێغەمبەر (د.خ) کە خەڵکی هاتن پێیان وتن ئەو قەومە لەشکرێکی فراوان و بەهێزیان کۆکردۆتەوە بۆ لەناو بردنتان کەچی ئیمانیان زیادی کرد و وتیان خوامان بەسە، خوای گەورەش پاداشتی دانەوە بۆ ئەو دوعا هەڵوێستە (فأنقلبوا بنعمة من الله و فضل لم يمسسهم سوء) خوای گەورە ئەوانی خستە بەر ڕەحمەتی خۆیەوە و نەیهێشت تووشی شەڕێکی تر ببن، واتە لە هەموو حاڵەتێکی ترسا ئینسان بڵێ (حسبنا الله ونعم الوكيل).

لە حاڵەتی غەم و پەژارەدا دەرسێکی گەورە لە قورئانی پیرۆز وەردەگرین دووعایەکە هی حەزرەتی یونسە (سەلامی خوای لەسەر بێ) دانیشتوانی نەینەوا زۆر نارەحەتیان کرد و گاڵتەیان پێ ئەکرد و ئیمانیان پێ نەئەهێنا ناچار ئەوێی بەجێ هێشت بیری کردەوە کە ئیسنانژیانی ماوەیەکی کەمە وە ئەمیش عیلمی پێغەمبەری پێدراوە ئەو کاتە بۆ لەگەڵ ئەواندا سەرفی بکات کەبێ سوودبێ،

بابڕوا قەومێکی تر بدۆزێتەوە، وە ببێتە هۆکاری هیدایەت و ڕێنوێنیان، بەڵام ئەبێ بزانین کە ئینسانی موسڵمان ئازادە وڵاتی خۆی بەجێ بهێڵێ، دین بڵاو بکاتەوە لەملاو لەولا ئازادە بۆ بەجێ هێشتن، بەڵام بۆ پێغەمبەران ڕەوا نییە تا خوا مۆڵەتیان نەدات، لەبەرئەوە خوای گەورە سزای دا و هەڵی دایە دەریایەکەوە و چووە سکی نەهەنگێکەوە، لەناو ئەو تاریکیەدا لەناو ئەو زەرداوەدا لەناو ئەو بۆنە ناخۆشەدا لەناو ئەو شوێنە تەسکەدا هاواری کرد (لاإله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين)، کێ ئەمانەمان بۆ ئەگێڕێتەوە؟! کێ ئەمەی بیست؟! خوا سبحانه وتعالى.. خوا ئەیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: ئاوهای وت: لەناو سکی حوتەکەدا: (ئەم نزاو پاڕانەوەیە بووە مایەی ڕزگاربوونی و لێخۆشبوونی) خوای تعالى کە دەفەرموێت: (فاستجبناله ونجيناه من الغم، وكذالك ننجي المؤمنين) وەڵاممان دایەوە و دوعاکەیمان قوبوڵ کرد وە ئاوەهاش هەموو ئیماندارێك ڕزگار دەکەین، وا نەزانن ئەم دوعایە تایبەتە بە پێغەمبەران (وكذالك ننجي المؤمنين) ئاوەهاش هەموو ئیماندارێك ڕزگار دەکەین، تۆ تەماشای دووعاکان بکە هەمووی تەوحیدە، (لاإله إلا أنت سبحانك) لەوی تریان (رب إني مسني الضر وأنت أرحم الراحمين) بە جوانترین ناو بە جوانترین سیفەت هاواری خوا ئەکات، (وانت أرحم ألراحمين) لێرەدا دان بە زوڵمی خۆیدا دەنێت پاش تەوحید پاش (لاإله ألا ألله) پێغەمبەری خوا (د.خ) دەفەرموێت (ئەوەی ئەو دووعایە بکات بۆ هەچ مەبەستێك بێت خوای گەورە ئەو دووعایە قەبوڵ دەکات)، حەدیثەکە ئەفەرموێت (دعوة ذي النون إذ دعى بها وهو في بطن الحوت لاإله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين لم يدع بها رجل مسلم في شيء قط إلا إستجاب ألله له) بۆ هەر مەبەستێك بێت ئەم دووعایە بکە خوای گەورە قبوڵی ئەکات.

بینینە سە رحاڵەتی پیلان کە هەست ئەکەیت پیلانێکت بۆ دەکەن لەلایەن کەسێکەوە یان لەلایەن کۆمەڵێکەوە، بۆ خۆت یان بۆ کەسوکارت... هتد. کە هەست دەکەیت تەونی پیلانەکە لەسەرت قورسە، هیچ مەترسە و ئەو دووعایە بکە کە قورئان فێرمان ئەکات.. (وأفوض أمري إلى الله إن الله بصير بالعباد) ئەمە ئیمانداریك لە قەومی فیرعەون بوو ئیمانی خۆی شاردبووەوە دوای ئەوەی هەستیان پێکرد، پیلانێکیان بۆ دانا.. پێی وتن خەڵکینە ئێوە بۆچی دژی مووسا ئەوەستن؟ ئەی لەناوماندا پەروەردە نەبووە؟ فلان کەس ئەی مووسا خزمەتی نەکردی؟ فیسارکەس تۆ خواریت لێ بینیوە؟ فلان کەس تۆ لە ژیانتا بیستووتە موسا درۆی کردبێت؟! ئەی بۆ دژی ئەوەستن؟! تەنها داوای یەکتا پەرستی ئەکات؟!.

داوا ئەکات یەك خوا بپەرستین داوای خزمەتی میللەتەکەمان ئەکات، داوای یەکبوونی قەومەکەمان ئەکات بۆ دژی ئەوەستن؟ پاش ئەوەی کە دەرکەوت ئەو دووعایەی کرد، وتی (أفوض أمري إلى الله إن الله بصير بالعباد)، خوای گەورە بەرامبەر بەوە پاراستی لە هەموو پیلانێك کە لە دژی کرابوو، (فوقاه الله سيئات مامكروا وحاق بآل فرعون سوء العضاب)، و ئالی فیرعەون و ئەوانەی کە پیلانیان بۆ دانابوو، ئەوان کەوتنە ناو پیلانی خۆیانەوە، ئەوان تووشی سزایەکی سەختی خوایی بوون.

هەروەها خوای گەورە فێرمان ئەکات لە حاڵەتی حەسوودیاو لە حاڵەتی چاو پیسیا ئەمانە هەموو دووعای تایبەتی هەیە، بێگومان چاو پیسی شتێکە و حەسوودی شتێکی ترە، حەسوودی لە نەفسێکی پیسەوەیە کە ئاوات ئەخوازێت نیعمەتی کەسێك نەمێنێ ئیتر نیعمەتی مادی بێت یان مەعنەوی بۆ نموونە:

نیعمەتی ئەولاد، لە دڵییەوە خۆزگە و ئاوات ئەخوازێ کە منداڵت نەمێنێ، ئەوە ئینسانێکی بێ باوەڕە ئەمە جیاوازە لەگەڵ چاو پیسی..

چاوپیسی جاری واهەیە خۆت، بەڵکو چاوی خۆت ئەو کاریگەریەی لەسەر خۆشەویستێکی خۆت دەبێت، چاوەکە کارئەکاتە سەر کوڕی خۆت، ئەمەش حاڵەتێکی ترە، ئایا چۆن ئێمە ئەم حاڵەتانە جیا بکەینەوە؟ لە حاڵەتی حەسوود یا کۆمەڵێك دووعا هەیە، بەڵام لە هەمووی ئاسانتر کە دوای نوێژی بەیانی (قل هو الله أحد، قل أعوذ برب الفلق، قل أعوذ برب الناس) بخوێنە بەسە، خۆ تا سێ جار ئەمە بخوێنی ئەبێتە قەڵغانێك ئەتپارێزێ تا ئێوارە، لە ئێوارەشدا دووبارەی بکەرەوە ئەتپارێزێ تا بەیانی کە سەیری منداڵێکی خۆت ئەکەی یاخود سەیری باخچەیەکی خۆت ئەکەیت، کە سەیری موڵکێکی خۆت ئەکەیت قورئان ئامۆژگاریمان ئەکات، فێرمان ئەکات بڵێین (ماشاء الله لاقوة إلا بالله) ئیتر کاریکەری خراپی بۆ لایەنە خۆشەویستەکەی بەرامبەرمان نابێت..

کە میوانێکت، دێت مەڵێ ئەو کراسەت چەند جوانە!! بڵێ (ماشاءالله) کراسەکەت جوانە (چاو کاریگەری هەیە پەیوەندی نییە بە نەفس پیسییەوە) ئەم دوو مەسەلەیە هەمیشە جیا بکەرەوە..

دوو هاوەڵی پێغەمبەر (د.خ) لە غەزوەیەکدا دوورکەوتنەوە یەکێکیان چوو خۆی بشوا ناوی (سهل) بوو کراسەکەی داکەند سنگ و سکی دەرکەوت، هاوڕێکەی پێی وت ئەم لەشەت چەند جوانە (هەردووکیان صەحابین)!! (هەردووکیان بەشداربووی جەنگی بەدرن)!! یەکەمیان بورایەوە ئەوی تریان نەخۆش کەوت، دوایی بردیانە خزمەت پێغەمبەر (د.خ) پرسی چی بووە کێ تاوانبار ئەکەی؟ وتی لەگەڵ فلاندا بووم و وای پێ وتووم، بانگی کرد بۆچی یەکتری ئەکوژن (هلا برکتە؟) یەکسەر کەوا بڵێی ئیتر شەیتان ئەو زەهرە نقڵ ناکات، ئەمە

فەرموودەیەکی صەحیحە، چاو رۆڵێکی زۆر زۆر باڵای هەیە بۆ ئەم حاڵەتانە، بەڵام بە (بسم ألله) وە بە (ماشاءألله) وە بە زیکری خوای گەورە ئیتر ئەو شەیتانە هەموو مەفعولێکی ئەوەستێنێ، ئەوەتان لەلا دروست نەبێ کە شەیتان شتی بە دەست بێ یاخود بکەربێ یان هێزێکی خوایی هەبێ، لەگەڵ تۆدا هیچی بۆ ناکرێت، بەڵام بە مەرجێ تۆ هەمیشە خوات لەیاد بێت، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (د.خ) ئەفەرموێ: (العين حق) واتە کاریگەری چاو راستەو هەیە.. لە فەرموودەیەکی تریشا هاتووە ئەوەی کە زیاتر دەبێت بەهۆی مردنی ئوممەتی پێغەمبەر چاو وپیسییە، زیاتر تینی کاری چاوە، چاو وا لە سوار چاك ئەکات رێك بینێتە ناو گۆڕەوە وا لە حوشتر ئەکات رێك بینێتە ناو مەنجەڵەوە.

بێینە سەر حاڵەتی تەنگانە خوای گەورە ئەفەرموێت (أمن يجيب المضطر إذا دعاه و يكشف السوء) ئەی کێ ئەچێ بەدەم لێ قەوماوانەوە و چارسەری گیروگرفتیان دەکات؟ یانی با ئینسان تۆزێ ویژدانی هەبێ سەدان جار، لە ژیانماندا تووشی نارەحەتی بووین، تووشی غەم و پەژارە بووین، تووشی کێشە بووین، کێ بۆی چارەکردین؟ ئینسان وەفای هەبێ تۆزێ ئینصافی هەبێ، غەیری خوا کێ ئەمانەی لابرد؟ (وإذا سألك عبادي عني فإني قريب أجيب دعوة الداعي إذا دعان فليستجيبوا لي و ليؤمنوا بي لعلهم يرشدون) ئەفەرموێ: من نزیکی ئێوەم دووعا بکەن وەڵامتان دەدەمەوە خوای پەروەردگار ئێمەی خۆش ئەوێ بەڵام بە مەرجێ باوەڕی پێ بکەین دەفەرموێ (فليستجيبوا لي وليؤمنوا بي) ئیمانێکی یەکتا پەرستیانەی راستەقینە بە من بێنن هاوەڵم بۆ بڕیار مەدەن شوێن پەیامەکەم بکەون، وەڵامتان دەدەمەوە..

ئەهلی بەصرە هاتنە خزمەت ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم، رەحمەتی خوای لێ بێت، وتیان ئێمە ئەم هەموو دوعایە ئەکەین کەچی خوا وەڵاممان ناداتەوە، بۆچی ؟

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمیش وتی: ئەی ئەهلی بەصرە ئێوە بە دوو جۆر دڵتان مردووە، خوا چۆن دوعاتان قبوڵ ئەکات!! فەرمووی (عرفتم الله ولم تؤدوا حقه) خواتان ناسیوە و مافیتان نەداوە، قورئان ئەخوێننەوە بەلأم جێبەجێی ناکەن و عەمەلی پێ ناکەن!! ئیدعای خۆشەویستی پێغەمبەر دەکەن، بەلأم سوننەتەکانی جێبەجێ ناکەن!! ئیدعای دژایەتی شەیتان ئەکەن، بەلأم ئێوە خزمەتی ئەو ئەکەن و بەقسەی ئەکەن!! ئەڵێن حەز لە بەهەشت ئەکەین و بەهەشتمان خۆش ئەوێت و هیچ کارێکی بۆ ناکەن!! ئەڵێن لە ئاگر ئەترسین و خۆتان ئامادە کردووە بۆ ئاگر!! ئەڵێن مردن حەققە و هیچ ئامادە باشیەکتان نییە بۆی!! خەریکی عەیب و عاری خەڵکن و عەیب و عاری خۆتان لەبیر چۆتەوە!! نیعمەتێکی خواتان پێدراوە و شوکرانە بژێری ناکەن! مردوو ئەنێژن و هیچ دەرسێکی لێ وەرناگرن!! ئیتر خوا چیتان قبوڵ بکات؟! تۆ دێیت جنێو ئەدەیت، بەلأم لە هەمانکاتدا ئیدعای خۆشەویستی پێغەمبەر ئەکەیت! قسە بەیەکێ ئەڵێی و ئەوکەسە نوێژکەرە!! سوجدە ئەبا بۆ خوای گەورە!! چۆن ئەوێرێ قسەی پێ بڵێ؟ نازانم!! گوێرایەڵی دایك و باوکت ناکەیت!! وە لەم لاوە ئیدیعای خۆشەویستی پێغەمبەر ئەکەیت! ئەمە چ ڕێبازێکە؟ ئەمە چ موحیبەتێکە، قورئانی پیرۆز ڕوونی ئەکاتەوە بۆمان کە پێوەرەکەی چییە؟ ئەوەی شوێن پێغەمبەر بکەوێت، یەعنی سەلماندوویەتی بە پێوەری خوای گەورە کە پێغەمبەری خۆش ئەوێت، ئەمما (ئیدیعا) کردن ئەوە هەموو کەس ئەتوانێ بڵێ من فلأن کەسم خۆش ئەوێت، چەنی بە چەند؟ ئەوە بەو هاوار هاورە و صلاوات دانە ناپێورێ، چەندت لە سوننەتەکەی زیندوو کردۆتەوە ؟ چەندت لە سوننەتەکەی جێبەجێ کردووە، چەندت لە سوننەتەکەی چووەتە ژیانتەوە، چووەتە بەشێ لە گیانت ئەوە حسابە ئەمما بە نیسبەت شەیتانەوە کە ئەڵێ



ئیدعا ئەکەن ئێوە دژی شەیتانن، بەڵام بە قسەی ئەکەن ئەمەش لە ئێمەدا هەیە، ئیبلیس لەعنەتی خوای لێ بێ ئەوەندە سوپای هەیە سوپای گەورە گەورەی هەیە، بە هەموو جیهاندا بڵاو بوونەتەوە، ئینحرافاتی (لادان) وەها دروست ئەکەن بەگەلان هەر عەقڵ (وێنا) تەصەوری ناکات، لە وڵاتی پیرۆ کەس ناچێت بۆ دەوام هەتا فاڵێك لەفاوەکەی خۆی نەگرێتەوە، ئەوەندە شەیتان کۆنترۆڵی کردوون، مەفرەزەکانی شەیتان کە دەرئەچن هەندێکیان ئەگەڕێنەوە بۆلای ئیبلیس ئەڵێن: ئەوە فلان موسڵمان وامان لێکرد کە گوناه بکات، ئەڵێ گرنگ نییە!! لەوانەیە تەوبە بکات، شەیتانێکی تر کە دێتەوە ئەڵێ قوربان فلانی کوڕی فلان کە عابیدێکی زۆر مەشهورە وامان لێکرد کە فاحیشەیەکی زۆر گەورە بکات، ئەڵێ دڵم خۆش نییە، لەوانەیە تەوبە بکات!! یان ئەڵێ فلان مەلا فلان عالم و زانامان وا لێکرد کە لە هاوڕێکەی عاجز ببێت، ئەڵێ گرنگ نییە لەوانەیە ئاشت ببنەوە!! یەکێکی تر دێت ئەڵێت قوربان وام لە فلان کرد لە ژنەکەی بدات و دەری بکات بە منداڵەکانیشیەوە، ئەڵێ تۆ پیاوی (نعم أنت) تۆ چاکی تۆ باشی.

جاری وا هەیە ئەو ئیشەی خۆت ئەیکەیت، کەواتە خۆمان بوینەتە سەربازێکی شەیتان و ئاگامان لە خۆمان نییە، بوینەتە ئەندامێکی حزبەکەی و ئاگامان لە خۆمان نییە، دێیت ئەزیەتی ژن ئەدەیت، ئەقیڕێنیت بە سەر منداڵدا لێیان ئەدەیت، لێدان لە دینی ئێمەدا تەنها بۆ فەرامۆشکردنی نوێژ هاتووە، لە فەرموودەی پێغەمبەردا (د.خ) ئەفەرموێ لە (١٠)ساڵیدا ئەگەر نوێژی نەکرد کوڕ و کچی خۆت، چونکە ئەمە مەسەلەیەکی عەقیدەییە، ئەبێ رابێ لەگەڵ نوێژدا ئەمما لە دەرس خوێندن و لەشتی تردا لێدان نییە، جوێن ئەدەیت و قسەی ناشرین ئەکەیت و ئیدیعای خۆشەویستی پێغەمبەر ئەکەیت، پێغەمبەر (د.خ)

دەفەرموێت (لیس المؤمن بالطعان ولا اللعان ولا فاحشا البذيء) واتا ئیماندار تانە و توانج لێدەر و نەفرین و جوێن دەر و دەم پیس نییە.

هەروەها حەز ئەکەم ئیمانداران ئەوەبزانن کە دوعا زۆران بازی دەکات لەگەڵ قەدەرا لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت (لایرد القدر إلا الدعاء، ولا یزید و في العمر إلا البر)، پێغەمبەری خوا ئەفەرموێت (هیچ شتێك رەدی قەزاو قەدەر ناکاتەوە دووعا نەبێ)، وە هیچ شتێ تەمەن درێژ ناکات چاکە کردن نەبێت لەگەڵ خەڵکدا، پێغەمبەری خوا (د.خ) هانمان دەدا کە دووعا بکەین بۆ یەکتری بەتایبەتی ئەو برادەرەی کە دووعای بۆ دەکەیت لەوێ ئامادە نەبێ بە پاش ملە دووعای بۆ بکەیت دەفەرموێت (مامن مسلم یدعوا لأخیه بظهر الغیب إلا قال الملك ولك بمثل)، هەر ئیماندارێك کە دووعایەك دەکات بۆ برایەکی ئایینی یان بۆ خوشکێکی ئایینی، هەر جۆرە دوعایەك بێت، مەلائیکە ئەڵێت بۆ تۆش ئەوە نووسراوە بۆ نموونە دووعا ئەکەی ئەڵێی خوایە تەوفیقی فڵانەکەس بدەیت خوا تەوفیقی تۆش ئەدات، دووعا ئەکەی خوا شەرەف و ناموسی بپارێزێت خوا شەرەف و ناموسی تۆش دەپارێزێت، ئەمە بەرهەمی ئیمانە، ئێمە تەرکیز ئەخەینە سەر عەقیدە، تەرکیز ئەخەینە سەر شەریعەت بۆ ئەوەی بگەینە بەرهەمەکەی، رەگەکەی عەقیدەیە قەدەکەی شەریعەیە بەرووبوومەکەی ئەخلاقە، وەڵڵاهی ئەو موسڵمانەی ئەخلاقی نەبێ ئیمانی زەعیفە ئایا دەزانی کێ زۆر زۆر نزیکی مەجلیسی پێغەمبەر نەبێت؟! (د.خ) وەك فەرموودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت (أقربکم مني مجلسا یوم القیامة محاسنکم أخلاقا) ئەوە ئەو کەسەیە کە رەوشتی زۆر بەرزە، چونکە ئەوە نیشانەی ئیسلامەتییەکەیەتی، یەکێك ئەگەر هات و داوای خوشکێکی کردی یان داوای کچەکەی کردی، هەموو قورئانی لەبەر بوو مەیدەرێ تا سەیری مەرجەکانی تری

دەگەیت، (إذا اتاکم ممن ترضون دینە وخلقە فزوجوە) ئەو دوو شەریعەتە (دین + رەوشت) دین بەتەنها چییە کە رەوشتی لەگەڵدا نەبێت سوێندت بۆ دەخۆن و دەڵێن (وەڵلاهی) بە جەماعەت نوێژ دەکات، هەمیشە قورئان ئەخوێنێ، ئەی رەوشتی؟ ئەی کار و کردەوەکانی؟ ئەی شێوازی؟ ئەی ئەمانەتی، رەوشت پێش هەموو شتێکە.

هەروەها ئێمە دووعامان هەیە لەکاتی (خەبەر بوونەوە) (نووستن) (نان خواردن) (جل و بەرگ لەبەر کردن) (دەرچوون لەماڵ) (کاتێ مانگ دەبینی) (کە دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە) (کاتێ خۆت ئەکەیت بە مزگەوتدا) (کاتێ خۆت ئەکەیت بە بازاڕدا) (کاتێ خۆت ئەکەیت بە حەمامدا) و لە هەموو حاڵەتێکی ژیانا دووعایەك هەیە بۆچی؟! لەبەرئەوەی خوا سبحان و تعالی ئەیەوێ ئیماندار یەقینی هەبێ ئەوپەڕی ئیمانی هەبێ، ئەوپەڕی باوەڕی هەبێ، کە ئەمرێ و ئەچێتە دادگای خوای گەورە و هیچ شتێك بە کەڵکی نایەت، غەیری پەیڕەوی کردن و خۆشەویستی نەبێ، ئەمەش چۆن دروست ئەبێ؟ ئێستا لە جیهانی ئەمڕۆدا کە تۆ یادی خۆشەویستێکت ئەکەیت وە ئەوە ئەو پردەی بەینی تۆ و ئەو پتە و ئەبێ هەموو جارێ، کە یادی خۆشەویستێکت ئەکەیتەوە بتەوێت و نەتەوێت: ئەو ئەمامە، ئەمامی خۆشەویستییە کە رەگ زیاتر دادەکوتێت و زەحمەتە بە مردنیش هەڵکەنرێ خوای گەورە ئەیەوێت ئاوا ئەو عیشق و خۆشەویستییە دروست بێت لە بەینی خۆی و ئێمەدا لە ڕێی کێوە؟ لە ڕێی رزگار کەرمانەوە حەزرەتی محمد (د.خ).

کە دەست ئەبەی پەرداخێك ئاو بخۆیتەوە بە دەستی راست ئەیگری محمد (د.خ)ت بیر ئەکەوێتەوە، چونکە ئەفەرموێت بەدەستی راست شت بخۆن و بخۆنەوە، دوو قومی لێ ئەدەیت سێ قومی لێ ئەدەیت ئەوت بیرئەکەوێتەوە (د.خ)، خۆشەویستی

ئاوا بەیاد کردنەوە، فوو ناکەیتە ناو ئەو پەرداخە، چونکە پێغەمبەر نەهی لێ کردووە، کە نان ئەخۆیت دەست بۆ ئەوە ئەبەیت کە نزیکتە (وکل مما یلیك) ئەوت بیر ئەکەوێتەوە ئەو دوعایانە هەمووی ئەو فێری کردووین، لە تەعزیەدا چی بە خاوەن مردووەکە ئەڵێی، لە خۆشییان و لە شاییا چی بە بووك و زاوا ئەڵێیت، هەموو شتێکی فێرکردووین، لەم کاتانا کە ئەوە بەکار ئەهێنی، یادی حەزرەتت ئەکەوێتەوە ئەمامی خۆشەویستیەکە ئاو ئەدرێت کە قورئان باسی ئەکات (مثل کلمة طیبة کشجرة طیبة، أصلها ثابت و فرعها في السماء تؤتي أكلها كل حين بأذن ربها)، ئەو ئەمامی ئیمانە، ئەو نوورە کە خوا داویەتی پێت مەیکوژێنەرەوە، ئەو ئەمامە ئاوبدە بە زیکری خوا بە دووعا، ئاوی بدە بە عیبادەت بۆئەوەی سبەینێ فریات بکەوێ، رەگەکەی لە دڵتایە، قەدەکەی و لق و پۆپی چۆتە ئاسمان و ساڵ دوانزە مانگە و بیست و چوار سەعاتە بەروبووم ئەبەخشێ کە کردەوەی چاکەی تۆیە، کە ئەڵێی (لاحول ولا قوة إلا بالله) ئەمامێکت بۆ ئەروێ لە بەهەشتدا کاتێ ئەچیتە بەهەشت تەماشای ئەکەیت ناوچەیەکی گەورە هی تۆیە، هەموو وشەیەك لێرە و لەوێ ئەمامێکت بۆ دەچێنرێ بە بیرکردنەوە لەم کەونە بە بیر کردنەوە لەناوە جوانەکانی و ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە و صیفات و خەسڵەتی پەروەردگار ئەو مەعریفەتە دروست ئەبێ ئەو جوان خواناسیە دروست ئەبێ پاشان ئەزانی عیبادەتی کێ ئەکەی ئەزانی کێ ئەپەرستی، ئەو موحیبەتەشی لەگەڵە، ئیتر ئەوسا کە بۆچونت بۆ ژیان فەرقی ئەبێ لەگەڵ خەڵکی تردا، دوور ئەبی لە لەغو لە پڕ و پاگەندە، شتێ بڵاو ئەبێتەوە زەرەری کۆمەڵی تیایە باسی ناکەیت پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێت (کفی بالمرء إنما أن یحدث بکل ماسمع) ئەوە گوناهێکی گەورەیە کە هەرچی ببیستێ باسی بکەی هەرچی سوودی موسڵمانانی تیا نەبوو هەرچی

بەرژەوەندی موسڵمانانی تیا نەبوو ئەوە پێی دەوترێت لغو (والذین هم عن اللغو معرضون) موسڵمان کە قسە ئەکات یان حەق ئەڵێت یان وسکت ئەبێت، هەروەها دوعا ئەتوانێت پەنای بۆ بەریت بە شێوەیەك لەکاتی تەنگانا ئەو عەمەلە صالحانەی کە تۆ کردووتە پەنای بۆ بەری لە (ریاض الصالحین)دا فەرموودەیەکی صەحیح هەیە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە ریوایەت کراوە. رەزای خوای لەسەر بێ، ئەڵێ پێغەمبەری خوا (د.خ) بۆی گێڕاینەوە و فەرمووی لە ئوممەتێکی پێش ئێمە سێ ئیماندار لە سەفەرێکدا بوون، چونە ئەشکەوتێکەوە (لام وایە لەبەر باران) پاش ماوەیەك بەردێکی گەورە خزا و بەردەمی ئەشکەوتەکەی لێ گرتن، هەموو هۆکارێکی پەیوەستیان لێ پچڕا بەردەکەش بەردێکی چەند تەنییە ئەمانیش تەنها سێ کەسن، عالەمی ئەسباب ئەمانیش ئیماندار بوون وتیان بیر کەینەوە هەرکەسە بیر بکاتەوە لە کردارێکی چاکی خۆی کە خالصەن بۆ خوای کردبێ و بەو وکردارە چاکە دوعا بکات، بەشکو خوای گەورە دەروی رەحمەتیمان بۆ بکاتەوە و ئەم بەردەیان بۆ لاببات.

یەکەمیان: هەستا و دەستی هەڵبڕی و وتی خوایە گیان، یا أرحم الراحمین تۆ ئەزانی کە من شوان بووم و چەند ساڵ لە لەوەرگا ئەهاتمەوە، ئاژەڵەکانم ئەهێنایەوە، بە پەلە ئەمدۆشین یەکەمجار شیرم ئەدا بە دایك و باوکم، کە ئەوان تێریان لە شیر ئەخوارد، ئینجا بەشی منداڵ و خێزانی خۆمم ئەدا، خوایە تۆ ئاگاداریت کە جارێکیان دوورکەوتمەوە بۆ لەوەرگایەکی دوور شەوم بەسەردا هات و درەنگ گەیشتمەوە ماڵێ و هەتا شیرەکەم دۆشی دایك و باوکم خەویان لێ کەوت، خوایە تۆ ئاگاداریت کە من قاپە شیرەکەم بە دەستەوەبوو منداڵان ئەگریان لەبەر پێما منیش بەشم نەدان وتم وەڵلاهی نایخۆنەوە تا باوك و دایکم لێی نەخۆنەوە، بەرەبەیان بەخەبەر بوونەوە بەشی هەردووکیانم داو تێریان خوارد، پاشان بەشی

منداڵەکانم دا خوایە بۆ خاتری ئەم کردەوە چاکە کە لەبەر خاتری تۆ کردوومە ڕەحممان پێ بکەی! بەردەکە مەسافەیەك جوولاً بە شێوەیەك روناکییەکیان بۆ هاتە ژووری، بەلاّم نەیاندەتوانی بچنە دەرەوە..

دووەمیان: دەستی هەڵبڕی و دووعای کرد و وتی خوایەگیان کچێکی ئامۆزام هەبوو زۆرم حەز لێ ئەکرد، زۆرم خۆش ئەویست، کەڕەتێك داوای خراپەم لێکرد، بەلاّم خۆی نەدا بە دەستەوە پاش ماوەیەك تووشی گرانیەك بوون و هەژاری رووی تێکردن بەناچاری هات بۆلام داوای پارەی لێکردم، منیش سەد و بیست دیناری ئاڵتونم پێ دا، بە مەرجێك فاحیشەی لەگەڵدا بکەم!! رازی بوو و پارەکەم دایە، وەختێ کە چوومە لایەوە و لە بەینی قاچیا دانیشتم وتی لەخوا بترسە، ئەو مۆرە مەشکێنە، ئیلا بە حەقی خۆی نەبێت، خوایە خۆت ئەزانی چەند حەزم لێ ئەکرد ئەو خراپەیە ئەنجام بدەم بەلاّم لەبەر خاتری تۆ هەستام و نەمکرد، خوایە لەبەر خاتری ئەو کردارە ڕەحممان پێ بکەی، بەردەکە مەسافەیەکی تر جوولایەوە، بەلاّم بە شێوازێ بوو کە ئادەمیزاد نەیدەتوانی بێتە دەرێ.

سێهەمیان: وتی خوایەگیان ئاگاداریت کەمن کرێکارم هەبوو، رۆژێکیان ئیشیان بۆ کردم رۆژانەی هەموویانم دا، بەلاّم یەکێکیان وەری نەگرت، رۆی و پارەکەی لام مایەوە، ئەو پارەیەم تێکەلاّوی پارەی تر نەکرد و ئیشم بۆ پێ کرد، هەر لە مریشك و کەڵەشێر و بزن و مەڕ و ئەمانە بۆم ئەکڕی سبحان الله زۆر بە خێرایی بەرەکەتی تێ کەوت و زیادی ئەکرد و لەگەڵ حەیوانەکانی خۆما جیام کردبوونەوە و شوانی تایبەتیم بۆ گرتبوو، پاش چەند ساڵێك شیوێکی پڕکردەوە، کابرام لێ پەیدا بوو، کرێکارەکە وتی فلاّن ساڵ ئیشم بۆ تۆ کرد و ئێستا ئیحتیاجی پاڵی پێوە ناوم کە کرێی ئەو رۆژەم بەیتێ، وتی کاکە کرێی تۆ ئەم شیوەیە، چی حەیوانی تیا هەیە هەمووی هی تۆیە، وتی کاکە گاڵتەم لەگەڵ مەکە،

وەڵلا گاڵتە ناکەم، ئەو پارەیەی تۆ گلم دایەوە و دام بە حەیوان، ئەمە هەمووی حەلاڵی تۆیە! کاکە کرێکار رانەکەی لێ خوڕی و هەمووی برد و هیچی بەجێ نەهێشت، خوایەگیان ئەمە هەمووی لەبەر خاتری تۆ بوو، بۆ خاتری ئەو کردارە، بۆ خاتری ئەو ئیخلاصیەتە، رەحممان پێ بکەیت، بەردەکە لاچوو هەرسێکیان هاتنە دەرەوە، مەعنای ئەوەیە جائیزە لێرەدا تۆ بپاڕێیتەوە بە عەمەلی صالحی خۆت کە ئیخلاصیەتی تیابێ بۆ خوای گەورە، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (د.خ) دەفەرموێت (ثلاث دعوات لاشك في إجابتها) سێ جۆر دووعا هیچ گومانی تێدا نییە خوای گەورە وڵامیان بداتەوە، (دعوة المظلوم دعوة المسافر و الوالد على ولده).

ئەڵێ سێ دووعایهەمیشە قبوڵە، دووعای ئەو ئینسانەی کە ستەمی لێ کراوە، دووەمیان ئەوکەسەی کە لە سەرەفدایە سەفەرێك لە پێناوی رزقدا بێت، یاخود سەفەرێك لە ترسا سەفەرێك لە پێناوی عیلما سەفەرێکی موباح و شەرعی بێت.. دووعای ئەو موسافیرە قەبووڵە و رەت ناکرێتەوە، چونکە لە غەریبیایە وە (دعوة الوالد على ولده) وە دووعای باوك و فەرزەند، باوك بۆ کوڕی خۆی باوك بۆ کچی خۆی، ئەو دووعایە رەتناکرێتەوە، هەروەها ئەفەرموێت (د.خ) (ثلاث لا ترد دعوتهم الصائم حين يفطر و الامام العادل و دعوة المظلوم) لە فەرموودەیەکی تریشا سێ جۆر کەس هەن کە دووعایان رەت ناکرێتەوە، ئەو کەسەی کە بە رۆژوە لە کاتێکدا کە رۆژووەکەی ئەشکێنێ وە ئەو ئیمامەی کە دادپەروەرە و حوکم ئەکا بە عەدالەت لە بەینی رەعیەتەکەیا و ئەوکەسەی زوڵمی لێ کراوە، لە فەرموودەیەکی تریشدا پێغەمبەری خوا دەفەرموێت (د.خ) ئەوکەسەی کە حەز ئەکات خوای گەورە لە تەنگانەدا فریای کەوێ با لەکاتی خۆشیا زۆر دوعا بکات.

لەکۆتاییدا داوا دەکەین لە خوای گەورە کەصیفاتی ئیماندارمان پێببەخشێت و دڵمان پاك بکاتەوە لە هەموو گوناهێك و رێی راستمان پیشان بدات و ئیمانێکی پاکمان بداتێ و لە هەموو بەڵایەکی دین و دنیا بمانپارێزێ و دوورمان بخاتەوە و وڵاتمان بپارێزێ لە زوڵم و لە فەساد و لە گرانی..

(ربنا أتنا في الدنيا حسنة و في الاخرة حسنة وقنا عذاب النار)..

## باسی یانزەهەم

## هاوسەنگی ئیماندار لە نێوان دونیا و قیامەتدا

هەموو ئەزانین خوای گەورە ئەم پرۆگرامەی کە ناردووە، بۆ جێبەجێ کردنی، یان بەجێهێنانی سێ مەبەستە.

یەکەمیان: ناسینی خوای گەورە بە مرۆڤ.. ناساندنی خوای گەورە بە سیفات و ناوەکانی و کردارەکانی بۆئەوەی مرۆڤەکان ببنە بەندەیەکی راستی خوای گەورە کە بوونە بەندەیەکی راست، ئەبێتە خاوەن ئازادییەکی راستی.

دووهەمیان: ئەو مرۆڤە پەروەردەی خۆی بکات لەژێر تیشکی ئەو ناسینەدا پاشان لە واقیعدا جێبەجێی بکات.

سێهەمیان: ئاوەدانکردنەوەی زەویی و دامەزراندنی شارستانیەت.

ئەم پرۆگرامەی خوای گەورە بۆ خێری دونیا و قیامەت هاتووە.. ئەمە مانایەکی تر ئەگرێتەوە، لە دونیادا هەندێ ئامانجمان هەیە وە لە قیامەتیشدا ئامانجمان هەیە.. بە دیهێنانی ئامانجەکانی دونیا رەوشتی تایبەتی ئەوێ.. ئەم پرۆگرامە بریتییە لە بیر و باوەڕ و عەقیدە.. بریتییە لە کۆمەڵێ رەوشت.. بریتییە لە تەشریع و ئەحکام.. سیستەمێکی تیایە بۆ پەروەردە کردنی ئەم مرۆڤانە، بۆ دروستکردنی ئەو سیفاتە تیایدا و ئەیگەیەنێ بە ئامامجی دونیا و قیامەت.. لەبەرئەوە کرداری چاك، کە سەدان جار لە قورئاندا دووبارە و چەند بارە بووەتەوە، بۆئەوەی لە دونیادا ئیماندار کرداری چاك ئەنجام بدات.. فەرمان بە چاکە و جڵەوگیری لە خراپە، ئەمە بە چ میکانزمێك دێتە دی؟! بە سیفاتێك دێتە دی، کە سیفاتی دونیایی پێ ئەڵێن.. لەهەمان کاتدا ئەو بیر و باوەڕەمان، داکۆکی لەوە ئەکات کە ئیماندار باوەڕی بە قیامەت هەبێت.. بە زیندووبوونەوە و

به دادگایی کردنمان لەلایەن خوای گەورەوە.. چاکە و خراپە لە ئاستی مسقالە زەڕڕەیەکدا ئەکێشرێ و حسابی وردی لەسەر ئەکرێ.

ئەمە عەقیدەیە کە ئەفەرموێ (قل اللهم مالك الملك تؤتي الملك من تشاء وتنزع الملك ممن تشاء وتعز من تشاء وتذل من تشاء بيدك الخير إنك على كل شيء قدير) وامان پەروەردە ئەکات کە ئەو سەروەت و سامانەی کە هەمانە خوای گەورە بۆماوەیەکی کاتی پێی داوین، لەهەمان کاتدا پایە و پلە و وەزیری دەسەڵاتداری و بەڕێوەبەری هەرشوێنێکەوە، هەر پلەوپایەیەکە، بزانین ئەوە لێپرسراویەتییە، ئەگەر بەدادپەروەری نەیبەیتە سەر و بە زوڵم بیبەیتە سەر، روو رەشیە بۆ ئەودونیا، کەواتە دەوڵەمەندی و هەژاری و پایەی بەرز و پایەی نزم و دەسەڵاتداری و بێ دەسەڵاتی.. ئەمانە هەموویان دابەشکردنەکەی لەلایەن خوای گەورەوەیە.

کەواتە بیروباوەڕێك بەم چەشنە مرۆڤ پەروەردە بکات، بەهیچ شێوەیەك لە خۆبایی بوون نایەتە دڵیەوە و هەموو بە ئەرك ئەزانێت، پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ئەفەرموێت: بۆ کاروباری دونیا وەها نەخشە بکێشە، کە هەتا هەتایە ئەمێنێت و بۆ کاروباری قیامەت و وەها نەخشە بکێشە، کە سبەی ئەمریت و ئەمرۆ دوا رۆژی ژینتە..

ئەم هاوسەنگییە ئەبێت هەمیشە جێبەجێی بکەین و لە دڵماندا بێت، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (د.خ) هاتووە ئەفەرموێت: ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە پاداشتەکەی زۆر زیاترە لە نوێژ و رۆژوو و پارە بەخشین لە خێردا، وتیان بەڵێ یا رسول الله.. فەرمووی دوو دۆست، دوو برا، دوو دراوسێ.. ئاشت بکەیتەوە.. ئەی ئایا ئەگەر دوو حزب ئاشتکەیتەوە یان دوو هۆز ئاشت کەیتەوە، ئەبێ پاداشتەکەی چەند بێت.. ئەولایەنانەی کە خۆیان بە رۆشنبیر دائەنێن وە خۆیان بە

پێشکەوتن خواز دائەنێن، لەبەرنامەیاندا شتی وەها نییە؟! چ بیروباوەڕێك جگە لە ئیسلام ئاوەها تەماشای ئیصلاح و تەماشای یەکێتی ریزەکانی میللەت ئەکات؟! ئیسلام بەم چەشنە تەماشای ژیان ئەکات کرداری چاککردنەوەی نێوەندی دوو کەس پاداشتەکەی لەو پەرستشانە زیاترە کە پێشتر تیشکمان خستە سەر.. کەواتە گوناهە بیخەیتە قالبێکەوە دونیای پێ تەرك بکەیت و بڵێیت من خەریکی قیامەت ئەبم.. قیامەت و دونیا یاخود بڵێین لە دونیاوە بۆ قیامەت ئەچین.. چەشنی هۆڵی تاقیکردنەوەیە، هەرگیز شەهادە و بڕوانامە وەرناگرین هەتا نەچینە هۆڵی تاقیکردنەوە.. ئەم هاوسەنگییە چەند جوانە لە نێوان دونیا و قیامەتدا، بۆچی ئایینی ئیسلام هەوڵئەدات بە ئایات و فەرموودە سیفاتی دونیایی و قیامەتی لە موسڵماندا بچێنێت؟ تێدا بێت، بۆچی؟ دیارە لەبەر دوو هۆیە..

یەکەم: بزانین بەهۆی دونیاوە ئێمە ئەگەین بە قیامەت و بەهۆی کرداری دونیاوەیە رووسپی یان خواپەنا بدات روو رەش ئەبین لە قیامەت.

دووەم: بۆ ئەوەی کە پێشەوا بین، بۆ ئەوەیە موسڵمان پێشەوا بێت لەناو گەڕەکی خۆیدا، لەناو قوتابخانەی خۆیدا، لەناو خێزانی خۆیدا و لەناو نیشتمانی خۆیدا، ئەم هاوسەنگییە تەنها لە ئیسلامدا هەیە، کاتێك مرۆڤ ئەچێتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام یان فکرەیەك ئایینی طقوسیە، یان فکرەیەك مادديە، بۆ نموونە لە فکری رۆژئاوادا بۆچی باوەڕ ناکەن بە پێغەمبەرایەتی (محمد) (د.خ) ئەوان وا تێگەیشتوون لە دینەکەیانەوە، کە پێغەمبەر ئەبێ یان فریشتە، یان خواوەند بێت! واتە یان سیفەتی خواوەندی یاخود سیفەتی فریشتەیی تیادا بێت و پێویستیەکانی مرۆڤی فەرامۆش کردبێت، لەبەرئەوە ناچێت بە عەقڵیاندا کە (محمد) (د.خ) مرۆڤ بێت پێغەمبەریش بێت و سەرکردەیەکی سەربازی و سیاسی بێت و سەرۆکی دەوڵەت بێت، ئەمە گەورەترین کۆسپە لەبەردەمیاندا بۆ باوەڕ

هێنان بە دینی ئیسلام و پێغەمبەرایەتی (محمد) (د.خ) خوای گەورە لە قورئاندا ئاماژە بۆ ئەو بیروباوەڕە چەوتە ئەکات (وقالوا لولا انزل عليه ملك) لە ئایەتێکی تردا (وقالوا ما لهذا الرسول يأكل الطعام ويمشي في الأسواق...) واتە ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە شت ئەخوات و ئەچێتە ناو بازار و ئەگەڕێت.. وا تێگەیشتووون لە دینە لادەرەکانی ترەوە، کە پێغەمبەران نابێت مرۆڤ بن و سیفاتی مرۆڤیان تیادا بێت.. قورئان زۆر زۆر جەخت ئەکات لەسەر بەشەرییەتی (محمد) (د.خ) کە قورئان ئەفەرموێ: (قل إنما أنا بشر مثلكم يوحى إلى أنما الهكم إله واحد). واتە پێیان بڵێ ئەی محمد من مرۆڤێکم وەکو ئێوە، ئەمە بەشە مرۆڤیەکەیەتی، کەواتە هیچ ناستەنگێك کە پێغەمبەر مرۆڤ بێت، بەڵام چۆن مرۆڤێك؟! کە خاوەنی سیفاتی (کمال)ی مرۆڤی بێت.

رۆشنبیرانی رۆژئاوا، هەندێکیان قۆناغێکی باشیان بڕی پێشکەوتنیان دابە بیری رۆژئاوا و بیریان کردەوە، کە فریشتە نابێتە پێشەوایەکی چاك بۆ گرۆهی ئادەمی.. چونکە مرۆڤ لاسایی فریشتەکان ناکاتەوە و ئەڵێت ئەوەی بە فریشتە ئەکرێ بە مرۆڤ ناکرێت و ئەو توانایەی کە بە فریشتەیە، من واتە (مرۆڤ) پێی نییە، بەڵام کە پێشەواکەی مرۆڤ بوو، زۆر خاڵی هاوبەش هەیە لە نێوانیاندا هەوڵ ئەدات کە شوێن پێی پێەواکەی هەڵبگرێ و چاوی لێ بکات. لەبەرئەوە باوەڕیارن هێنا بەوەی کە لوتکەی رەوشت بەرزی، و لوتکەی پێشەوایەتی بۆ مرۆڤ، تەنها مرۆڤ خۆیەتی.

لە فەرنسا ئافرەتێکی فەرەنسی زۆر کتێبی ئیسلامی ئەخوێندەوە، بۆیە باوەڕی هێنا بە ئیسلام و موسڵمان بوو، لەبەرئەوە خۆیی و منداڵەکانی دەرکران لەلایەن هاوسەرەکەیەوە.. ئەوکەسانەی کە لە کوردستانەکەی لەمەڕ خۆمان ئەڵێن بۆچی (قوامة) بەدەست پیاوە؟ ئەی لە رۆژئاوا بۆچی بەدەست پیاوە؟ وە لێرە ئەڵێن



هۆی دواکەوتوویمان، ئیسلامەتییە.. ئەی لەویّ بۆچی ئەو ئافرەتانە دەرئـەکرێن؟! خۆ ئیسلامەتی لەویّ فەرمانـدە نییـە و کۆنتڕۆڵی داب و نـەریتی کۆمەڵایـەتییانی نەکردووە! ئەم ئافرەتە زۆر نـەداربوو، وازی لـە دینەکـەی نـەهێنا، وە هـەوڵی داو منداڵەکانی زۆر چاك بەخێو کردن و کوڕەکەی بوویە دکتۆر و بووبە موسڵمانێکی ڕێك و پێك، کەناوی (جۆرج) بوو، کاتێك موسڵمان بـوو، نـاوی خـۆی نـا (محمـد).. پاش پـانزە سـاڵ ڕۆژێـك لـە ڕۆژان باوکیـان دێـت بۆلایـان و دایکیـان پێیـان ئـەڵێت ئەمە باوکتانە.. ئیتر باوەش بە باوکیاندا ئەکەن، بەتایبەت کوڕە دکتۆرەکەی..

دایکیان ئەڵێت منداڵینـە بـا نوێـژێکی سوپاس گوزاری (صلاة الشکر) بکـەین، کـە خـوای گـەورە بـە یـەکتری شـاد کردنـەوە، ئـەڵێ منـیش لەگـەڵتان ئەیکـەم، چونکە ماوەیەکە منیش موسڵمان بـووم.. باوکیـان پـاش موسـڵمان بـوونی، نـاوی خـۆی نـا (عەبدوڵلا).. باشە ئەم خێزانە بۆچی موسڵمان بـوون؟! لـە وەڵامیانـدا هـەموویان ئەیانوت کەسایەتی بەرزی پێغەمبەر (د.خ) وای لە مرۆڤی ڕۆژئاوایی کـردووە، کـە بیربکاتەوە بێگومان ئەمە پێشەوای مرۆڤایەتییە.. مرۆڤێك کـە لـە بورجوازترین بنەماڵە بێت و لە گرنگترین هۆزی عەرەب بێت و هەموو سەرچاوەی ئـابوری ئـەو ناوچـەیە لـەژێر دەسـەڵاتیدا بێـت سـێ ڕۆژ لەسـەر یـەك تێـر نـانی جـۆ نـەخوات. (ماشبع رسول الله من طعام قط ثلاثة ایام متتالیات...) هەموو دەرامـەتی ئـابووری ئـەو سـەردەمەی لـەژێر دەسـتدا بـووە، کەسـی وەهـا هـاتووە، کـە پێغەمبـەری خـوا (د.خ) (١٠٠) حوشـتری داوەتـێ، چـونکە کەسـێکی وەکـو (صـفوان ابـن أمیـة) پێشترهەیبووە و پاشان نەدار کەوتووە، جگە لەمەش لە کۆمەڵدا جێگەیەکی باشی بۆ خۆی مەیسەر کردبوو، بـەڵام حـەزرەتی عائیـشە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) و چـەند خێزانێکی تر ئەیگێڕنەوە کە مـانگ ئـەهات و مـانگ ئەڕۆیـشت دوو مـانگ لەسـەر یـەك ئـاگر نەکراوەتـەوە لـەماڵی پێغەمبـەری خـوادا (د.خ) (عـوره ابـن زوبـیر) کـە

ئەبێتە خوشکەزای حەزرەتی عائیشە، ئەفەرموێت بە عائیشە: ئەی بەچی دەژیان پورێ؟! لە وەڵامدا حەزرەتی عائیشە ئەفەرموێت (خورما و ئاو) واتە بە دوومانگ لە ماڵی حەزرەتدا تەنها خورما و ئاو هەبووە.

ئەمەیە پێشەوا چۆن سەرنجی رۆژئاواییەکان راناکێشێت؟! لەملاوە، سەرکردەیەکی سەربازییە و لەولاوە سەرکردەیەکی سیاسیە، لەملاوە دادگەرە، شەوانیش ئەوەندە بەرامبەر خوای گەورە ئەوەستێت پێیە پیرۆزەکانی ئەئاوسێن! جاری وەها بووە ئایەتێکی هەتاوەکو بەیانی خوێندۆتەوە.. بەراستی ئەمەیە هاوسەنگی لە نێوان پێغەمبەرایەتی و بەشەریەتدا!!! جاری وەها هەبووە ریشی پیرۆزی لە فرمێسکەکانی تەڕبوون و پاشان تکاونەتە سەر زەوییەکە و، زەوییەکەشی تەڕکردووە.. خۆی وتەنی (ئەی نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزار بم...) سیفەتی لەگەڵ بەرامبەردا هاوسەنگ بووە.. بە راکردن رایکردووە بەدوای حەزرەتی (حسن) لەبەرچاوی ئەم هەموو هاوەڵانە و باوەشی پیا کردووە و لەگەڵ خۆیدا، بردوویەتی بۆ میوانداری.. هەندێ منداڵ هەبوون، کە چۆلەکەیان هەبووە، پاش ماوەیەك منداڵەکەی بینیوەتەوە و هەواڵی چۆلەکەکەی لێ پرسیوە!... لەکاتی سوجدەدا حەزرەتی (حسن) چووەتە سەر پشتی، نەجووڵاوەتەوە تاوەکو (حسن) تاقەتی چووە هەستاوە و رۆشتووە، ئەم سیفاتانە هەمووی سیفەتی (کمال)ی بەشەرییە لەهەمان کاتدا پێغەمبەریش بووە (د.خ).

هەندێ سیفاتی تری تایبەت بەخۆی تیا بووە، کە بەشێکی نهێنییە و ئێمە نایزانین، بەتایبەت پاش (معراج) واتە بەرزبوونەوە کە خاوەن هەستێکی زۆر ورد بووە.. بەراستی شیاوی ئەوەیە کە ببێتە پێشەوای جیهانیان.. خوای گەورە ئەفەرموێت (وماأرسلناك إلا رحمة للعالمين) خوای گەورە کردوویەتی بە پێشەوامان.. (لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة...).








ئێمە ئەبێت چاو لەو پێغەمبەرە بکەین (د.خ) و دونیامان بیرنەچێ و توێشووی قیامەتیمان پێ بێت.. (وابتغ فيما اتاك الله الدار ألآخرة ولا تنس نصيبك من الدنيا و أحسن كما أحسن ألله اليك ولاتبغ الفساد في ألأرض...) ئامانجمان ئاخیرەت بێ. بەلأم نابێت دونیامان بیر بچێت و ئەرکی سەر شانمان لەیاد بچێ.

فەرموودەیکی درێژ هەیە کە ئەبو هالە ئەیگێڕێتەوە و وەسفی پێغەمبەر (د.خ) ئەکات و ئەفەرموێت هەمیشە خەفەتبار بوو، بیری ئەکردەوە لەم میللەتە و بیری ئەکردەوە لە ئوممەتەکەی... وە زۆربەی جاریش بێ دەنگ ئەبوو وە هەموو سەیر کردنێکی عیبرەت بووە.

ئەبو هالە کوڕی حەزرەتی خەدیجەیە.. خەدیجە کاتێك شووی کرد بە پێغەمبەر (د.خ) ئەم ئەبو هالەیە کوڕی هاوسەری یەکەمی خەدیجە بوو.

یەکێك لە بەردەمیدا شڵەژا لە هەیبەتی پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی هێواش.. هێواش.. من پادشا و مەلیك نیم.. مەشڵەژێ من کوڕی ئافرەتێکم لە قوڕەیش کە گۆشتی وشکی ئەخوارد.. منیش مرۆڤم وەك تۆ، لە فەرموودەیەکی تریدا، منیش وەکو هەموو ئەم بەندانەی خوای گەورە، ئەوان چۆن نان ئەخۆن.. منیش ئاوەها نان ئەخۆم.. ئەوان چۆن دائەنیشن.. منیش ئاوەها دائەنیشم.. ئەیهێشتووە خەڵك لەبەری هەستێ! چۆن نابێت بە پێشەوا؟!! پێغەمبەرە و فەخری عالەمە، ئەیهێشتووە خەڵك لەبەری هەستن.. چۆن نابێت بە پێشەوا؟!! فەرموویەتی هەرگیز بە باشترم نەکەن بەسەر موسا و بەسەر عیسادا.

سیفاتی قیامەتی، لە هەمووی گرنگتر خۆشەویستیە.. سیفەتێکی هێندە گرنگە کە داواکراوە لێمان و مەرجە تیاماندا بێت کە پێوەرەکەی خۆشەویستی پێغەمبەرە (د.خ) (قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله...) خۆشەویستی خوای گەورە، خۆشەویستی پێغەمبەر (د.خ) ئەبێت لە ئاستێکدا بێت، لە خۆشەویستی خۆمان

بۆ خودی خۆمان... لە خۆشەویستی خۆمان بۆ جگەر گۆشەکانمان و کەسوکارمان (لایؤمن أحدکم حتی أکون أحب الیه من والد و ولده و الناس أجمعین).. واتە هیچ یەکێك لە ئێمە نابێتە خاوەن ئیمانێکی تەواو و راستەقینە، هەتا وەکو پێغەمبەری خۆش نەوێت لە خودی خۆیی و کەسوکار و لە هەموو دنیا زیاتر..

لە شەڕی ئوحوددا، لەو کۆمەڵە موسڵمانانەی کە شەهید بوون، یەکێکیان ناوی (عمر) بوو، (عمر ابن معاذ).. جەنگەکە تەواو کۆتایی پێهات، بریندارایان هەڵئەگرت و شەهیدیان هەڵئەگرت و، پێغەمبەری خوا (د.خ) بەسەر وڵاغەکەیەوە بوو، کە (سعد ابن معاذ) جڵەوەکەی بۆ رائەکێشا، برای ئەو (عمره)ی کە شەهید بووە.. ئەڕوات و ماندوو، لەوێوە دایکی سەعد رائەکات بەرەو پێغەمبەر (د.خ) ئەم دایکە میهرەبانە زانیویەتی کە یەکێك لە کوڕەکانی شەهید بووە.. سەعد کە سەیری دایکی ئەکات، ئەڵێت ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە دایکمە.. پێغەمبەریش روو ئەکاتە ئەو دایکە و سەرەخۆشی لێ ئەکات کە کوڕەکەی شەهید بووە، ئەڵێت (یارسول الله) من هاتووم بۆئەوەی بزانم کە تۆ سەلامەتیت، یان نا؟! ئەوە گرنگە.. بەراستی ئەوە ئەو خۆشەویستییەیە کە ئایین داوام لێ ئەکات و ئەوەیە سیفەتی ئاخیرەت! ئەمە لە قیامەتدا فریامان ئەکەوێت.

یەکێك لە قوتابیانی پێغەمبەر (د.خ) ناوی (ثوبان) بوو.. ئەم هاوەڵە بەڕێزە ماوەیەك تێکچوو.. زەرد هەڵگەڕا.. پاشان پێغەمبەری خوا (د.خ) لێی پرسی ثوبان ئەوە چیتە؟ ئەویش فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا والله نەخۆش نیم.. ئازارم نییە.. بەلأم من تۆم خۆش ئەوێت یارسول الله، ناتوانم لێت دوور کەومەوە.. سبەی تۆ ئەچیتە بەهەشت و ئەچیتە (علیین) لەگەڵ پێغەمبەراندا، من ئەگەر بچمە بەهەشت، ئەچمە بەهەشتێکی نزمو ناتبینم.. وە ئەگەر بشچمە دۆزەخ، ئەوە هەرگیز ناتبینم.. خەفەتی ئەوە ئەخۆم و ئەوەیە منی رەنگ زەرد کردووە..

پێغەمبــەری خــوا (د.خ) خۆشەویــستییەکەی کــەمتر نــەبوو بــۆ (ثوبــان) لــە خۆشەویستی (ثوبان) بۆ ئەوە.. ئەو پێغەمبەرەی (د.خ) کە ئەفەرموێت ئەگەر لە درکیش کەمتر بچێت بە جەستەی موڵسمانێکدا، من هەست بە ئازارەکەی ئەکەم، بۆیە خەمی خوارد بۆ ئەو قسەیەی (ثوبان) هەتاوەکو خوای گەورە ئایەتێکی نارد (ومن يطع الله والرسول فأولئك مع الذين أنعم الله عليهم من النبيين و الصديقين و الشهداء و الصالحين و حسن أولئك رفيقا) واتە ئەوەی بە گوێی خوا و پێغەمبەری خوا بکات، ئەوا لەگەڵیدایەتی لە بەهەشتدا و لەگەڵ پێغەمبەراندا و راستگۆیان و پیاو چاکان و شەهیدەکاندا...

ئەو پێغەمبەرە (د.خ) ئێمەی بیرنەچوو لە میوانداری (میعراج)دا.. کاتێك خوای گەورە ئاشتی خۆی باراند بەسەریدا و پێی فەرموو (السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته....) بەو هەڵوێستە پیرۆزەدا کە لەگەڵ خوای گەورەدا گفتوگۆی کرد.. فەرمووی ئاشتیەکەم وەرگرت و بەشێکیم لێ دا بە ئوممەتەکەم.. هەرگیز ئێمەی بیرناچێتەوە.. ئەو پێغەمبەرەی (د.خ)، هەمووومان لە گۆڕدا پرسیارمان لێ ئەکرێت لەسەر ئەو.. خواوەندت کێیە؟ دینەکەت چییە؟ پێغەمبەرەکەت کێیە؟ رات چی بوو بەرامبەر (محمد)، ئەو پرسیارانەمان لێ ئەکرێت.. ئەو زاتە پیرۆزە یەکەمین کەسە کە زیندوو ئەبێتەوە.. پلەی تکاکردنی هەرە گەورەی پێ بەخشراوە.. لە مەحشەردا کە ئیتر خەڵك هەموی نارەحەت ئەبن، وە هیچ پێغەمبەرێك رووی ئەوەی نییە کا داوا بکات لە خوای گەورە، حەزرەتی (محمد) (د.خ) سوجدە ئەبات، ئیتر قیامەت دەست پێ ئەکات.. میزان دائەنرێت.. نامەی کردەوەکان دابەش ئەکرێن.. لەم کاتانەدا، خوای گەورە بەوزاتە پیرۆزە ئەفەرموێت.. سەرت بەرزکەرەوە تکا بۆ کێ ئەکەیت بیکە.. پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێت: تکا و شەفاعەتم دوا خستووە و هەڵگرتووە بۆ ئەهلی معصیەت

لە ئوممەتەکەم.. ئەوانەی کۆچی دوایی ئەکەن و فریای (تەوبە) نەکەوتوون، بەڵام لە ئەهلی قیبلەن.. تاوانبارن و گوناهبارن، بەڵام ئیمانداران.. ئەم نازدارە (د.خ) واستە و حەڵاڵی ئیسلامییان بە حەڵاڵ و.. حەرامی ئیسلامییان بە حەرام داناوە و بیروباوەڕی ئیسلامییان وەرگرتووە، بەڵام جێبەجێییان نەکردووە..

## باسی دوانزەهەم

## پێوەرەکانی ژیار و شارستانیەت

ڕۆژئاواییەکان و گەلانی سەر زەمین، وڵاتانی جیهانیان کردووە بەسێ بەشەوە، واتە کردوونیان بە سێ جیهان، جیهانی یەکەم: کە برتییە لە حەوت دەوڵەت.. جیهانی دووەم کە (٧٧) دەوڵەتن.. جیهانی ژمارە سێ دەوڵەتانی ترن.. وئێمەیان خستووەتە کۆتاییەوە، ئەگەر جیهانیان بکردایە بە (١٠٠) بەشەوە ئێمە سەدهەمین بەش ئەبووین، ئەو وڵاتانە لەسەر بنەمای ئابووری دابەشکراون.. لەوەندە دۆلار ساڵانە، کەمتر بەر خەڵکی بکەوێت، ئەوە ئەچێتە فلاّن پۆلەوە، و ئەگەر لەمەندە کەمتری هەبوو ئەچێتە فیسار پۆلەوە.. واتە هێڵێك هەیە کە پێی ئەوترێت هێڵی هەژاری (poverty Line).

ئێمەیان خستووەتە ئەم هێڵەوە و بێگومان بەو شێوەشین! ئێمە گەلێکین ڕێز لەکات ناگرین.. ڕێز لە یاسا ناگرین.. ڕێز لە بۆچوونێك ناگرین، کە دژ بە بیر و باوەڕ و بۆچوونی ئێمە بێت.. ئاستی خوێندەواریمان زۆر نزمە.. هۆشیاریمان زۆر کەمە.. نەخۆشیمان زۆرە.. لەبەرئەمانە ئێمە خراوینەتە جیهانی سێهەمەوە.. کاتێکیش لاپەڕەکانی مێژوو هەڵئەدەینەوە، ئەو رابردووە جوانەی شارستانی ئیسلامی ئەبینین.. ئەو شارستانییەی کە بەشایەتی زانایانی خاوەن ویژدانەکان و ڕۆژئاواییەکان دانی پیادا ئەنێن کە شارستانی ئیسلامی زۆر بەرز بووە.

هەندێ پێوەر هەیە کە شارستانی پێ ئەوترێت، یەکێك لەوانە عیلمە.. بزانن لە مێژووی ئیسلامدا شوێنی زانست و زانایان چۆن بووە؟! نەك تەنها زانایانی شەریعەت، بەڵکو هەموو زاناکان و لە هەموو بوارێکدا.. لەکاتی ئیسلامدا بوو کە

چێوەی زەوییان دۆزییەوە و سەلماندیان کە زەوی خڕە و لەوکاتەدا کە لەدوای ئیسلام لە ئەوروپادا گالیلۆ وتی زەوی خڕە، لە سێدارەیان دا.. ئێمە کێشەی وامان نەبووە لەناو ئیسلامدا، رۆژێك لە رۆژان هیچ کێشەیەك رووی نەداوە لە نێوان زانست و شەریعەتدا، ئەوە کێشەی رۆژئاواییەکانە هەر لە ئیسلامدا بوو کە سوڕی خوێن دۆزرایەوە، بەهەمان شێوە لە بوارەکانی فیزیا و دەرمانەوانی و پزیشکی و کیمیاوی و ئەم بوارانەدا.. هەتا هەندێ کتێب هەیە ئەگەر بیخوێنیتەوە، کە شارەوانی لە کاتی عەبباسییەکاندا چۆن بووە. مەرجەکانی نانەوا چۆن بووە! ئێستاش ئەو مەرجانە نەهاتووەتە دی لێرە.. ئەبێ قۆڵەکانی توکی پێوە نەبێت و کڵاوی لەسەردا بێت و ئەبێ سەقفی نانەواخانەکە ئەوەندی مەتر بەرزبێت، بۆئەوەی دووکەڵەکە نەگەڕێتەوە بۆی! هەروەها نینۆکەکانی کرابێت و لەم جۆرە پاك و خاوێنییانە کە سەدان ساڵ لەمەوپێش ئەمە یاسا بووە!

بەهەمان شێوە بۆ یاسای ناوبازاڕ و پاك و خاوێنی ناوبازاڕ و چۆڕاوگەی ماڵان نابێت بچێتە سەر ماڵێکی تر و بچێتە سەر شەقامەکان، و یاسای چێشت خانەکان کە نابێت دوو جۆر خواردن بەیەك رۆن سور بکرێتەوە!

لە پێوەرەکانی تر، پێوەری جوگرافیمان هەیە، کە دەوڵەتی ئیسلام زۆربەی جیهانی کۆنی گرتبووەوە، لە چینەوە هەتا ناوەڕاستی فەرەنسا، شاری (بوغدو) سنوور بووە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی و (١٠٠) کم لە شاری پاریسەوە دوور بووە.

لە پێوەری دیموگرافیا، ئەم هەموو میللەتە هەمە چەشنە، کە زمان و دابوونەریت و فۆلکلۆری جیاوازە هەموویان لەژێر ئاڵای ئیسلامدا کۆ بووبوونەوە، رۆژێك لە رۆژان نەمانبیست و نەمان خوێندەوە میللەتێك لە دژی حوکمی ئیسلامیدا راپەڕێت! و هیچ کەس و هیچ میللەتێکیش نەتواوەتەوە، هەموویان پارێزگاری

زمانی خۆیان کردووە و ماون، ئەدەب و کولتوری شارستانییەتییان ماوە، ئیسلام ئەمانە ناتوێنێتەوە.

لە پێوەری هێزی سەربازیدا، ئاشکرایە هێزی سەربازی ئیسلام چۆن بووە.. هەروەها پێوەری بەڕێوەبردن، ئەمین و ئومانی میللەت، ئەم هەمو بازرگانییە بە رۆژهەلآت و رۆژئاوادا رۆشتووە هەموو رێگەکان پۆلیس کۆنترۆڵی کردووە.. سەدان ساڵ رێگەیەك هەبووە لە عێراقەوە رۆیشتووە بۆ چین، بەناو ئێران و ئەفغانستاندا رۆیشتووە، پێیان ئەوت رێگەی ئاوریشم کە ئێستاش ئەو رێگەیە هەیە، بۆ حەج هەمووی خاڵ دانراوە، خاڵی پاسەوانی، ئاویان ئامادەکردووە بۆ حاجییەکان و سێبەریان بۆ ئامادە کردوون، هەروەها پاسەوانی بۆئەوەی کە حاجییەکان بەوێدا رۆیشتن، لەو شوێنانەدا پشوو بدەن.. ئێستاش شوێنەواری ئەو بیرانە ماوون کە لە زەمانی خاتوو زوبێدەی خێزانی هاروونە رەشید لێدراون بۆ خزمەتی حاجییەکان..

لە پێوەری کۆمەلآیەتیدا، شار نەبووە نەخۆشخانەی نەبێت.. بزاوتنی زانستی لە سەردەمی خەلیفە (مأمون) چی دەوروبەر هەیە لە قەومەکانی هند و شارستانییەتی هند ی و فارسی و رۆمان، هەموو جۆرە زانستێکی ئەوان وەرئەگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبی و ئاڵتونیان دائەنا بەرامبەر هەموو کتێبێك، ئیتر هەر جۆرە زانستێك بێت، ئاڵتونەکەیان داوە بەو کابرای ترجمانە و تەنها ترجمەی بکات، لە فکری بێگانە نەترساون، هەموو جۆرە فەلسەفەیەکیان وەرگت، دوای ئەوەی رەدیان کردەوە، چونکە خۆیان ئەزانن چییان پێیە.. ئیسلام هەرگیز لە فکرێکی بێگانە نەترساوە، ئەمەش پێوەرێکی شارستانی زۆر گەورەیە.. کە بەرامبەرەکەت و دراوسێکەت بخوێنیتەوە، ئابلۆقە نەخەیتە سەر بیروباوەڕەکەی، ئەی نابێت بزانیت چی پێیە؟! لەبەرهەم هێناندا، هەر تەنها عێراق (٣٠) ملیۆن

کەس بووە ئەوکاتە.. عێراق کێشەیەکی هەیە، ئەویش کێشەی (خوێ)، کە زەوییەکە خوێیاوییە کە پێی ئەوترێ (تملح) (ملوحە).. ساڵانە (٥٠) هەزار دۆنم زەوی لە عێراقدا خراپ ئەبێت.

نەخشەی وەزارەتی کشتوکاڵی عێراقی وابووە، ساڵانە (١٠٠) هەزار دۆنم چاك بکەن (٥٠) هەزاری بەرامبەر بەو زیانەی کە دروست ئەبێ و (٥٠) هەزاریی بۆ گەشەپێدان (تنمیە).. زۆر بەشگە (شبکە) لە ساڵەکانی حەفتاکاندا، یەکێك لەو شەریکانە.. شەریکەیەکی ئیتاڵی بوو مقاوەلەکەی (١٦٠) کم بوو لە ناوچەی کووت، کە (حفارە)کان کاریان ئەکرد (مەبزەل) لێبدەن، مەبزەل ی عەباسییەکانیان ئەدۆزییەوە کە عەباسییەکان ئەو سەردەمە نە (حەفارە)یان هەبوو نە ترەنچەریان هەبووە، بەڵام ئەو راستیەمان زانیوە و لەبەرئەوە مەبزەلەیان بۆ داناوە.

لە پێوەری کاتدا، (٥٠٠ - ٥٠٠) ساڵ بیرو باوەڕێك فەرمانڕەوای چەندین گەل بکات، مانای ئەوەیە کە شایستەی ئەوەیە، خەڵك شوێنی بکەوێت.. مانای ئەوەیە ئیسلام بە کودەتایەکی سەربازی نەهاتووەتە سەر حوکم.. وەك ئەزانین، کەمرۆڤ خوای گەورە وەهای دروست کردووە کە ئازاد بێت و قبوڵی زوڵم نەکات.. لەوانەیە ماوەی چەند ساڵێکی کەم دان بەخۆیدا بگرێت، بەڵام لە دوایی ئەتەقێتەوە دژی ستەمکار. وە ئەگەر پاش چەند ساڵێکی کەم نەبێت، ئەوا هەر ئەبێت وەچەی دووەم هەر ئەبێ دژی زاڵم بوەستێت.. وەك بەچاوی خۆمان ئەیبینین لە جیهاندا.. ئەی بۆچی میللەتێك رانەپەڕی دژی حوکمی ئیسلامی لە کاتی (٥٥٠) ساڵی فەرمانڕەوایی عەباسییەکاندا؟! یان لە (٨١٩) ساڵی ئەمەوییەکاندا لە ئەندەلوس، (٨١٩) ساڵ حوکمی ئیسلامی لە ئیسپانیا و پورتوگال بووە، خەڵکی لە دژی رانەپەڕیوە.. ئەمە مانای وەهایە، کە بەزەبری هێز فەرمانڕەواییان

نەگرتوومتە دەست، ئەگەر وابوایە، چۆن ئەمڕۆ دەوڵەتێکی وەك (ئیندۆنیسیا) کە ڕۆژێك لە ڕۆژان سوپایەکی ئیسلامیی یان سەربازێکی ئیسلامی نەگەیشتوومتە (ئیندۆنیسیا) (١٩٥) ملیۆن موسڵمانی تیا هەن، کە گەورەترین دەوڵەتی ئیسلامییە! لەبەرئەوە بە هەموو پێوەرێکی زانستی ئیسلام واقعی ترین شارستانییەتی هەبووە.. باشە ئەی بۆچی وامان لێهاتووە، ئەمڕۆ کە کەوتووینەتە جیهانی سێهەمەوە؟! و بەچاوێکی سوك بۆمان ئەڕوانرێت؟! وەڵامی ئەم پرسیاری پێغەمبەر خوا (د.خ) ئەماندااتەوە لە فەرموودەیەکی صەحیحدا و ئەفەرموێت: واتان لێدێت هێرش ئەبرێتە سەرتان لەلایەن دوژمنانەوە پارچە پارچەتان ئەکەن، چۆن ئاژەڵی درندە هێرش ئەباتە سەر پارچە گۆشتێك و ئەو پارچە گۆشتە لەت و پەت ئەکات، ئێوەش نیشتمان و گەلانی موسڵمان پارچە پارچە ئەکرێ لەلایەن دوژمنانەوە.. یەکێکیش ئەفەرموێ: نەخێر زۆرن وە گەلآی دار وەهان وەك پووش و پەلآش وەهان بەلآم پووش و پەلآش ڕۆڵی نییە، چونکە ناو ئەیبات.. هەیبەت و ترس لە دڵی دوژمناندا نامێنێت بەرامبەر ئێوە.. لاوازی دێتە دڵتانەوە.. یەکێك ئەفەرموێ ئەی پێغەمبەری خوا لاوازی چییە؟ ئەفەرموێ خۆشەویستی دونیا و، ڕق لێبوونەوەی مردن..

خۆشترین و ڕێك و پێکترین ماوە ئەو ساتانە بوو کە پێغەمبەر (د.خ) لە ژیاندا بووە (خير القرون قرني ثم الذين يلونهم ثمالذين يلونهم). . (كنتم خيرأمة أخرجت لناس) بۆ ئەوان دابەزی، نەوەك بۆ ئێمە، چونکە ئەوان فەرمانیان ئەکرد بە چاکە و جڵەوگیرییان ئەکرد لە خراپە.. دە ئێمە ئەوەمان واز لێهێناو.. خوای گەورە ئەوانی گەیاندە جێگەیەك کە هیچ میللەتێك نەگەیشتوومتە ئەو جێگەیە.. جێگە و پلەی مامۆستایەتی مرۆڤایەتی (لتكونوا شهداء على الناس ويكون الرسول عليكم شهيدا).

وشەی (شهداء) واتە مامۆستا، ببنە مامۆستای مرۆڤایەتی،، هەموو شارستانیەتیەك لەسەر دوو بناغە چەسپاوە:

١- ئەبێت هەندێك بەهای فکری هەبێت.

٢- هەندێ بەهای رەوشتی. . لەسەر ئەوە شارستانییەت ئەچەسپێت.

کاتێك ئەڕوانینە ئەو جیلە، کە پێی ئەوترێ جیلی کامەران.. ئەو بنەما فکری و رەوشتییە لە شێوەی عیشقی ئاخیرەت و عیشقی خواو عیشقی پێغەمبەردا (د.خ) درەوشاوەتە، ئەو سوپایەی کە (٣٢) هەزار موسڵمانی بوو لە شەڕی قادسیەدا.. وەفدەکە چاوپێکەوتنێکی کرد لەگەڵ وەزیری بەرگری ساسانییەکان، کەناوی (رۆستەم)بوو.. (رۆستەم) وتی: ئێمە دەوڵەتێکی گەورەین و ئێوە پێ پەتین و ئێمە (١٠٠) هەزارین و ئێوە (٣٢) هەزارن و چەندین بەراورد کردن و لەم چەشنانە، و ئێوە شەڕی (جبهه)تان نەبینیوە و لە برسێتیدا هاتوون و چەکی وەهاتان نییە و شمشێرەکەتان هیچ نابڕێت و خواردنتان ئەدەینێ و بگەڕێنەوە..

(ربعی کوڕی عامر) وەڵامی دایەوە و بە شان و باڵی سوپاکەیاندا هەڵی نەدا، بەڵکو وتی: من کۆمەڵێکم لەگەڵ خۆمدا هێناوە ئێوە چەند دونیاتان خۆش ئەوێ، ئەوان هێندە مردنیان خۆش ئەوێ! ئیتر (رۆستەم) قسەی بۆ نەکراو وتی: دۆڕاندمان و لە راستیشدا دۆڕاندیان.. هەر هاوەڵێکی پێغەمبەر (د.خ) بگریت، بزانە مێژووی چۆنە؟! ئەبینیت هەموو ژیانی بریتییە لە خۆشەویستی، (أم عمارە) ئافرەتێك بوو کەناوی (نسیبەی کچی کەعبی مازنی ئەنصاری)یە ئەمە لەشەڕدا وازی لە ناو و شت هێنا، ئاوی ئەدا بە بریندارەکان و تینووەکان کە موسڵمانەکان شکان (لە ئوحود)دا رایکرد بەرگری ئەکرد لە پێغەمبەری خوا (د.خ) کە خەنجەرێکی بوو لەگەڵ کۆمەڵە پەرۆیەك بۆ بریندارەکان، ئەوەی بیرچووە کە کوڕەکەی لەوێدا شەڕ ئەکات، هەتا بەگوێی خۆی گوێی لێبوو پێغەمبەر (د.خ) هاوار ئەکات،

برینەكەت ببەستەرەوە، بە كوڕی ئەم ئافرەتە ئەڵێت، كاتێك وا برینداره و له بەردەمیدا كەوتووە و خوێنی لێ دەڕواوات، پاشان دایكەكە هۆشی هاتەوە بەر خۆی، كە ئەوە كوڕكەیەتی لە خۆشەویستی پێغەمبەر (د.خ) كوڕی خۆی بیر چووبووەوە.. رایكرد و برینەكەی بۆ پێچایەوە و بە كوڕەكەی ئەڵێت كوڕم هەستەرەوە دەست بكەرەوە بە شەڕ كردن، كاتی پاڵكەوتن نییە..! ئەمە عیشقی ئاخیرەتە..

(عوبەیدەی كوڕی حارس) لە شەڕی (بەدر)دا، وەك ئەزانن سێ كەس لە قوڕەیش كە سەركردەیان بوون، هاتن وە داوایان كرد كە سێ كەسیش بەرامبەریان بووەستێ؟ پێغەمبەری خوا (د.خ) مامی خۆیی و دوو ئامۆزای هەڵبژارد كە (حمزە)ی مامی و (أبو عوبەیدەی حارس) ی ئامۆزایی و (عەلی كوڕی ئەبی تاڵب)ی ئامۆزای.. ئەبو عوبەیدە قاچی بڕایەوە، هەرچەندە بەرامبەرەكەی كوشت.. هەڵیان گرت و هێنایانە بەردەم پێغەمبەری خوا (د.خ) چی پێوت: با ئێمە بیر بكەینەوە كە خوێنی لێ ئەڕوات و قاچی لێ بوومتەوە.. فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا من شەهیدم؟ بەڕاستی ئەومیە مەراق و خۆشەویستی ئاخیرەت، كە بەراستی ئەوە شارستانییەتە! بۆیە پێغەمبەر (د.خ) پێی فەرموو (إني أشهد إنك لشهيد) گەر زمانی عەربی شارەزابین ئەزانین ئەم رستەیە چەند تەوكیدی تیایە..

(سەعدی كوڕی رەبیع) كابرایەكی دەوڵەمەندە لە مەدینە، ئەم پیاوە دەسەڵاتدار و دەوڵەمەند بوو، لە بەڵێنی عەقەبەدا یەكێك بوو لەو پیاوانە كە پەیمانیان دا بە پێغەمبەر (د.خ) گەر هاتوو تەشریفت هێنا بۆ مەدینە، چۆن بەرگری لە دایك و خێزان و خوشك و كەس و كارمان نەكەین، ئاوهاش بەرگری لەتۆ نەكەین، لەكاتێكدا پەیمانیان پێداوە موسڵمانی تێدا نییە مەدینە و هەرناوی مەدینە نییە،

ناوی (یثرب)ه... له پاش شەڕی (ئوحود)دا کە ئەو ساتە تەواو بووە، پێغەمبەری خوا (د.خ) یەکێك له هاوەڵان بانگ ئەکات کە ناوی (محمد کوڕی مسلمه)یە ئەڵێت: بگەڕێ و بزانە سەعدی کوڕی رەبیع ماوە، یان مردووە.. ئەڕوات بەناو بریندارەکاندا ئەگەڕێت، ئەیدۆزێتەوە و ئەڵێت ئەی سەعد! پێغەمبەری خوا (د.خ) منی ناردووە، تاوەکو بزانم تۆ لەناو مردووەکاندایت، یاخود لەناو زیندووەکاندا، ئەڵێت: لەناو مردووەکاندام، و سەلامم بگەیەنە بە پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەم کابرایە چەند دەقیقەیەکی ماوە لە ژیاندا و ئەملاولاکەی هەمووی شەهید بوون و لە شەڕێکدا بوون، کە موسڵمانەکان دۆڕاوون و (٧٣) شەهیدیان هەبووە و پێغەمبەری خوا (د.خ) لەچەند لایەکەوە بریندار بووە.. سەعد ئەڵێت: سەلامم بگەیەنە پێی و بڵێ: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە و بڵێ سەعد (١٢) برینی پێوەیە و زۆر مەمنوونی تۆیە، پاشان کۆچی دوایی ئەکات.. ئەمە خۆشەویستی ئاخیرەتە! ئەمە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرە (د.خ).

پێغەمبەری خوا (د.خ) لە فەرموودەیەکی صەحیحدا مژدانەیەکمان پێ ئەدات کە زۆر گەورەیە: جارێکیان پێغەمبەر (د.خ) تەشریفی بردە گۆڕستانی (بقیع) لەوێدا فەرمووی خۆزگە براکانی خۆمم ئەبینی.. ئەوهاوەڵە بەڕێز و کەڵە پیاوانەی کە لە شەڕەکاندا کە هەندێکیان کەمئەندام بوون لە پێناوی خواو ئیسلامدا بە ماڵ و سەروە ت و گیان، ئەو کۆچکردوانە کە لە مەککەوە کۆچییان کرد ئیتر مەککەیان نەبینیەوە، فەتحی مەککەیان کرد و گەڕانەوە بۆ مەدینە، کەس نەچووەوە ماڵی خۆی و حەرام بوو لە سەریان، چونکە بەجێیان هێشتووە بۆ خواو، ئیتر نابێ بچنەوە سەری.. ئەمە پەندێکی زۆر گەورەیە کە ئێمە لە کۆچی هاوەڵانەوە وەری نەگرین! شارەکەیان بەدەستی خۆیان رزگار کرد کەچی تیایدا نەمانەوە! یاساغ کرابوو بۆ هەموو هاوەڵێك کە کاتی خۆی شوێن پێغەمبەر (د.خ) کەوتووە بۆ

مەدینە و خۆی خەڵكی مەككەیە، یاساغ و قەدەغەبوو بۆی كە بگەڕێتەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆی و موڵك و سامانی و كەس نەچووەوە ماڵی خۆی! لە زەمانی حەزرەتی عومەردا قەدەغە بوو تەنانەت مەدینەش بەجێ بهێڵن، تەنها بە بە مۆڵەتی فەرمیی نەبێت.. پێغەمبەر (د.خ) بەو بەڕێزانە ئەفەرموێت: ئێوە هاوەڵ و هاوڕێی منن، بەڵكو براكانم ئەوانەن كە باوەڕ بە من ئەهێنن و منیان نەبینیوە! هەموو یەكێكیان پاداشتی (٥٠) پیاوی هەیە.. ئەپرسن پاداشتی (٥٠) پیاوی سەردەمی خۆیان؟! ئەفەرموێت نەخێر (٥٠) لە ئێوە!!!

دەبا ئێمەش قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵبكەین و دونیا سەعاتێكە.. وەك پیاوچاكان دەفەرموون (الدنیا ساعة فاجعلها طاعة) لە خۆمان بایی نەبین بە تەندروستی چاك و لەش ساغی.. ئەمانە نامێنن.. لە خۆمان بایی نەبین بە ژیان، ژیان ماوەیەكی زۆر زۆر كورتە و هەر ئەبێت بگەڕێتەوە بۆ خوای گەورە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بە روویەكی سپییەوە بگەڕێینەوە..

## باسی سێنزەهەم
## رامانێك لە پێغەمبەری مەزن (د.خ)

هەرچەندە من زۆر زۆر بچوکترم لەوەی کە باسی پێغەمبەر بکەم (د.خ)، بەڵام ئەو تۆزە زانیاری و زانستەی کە هەمە حەزئەکەم ئاراستەتانی بکەم..
قورئان بۆمان باس ئەکات کە حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) دوعای کرد بۆ هاتنی ئەو پێغەمبەرە (ربنا وابعث فيهم رسولا منهم) حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) مژدانەی دا بە هاتنی (محمد) پاش ئەو (ومبشرا برسول يأتي من بعدي إسمه احمد...) ئەو دوعایە و ئەو موژدانەیە لە ساڵی (٥٧١)ی زایینی هاتە دی لە یەکەم جومعەی مانگی رەجەب، ئامینەی کچی وەهاب کە دایکی پێغەمبەرە (د.خ) نوورێکی بینی و زانی کە سکی پڕە بە زاتێکی پیرۆز.. عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوتاڵب کە باوکی پێغەمبەرە (د.خ) ئەو مژدانەیەی پێدرا، کە خێزانەکەی دووگیانە، بەڵام دوای ماوەیەکی کەمی نزیکەی یەك مانگی وەفاتی کرد..
پێویستە فکرەیەکمان هەبێت لەسەر بارودۆخی ئەوکاتە.. لە دورگەی عەرەبدا هەموو هۆزەکان چەکداربوون.. هەموو عەرەبێك چەکدار بووە.. و هەمویان زانیویانە چەك بەکار بهێنن، چونکە دوژمنیان هەبووە.. هۆزێك لەگەڵ هۆزێکدا باش نەبووە.. بەهێز هێرشی بردووەتە سەر کەم هێز.. هەموو هۆزێك یاسا و رژێمی تایبەتی خۆی هەبووە، بەڵام هەرهەموویان رێزیان گرتووە لەیەك هۆز کە پێی ئەوترا (قورەیش).

ئەوەش لەبەر خاتری ئەوەی کە لە ناوچەی مەککەن و خزمەتی (بیت) ئەکەن..
شایانی باسە کە عەرەب شانازی ئەکرد بە دینی ئیبراهیمەوە، بەلاّم هیچ پەیوەندییەکی نەمابوو لەگەڵ دینی ئیبراهیمدا.. ئوصولی دینی ئیبراهیم بنەماکانی نەمابوو چ لە بیر و باوەڕ و چ لە پەرستشدا (عبادە).. بەلاّم شانازییان ئەکرد بە پەیوەندی بە حەزرەتی ئیبراهیمەوە، هەرچەندە هەموویان بت پەرست بوون!!
لەو پەرستشانەی کە حەزرەتی ئیبراهیم فەرمانی پێ ئەکرد، هیچی نەمابوو، تەنها بە رووکەش دیاردەی (حەج) مابوو.. کاتێکیش ئەهاتن بۆ حەج و قوربانیان ئەکرد، بۆ بتیان ئەکرد، تەنها بە رووکەش کۆبوونەوەیان لە مەککەی پیرۆز ساڵی جارێك هەبوو.. بوارەکانی تر هەمووی لادان بوو..
دوژمنی عەرەب هەستی بەم جیاوازییانە کرد.. مەملەکەتی حەبەشە، کە نزیکەی (٢٠٠٠) ساڵ حوکمیان کرد، کۆتا مەلیکیان (هیلا سیلاسی) بوو کە لەم سەردەمەدا نەما و ئیمبراتۆریەتەکەیان کوژایەوە و. . لە زەمانی ئەبرەهەدا لە دەریای سور پەڕینەوە بەشێکی زۆر لە وڵاتی یەمەنیان داگیر کرد، کەس نەیتوانی بەرەنگارییان بکات، ئەوەی کە بەرگرییان ئەکرد هەمووی تاکە کەس و کەم کەم بوون، ئەوانیش سوپایەکی یاسایی و دەوڵەتێکی گەورە بوون.. پاشان لەبەرئەوەی کە هەمو عەرەب ساڵی جارێك روو ئەکەنە مەککەی پیرۆز.. ویستی ئەو دیاردەیەش نەمێنێت، بۆیە کەنیسەیەکی گەورەی دروست کرد، کە پارەیەکی زۆری تیادا سەرف کردو توانایەکی زۆری تیادا سەرف کرد و بۆئەوەی سەرنجی عەرەب رابکێشێ و ئیتر لەوێ حەجەکەیان بکەن.. بێگومان مرۆڤی فیطرە و ئازاد وەکو رقی لە داگیرکارە، رقی لە بیروباوەڕی داگیرکاریشە..

ئەگەر چاوێك بخشێنین بە میژووی گەلی کورددا، هەزاران ساڵ دوو دەوڵەتی بەهێز کە بێزەنتی و ساسانییەکان بوون، ئەیاندا بە یەکتردا لەسەر خاکی کورستان.. ئەمیان ئەهات هێرشی بۆ ئەو ئەبرد بەخاکی ئێمەدا ئەهات، ئەویشیان کە هەستی ئەکرد لەم بەهێزترە، بەخاکی ئێمەدا ئەهات و ئەچوو لەوی ئەدا.. گەورەترین بەڵگەیش بۆ نموونەکەمان ئەمەیە، کورد نە دینی ئەمی وەرگرت و نەدینی ئەوی وەرگرت، چونکە هەردووکیان داگیرکار بوون.. ئەم حاڵەتەش لە عەرەبدا روویدا، دینی داگیرکاری وەرنەگرت نسرانیەتیش بوو، وای لێهات مرۆڤێکی هەڵەشە کە هەمیشە کێشە لە گرفت لە هەڵەشەوە دێت، خۆی کرد بە کەنیسەکەدا بە شەو پیسایی کردە ناو کەنیسەکە.

بۆ سەبینێ کە دونیا رووناك بووەوە، قەشەکان چوونە ناو کەنیسەکە و ئەوەیان بینی، بە ئەبرەههیان وت کە پادشای حەبەشەبوو، زۆر تووڕەبوو وە بڕیاریدا کە کەعبەی عەرەبەکان بڕوخێنێت و لەشکرێکی زۆری کۆکردەوە و فیلیشیان لەگەڵدا بوو، ملی نا بەرەو ئەوێ. ئیتر هەر تیرەو هۆزێك لەو رێگەیەدا بوون هەموویان رایانکرد چونکە لەوان ئەچوون..

هەواڵ گەیشتە شارۆچکەی مەککە، خەڵکەکە هەموویان هەڵهاتن بۆ ئەو شاخ و کێوانە، ژمارەیەکی کەم نەبێت پەنایان بردە بەر (بیت).. ریش سپی ئەوکاتە، کە باپیری پێغەمبەربوو (د.خ) کە (عبدالمطلب)ی کوڕی هاشم بوو.. لەوە ئەچێت تروسکاییەکی ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم لەو پیاوەدا مابێت، کە وتی با ئێمە لەشکریشمان نەبێت، ئەمە خانەی خوایە و خوا خاوەنیەتی، مەترسن خوا خۆی بەرگری لێ ئەکات، لەگەڵ ئەوەدا کە لەو شوێنەدا سێ سەد و ئەوەندە بتی تیابوو! لەو کەسانەی کە لەگەڵیدا بوون، بووکەکەی خۆی بوو، کە دایکی پێغەمبەربوو(د.خ) مێردەکەی کۆچی دوایی کردبوو، سکی هەشت مانگ بوو..

رووداوەکە لە قورئاندا باسکراوە کە لە سورەتی (فیل)دایە کە ئێستا کاتی باس کردنی نییە، بەڵام بە کورتی ئەم سوپایە نزیک بووەو رێکەوتنیان لەگەڵدا کرد، بەڵام سوودی نەبوو کابرا هاتووە ئەو پەرستگایە ئاینییە برخێنێت.. بێگومان (کەعبە)ی پیرۆز یەکەم شوێنە، کە خوای گەورەی تیادا پەرسترا، ئەو بەردەی کە حەزرەتی ئادەمی لەسەر بوو کاتێ لە بەهەشتدا دەرکرا، خۆیی و بەردەکەی ژێری لەوێدا گیرسایەوە.. لەوێدا هەستی بە پەشیمانی کرد و داوای لێبوردنی لە خوای گەورە کرد.. سوجدەی برد و نوێژی کرد بۆ خوای گەورە، واتە پیرۆزترین شوێنە لە گۆی زەمیندا.. یەکەم شوێنە کە مرۆڤ سودەی تیادا بردووە بۆ خوای گەورە.. بینای کردووە ئیتر لەوێدا حەزرەتی ئیدریس و حەزرەتی (شیت) هەر لەوێدا خوایان پەرستووە.. لە لافاوی نوحدا ئەمانە هەموویان نەمان و نغرۆ بوون بۆ چەند هەزار ساڵێك، تا خوای گەورە حەزرەتی ئیبراهیمی نارد (علیە السلام) لە کوردستانەوە رۆیشتوو ئەو شوێنەی دۆزییەوە، بەویستی خوای گەورە و بە فەرمانی خوای گەورە لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕیدا دروستیان کردەوە.. دوای ماوەیەك دیسانەوە بیرو باوەڕەکە تێکچوو و بووەوە بە بت پەرستی.. وەك هەموو جارێك کە لادانێکی بیروباوەڕی دروست ئەبێت، خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ئەنێرێت..

کاتێك ئەم سوپایە لە مەککە نزیك بووەوە، خوای گەورە باڵندەیەکی نارد کە پێی ئەڵێن (ئەبابیلی) بەقەد چۆلەکەیەکە.. چۆلەکەش ئەوپەڕی توانای هەڵگرتنی (٢٠ - ٣٠) غرام شتی هەیە، خۆ قومبەلەی بۆ هەڵناگیرێ و ئەوە شێوازی بەرگری خوای گەورەبوو بۆ (بیت) (ترمیهم بحجارة من سجیل) ئەو کۆگڵەی کە ئەو باڵندەیە هەڵی ئەدا، ئەبوو بە تێزابێك و ئەبوو بە (سجیل) ئیتر ئەو سوپایەی سوتاند، بە فیل و حوشتر و مرۆڤەوە لەناوی بردن و تێکی دان بە پەلە

رۆیشتنەوە بەشێکی کەمیان گەیشتنەوە یەمەن، ویستی خوای گەورە وەهابوو کە ئەبرەهە لەوێدا نەکوژێ، نەبا رۆژێک لە رۆژان، داستانێکی بۆ دروست بکەن و بڵێن پاڵەوان بوو، وا ئازا بوو، وایکردووە و وایکردووە.. بەو زەلیلییەوە و بەتێکچوونی رووکاری دەرەوەییەوە گەیشتەوە ناو ماڵ و منداڵی و گەیشتەوە ناو عەرەبەکانی یەمەن و بەو حاڵەتەوە بینیان لەگەڵ ئەو چەند کەسەی کە خوای گەورە نەیکوشتن، بۆئەوەی بیگێڕنەوە کە ئێمە دووچاری سوپایەک نەبووین، بەڵکو دووچاری چۆلەکە بووین.. ئاوا خوای گەورە زەلیلی کردن و دوای ئەوە لە یەمەنیشدا نەمان.

پەندێکی گەورەیە بۆ ئێمە کە بزانین ئەو ولاتە و ئەو کەعبەیە چەند پیرۆزە لای خوای گەورە، لەو بارودۆخەدا پاش (٥٠) رۆژ لە رۆژی دووشەممەدا و لەگەڵ (فجر)دا ساڵی (٥٧١)ی زایینی سەرداری مرۆڤایەتی لەدایکبوو (د.خ) مامۆستای بەشەرییەت لەدایك بوو، گەورەترین رووداو کە روویدا لەدایکبوونی پێغەمبەر محمد بوو (د.خ).

سێ شتی زۆر سەر سورهێنەر روویدا:

یەکەم: لەرینەوەی کۆشکی کیسرا. هەر لەبەرەبەیانەوە کۆشکەکەی کە وەك زەنگێکی ئاگادار کردنەوە وەها بوو بۆی.

دووەم: دەریاچەیەك لە عێراقدایە و لەناوچەی (سماوە)یە پێی ئەڵێن دەریاچەی (ساوا) لەو بەرەبەیانە دەریاچەکە یەك دڵۆپ ئاوی تیا نەما، ئەمە دوایی زانییان کە لەو بەروارەدایە..

سێیەم: ئاگری فارسەکان (١٠٠٠) ساڵ بوو نەکوژابووەوە، ئەو بەرەبەیانە کوژایەوە.. هەوڵیان ئەدا دایگرسێنن، بۆیان دا نەئەگیرسا.. لەبەر شەرافەتی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ).

دوژمنانی ئێمە رقیان لە ژمارە (١٣)یە و ئەڵێن شوومە، لە راستیدا ئەو ژمارەیە شووم نییە، بەڵکو لەبەرئەوەی (٥٧١) لەدایکبوونی پێغەمبەرە (د.خ) (٥+١+٧-١٣)، بۆیە رقیان لە ژمارە (١٣)یە.. (١٣) ژمارەیەکە خوای گەورە دایناوە وەکو هەموو ژمارەیەکی تر، ئەگەر لەوان زیاتر نەبێ، لەوان پیرۆزتر نییە..

پێغەمبەری خوا (د.خ) هیچ کەسێك نەیتوانیوە تا رۆژی قیامەتیش کەس ناتوانێ لە وەسف کردندا مافی تەواوی خۆی بداتێ.. هەموو زانایەك دەستە وەستانە بەرامبەر زاتی پاکی پێغەمبەر (د.خ) ئەوەی کە ئەبیسترێ و ئەنوسرێ، تەنها بریتییە لە وەسفی شوێنەواری سیفاتی، بەڵام زاتی خۆی، کاری ئێمە نییە و ناتوانین، بۆچی؟ چونکە پێغەمبەری خوا لە پلەی (نبوە)دایە واتە نێردراوی خوای گەورەیە و پەیوەندی ئەکات لەگەڵ دروستکاری زەوی و ئاسماندا کەی ئێمە لەمە تێ ئەگەین؟! جگە لەوەش پلەی (الرسالە)ی هەیە.. هەروەها پلەی کۆتایی هەموو پێغەمبەران و نێردراوانی هەیە..ئەمانە هەموویان نهێنین و لە توانای ئێمەدا نییە تێی بگەین.. ئەم زاتە (د.خ) خوای گەورە هەندێ شتی داوەتێ، کە ئێمە هەستمان پێ کردووە.. بەڵام ئەوەی کە ئێمە هەستمان پێنەکردووە دەر بایەکی بێ بنە.. خۆی پێغەمبەر (د.خ) پێکهاتوومیەکە لە عیرفان و عیلم و حیکمەت، بەڵام ئەوەی کە دەرکەوت و مرۆڤ بە چاوی خۆی بینی، ئێمە ئەوە ئەگەیەنین خودی خۆی (د.خ) ئەوە هیچی لێ نازانین. کاتێك منداڵ بووە دوو فریشتەی پیرۆز هاتوون و دڵیان هێناوەتە دەرەوە و بە ئاوێکی تایبەت شتویانە و پاشان بۆیان خستووەتەوە جێگەی خۆی..

ئایا ئێمە لەمە چۆن تێئەگەین؟! ئەمرۆ لە جیهاندا هەندێ کەس دڵی دەرئەهێنن، ئامێرێکی پێشکەوتووی تایبەت بە دڵیەوە ئەنووسێنن و، نەشتەرگەری بۆ ئەکەن و لە دەریشەوە ئامێرێکی ئەدەنێ، تاوەکو جاربەجار ئەو پاترییە شەحن بکاتەوە..

ئەوە بەلامانەوە نامۆ نییە.. ئەی بۆچی بەلامانەوە نامۆ بێت ئەگەر خوای گەورە لە ڕێگەی دوو فریشتەوە ئەو نەشتەرگەرییە ئەنجام بدات؟! بۆیە زەرڕەیەك ئارەزووی دەروون لەو زاتەدا نەمێنێت! نەوەکو تاکە چرکەیەك لە ژیاندا شوێن ئارەزووەکانی بکەوێت، ئەوانە هەر لە منداڵییەوە کوژاونەتەوە..

یەکجار پێغەمبەری خوا ئەفەرموێت منداڵ بووم شاییەك هەبوو، هەموو خەڵك رۆیی منیش لەگەڵیاندا رۆشتم، فەرمووی چوومە سەر دیوارەکە و خەوم لێکەوت، خوای گەورە نەیهێشتووە شاییەکە ببینێت! هەر لە منداڵییەوە خوای گەورە پەروەردەی کردووەو پاراستوویەتی لەبەر زاتی خۆی، خوای گەورە لە دونیادا هەندێك خەڵاتی داوەتێ، وەهەندێك خەڵاتی داوەتێ لە ئاخیرەتدا، وە لەبەر زاتی ئەو هەندێ خەڵاتی داوە بە ئوممەتەکەی لە دونیاو ئاخیرەتدا.

لەو سیفات و ڕێزلێنانەی خوای گەورە بۆ زاتی پێغەمبەر (د.خ) لە دونیادا، کە ئەفەرموێت (إنك لعلى خلق عظيم...).

گەنجینەی ڕەوشتی بەرز و جوان وتەواوی هەموو ڕەوشت بەرزییەك، هەرهەمووی والەلای پێغەمبەر (د.خ) هەموو مرۆڤایەتی ئەبێت لەوەوە شت وەربگرن ئەمە خوای گەورە نەیداوە بە هیچ پێغەمبەرێك...

یەکێکی تر لە ڕێزلێنانەکانی تری ئەوەی، کە هەموو پێغەمبەرێك خوای گەورە بۆ گەلێکی تایبەتی ناردوو، بۆ کاتێکی دیاریکراوی ناردووە، بەلام بۆ پێغەمبەر (د.خ) خوای گەورە لەو رووەوە ئەڵێت.

(وماأرسلناك إلا رحمة للعالمين) (قل يأيها الناس إني رسول الله إليكم جميعا) ئەی مرۆڤایەتی من نێردراوی خوام بۆ هەر هەمووتان بۆ هەموو قەومێك، واتە لە شوێندا هەموو گۆی زەمین ئەگرێتەوە، وە لە کاتیشدا تاوەکو رۆژی قیامەت، چونکە کۆتایی پەیامی خوای گەورەیە..

ئەم پلە و پایەیە، خوای گەورە نەیداوە بە هیچ پێغەمبەرێك.. ئایینی هەموو جیهان ئەبێت تەنها ئیسلامەتی بێت، ئەوەیشی داوە بە پێغەمبەر (د.خ) چواردە جار وشەی (عالمین) لە قورئاندا هاتووە! هەروەها ئێمە چی لەوە تێئەگەین، کە پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێ (أنا سید ولدآدم یوم القیامة ولا فخر) خوای گەورە کردوویەتی بە سەرداری هەموو نەوەی ئادەمیزاد! ئەبێت چەندە سیفەتی بەرزی تیادا بێت تاوەکو بگات بەو پلەیە؟! پێدراوە سیفاتی ناژمێردرێت، و (مکرومات)ەکانی ناژمێردرێت سیفاتی (أخروي) داوە پێی واتە سیفاتی تری پێ دراوە، کە خوای گەورە لە ئاسماندا بێ بەشی نەکردووە لە سڵاوات، هەموو فریشتەیەك سڵاواتی لە دەربارەیدا و لەسەر زەویشدا ئیماندارانی مرۆڤ و جنۆکە واتە پەری... واتە شوێنێك نییە لە بوونەوەردا، کە یادی محمدی (د.خ) تیادا نەکرێت، لەو خەڵاتانە خوای گەورە بە ئایەتێك ئەفەرموێت (ورفعنا لك ذكرك).

کاتێك جوولەکە جنێو ئەنێرن بۆ پێغەمبەر (د.خ) ئێوە هیچ غەمبار مەبن، چونکە ئەو شتانەی پێ ناگات.. کاتێك سەگ ئەوەڕێت بۆ مانگ، ئایا ئازاری مانگ ئەدات؟! مانگ کە دروستکراوێکی بێ گیانە.. دروستکراوێکی وەکو پێغەمبەر (د.خ) کە لە هەموو فریشتەکان ڕێزدار ترە چۆن زیانی وای پێئەگات؟! بەڵام زیان ئەدات لە ئێمە، چونکە هەستی ئێمەی پێ بریندار ئەبێت، زاتی پیرۆزی خوای گەورە، خۆی سڵاوات ئەنێرێت بۆ پێغەمبەر (د.خ) (إن الله و ملائكته يصلون على النبي...) لێرەدا تێبینیەکی گرنگ هەیە، ئێمە ناتوانین سڵاوات بنێرین بۆ پێغەمبەر (د.خ)، لێیانپرسی هاوەڵان: یارسول الله، سەلاممان زانی چۆن سەلامت لێ بکەین، بەڵام (صلاة) چۆن بێت؟ فەرمووی بڵێن (اللهم صلي على محمد) ئێوە تا بزانن، خوا بکەن بە وەکیل.. ئێمە کە سڵاوات ئەنێرین، ئەڵێین خوایەگیان ئەپاڕێینەوە لە زاتی تۆ، چونکە تۆ پێغەمبەر (د.خ) ئەناسی و ئێمە ناتوانین مافی

تەواوی خۆی بدەینێ، تۆ رەحمەت و بەرەکەتت بڕژێنە بە سەریدا، چونکە تۆ ئەیناسیت و تۆ مافی خۆی ئەدەیتێ.. ئەمەیە مانای (ورفعنا لك ذكرك).

ئەگەر تەنها فەرزەکان بەجێ بهێنین، و تەسبیحاتت نەبێ، لە شەو و رۆژێکدا نۆجار شایەتمان ئەهێنیت... ئەمە بەرزکردنەوەی یادی پێغەمبەرە، کە هەموو نوێژکارێك هیچ نەبێ لە شەو و رۆژێکدا ناوی ئەبات.. لە سەدان هەزار مزگەوتدا لە جیهاندا، رۆژانە (٥) جار ناوی دەبرێت.. لە ئامارێکدا (٤٣٠) هەزار مزگەوت تەنها لە بەنگلادش هەیە! ولات نییە لە جیهاندا مزگەوتی تیا نەبێ، شەو و رۆژ ناوی (محمد) ئەبرێ لەناو جەرگەی ئەو ولاتانەی کە باوەڕیشیان بە ئایینی ئێمە نییە، ئەمەیە (روفعنا لك ذكرك...) ئیمان تەواو نابێ، ئەگەر باوەڕ بەوی لەگەڵدا نەبێت. (يأيها الذين آمنوا بالله و رسوله) کەواتە ئیمان بە پێغەمبەر (د.خ) پاشان ئەمانهێنێتە بازنەی ئیمان.. هەموو بەشەکانی تری ئیمانت تەواو بێ، تەنها بە محمد نەبێ، موسڵمان نیت..

لە ئاخیرەتیشدا، کە خوای گەورە پلەی شەفاعەتی ئەداتێ، ئەیداوە بە پێغەمبەرانی تر پێی ئەفەرموێ: کێت ئەوێت بۆ لێبوردن، من رازیم.. لە صەحیحی موسلیمدا پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێ (و أنا أول من ينشق عنه القبر...) واتە من یەکەم کەسم کە خوای گەورە لەکاتی زیندوو بوونەوەدا لە قەبر دەرم ئەهێنێت.. بۆچی؟! لە بلیۆنەها بلیۆنەها مرۆڤ یەکەم کەسە زیندوو ئەکرێتەوە؟! (وأول من يجيز الصراط...) و یەکەم کەسم لە پردی (صراط) ئەپەڕمەوە (واول من يدخل الجنة) یەکەم کەسم ئەچمە بەهەشت، لەبەر خاتری ئەویش لە دونیا و قیامەتدا خەڵاتی ئوممەتەکەی کراوە.. لەوانە: ئەوەی نییەتێکی پاك بهێنێت بۆ کاری باش و دوایی بۆی نەکرێت، بە چاکە بۆی حسابە، ئەوەی نییەتێکی خراپ لە دڵیدا بێت و نەیکات، بە چاکە بۆی حسابە، ئەم

بەخششانە لە ئوممەتەکانی تردا نییە.. وە ئەوەی کە چاکەیەك بکات بە یەکجار بۆی حساب نییە، بەڵکو بە دەجار و سەدجار هەتا (٧٠٠) جار بۆی ئەنووسرێت.. ئەمە لە دینەکانی تردا نییە.. نێوان نوێژێك و نوێژێك هەر گوناهێکت کردووە، بە مەرجێ گەورە نەبێ.. (ئازاردانی دایك و باوك گوناهی گەورەیە) ئەمە نوێژ و شت نایسرێتەوە.. ئەو گوناهە بچوکانە هەموویان کە لە نێوان ئەو دوو نوێژەدا کراون ئەسرێنەوە.. نێوان نوێژی هەینی و نوێژی هەینی، گوناهەکان ئەسرێتەوە هەروەها نێوان مانگی رەمەزان و مانگی رەمەزان هەر گوناهێك لەو ساڵەدا کراوە هەمووی ئەسرێتەوە، ئەمە لە ئوممەتەکانی تردا نییە.. لە هەموو شوێنێك ئەتوانیت خوای گەورە بپەرستی.. تەنها پەرستن لە مزگەوتدا واجب نەکراوە، بەڵکو لە هەرجێگایەك بێت ئەتوانی خوای گەورە بپەرستی.. (وجعلت لي ألأرض مسجدا و طهورا) (إن الله تجاوز عن أمتي الخطأ و النسيان وما أستكرهوا عليه) واتە کردارێك کە بە هەڵە بکرێ و نییەتت نەبووە بیکەیت، خوا لێت خۆش نەبێت و بە گوناه ناژمێردرێت.. وەحاڵەتی بیرچوونەوە، کاتێك فەرزێکت بیر ئەچێتەوە، خوای گەورە (إنشاء الله) لێت ناگرێت.. و شتێکیش کە بە زەبری چەك و بە زۆر گوناهێکت پێ بکەن، ئەوانەش (إنشاء ألله) بە گوناه ناژمێردرێت بە مەرجێك (کبائر). نەبێ وەکو (قەتڵ و زینا) بۆ ئەم سێ حاڵەتە کە تایبەتە بە ئوممەتی پێغەمبەر (د.خ) قەڵەمی لێبوردنی داناوە.. چەندین خەڵاتی تر لە قیامەتیشدا یەکەم ئوممەت کە زیندوو ئەکرێتەوە، ئوممەتی پێغەمبەرە (د.خ) هەروەها یەکەم ئوممەتیشە کە لەسەر پردی (صراط) ئەپەڕێتەوە.. هەروەها یەکەم کۆمەڵ و ئوممەتیشە کە ئەچێتە بەهەشتەوە..

جگە لەم هەمووەی کە باسمان کرد، خوای گەورە پێغەمبەری بەرزکردەوە بۆلای خۆی و بەهەشتی پیشاندا و گفتوگۆی لەگەڵدا کرد، کاتێك گفتوگۆی خوایی

لەگەڵ موسادا کە پێی ئەوترێ (کلیم الله) لەسەر زەوی روویدا.. بەڵام بەرز بوونەوەکەی پێغەمبەر (د.خ) بۆ حەوت ئاسمانەکان بوو، بۆئەوەی هەموو بوونەوەر بەخێرهاتنی بکات، هەموو فریشتەکان بەخێرهاتنی بکەن، ئەمە چ ڕێزێکە؟! بە هیچ نێردراو و پێغەمبەرێك نەدراوە.. هەروا بە ئاسانی وەری مەگرن ئەو تەحیاتەی کە لە نێوان خوای گەورە و پێغەمبەر (د.خ) روویدا، کە لە نوێژدا ئەیڵێیت، هێندە پیرۆزە هێندە پیرۆزە، لە هەموو نوێژێکدا یادی ئەکەینەوە.. دوای شەرەف مەندی بەودیدارە، دێتەوە بۆ سەر زەوی بەردەوام ئەبێت لەسەر پێشەوایەتی خۆی.. بەردەوام ئەبێت لەسەر واجباتی خۆی.. ئەو پلە و پایە بەرزە، لەوە قەدەغەی ناکات، ئەگەر نەعلێکی بپچڕێت، بەدەستی خۆی چاکی بکاتەوە، یاخود مەڕێك بدۆشێت، یان کراسەکەی خۆی بدورێتەوە.. هەندێ چەمك و تێگەیشتنی چەوت هەیە لای ئێمە، نازانم لەکوێوە بۆمان هاتووە؟! پێغەمبەر (د.خ) وەکو حەزرەتی عائیشە ئەیگێڕێتەوە کە لە هەموو کاروبارێکی ناوماڵدا یارمەتی خێزانەکەی داوە.. لای ئێمە هەندێ کەس هەیە، بێزی نایەت تەنانەت قاپێك بداتە دەست خێزانەکەی، بەراستی ئەم چەمکە بەهیچ جۆرێك ئیسلامی نییە..

کاتێك پێغەمبەر (د.خ) شتی ئەکڕی لە بازاڕ، نەیهێشتووە کەس بۆی هەڵبگرێت، خۆی داویەتی بەسەر شانیدا و هێناویەتە ماڵەوە، بۆئەوەی واجبی ئەمانەتەکە لە هەموو بوارێکدا جێبەجێ بکات.. میهرەبانترین باوك بووە بۆ جگەر گۆشەکانی.. میهرەبانترین هاوسەر بووە بۆ خێزانی.. میهرەبانترین سەرکردە بووە بۆ میللەتەکەی.. میهرەبانترین دادوەر بووە.. ئازاترین سەرکردە بووە.. سەرکردەی هەموو پێشەواکانە.. مامۆستای هەموو مامۆستاکانە.. بەم جۆرە چەند هەوڵبدەین، ئەمانە تەنها شوێنەواری رەوشت و سیفەتی پێغەمبەرێکە (د.خ)

بـەڵام نـاخی دڵ و دەروونـی نـازانین چـۆنە... خـوای گـەورە ئەفـەرموێت (إنـك بأعيننا) واتە تۆ لـە چاوی میهرەبانی ئێمـەداتیت.. ئـیتر ئـەم زاتـە بـەرزە چۆن بەمن و تۆ وەسف ئەكرێت؟!

پێغەمبـەر(د.خ) ئەفـەرموێت (مـن مـات وتـرك مـالا فلورثتـه، ومـن تـرك دينـا أو ضياعا فالي وعلي...) واتە ئەوكەسەی كە كۆچی دوایی ئەكات و سەروەت و سامان بەجێ ئەهێڵێت، ئەوە بۆ وەرەسەكەیەتی.. ئەوەی كـە قـەرز و منـداڵی ورد بـەجێ ئـەهێڵێت مـن لێپرسـراوم و بـۆمنی بهێـنن (الـنبي أولى بـالمؤمنين مـن أنفسهم).. چ سـەركردەیەك ئەمـەی كـردووە؟ لـە چ دەوڵەتێكـدا و لـە چ كتێبێكـدا لـە چ مێژوویەكـدا سـەركردەیەك ئەمـەی وتـووە؟ چ سـەركردەیەك لێپرسـراوبووە لـە بەخێوكردنی منـداڵی میللەتەكـەی؟ چ دەسـەڵاتێك لێپرسـراو بـووە لـە گێڕانـەوەی قەرزی قەرزار؟ كاتێك ئەمە ئەفـەرموێت، واتـە ئـەبێت دەوڵەتەكـەی بـەو شێوەیە بێت... ئەبێت ئەوەی كـە دوای پێغەمبـەر (د.خ) دێـت و ئـەڵێت دەوڵەتەكـەی مـن دەوڵەتێكی ئیسلامی و محمدییە، ئەبێ ئەم دەستورانە جێبەجێ بكات.

هـەروەها پێغەمبـەر (د.خ) ئەفـەرموێت (مايـصيب المـسلم مـن شـوكة فمادونهـا إلا وجدت ألمها في قلبي..) واتە هەر موسڵمانێك دڕكێك یاخود لە دڕكێك كەمتر بـچێت بە جەستەیدا، كاتێك ئازارەكەی دەچێتە دڵی موسڵمانەكەوە، هەمان ئازار دەچـێتە دڵی منەوە...

لە مامۆستا مـەلا عەبدولكەریمی مودەریـسم پرسـی سـەبارەت بـەم فەرموودەیـە و وتم، قوربان! ئەمە بۆ كاتی خۆیەتی؟ فەرمووی نەخێر، ئەمە تا قیامەتە، چونكە ئێمـە سلاّواتی بـۆ ئـەنێرین، فریـشتەیەك بـۆی ئـەنێرێت و ئـەڵێت: يارسـول الله فلاّنـی كـوڕی فـلاّن لـە سلێمانییەوە، لـە هـەولێرەوە، لەهـەر شـوێنێكی جیهانـەوە

سەلامت لێ ئەكات، بەلاّم ئەگەر شەوی هەینی بێت بە گوێی پیرۆزی خۆی گوێی لێیەتی..

ئەگەر بمانەوێت رەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێنین، ئەبێت شوێن ئەم زاتە بكەوین (د.خ) لەدایك بوونی رەحمەت بوو.. ژیانی هەمووی رەحمەت بوو.. رێبازەكەی هەمووی رەحمەتە.. ئایا ئەمە ژیریە كە دوور بكەوینەوە لەو هەموو رەحمەتە؟! ئایا ئەمە (منطق)ە كە دوور بكەوینەوە لەو هەموو رەحمەتە؟! خوای گەورە ئەفەرموێت (قل أن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله) واتە: ئەگەر خۆشەویستی خواتان هەیە شوێن پێغەمبەر (د.خ) بكەون.. واتە ئەگەر شوێن ئەو بكەون، من ئێوەم خۆش ئەوێت.. تەنها رێگە بۆ رەزامەندی خوای گەورە، شوێن كەوتنی (رسول الله)یە (د.خ) خوای گەورە ئەفەرموێت (فالذين أمنوا به وعزروه ونصروه واتبعوا النور الذي أنزل معه أولئك هم المفلحون).

## باسی چواردەهەم
## پەیکەڵ کردنی ئیمان

**فیطرة: سیستەمێکی خواییە و داویەتی بە هەموو مرۆڤێك.. ئەو هەستەیە کەلە مرۆڤدا هەیە، بریتییە لە باوەڕهێنان بە دەسەلاَتێکی ڕەها (مطلق) هەست کردن بە لاوازی بەرامبەر دەسەلاَتێکی ڕەها ئێمە ئەو دەسەلاَتە ڕەهایە ناوئەنێین (الله).. ئەو هەستە لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە و پێی ئەوترێت بەندایەتی.. تۆوێکە کە خوای گەورە داویەتی بە هەموو مرۆڤێك.. ئەگەر هاتوو بەناوی بەرنامەی خوا ئەو تۆوە ئاو درا، ئەوا ئەبێتە ڕەفتار و لایەنێکی پراکتیکی، ئەو پراکتیکە پێی دەڵێن پەرستش (عبادە)، هیوادارم ئەو پێناسەیە ئاشکرا بێت.. کە ئەم تۆوە ئاو ئەدرێت بەو شێوازی سورشتیە، مرۆڤەکە ئەگاتە ئاستێك کە ئەم هەستە تیایدا بەرەو گەشەسەندن ئەچێت، چۆن لەشی مرۆڤ و فیکری مرۆڤ گەورە ئەبێت، ئاوەها ئەم هەستەش گەورە ئەبێت، ئەگەر بگاتە ئاستێك، باوەڕ بهێنێ کە ئەم بوونەوەرە، دروستکارێك. . خاوەن عیلمێکی ڕەهاو خاوەن دەسەلاَتێکی ڕەها.. خاوەن دەسەلاَتێکی بێ سنوور، ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە، کە منیش یەکێکم لەو دروستکراوانە.. لەناو خودی خۆمدا بەشێکی زۆری ویست و دەسەلاَتی منی تێدا نییە، وەکو لەکوێ لەدایك بووم؟ کەی لەدایك بووم؟ فلاَن و فلاَن بوونەتە دایك و باوکم، ئەمانە ویستی منی تیادا نەبوون.. لە فلاَن نیشتماندا لە دایك بووم، ویستی منی تیا نەبووە... ئەم شێوازی ڕوخساری**

روو و دەمو چاوم، ویستی منی تیادا نییە، ئەو هۆرمۆنانەی کەلە لەشمدا دەرئەدرێن بۆ هەرسکردن و شیکرنەوەی خواردن،
وە ئەوشتانەی کە کۆنترۆڵی ترپەی دڵ و سوڕی خوێن و هەناسە ئەکات، ئەمانە هەرهەموویان راستە و ویستی منی تیادا نییە، چونکە من ئەنوونم، چۆن کۆنترۆڵی ترپەی دڵم بۆ ئەکرا، گەر بنوستمایە؟! لەبەرئەوە ژیان و بوونی ئێمە.. خوای گەورە راستەوخۆ ئەیبات بەڕێوە، بەبێ ویستی ئێمە بەشەکەی تری ئازاد و سەربەستین تیایدا، ئەتوانین چاکە بکەین ئەتوانین خراپە بکەین.. ئازادین باش یان خراپ بڵێین..
ئەگەر ئەو هەستەی کە ئێستا باسکرا گەیشتە ئەو رادەیەی بڵێیت خوایە گیان! ئەو بەشەی کە منت تیایدا ئازاد کردووە، ئەویش ئەدەمەوە بە تۆ بۆئەوەی بە ویستی تۆ بەڕێوە بڕوات و بەپێی بەرنامەکەی تۆ هەڵس و کەوت بکات، بۆ ئەوەی لەگەڵ بەشەکەی تردا هاوسەنگی بپارێزێت و هاو ئاهەنگ بێت.. ئەوە یەکەم هەنگاوی ئیمانە.. پاشان ئەگەر زیاتر گەشەی کردو.. گەیشتە رادەیەك قوربانی لەگەڵدا بوو، ئەوە ئیمانەکە بەرز ئەبێتەوە، کۆچکردنی لەگەڵدا بێت و جیهادی لەگەڵدا بێت بە هەموو جۆرەکانی، هەتا ئەگاتە دوا قۆناغ، کە بریتییە لە خۆبەخش کردن، کە شەهیدییە، ئیتر ئەوە بەرزترین پلەی بەخشینە..
کەواتە بانگەواز بۆ خوای گەورە، بریتییە لە هاندانی خەڵك بۆ کردەوەی باش، بۆ فەرمان بەچاکە و جڵەوگیری لە خراپە و بۆ هیدایەت، هەمووی بریتییە لە رەوشت، واتە دینداری تەنها هەستێك نییە لە ناخی مرۆڤدا بێت و واقیعییەتی لەگەڵدا نەبێ، ئەم حاڵەتە لەو جیاکردنەوەی لایەنی ئیمانی و لایەنی کرداری، لە ئیسلامدا نییە، بەڵکو تێکەڵە وەکو خوای گەورە لە چەندین شوێندا لە قورئاندا ناوی ئیمان و کردەوەی چاکی بەیەکەوە هێناوە (امنوا وعملوا الصالحات) سنوورێك

نییە بڵێت: ئیتر ئەمە لایەنی تیۆری و ئەمە لایەنی پراکتیکییەتی، بەڵکو نورێکە کە چووە دڵەوە، ئیتر ئەو مرۆڤە یەکسەر دەست ئەکات بەکار کردن.

لای ئێمە و لە دینی ئیسلامدا زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ میللەتانی تردا.. ئێمە ئەوەمان نییە، کە مرۆڤەکە لەناو کەنیسەیەکدا بگری، بەڵام کە هاتە دەرەوە ئیتر خەڵکی بچەوسێنێتەوە و کردەوەی چەوتی بەدی بکرێت و خەڵك لەناو بەرێت بە هەموو دڵڕەقییەکەوە، ئێمە ئەوەمان نییە، لەلای ئێمە هەموو دونیا بریتییە لە پەرستگا.. هەر لە دەستورەکەماندا خوای گەورە ئەفەرموێت (اتأمرون الناس بالبر وتنسون انفسكم و أنتم تتلون الكتاب أفلا تعقلون) خوای گەورە رەخنە لەو کەسانە ئەگرێت کە زمانیان درێژە، وا ئەزانن ئەم دینە بریتییە لە قسەکردن، ئەڵێت فەرمان بە چاکە ئەکەن ئەمە لایەنی تیۆریەکەیەتی و قسەکردنەکەیەتی.. وە خۆتان پەیڕەوی ناکەن و خۆتان جێبەجێی ناکەن، کەواتە هەموو موسڵمانێك پێش ئەوەی قسە بکات ئەبێت ئەو قسەیە لەلای خۆی چووبێتەوە قۆناغێکی پراکتیکەوە.. هەر فەرمانێك بە چاکە ئەبێت پێش باسکردنی خۆت کردبێت، هەر جڵەوگیرییەك لە خراپە، ئەبێت خۆت ئەنجامت نەدابێت و دوور بی لێی، مرۆڤ ئەکرێت بە سێ بەشەوە لەلایەنی وەرگرتنی بیروباوەڕ و جێبەجێ کردنیەوە..

١- بەشێکیان ئیمانداری راستەقینەیە، بیروباوەڕێکی هەیە، کە لە رێگەی هەست و ئەندامەکانییەوە ئەو بیروباوەڕە جێبەجێ ئەکات و هاوسەنگییەك پەیکەڵ ئەکات.. هارمۆنییەتێك و گونجاندنێك هەیە لەنێوان بیرو باوەڕ پەیکەڵ کردنی ئەو بیروباوەڕەیدا.

٢- مرۆڤی بێ ئیمانیش بەهەمان شێوە گونجان هەیە لە نێوان باوەڕ و کرداریدا، بەڵام باوەڕی لەگەڵ تۆدا جیاوازە.

٣- جۆری سێهەم ئەو کەسەی کە پەیامێکی پێیە، بەڵام بەشێوەیەکی تر پەیکەڵی ئەکات، کە پێی ئەوترێ دوو روو (منافق) مرۆڤی دوو روو بێ عەقڵە.. شتێك ئەکات، باوەڕی پێی نییە، یان باوەڕی بەشتێکە و نایکات لە ترسی ئەوەی کە بەرژەوەندیەکەی ئەوەیە دوو روویی و بێ عەقڵی.. لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە ئەفەرموێت (ومن أحسن قولا ممن دعى إلى ألله و عمل صالحا و قال إنني من المسلمين).

واتە کێ لەو کەسە باشترە کە هەوڵئەدات بە قسە و خۆیشی جێبەجێی کردووە و ئەڵێت من موسڵمانم و شانازی بە ئیسلامەوە ئەکات.

ابن مسعود خوای لێ رازی بێت ئەفەرموێت (ليس الإمان بالتحلي و لا بالتمني ولكن ماوقر في القلب وصدقه العمل) واتە ئیمان ئەوە نییە بە ئاواتەخوازی و حەزلێکردن بێت، بەڵکو ئیمان نورێکە دێتە دڵ و کردار ئەیسەلمێنێت..

شێخی گەیلانی ئەفەرموێت: ئەوەی کە ئەڵێت (لاإله إلا ألله محمد رسول ألله) ئەوە بانگەشەی ئیمان ئەکات.. پێی ئەڵێن ئەوە ئیددیعایە ئەی بەڵگەکانت چییە؟ خوای گەورە داوای کرداری لێ ئەکات.. لەبەرئەوە کرداری چاکە و هەڵوێست بەشێکە و لە بیروباوەڕی جیا نابێتەوە.

ئەم پەیکەڵ کردنە، کارێکی هەروا ئاسان نییە، بەڵام لای ئێمە سووکترە کاتێك بەراوردی ئەکەین لەگەڵ ئوممەتەکانی تردا، چونکە ئێمە پێشەوامان هەیە.. خوای گەورە ئەیتوانی لە رێگەی ئەو فریشتانەی کە بەشەو بەرۆژ چاودێریمان ئەکەن، قورئانمان بۆ بنێرێت و بیخاتە دڵی هەموو کەسێکەوە، بەڵام قورئان داوای کردەوەمان لێ ئەکات.. پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێت (إنما بعثت لأتمم صالح ألأخلاق..) واتە خوای گەورە بۆ ئەوە منی ناردووە کە هەموو رەوشتێکی جوان بەشێوەیەکی تەواوی بگەیەنم بە ئێوە.. ئەم شتە تیۆرییە، ئەگەر بەبێ پێغەمبەر

بێت کەس ناتوانێت جێبەجێی بکات.. دین ئەڵێت راستگۆبە.. دین ئەڵێت وەفات هەبێ و خواو نیشتمانت خۆش بوێت.. باشە من چۆن ئەم تێورانە جێبەجێ بکەم ئەگەر پێشەوایەکم نەبێت و ئەم شتانەی جێبەجێ نەکردبێ، من چۆن ئەتوانم بیکەم؟! لەبەرئەوە خوای گەورە پێغەمبەری نارد (د.خ).

بۆئەوەی کارەکە بۆ ئێمە ئاسان بێت.. گەرنا، بۆ خوای گەورە زۆر سانا و ئاساییە هەموو کەسێك سروش (وەحی) بۆ بنێرێت و، ئەوە زۆر ئاسانە، بەلاّم ئەمە کارەکە سەرکەوتوو ناکات.. تەنها ئەبێت پێشەوایەك هەبێت لە رەگەزی مرۆڤ بێت لەبەرئەوە خوای گەورە نوورێکی نارد، کە ئەفەرموێت (لقد جاء من الله نور و کتاب مبین) نوورەکە پێغەمبەرە (د.خ) پاشان یاسایەك، ئەگەر ئەو نەبوایە ئێمە نەمان ئەزانی قورئان چییە! کام رەوشتی جوانی، پێغەمبەری خوا (د.خ) لە لوتکەدا جێبەجێی کردووە واتە (کمال الأنسانی)، دوای ئەوە پلەی پێغەمبەرایەتی و پلەی (رسالة) و پلەی کۆتایی پێغەمبەر و نێردراوانی هەیە، جا پێغەمبەرێکی وەهای بۆ ناردین، کە نەوەك هەر تەنها (٢٣) ساڵی تەمەنی پێغەمبەرایەتی، بوڵکو هەموو (٦٣) ساڵی تەمەنی تەنها چرکەیەك گومانی تێدا نییە مایەی کەمێك گومان بێت.. بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێت (لقد کان لکم في رسوله الله أسوة حسنة) ئەیفەرموو باکردارەکانی پێغەمبەر ببێتە پێشەواتان یان وتەکانی پێغەمبەر ببێتە پێشەواتان، نەخێر، پێغەمبەر زاتی خۆی ببێتە پێشەواتان، چونکە هەموو حاڵەتێکی ئەو پێەنگە بۆ ئێوە، هەرچ هەڵوێست و، فەرموودە و بێ دەنگ بوونێك و قسەکردن و کردارێك، لە حەزرەتەوە، پێشەوایەتییە بۆ ئێمە، ئەمە لە بیر باوەڕی تردا ئەم پێشەوایەیان نییە، لەبەر ئەوە جێبەجێ کردنی بیروباوەڕ لەلای ئێمە ئاسانترە...

لەو رەوشتە جوانانەی کە فەرمانمان پێکراوە جێبەجێی بکەین، بێگومان هەموو رەوشتێکی جوان لەلای ئێمە فەرزە.. دوو رەوشت هەڵئەبژێرین ئەمانەت و راستگۆیی..

بابێینە سەر کۆمەڵگا، هەر کۆمەڵگایەك لایەنێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە، رژێمێکی سیاسی هەیە کۆنترۆڵی ئەکات.. ئەمانەت و راستگۆیی بخەرە ئەو بوارانەوە، پاشان سەیری جیاوازییەکەی بکە...! لە ئابووریدا هەرچی خەریکی کاسبی و کڕین و فرۆشتن بێت ئەمانەت و راستگۆیی لێ بسەنەرەوە، بزانە چی بەسەر دێت؟! ئەگەر هەموو ئاسنگەرێك ناراست بدوێت و هەموو دارتاش و بەقاڵ و دوکاندارێك... هتد بزانە لایەنی ئابووری چی بەسەر دێت؟! وە بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر هەموویان راستگۆ و ئەمین بن، بزانە ئابووری وڵات چی بەسەر دێت؟! یان با بێینە سەر بواری کارگێڕی.. هەموو پۆلیسێك و هەموو ئاسایشێك ئەگەر ئەمین بن و ئەگەر راستگۆ بن، هەموو فەرمانبەرێك و هەموو سەرۆك فەرمانگە و هەموو ئەندازیار و دکتۆرێك و هەموو خزمەتگوزارێك کەلە ئاو و کارەبا و تەلەفزیۆندا کارئەکەن، ئەگەر راستگۆ و دەست پاك بن، چ کۆمەڵگەیەك دروست ئەبێت؟! پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێت (لاإيمان لمن لا أمانة له) ئەوە پێوەری ئێمەیە بۆ شارستانیەت و ژیار، واتە ئەوەی دەست پاك نەبوو ئیمانی نییە..

پاشان پرسییان جائیزە موسڵمان درۆزن بێت؟ فەرمووی نەخێر.. موسڵمان هەرگیز درۆزن نابێت.. هەرکەس درۆی کرد، موسڵمان نییە، ئەمە پێوەری ئێمەیە.. با بێینە سەر بواری سیاسی کۆمەڵگە.. کار بەدەستەکان، وە دادوەرەکان و سەرۆك وڵات، ئەمانە ئەگەر سیفەتی دەست پاکییان تیادا بێت، سیفەتی راستگۆییان تیادا بێت، بزانە چ کۆمەڵگەیەکی جوانی نموونەیە دروست ئەبێت!

ئەوە داواکراوە لە ئێمە.. مەڵێ من ئامۆژگاریی نازانم.. مەڵێ من زانیاریم نییە. مەڵێ من ئەو شێوازە نازانم، ئەمانە هۆ و پێناوی گەیاندنی دینن.. هۆ پێناوی دین مەرج نییە تەنها ئەوانە بێت..پێغەمبەری خوا (د.خ) بە ئیمامی عەلی ئەفەرموێت: ئەگەر خوای گەورە تۆی کرد بە هۆکارێك بۆ هیدایەتی یەك کەس.. خێر و چاکەکەی لە هەموو خێری دونیا زیاترە.. هەموو کەسێك ئەتوانێت ببێتە مرۆڤێکی نموونەیی لەماڵی خۆیدا.. بیر بکەینەوە، کاتێك پێغەمبەری خوا (د.خ) رۆیشتن بەرەو مەدینە.. هاوەڵان هەر لە خۆیانەوە هاتنە دەرەوە و بەخێر هاتنیان کرد، یان قوتابیەکانی پێغەمبەر لەرێی ماڵەکانیان و رەوشتیانەوە و کردارە جوانەکانیانەوە، توانیان ئەمە بکەن.. ئەمە بە سات و دوان دروست نەبووە، بەڵکو بەرهەمی رەنجی هاوەڵان بوو.. رەنجی یەکێکی وەك (مەصعەبی کوڕی عومەیر) ئەو خانەدانە و ئەو موسڵمانە گەنجەی کە بە نازداری بەخێو کرابوو.. ئیمانەکەی گەیشتە رادەیەك، نیشتمانی خۆی بەجێ هێشت، ناردیان بۆ بڵاوکردنەوەی دین، بەبێ هۆ پێناوی راگەیاندنی ئەمڕۆ.. هەتا راپۆرتێکی بەرز کردەوە، پاش ئەوەی کە رەنجێکی زۆری دا، ئەگەر راستگۆیی و دەست پاکی تیادا نەبوایە، سەر نەئەکەوت.. هاتە خزمەت پێغەمبەر (د.خ) و فەرمووی یارسول الله وەڵڵاهی ماڵێك نەماوە لە مەدینەدا یادی خوای تیادا نەکرێت.. واتە لە هەموو ماڵێکدا، هەر هیچ نەبێت یەکێکیان موسڵمان بووە، ئەمانە قوتابی پێغەمبەر بوون بەشتێك نووری ئەویان وەرگرتووە.. بۆیە خۆشەویستی پێغەمبەر (د.خ) مەرجێکە لە مەرجەکانی باوەڕ.. نرخی نییە ئەو باوەڕەی کە باوەڕ بە پێغەمبەی (د.خ) تیادا نەبێت، ئەو نوورەی کەلە پێغەمبەردا بوو کاتێك دوعا ئەکات (اللهم أجعل في قلبي نورا وفي سمعي نورا وبصري نورا وعن يميني نورا و عن شمالي نورا) خۆی هەمووگیانی نوور بووە، بەڵام فێرمان ئەکات کە بڵێین،

خوایـه ئـەو نـوورەی کـە داوتـە پێمـان و لـە دڵماندایـە، خوایـە وای لێبێـت لـە هەستەکانماندا دەرکەوێت و ئیخلاصیەتەکە بگاتە کردارمان..

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، یەکێك بوو لە زانایانی یەهوود هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر (د.خ) وە کەمێك بۆی روانی و وەستا، پاشان تەوقەی لەگەڵدا کرد و وتی (اشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أنك محمد رسول الله).

پێغەمبەری خوا فـەرمووی جارێ مـن هـیچ قـسەم نـەکردووە، تـۆ چیـت بیـستووە لەمن؟ وتی یا رسول الله ئێمە ئەوەندە تێ ئەگەین لە دونیا، کە جیاوازی راستگۆ و درۆزن بکـەین.. ئەمـە دەم و چاوی مرۆڤێکی درۆزن نییـە.. ئەوەیـە نـوور! ئێمـە ئەمڕۆ لێمان داواکراوە کە ئەو نوورە بگەیەنینە هەموو ماڵێك، چۆن کاتێك کارەبا ئەگەیەننـە شـارێك، پێویـستە عـەموودی بـۆ داکـوتن و وایـەری بـۆ راکێـشن و بیگەیەننە هەموو ماڵێکـەوە پاشان لەگـەڵ وێـستگە کارەباییەکـەدا بیبەسـتن، لـەم کارەیشدا زۆر کەس کارەبا ئەیگرێ.. زۆر کەس لە عەموودەوە ئەکەوێتـە خـوارێ.. بەشی خۆی قوربانی تیایە.. واجبی ئێمەیە ئەو نوورە بگەیەنینـە هـەموو ماڵێـك، ئەمەش کارێکی هەروا ئاسان نییە.. ئەگـەر خۆمـان راسـتگۆ و دەسـت پـاك نـەبین، ناتوانین ئەو نوورە بگەیەنین، فەرمان بە چاکە هەمیـشە پـێش جڵەو گیرییـە لـە خراپـە.. هـەتاوەکو پـەرداخێك شـیر یـان شـەربەتت پـێ نـەبێت بـەو کەسـەی پـەرداخێك ئـارەقی پێیـە، پێـی مـەڵێ لایبـەرە.. هـەتا بـەدیل نـەبێ بـۆ خراپەکـە، هەرگیز نابێ نەهی بکەیت لە خراپەکە..

گەیانـدنی ئـەم نـوورە بەکەسـانی نـەفام ناکرێـت و بـە کەسـانی گێـل و تونـدڕەو ناکرێت.. بە کەسانێك ناکرێت کە بێ ئارام بن.. بە کەسانێك ناکرێت کە باوەڕیـان بە ژیار و عیلم نەبێت.. بە کەسانێك ناکرێت کـەوا بـزانن دیانـەت تـەنها بریتییـە لە تەزبیح و لە گۆشەیەکدا دابنیشێ و زیکر بکات کەنار گیر بێـت و تەمـەنی بـەم

جۆره بەرێتە سەر، کەس دژایەتیت ناکات، چونکە زیانت بۆ دوژمن نییە و زیان لە بێ باوەڕان نادەیت.. بە کەسانێك ئەکرێت کە ڕێز لەو شۆڕشە تەکنەلۆژیایەی ڕۆژئاوا بگرن..

کاتێك ئەڵێن ڕۆژئاوا خراپەکاری ڕەوشتی و رووحی تیادایە، ئەی لایەنی عیلمەکەی ؟! ئێمە ئەمانەوێ ئەو شۆڕشە عیلمیە بمێنێت، بەڵام ڕەوشت و بەهای ئیسلامی لەگەڵدا بێت..

ڕۆژئاواییەك کە تەلەفون و تەلەفزیۆن و ئامێری پێشکەوتووی دروستکرد، بەڵام بەداخەوە جیلی پێش ئێمە بە تەلەفزیۆنیان ئەوت شەیتان و دژ بە عیلم ئەوەستان.. ئەوە بووە هۆی ئەوەی کە عیلم هاوڕێیەتی دین نەکات، ئەویش هەڵەی ئێمە نەبوو، بۆیە ئەمڕۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی سەردەم ئەبێت بەشێك بێت لە ڕەوشتمان، نەك بە ئالییەتی سەدەی دەی کۆچی بجوڵێینەوە.. ئەو بیروباوەڕە پیرۆزە بهێنین، بەڵام بە عەقڵیەتێکی نوێ ئیشی پێ بکەین..

پلە پلە (تدریج)مان هەیە، ئەم دینە ناشیرین مەکەن، نەکەن هەمووی بە جارێك بهێنن بۆ کەسانێك و لەبەردەمیدا ئاڵۆزی بکەن، میللەتێك هاتن ئیسلام بوونیان ڕاگەیاند کە هۆزەکانی دەوروبەری (طائف) بوون.. ماوەیەکی زۆر پێغەمبەر (د.خ) قسەی بۆ کردن، دوای ئەوەی باوەڕیان هێنا و لەکاتی ڕۆیشتندا پاش شایەتمان هێنان و پەیمان دان بە پێغەمبەر (د.خ) وتیان یارسول الله ئێمە بتی زۆر جوانمان هەیە هەمووی بە مرواری ڕازێنراوەتەوە، ئەوە چی لێبکەین؟ ماوەیەکە باسی یەکتا پەرستییان بۆ ئەکات، تازە ئەمان باسی بتەکانیان ئەکەن کە چی لێ بکەن کە لەوانەیە زۆر لەسەریان کەوتبێ و هەندێ بەشی ئاڵتوون بێت.. پێغەمبەری خوا (د.خ) جوابی نەدانەوە حەزرەتی عومەر وتی: ئەوە کەی قسەیە بیشکێنن.. وتیان پرسیارمان لەتۆ نەکردووە، وەڵامان لەتۆ ناوێت.. پێغەمبەری خوا (د.خ)

ئەو پرسیارەی پشت گوێ خست، چونکە ئیمان و تێگەیشتنەکەیان جارێ تازەیە، بەجێی هێشتن خۆیان لێی بکەنەوە.. بێگومان مامۆستای لەگەڵ ناردن قورئانیان فێر بکات.. ورده ورده پاش ماوەیەك هاتنەوە بۆلای پێغەمبەر (د.خ) باسی گوزەرانی خۆیان کرد و وتیان یا رسول الله بتەکانمان لەت و پەت کرد.. پاشان رووی کردە عومەر و وتی: چاوت لێیە عومەر، خۆیان شکاندیان، چونکە لەو قۆناغەدا ئەوە وەرناگیرێ، ئەبێ بزانین ئەو ئیمانە تەمەنی هەیە ورده ورده گەورە ئەبێت، ئیمان شتێك نییە بڵێیت لەپڕ نەگەیتە لوتکە، بەڵکو گەشەئەکات و ورده ورده بۆ نموونە قوتابییەك لە پۆلی دووەمی سەرەتاییە، وانەکانی پۆلی شەشەمی بۆ وەرناگیرێت هەتاوەکو توانای فیکری نەگاتە ئەو قۆناغە، لەو وانانە تێ ناگات، ئیمانیش وەهایە.. پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێت، بارگیر کێشێکی دیاریکراو ئەتوانێت، کە زیاد لە سنووری خۆی بارت کرد، نە پشتی ئەمێنێت نە ئەتوانێت رێگە ببڕێت.. ئەو خەڵکە مەترسێنن و هەموو فەرزەکان بە جارێك لەلایان باس مەکەن بەڵکو پلە بە پلە.

ئەگەر ئیماندار جێبەجێ کردنی رێنمویی ئیسلامیان تیادا نەبوایە، نەججاشی چۆن پەناهەندەی سیاسییان پێ ئەدات؟! ئەگەر جێبەجێ کردنی رەوشتە جوانەکان تیایاندا دەرنەکەوتایە، چۆن نەجاشی ئەیوت واللە کێوێك ئاڵتونم بدەنێ، یەکێك لەمانە نادەم بە دەستەوە، چۆن.. چۆن ئەمەندە چوونە دڵیەوە، ئەگەر رەوشتی جوان و راستگۆیی و دەستپاکی و ئیخلاصی لەمانەدا نەبێت؟! (أقامة الحجة) یان (بلاغ المبين) کە لە ئایەتی (١٦٠)ی سورەتی نیساء فەرمانمان پێ کراوە.. ئەبێت ئێمە کارێکی وەها بکەین، فەرمانی خوا جێبەجێ بکەین، لە قیامەتدا کەس نەڵێت خوایە من ئاگادار نەکراوم (تبليغ) واجبە لەسەرمان، کە بەرێکو پێکی بیگەیەنین، نەك خۆت بڵێیت رێك و پێکە، بەڵکو بەرامبەرەکەت

دانی پیادا بنێ کە بەرێك و پێکی پێت گەیاندووە، قەناعەتەکە لە بەرامبەرەوە بێت، نەك بڵێت من هەموو هەوڵێکم لەگەڵیدا داوە بە جوانی، بەڵکو ئەو بڵێت، تۆ بەشێوەیەکی جوان دینەکەت پێ گەیاندم، ئیتر من باوەڕ ئەکەم یان نا، ئەوە لەسەر خۆمە..

دووبارەی ئەکەمەوە لە کردەوەی جێبەجێ کردن و کرداری چاك بەشێکە لە بیروباوەڕەکەمان، یەکێك هات سوئالی ئەکرد و هاتە خزمەت پێغەمبەر (د.خ) و داوای پارەی لێ کرد.. بینی چوار شانەیە و بەتوانایە، فەرمووی تۆ چیت هەیە؟ وتی جامێك و جاجمێکم هەیە هەر ئەو دوانەم لێ زیادەیە و شتی زیادەی ترم نییە، فەرمووی بڕۆ بیهێنە.. چوو هێنای و فەرمووی بیفرۆشە، فرۆشتی، سێ درهەمی کرد، فەرمووی درهەمێکیان بدە بە خواردن، درهەمێکی تری بۆ خێزانەکەت، درهەمەکەی تر بڕۆ دەمە پاچێك یان دەمە تەورێك بکڕە و بیهێنە بۆم، ڕۆشت ئەمەی جێبەجێ کرد و دەمی تەورەکەی هێنا، پێغەمبەری خوا (د.خ) بە دەستی خۆی کلکێکی لە دار بۆ دروست کرد بە دەستی پیرۆزی خۆی دایە دەستی و فەرمووی نەتبینمەوە هەتا دوو هەفتە، پاش دوو هەفتە بینییەوە (١٤) درهەمی پەیدا کردبوو، وتی دەبڕۆ قاپ و جاجمەکەی خۆت بکڕەوە و ئەوەی تریشی لە ماڵ و منداڵتدا سەرف بکە.. تێڕوانینی دینی ئێمە بۆ کارکردن بەو شێوەیەیە، وە چ جۆرە کارێك؟ نەك تەنها بەرهەم بهێنێت و تەواو، بەڵکو (اتقان) ڕێك و پێکی لەگەڵدا بێ ئەمڕۆ لە جیهانی تەکنەلۆژیادا، تەنها بەرهەم گرنگ نییە، بەڵکو دقەت لەگەڵیدا گرنگە جاری وەها هەیە یەك هەڵەی ساکار لە کارگەی ئۆتۆمبیل.. یەك هەڵەی ئاسایی لە کارگەیەکی دەرماندا، هەموو بەرهەمەکە تێك ئەدات..

(إن الله يحب أحدكم إذا عمل عملا أن يتقنه..) نەك هەر كار بكەن بەڵكو ڕێكو پێكی و داهێنانی لەگەڵدا بێت..

پێغەمبەری خوا (د.خ) قەرزی كردبوو لە یەكێك لە (أحبار)ی یەهوود هێشتا سێ ڕۆژی ئەمێنێ بۆ بەرواری دیاریكراو قەرزەكە، لەناو مزگەوتدا و لەناو خەڵكیدا و هاوەڵاندا، خۆی كرد بە ژووردا و لە یەخەكەیەوە ڕایكێشا زۆر بە توندی و ناشیرینی هاواریكرد: مافی خۆمم بدەرەوە.. ئێوە ئەی هۆزی عبد المطلب زۆر قەرز كوێرن.. بە دەنگی بەرز و بە شێوازێكی ناشرین، وەكو زانراوە كە پێغەمبەر (د.خ) ڕەنگی پیرۆزی سپی و جوان بوو، بەو ڕاكێشانی یەخەیەی، خەتێكی سوور لە ملیدا دەركەوت.. عومەری كوڕی خەتاب دەستی دایە شمشێرەكەی تاوەكو ئە و پیاوە دووكەرت بكات.. یەكسەر پێغەمبەری خوا (د.خ) ئاماژەیەكی بۆ كرد و وتی شتی لەوە گرنگ تر هەیە عومەر.. ئەبوایە فەرمانی پێبكەیت كە بە جوانی داوای مافی خۆی بكات.. وە فەرمان بە من بدەیت كە مافی خۆمی بدەمێ.. دەبڕۆ ژوورەكەی ئەودیو قەرزەكەی ئەوەندەیە، بیدەرەوە، هەرچەند سێ ڕۆژیشی ماوە، بەڵام بەرامبەر بەوەی كە ترسانت، (٢٠) جام گەنمیشی خەڵات بدەرێ.

عومەریش چوو قەرزەكەی پێ دا و (٢٠) جام گەنمیشی پێ دا.. كابرای جوولەكە شتەكانی وەرگرت و هاتەوە ئەم دیوو و وتی (أشهد أن لاإله إلا الله و أشهد أن محمد رسول الله) دوایی وتی: عومەر من چەند وەختە چاودێری ئەم پێغەمبەرە ئەكەم، لە تەوراتدا هەموو سیفاتەكانی نووسراوە، كەك پێغەمبەری ئاخر زەمان، ئەم جۆرە ڕەوشتانەی هەیە، هەمووی جێبەجێ كردووە.. سیفەتێكی تیادایە نەمدیوە هێشتا، ئەوەیە كە (حیلم)ی پێش تووڕە بوونیەتی، وەهەتا نەفام بیت تووڕەی بكەیت، ئەو ئەوەندەی تر بە حیلمە.. ئەمەم نەبینیوە، ئەمڕۆ ئەم سیفەتەشم

بینی، بۆیە شایەتی ئەدەم کە ئەمە پێغەمبەرە (د.خ) وشەیەکی ناشرین لە دەمی نەهاتە دەرەوە..

مەبەست لەم هەموو باسەی کە کردم، ئەوەیە کە ئەم بیروباوەڕە پەیکەڵ بکەین.. بیسەلمێنین بۆ خەڵك، کە دینەکەمان واقیعیە و شتێکی تیۆری نییە.. دینەکەمان هاتووە مرۆڤ دروست بکات.. خێزان دروست بکات.. کۆمەڵگا دروست بکات.. دەوڵەت دروست بکات.. نەهاتووە لەناو کۆمەڵێ پەرستشی مزگەوتدا بمێنێتەوە و بەس.. وەکاتێ ئەم دینە جێبەجێ ئەبێ، ئیتر ڕێگە بە خۆویستی و رق و قین نادات کە بمێنێت، چونکە هەموو دینەکەمان بریتییە لە لێبوردن و چاوپۆشی کردن..

هەروەها بیمەی پەیوەندییەکانی ئەو دونیا ئەکەیت.. خوای گەورە ئەفەرموێت (ألم تر كيف ضرب الله مثلا كليمة طيبة كشجرة طيبة أصلها ثابت و فرعها في السماء تؤتي أكلها كل حين بإذن ربها). درەختی ئیمان کە بە ئاوی پەرستش (عیبادە) ئەڕوێت، ئەبێتە ئەمامێك، رەگەکەی لە دڵیدا و قەد و پۆپی لە ئاسماندایە.. هەمیشە و بەردەوام بەرو بوومی هەیە و چاکە ئەنووسرێ.. ئەمەیە پەیوەندییەکەمان لەگەڵ خوای گەورە لە قیامەتدا، بەڵام پەیوەندییەکانی تر، کە لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤە، بێگومان درەختی یەکتا پەرستی و پەیوەندی و ئیخلاصە لەگەڵ درەختی یەقین و ئیسلامەتی و ئیمان و خۆشەویستیشە.. پەیوەندییەکانی تر، لەو دونیا، هەموو سفرە (ولا يسأل حميم حميما) دۆست لە دۆست ناپرسێتەوە (فأقبل بعضهم على بعض يتلاومون) هەریەکە لۆمەی ئەوی تر ئەکات.

**(الأخلاء يومئذ بعضهم لبعض عدو إلا المتقين) واتە هەموو دۆستان لەو دونیا ئەبنە دوژمنی ئەوی تر، تەنها کۆمەڵی پارێزکاران و کۆمەڵی ئەو ئەمامە نەبێت...**

## باسی پانزەهەم
## پرۆسەی پەیوەندییەکان و مافی مرۆڤ

**پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤدا دوو جۆرە:**

**جۆرێکیان لەگەڵ هاوبیر و هاو فکری خۆتا، ئەوە بنەمای خۆی هەیە.. پێی ئەوترێ برایەتی ئیمان کە لەسەر خۆشەویستی و هاوکاری و ئاشتی و یەکگرتن بەندە، بەڵام پەیوەندییەکی تری هەیە، پەیوەندییەکی ئینسانییە، بنەمای خۆی هەیە وا تێمەگەن کە تەنها ئەبێ ئیماندار بخوێنینەوە، دینەکەمان فەرمانمان پێ دەدات کە پەیوەندی ئینسانیمان بەوپەڕی ڕێز و شکۆوە جێبەجێ بکرێ لەگەڵ خەڵکیدا، لەو بنەمایانە یەکەمیان پێکەوە ژیانی ئاشتیانەیە.. بەڵگەمان چییە؟ سەیری قورئانی پیرۆز بکە چۆن ئەمر ئەکات بە ئینسان کە باش بێ لەگەڵ دایک و باوکیدا، بەبێ ئەوەی بڵێ بیروباوەڕی دایک و باوکەکە چۆنە؟ بەڵکو خوای گەورە مافیانی هێناوەتە ریزی مافی خۆیەوە..**

**(وقضى ربك ألا تعبد و إلا إياه و بالوالدين إحسانا) چاك بە لەگەڵیان بە چاکی لەگەڵیانا بژی خزمەتیان بکە پێیان نەڵێی ئۆف.. شتێك نەکەی دڵیان بئێشێ.. تەنها حاڵەتێکی تایبەتی هەیە ئەگەر ئەمریان پێ کردی بۆ خراپەیەك، ناشەرعییەك نابێت بە قسەیان بکەیت (وصاحبهما في الدنيا معروفا) باسی بیروباوەڕی دایك و باوکەکە ناکات، دێتە سەر کەس و کار، خزم و کەسوکار مافیان هەیە بەسەرتەوە، براکەم، مەڵێ ناچم بۆلایان، چونکە نوێژ ناکەن شتی وانییە لە ئاینماندا.. مافیان هەیە بەسەرتەوە ئەبێ ڕێزیان لێ بگری پێکەوە ژیانی ئاشتیانە**

بەریتە سەر لەگەڵیاندا ئەوە بنەمایەکە لە بنەماکانی پەیوەندی ئەی چۆن دینەکەت بڵاوئەکەیتەوە؟ ئەی چۆن ئەیسەلمێنیت بۆ خەڵك کە تۆ بیروباوەڕێکی باشت پێیە و، بەڵام دەرگاکەت داخستووە بەرامبەر خەڵکی.. یاخود پەیوەندی ناکەیت لەگەڵیاندا.. بەێیتەسەر دراوسێ.. قورئان ئەفەرموێ.

(والصاحب بالجنب) ئەوەی تەنیشتە نەی وتووە بیروباوەڕەکەی چۆنە پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێ (مازال جبریل یصیني بالجار حتی ظننت أنه سیورثه) هەمیشە ئامۆژگاری ئەکردم.. وەسیەتی بۆ ئەکردم جبریل (علیه السلام) دراوسێکەت. . دراوسێکەت.. ئیتر گومانم وابوو کە دراوسێ میراتی بەر ئەکەوێت، دیاری نەکراوە لێرەدا کە دراوسێکەت ئیمانی هەیە یان نییەتی، بێگومان ئەگەر ئیمانی هەبوو ئەوە مافەکەی زیاتر ئەبێ.. مافی دراوسێیەتی ئەبێت مافی ئیسلامەتییەکەشی ئەبێ، ئەگەر خزمیش بێ ئەوە سێ مافی ئەبێ، عەزێتی دراوسێکەت مەدە بە بۆنی مەنجەڵەکەت.. خۆش بێ یا ناخۆش بێ عەزێتی مەدە بەوە، چەندین حدیث هەیە لەسەر دراوسێ.. بەڵام دیاری نەکردووە خاوەن ئیمانە یا خاوەن ئیمان نییە، هەر کە بوو بە دراوسێت ئیتر ئەوە مافی هەیە بەسەرتەوە.. واللە لایؤمن.. واللە لایؤمن.. پێغەمبەر ئەیفەرموو وەڵلاهی بەئیمانداری راستەقینە و تەواو ناژمێردرێ وتیان کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی (من بات شبعانا و جاره جائع) ئەوکەسەی کە بە سکێکی تێرەوە ئەچێتە ناو جێگا، تێری خواردووە لەنان وە دراوسێکەی برسێتی.. نەی وتووە دراوسێکەی ئیماندارە یان ئیماندار نییە ئەوە بابەتێکی ترە.. هەروەها لەگەڵ غەریبە..قورئان زۆرجار باسی (ابن السبیل) ئەکات.. ابن السبیل.. ئەو کەسەی کە موڵکی نییە لە شارەکەی تۆدا کەسی نییە پشتیوانی نییە کەس نایناسێ ئاوارەیە غەریبە..ئەوە پێویستە کۆمەڵگا پەیوەندییەکی مرۆڤانەی هەبێت لەگەڵیدا.. لە

فەرموودەیەکدا هاتووە ئەو کەسەی کە ڕێز لە میوانی بگرێ وە بیناسێ وەك ڕێزی گرتبێ لە پێغەمبەری خوا (د.خ) وە ئەوکەسەی ڕێز لە میوانی بگرێت و نەیناسێ وەك ڕێزی گرتبێ لەخوای گەورە.. ئەمە هەمووی پەیوەندی و وابەستەییە لەگەڵ ئەو کەسانەی ئەیانناسێت و نایانناسێت.. ئەبێ ڕێزیان بگری کەواتە.. پێکەوە ژیانی ئاشتیانە بنەمایەکە لەبنەماکانی پەیوەندی لە ئایینی ئێمەدا.. حاڵەتی تایبەتمان هەیە.. کەی ئەم پەیوەندیانە ئەپچڕێ.. کەی ئەم پێکەوە ژیانە ئاشتیانە ئەپچڕێ. لەدوو حاڵەتدا لە حاڵەتی غەدردا.. کە بەرامبەرەکەت غەدرت لێ بکات یان کۆسپ بخاتە ڕێت.. لەو دوو حاڵەتەدا ئەمیش حاڵەتێکی تایبەتە.. ئەمما پێکەوە ژیانی ئاشتیانە ئەصلە.. وە بنەمایە.. بنەمایەکی ترمان هەیە.. فرە بۆچوونی.. چاوەڕوانی ئەوە مەکە هەموو دنیا بێتە سەر دینی تۆ ئینتیزاری ئەوە مەکە هەموو بەشەرییەت بۆچوون و بیرکردنەوەی وەك تۆ بێ (أفأنت تكره الناس حتى يكونوا مؤمنين) خوای خوای گەورە بە پێغەمبەر ئەفەرموێ (د.خ) ئەتەوێ بەزۆر خەڵك شوێنت کەون (لاإكراه في الدين) زۆرداری نییە لەمەسەلەی باوەڕدا. . خوای گەورە لەئایەتێکی تردادەفەرموێ.(ولوشاء الله لجعلكم امة واحدة) ئەگە خوا بیویستایە (سبحانه وتعالى) هەموو بەشەریەتی ئەکرد بە ئیماندار، ئەیکردن بەیەك ئوممەت.. لەبەرئەوە ئەمە ئیشارەتێکە بۆ ئێمە کە قبوڵمان بێ، خەڵکی تر تر بیروباوەڕی ئێمەی پێ نەبێ نابێت دڵتەنگ بین.. ئەمەندە ملیۆن ئەمەندە ملیار خەڵك هەیە باوەڕەکەی تۆی نییە نابێت سەغڵەت بیت ئەبێت بتوانیت خۆت بگونجێنیت لەگەڵیاندا.. لەگەڵیاندا بژیت بیانناسیت (وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا) بەو ناسینە وردە وردە تۆ ئەیسەلمێنیت.. کە بیروباوەڕێکی چاکت پێیە.. بەرەوشتی جوان. ئێمە زۆر پێویستمان بەرەوشتە زیاتر لە عیلم.. ئەو کەسانەی کە باوەڕیان

ئیسلامی نەبووە، بەلاّم لەناو کۆمەڵی موسڵماناندا ژیاون.. وەك نەصرانییەکان وەك جولەکەکان ژیاون و لەناو کۆمەڵگای ئیسلامیدا پێیان ئەوتن (أهل الذمة) هەموو مافێکیشیان هەبووە.. لە زیمەتی خواو پێغەمبەردا بوون، لە زیمەتی حکومەتی ئیسلامدا بوون لە زیمەتی ئوممەتی ئیسلامدا بوون.. شەرەف و ناموس و سەروەت و سامان و ژیانیان لە زیمەتی موسڵماناندا بووە، پارێزراوبوون، پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێت (من آذى ذميا كنت خصمه، ومن كنت خصمه خاصمته يوم القيامة) ئەوەی کە عەزێتی مەسیحیەك بدات عەزێتی جولەکەیەك بدات کە هاولاّتییە لە خاکەکەی تۆدایە عەزێتی بدەی وەك عەزێتی منت دابێ وایە.. پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێ وە ئەوەی عەزێتم بدات دژایەتی لەگەڵدا دەکەم لە قیامەتدا.. ئەمە ئیشارەتێکە کە ئەبێ فرە بۆچوونی هەبێت.. تەحەممولی ئەوە بکەیت کە خەڵکی تر نایەتە سەر دینەکەی تۆ، بەلاّم شتێکی تر ئەمان بەستێتەوە کە مەسەلەی ئینسانیەتە.. سەبارەت بە مەسەلەی پەنادان هەیە قورئان ئەفەرموێت (وإن أحد من المشركين استجارك، فأجره حتى يسمع كلام الله) چەند گەورەیە ئەم ئایەتە.. ئەگەر بێ باوەڕێك پەنای هێنا بۆت پەنای بدە (حتى يسمع كلام الله) هەتا ئەتوانی دینەکەتی فێر بکە با ببیستێ دینەکەی تۆ چییە.. رێز و ئیحترامی بگرە لە ماڵەکەی خۆتا.. (ثم ابلغه مأمنه) واتە چاوەڕوانی ئەنجام مەکە باوەڕئەهێنێ باوەڕ ناهێنێ.. تۆ ئەرکی خۆت بەجوانی جێبەجێ بکە.. ئەرکی خزمەتی ئەو کە واجبی گەیاندنی دینەکەت بە چاکترین شێواز (ثم ابلغه مأمنه) ئیتر حەز بەکوێ ئەکات بیگەیەنەرە ئەو شوێنە کە هەست بە ئەمین و ئومان ئەکات تیایدا لەسەرتە ئەرکەکە بیگەیەنیتە ئەوێ..

ئیتر باوەڕ ئەهێنێ یان باوەڕ ناهێنێ.. ئەوە بابەتێکی ترە ئەمە قورئان ئەفەرموێ مەعنای ئەوەیە ئەبێ تەحەممولی ئەوکەسانە بکەین کە باوەڕیان وەك ئێمە نییە

ئەنجامی ئارامی ئەویٚ ئەمە ئیمانێکی بتەوی ئەویٚ.. زیرەکی ئەویٚت ئەم دینەت چۆن عەرز کەی بۆ ئەو کەسانە! بنەمایەکی ترمان هەیە (گفتوگۆیە) کە بەزاراوەی ئەمرۆ پێی ئەڵێن دایەلۆگ.. گفتوگۆ لەگەڵ بەرامبەردا.. بەهەچ شێوازێك بیٚ قورئانی پیرۆز فێرمان ئەکات کە ئەبیٚ ئەم بنەمایەی هەبیٚ.. لەگەڵ ئەو کەسانەی کە باوەڕت پیٚ ناکەن، ئەبیٚ تۆ هەوڵ بدەیت کە رێك بکەوی لەگەڵیدا (قل یا أهل الكتاب تعالوا الى كلمة سواء بيننا و بينكم...) وەرن با دابنیشین ریٚ بکەوین باشە تۆ باوەڕت نییە بەمن لەسەر شتی تر ریٚ بکەوین؟! دووسەد جۆر خیتاب لە قورئاندا هەیە لەگەڵ ئەوکەسانەی کە باوەڕیان نییە (وجاد لهم بالتي هي أحسن.....) جیدال هەیە نیقاش هەیە بەشێوەی عیلمی بە شێوەی رێكو پێك بەبیٚ تەجریح..

بنەمایەکی ترمان هەیە (هاوکاری).. خوای گەورە ئەفەرمویٚ (وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعونوا على ألإثم و العدوان....) هەرشتێك بەرژەوەندی میللەتەکەتی تیا بوو.. ئیتر کەسێك ئەیکات یا کۆمەڵێك هەر چاکە، کەس هەیە بڵیٚ خەستەخانە دروست کردن شتێکی خراپە! کەس هەیە بڵیٚ چاککردنی رێکەوبان شتێکی خراپە؟!، کەس هەیە بڵیٚ.. گەیاندنی ئاوو کارەبا بۆ شوێنێك خراپە؟! کەس هەیە بڵیٚ مزگەوت دروست کردن خراپە؟! کەس هەیە بڵیٚ قوتابخانە دروست کردن خراپە؟! ئەمانە هەمووی (بت)ن هەرکەسیٚ ئەم ئیشانە بکات ئەبیٚ رێزی لیٚ بگریت ئەبیٚ هاوکاری لەگەڵدا بکەی دوعای خێری بۆ بکەیت.. ئیتر باوەڕەکەی ئەو چۆنە ئەوە گرنگ نییە.. بنەمایەکی ترمان هەیە.. نەرم و نیانی.. رەحم و بەزەیی لە قورئاندا خوای گەورە بە پێغەمبەر ئەفەرمویٚ (د.خ) (لوكنت فظا غليظ القلب لانفظوا من حولك) ئەی محەمەد ئەگەر تۆ دڵ رەق بوویتایە و شێوازت رەق بوایە کەس شوێنی تۆ نەئەکەوت.. نەرم و نیانی بنەمایەکە لە

پەیوەندیماندا.. پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ (د.خ) (من لا یرحم الناس لایرحمه الله) ئەوەی رەحم بە خەڵکی (ناڵێ موسڵمانان، بەڵکو هەموو خەڵك).. رەحمیان پێ نەکات خوای گەورەش رەحمی پێ ناکات.. ئاوها ئەبێ لە ئیسلام تێ بگەین ئەم بنەمایە ئاوها تێ بگەین.. لە زەمانی پێغەمبەردا (د.خ) پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر.. فریای دوو کۆمەڵ کەوت..

کە بە زاراوەی ئەمڕۆ پێی ئەڵێن (حزب) ئەوان ئەوکاتە پێیان ئەوت (حلف) یەکێکیان پێیان وت (حلف المطیبین) کۆمەڵی پیاو ماقوڵان کۆبوونەوە بڕیاریاندا بەرگری لە مەککە بکەن لە هەموو جۆرە هێرشێك تورەکەیەکیان هێنا شتێکی تیابوو بۆن خۆش دەستیان ئەخستە ناوییەوە.. دەستیان ئەو بۆنە خۆشەی ئەگرت ئەهاتن ئەیاندا لە دیواری کەعبە و پەیمانیان ئەدا بە خوای گەورە کە بەرگری لەو ولاتە بکەن.. شتێکی پیرۆزە ئەمە پێغەمبەری خوا (د.خ) بوو بە ئەندام تیایا.. حیلفێکی تر دروست بوو بوو پێیان ئەوت (حلف الفضول) پیاو ماقوڵان و ریش سپیان کۆبوونەوە لە هەموو هۆزەکان.. بڕیاریاندا پشتی ستەم لێکراو بگرن، بەرگری لە ستەم لێراو بکەن، پێغەمبەری خوا (د.خ) لەوکاتەدا (١٥) ساڵ بوو نوێنەری هۆزی عبدالمطلب بوو چوو دەستی خستە ناو دەستیانەوە وە پەیمانی دا.. پاش چەندین ساڵ.. کە بووبە پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی (لو دعیت إلیه في الإسلام لأجبت) ئەگەر ئەمڕۆ ئەم شتە زیندووبێتەوە و بانگم کەن.. وەڵامیان ئەدەمەوە و ئەبم بە ئەندام تیایا.. چونکە کاری خێرە.. نەك هەر بەرگری لەکرێکار و ئەوەی کە حەقی خۆی وەرناگرێ بەتەواوەتی بەرگری لە هەموو مەزڵومێك. . شتێکی جوانە..

ئەبێ ئێمەیش ئاوها بیر بکەینەوە.. کە ئەمانەمان هەزم کرد ئەمانەمان ئیستیعاب کرد ئەوسا کە ئەتوانین.. مافی مرۆڤیش هەزم بکەین، بزانین

بەشەرییەت هەمووی چ مافێکی هەیە، لە ریوایەتی صەحیحدا.. پێغەمبەری خوا (د.خ) لە (حجة الوداع)دا فەرموویەتی (أيها الناس إن ربكم واحد) خەڵكینە.. ئەمە گوتارێکە بۆ هەموو بەشەرییەت.. خەڵكینە خواوەندتان یەکە.. دە بیربکەرەوە لەمە.. هەموو ئینسانێك خواوەندێکی هەیە هەوڵ ئەدا رازی بکات نیتر ئەو خواوەندە بەشەرە.. کۆمەڵ بەشەرە، ژنە، پیاوە، حزبە، دەوڵەتە، بتە، هەرشتێکە.. وە ئەگەر یەکتا پەرستیش بێت خوای گەورە خاوەنێتی.. هەوڵ ئەدات ئەو خواوەندە لەخۆی رازی کات، پێغەمبەری خوا ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات ئێمە خوامان یەکە، کەواتە میتۆدی رازی کردنی خوا لەخۆمان یەك میتۆدە (المنهج) ئیتر کەواتە بۆچی خیلاف بکەوێتە بەینمانەوە؟ بۆ کینە بکەوێتە بەینمانەوە؟ کە ئێمە پێویستە یەك پرۆگراممان هەبێ . هەموو هەوڵ بدەین ئەو خوایە لە خۆمان رازی بکەین.. پاشان ئەفەرموێت (الناس سواسية كأسنان المشط لا فرق لعربي على أعجمي الا بالتقوى، كلكم لآدم و آدم من تراب) هەموو ئینسانێك لە دایك ئەبێت ئازادە، هەموو ئینسانێك خوای گەورە کەرامەتی پێ بەخشیوە، بەهۆی کەرامەتەکەوە ئەبێتە خاوەن ماف، ئەگەر کەرامەتی نەبێ . ترخ.. نرخ و پایەی نەبێ ئیتر مافی بۆ چییە.. (لقد خلقنا الإنسان في أحسن التقويم) خوای گەورە کەرامەتی پێ بەخشیوە (ولقد كرمنا بني آدم..) جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ کە ئێستا بەندی یەکەمتان بۆ ئەخوێنمەوە.. هەر ئەڵێی لەو (حجة الوداع)وە دەرهێنراوە.

بەڵام بە وشەی جیاواز.. هەمان مەفهوم ئەدات.. بەندی یەکەمیان ئەڵێت: هەموو مرۆڤەکان بە ئازادی لەدایك دەبن و یەکسانیشن لە نرخ و پایە و مافدا.. عەقڵ و ویژدانیان پێ بەخشراوە و دەبێ بە رۆحێی برایانە رەفتار و هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکدا بکەن.. هەر دەقە ئینگلیزییەکەیشی ئەڵێت (Sprit of brother hood)

واته وەكو رۆحی برایانە.. نەك هەر برایەتییەك روالەتی.. ئەلێی برای خۆمە چیبکەم ناچارم یارمەتی ئەدەم.. خۆشیشت ناوێ.. بەلام دینەکەمان ئەلێ: ئەبێ خۆشت بوێت.. (لایؤمن أحدکم حتی یحب لأخیه مایحب لنفسه....) بە ئیمانداری راستەقینە و تەواو کامیل نادرێتە قەڵەم تاوەکو ئەو شتانە تۆ پێت خۆشە بکرێ لەگەڵت ئەبێ پێشت خۆش بێت بۆ برای ئایینیەکەت.. ئەو شتانەی کە دژ بە بەرژەوەندی خۆتە و حەز ناکەیت رووبدات.. ئەبێ هەمان حاڵەتت هەبێ وە حەز نەکەیت روو بدات بەرامبەر برای ئاینیت.. پێغەمبەری خوا ئەفەرموێت (إن دمائکم و أموالکم و أعراضکم حرام علیکم کحرمتی یومکم هذا في شهرکم هذا في بلدیکم هذا) ئەفەرموێ خوێنی هەموو ئینسانێك وە هەموو پەیوەستەکانی ژیانی بە شەرەف و نامووسەوە هەمووی حورمەتی هەیە و پارێزراوە.. واتە نەك هەر پارێزراوە کە خەڵك تەعەدای نەکات.. خۆشت نابێ تەعەددای لێ بکەیت.. نابێت خۆت ئینتحار بکەیت.. چونکە ئەو ژیانە موڵکی خۆت نییە، نابێ پارەو سامانی خۆت بە فیرۆ بدەیت، چونکە خوای گەورە بە ئەمانەت داوێتی پێت.. نابێ شتێکی وا بکەی کە شەرەف و نامووست سوك کەیت، پاش چواردە سەدەی لەمافی مرۆڤدا ئەلێ: هەموو کەسێك مافی ژیان و ئازادی و ئاسایشی خۆی هەیە.. مەسەلەی ژیان لە بۆچوونی ئیسلامدا جیاوازی زۆرە لەگەڵ بۆچوونی تردا.. ئاژاوەیەك رووی دابوو لە ویلایەتی موصل لە زەمانی ئەبو جەعفەری مەنصوردا.. پاش ماوەیەك دیسان روویدایەوە.. تالأنی کراو چەندین کەس زەرەر و زیانی پێ گەیشت ماڵیان تالأن کرا، ئەبو جەعفەری مەنصور ئینسانێکی سیاسی بوو.. لێپرسراوانی موصلی بانگکرد.. بەرێوەبەری ئاسایش و بەرێوەبەری پۆلیس و پارێزگاری ئەوێ هەموویانی بانگ کرد.. وتی: ئەمە دووجارە هاولأتیان زیانیان پێ ئەگات لەوێ هیچتان لەگەڵدا ناکەم.. تەنها ئەلەوێدا ئیمزام بۆ بکەن.. ئەم



جاره شتێکی وا رووبدات ئیعدامتان ئەکەم، ئیمزایان بۆکرد.. حەز ئەکات بڕیارەکانی شەریعەت وەرگرێ.. چوو کۆمەڵێك زانای بانگ کرد.. بۆئەوەی زاناکانیش ئیمزای لەسەرکەن. ئەوساکە شەریعەتی ئەبێ.. ویستی بڕیارەکەی زۆر زۆر وەزنی هەبێ، ناردی بەشوێن ئەبوو حەنیفەشدا (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەبو حەنیفە کە سەیری نووسراوەکەی کرد.. فەرمووی (أمیر المؤمنین) ئەمە ناشەرعییە.. وتی چۆن؟ ئەمانە مەسئولن، وتی قوربان ئەوەی مافی کۆتایی هێنانی ژیانی خەڵکی پێ بێ تەنها خوایە.. خوای گەورە ئەو مافەی هەیە، چونکە ئەو ژیانەکەی بەخشیوە.. ئەو ئەتوانێ رایکێشێتەوە.. کۆتایی هێنان بە ژیانی یەکێك بێنی ئەبێ بەگوێرەی دەستوری خوا بێت.. ئەمە حاڵەتی دزییە.. دزی ئیعدامی تیا نییە.. لەبەرئەوە ئیمزای بۆ نەکرد..

نموونەی ترمان هەیە.. ئیمامی عومەر (خوا لێی رازی بێت) بەناو بازاڕدا ئەڕۆی.. بۆئەوەی بزانێ نرخ چۆنە؟ کڕین و فرۆشتنی خەڵك چۆنە؟ ئازارو ئەشکەنجە و موعاناتی رەعیەتەکەی چۆنە؟ بەشەو بە رۆژ.. پیاوێکی لێ پەیدا بوو وتی شەرتبێ بت کوژم.. خەریك بوو بیگرن: وتی مەیگرن: خۆنەی کوشتووم.. سەیری ئەو ئازادییەکە سەیری ئەو تێگەیشتنەکە.. ئەمرۆ لە راقیترین دەستوری جیهاندا.. ئەڵێ: هەوڵدان بۆ کوشتنی سەرۆکی وڵات جەریمەتێکی سیاسی نییە، شتێکی جینائییە.. ئیسلام چوارده قەرن لەمەوپێش ئەمەی جێبەجێ کردووە.. ئەو ئیستیجارەی کە پێش نەختێ بۆم باسکردن، کە قورئانی پیرۆز ئەفەرموێت (وإن أحد من المشركين استجارك فأجره....) کە یەکێك پەنای برد بۆت پەنای بدە، تا ئێستا ئەم حەقە نەدراوە بە دەوڵەتەکان لجوء و لجوء سیاسی و لجوئی ئینسانی مافی دەوڵەتەکەیە مافی ئینسان نییە.. ئیسلام ئەیدا بە ئینسان.. بۆ من مافم نەبێت یەکێك بێنم بیحەوێنمەوە لەماڵی خۆمدا.. من خزمەتی ئەکەم من

بەخێوی ئەکەم بۆ ئەو مافەم نەبێ، دە بزانە ئیسلام چەند راقیە بەس ئێمە تێی نەگەیشتووین.. ئەم پیاوە ئەبو لوئلوئەی فەیروزی ناوبوو دوای چەند رۆژێك فرسەتی هێنا لەکاتی نوێژدا کە ئیمامی عومەر نوێژ ئەکات بە ئیمامەتی وە ئەوانە هەموو قوتابی پێغەمبەر بوون کە نوێژیان ئەکەرد وەك ئێمە نوێژیان نەئەکرد، کە ئەیان وت الله أکبر دنیایان فڕێ ئەدایە پشت خۆیان.. لەو فرسەتەدا ئەم بکوژە هات و خەنجەرەکەی کرد بە سەر شانیدا ئیمامی عومەر نەیتوانی نوێژەکەی تەواو بکات کەوت و هەموو گیانی خوێن بوو کابرایان گرت.. فەرمووی، نەی کوژن ئێشتا من نەمردووم.. کەس مافی کۆتایی هێنانی ژیانی ئەو پیاوەی نییە.. چونکە نەکوژراوم هێشتا.. من ژیانم تیایە.. هەمان شت روویدا لە ئیمامی عەلی (سەلامی خوای لێ بێت) (عبدالرحمن کوری ملجم) کە دیسان بە هەمان شێوە لە ئیمامی عەلی دا.. فەرمووی نەی کوژن، چونکە من نەمردووم.. ئەگەر چاك بوومەوە خۆم مەحکەمەی ئەکەم.. ئەگەر فەوتاشم خۆتان بەگوێرەی شەرع حوکمی بکەن، بەڵام ئەمڕۆ بەداخەوە زۆر کەس کۆتایی هێنانی ژیانی زەلامی زۆر ئاسان دێتە بەرچاوی: (دخلت أمرأه في هرة) پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێ: ژنێ: کە نوێژی ئەکرد و رۆژووی‌ئەو ئەگرت، چووە جەهەنەم بەهۆی ئەوەی کە پشیلەیەکی حەپس کردبوو.. پشیلەیەکی حەپس کرد بوو نەئاوی دایە و نە خواردنی دایە نەبەرەڵاشی کرد خۆی شوێن خۆراکی بکەوێت.. پشیلەکە فەوتا.. وە ئافرەتەکە ئەچێتە جەهەنم بەهۆی عەزێتدانی ئاژەڵێکەوە..

## باسی شانزەهەم
## مافی ئافرەت لە شارستانیەتە دێرینەکان و ئیسلامدا

پێشەکی کاتی وتارەکە ڕۆژی عەرەفە بوو.. ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە لە حاجیەکان خۆش ئەبێت.. بەشوێنی وتارەکەش دەشتی عەرەفات بوو.. لەسەر چیای (الرحمة) (جبل الرحمة) وە ئامادەبوان مەزەنە ئەکران بە (١١٤) هەزار موسڵمان لە ژن و پیاو لە عەرەب و غەیری عەرەب، کۆمەڵێ ڕیوایات هەیە صەحیحن کە زاناکان کردوویانە بە دەستوری ئیسلام.. نزیکەی شەش حەوت خاڵی تیایە زۆر زۆر گرنگن.. وە دەرمانن بۆ هەموو کێشەی مرۆڤایەتی.. من ئەمویست لە خاڵی یەکەمەوە دەست پێ بکەم، بەڵام قەدەر وابوو ئەمڕۆ خوشکێك پرسیارێکی کرد بوو.. پەیوەندی هەیە بە بەشی دووەمی وتارەکەوە.. ناچارم بەشی دووەمەکە پێش ئەخەم.. پێغەمبەر (د.خ) دڵی خەبەری دابوو.. کە ئیتر ئەوان نابینێ.. وەك ئەفەرموێ (لعلي لا القلكم بعد عام هذا) (٨٠) ڕۆژی خایاند.. پاش ئەو بەرواره.. حەزرەتی رسول الله (د.خ) دنیای بەجێهێشت.. یەکێك لەو خاڵانە ئەفەرموێ (واتقوا ألله في النساء واتقوا الله في النساء) لەخوا بترسن وەمافی ئافرەت ون مەکەن.. چەندین جار ئەمەی تیکرار کردۆتەوە حەتتا لەگیانەڵاشدا.. لە گیانەلاَ.. ئەیفەرموو (الصلاة. . الصلاة.. النساء.. النساء وما ملكت أيمانكم استوصوا بالنساء خيرا).. پێش ئەوەی باسی مافی ئافرەت و ڕەوشتی ئافرەت بکەین لە ئیسلامدا.. پێویستە بزانین ڕەوشتی ئافرەت چۆن بووە لەو شارستانیەتانەی کە لەو ماوەیەدا بوون.. پێش ئەو ماوەیە ئەو وڵاتانەی

دەوروبەر.. کتێبێ: هەیە بەناوی (ألمرأة في ألإسلام) نووسینی (جمال الباجوری) دوو بەرگە.. ئەوەی بیەوێ زانیاری زیاتری هەبێ.. ئەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو کتێبە.. لە شارستانیەتی فارسا ئافرەت ئەدرا بە مەحرەم.. باوك كچی خۆی ئەهێنا، برا خوشكی خۆی ئەهێنا، وە لە كاتی مەزدەكا.. ئافرەتی عەوام بوو بە مووشاع واتە هەموو كەسێ ئەیتوانی (نعوذوا بالله) رابوێرێ لەگەڵیا.. بارودۆخی ئافرەت زۆر خراپ بوو هەتا زەردەشت هات.. زەردەشت حاڵی ئافرەتی چاك كرد.. مافی یاسایی بۆ دانا.. وە بوو بەخاوەن موڵك و بوو بەخاوەن میراتی.. وە كەرامەتێكی بۆ پەیدا بوو، بەلاّم پاش زەردەشت.. هەمدیس رەوشتی تێكچۆوە، لە شارستانییەتی بابلیەكاندا.. ئافرەت ئەكڕا و ئەفرۆشرا.. لە مادە (١١٧)ی شەریعەتی حامورابیدا.. ئەڵێ ئەو كەسەی كە قەرزاربێ و لە میعادی خۆیدا قەرزەكە نەگێڕێتەوە.. خاوەن قەرز بۆی هەیە ژن و كچ و كوڕی ئەو پیاوە بەرێ بۆ ماوەی سێ ساڵ بەكاری بێنێ.. لەلای ئاشووریەكان، مێرد هەقی فرۆشتنی ژن و منداڵی هەبووە، لە شارستانیەتی هندیدا.. دیسان ئەكڕا و ئەفرۆشرا.. وە بەچاوێكی سووك تەماشای ئافرەت ئەكرا، وە ئافرەت ئەبوایە بە مێردی بووتایە گەورەم یان خاوەنم، نەئەبوایە بەناوی خۆی بانگی بكردایە، هەرچیەكی دەست ئەكەوێ ئەبێ بیدا بە مێردی، وە ئەگەر هاتوو مێردی پێش ئەو مرد.. ئەبێ ئەو ژنە بسوتێنرێ و شوێن مێردەكەی بكەوێ، هیچ عەیب و عار نییە ئەگەر ژنێك كچێكی بوو ئەو كچەی بكوژێت، بە عەیبی دانانێن، تا ئێستاش ئەو شتە ماوە لە هیندستان لە عیادەی دكتۆرەكان نووسوراوە (٥٠٠) روپێكەت ئەمڕۆ بدە باشترە لە (٥٠٠٠٠)هەزار روپێكەی یەعنی چی؟ ئەو (٥٠٠) روپێیە كە ئەكاتە (١٦) دۆلار پارەی نرخی لەناوبردنی ئەو منداڵەیە.. بێگومان كچ.. وە ئەگەر لە شوێنێكدا ئافرەتێك كچی بوو مامانەكە لەبەرچاوی دایكەكە دەست ئەنێ بە بڕبڕەی پشتیا

بـه قـايمی پـشتی ئەشـكێنیٚ و ئـەی كوژێـت دايكەكـە پێـی ئـەڵێ دەسـت خـۆش.. لەهەندێ ناوچە لە هندستان بە تـووتن منـداڵ ئـەكوژن.. لـە هەنـدێ.. بـەو پـشت شكاندنە لە هەندێ شوێنی تر فرێی ئەدەن بۆ چەقەڵ و سـەگ بيـانخۆن.. مـارەيی وە جيازی لەسەر باوكی كچەكە داناوە، زاوا هيچ شتێك سەرف ناكات، لەبەرئـەوە.. ئەوەی يەك دوو كچی هەبێت ئيتر ئەوە قوڕی بۆ گيراوەتەوە، چونكە جيازييەكەی ئەچێتە نزيكەی (٥٠٠٠٠) روپيە كە نزيكەی (١٤٠٠) (١٥٠٠) دۆلار ئەكات كە دەبێـت بـاوكی كـچەكە ئامـادەی بكـات.. لـە شارسـتانيەتی چين شارسـتانيەتێكی گـەورە و مێژوويەكی دێرينی هەيە.. ئەمرۆ چين (٦٢) پارێزگايە.. هەزار و دووسەد مليـۆن كەسە.. بەڵام لە شارستانيەتی چيندا ئافرەت بۆی نەبووە بچێتە ناو پەرستگاكان، چونكە بە بەشـەريان دانـەناوە، وەباشـترين ئـايين لـە شارسـتانييەتی چينـدا پێـی ئــەوترێ (كۆنفۆشيۆســی)، كۆنفۆشيۆســی ئينــسانێكی موصــليح بــووە، تەنانــەت ئەويش ويژدانی نەبووە بەرامبەر ئافرەت، ئەڵێ زۆر كێشە كە تووشـی مرۆڤايـەتی بووە هۆكارەكەی ئافرەتە، لەو شارستانييەتەدا پياو بۆی هەيە ژنی خۆی بفرۆشـێ پياو بۆی هەيە لەگەڵ ئافرەتی تردا رابوێرێ بە ئاشكرا و عـەيب و عـار نييـە.. وە لـە شارسـتانييەتی ياپانـدا هـەمان شت هەيـە لەگـەڵ ئەوەشـدا مـافی موڵكايـەتی و ميراتی نييە. ئەكرێ و دەفرۆشرێ تەنانەن بۆ مێردیی هەيە كە بەكاری بێنێ بۆ خراپەكاريش (نعوذ بالله) لەلايەن يۆنانييەكان ئافرەت.. تەنها لـە رێگـەی كـڕين و فرۆشتنەوە شووی ئەكرد.. رێگەی شوو ئاسـايی نـەبووە، تـەنها لـە رێگـەی كـڕين و فرۆشتنەوە نەبێ.. وە بە چاوێكی سووك تەماشای ئـەكرا و ئـەيانوت كـە ئـافرەت تەنها بـۆ بـەخێو كردنـی منداڵـە و هيـچی تـر.. لـە شارسـتانييەتی يۆنانـدا ئەگـەر ئافرەتەكە منـداڵێكی ناشيرينی ببوايە ئافرەتەكـەيان ئەكوشـت.. وە زۆر ئـافرەتيش ئـەدرا بـە پيـاوی تـر بۆئـەوەی منـداڵی زۆری ببـێ ئـەيان وت بـا نيـشتمانەكەمان

لەشکری زۆر بێ.. لە شارستانیەتی رۆماندا میراتی بەر نەئەکەوت.. وە ئەوکەسەی کە کچی ببوایە، خەمبار ئەبوو زۆر پێی ناخۆش ئەبوو، باوك مافی ئەوەی هەبوو کە کچی خۆی رەهن بکات یاخود بیفرۆشێ یان بیکوژێت. لەلای عەرەب دیسان خاوەن موڵك نەبووە.. خاوەن میراتی نەبووە.. بەلەدایك بوونی دلگران بوون هەندێ هۆز زیندە بە چاڵیان ئەکرد. وە نیکاحی (إستبضاع) هەبووە (نعوذ باللە) پیاو خێزانی ناردۆتە لای پیاوێکی بەقوەت بۆئەوەی منداڵی بەقوەتی ببێ (نعوذ باللە) نیکاحی (شیغار) هەبووە ژن بەژن بەبێ مارەیی، نیکاحی موتعە هەبووە، نیکاحی (مەقتی) هەبووە، (مەقتی) یەعنی باوەژنی خۆی ئەهێنێ پاش مردنی باوکی یا پاش تەلاق دانی.. نیکاحی (بەدەل) هەبووە ژنیان گۆریوەتەوە لەگەڵ فەرەقێکی پارە، نیکاحی (غەصب) هەبووە بە زۆر داگیرکردن، بەکورتی بارودۆخی ئافرەت ئەوها بووە کە ئیسلام هاتووە، بزانین لەلای دیانەتی جولەکە (مونحەریف) لە سفری خروجدا فەقەر حەوت بۆ دوانزە چی.. ئەڵێ: حەلاڵە بۆ پیاو کە کچی خۆی بفرۆشێت بۆ چارەسەر کردنی کێشەیەکی دارایی.. شایەتی (١٠٠) ئافرەت یەکسانە بە شایەتی یەك پیاو، وە لە تەوراتدا ژمارەیەکی دیاریکراو نییە بۆ ژنی پیاو، واتە بۆی هەیە دەیان سەدان ژنی هەبێ.. لە سفری (تەثنیە) ئیصحاحی (٢٥) برگە (٥) تا (١٠) ئەڵێت: ئەو پیاوەی کە دەمرێ و منداڵی نییە ئەبێ ژنەکەی شووبکات بە براکەی.. مەرجە.. وەئەگەر هاتوو برای نەبوو ئەبێ لەهەمان قەوم یەکێك بهێنێ، وە جائیز نییە یەکێك لە قەومێکی تر بیهێنێ، هەروەها لەو سفرەدا.. ئافرەت میراتی بەرناکەوێ.. تەنها لە حاڵەتێکدا ئەگەر کوڕی هەبێ یان کوڕی کوڕی هەبێ، یەهودیەت قەدەغەی ئافرەت ئەکات بچێتە ناو پەرستگاکانەوە.. لە قانوونی ئینگلیزدا هەتا ساڵی (١٨٠٥).. مێرد بۆی هەبووە ژنی خۆی بفرۆشێ هەتا لە قانوونی فەرەنسیدا کە پێی دەوترێت سەرچاوەی

هەموو دەستوورەکان.. دایکی هەموو دەستوورەکان، هەتا (١٩٣٨) زاینی ئافرەت بە قاصر دانراوە.. قانوون شایەتی وەرنەگرتووە، چونکە لەسێ جۆر خەڵك شایەتی وەرنەگیراوە، ئەوانیش (شێت و منداڵ و ژن)ن، مافی تەصرووف بە موڵکی خۆیەوە لە (١٩٦٦)دا وەری گرتووە یەعنی پێش ئەو بەروارە، ئافرەتی خاوەن موڵك کە شوو ئەکات ئیتر بۆی نییە تەصەرووف بکات بە موڵکەکەیەوە.. تەنها بە مۆڵەتی مێردەکەی نەبێ.. بەڵام ئیسلام لەیەکەم رۆژی هاتنیەوە ئەم گرفتانەی چارەکردووە هەزار و سێ سەد ساڵ پێش ئەوروپا.. بارودۆخی ئافرەت لە ئەمریکای لاتینی مەکسیك و بەرازیل و ئەرجەنتین و ئەم وڵاتانە لەوان باشتر نییە، ئامارێك کراوە سەدی هەشتای ئافرەت بەلایەنی کەمەوە یەك جار لە ژیانیدا پەلامار دراوە.. ئەمریکا لەگەڵ هەموو (١٧) دەقیقەیەك دەست درێژیەکی ناموس لە ئافرەت ئەکرێت بەزۆر، یەعنی پێی ئەوترێت (جەریمەی ئیغتصاب) (١٧) خولەك رۆژانە نزیکەی ئەکاتە (٨٤) ئافرەت.. بە نیسبەت ئیسلامەوە.. هەر لەو فەرموودەی پێغەمبەردا (د.خ) ئەفەرموێ (فاتقوا الله في النساء) پاشان ئەفەرموێ (ولكم عليهن أن لا يطئن فرشكم أحدا تكرهونه) مافی مێرد بەسەر ژنەوە ئەوەیە ئەو کەسانەی کە تۆ حەزناکەیت بێنە ماڵت کە لە ماڵ نەبی نابێ بهێڵی بێنە ژوورێ.. ئەوە مافی مێردە بەسەر ئافرەتەوە.. ئەگەر بەقسەی نەکردی یەعنی خیانەتی کردووە.. (ولهن عليكم رزقهن و كسوتهن بالمعروف) مافی ئەوانیش بەسەر مێردەوە رزقە واتە خواردنە لەگەڵ جلوبەرگ، بەڵام وردبینەوە لە فەرموودەکە لە قورئانی پیرۆزدا چەند جارێك وشەی مەعروف بەکار هاتووە.. مەعروف یەعنی (عورفی ئیجتماعی) یەعنی دابی کۆمەڵایەتی نموونەیەکتان بۆ ئەهێنمەوە بۆ ئەوەی بە تەواوەتی تێ بگەین: سێ خوشك خەڵکی دێیەکن هەرسێکیان شوو ئەکەن یەکەمیان یەکێك ئەیهێنێ لە دێیەکەی خۆیان دووەمیان

یەکێك خەڵکی سلێمانی ئەیهێنێ، سێهەمیان ئەیبا لەگەڵ خۆیدا بۆ سووید ئەبێ بزانن کە مافی ئەم ئافرەتانە یەکسان نین بەرامبەر مێردەکانیان، چونکە شوێنەکانیان جیاوازە، داب و نەریتی ئەو دێیە چۆنە لەبارەی خۆراك و خواردنەوە ئەبێ خواردنێکی وای بۆ ئامادە بکات، لەو دێیەدا خەڵك چۆن ژنی خۆی بەخێو ئەکات ئەبێ ئەم لەوان کەمتر نەبێ، داب و نەریتی ئەو گوندە ئاوایە ساڵی جارێك جل ئەکەن ئەبێ ئەم لە ساڵی جارێ کەمتر نەبێ، جلی بۆ بکات، ئەوەیە (بالمعروف) یەعنی عورفی ئەو شوێنە، هی سلێمانییەکە بە شێوەیەکە، هی سویدەکە شێوازێکی ترە لەبەر ئەوە قورئانی پیرۆز بارودۆخی کۆمەڵی رەچاو کردووە، ئەگەر داب و نەریت لەوێ وابێ هەموو حەفتەیەك مێردەکە ئەبێ شتێك بکرێ بۆ خیزانەکەی ئەمیش ئەبێ وا بکات ئەگینا موسڵمانێکی باش نییە، لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە.. رۆژێکی تایبەت هەبووە پێغەمبەری خوا (د.خ) کە تەرخانی کردووە بۆ ئافرەتان بۆ وەڵامی پرسیاریان بۆ تەوجیهی دینیان.. وە قورئان ئەفەرموێت (ومن یعمل من الصالحات من ذكر أو أنثى وهو مؤمن فأولئك یدخلون الجنة ولا یظلمون نقیرا..) ئەوانەی کراری چاك ئەکەن نێرینە بن یان مێینە بن.. ژن بن یان پیاو بن.. بە مەرجێ ئیماندار بن.. ئەمانە ئەچنە بەهەشت و مسقاڵە زەررەیە زوڵمیان لێ ناکرێت.. خوای گەورە ئەفەرموێت (من عمل صالحا من ذكر أو أنثى وهو مؤمن فلنحيينه حيوة طيبة و لنجزينهم أجرهم بأحسن ماكانوا يعملون) هەمان مەعنا ئەگرێتەوە.. ئیتر لێرەدا جیاوازی نییە لە نێوان نێرینە و مێینەدا بەرامبەر پاداشتی خوای گەورە.. هەتا قەرنی حەڤدە.. کە لە پیاوانی ئاینی مەسیحی.. کۆ ئەبوونەوە لە هەموو شوێنێکەوە بە کۆنفرانسی گەورە.. دیراسەتی ئەوەیان ئەکرد.. ئایە ئافرەت ئینسانە یا شەیتانە؟ هەتا قەرنی حەڤدە دانیان بەوەدا ناوە کە ئافرەت بەشەرە..

بەلام لە قەرنی (حەوت)دا هەزار ساڵ پێش ئەوە.. کە دەستووری ئۆمەتی پێغەمبەر (د.خ) قورئانە.. قورئانەکەش یەك نووسخە بووە لەماڵی (حەفصە)ی کچی عومەری کوڕی خەتاب پارێزراوە..!!

قورئانەکەمان لای ئافرەتێك دائەنرا.. دایکی ئیمانداران حەزرەتی حەفصەی کچی عومەر.. پاش هەزار ساڵ لەو بەرەوارە.. ئەوان کۆ ئەبنەوە بزانن ئافرەت بەشەرە یا شەیتانە!! شانازییە بۆ ئێمە کە یەکەم شەهید یەکەم خوێنی رشتبێت بۆ ئەم دینە ئافرەت بووە حەزرەتی (سومەیە) بووە.. خوای گەورە ئەفەرموێت (یاأیها الناس أتقوا ربکم الذي خلقکم من نفس واحدة) (ایها الناس) خەڵکینە.. خەڵکینە کێ ئەگرێتەوە ژن و پیاو ئەگرێتەوە.. خوای گەورە خیطاب ئەکات لەگەڵ بەشەریەتدا ژن و پیاو ئێوەم دروست کردووە لە یەك نەفس.. لە ئایەتێکی تردا (بعضکم من بعض) بەلام ئەو رۆحە کە یەکسانە رۆحی ژن و رۆحی پیاوە، بەلام ئەمیان ئەچێتە لاشەیەکی نێرینەوە و ئەویان ئەچێتە لاشەیەکی مێینەوە لەوێدا جیاوازییەك دروست ئەبێت.. جیاوازییەکی دنیاییە بەگوێرەی ئەرکەکە، چونکە ئەرکی ئەم جیاوازە بازوو پتەوی ئەوێ، چونکە ئەبێ بەرگری بکات ئەبێ ژنەکە بپارێزێت هەندێ واجباتی قورسی لەسەر ئەبێت رزق و رۆزی پەیدا کات، ئەوەی تریشیان بە جۆرێکی تر دروستکراوە.. جیاوازییەکە جیاوازییەکی بایەلۆجییە، بەلام لای خوای گەورە رۆح یەکێکە.. جۆرێك لە یەکسانی هەیە (الناس سواسیة کأنسان المشط) هەمو خەڵك یەکسانن.. ئافرەت حەقی هەیە لە عقدی نیکاحی ئەگەر بالغ بێ.. حەقی هەیە، خۆی مەرج دابنێ لە عەقدی نیکاحدا.. ئەمە لە چ دینێکدا هەیە؟!

حەقی میراتی هەیە ئیسلام بۆی ئیقرار کردووە وتمان هەزار و ئەوەندە ساڵ پێش هەموو دەستوورەکانی جیهان وە لە قورئاندا کە ئەفەرموێت (وبالوالدین إحسانا)

(الوالدين) ژن و پیاو نەگرێتەوە.. دایك و باوك (وقل لهم قولا كريما وأخفض لهما جناح الذل من الرحمة وصاحب هما في الدنيا معروفا) هەمووی دەربارەی دایك و باوكە هەتا دایك بەڕێز تریشە بەسەر باوكدا، هاوەڵێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (د.خ) لێی پرسی (أي الناس أحق بصحبتي يا رسول الله) واتە.. كێ نزیكترین كەسە بۆ من ئەی پێغەمبەری خوا وە لە هەموو كەسێ زیاتر مافی بەسەر منەوە هەیە، فەرمووی (أمك)، قال ثم من؟ ئەی دوای دایك كێ؟ فەرمووی أمك، ئەی دوای دایك كێ فەمووی أمك، لە چوارهەمیندا فەرمووی أبوك.. ئەنجا باوك، ئیسلام ئاوها تەماشای ئافرەت ئەكات.. هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا.. بەڕێز و بە ئیحترامەوە باسی كۆمەڵێك ئافرەت كراوە.. وەك ئاسیا خاتوونی خێزانی فیرعەون.. وەك خێزانی عیمران. وەك حەزرەتی مەریەم.. وەك دایكی موسا كەناوی (یوكابدە) وەك خوشكی موسا.. وەك خێزانی حەزرەتی ئەیوب، كە هەمو كەس لێی دوور نەكەوتەوە، چونكە تووشی ئەو دەردە بوو.. بەڵام خێزانەكەی خزمەتی ئەكرد.. هەموو پێغەمبەرێك كە خوای گەورە ئەینێرێ پەیامێكی پێیە ئەبێ شێوەی جوان بێ ئەبێ رێك و پێك بێ، بەڵام بۆ ماوەیەكی دیاریكراو نەخۆ شی خست بۆماوەی حەوت ساڵ.. تاقیكردنەوەی خوا ئاوهابوو نەخۆشیەكی پیسی گرت.. منداڵی نەما كەسی نەما هەموو كەسی لێ تەكیەوە.. تەنها خێزانەكەی مایەوە لەگەڵیا وە خێزانەكەی كچی حەزرەتی (یوسف)ە (علیە السلام) هەروەها باسی كچەكانی حەزرەتی شوعەیب ئەكات، قورئانی پیرۆز.. وە ئەبێ بزانین لە رێكەوتننامەی حودەیبیەدا، كە هاوەڵانی پێغەمبەر تووشی نارەحتیەك بوون، بڕیار وابوو بچن بۆ حەج (طواف) بكەن هیچی نەهاتە پێشەوە.. صوڵح كرا پێغەمبەری خوا زۆر زۆر خەفەتی خوارد ئەنجا ئوم سەلەمە (خوای لێ رازی بێت) دڵنەوایی حەزرەتی كردەوە.. وتی: دەتۆ بڕۆ قوربانیەكەی خۆت سەربڕە، ئەنجا ئیحرامی خۆت

بشكێنه، قژى خۆت ببڕه، ئەوانیش چاو لەتۆ ئەكەن.. مەعنەویاتی بەرز كـردەوە.. پێغەمبـەری خـوا بـە قـسەی كـردوو، ئـەو كێـشەیە بـە ئاسـانی چارەسـەركرا.. جوبرەئیل (علیه السلام) بە پێغەمبەر ئەفـەرموێت (یارسـول ألله بلـغ عائیـشة منـا السلام) واتە بڵێ بـە عائیـشە ئێمـە سـەلامی لێ ئەكـەین یـەعنی جوبرەئیـل (علیـە السلام) سەلام لە كێ ئەكات؟ لە حەزرەتی عائیـشە.. ئەمـە رێـز و شـوێنی ئافرەتـە لە دینی ئێمەدا.. لە كۆتاییدا ئەبێ بـزانین كـە فەرموودەیـەك هەیـە سـەبارەت بـە حـەزرەتی خەدیجـە یەكـەم خێزانـی پێغەمبـەر (د.خ) كـە جوبرەئیـل ئەفـەرموێ (یارسول ألله بلغ خدیجة من ربها السلام) رای بگەیەنە بە خەدیجە كە خوای گەورە سەلامی لێ ئەكات...



## باسی حەڤدەهەم

## دووڕوویی لە هاوکێشەی ڕواڵەت و جەوهەردا

نەخۆشی دووڕوویی (نیفاق) لە (نافقە الیربوع)ەوە هاتووە کە حەیوانێکە لە دەشتدا ئەژی حەیوانێکی فێڵاوییە و قوموش لێدەرە وەك کەروێشك، بەڵکو زیاتر و چەند ڕێگەیەکی هەیە بۆ دەرچوون، وە مەعنا زمانەوانییەکەی لەوەوە هاتووە (المدرات و الالتیواء)یانی ماستاوکردن، فێڵ کردن، گەڕان بەشوێن پێچ و پەنادا، لە زاراوە شەرعییەکەشدا مەعناکەی دەرخستنی ئیسلامە وە داپۆشینی کوفرە، بەڵام بۆچی ئەو ئینسانە وائەکات؟ بۆچی بە ڕواڵەت شتێکە و لە ناوەوە شتێکی تر؟ بۆچی موجامەلەت دەکات و رووی خۆشت پیشان دەدات و کەچی لەناوەوە بوغزی هەیە بەرامبەرت بۆچی؟ دووڕوویی ڕاستەقینە، ئەو کەسەیە کە باوەڕی بە ئیسلامەتی نییە، باوەڕی بە ئامانجەکانی کۆمەڵگای ئیسلامەتی نییە، ڕوویشی نییە ئەو بیروباوەڕەی ئاشکرا کات لەبەرئەوەی دەوروبەری قبوڵی ناکا ناچارە ئەو ڕێگا چەوتە وەرگرێ بۆ لێدانی دین، هەمووومان ئەزانین کە ئیمان بە پلەیە دووڕووییش بە هەمان شێوەیە یەکسان نین لەگەڵ یەکدا، بەڵام خوای گەورە لە قورئاندا ناوی دووڕوویی بە نەخۆشی ئەبات (في قلوبهم مرض) واتە: دووڕوویی نەخۆشییە هەموو نەخۆشیەك یەکەمجار نیشانەی هەیە، ئەگەر چارەی نەکرد زیاد دەکات، بۆنموونە برینی گەدە یان با بڵێین ڕۆماتیزمە لە سەرەتادا سادەیە، بەڵام ئەگەر چارەسەری نەکرد نەچوو بۆلای دکتۆر دەرمانی بەکار نەهێنا خەست دەبێتەوە و نیشانەکانیشی زیاد دەکات، پێغەمبەری خوا (د.خ) باسی نیشانەکانی

دووڕوومان بۆ دەكات لە فەرموودەیەكدا ئاماژە بۆ سێ نیشانە دەكات ئەفەرموێت (اية المنافق ثلاثة: إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا اتمن خان) ئەگەر قسەی كرد درۆئەكات، درۆیش جۆری هەیە: بچوك كردنەوەی هەندێ رووداوی گەورە ئەو جۆرێكە لە درۆ، گەورەكردنی هەندێ رووداوی بچووك ئەوە جۆرێكە لە درۆ دەسكاری كردنی وشە دەستكاری كردنی ژمارە كەمكردنەوەی زیادكردنی، ئەمانە هەموو نیشانەی درۆن (وإذا وعد أخلف) كە پەیمانێك ئەدات جێبەجێی ناكات، بۆ نموونە پەیمان ئەدات خانووەكە بداتەوە بە خاوەنەكەی لە كاتێكی دیاریكراودا نایداتەوە! پەیمان ئەدا قەرزەكەی بگەڕێنێتەوە لە فلان كاتدا نایكا پەیمانی شووكردن هەیە پەیمانی ژن هێنان هەیە پەیمان زۆرە، جا ئەوكەسەی ئەبێ ئەوە بزانێ كە نیشانەیەك لە نیشانەكانی نەخۆشی دووڕوویی تێدایە، سێهەم (وإذا اتمن خان) كە ئەمانەتێكی پێ ئەسپێردرێ خیانەتی لێ ئەكات ئیتر ئالتونە، دۆلارە، دینارە، كە خاوەنەكی داوای دەكاتەوە نكوڵی لێدەكات یان خیانەتی لێ دەكات یان ئەیگۆڕێ یان نوقسانی ئەكات یا لەكاتی خۆیدا نایداتەوە وە مەرجی نییە ئەمانەتەكە ماددە بێت..

جاری واهەیە وەرەقەیەكە سەنەدێكە نامەیەكە ئەمانە ئەمانەتن جاری وا هەیە ئەمانەت قسەیەكە یەكێك لەلات ئەیكات بە ئەمینت ئەزانێ دوایی ئەچیت خیانەت ئەكەیت ئەو قسەیە ئەگێڕیتەوە كەواتە ئەمانەت بەشێكی ماددیە و بەشێكی مەعنەویە، ئەوەی سیفەتی هێنان و بردنی قسەی هەبێت ئەوە سیفەتی دووڕووی تیایە لە فەرموودەیەكی ترا (د.خ) ئەفەرموێت (وإذا عاهد غدرو إذا خاصم فجر) كە گفتێك ئەدا نایباتە سەر، كچی خۆم تووشبكە بە كوڕەكەی من دوایی وات بۆ دەكەم وات بۆ دەكەم دوایی تەماشا ئەكەیت جێبەجێی ناكات، كوڕی خۆم تۆ دەرچۆ ئەمساڵ من دوایی فلان شت و فیسار شتت بۆ ئەكەم بۆچی پێی

ئـەڵێی کـە بـۆی نـاکرێ؟ (وإذا خاصـم فجـر، مخاصـمه) واتـه دژایـەتی (خـیلاف) دووکـەس خـیلاف ئەکەوێتـە بەینیانـەوە، بێگومـان هۆکـارێکی هەیـە لەسـەر دووکانەکە لەسەر نرخەکە یان لەسەر کاڵایەکە بیروباوەڕێکە، بۆچوونێکە... هتـد، خیلاف کەوتۆتە بەینی دووکەسەوە ئەو خیلافە دووڕوو گەورەی دەکات، ئەگەڕێ بـۆ هـەموو وەسیلەیەك بۆئـەوەی کەسیـەتی لەکـەدار بکات، ئەگـەڕێ بـۆ مێـژووی بزانێ لەکەیەکی تیایـە ئەگـەڕێ بـۆ بوختـان بـۆ سـەر خێزانـی بـۆ برینـدارکردنی کەرامـــەتی، ئەمـــە کـــەی ســـیفەتی بەشـــەرە! لەبەرئـــەوە بـــا بگەڕێینـــەوە و پیاچوونەوەیەکی خۆمان بکەین بزانین ئەم سیفەتانە چەندی لـە خۆمانـدا هەیـە با چارەسەری بۆ بدۆزینەوە، جۆرێکی تر هەیە لـە دووڕوویـی بـەپێی هەڵوێـست و بەڕێوەبـەر بـەپێی کرێکـار و خـاوەن کارگەکـە ئەمـەش بێگومـان لـە لاوازی ئیمانیەوەیە وا ئەزانێ ڕزقەکەی بەدەست ئەوە، دێت ماستاوی بۆ دەکات، جۆرێکی تر هەیە لەنێوان فەرمانبەرێکی حزبی و لێپرسراوەکەیدایە

ئەمەیان دووڕوویی سیاسی پێ ئەڵێن تەماشای مێـژوو بکـە ئەوانـەی دیکتـاتۆرن و سـەرکردەی میللـەتن بزانـە کـێ نزیکـی ئەبێتـەوە ئـەیکا بـە وەزیـر ئـەیکا بـە مستەشاری خۆی و ڕاوێژکاری خـۆی هـەموو سیفەتی دووڕوویـی تیـا هەیـە بزانـە ئەو پاشایە سەرکردەی وڵاتە حەز بەچی ئـەکا بـەو کەناڵە قسەی لەگـەڵ ئـەکات، بەڵێ قوربان ڕاست ئەکەیت، سەیر لەوەدایە کە کەسێك شیعر بەسەریدا هەڵئەدات تۆ وایت و وایت ئەگەر تۆ نەبی کەون تێك ئەچێ، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو دکتـاتۆرە ئەزانێ ئەوانە درۆ ئەکەن ئەزانێ دووڕوون بەس نایان گۆڕێ، چونکە خـەڵکی وای ئەوێ، جا بـا بـزانین ئـەبێ خۆمـانی لێ بپارێزین، چونکە کـە زۆر بـو گـەورە بـوو ئەبێتە دووڕوویـەکی تـەواو کـە خـوای گـەورە ئەفـەرموێت (إن المنـافقين في الـدرك أسفل من النار ولن تجد لهم نصيرا) ئەمانە لە بنی بنەوەی دۆزەخن ئەگـەر تەوبـە

نەکەن، بڕوانە مێژوو بخوێنەرەوە بزانە ئەوکەسانەی کە یارمەتی زاڵم ئەدەن هەر زاڵمە کە تۆڵە لەوان ئەسێنێتەوە وا ئەزانن رازقی ئەوانن وە مقەدەراتی ئەوان بەدەست ئەو سەرکردەیەیە و حەز بە چی ئەکا بۆی جێبەجێ ئەکەن، پێغەمبەری خواش (د.خ) ئەفەرموێت (من إعان ظالما سلطه الله عليه) ئەوەی یارمەتی زاڵم ئەدات، ئەو زاڵمە دەسەلاّتدار ئەبێ بەسەریا، خوای گەورە لە سورەتی (البقرە) کە یەکەم سێ ئایەتی باسی ئیماندار دەکا دوای ئەوەی باسی بێ ئیمان دەکات دوای ئەوە نزیکەی (١٠) ئایەت باسی منافق دەکات، ئەڵێ درۆدەکەن فێڵ ئەکەن لە ئیمانداران فەساد بلاّوئەکەنەوە و ئیدیعای چاکەکردن ئەکەن، هەروەها بە چاوێکی سووك سەیری ئیماندار ئەکەن.. (وإذا قيل لهم آمنوا كما آمنا الناس قالوا انؤمن كما آمن السفهاء....) بە ئیماندار ئەڵێن سەفی پێی ئەڵێن کەم عەقڵ پێیان ئەڵێن نەفام واتە هەلپەرستن تیۆرێکی هەڵپەرستان هەیە کێ دەسەلاّتی هەبێ لەگەڵ ئەوەدان، کە دێنە لای ئیماندار دەڵێن ئێمە لەگەڵ ئێوەداین (قالوا أمنا، وإذا خلوا إلى شياطنهم، قالوا إنا معكم نما نحن مستهزؤن....) وە هەمیشە گاڵتە بە دین دەکەن، بەلاّم بە نهێنی، هۆکاری هیدایەت وەرناگرن خوای گەورە سوورەتێکی بەناوی ئەوانەوە ناوناوە (المنافقون) ئینجا سورەتێکی تر کە (براءة)ە، سوورەتی (التوبە) چەندین ناوی هەیە، یەکێ لە ناوەکانی (الفاضحە)یە ئابڕوویان ئەبات بە ٨٠ ئایەت، لێرەدا ئەبێ بزانین ئەمە دووڕوویيە گەورەکەیە، لە هەموو کۆششی حەزرەتی روسول الله (د.خ) لە مەککە یەك دووڕوو نەبوو، دووڕوویی لە مەدینە دروست بوو، پیاوێك ناوی (عەبدوڵلاّی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) بوو یەکێ بوو لە کەسایەتییەکانی شارۆچکەی یەثرب بڕیار بوو کە بیکەن بە سەرکردە تاج بکەنە سەری لەو کاتەدا بوو کە پێغەمبەر (د.خ) کۆچی کرد بۆ یثرب کە پاشان ناویان نا مەدینەی مونەوەرە. دەوڵەتی ئیسلامی تیا

دروست کرد، ئەو پیاوە لێرەدا بیری کردەوە کە ناتوانێ دژ بە ئیسلام بوەستێ وە پێغەمبەری خوا (د.خ) حەکیمانە حەلیمانە وە رەحمیانە تەصەرووفی کرد لەگەڵ هەموو توێژەکانی ئەو گەلە لەگەڵ جوولەکەکاندا پەیمانی بەست کە ئازدن لە عیبادەتی خۆیان ئازادن لەکاری ئابووری خۆیانا، بەڵام ئەبێ دیفاع کەن لە شارەکە ئەگەر هاتوو دوژمنان و داگیرکەر هاتنە سەریان هەروەها لەگەڵ بێ باوەڕانی ئەو دەوروبەرە (غطفان و هوازن) لەگەڵ ئیمانداری ناو دەستووری (إنما ألمؤمنين ألأخوة)یان جێبەجێ ئەکرد کە ئەو کۆچەریە ئەبوو بە برای ئەنصاریەك ئەگەر دووخانووی هەبوایە یەك خانووی هەبوایە نیوەی ئەدا بەو، باخچەیەکی هەبوایە نیوەی ئەدا و چی سەروەت و سامانی هەبوایە دابەشی دووی ئەکرد تا ئایەتێ نازڵ بوو کەرێی لەو میراتیە ئەگرت یەعنی تا ماوەیەك میراتیان بەر یەك ئەکەوت بەم جۆرە هەمووی بە پەیمان و بە رێکەوتننامە وەزعەکەی چاککرد، بەڵام لێرەدا کێشەکە لە نێوانی کێ و کێدایە؟

لە بەینی ئیمانداران و ئەو کۆمەڵە دووڕوومیە کە پەیدا بوو بوون کە ناتوانن دژ بە ئیسلام بوەستن سەیرم لەوە لێ دێ لە ئاسمانەوە خوای گەورە ناوی منافقەکانی بە ئەمینی ئاسمانا ئەنێرێتە خوارەوە جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) ئەی محمد فلأن موناففقە فیسار کەس موناففقە ناوەکانیان ئەوەیە وە نیەتەکانیان بە درێژی بۆ پێغەمبەر (د.خ) بەیان کرا، پێغەمبەریش (د.خ) حوزەیفەی کوڕی یەمانی هەڵبژارد ئەیوت ئەمە ناوەکانیانە با بیرمان نەچێت و بەکەس مەڵێ کەچی هیچ هەڵوێستێکی خراپی نەبووە لەگەڵیاندا، رۆژێك لە رۆژان پێغەمبەر عەزێتی موناففقێکی نەداوە کە سەرۆکی وڵاتەکە بووە هەموو دەسەڵاتێکی بەدەست بووە، تاگەیشتە ئاستێك کە (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) ناماقوڵییەکی زۆر گەورەی کرد کفرێکی گەورەی کرد کە قورئان باسی ئەکات (لئن رجعنا إلى

المدينـة ليخـرجن ألاعـز منهـا ألأذل) بـا بگەڕێینـەوە شـار وا ئەکـەین و وا ئەکـەین قسەیەکی ناشیرینی وت کوڕەکەی خۆی ئـەویش نـاوی (عەبـدوڵڵا)یـە (عەبـدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوری ئوبـەی) هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر (د.خ) وتـی یارسـول ألله بـاوکم منافقـە ئەگـەر بڕیـار ئـەدەی بـۆ کوشـتنی بـە مـن بڵـێ مـن ئـەیکوژم، بـا بێگانەیەك باوکم نەکوژێ وتی نا شتی واناکەین با عـەرەب نـەڵێ (محمـد) هاوڕێـی خۆی ئەکوژێت بەم نەوعە دەستورێکی بۆ دانـاین پێغەمبـەری خـوا (د.خ) کـە تـا ڕۆژی قیامەت موسڵمان بۆی نییە بە جەماعەتێك بڵێ ئێوە منافقن و بـا لـەناوتان بەرین بۆئەوەی ریزەکانی ناو کۆمەڵگا تێك نەچێت باهەر لـەناومان بـژین بەشکو خوای گەورە ئیصلاحیان بکات ئیقامەی حەدی لەسەر هیچیان نـەکردووە، لـەکاتی جیهادا نـەهاتن، یارسـول ألله ژنەکـەم نەخۆشـە، یارسـول ألله کوڕەکـەم تـەواو نییـە، یارسـول ألله بـیرم چـوو خـەوم لێ کـەوتبوو بـە پێکـەنین و زەردەخەنـەوە هـەموو عوزرەکانیان قبووڵ ئەکردن، بەڵام سێ ئیمانـداری راسـتەقینە نەچوون بـۆ غـەزا (وعلى الثلاثة الذين خلفوا) فـەرمانی کـرد بـە هـەمو مووسـڵمانان قسـەیان لەگـەڵ نەکەن ئەمری کـرد خێزانـەکانیان لایـان نـەبن سـزایەکی زۆری وای دان (٥٠) دانـە ڕۆژ، هەتا خوای گەورە لە ئاسمانەوە عەفووی کردن، چونکە ئەمانە جیـان ئەمانـە ئیمانداری راستەقینەن نابێت شتی وا بکەن، بەڵام ئەوان ئەگـەر بـچین بـۆ غـەزا و لە نیوەی رێگا ئەگەڕێنەوە، سیفاتی تریـان تێدایـە (يرائـون النـاس) (وإذا قـاموا الى الـصلاة قـاموا كـسالى) نوێـژەکانیان بـە تەمـەڵی ئەکـەن نوێـژی عیـشا و نوێـژی بەیانیان نایـەن بـۆ مزگـەوت (ولا يـذكرون الله إلا قلـيلا) کـەم زیکـری خـوا ئەکـەن بەڵام هەوڵئەدەن ئەو کردارە چاکەی کە ئەیکەن خەڵك ببینێ، کە ئەمـە سیفاتی ئیمانـدار نییـە، مەسـەلەی ریـا بەشـێکی سـەرەکییە هۆیـەکانی دووڕوویـی.. فەرموودەیەکی پێغەمبـەر هەیـە (د.خ) ئەفـەرموێت لـە ڕۆژی قیامەتـدا سێ جۆر

خەڵك دێنە مەحکەمەی خوای گەورە یەکێکیان (شەهیدە) پێی ئەڵێت تۆ چیت؟ ئەڵێت خوایە من ژیانی خۆمم بەخشی لەپێناو دینەکەتدا، خوای گەورە پێی ئەفەرموێت درۆت کرد! تۆ خۆت دا بەکوشت نیەتت ئەوەبوو پێت بڵێن بەخوا ئازای بەخوا پیاوێکی بەجەرگ بوو حەزت لەوە ئەکرد، ئەوە نیەتەکەت بوو (وقد قیل)وە وتراش ئەوە بۆ من نەبووە ئەوە خۆت داوە بە کوشت بۆئەوە دەبرۆ بۆ دۆزەخ جۆری (دووەم) (ئینسانێکە خێرکەرە) گفتوگۆ ئەکات لەگەڵ (رب العالمین) ئەڵێ خوایە ئەو سامانەی دابووت پێم بە چەپ و بە راست ئەمدا بە فەقیر و هەژار لەپێناوی تۆدا، خوای گەورە پێی ئەفەرموێت درۆت کرد! ئەو پارانە ئەتدا بە فەقیر و هەژار بۆئەوەی پێت بڵێن بەخوا خێر کەرە وە دواتریش (وقد قیل) پیاوی چاکە حەزت لێ ئەکرد ئەوە نیەتەکەت بوو، ئەوە بۆ من نەبووە فەرموو برۆ بۆ جەهەنەم، جۆری سێهەم (زانای ئایینیە) ئەڵێ ئەی خوای گەورە ژیانی خۆمم سەرف کرد لەپێناوی شەریعەتەکەتدا وە لەپێناوی گەیاندنی شەریعەت، خوای گەورە ئەفەرموێت درۆت کرد! نیەتت ئەوە بوو پێت بڵێن بەخوا زانایەکی گەورەیە بەخوا تێگەیشتووە، بەخوا رۆشنبیرە، بەخوا عالمێکی بەرزە، حەزت لەوانە ئەکرد و (وقد قیل) وە وتراش فەرموو برۆ بۆ دۆزەخ، ریا بەشێکە لە دووڕوویی ئاوا کردار ئەسوتێنێ، جاری واهەیە شێوازێکی زۆر ئایینی وەرئەگرێ یەکێ لە خەلیفەی ئومەوییەکان (صالح) بوو ئەوان هەمویان صالح نەبوون، بەڵام ئەمەیان (صالح) بوو وتاری جومعەی ئەدا لەسەر مینبەر یەکێ لە هاوڵاتیان، یەکێ لە عەوامی خەڵك پێی وت (إتق الله یا رجل و إلا قومناك بحد السیف) وەختی خۆی بە حەزرەتی عومەریش ئاوها وتراوە.. پێی وت ئەی مرۆڤ لەخوا بترسە ئەگینا بە شمشێر راستت ئەکەینەوە قسەی نەکرد دوای وتارەکە ناردی بە شوێنیا وتی: کاکە، فلان کەس پێش من حوکمی ئەکرد زوڵمی ئەکرد وای کرد و

وای کرد فیسار کەس پێش ئەوە بوو دیسانەوە ئەوە پوخڵەواتەکانی بوو جەنابت بۆ ڕۆژێ لە ڕۆژان دژی نەوەستای، چونکە چاوی دەرئەهێنای، بەڵام ئێستا دڵنیایت کە من پەنجەت بۆ نابەم زیانت پێ ناگەیەنم هاتووی زمانت درێژ ئەکەیت و نیهانەی من ئەکەی و خۆت بە ئیماندار ئەزانی ئەمە ریایە ئەگەر ئازا بوویتایە وەختی خۆی بت کردایە.. ریا ئاوا لە ئینسان ئەکات دووڕوویی ئاوا لە ئینسان ئەکات، ئێستا بێینە سەر ئەوەی کە ئینسان بۆچی؟ هۆکار چییە دەبێتە دووڕوو؟

١- هۆکار ئەوەیە غافڵە لە عەیب و عاری خۆی مەشغوڵە بە عەیب و عاری خەڵکەوە ئەیخاتە ژێر زەرەبینەوە.

٢- مراقەبەی خوای گەورەی بیرچۆتەوە، مەحکومە و محاسەبەی خوای گەورەی بیرچۆتەوە.

٣- هاوڕێی خراپی لەگەڵدایە ئەنجا چاکەی خەڵك ناخوێنێتەوە، ئەمانە وا لە ئینسان ئەکا بەرەو دووڕوویی بڕوا، بەڵام ئەگەر هاتوو عیلاجی ئەم حاڵەتەی کرد بەچی؟ بە مەشغوڵ بوون بە خۆیەوە بە عەیب و عاری خۆیەوە، چونکە ئەگەر ئینسان بگەڕێ بەناو زوڵمەتی نەفسی خۆیا ئەبینێ چ وێرانەیەکە ئینسان بگەڕێ محاسەبەی خۆی کا لەحزەیەکی نامێنێ تەماشای عەیب و عاری خەڵك کا، وە هەوڵ بدە کە هاوڕێی خراپت نەبێ، بیر بکەرەوە لە مەحکەمەی خوای گەورە، مەعنای ئەوەیە کە دڵەکەت پاك کردۆتەوە شایستەی ئەوەیە کە نووری ڕقابەتی خوای گەورە بێتە دڵتەوە ئەوە نووری (محەبەتە) ئەو نووری محەبەتەی خوای گەورەیە کە هاتە دڵتەوە سێ سەرچاوەی فەساد هەیە لەدڵدا هەرسێکی وشك ئەکات کە بریتین لە:

١- (أنانیەت) واتە خۆ ویستی.

٢- حەسودی.

٣- بوغز و كينه.

ئەگەر ئـەم سيانە نـەمێنن كۆمـەڵگای ئينـسانی ئەبێتـە زۆر شتێكی رێـك و پێـك، ئيتر ئەو دڵە شايستەی ئەوە ئەبێ كە نووری خوای گەورە، يەقين، محەبەتی خوای گەورە بێتە ناو دڵەكەوە، لە فەرموودەيەكی پێغەمبەردا (د.خ) ئەفەرموێت (إني لا أخاف على أمتي مؤمنا ولا مشركا، اما المؤمن فيحجزه إيمانه، و أما المشرك فيقمعه كفره، ولكن أخاف عليكم منافقا عليكم اللسان يقول ما تعرفون، و يفعل ماتنكرون) ئەفـەرموێت ناترسـم لـەدوا رۆژدا ئيمانـدارێك عـەزێتان بـا ياخود بـێ باوەڕێك عەزێتان با (فأم المؤمن فيحجزه إيمانه و اماالمشرك فيقمه كفره) ئيمانـدار خۆی ئيمانەكەی مەنعی ئەكا كە زەرەر با لەگەل و نيشتمانەكەی و كافريش خـۆی فصح ئەبێ لە منافقێك ئەترسم زمان لـوس هـەڵتان خەڵەتێنێت ئينحرافتـان پـێ دروست بكات.

## باسی هەژدەهەم

## بەخشین لە ئیسلامدا

تەنها بەخشندە خوای گەورەیە کە ئەیبەخشێت بێ بەرامبەر هەر لە نەبوونی سەرەتاوە خوای گەورە سیفاتی کەمالی هەبووە (العاطی، المعطی، الوهاب، الغنی، الصمد) خوای گەورە پێش ئەوەی مەخلوقات دروست بکات پێش ئەوەی ئینسان دروست بکات، لە زاتی خۆیدا کەریم بووە، وەهاب بووە رەزاق بووە، بۆیە لە عەقیدەماندا ئەڵێین (الخالق بلاحاجة) ئێمەی دروست کردووەو پێویستی بە ئێمە نییە خوای گەورە (صمد)ە صمد یانی چی؟ یانی هەموشتێك پێویستی بە ئەو هەیە، وە ئەو پێویستی بە هیچ شتێ نییە ئەمری پێ کردووین (سبحانە و تعالی) کە ببەخشین ئەبێ خێر بکەین ئەم خێرەش ئەکرێت بە دوو بەشەوە بەشێکی ئەچێتە سنوری فەرزەوە، ئەچێتە حوکمی زاتەوە، ئەو بەشە ئەگەر بە باوەڕ بە عەقیدە باوەڕی پێ نەکەیت کافر ئەبیت.

زەکاتت لەسەر بێ وە یاخود نیمات پێی بێ و نەیکەیت ئەوە کبائیرێکت کردووە، مەرجەکانی خێر کردن:

یەکەم: کەلە خۆت زیاد بێ لە ماڵ و منداڵت زیاد بێت، خوای گەورەش شتێکت لێ داوا ناکات کەلە دەسەڵاتتدا نەبێ، ئەوەی کە زیادەلێت وە زیادە لە ماڵ و منداڵت، ئەوەت لێ داوا ئەکات ئەڵێ ئەوەی داوومە پێت بیدەن بە فلاَن و فلاَن.

دووەم: ئەوەیە کە مەبەستت تەنها خوای گەورە بێت لەبەر ریایی نەبێ لەبەر شتێکی دنیایی نەبێت لەبەر هیچ هۆیەك نەبێت تەنها لەبەر رەزامەندی خوای گەورە نەبێت.

سێیەم: کۆمەڵێک ئاداب و ڕەوشتە إن شاء ألله وردە وردە باسیان ئەکەین، واتە خێر کردن تەکلیفی خوایە خێرکردن پێوەرێکی ئیمانییە جارێکی دیکە بۆم باس کردوون وتم هاوکێشەیەکمان هەیە لە بەینی ئیمان و کردەوەی چاکدا کە کرداری چاکە ئەکەیت هەست بە شیرینییەکەی ئەکەیت لە دڵتا ئیمانت بەرز ئەبێتەوە یان ئیمانت بەرز ئەبێتەوە بە ڕشتنی دوو تنۆک فرمێسک لە کاتێکدا خەڵک نووستووە بە تەوبە و ئیسغفارێک بە کتێب خوێندنەوەیەک، بە بیرکردنەوەیەک کە ئیمانەکەت زیاد ئەبێت پاش ماوەیەک هەست ئەکەیت پاڵت پێوە ئەنێت بەرەو کرداری چاکە، ئیمان بەرز ئەبێتەوە کرداری چاکە لەگەڵیدا بەرز ئەبێتەوە، چی بکەین؟ ئەم ئیمانە بخەینە ناوەرۆکی دڵمانەوە، چی بکەین کە کێوێک لەم ترسی خوای گەورە و هەیبەتی خوای گەورە بخەینە نێوان خۆمان و نێوان و مەعسیەتی خوای گەورە، خوای گەورە باسی پێغەمبەرێک ئەکات ئەفەرموێت (إن أحببت حب الخير) چۆن وامان لێبێت کە عاشقی کرداری چاک بین، وامان لێبێت کە شیرینی ئیمان هەست پێ بکەین، هەست بە نزیکی ڕەحمەتی خوای گەورە بکەین.

بە هەزاران گۆڤار و پەرتووک دەبینین لەسەر پاکیزەیی لەش و پاکیزەیی جل و بەرگ، بەڵام تاکە تاکە کتێب دەبینی باسی پاکژبوونەوەی دڵ و دەروون دەکات.. بەداخەوە ئەو بایەخەی دراوە بەو دیاردەیە نەدراوە بەو ناوەڕۆکە.. ئەمرۆ زۆر پێویستمان پێیە هەرکەسێ کە ئەرکی ڕێگەی بانگەوازی خستۆتە ئەستۆی خۆی، ئەبێ بزانێ ئەگەر دڵی پاک نەبێ و دەروونی پاکیزە نەکردبێتەوە لە ئیشەکەیدا سەرکەوتوو نابێت، خێر کردن لە حەقیقەتدا بریتییە لە پاککردنەوەی نەفس هیچ ڕێگەیەک ناهێڵێتەوە کە شەیتان زەفەرت پێ بەرێت وە بەرەو دەرچوون لە هەستی مرۆڤانە بتبات، کەواتە نزیکت دەخاتەوە لە هەستێکی ئاژەڵی، وە هەموو ئاژەڵێکیش ڕەزیلە، ڕەزیلی سیفەتی ئینسانی ڕێک و پێک نییە، ڕەزیل و چرووک

بۆنی بەهەشت ناکات، هەمو ونایەتەکانی ئینفاق لێکبدەرەوە ئەیانەوێت ئەو ڕێگایانە دابخەن بەرامبەر شەیتان دڵت نەبەن بەرەو ڕەزیلی واتە سوودی خۆمانی تیایە، خۆمان کە سوود وەردەگرین دڵمان پاك دەبێتەوە.. پلەمان لای خوای گەورە بەرز دەبێتەوە، تێشوویەك ئامادە دەکەین بۆ قیامەت جگە لەمانەش یارمەتییە بۆ ئەو کەسانەی کە دەسەلاتیان کەمە ناتوانن پێداویستی خۆیان دابین بکەن، خوای گەورە ئەفەرموێت (وما تنفقوا من خير يوف إليكم) الله ئەم ئایەتە چەند گەورمیە خێر بەشێوەی (نکرە) هاتووە، بەشێوەی مطلق (ولا تظلمون فتيلا) زەرڕەیەك خیانەتت لێ ناکەم، مافی خۆت بە تەواوەتی دەدەمێ، بەڵکو لە ئایەتی تردا خوای گەورە ئەفەرموێت (و الله يضاعف لمن يشاء) بەڵکو بە چەندین جار پاداشتت ئەدەمەوە، خوا ئەفەرموێت لە ئایەتێکی تردا (وما تنفقوا خير فلأنفسكم) هەچ خێرێ دەکەن بۆ خۆتانە، خوای گەورە پێویستی پێی نییە، بۆ خۆتانە واتە (ئەی بەندەکەم ئەوەی پێم داویت و لێت زیادە بیدە بە فلآن با هی ترت بدەمێ) لأنفسكم ئەو خێرە بۆ خۆتانە، لێرەدا تێبینییەکی گرنگ هەیە پیاو چاکان ئەڵێن: کە خێر ئەکەیت با چاوی دڵت ئەو کەسە نەبینێت، چاوی دڵت تەوجیهی کردبێ بۆ خوای گەورە، سەیری ئەو ئەحمەد و موحەمەدە مەکە خێری پێ دەکەی، با ئەو ڕەسمەی نەیەتە دڵتەوە، چونکە زۆرجار ئەو کەسانەی کە تۆ خێرت لەگەڵدا کردوون تەماشا دەکەیت بێوەفا دەردەچن، سپڵە دەردەچن زۆر عەزێتی دڵت ئەدەن، بەلآم ئەگەر ئەو ڕەسمەت نەخستبێتە دڵتەوە و تا بەیانی خراپ بێ لەگەڵت بایەخی پێ نادەیت، چونکە بۆ خوات کردووە ئەم ئیستنباطی پیاو چاکانە لەو ئایەتەی کە دەفەرموێت (وما تنفيقوا إلا إبتغاء وجه الله) هەرچی سەرف ئەکەن هەرچی خێر بێت کە ئەیکەن خالصەن بۆ خوا بێت (إلا) ئامرازی (حصره) تەنها ئەبێت بۆ خوابێ لەلایەکی ترەوە، ئەو کردارە چاکەی کە

کردوومته قەت شانازی پێوه مەکه، چونکه لەلات نەماوه ئەگەر خالص بێت بۆ خوای گەوره ئەوا لەئەرزا نەماوه، خوای گەوره ئەفەرموێت (والعمل الصالح یرفعه) کرداری چاکه بەرز دەکاتەوه و دەیخاته بانکی قیامەتت، لەو دنیا ئەیداته دەستت، سەر فرازییه، رو سورییه، بۆ ئەو دنیات.. کەواته نەخەڵەتابی باسی کرداری چاکەت بکەیت، یەکێ لە سیفاتی ئیمنداری راستەقینه ئەوەیه، رووی نایەت باسی چاکەکانی بکات، ئینجا باش بزانه دوو پەیمانت لەبەردەمدایه یەکێکیان پەیمانی شەیتانه کە قورئان باسی ئەکات (الشیطان یعدکم الفقر) شەیتان ناهێڵێت خێر بکەیت، ئەڵێ هەژار دەبیت ئەم چەند هەزارەی کە داتناوه، ئەگەر ئەمەندەی لێ سەرف بکەیت، کەم دەبێتەوه بۆ دواڕۆژ ئەی منداڵەکانت، ئەی پێداویستی منداڵەکانت ئاوا بەناوی نەخشەی دوا رۆژەوه بۆت دێت ناهێڵێت خێر بکەیت، هەمیشه ئەترسێنێت بە هەژاری، پەیمانێکی رەحمانیشمان هەیه کە پەیمانی خوای گەورەیه ئەفەرموێت (و الله یعدکم مغفرة منه وفضلا) خوای گەوره پەیمان و مژدانەی چی پێ ئەدات؟ لێت دەبوورێت لێت خۆش دەبێت وه بە بەردەوامی فەزڵ و منەت و بەرەکەتی دڕژێنێ بەسەرتا. ئایا تۆ لە بەینی ئەم دوو پەیمانەدا کامیان هەڵدەبژێری،؟ تەنها ئەگەر تەماشای ئەم دوو وەعده بکەیت بەیەك چاو بێ ئیمان دەبیت، هەر ئەبێ وەعدی شەیتان فەرامۆش بکەیت، چونکه خوای گەوره لەو رۆژەدا کە شەیتان بە قسەی خوای گەورەی نەکرد و رێزی نەگرت لە ئادەم لەو رۆژەو دووژمنی ئێمەیه هەتا رۆژی قیامەت بە هەمیشەیی، خوای گەوره ئەفەرموێت (إن الشیطان لکم عدو فاتخذوه عدوا...) شەیتان دوژمنتانه دوژمنی باوکتان بووه، دومنی ئادەم بووه و وه بە دوژمنی ئەمێنێتەوه، ئێوەش حسابی دوژمنی بۆ بکەن هەمیشه خراپی لێ چاوەڕێ بکەن، چونکه (فاتخذوه عدوا....) ئەمره، کە ورد ئەبینەوه لە ئایەتی خێر کردن ئەبینین هەر

هەمووی چارەیە بۆ نەفسی ئینسان هەرهەمووی دەرمانە، هەرهەمووی ویقایەیە کە ئینسان نەڕوات بەرەو (اسفل السافلین) چروکی و. ..هتد، لە فەرمودەیەکی پێغەمبەردا (د.خ) دەفەرموێت (ثلاث مهلکات شح مطاع وهوی متبع وإعجاب المرء بنفسه) سێ هۆکار هەیە کە دەبێتە خەسارەت مەندی ئینسان لە دونیا و لە قیامەتدا بەرەو تەهلوکە دەیبا یەکەمیان (شح مطاع) رەزیلی کە بەردەوام رەزیل بێ، دووەمیان (هوی متبع) شوێن کەوتنی ئارەزووی خۆت، سێیەمیان (إعجاب المرء لنفسه) واتە مرۆڤێك هێندە لە خۆی رازی بێت، سەری لەخۆی سوڕ بمێنێت و گوێرەشی خەڵك نەگرێت و رێیان بۆ دانەنێت، ئیماندار لەگەڵ بێ باوەڕدا لە جیهانی هۆکاردا یەك دەگرنەوە ئیمانداری کاسبکار وەبێ باوەڕی کاسب کا رهەردووکیان لەیەك مەیداندا ئیش ئەکەن جوتیار و کشتیار باوەردار و بێ باوەڕ، هەردووکیان دێن یاسای کشتوکاڵ جێبەجێ دەکەن، لە هەموو بواری هۆکاردا لەیەك دەچن، بەڵام جیاوازییەکەیان ئەوەیە ئیماندار ئەبێت ئیش بکات بەگوێرەی توانای خۆی نەك بە گوێرەی پێویستی خۆی، بەڵام بێ باوەڕ بەگوێرەی پێویستی خۆی ئیش ئەکات، تۆ رۆژی (٦٠) دینار پەیدا دەکەیت، بەڵام پێویستیت بە (٣٠) هەیە، ئەو زیادەیە ئەبێت بیدەی ئەو کەسانەی کە توانایان نییە، بەڵام بێ باوەڕ هەمووی بۆ خۆیەتی بێ باوەڕ شیوێ ئاڵتونی بەرێ داوای شیوێکی تر دەکات، ئەگەر یەکێکیش پرسیارێ بکا بڵێ باشە ئێمە چ پێویست دەکات بەخێویان بکەین تۆش لە وەڵامدا بزانە کە ئەبێ وەڵامێکی ئیمانیت پێ بێ، ئینسان کە سەیری دەوروبەری خۆی ئەکات، کۆمەڵێ خەڵك ئەبینێت کە توانایان کەمترە لەوانەی تر یان بەهۆی پیرییەوە یان بەهۆی بێ کارییەوە، قورئان ئەفەرموێت (للفقراء الذین أحصروا) باسی هەژاران دەکات کە ئابلۆقەیان لەسەرە لە زمانی عەرەبیدا (حصر)مان هەیە و (أحصر)مان هەیە جاری وا هەیە هۆکارەکە زاتییە

وەك: نەخۆشی، پیری جاری واش هەیە فاکتەرەکە دەرەکییە، سیستمەکە ناهێڵێت ئیشەکە بکەن یان ئیش نییە. دووکەس نەیانەوێت کشتوکاڵ بکەن، هەردووکیان بێ تاوانن، یەکێکیان نەخۆشە یەکێکیان ناهێڵن بچێت ئیش بکات، ئەمانە پێیان ئەوترێ (العاجز) یەعنی بێ دەسەڵات و بێ تاوان، ئەی کێ یارمەتی ئەمانە بدات؟ ئەمانە ڕێژەیەکی زۆرن لە کۆمەڵگا، برامانن دایکمانن باوکمانن ئینجا ئەو کەسەی ئەڵێ خوا بۆچی وای لێکردوون؟ بۆچی ئێمە یارمەتییان بدەین؟ زۆر گرنگە لە ڕاستی فەلسەفەی خێر تێبگەین، ویستی خوا تێبگەین، لەو ڕۆژەی فریشتە نازدارەکان سوجدەی ڕێزیان برد بۆ حەزرەتی ئادەم ئەو سوجدەیە بەردەوام تا قیامەت درێژەی هەیە، مرۆڤ ڕێزدارترین مەخلوقی خوای گەورەیە، واتە هەموو مەخلوقێ لەو نزمترە و خوای گەورە ئاماژەی بۆ سودی ئەو ئینسانە بۆ بەرژەوەندی ئەو ئینسانە کردووە (وسخر لكم مافي السماوات وما في الأرض جميعا منه) هەندێ ئامادەکردنەکەی گەیشتۆتە ڕادەی زەلیلی (وذللناها لهم فمنها ركوبهم و منها ياكلون) فیلی زەلیل کردووە بۆ ئینسان منداڵێکی (١٠) کیلۆیی شەش ساڵێك جڵەوی مانگایەك ڕائەکێشێ ٦٠٠ – ٧٠٠ کیلۆیە.

خوا ڕامی کردووە، خزمەتی ئینسان لە فیلما ئەبینی منداڵێ فیلێك ڕائەکێشێ (٥،٤)تەن و نیوە هەندێکیان (٥) تەنە لە هیندستان بەعزێکی بەکاری دەهێنێت وەك شۆفڵ و بلدۆزەر شتی پێ دەگوێزێتەوە، خوای گەورە زەلیلی کردووە بۆ ئەم ئینسانە، هەموو شتێك لەم جیهانەدا سوننەتێکی بۆ داناوە خوای گەورە کلیلەکەی داوەتە دەست تۆ، ئەمە کێڵانە ئەمە تۆو کردنە، ئاودانە، بژارکردنە، ئەم هۆکارانە بەکار بهێنە، بەرهەمت ئەداتێ لێت ناپرسێت تۆ کێیت، چونکە کلیلەکەی بەڵام ئایا کە ئەو کلیلەت پێ بوو ئەبێ شعورت وابێ کە تۆ ئەصڵی لە کەونا! کە تۆ خالقی (نعوذ بالله) خوای گەورە ئەیەوێ تووشی ئەو دەردە نەبی کە پێی

دەوترێت فیرعەونیەت (إن ألإنسان لیطغی) کەی؟ چ کاتێ؟ (أن رآه أستغنی) ئینسان تووشی طغیان دەبێت تووشی زوڵم دەبێت لەکاتێکدا شعور دەکات دەڵێت من کەسم پێویست نییە، سەروەتەکەم ئەوەندەیە موڵکەکەم ئەوەندەیە، ئەوەندە کوڕم ئیتر.. دڵی خەڵك عاجز دەکات، چونکە دەڵێت من پێویستم بە خەڵك نییە، جا بۆئەوەی ئەو دەردەی تووش نەبێت هەمیشە جار بەجار کلیلی لێ ئەسەنرێتەوە تۆزێك بیر بکەرەوە. . (و خلق ألإنسان ضعیفا) خوای گەورە ئینسانی بەو لاوازییە دروست کردووە، بەلاّم کاتێ هێز و دەسەلاّتی ئەداتێ ئەوە منەتێکی خوایە نیعمەتێکی خوایە ئەبێت بزانێت بۆچی؟ خوای گەورە بۆچی دەستی یان قاچی لە فلاّنەکەس سەندۆتەوە هەرچەندە لە من پیاوترە لەمن زیرەك ترە لە من خانەدانترە، ئەبێت بیر بکەمەوە منیش ئەمەی کە هەمە کتوپڕ لێم ئەسەنێتەوە، ئەمە حیکەمەتێکی تیایە بۆئەوەی ئینسان کە هەرگیز تووشی غرورو نەبێت، زوڵم لە برای خۆی نەکات خۆی رانەوەشێنێت بە سەریدا، لەبەرئەوە ئادابی ئینفاقیش ئەوەیە ئەو خێرە کە ئەیکەیت بە هیچ شێوەیەك نابێت شعوری بریندار کەیت، پێغەمبەر (د.خ) هەڵسوکەتێکی کرد لەگەڵ هاوەڵێکدا!!

حەز دەکەم بیگێڕمەوە بۆتان هاوەڵێك هەبوو ناوی (عەبدوڵلاّی کوڕی حەرام) بوو ئەمە لە شەڕی (ئوحودا) شەهید کرا کوڕێکی بەجێهێشت ناوی (جابر) بوو، کوڕێك و حەوت کچ یان کوڕێك و نۆ کچ، وە قەرزاریش بوو، پێغەمبەر خوا ویستی خزمەتی ئەو کوڕە گەنجە بکات، بەلاّم ئەیزانی کە بنەماڵەیە و پارە وەرناگرێت، بۆئەوەی شعوری بریندار نەکات بە موعجیزەیەك قەرزەکانی بۆ دایەوە وتی یارسول ألله ئەو خورمایەی کە هەمانە بەشی قەرزدانەوەی دوان ئەکات، بەلاّم ئەمان ١٨ کەسن، پێغەمبەریش فەرمووی تۆ بیهێنە سەر حەسیرێك هەموویان کۆبکەرەوە منیش بانگ بکە با لەبەرچاوی من خورماکەبەرنەوە، ئیتر

به سەرە هەموو قەرزەكانی خۆیانیان بردەوە، خورماكە وەك خۆی مایەوە، ئەمە جارێ خۆراكێكی بۆ دابین كرد سەفەرێكیشیان كرد بەیەكەوە، حوشترەكەی جابر لاواز بوو باش نەئەڕۆی فریای كاروانەكە نەئەكەوت پێغەمبەر (د.خ) هات ئاوا دارێكی بە هێواشی لێدا و ئیتر بوویە یەكەم حوشتر ئەوان فریای نەئەكەوتنەوە لە ڕێگادا پێغەمبەری خوا فەرمووی: جبر ئەمەوێت ئەو حوشترەت لێ بكڕم ئەویش فەرمووی پێغەمبەری خوا با هەدیە بێت وتی: نا نا.. بڕێك پارەی پێدا كە زۆر زیاتر بوو لە نرخی حوشترەكە، بۆئەوەی هیلاك نەبێ فەرمووی: لە مەدینە بمدەرێ كە گەیشتنە مەدینە حوشترەكەی دا بە پێغەمبەر (د.خ) جا دوایی بیری كردەوە ئەمانە بنەماڵەن هەر هەیان بووە چۆن ئەمڕۆ یەكێ هەیە سەیارەی هەیە لەپڕ نایمێنێ حاڵەتەكە سروشتی نییە، پێغەمبەری خوا ئینجا حوشترەكەی بۆ كردە دیاری، سەیری ئەم هەڵوێستە جوانە بكەن ئاوا راستەوخۆ پارەی نەدایە، چونكە وەری ناگرێ ئەمە هەمووی ئادابی خێر كردنە، قەت منەت نەكەی وە نەڵێی ئەمە چییە بەم نیوەڕۆیە هاتووی لە دەرگا ئەدەیت و قەت مەقیڕێنە بەسەر سواڵكەردا خوای گەورە ئەفەرموێت (قول معروف ومغفرة خیر من صدقة یتبعها أذى) وشەت شیرین بێ لەگەڵ ئەو كەسەی كە سواڵت لێ ئەكات و داوای لێ بوردن بكە، خێری زیاترە لەوەی كە پارەی بدەیتێ و بقیڕێنی بەسەریا، یتبعها إذى، باشترە لە خێرێك كە بیكەی دوای ئەوە عەزێتی لەگەڵدا بێت وكابرا هەموو دەقەیەك پێی بلێتەوە.. منەتكەر دوورە لە بەهەشت بیشزانە ئەو نیعمەتانەی كە خوای گەورە داویەتی پێت هیچ هەوڵ و قوەتێكی تۆی تیا نەبووە، خوای گەورە ئەفەرموێت (ماعندكم ینفد وما عند الله باق) ئەوەی كە لەلاتانە نامێنێ هەر ئەوەی لای خوای گەورە ئەمێنێ، مەڕێكیان هێنا بۆ حەزرەتی رسول ألله (د.خ) لەماڵ نەبوو بەخێر بۆیان هێنا حەزرەتی عائیشە (رەزای خوای لەسەر

بێ) دابەشی کرد بەسەر فەقیر و هەژارا کەمێکی هێشتەوە کە پێغەمبەر تەشریفی هێنایە ماڵەوە بۆی گێڕایەوە وتی بەس ئەمە ماوە، پێغەمبەر فەرمووی بەس ئەمە نەماوەتەوە هەموی بۆ ئێمە خێرە و نووسراوە، ئەمە نەبێ، کرداری چاکە شەو ورۆژی بۆ نییە، ئاشکرا و نهێنی بۆ نییە، راستە شتی نهێنی باشترە، بەلآم جاری واهەیە ئینسان ئەیەوێ لەناو خەڵکدا خێر بکات شەیتان پێی ئەڵێ ئاخر ئەمە ریایە بەم جۆرە دوای ئەخات بۆی (یعدکم الفقر) دوای ئەوە وات لێئەکات کە خێرەکە نەکەی، هەتا کێ ئەڵێ ئەمێنێ جا خوای گەورە مەدحی ئەو ئیماندارانەش ئەکا، (الذین ینفقون) یانی ئەوانەی کە سەرف دەکەن و خێر دەکەن (أموالهم باللیل و النهار سرا وعلانیة فلهم أجرهم عند ربهم) شەو ورۆژمان بۆ نییە ئاشکرایە وەك (إمامی أحمد بن حمبل) رەحمەتی خوای لێ بێت. . کە بە ئاشکرا بە دەنگی بەرز دینارێکی کردوو بە خێر دیناری (١٠) درهەمی زیوە کە لێیان پرسیوە بۆچی وا بە ئاشکرا؟ وتی: بۆئەوەی ئەو دەوڵەمەندانە گوێیان لێ بێ (أحمد بن حمبل)ی فەقیری هەزار دیناری ئەکا بەخێر بۆئەوەی ئەوان غیرەتیان بجولێ هیچ نەبێ سەر و دینار بکەنە خێر مەسئەلەی رزق تێکەڵی مەکەن لەگەڵ مەسئەلەی ئیمانا دوو شتی جیاوازن خوای گەورە کە بەخشندەیە، دوو جۆر بەخشندەیی هەیە بەخشندەییەکیان پێی ئەڵێن (عطاء ربوبیة) کە ئەمە هەموو بەدیهێنراوێك ئەگرێتەوە رزقیان ئەدا ئیتر ئیمانداره ئیماندار نییە رزقی ئەداتێ، چونکە کەس بە ویستی خۆی نەهاتووەتە ئەم دنیاوە بە ویستی خوای گەورە هاتۆتە ئەم دنیاوە، خوا کەفالەتی ئەو رزقەی کردووە، ئائەمە تێکەڵ مەکەن لەگەڵ (عطاء ألالوهیة) تایبەتە بە ئیمانداران بریتییە لە ئیمان و ئیلتیزام (الکریم لا یأکل وحده) ئینسانی کەریم بە تەنها نان ناخوات، نانی بۆ ناخورێ بەتەنها، بیستوومە چەندین کەس لەم شارەماندا، کە فامیان کردۆتەوە تاوەفاتیان

کردووه ژەمێك بە تەنها نانیان نەخواردووە، حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت.. هەرگیز بە تەنها نانی نەخواردووە، جارێکیان نانی لەبەردەمدا بوو کەسی لەگەڵدا نەبوو چاوەڕوانی کرد لە دووره ڕێبوارێکی بینی بانگی کرد پیاوێکی پیر بوو داینا و یەکسەر پەلاماری خواردنەکەی دا حەزرەتی ئیبراهیم پێی فەرموو (بسم ألله) بکە، وتی بڵێ بەناوی خوا، وتی خوا کێیە؟! من خوا ناناسم، وتی تۆ بڵێ (بسم الله) ئەمە رزقی خوایە، وتی من نایڵێم وتی دە هەستە لاچۆ دەریکرد، خوای گەورە وەحی نارد بۆ حەزرەتی ئیبراهیم، یا ئیبراهیم (٧٠) ساڵە لە سفرەی من ئەخوات و عیبادەتم ناکات و نامناسێ و تەحەموولم کردووە تۆ دەقیقەیەك تەحەمولت نەکرد لەسەر سفرەی خۆت، لەبەرئەوە ئەم دووشتە تێکەڵ نەکەین بەخشین و ئیمان.. گوناهە ئەم سیفەتە ئەمە خاڵی لاوازییە، (نقطة ضعفة) دەقۆزێتەوە (ئیستغلال) ئەکرێ لە دنیای سیاسەتدا گەلێك پرسی دەکەن ئەمە چییە؟ هەڵوێستێکی دیاریکراوی نییە.. هەڵوێستێکی هەماهەنگی زلهێزەکان،.. کۆمەڵێ هاوەڵ خزمیان هەبوو زۆر هەژار بوون لەسەر بێ باوەڕی خێریان پێ نەئەکردن، هەندێکیان ئەیان وت مەرجە ئەبێ ئیمان بهێنن ئینجا ئێمەش خێرتان پێ ئەکەین.. هاتن لە پێغەمبەریان پرسی (د.خ) ئەو ئایەتە نازڵ بوو کە دەفەرموێت (لیس علیك هداهم ولكن ألله یهدی من یشاء) ئەمە هەڵوێستێکی پێچەوانی سەلماندن مفسرین ڕاڤەی زۆریان هەیە لەسەر ئەم ئایەتە وە خیلافاتی زۆریشی لەسەر ئەڵێن کەوا مەسائیلی رزقی نابێت تێکەڵی ئیمان بێت بەشیان بدە با بێ باوەڕیش بن کەواتە سنووری ئەم دینەمان هەموو بەشەرێك ئەگرێتەوە، هەندێ کەس هەن رووی داواکردنیان نییە کە قورئانی پیرۆز مەدحیان ئەکات ئەفەرموێت (یحسبهم الجاهل أغنیاء من التعفف) ئەوەی نەشارەزاییی هەیە سەبارەت بە حاڵیان وا ئەزانێ دەوڵەمەندن بۆ؟ من (التعفف)

پرسیار ناکەن، بگەرێ بۆیان لە جومعا، لە جەماعتدا، جومعە و جەماعەت بۆ ئەوە نەکراوە شان بدەیت لە شانی تەنیشتەکەت و نەزانی کێیە، دوای ئەوە بچیتەوە ماڵی خۆت.. حیکمەتی ئەم کۆبوونەوەیە ئەوەیە ئەوەیە حاڵی یەکتری بزانین، من پارووی‌یەکەم هەیە زیایەیە بیدەم بە تۆ، سبەینێ من وەك تۆم لێ بێ پاروە زیادەکەی تۆ بێتەوە بۆ من ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێت لە ئایەتێکدا (وما تنفق من خير فإن الله به عليم) هەچ خێرێ بکەن، خوای گەورە عیلمی پێی هەیە.. کۆتایی بە وتارەکەم ئەهێنم بە رووداوێکی بچکۆلە،، لە دەرگای ماڵی پیاو چاکێکیان دا ئینسانێکی هەژاری ناسراوبوو پیاو چاکەکە خواناسەکە دەرگای لێکردەوە و هێنایە ژوورەوە زۆر رێزی لێگرت و خواردنی پێدا، پارەیەکی چاکیشی پێدا، بەوپەڕی ڕێز و ئیحترامەوە خوا حافیز بوونی لێکرد کە رۆیشت و دوورکەوتەوە پیاوچاکەکە دەستی کرد بە گریان خێزانەکەی پێی وت، تۆ خێرت کرد، رێزت گرت، خواردنت داپێی، پارەیەکی زۆرت دایە، ئیتر بۆچی ئەگری؟ وتی ئەگریم چونکە من موقەصیرم ئەبوایە نەمهێشتایە سواڵ بکات، ئەبوایە پێش ئەوەی ئەو سواڵ بکات، بۆم ببردایە، ئەوە قسووری منە..

# باسی نۆزدەهەم
# سەبارەت بە گفتوگۆ و توندوتیژی

خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت (ومن الناس من يجادل في الله بغير علم ولاهدى ولاكتاب منير..) واتە هەندێ خەڵكی مجادەلە دەكەن سەبارەت بە زاتی خوا سەبارەت بەدینی خوا، بەبێ عیلم و بەبێ زانست و هۆكاری هیدایەت بەبێ ریزبەندی لۆژیكی بەبێ سەرچاوەیەكی رۆشتن كەواتە گفتوگۆ بە بوونی زانست رەوایە..

مجادەلە دوو جۆرە:

یەكەم: چاكە و باشەی پێ ئەوترێت (جدال بالتي أحسن) برتییە لە پەیڤینی نێوان دوو كەس یان دوولایەن كە هەردووكیان بۆ هەق ئەگەرێن.

دووەم: خوای گەورە رقی لێیەتی و وە نایەوێت ئێمە بەكاری بهێنین، كە ئەمیش لەنێوان دوو بەرامبەردایە و مەبەستیان شكاندنی یەكترە، هەریەكەیان ئەیەوێت بیسەلمێنێت كە بەرامبەرەكەی نەزانە، رەئی خۆی بسەپێنێت بەسەریا، لە عینادییەوەیە و لە قەناعەتەوە نییە، بەمەبەست ئەوەنییە بگەرێن بۆ حەق ئەم جۆرەیان، ئەم ئایەتی بەسەردا پەیكەڵ ئەبێت چونكە عیلمی تیا نییە، چونكە هیدایەتی تیا نییە جیدال لەوەوە هاتووە و وەرگیراوە كە بۆ تەقویە كردن و هێنانەوەی بەلگە بۆ بەرامبەرەكەی كە حەق و قەناعەتەكەی بەقوەتتربێ (ومن الناس من يجادل في الله بغير علم) نەبوونی زانست و هیدایەت بەرامبەر خواو پێغەمبەر (د.خ) زۆرجار تەوەرەی زانستی بابەت لەنگ دەكات بۆ نموونە كەسێك خاڵی ئیجابی باس دەكات بەس نەزانە كە بێ باوەڕ بوو نابێت بیخوێنیتەوە،

چونكە لەوانەیە بلێ. . پێغەمبەر وا گەورە بووە وا سیاسییەكی كارامە بووە، بەلاَم گرنگ ترین شت لە پێغەمبەردا پێغەمبەرایەتیە كەیەتی ئەو ئینكاری ئەوە ئەكا ئیتر چۆن گوێی لێ ئەگری!! هەچ كەس باوەڕی نەبوو بە حەزرەتی رەسول الله (د.خ) كە پێغەمبەری ئاخیر زەمانە و خاتم الأنبیاء. . علیه السلام ئەو كەسە چۆن لەوە تێدەگات كە پێغەمبەری خوا (د.خ) كە ئەفەرموێت (د.خ) (فأني أراكم من خلفي كما أراكم من أمامي) چۆن ئاوا لە پێشەوە ئاوا لە پێشەوە ئەتان بینم ئاوا لە دواوەش ئەتانبینم، یەكێ بێ باوەڕبێ چۆن بڕوای بەمە دەبێت! پێغەمبەری خوا كە ئەفەرموێت (د.خ) (إني لست على هيأتكم إني أبيت نطعمني و يسقيني) دوو رۆژ، سێ رۆژ لەسەریەك بە رۆژو بووە بەبێ شكاندنی رۆژوو ئەفەرموێ من وەكو ئێوە نیم من خوا خواردنم ئەداتێ وە خواردنەوەم ئەداتێ كێ ئەتوانێ ئیستعابی بكا گەر ئیماندار نەبێ، یان ئەو باوەش پیاكردنەی حەزرەتی جوبرەئیل (سەلامی خوای لەسەر بێت) كە بوخاری ئەیگێڕێتەوە (رەحمەتی خوای لێبێت) سند متصل فەرموودەیەكی صەحیصە كە ئەگاتەوە حەزرەتی خەدیجە، كە پێغەمبەر خوا (د.خ) بەسەرهاتی ئەشكەوتی بۆ ئەگێڕێتەوە ئەفەرموێ (حتى لقيني الجهد) ئەفەرموێ ماندووی كردم بەرەلاَی كردم باوەشی پیاكردم سێ جار پاش هەموو بەرەلاَكردنێكیش پێمی ئەوتم/ بخوێنە بۆچی؟ من لە منداڵیەوە ئەپرسم بۆچی سێ جار ئایا خوا نازانێ پێغەمبەری خوا نەخوێندەوارە، سێ جار بۆ لێی ئەپرسێت ئەفەرموێ (ما أنا بقارئ) زانایەك لەم بەینا وتی: كە فەرموویەتی (ماأنا بقارئ) یەعنی ناخوێنم و بەقسەت ناكەم ئەمە جۆرێكە لە ئازایەتی و لە ئەترسی، واتە ئەرێی فەرمانەكەت ئەكەم بۆجاری دووەم كە باوەشی پیاكرد و پێی وتم بخوێنە، لێرا كە پێغەمبەر ئەفەرموێت (ماأنا بقارئ) واتە: خوێندەوار نیم بۆ جاری سێیەم كە ئەفەرموێت (ماأنا بقارئ) یەعنی چی

بخوێنم؟ نور عیلمی یەزدان جێگیر بوو لە دڵی پیرۆزیا (کتاب المنیر) یەعنی قورئانی پیرۆز ئاخیر پەیام، پەیامەکانی پێشوو تووشی حاڵەتی خامۆشی و کوژانەوەی نووربوون ئەو نورە چۆن کوژێنرایەوە بەچوار رێگا:-

١- لەرێگای بیرچوونەوە (ونسوا حظا مما ذكروا به)

٢- لە رێگەی گۆرانگاری و تەحریفەوە (یحرفون الكلمة عن مواضعه و نسوا حظا مما ذكروا به) وشەیەك لائەبەن وشەیەكی تر ئەخەنە شوێنی پێش و پاشی دەخەن چەمكی واتاكەی ئەگۆڕێت.

٣- ئەنجا ئیزافەی بۆ ئەكەن شتی زیایەی بۆ ئەنووسن (فويل اللذين يكتبون الكتاب بأيدهم ثم يقولون هذا من عند ألله) (دۆزەخ)، بۆ ئەو كەسانەیە كە شت ئەنووسنەوە لە خۆیانەوە ئەڵێن ئەمە هی خوایە عەوامی پێ ئەخەڵەتێنن.

٤- شاردنەوەیە (إن اللذين يكتمون ماأنزلنا من البينات) پەیامەكانی رابردوو بەم چوار حاڵەتە بە (شاردنەوە، بەبیرچوونەوە، بە تەحریف و گۆرانكاری و زیادەكاری). یەكێك ئەپرسێت: (ماشاء ألله) باشە پەیامی خوایە بۆچی خوای گەورە نەیپاراستن؟ لەبەر چەند هۆكارێك:

یەكەم: چونكە پەیامەكانی خوای گەورە (مەحەلی) بوون هەر پەیامەی بۆ قەومێك بوو.

دووەم: ئەحكامی موعجیزەی تیا نەبووەوە، بەڵكوك موعجیزەكەی داوەتە دەست ئەو پێغەمبەرە (هودە، صالحة، ذل الكفل)، هەچ پێغەمبەرێك بێ موعجیزەكەی ئیعجاز نەبووە لەو پەیامەی كەپێی بووە، هەچ قەومێك كە پێغەمبەری بۆ چووبێ ئەو پەیامە تایبەت مەند بووە بەو پێغەمبەرەوە، واتە ناوچەیی (مەحەلی) بووە، وەكاتی (موەقت) بووە لەوە گرنگتر خوای گەورە ئاگادارە كە بەهۆی تەكنەلۆژیاوە دنیا دەبێتە یەك شار هۆكاری پەیوەندی دروست ئەبێت

نەنێو خەڵکیدا ئەوسا کە ئایینێکی جیهانی دەبێتە پێویستی بۆیە پێغەمبەر نحکاتە شەرەفمەندی ئەو ئایینە، نورێکی تر هەیە جگە لە نوری پەیامی خوای گەورە، کە نوورێکە لەناخی ئینساندایە، خوای گەورە نووری دا بە حەزرەتی (ئادەم) (سەلامی خوای لێبێت)، ئەو نوورە نووری فیطرەتە نووری ئیشراقییەتی (ئادەمە) ئەوا ئەگوێزرێتەوە بۆ هەموو (نەوەی ئادەم)، ئینسان کەبیر بکاتەوە لە خۆی لە خانەیەکی زیندووەوە هاتووە لە دایکیەوە و لە باوکییەوە بەشێکی زیندوو لەوانەوە وە گوێزراوەتەوە بۆ ئەم، ئەمیش بەشێکی زیندوو لەخۆی ئەگوێزێتەوە بۆ رۆڵەکانی، ئەو بەشە زیندووە لە ئادەمەوە هاتووە (فیطرە)یە، ناسینی خوایە، نوورە، خوای گەورە ئەفەرموێت: (لە قیامەتدا نەڵێی نەمزانی عادات و نەریتەکە وابوو پێشەوامان نەبوو شتی وا نەڵێی) (أن تقولوا يوم القيامة إنا كنا عن هذا غافلين) شتی وا نەڵێی قبوڵ ناکەم (أو تقولوا إنما أشرك اباؤنا من قبل) لە شوێنێکی تر جا ئەم عیلمی پێغەمبەرایەتییە، خوای گەورە خەڵاتی کردووە ئەم نوورەی خۆی کە داویەتی بە پێغەمبەر (د.خ) بیپارێزێ وەك پەیامەکانی تر نییە کوژاندنەوە روو نادات تیایدا پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێ (يحمل العلم من كل خلف عدوله) ئەم عیلمی پێغەمبەرایەتییە لە هەموو نەتەوەیەکەوە کە دەگوێزرێتەوە بۆ نەتەوەیەکی تر مرۆڤی دادپەروەر رێك و پێك، ئینسانی خاوەن تەقوا، خاوەن عیلم ئەیگوێزنەوە بۆ سێ مەبەست (ينفون عنه تحريف الغفلين و تأويل الجاهلين و إنتحال المبطلين) ئەرکی سەرشانی ئەم پیاوچاکانە ئەوەیە نەهێڵن زیادەرەویی دروست بێ لەم ئایینەدا نەهێڵن تەفسیراتی نەفامەکان بڵاو ببێتەوە، ئەوانەی کە ئەحکامی شەریعەت نازانن رێزمانی عەرەبی نازانن (ناسخ و منسوخ) (أسباب نزول) (فقه) نازانن و تەفسیر دەکەن و فتوا ئەدەن ئەم زانایانە ناهێڵن رافەی نابەجێ بڵاوکەنەوە! هەرچ کەسێ

بەناوی دینەوە بێ شت بڵاوبکاتەوەو خەڵك چەواشە بکات، ئەم زانایانە خوای گەورە ئەیانێرێ بۆئەوەی ئەم دینە تووشی ئینحراف نەبێت لە فەرمودەیەکی تریشدا پێغەمبەر ئەفەرموێت (د.خ) هەر ١٠٠ ساڵ جارێك خوای گەورە پیاو چاکێك ئەنێرێ ناهێڵێ کە ئەم دینە بفەوتێ، هەروەها خوای گەورە پەیمانی داوە بە نەصی قورئانی پیرۆز نافەوتێ کە فەرموویەتی (إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون) هەروەها پێغەمبەری خوا (د.خ) ئەفەرموێت (إن هذا الدين متين فأوغل فيه فإن المتبن لا ظهرا ابقى ولا أرضا قطع) ئەم دینە پتەوو رێك و پێکە، ئەم دینە قوڵە وردە وردە بچۆرە ناوی وردە وردە بارهەڵگرە چۆن لەباری مادیا ئاژەڵێك بارێکی دیاریکراو ئەتوانرێ بخرێتە سەر پشتی بۆ نموونە حوشتر، ٢٧٠ کیلۆ باری ئاساییەتی کە تۆ نیو تەنت خستە سەر پشتی، پشتی ئەشکێ ناتوانێ ئەو بارە بگوێزێتەوە، وەك پێغەمبەر ئەفەرموێت نەپشتی ئەمێنێ، نە رێگەکەش ئەبڕێ، لە جیهانی مەعنەویشدا وایە لە جیهانی ئیمانا ئەم راستییە ئەبێ بزانی بەتایبەت ئەو کەسانەی کە دین بڵاو ئەکەنەوە ئەوانەی کە دەعوە ئەکەن بۆ خوای گەورە ئەبێ بزانن ئەو کەسەی بەرامبەر چەندە ئەتوانێ هەڵگرێ بە گوێرەی ئەوە ئیسلامەتی بۆ باس بکەن، ئەم زیادەڕەوییە دەردێکی کوشندەیە بۆ دین کە وەختی خۆی ناویان ناوە (غلو) لە زاراوەی ئەمڕۆدا پێی ئەڵێن (تطروف) ئەم نەخۆشییە کە هەر لە دێرین زەمانەوە هەیە یەکەم هەنگاوی لادانە، یەکەم هەنگاوی تێکچوونی دینە، حەزرەتی (عیسا) ئەفەرموێت بە حەوارییەکان (سەلامی خوای لەسەر بێ) رۆژێك دێت خەڵکی ئەتان کوژن بە عەقڵی خۆیان وا ئەزانن خزمەتی خوا ئەکەن هەرلەکاتی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی دا ئەمە هاتە دی، ئەم بۆچوونە کۆنە یەکەم هەنگاوە بۆ لادان ئەم هەموو ئایەتانە بۆ ئەوەیە کە ئەوە دروست نەبێ ئەم هەموو نوێژەو جەماعەتانە ئەم هەموو کۆبوونەوەی

جومعانه بۆ ئەومیه ئینحیراف دروست نەبێ لە عیبادەتماندا لە بیرو باوەڕماندا، ئەم هەنگاوە پچڕاندنی پەیوەندی کردنە، (تطروف) یەکەم هەنگاوە کە باوەڕی بە (حیوار) نییە باوەڕی بە گوێگرتن نییە گرفتەکەی لەوەدایە خۆی بەڕاست ئەزانێ و هەمو جیهان بە هەڵە ئەزانێ لە زەمانی (خوارج)ەوە، ئەم شتە دروست بوو ئەوەی گوناهی گەورە گوناهی کەبیرەی بکردایە پێیان ئەوت کافر، لەو وەختەوە ئەمە دروست بووە، ئەوەی ئیمامی (عەلی) شەهید کرد گرتیان دەستیان بڕی (ذکری)ی خوای ئەکرد (ذکر)ەکەی نەبڕی قاچیان بڕی قاچەکەی تریان بڕی دەستیان بڕیەوە (ذکر)ەکەی نەبڕی، هەر نەیوت تا گیانی دەرچوو، ئەوەندە خۆی بەراست ئەزانی و دونیا بە کافر.. کێشەکە ئەوەیە چارەسەرکردنی زۆر زەحمەتە، بەڵام لە سەرەتادا خۆپاراستن لێی ئاسانە، سەرۆکی خەواریجیەکان (ذي الفنان)یان پێ ئەوت ئەژنۆکانی ئاوسا بوون بە هۆی نوێژ کردنەوە، بەڵام بەداخەوە بە ئەصحابیەکانی ئەوت کافر، بە ئیمامی (عەلی)یان ئەوت کافر، سەیری ئەم بەڵایەکە!! ئەم (غلو)وە ئەڕوا بەرەو ئیرهاب (تۆقاندن) ئەم ڕۆچوونە سەرەتا ئاشکرا نەکراوە بۆ کۆمەڵێکی دیاریکراو، بەڵکو (گشتییە)، بەڵام کە بوو بە (ئیرهاب) ئەبێتە (تایبەت) تۆقاندن دژی حکومەت تۆقاندن دژی دەوڵەمەند تۆقاندن دژی کۆمەڵ ئەگەر لەوەشدا چارەسەر نەکرا ئەڕوا ئەبێ بە توندڕەوی.. ئەوەش من و تۆ ئەگرێتەوە لەبەرئەوە ئینسانی موسڵمانی ڕۆشنبیر شتێك بخاتە بەرچاوی ئەویش ئەوەیە.. ئەوانەی کە زیادەڕەوی دەکەن بە دووشت دەناسرێن.

یەکەم: دیاردەی گەورەکردنی گوناه، بۆ هەموو شتێ وشەی حەرام بەکار ئەهێنن شت گەورە ئەکەن نەکەی ئەوە حەرامە، نەکەی ئەوە حەرامە یەعنی یاسای رەش و سپی بەکار ئەهێنن و هیچی تر،،

دووەم: شت تێکەڵ ئەکەن گوناهی بچکۆلە لەگەڵ گوناهی گەورە تێکەڵ دەکەن سەر لە خەڵك ئەشێوێنن، بۆ نموونە ئەڵێن گوڵەبەڕۆژە مەخۆ لەسەر جادە حەرامە، خواردنی گوڵەبەڕۆژە لەسەر جادە دژ بە ئادابی ئیسلامییە، دژ بە ئادابێکی گشتییە، جوان نییە، بەڵام تۆ بۆ ئەم وشەی حەرامە دابنێی؟ لەولاشەوە بۆ زینا و هاوەڵ دانان هەر حەرام هەیە؟! لەمەوە گوناهی گەورە و بچووکی لێ تێکەڵ ئەبێ..

لێرەوە دەگەینە ئەوەی بڵێین موسڵمانی رۆشنبیر ئەبێت ئاسۆیەکی فراوانی هەبێت چۆن لە رەنگەکاندا شەپۆلێکی جۆراوجۆرمان هەیە لە رەنگا.. ئاواش جیاوازی هەیە لە بەرز و نزمی کاری ئیسلامیدا (فرض) هەیە دوای فەرضەکە واجبات هەیە لەو کەمتر سوننەت هەیە لەو کەمتر مندوبات هەیە لەو کەمتر مستحابات هەیە دوای ئەوە مەودای زۆر زۆر لەمە فراوانتر پێی دەوترێ (مباح) دوای مباحەکە وردە وردە دەڕۆی دەگەیتە خەتێکی سوور کە ئەکەویتە مەکروهاتی تنزیهی دوای ئەوە مەکروهاتی تەزهیمی ئینجا وردە وردە ئەڕۆینە ناو تەمریعی ئینجا دوای ئەوە کەبائیرە ئەبێ بزانی ئەو بەرامبەرەت لەچ حاڵەتێکدا رزگاری ئەکەی ئەگینا هەمو شتێك هەر حەرام و حەلاڵ نابێ! چونکە تەنانەت وشەی حەرامەکە ئەو سەدایەی نابێ.. زیادەڕەوییمان هەیە لە خۆشەویستیا ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی نەصرانییەکان و یەهودییەکان موشریك، ببن کە زیاد لە حەد حەزرەتی عیسایان خۆش دەویست گەیشتە ئاستی تقدیسی وە یەهوودیەکانیش حەزرەتی عوزەیریان خۆش دەویست گەیشتە ئاستی تەقدیسی (وقالت النصرى المسيح ابن ألله) نعوذ بالله (وقالت اليهود عوزير ابن الله) یەهودییەکان وتیان عوزەیر کوڕی خوایە، چونکە خۆشەویستییەکەیان لە سنوور دەرچوو، بۆیە لای ئێمە نابێت خۆشەویستی لە سنووری خۆی تێپەڕێت، لە

پێغەمبەرەوە (د.خ) ریوایەت کراوە (من أحب لله وابغض لله و أعطى لله ومنع لله فقد إستملك إيمان) ئەوەی کەلەبەر خوا کەسی خۆش بوێت لەبەر خوا رقی لەکەس بووبێ لەبەر خوا سەرف بکات و لەبەر خوا بیگرێتەوە ئیمانی تەواوە، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ئەفەرموێت (أحببت حبيبك هون ماعسى أن يكون تغضت يوم الماء) ئەو کەسەی کە خۆشت ئەوێت تۆزێکی تیا بهێڵەرەوە مەیگەیەنەرە ئاستی قودسیەت، چونکە لەوانەیە مخالەفەیە بکات، نابێ خۆشەویستییەکەت بمێنێ تۆزێکی تیا بهێڵەرەوە وە ئەو کەسەی کە ئەیبوغزێنی و رقت لێیەتی ئەبێ بەشی خۆشەویستی تیا بهێڵیتەوە ئەمە یاسایەکە کە پێغەمبەر دایناوە کە عاتفەمانی پێ بپێوین، ئیمان سێ مەرجە، زاناکان دەفەرموون (تصدق بالجنان وقول يا إقرار بأحسان و عمل باأركان)

١- ئیمان جێگیر ئەبێت لە دڵتا ئەمە مەرجی یەکەمە.

٢- وتن و ئیقرار بە زمان.

٣- ئەیسەلێنمی بە کردار.

هەندێك لە زیادەڕەوەکان هاتن باوەڕ جێگیربوونیان لابرد، هەموو شتێکیان کرد بە کردار، راستە کردار بەشێکە لە ئیمان، بەڵام تەصدیق گرنگترە، بەشێکیان هاتن وتیان، کردار هیچ گرنگ نییە بەس تەصدیق گرنگە، ئەوانیش هەر زیادەڕەوییان کرد، ئێمە کە پێمان ئەڵێن ئەهلی (السنة والجماعة) ئەم دوانەمان کۆکردۆتەوە (وسط)مان هەڵبژاردووە، لە پێغەمبەریان پرسی (د.خ) وسط چییە؟ فەرمووی (الوسط والعدل) میانڕەوی یەعنی عادل بێ راستە ئەهلی (السنة والجماعة) کە ئیمانی بە تەصدیق هەیە ئیمانی بە عەمەل هەیە، وە تەصدیق گرنگترە، وە هەردووکی ئەبێت هەبێ، بەرەکەت و رەحمی خوای گەورە هەر بۆ ئەوان ئەرێژێ، چونکە دینی پێغەمبەر (د.خ) چۆن نازڵ بووە لای ئەوان ئاوەهایە، هەموو کاتێ

به ماڵ و به سامان و به گیان پێغەمبەریان خۆش ئەوێت.. لە نەفسی خۆیان و ئەولادیان زیاتر وە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە خوا پێی ناخۆش بێت. یەکێك لەوانە کە چەند ساڵێك لەمەوپێش تەشریفی هێنا بۆ کوردستان ناوی مامۆستا (داود) بوو، شێخ داود پێش نوێژ و وتار خوێنی مزگەوتی (واشنتن)ە فەرمووی (١٧) ساڵە من پێش نوێژ و وتار خوێنم لە واشنتن نەژیم جومعە نەبووە دوو خێزان و سێ خێزان و پێنج خێزان موسڵمان نەبن، جومعە نەبووە! ئەوە وەسیلەیە ئەمە ئەگەر ئەو پیاوە لەو تەرزی میانڕەوییە نەبێ، ئەتوانێ خەڵك ڕاکێشێ؟ شێخێك ناوی (گار گارییە) لە زاناکانی ئەزهەری شەریفە ساڵی (١٩٠٥) چوو بۆ یابان تەرجومانێکی برد لەگەڵ خۆیدا (٦) مانگ لە یابان مایەوە چەندی موسڵمان کردبێ؟ (٦) مانگ.. (١٢) هەزار کەس!!.. کتێبێکی نووسیوە بەناوی (الرحلة اليابانية) درێژەی هەموی تیایە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دنیا هەر هەمووی تینووە بۆ ئایینێکی جیهانی تینووە کە جیاوازی ڕەگەزێ لە ڕەگەزێکی تر نەکات ئەمە لە یەهوودیەتدا نییە هەزاران ساڵە ئایینی یەهودییەت هەیە ئێستا (١٥) ملیۆنە، ئایینێکی نەتەوەیین بێجگە لە خۆیان ئەڵێن (گۆیین) یەعنی حەیوانات ئەوەی ئێمەی دروست کردووە بێ جیاوازی بەدیهێناوین، بۆچ خەڵکی بەدەر لە خۆمان وەك ئاژەڵ سەیر کەین، ئیتر ئەم دینە چۆن گەشە دەکات و بڵاو ئەبێتەوە، ئیتر چۆن ئەبێ بە ئایینێکی جیهانی کە ڕێز نەگرێت لە هیچ ئینسانێك، لە هیچ قەومێك، مەسیحیەتەکەش ئەوەتا کەوتۆتە کەنیسە فرۆشتنی زۆر شوێن، لە ئەمریکا موسڵمانان ئەچن کەنیسە ئەگرن بەکرێ نوێژی جومعەی تیا ئەکەن، لەزۆر شوێنا مەداریسی دینیان وە ڕاهیباتیان نەماوە ئەچن ئیستراذیان ئەکەن، لە هیند و لە ئەمریکاوە ئەیانکەن بە ڕاهب بەم جۆرە (٢٢٥) کەوص هەیە لە ئەمریکا، کەوص واتە: مەزهەبو ئایین کە هەمان ئەستێرە ئەپەرستن

بەرد ئەپەرستن، خۆبیستتان پێش ماوەیەك (هێڵ پۆپ) هەبوو، ئەمەی کە ئەستێرەیەك مایەوە بە رووناکی.

کۆمەڵێك ئینتیحارێکی کومەڵیان کرد، بۆئەوەی رۆحیان بچێتە ناوی گوایە ئەمە کەشتییەکە ئەچێ بەرەو بەهەشت ئەمە عەقڵەکەیانە (إن شاء ألله) ئەو کاتە نزیك بووەتەوە کە هەموو جیهان بەرەو ئیسلامەتی بێن، (بإذن ألله)، ئەگەڕێینەوە بۆ باسەکەمان سەبارەت بە هاوکێشەی زیادەڕەوی، ئەو لادانە ئەڕوات بەرەو ئیرهاب، ئەڕوا بەرەو عنف (توندوتیژی) لە زمانی قابیلەوە هەیە، کوشتن توند و تیژی لە فیطرەتی ئینساندا هەیە، بەلأم جیای کەرەوە لە بەکارهێناندا، خوای گەورە داویەتی بە ئینسان کە توند و تیژ بێت لەکاتێکدا کە دیفاع بکات لە شەرەف و ناموس و بەرگری بکات لە نیشتمانی، بەرگری بکات لە موقەدەساتی نابێت بەکاری بهێنێ بۆ زوڵم ئەمە شتێکە وە جۆری بەکارهێنانی بۆ (تعدی) ئەمە شتێکی ترە کە ئینسانێك ئاشتی بەکار ئەهێنێ لێبوردن بەکار ئەهێنێ بەرامبەر بە زوڵم ئەوە نیشانەی هێزە، هابیل دەست و قاچی هەبووە ئەیتوانی مەنعی قابیل بکات ئەیتوانی بەرگری بکات وەك قورئان ئەفەرموێت (لئن بسطت الی یدك لتقتلني ماأنا بباسط یدی إلیك لأقتلك إنـي أخاف ألله رب العالمين) لەبەرئەوە ئەو جۆرە توندوتیژییە دەمێکە لەگەڵ ئینساندا هاتووە وە شێوازێکی وەهای وەرگرتووە بۆتە دواپلەی کۆتایی لە لادان، لە ئینحراف، وە ئەمەش دژی نەرمی و بەزەییە، دژ بە رفق و لەسەر خۆییە جولەکەکان هاتن بەناوی سەلامەوە بە پێغەمبەریان وت (ألسام علیك) (سام) یەعنی مردن حەزرەتی عائیشە بەتوند و تیژی وەلأمی دانەوە پێغەمبەر فەرمووی وامەکە، فەرمووی (ماکان رفق في شيء إلا زان ومانذع من شيء إلا شان) ئەو هێمنیە و ئەو لەسەرخۆییە و ئەو رەحم و بەزەییە بچێتە هەر بوارێکەوە رێز ئەدا بەو بوارە بەها ئەدات بەو بوارە وە لە

هەج بوارێکەوە هاتە دەرێ ئەو بوارە ناشرین ئەکات ئینجا بێینە سەر بۆچی ئەم توندوتیژییە دروست ئەبێت هۆکارەکەی چییە؟

یەکەم: کە ئینسانێك رەئیەکەی لەسەر فرض ئەکرێ بەسەریدا.

دووەم: ناهێڵێت رەئی خۆی دەربپڕێت.

سێهەم: بارودۆخی سیاسیش دەوری هەیە، لەو هۆکارانە وا لە ئینسان ئەکات توندوتیژ بێت ئەوەیە:

١- لە منداڵیدا خۆشەویستی پێویستی وەرنەگرتبێ.

٢- بەرەڵایی. گەنج و لاو چاودێری لەسەر نەبوو نەڕوات بەملاو بەولا کەسێك نییە شتی بۆ راست کاتەوە بڵێ ئەمە راستە ئەمە چەوتە ئەمە حەرامە، وامەکە ئەمە باش نییە، بە ئارەزووی خۆی ئەجوڵێتەوە ئەبێتە ئینسانێکی توندوتیژ.

٣- زوڵم کە ئەکرێت لەسەر ئینسان دوایی هەوڵئەدات تۆڵە بسێنێت تۆڵەی کۆمەڵایەتی، چونکە رقی پەیدا کردووە ئەو زوڵمە وای لێ ئەکات رق پەیدا بکات. بەو جۆرە ئەو ئینسانە ئەبێتە ئینسانێکی توندڕەو، جۆرە زوڵمێکی تر هەیە زوڵمی ئابووری، کە ئەکرێتە سەر ئینسان، کۆمەڵێ خەڵك کە کاسپی بە خوێنی قەومێك ئەکەن ئەمەش ئەبێتە هۆیەك بۆ توندوتیژی خۆ لە تەلەفزیۆندا ئەبینین چی ئەکەن، وە هەروەها ململانێی سیاسیش هۆیەکی زۆر گەورەیە، هەروەها لە واعقی ژیانماندا سەیری بەڕێوەبەری فەرمانگەیەك بکە دێ توند و تیژی بەکار دێنێت لەگەڵ فەرمانبەرێکدا، ئەو هیچی پێ ناکرێ ئەچێ زوخاوەکەی بەسەر ژنەکەیدا ئەڕێژێت، ئەی منداڵەکەی چی ئەکات ئەچێت سەیارەی دراوسێکەیان ئەشکێنێت، یان پەنجەرەی مەکتەبەکەی ئەشکێنێ، ئە م گوشار بۆ هێنانە ئەڕوا دوایی بەو منداڵەدا ئەتەقێتەوە، لە منداڵییەوە تۆ متابەعەی منداڵ بکە، باوك و دایك لەگەڵ مامۆستای قوتابخانە، واتە ماڵ لەگەڵ

قوتابخانـە هەرچـەندە نیـەتیان پاکـە، بـەڵام زەرەر دەدەن لـە کەسـێکی منـداڵ بـە فێرەو بە جنێو بە ئیرهاب، واو لێ ئەکەم واو لێ ئەکەم بە لێدان، ئایا تۆ بـەم زلیـە ناتوانیـت منـداڵێك قەناعـەت پـێ بکـەیت ئـەم تونـدو تیژییـە خـۆت زەرەری لێ ئەکەیت، لە خۆشەویستەکەی خۆتدا ئاگات لێی نییە، پێویستە ئێمە بیر بکەینـەوە پێغەمبـەری خـوا (د.خ) چـۆن بـووە لەگـەڵ منداڵدا، حەدیـسێکم بـۆ بێنـە کـە لـە منـداڵی دابـێ، کـە لـە منـداڵێ تـورە بـووبێ بۆچـی ئـەم یاسـای پەروەردەییـە لـە پێغەمبەرەوە وەرناگرین، تۆ ئاوا بەتوند و تیژی بەخێوی ئەکەیت و دوایی گـەورە ئەبێ پۆلیس ئـەیگرێ و تـاوانێکی کـردووە تـۆ ئـەڵێیت مـن ئـاوام فێـر نـەکردووە، ئەخێر تۆ هاوکاری توندوتیژی ئەو بووی، کاممان لەگـەڵ کـوڕی خۆیـدا دانیشت و پـەیڤینێکی لەگەڵدا کـرد؟ گفتوگۆیـەکی هێمنـی لەگەڵدا کـرد لەسـەر ئـاڵوگۆڕی فکری.. کۆمەڵایەتی.. هتد، کەسمان وامان نـەکردووە فیلمێکتـان بینیـوە مناقەشـەی لەسەر بکەن، دیاردەیەك ڕووداوێك شتێك بووە بە هێواشی لەسەری بـدرێت، ئێمـە ئـەوەمان نـەکردووە، کەواتـە ئێمـە هۆکـارێکی گـەورەین بـۆ ئـەو توندوتیژییـە، توندوتیژی لە زۆر شوێن هەیە لە ئەفغانـستان پیـاو تـەریق ئەبێتـەوە کـە باسـیان بکات، تاڵیبان (٦٥) کەسیان ئیعدام کرد کاتێك کـە هاتنـە نـاو کـابوڵ گوناهەکـەیان چی بوو؟ ڕیـشیان نـەبوو یـەعنی مـن ئێـستە لـەوێ بوومایـە ئیعـدامیان کردبـووم، سـەیارە نابێـت ئاوێنـەی نـاوەوەی هـەبێت نـەبا سایەقەکە سـەیری دواوە بکـات، یەعنی تخلفێکی وا پیـاو تـەریق ئەبێتـەوە.. ئـەم کتێبـە نـاوی ( The Wuld al Manak) کتێبێکی ئەمریکییـە وا نـەزانن توندڕەوییـە وە توندوتیـژی بـەس لای ئێمـە هەیـە، بـەڵکو کۆتـایی باسـەکەمان بـەم خـشتەیە ئـەهێنم کـە لـەم کتێبـەدا هاتووە، لاپەڕە (٩٥٣) ئەم کتێبە لە ساڵی (١٩٩٢) بڵاو کراوەتەوە، لەسەر ئـەمریکا و وتمان یەکێ لەو هۆکارانەی کە تونـدو تیـژی دروسـت ئـەکات، بەرەڵاییـە، لـە سـاڵی

(١٩٧٠)وه هەتا ساڵی (١٩٩٠) لەم (٢٠) ساڵەدا ئەو ئافرەتانەی کە بەتەنیا ئەژین (٩١٪) زیادی کردووە ئەو پیاو و کوڕانەی کە بە تەنها ئەژین (١٥٦٪) زیادی کردووە.

لە هەموو نۆ کەسێکدا لە ئینسانی باڵغدا یەکێکی تیایە کە بەتەنیا ئەژی، ئەو یەکە (٦١٪) ئافرەتن کە بەتەنها ئەژین، بەڵام ئەوانەی کە تەمەنیان لە نێوان (١٥ - ٢٤) دایە ئەوانە (١٠٠٪) زیادی کردووە لە نێوان (٩٧٠ - ٩٩٠)دا جا بیرکەوە ئەمە عاقیبەتەمەی چییە؟ (١٥) ساڵ تا (٢٤) ساڵ ئەمانە بە تەنیا ئەژین زۆربەی تاوان و کوشتن و بڕین ئەمانە ئەیکەن، کەس نییە هەڵەیان بۆ راست بکاتەوە، ئەم زانیارییە لە لاپەڕە (٩٤٦)دا بوو لە لاپەڕە (٩٥٣)دا باسی تاوان ئەکات.. کە کردوویەتی بە دووبەش ویلایەت بە ویلایەتی تیایە من تەنها پایتەختەکانم هەڵبژاردووە، واشنتن لەیەك ساڵدا بۆ هەموو (١٠٠)هەزار کەسێ (١٠٧٧٤) تاوان روو ئەدات کردوویانە بە دووبەش بەشێکیان تاوانی توندوتیژی ئەوەی تریشیان تاوانی سەروەت و سامان، تاوانی توندوتیژییەکە لە هەموو (١٠٠)هەزار کەسێ (٢٤٥٨) کەس تاوانی لێ ئەکرێت ئەم (٢٤٥٨)ە، ئەکرێ بە چوار جۆرەوە: (٨،٧٧) کوشتنە (٩،٤٩) هەتکی ناموسە (١٢١٣) هەتکی بردن یان شاردنەوە و دزین (١٠١٧)ی لێدانی ئینسانە ئیتر بۆکسە بە بۆکس خەنجەرە بە چەقۆیە بە هەرشتێکە ئەمرێژانەی کەوتمان بۆ (١٠٠)هەزار کەسە، ئەم شارەی (سلێمانی) ئێمە بەراوردی ئەکەین لەگەڵ واشنتن بەم بێ پۆلیسییە بەم بێ ئیمکانیەتە ئەگەر ئەوان (٥٠/١) ئیمکانیەتی پۆلیس و یاسا و ئاسایشی ئەوان بێ بۆ ئەم شارە لەوانەیە تاوان لەم شارەدا نەمێنێ و نزیکی سفر بێتەوە، دانیشتوانی ئەم شارەی ئێمە نزیکەی (٧٠٠،٠٠٠) هەزار کەسە بابڵێین (٧٠٠)هەزارە، ساڵی بەگوێرەی ڕێژەکەی ئەوان ئەبوایە (٣٤٩٣) حاڵەتی تاوان بەرامبەر بە ئافرەت رووی بدایە، تەنها لە ساڵێکدا،






بەلأم لەخوا بە زیاد بێت بە (١٠ ساڵ) ئەوەندە کارەسات نابیستین، حاڵەتی کوشتن بەشێوەی ناسایی باسی برا کوژی ناکەم، ئەبوایە (٥٤٥٦) حاڵەتی کوشتن ساڵانە لە شاری ئێمەدا رووی بدایە بە گوێرەی ئەمەریکا سەبارەت بە رفاندنی زەلام ئەبوایە (٨٤٩٤) کەس ساڵانە لەم شارەدا بفرێنرایە، حاڵەتی لێدانی (زەلام بگرن و لێی بدەن بە بۆکس) ئەبوایە (٧٨١٩) تاوانی ساڵانە وابیوایە، دێینە سەر بەشەکەی تر کە تاوانەکانی ماڵ و سەروەت و سامانە، گراوە بەسێ بەش بەشێکیان (کوتانە سەرماڵان) بەشێکیان ئیختلاسی ژمارەیە لە بازاڕ و لە دوکان و لە دەزگاکاندا، بەشێکی تریشیان سەیارە رفاندنە، بۆ هەموو (١٠٠)هەزار کەسێك (١٩٨٣) کەس ماڵی ئەدزرێ ئەگەر بەراوردی بکەین بە ئێرە ئەبوایە ساڵانە (١٣٨٨١) ماڵ بدزرێ لەم شارەدا هۆکاری روونەدانی ئەمە ئەگەڕێتەوە بۆ دینەکەمان کەواتە ئێمە زیاتر خاوەن شارستانیەتین نەك ئەوان سەبارەت بە ئیختلاسەوە ئەبوایە (٣٤٩٩٣) حاڵەت رووداى بدایە لە شارەکەماندا وە سەبارەت بە رفاندنی سەیارە ئەبوایە (٩٣٥٢) حاڵەتی روودانی رفاندنی سەیارە رویبدایە، ئەم سلبیاتە باس ئەکەم، بەلأم لەهەمان کاتیشدا بزانن کەلە ساڵی (١٩٨٩)وە (٥٢٣٤٣) دکتۆری پیاویان هەبووە ئەبێ ئەم حەقیقەتەش بزانین، (١٢٢) کۆلێژی پزیشکییان هەیە (٩٨٤٤٦) پزیشکی ئافرەتیان هەیە، کە ئێمە لایەنە خراپەکە باس ئەکەین دان ئەنێین بە لایەنە باشەکەشدا.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

## باسی بیستەم
## ئیعجازی زانستی لە دروست بوونی مرۆڤدا

پرسیارێك لەدێرین زەمانەوە مرۆڤ ئەیكات[١٣٩] لەخۆیو لەخەڵكی، بۆ دۆزینەوەی راستی كە ئەویش پرسیاری بەدیهاتنی مرۆڤە. فەیلەسوفی بەناوبانگ (ئەرسطو تالیس) ئەیووت: لەخوێنی حەیزەوە مرۆڤ دروست دەبێت. ئەم باوەڕەشی بۆ چەندین سەددە چەسپی بوو لەمێشكی زاناكانا، كەوا منداڵ لەخوێنی حەیزەوە پێك دێت. لەساڵی ١٧٠١دا بۆ یەكەمین جار شكڵی سپێرمی پیاو واتە ئاوی پیاو ئاشكرا كرا بۆ خەڵكی لەو بەروارەوە باوەڕێكی تر پەیابوو كە مرۆڤ لەباوكەوە دێت یان دروست دەبێت، لەكۆتایی سەددەی نۆزدەدا هێلكۆكەی شیرداران و هێلكۆكەی مرۆڤیش دۆزرایەوە، زاناكانی ئەو سەردەمە وەك (ماربیجی) باوەڕیان وابوو كەسەرچاوەی هەر بەدیهێنراوێك دەگەڕێتەوە بۆ دایك، ئەم بیروباوەڕانە لەعەقڵی زاناكاندا چەسپی بوون، جگە لەجەماوەر بەڵام زانایانی ئیسلام قایل نەبوون بەو ئەفكارانە، هەروەها فیكرەیەكی تریش بڵاوبوبووەوە كەوا مرۆڤ بەكامڵی لەیەكەم رۆژەوە دروست بووە ئیتر ئایا لەتۆوی دایكەوە بێت یالە تۆوی باوكەوە، بەڵام زانایانی ئیسلام قایل نەبوون بەم دوو فیكرەیە، نە

---

[١٣٩] سەرچاوەی سەرەكی ئەم كۆباسە كتێبی (علم الاجنة في ضوء القرآن والسنة) كە كۆی ئەو توێژینەوانەیە كە پێشكەش كراون لە یەكەمین كۆنفرانسی (ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەت) لە (ئیسلام ئاباد) ساڵی ١٩٨٧، كە لەلایەن بەڕێز مامۆستا (محمد علی عبدالرحمن)ەوە لە رێگای كورەكەیەوە بەدەستمان گەیشت خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە.

فیكرەی دروست بوونی مرۆڤ لەیەك سەرچاوەوە نیتر سەرچاوەكە باوك بێت یان دایك بە تەنها وە نە ئەو فیكرەیەی كە مرۆڤ بەتەواوەتیو بەكامڵی دروست بووە لەتۆوی باوكەوە یاله تۆوی دایكەوە چونكە ئەم دوو رایە پێچوانەی دەقی قورئانی پیرۆزن ئەو دەقانەی كە تەئویل هەڵناگرن أعوذ بالله من الشيطان الرجيم (( يأيها الناسُ إنا خلقناكم من ذكرٍ وانثى))[١٣٠] ئەی خەڵكینە ئەی نەوەی ئادەمیزاد هەمووتان لەنێرو مێ پێك هاتوون ئەمە دەقێكە راڤەو تەئویلی تر هەڵناگرێ، راستیەكەی تر دەقێكی قورئانە :

(يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ

)[١٣١]

دیسان ئەو فیكرەی كە مرۆڤ لە یەكەم رۆژەوە بەكامڵی دروست بوو، ئەوە قورئان دژیەتی بەڵكو

(خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ ﴿٦﴾)[١٣٢]

واتە: بەپلە پلە و ووردە ووردە ئەم مرۆڤە لەشەكەی پێك دێت یا تەواو دەبێت، هەروەها لەدەقی فەرموودەی پێغەمبەرا (ﷺ) كە جولەكەیەك پرسیاری لێ دەكات چۆن مرۆڤ دروست دەبێت؟ لەوەڵامدا دەفەرمووێت: (يايهودي من كُلٍ يُخلق من نطفة الرَجل وَمن نطفة المرأة)[١٣٣] دەفەرمووێت:: مرۆڤ لەهەردوولا دروست

---

[١٣٠] النساء / ١ .

[١٣١] الزمر / ٦ .

[١٣٢] الزمر / ٦ .

[١٣٣] مسند احمد / ٤٦٥ .

دەبێت لەئاوی باوك و دایك، لەم دەرسەماندا هەوڵ نادەین کە دەقەکانی قورئان یاخود فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)بگونجێنین لەگەڵ راستییەکانی زانستدا بەڵکو راستییەکان و دۆزراوەی زانستی ئەهێنینە بەردەم دەقەکانی قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئیتر خۆت داوەر بە، بزانە چۆن ئەم دۆزراوانە یان راستیە زانستیانە خۆیان مل کەچ دەبن و کڕنوش دەبەن بۆ ئەو دەقە پیرۆزانە، بۆ چەندین سەددە کۆرپەلە ناسی تەنها وەصفی بووە، بەو واتایەی ئافرەتێك منداڵێك فرێ دەدات لەتەمەنی مانگدا، دووەمانگدا یان سێ مانگدا بەو جۆرە وەصف دەکراو تۆماردەکرا، صیفاتی ئەو کۆرپەیە، (علم الاجنە) لەو بوارەدا ئیشی دەکرد، بەڵام لە چلەکانی ئەم سەددەیەدا بەهۆی (الالیاف البصریە)یەوەو کامێراو ووردبینی وە ئەم زانستە هەنگاوێکی گەورەی بڕیو چووە قۆناغێکەوە کە پێی دەڵێن (علم الاجنە التجریبی) بە تاقی کردنەوەو ئەزموون سەلماندی کە کۆمەڵێك راستی هەیە. لەوەو پێش تەنها خەون بوون پاشان بوونەتە راستی زانستی، ئێمە ئێستا بۆ بەڕێزتانی باس دەکەین و پاشانیش ئایەتەکان دەخەینە روو.

خۆت حوکم بدە...

- زانست ئەڵێت: لەملیۆنەها تۆوی پیاوەوە تەنها چەن سەد دانەیەك دەگاتە هێلکۆکە، پێغەمبەر (ﷺ) پێش چوارده سەددە لەمەو بەر فەرمویەتی: (مامن کل الماء یکونُ الوَلد) واتە: هەموو ئاوەکە بەشدار نابێت بۆ دروست بوونی ئەو منداڵە بەڵکو بەشێکی کەمی زانستیش دەڵێت: ژمارەیەکی زۆر کەم ئەگەنە هێلکۆکە.
- مەرجە لەهەموو پیتاندنێکدا یان لەهەموو دروست بوونێکی منداڵدا هەردوو ئاوی ( دایك و باوك) بجوڵێنەوەو بگەن بەیەك، جوڵانەوە مەرجە بۆ

پیتانـدن، لـەکتێبی (التکامـل البـشری) نوسـراوی دوو پرۆفیـسۆری ڕۆژئـاواییین (پـیج)و (فیڵـی) دەڵـێن کـەوا ئـاوی پیـاو ماددەیـەکی تێدایـە پێـی دەڵـێن: (پرۆســتاگلاندین) کاردەکاتــە دیــواری ڕەحــم، گــرژی دەکاتــەوە، ئــەو گرژبونەوەیـە یارمـەتی گواستنەوەی ئـەو تـۆوە دەدات بـۆ نـاوەوە، لەهـەمان کاتیـشدا دەرکـەوت کـە ئـەو هێلکۆکەیـە هەمیـشە لەجوڵەدایـە تـا دەگاتـە ناورەحم، ئەو دوو جوڵەیە مەرجن بۆ دروست بـوونی منـداڵ، قورئـانی پیرۆز دەفەرموێت:

(فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ۝٥ خُلِقَ مِن مَّآءٖ دَافِقٖ ۝٦)[١٣٤]

واتـە: مرۆڤ با تەماشا بکات لەچی دروست بووە؟

- لەئاوێك دروست بووە کە دەبێت بجوڵێتـەوە ئـەبێت دەرپـەڕێت و حەرەکە بکات.
- زانـست دەڵێت: مەرجـە ئـەو تـۆوەی پیاوە بگاتـە هێلکۆکـە ئـەگینا منـداڵ دروسـت نابێـت وە ئـەبێت صـیفاتی هـەردووکیان تێکـەڵ بـبن. قورئـان دەفەرموێت:

(إِنَّا خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٍ أَمۡشَاجٖ نَّبۡتَلِيهِ فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا ۝٢)[١٣٥]

واتـە: ئێمـە مرۆڤمـان دروسـت کـردووە لـەتۆوێکی تێکـەڵاو، ئیمـامی قرطبـی دەفەرموێت:: (النطفة مفردة لکنها مـن معنـی الجمـع) بـەگوێرەی قەواعیـدی

---

[١٣٤] الطارق / ٥،٦ .
[١٣٥] الانسان / ٢ .

زمانی عەرەبی (الصفه تتبع الموصوف) ئاوەڵناوەکە دەبێت شوێن وەصف کراوەکە بکەوێت. لێرەدا (نطفە)کە تاکە مەوصوفەکەیە، وەصفەکە (امشاج)ەکە کۆیە ئەمەش نابێت وابێت یان ئەبوایە هەردووکیان تاك بوونایە یا هەردووکی کۆببوونایە.

ئەمە گەورەترین بەڵگەیە کەوا (نطفە)کە تاکێکە لەباوکەوەو تاکێکە لەدایکەوە پاشان تێکەڵ دەبن و دەبنە کۆ (امشاج).

تێبینی / (إنا خلقنا) کە لێرەدا خوای گەورە دەفەرمووێت: (إنا) لەگەڵ (نحن) مانای خۆمان یاخود (نحن) مانای ئێمە دوای ئەوە، یاصیفەتێك لەصیفاتی جلال یا جمال ی خوای گەورە دێت یا کارێك لە کارە جوانەکانی خوای گەورە، واتە: بۆ پێشان دان یا ئاماژە پێکردنی صیفەتێك لەصیفاتی کەماڵی خۆی (جل جلالە) ئەبێ بێت بۆ نموونە: (إنا خلقنا) کرداری بەدیهێنان لەبەرئەوەی کارێکە لەدەسەڵاتی بەدیهێنراودا نییە، خوای گەورە (إنا)ی بەکارهێناوە،

(إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ )[٣٦]

هەر خۆی تەنزیل و پێك هێنانی تەنزیلەکەش دەکات ئەو دەستورە لەدەستەڵاتی مەخلوقدا نییە وە هێنانە خوارەوەی

ئەو تەنزیلە بۆ دڵی پێغەمبەر (ﷺ) کارێکە لەدەستەڵاتی مەخلوقدا نییە، وە جێگیر کردنی ئەو تەنزیلە لەدڵی پێغەمبەرا (ﷺ) وە هاتنە دەرەوەی ئەو تەنزیلە لەزمانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەمە کارێکە تەنها بەپەروەردگار دەکرێت بۆیە دەبینیت (إنا) بەکارهاتووە دوای ئەوە فیعلێکی تعجیزیەو لەدەستەڵاتی مرۆڤدا نییە

(إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ )[١٣٧]

إنــا و نحــن بــەكارهاتووە چــونكە كــردارى تــەنزيل كردارێكــە لەدەســتەڵاتى بەديهێنراواندا نييە (وإنا لهُ

لحافظون) پاراستنى ئەو (ذكر)ە قورئانەش لەگەڵ هەموو گۆڕانكارى ژيانى مرۆڤدا تا رۆژى قيامەت ئەوە لەخودى خۆيدا ئيعجازێكە، پاراستنێكە لەدەستەڵاتى بەديهێنراودا نييە

(وَإِنَّا لَنَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ ﴿٢٣﴾)[١٣٨]

هەردوو فرمانى كاريگەرى ژياندن و مراندن تەنها لە كارسازى خوا دەوەشێنەوە (جل جلالە) (وَنَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾)[١٣٩] ميراتى و گەڕانەوە تەنها بۆ پەروەردگارە واتە: ميرات گرى راستەقينە تەنها خوايە (سبحانە وتعالى)، لێرەدا بۆمان دەركەوت كە هەموو بەكارهێنانێك بۆ إنا يا نحن مەرجە صيفەتێك يا كارێك لە كارەكانى پەروەردگار بێت بەدوايدا ئايا لەسيفاتى جلال بێت يان جمال يا هەر ناوێك بێت لەناوە جوانەكانى پەروەردگار، بەڵام گەر خواى گەورە مەبەستى ئەوە نەبوو كەباسى سيفەتى خۆى بكات يا باسى فيعلى خۆى بكات ئەگەر مەبەستى ئەوە بوو باسى زاتى خۆى بكات ئەوە إنا يا نحن بەكار ناهێنێت بەڵكو (أنا) ئەفەرموێت (من) بەكاردەهێنێت

(إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي ﴿١٤﴾)[١٤٠] (إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ ﴿١٢﴾)[١٤١]

کەمەبەستی زاتی خۆی بێت ئەفەرموێت: (انـا) گوتارێکە بۆ هەموو مرۆڤێك کەبگەڕێتەوە بۆ ڕێگەی ڕاست و پەروەردگار بپەرستێت، دێینەوە سەر باسەکەمان.

- کتێبی (التخلق البشری) پرۆفیسۆر (کیث مۆر) کە پرۆفیسۆرێکی گەورەی ئەم سەردەمەیە لەکۆرپەلە ناسیدا، پرۆفیسۆرە لەزانکۆی (تۆرنتۆ) لەکەنەدا چەندین کتێبی هەیە کە بۆتە کتێبی پرۆگرامی لەزانکۆکانی پزیشکیدا لەجیهانداو میوانی بەڕێزە لە هەر کۆنگرەیەکی ئیعجازی قورئاندا کە ساز بکرێت، بەڵکو لەچەند کتێبێکی دا دەقەکانی قورئان دەخاتە لاپەرەکانی یەکەمیەوە چونکە دەقاو دەق لەگەڵ زانستدا گونجاوە، لەم کتێبەداو لە لاپەڕە (١٠)دا دەڵێت: لەناوی ئافرەتدا ئێنزیمێك هەیە ئەو پرۆتینەی کەلەسەرەتای سپێرمەکەیا هەیە پرۆتینێکی سوکەرییە کاتێ ئەو ئینزیمە کە تێکەڵ دەبێ بە ئاوی ئافرەت نزیك هێلکۆکە دائەماڵرێت و لادەبرێ و ئەو سپێرمە دێتە دەرەوە کە سیفاتی باوکەکەی لەسەر تۆمارکراوەو ئامادە دەبێت بۆ چوونە ناو هێلکۆکە کە لەهەمان کاتیشدا کارلێکێکی وەها ڕوودەدات لەو خانانەی کەلەتوێـژاڵی دەرەوەی هێلکۆکەکەن کەکەوتونەتە بەرامبەر ئەم سپێرمە دامالراوەو ئامادەدەبن بۆ هاتنە ژوورەوەی ئەو بەشە، لەهەمان کاتیشدا حالەتێکی سێیەمیش ڕوودەدات لەهەموو ڕووبەری هێلکۆکە حالەتێك ڕوودەدات لەکرژبونەوە نایەڵێن هیچ سپێرمێکی تر یا هیچ تۆوێکی تر بێتە

---

[١٤٠] طە / ١٤ .
[١٤١] طە / ١٢ .

ژوورەوە، ئــەم ســێ ڕووداوە بــۆ زاناکــان روون بۆتــەوە، قورئــانی پیرۆزیــش دەفەرموویّت:

(وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾)[١٤٢]

وشەی (سلالە) دەهۆنینەوە بزانین لەزمانی عەرەبیدا مانای چییە؟ (سلالە) لەفرمانی (استل) وە واتە: (انتزاع شيء وإخراجهٔ برفق) داماڵینی شتێك و هێنانــە دەرەوەی بەئاســانی، ئــەو ســیفاتی باوکــە لەوێــدا زۆر بەئاشــکرا دەرئەکەوێت. کەیەکەم هەنگاوی دروست بوونی منداڵ (سلالە)یە یەکەم هەنگاو بریتییە لەداماڵینی ئەو سپێرمە کە تەنها ئەو بەشەی کەسیفاتی باوکەکەی لەسەر تۆمارکراوە ئەوە دەردەکەوێت، هەر ئەوە دێتە دەرەوە، ئەوانەی تر وەك قاوغێك یا بەرگێك فرێی دەدات لەهەمان کاتیشدا داماڵینێك هەیە لە هێلکۆکەی دایکەکەدا ئەو پەردەیەی کەبەرامبەریەتی ئەویش دادەماڵرێت و ئامادەدەبێت بۆ هاتنە ژوورەوەی سیفاتی باوك، مەسەلەی بەدیهێنان کەئەمە یەکەم هەنگاویەتی تەنها بریتی نییە لەخەلقێکی ئاوا روون و ئاسایی بەڵکو قورئان دەفەرموویّت:

(قُتِلَ ٱلْإِنسَـٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾)[١٤٣]

مەسەلە تەنها دروست کردن و ئەندازەگیری نییە بەڵکو تقدیری لەگەڵە ووردەکارییەکی سەیری لەگەڵە ئەو ئەنزیمانەی کەباسمان کرد لەملاوە

---

[١٤٢] المؤمنون / ١٢ .

[١٤٣] عبس / ١٨ .

دەرگای بۆ دەکرێتەوەو لەو لا هەموو دەرگاکانی تری لێ دادەخرێت، بۆ ئەوەی هیچی تر نەیەتە ژوورەوە،

(ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾)[١٤٤]

وشەی ثم لەزمانی عەرەبیدا (تفيد التراخي الزمني) واتە: ماوەیەکی پێ دەچێت، زانست بەهۆی کامێراوە بەهۆی ئەزموونەوە بۆی دەرکەوت ئەم تۆوە کاتێك دەچێتە ناو هێلکۆکەوە دەبێتە یەك خانە پێی دەوترێت: (زایگۆت) وە پاش ماوەیەك دەبێتە دووان، دووانەکە دەبێتە چوار ئەمەش پێی دەڵێن (بلاستۆمیر) هەموو قۆناغەکان پزیشکەکان دەیخوێنن لەزانکۆی پزیشکیدا، هەر قۆناغێك ناوێکی هەیە لەچوارهەمین رۆژدا پێی دەڵێن (مورولا) لەپێنجەمین رۆژدا پێی دەوترێت: (بلاستۆسست) ئەمە واتە: درەنگ کەوتنێکی تێدایە لەبەر ئەوە قورئان (ثم)ی بەکارهێناوە وە پاش ئەم (٥) رۆژە (ثم جعلناه نطفة) پێشتر ئاماژەمان پێ کرد کە جوڵە لەتۆوی پیاوو ئافرەتدا مەرجە، ئەم هێلکۆکەیە پاش ئەوەی کە تۆوەکە چووە ناوی ئەبینیت ئەجوڵێت، لە کەناڵی فالوبەوە ئەڕوات و ئەجوڵێت، ئەم گۆڕانکاریانەشی بەسەردادێت تا دەبێتە (١٦) دانەو گەورەتر دەبێت تا دەگاتە ناو رەحم لەوێدا شێوەی لە دڵۆپە (قطرة) ئاو دەچێت، قورئان دەفەرموێت: (ثم جعلناه نطفة) (ثم) بریتییە: لەو (٥) رۆژەی کە دەخایەنێت (جعلناه نطفة) بزانین (نطفة) لەزمانی عەرەبیدا مانای چییە؟ لە زۆربەی سەرچاوە فەرهەنگییەکانی زمانی عەرەبییدا ئاوا هاتووە کە (نطفة) واتە: (القليل من الماء الذي يعدل قطرة) ئەو برە کەمەی ئاو کەیەکسانە بە دڵۆپەیەك، بێجگە لە ووشەی دڵۆپە ئایا

---

[١٤٤] المؤمنون / ١٣ .

چی گونجاوه لێرەدا ئێمە بەکاری بهێنین؟ جوانترین و شیاوترین و گونجاوترین وشە بۆ ئەم دۆخە ووشەی (قطـرة)یـە، خـوای گـەورە لـە قورئانــدا دەفەرمووێت:: ئەیکەین بە دڵۆپەیەك لەکوێدا (فی قرار مکین ) گرنگ ترین دوو خەسڵەتی یزدان (منالّدان) یا رەحم ئەوەیە کە یەکەم: جێگیربوون.

دووەم: پاراستن و ئارامی تێدایە، ئەو بەدیهێنراوە لە یزدانـدا جێگیر دەبێت، ئـەلکێت بـە دیوارەکـەوە ئەمـە (قـرار) جێگیربوونەکەیـە[١٤٥] (فی قـرار مکـین) (مکـین)یـش سـیفەتێکی ئاشـکرای رەحمـە کـە ئـەو ئامادەبوونـەی تێدایـە بـۆ پاراستنی ئەو منداڵە.

هەر لە شەشەمین رۆژەوە لەناو دیواری رەحمدا دەچێنرێت (ئینپلانتەیشن)ی پێ دەڵێن، دەچەسپێت خۆی دەلکێنێت بـەوەوە، وورده وورده لەچواردەهەمین رۆژدا شێوەی دڵۆپەکە نامێنێت شێوەیەکی تـر دروست دەبێت قۆناغێکی تـره کە قورئان ناوی ناوه

(ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ﴿١٤﴾)[١٤٦]

ئـەم (ثـم)یـەش دیـاره ماوەیـەك بەسـەریدا تێپـەر دەبێت تـا شـێوازی کرمێـك وەردەگرێت. (علق) لەزمانی عەرەبیـدا دوو مانـا دەبەخشێت: مانایـەکیان (هو الالتصاق والتعلق بشيء ما) واتە: لکاندن و خۆهەڵواسـین بەشـتێکەوە کـە ئەمـە رووی داوه چونکە ئەم کۆرپەیە لەو تەمەنەدا کە تەمەنی ١٤رۆژو بـەرەو ژووره

---

[١٤٥] ووشەی (قرية وقرى)ش لەوەوە هاتووه واتە: دێ، مەبەست پێی جێنشین بوونە، ئەگەر گوندێك کۆچەر بن بە شوێنەکەیان ناڵێن (دێ)، بەڵکو پێی ئەڵێن (هۆبە، دەوار، رەشماڵ)، شوێنێك (استقرار)ی تێدا بێت پێی دەوترێت (قرية) دێ.

[١٤٦] المؤمنون / ١٤ .

خـۆی هەڵواسـیوە بـەدیواری رەحمـەوە وخـۆی نوسـاندوە بەدیوارەکـەوە و لە١٦هەمین رۆژدا چوکڵەیەك دروست دەبێت دەبێتە والأشی دواروژ ئەوە روونە کە بەوەوە خۆی هەڵواسیوە، مانای دووهەم: (دودة الماء التي تمتصُ الدَم) ئەو کرمی ئاوەی کە خوێن دەمژێت، ئەم مانایەش دیسان گونجاوە بۆ ئەم وەصفە چونکە لەو تەمەنەدا لەدەوروبەری تەمەنی ١٤ تا ٢٤ رۆژ ئەوە لە کرمی ناو ئاو دەچێت، ئەو کرمەی کە خوێن دەمژێت چونکە ئەمیش خوێن دەمژێت، ئەگەر ئەو بەدیهێنراوە لەو قۆناغەدا بهێنینە دەرێ پڕە لەخوێنی دایکەکە، واتە: هەردوو ماناکە گونجاون و جوانترین دەربڕین بەکاربێت بۆ ئەم قۆناغە بەراستی زاراوەی (علقه)یە، پاش (علقه) ئایەتەکە دەفەرموویێت:

(فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً ﴿١٤﴾)[147]

لێرەدا (ثم)ی بەکار نەهێنا، (فاء التعقیب)ی بەکارهێنا (تفید التعقیب والترتیب) واتە: شتێك روودەدات کوت و پڕە، ماوەی زۆر ناخایەنێت، ئەم (علقه)یە شێوەی دەگۆڕێت دەبێتە (مضغة) زانستیش بۆی دەرکەوت کەئەم قۆناغەی (مضغة)یە لە ٢٥ یا ٢٦هەمین رۆژدا دروست دەبێت. لەزمانی عەرەبیدا (مضغة) واتە: (شيءٌ لاكته الاسنان) یاخود (مادة ممضوغةٌ عليها طبع الاسنان) واتە: ئەو کەرستەیەی کە شوێنەواری دانی مرۆڤی پێوە دەرکەوتووە. یان بەواتایەکی تر واتە ئەو ماددەیەی کە بە دان جووڕابێت. مانایەکی تریشی هەیە (مایمكن مضغهٔ) زانا رۆژئاوایەکان زاراوەی چوود لایك (Chewed Like) یان بەکارهێناوە لەکتێبە زانستییەکاندا. واتە: ماددەیەکی جووراو ئاگاشیان لەقورئان نییە کە ١٤سەدە لەمەوپێش وەصفی

---

[147] المؤمنون / ١٤ .

کـردوه بـەجووراو لەشـتێك دەچـێت کـە بـە ددان جوورابێـت و شـوێنەواری دانەکەی لەسەر دەرکەوتبێت. سەیر دەکەین لەکتێبی (علم الاجنة في ضوء القران والسنة) خشتەیەك هەیە لەلاپەرە ٧٨دا بۆمان دەردەخات کە لە (٢٣ و ٢٥ و ٢٧) هەمین رۆژدا کتوپڕ حەوت یان هەشت چوکڵە پەیا ئەبن. کەپێش ئەو بەرواره ئەم چوکڵانە نەبوون کەلە دەرەوە سەیری دەکەیت لەچی دەچێت لەماددەیەکی جووراو دەچێت ئەمانە دەبنە سەرچاوەیەك بۆ زۆر لەئەندامەکانی لەش، ئێسقان و هەروەها ماسولکەو ئۆرگانەکانی تر بەلام هەمووی نابێگومان قۆناغی (مضغة) بەردەوام دەبێت تا ٤٢هەمین رۆژ واتە: تا شەشەمین هەفتە ئینجا هەندێك لەئەندامەکان دروست دەبن. خوای گەورە دەفەرموێت:

(...ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ ﴿٥﴾)[١٤٨]

هەندێك ئەندام دروست دەبێت لەو قۆناغەدا و هەندێکی تری هێشتا دروست نەبووە. زانست بۆی دەرکەوت کە کۆرپەلەی مرۆڤ لە ٤٢ هەمین رۆژدا جیادەکرێتەوە لەگەڵ کۆرپەلەی ئاژەڵ دا، لەو کاتەدا ئەوە روون دەبێتەوە. بەبێ ئەوەی هیچ گوزارشتێك بدەین فەرموون بزانن پێغەمبەر (ﷺ) چی دەفەرموێت:: (إذا مر بالنطفة اثنان واربعون ليلة بعث الله اليها ملكا فصورها وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها)[١٤٩] ئەو ٤٢ رۆژەی کە زانست دەڵێت گۆرانکارییەکی روون و ئاشکرا دروست دەبێت لەکۆرپەلەی مرۆڤدا

---

[١٤٨] الحج / ٥ .

[١٤٩] ئەم فەرمووده درێژە لە (صحيح مسلم) بە ژمارەی (٢٤٤٥) یاداشت کراوە، لاپەڕە (٢٠٣٧) کتاب القدر / ج ٤ .

سەرەتای دروست بوونی ئێسك و سەرەتایی جیاکردنەوەیەتی لەگەڵ کۆرپەی ئاژەڵا، ئەم فەرموودەیەش پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: *کەلەسکی دایکیدا ٤٢* شەو تەواو دەکات خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێت شێوە جیادەکاتەوە، ئێسکی پێئەدا گۆشتی پێ دەدا، پێستی پێ دەدا، چاوو گوێی بۆ دروست دەکات بەفرمانی خوا (سبحانه و تعالى)، مەسەلەی ئێسقان هەمووی پێکەوە گەشە ناکات سیستەمێکی زۆر سەیرە هەندێکی هەر لەو تەمەنە کورتەدا وەك ئێسقانەکانی ناو گوێ (گوێی ناوەندو سندان و ...) ئەمانە لەتەمەنێکی زۆر بچوکدا دروست دەبن و کامڵ دەبن. بە لاّم ئێسکی ئەندامی تری وەك ران و باسك و بازوو ئەمانە هەتا ٢٠ ساڵی نەش و نما یان بەردەوامە. زانست تا پێش دروست بوونی ئامێرە پێشکەوتووەکانی پشکنین و ئەزموون وای دەزانی گۆشت دروست دەبێت پاشان ئێسقان دروست دەبێت بەڵکو قورئان دەفەرمووێت: ﴿عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ﴿١٤﴾﴾[150]

بەڵکو ئێسك دروست دەبێت وە پاشان بەکتوپڕی گۆشتی لەسەر دروست دەبێت، ئێسکەکە کە لەسەرەتادا کالسیۆمی زۆر وەرنەگر تووە، واتە: ئێسکە پەیکەرێکی کرکراگەییە، پاشان وردە ووردە پتەو دەبێت و گۆشتیشی لەسەر دروست دەبێت، ئایا پێغەمبەر (ﷺ) ئەم جۆرە کامێرایانەی هەبووە کەئەمە وەصف دەکات؟ بەڵکو لەکۆتایی فەرموودەکەدا (ثم قال: يارب أذكرٌ أم أنثى؟ فيقضي ربك ماشاء، ويكتب الملك)[151] پاش ئەوەی کە فریشتەکە ئەو سیفاتانە تۆمار دەکات وە دەفەرمووێت: خوایە نێرینەیە یا مێینە؟ خوای گەورە

---

[150] المؤمنون / ١٤ .

[151] پاشماوەی فەرموودەکەی لاپەڕە (٢٠٣٧)ی (صحیح مسلم)ة.

حوكمی چۆنە بزانە پاشان حوكم دەدات چونكە دوای ئەوە بە ٨٤ رۆژ ئینجا رەگەزی ئەو بەدیهێنراوە دیاری دەبێت. كچە یا كوڕە! ئەوەش تۆمار دەكرێت لەو قۆناغەدا، دوای ئەوە قۆناغی (نشأە) گەشەمان هەیە

(ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَ ۝١٤)[١٥٢]

جومجومەی كۆرپە لە سەرەتادا زۆر گەورەیە لەچاو لەشیدا دوای ئەو قۆناغە دەبینین ووردە ووردە شێوە مندالێك وەردەگرێت (ثم انشاناه خلقاً آخر) ئەویش ماوەیەك دەخایەنێ و ووردە ووردە گەورە دەبێت لە ٩هەمین هەفتەوە دەست پێ دەكات هەتا ١٢هەمین هەفتە. ئیتر رەگەزەكە پەیدا دەبێت بەخێرایی دەروات تا ٣٨هەمین هەفتە لەو ماوەیەدا ئەندامەكان سەرجەمیان دروست دەبن و رۆح دەكرێت بەبەریدا، لێرەدا راستیەیەكی زانستی تریش هەیە كە تا ٦ مانگ تەواو دەكات لەڕووی زانستییەوە پێی دەوترێت: (ئێمبریۆ) دوای ٦ مانگ پێی دەوترێت (فیتەس) دوای ٦ مانگەكە گەر ئەو مندالە دەربهێنرێت ئەژی چونكە جەستەی تەواو بووە، ئەم راستیە ١٤ سەددە لەمەوپێش پێشەوا عەلی (رەزای خوای لەسەربێت) بەهۆی هەلگۆزینی دوو ئایەتی قورئانەوە فەرمووی (هەلگرتنی مندال لەسکی دایكدا شەش مانگە) ئەمەش بەپێی ئەو ئایەتەی كە دەفەرمووێت:

(وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ ۝١٥)[١٥٣]

---

[١٥٢] المؤمنون / ١٤ .

[١٥٣] الاحقاف / ١٥ .

حەملی دایك بۆ منداڵ هەتا لە شیر دەبڕرێتەوە ٣٠ مانگە، ئایـەتێکی تـر هەیـە
﴿ وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ ﴿٢٣٣﴾ ﴾[١٥٤]

دایك دەبێت شیر بدات بەمنداڵی بۆ ماوەی ٢٤ مـانگ: ٣٠ – ٢٤ = ٦ مـانگ واتـە: ٢٤ لە ٣٠ دەرکەین شەش دەمێنێتەوە.

ئێستا زانستی پزیشکیش ئەم راستییەی سەلماندووە، وە ئەمـە ئـەمڕۆ تـەنها بـۆ پزیشکەکان نییە، بەڵکو بەهۆی چڕی کەناڵەکانی راگەیاندنەوە لەجیهانـدا ئـەم راسـتیانە هاتۆتـە بـەردەمی هـەموو مرۆڤێـك، کـە ئەمـە بەرجوویەکـە لـە بـەرجووەکانی خـوا چۆنیەتی دروسـت بوونمـان دەرکـەوتووە بـەڵکو زاناکـان و پسپۆرە بەرزەکانی جیهان دان بەوەدا دەنێن کەلەهەموو قۆناغێکدا قودرەتێـك بـەرێوەی دەبـات، حیکمـەتێك، لطفیـك، رەحمـەتێك لەگـەڵ ئـەم کۆرپەیەدایـە بـەڵکو کـە دەگاتـە قۆنـاغی هاتنـە دەرەوەی بـۆ نـاو دنیـا تەماشـا دەکـەیت بەشێوازێك لەدایك دەبێت لەهەموو جیهانـدا لەهـەموو مێـژوودا ئـەو قودرەتـە ئەمر دەکات بەئێسکەکانی سەری کـە گـرژ ببنـەوە ئـەو قودرەتـە ئـەمر دەکات بەئێسکەکانی حەوزی دایکی کە بکشێ و گەورە بێت. بۆچی ئەو فرمانـە ئاوها بۆ دایکەکە ئەڕوات وەئاوها بۆ کۆرپەکە دەڕوات؟ هـەردووکی ئێسقانە!! بۆچـی ئـەم ئێـسقانەی حـەوزی دایکەکـە گـەورە دەبێـت؟ بۆچـی ئێـسقانی سـەری منداڵەکە کرژدەبن؟ ئایا ئـەو منداڵـە عـەقڵی هەیـە لەوتەمەنـەدا خـۆی بـچوك بکاتـــەوەو بێتـــە دەرێ؟! بێگومـــان عـــەقڵی نییـــە. بـــەڵام ئـــەو قودرەتـــەی کەلەیەکەمین رۆژەوە چاودێری کـردووە تـا ئـەو چـرکەیە چاودێری دەکـات وە

پاشــان کەدێتــە دەرێ ئــەو بەرنامەیــەی پێیــە دەگــەڕێت بەشــوێنی شــیرداو دەیدۆزێتەوە بەبێ مامۆستا.

لەکۆتاییــدا: دەڵــێم لەپێغەمبــەریان پرســی (ﷺ) (أي ذنــب أعظــم)[155]؟ ئــەی پێغەمبەری خوا چ گوناهێك زۆر زۆر گەورەیە فەرمووی: أن تجعل لله نداً وهو خلقك. ئەوەیەکە هاوەڵێك بۆ خوا دابنێیت کەتۆی دروست کردووە بەبێ هاوەڵ واتە: هاوەڵ دانەنێین بـۆ خـوای گـەورە لـەو چـوار حەقـەی کـە هـەر هـی خـوای گەورە خۆیین بە تەنها کەس نەکەین بەهاوەڵی:

١- تیایدا لەخۆشەویستی دا هاوەڵی نەبێت.

٢- لەگوێرایەڵیدا هاوەڵی نەبێت.

٣- لەچاوگی حوکمدا هاوەڵی نەبێت.

٤- لەدوعاداو نزاو پارانەوەمانداو پەنابردنماندا هاوەڵی نەبێت.

---

[155] بە (متن)ی جیاواز هاتووە لە البخاري، المسلم، أحمد بن حنبل، النسائي، الدارمي.

## باسی بیست و یەکەم

## ئیعجازی قورئان و سوننەت لە چەند بوارێکی زانستیدا

لە ڕامانێکی کورتی قورئانی پیرۆزدا دەردەکەوێت کە خوای گەورە بەچەند دەربڕینێك باس لە خوای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەکات، ئایا زاناکان چۆن ئەمەیان تەفسیر کردووە واتە: خاوەنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، خاوەنی دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوا، خاوەنی ڕۆژهەڵاتەکان و ڕۆژئاواکان

(رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ ﴿٩﴾)[156] (رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾)[157] بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ ﴿٤٠﴾)[158]

شێخ محمد متولی الشعراوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) جوانی پێکاوە وەك دەفەرموێت:: (رب المشرق ورب المغرب) سەرجەمی زەویە بەحوکمی ئەوەی زەوی هەسارەیەکی گەرۆکە دەخولێتەوە بەدەوری خۆردا بە شێوەیەکی گشتی ڕۆژهەڵاتێك و ڕۆژئاوایەکی هەیە. ئەو ئایەتەش کە دەفەرموێت:: (رب المشرقين ورب المغربين) هەر زەوی خۆی هەمیشە نیوەی تاریکەو نیوەی ڕووناکە ئەو خاڵەی کە دەبێتە (ڕۆژهەڵات) یەکەم جار لەوێوە ڕۆژهەڵدێت، لەهەمان کاتدا لەشوێنێکی ئەو سەردا خاڵێکی تر دەبێتە (ڕۆژئاوا) بۆی واتە: ئەو بەشەی

---

[156] المزمل / ٩ .

[157] الرحمن / ١٧ .

[158] المعارج / ٤٠ .

کەرووناکەو رووی لەخۆرە (مشرق و مغرب)ی خۆی هەیە بە پێچەوانەوەی رووە تاریکەکەوە، واتە: (مشرق)ی رووە روناکەکە (مغرب)ی تاریکەکەیە وە (مغرب)ی رووناکەکە (مشرق)ی تاریکەکەیە. لە ئاکامدا دوو (مشرق)و دوو (مغرب) پێك دێن. حاڵەتی سێهەم: تەفسیرەکەی (رب المشارق و رب المغارب) هەر خاڵێك وەرگرین لەسەر زەوی دا کە دەبێتە (مشرق) لەهەمان کاتدا خاڵێکی تر دەبێتە (مغرب) یاخود هەرچی خاڵە لەسەر زەویدا رۆژهەڵات و رۆژئاوای خۆی هەیە، خاڵ بەبێ کۆتایی بژمێرە رۆژهەڵات و رۆژئاوایان بەدوادا دێت بەبێ کۆتایی. بەم جۆرە بەم راڤە زانستییە شێخ شعراوی شەرحی کردووە، جگە لەمەی کە فەرموویەتی زیادەیەکی زانستی نوێ هەیە: لەم ساڵانەدا دوو خۆر دۆزرانەوە، ناویان نان:

یەکەم: (ئەلفاسەنچرا A) کەکەمێك لەخۆرەکەی ئێمە گەورەترە.

دووەم: (ئەلفاسەنچرا B) کەکەمێك لەرۆژەکەی ئێمە بچوکترە.

هەسارەیەکی گەرۆکیش رۆژانە دەسورێتەوە بەدەوری ئەم دوو خۆرەدا واتە: لەهەموو خولێکیدا دوو جار رۆژهەڵات دروست دەبێت وە دووجار رۆژئاوا دروست دەبێت (ربُ المشرقین وَ ربُ المغربین) ئەمە زیادەیەکە بۆ سەر ئەو راڤانەی کە زاناکان پێشتر لەسەر ئەم ئایەتانە فەرموویانە. ئەم دۆزینەوانە بەردەوامن، ئەم زیادانەو خستنەسەرانەش درێژەیان دەبێت، ئەم دۆزینەوە زانستییانە بەردەوام دەبن تا رۆژی قیامەت، لەفەرموودەدا هاتووە کە قورئانی پیرۆز (لاتنقضي عجائبه)[159] رازی قورئان لەبن نایەت وە خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێت:

---

[159] ئەم فەرمودە بەم شێوەیە (ولا تنقضي لاتفني عجائبه) هاتووە، رواه الدارمي في فضائل القرآن ١ / ٢٥ ، رواه الترمذي في ثواب القرآن / ١٤ .

(سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾)[١٦٠]

گەر سەرنج بدەین لەم ئایەتە کە دەفەرموویّت: (حتى يتبين لهم أنهُ الحق) تا وەکو بۆیان دەردەکەویّت کە ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگارەوە (سبحانه وتعالى) هاتووە زاناکان ئەمڕۆ لەجیهاندا ڕێککەوتوون لەسەر ڕاستیەک لەسەر ڕوداویّکی گەردوونی کە پێی دەوترێت: (بیك بانگ) واتە: تەقینەوە گەورەکە، ئەم تەقینەوە گەورەیە دە هەزار ملیۆن ساڵ لەمەوپێش ڕوویداوە، دووساڵ لەمەوپێش لەکۆباسێکی میحرابدا باسی دووزانامان کرد کە توانیان دەنگی ئەو تەقینەوەیە تۆماربکەن ئەو تەقینەوەیە دەنگەکەی گەیشتۆتە ئێمە وە تەمەنی دە هەزار ملیون ساڵ لەمەوپێشە. یەکەمیان ناوی (ئارنۆڵد پێنزایەس) کە ئەندازیاری تەلەفۆناتە لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆیدا ناوی (ڕۆبەرت ویڵسن) بوو کە فەرمانبەرێکی تەلەفۆنات بوو بەهۆی کۆڵ نەدانەوە توانیان خەڵاتی نۆبڵ بەدەست بهێنن، دەنگی ئەو تەقینەوەیە تۆماربکەن واتە: بوو بەیاسایەك لەبەرئەوەی بەڵگەی لەسەرە کە تەقینەوەیەك ڕوویداوە نەك تەنها تیۆرێك بێت و بەس وە لەئەنجامی ئەو تەقینەوەیەدا حاڵەتێك لەگەورە بوونی گەردوون ڕوودەدات، سەبارەت بەتەقینەوەکە قورئانی پیرۆز دەفەرموویّت:

(أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾)[١٦١]

---

[١٦٠] فصلت / ٥٣ .

گەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین باسی (رتق) دەکات (رتق) واتە: یەك پارچە (ففتقناهما) واتە: تەقینەوە، هەرچی شوێنێك گەر ئاوی تیابوو ژیانی تێدایە ئەگەر بێ ئاو بوو ژیانی تێدانییە ئەمەش یەکێکە لەو راستییانەی کە زانست جەختی لەسەر دەکات سەبارەت بەگەورە بوونی ئەم گەردوونەوەو بەردەوام بوونی ئەو گەورە بوونە، دیسان قورئان باسی دەکات وە دەفەرمووێت:

(وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ )[١٦٢]

ئەگەر وورد ببینەوە دەبینین هەمیشە لەزمانی عەرەبیدا رستەی ناویی (الجملە الاسمیە) مانای بەردەوامی دەبەخشێت ئەم فراوان بوونە لەگەردوون دا، بەردەوامە.

زانست گەیشتە ئەوەی کە دەنگەکەی تۆمار بکا وە گەیشتە ئەوەی کە بەژمارە خێرایەکەی بپێورێت وە بزانێت چەندەو چۆن گەورە دەبێت فەرموون بزانن دکتۆر خالد السویدان بەزمانی خۆی ژمارەکەمان پێ دەڵێت: (یتسع الکون بسرعةٍ هائلة قدرها العلماء أن حجم الكون يكبر مليون ترليون ترليون سنة ضوئية مكعبة كل دقيقة اليس هذا هو الاتساع وماقدروا الله حق قدره والارض جميعاً قبضته يوم القيامة والسموات مطويات بيمينه) پاش ئەم ژمارە گەورەیە دەفەرمووێت: (سنة ضوئية مكعبة) واتە: ساڵی تیشکی توان سێ، مانای ئەم هەموو ژمارە گەورە فەلەکییەی کە فەرمووی ئینجا ×ی خۆی دەکرێتەوە ٣ جار (سبحان الله) لەهەموو دەقیقەیەك دا ئەم گەورە بوونە ئێجگار زۆرە. زاناکان هەندێ جار لە کەناری گەردووندا هەسارەیەك دەدۆزنەوەو دوای ماوەیەك

---

[١٦١] الأنبياء / ٣٠ .

[١٦٢] الذاريات / ٤٧ .

لەدەستیان دەردەچێت چونکە خێراییەکەی هی ئەوەنییە کە فریای بکەون بەشێوەیەکی بەردەوام. ئێستاش با بیربکەینەوە لە ئەم پارچەیەی گەردوون بزانین ئەم گەردوونە چەند گەورەیە! چەند فراوانە! بیر لەم پارچە بکەینەوە بۆمان دەردەکەوێت نەك هەر خۆمان بچوکین نەك هەر زەوییەکەمان بچوکە نەوەك هەر کۆمەڵەی خۆرمان بچوکە! بەڵکو ئەو گەلەکسییەو ئەو مەجەڕەی کەناوی میلکی وێیە (Milky Way) کەبە عەرەبی پێی دەڵێت (درب التبانە) ئەویش جێگەیەکی ئەوتۆی نییە لەم گەردوونە گەورەیەدا ئینجا مرۆڤ بەسەرکێدا خۆی بەگەورە دادەنێت؟! بە چ رووپەکەوە مرۆڤ خۆی بەگەورە دادەنێت؟! کە کۆمەڵەی خۆرەکەت جێگەیەکی ئەوتۆی نییە لەم گەردوونەدا بۆیە پێویستە مرۆڤی ژیر رێگەنەدا بەدەروونی، خۆی بەشت بزانێت.

لەهەمان کاتیشدا زاناکان لەگەڵ ئەوەدان کەرۆژێك دێت ئەم گەورەبوونە دەوەستێت ئەم فراوان بوونە کۆتایی دێت ئینجا بەپێچەوانەوە گەردوون بچوك دەبێتەوە ئەگاتەوە ئەو خاڵەی کە یەکەم جار تەقینەوەکە رووی تیادابوو، ئەچێتەوە ئەو دۆخەی جارانی، دیسان قورئانی پیرۆز جەخت لەو راستییە زانستییە دەکات زاناکان گەردوون بە ئیسپرینگێك بەراورد دەکەن کە رادەکێشرێت تا دەگاتە ئاستێك کەبەرەڵای دەکەیت دێتەوە دۆخەکەی جارانی، قورئان دەفەرمووێت:

(يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ١٠٤)[١٦٣]

ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین خوای گەورە دەفەرموویت: (وعداً علينا) خوا کردویەتی بەبڕیارێك پەیمانێکی خۆی کەئەم گەردوونە گەورە بکات تا رادەیەکی دیاریکراو وە پاشان پەیمانە لەسەر خۆی فەرموویەتی دەیهێنینەوە حاڵەتەکەی خۆی وەك کتێب داخستن وەك سجل داخستن (كطيّ السجل للكتب).

تێبینییەکی گرنگ / کۆمەڵێك هەن بەتەواوەتی دژ بە هەموو مەسەلەیەکی زانستین کە بخرێتە پاڵ قورئان یان دژ بە راڤەی زانستی قورئانن. ئەویش قوتابخانەیەکە (طه حسين) داینـاوە، بەهیچ جۆرێك نایەڵن راڤەی زانستی نزیکی ئایاتی قورئان ببێتەوە (طه حسين) ئەو ئەدیبە گەورە بەناوبانگە بوو کە هەبوو.. بەڵام لەڕووی زانستییەوە هیچی وای پێ نەبوو.

قوتابخانەیەکی تر هەیە کە پێچەوانەی ئەوە ئەیانەوێت ملی هەموو ئایەتێك خوار بکەنەوە بۆ هەموو تیۆرێك کە دەردەچێت و بانگەشەی بۆ دەکرێت، ئێمە نەلەگەڵ یەکەمداین وە نە لەگەڵ دوهەمداین بەڵکو ئێمە دەمانەوێت خەڵکی تێبگات وە بزانن جیاوازیەك هەیە لەنێوان تیۆرو یاسادا شتێك کەووتیان تیۆرە سبەینێ لەوانەیە بگۆڕێت ئەوکاتە چۆن راڤەی ئەو ئایەتە دەکەیت کە دوێنێ لەگەڵیدا گونجاندبووت!؟ بۆیە ئێمە لەگەڵ ئەوەداین هەندێك باس کە دەگەنە ئاستێك پێیان دەوترێت: (حقائق) راستی یان (یاسا) وە راڤەیەکی هاوچەرخەی ئایەتێکن بۆچی باسیان نەکرێت! بۆچی ئەو ئیعجازە زانستیە باسی نەکرێت!؟ لەکاتێکدا کە ئەم مەرجانەی تێدابێت:

١. لەگەڵ هیچ حوکمێکی قورئانیو (نبوی)دا دژ نەوەستێت.
٢. لەگەڵ رێزمانی عەرەبیدا پێچەوانە نەبێت.
٣. لەگەڵ راڤە بڕواپێکراوەکانی ( معتبر) پێشینان و سەلەفی صاڵحمان دا دژ نەوەستێت.



بەم مەرجانە هەموو موسڵمانێکی زانا بۆی هەیە (إضافة) بکات، مەبەستیش لە (ئیعجازی زانستی) وەرگرتنی عیبرەتە تێگەیشتنێکی باشترە.. عیبرەتیش بەچی وەردەگیرێت بەبیرکردنەوە وەردەگیرێت، بەوورووژاندنی ئەقڵ، بەتێڕوانین، مرۆڤ دەگاتە ئەو ئاستانەوە بەهۆی بیرکردنەوەوە مرۆڤ پێش دەکەوێت وە شارستانیەت.. دروست دەکات بەپێچەوانەشەوە کە ئەگەر بیرکردنەوە سڕ بکەین ئەگەینە حاڵەتێك کە ئیتر ئەقڵمان پەکی دەکەوێت، مرۆڤیش ئازادە (فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾)[١٦٤]

ئازادە لەوەی کە ئەقڵ بەکاربهێنێت و بڕوا بەرەو ڕێگەی ئیمان یاخود ڕێگەی کفر هەڵبژێرێت بەفەرامۆش کردنی ئەقڵ، لێرەدا بابێینە سەر دیمەنێك لەخۆر کە نزیك ترین ڕۆژە بۆ ئێمە، بیری لێ بکەینەوە ئەم تۆپە ئاگرینە (٩٣) ملیۆن میل لەزەوییەوە دوورە ملیۆنەها پلەی سەدی گەرمیەکەیەتی، ئەو ماوەیەی کەلەنێوان خۆرو زەویدا هەیە ئەگەر کەمتر بێت بەردو شاخەکانی سەرزەوی هەمووی دەتوێنەوە ئەگەر دوورتر بێت نەوەك هەر ئاوەکان بەڵکو هەواکەشی دەیبەستێ‌و لە هەردوو حاڵەتیشدا بۆ ژیانی زیندەوەران ناگونجێت، ئایا ئەمە ڕێکەوتە؟ ئایا ئەم هاوسەنگیە ملینۆها ساڵە کە هەیە هەر لەخۆیەوە دروست بووە؟ بیربکەینەوە لەو وزە گەرمیەی کە خۆر دەیدات و گونجاوە بۆ ژیانی زیندەوەران لەسەر زەویدا، ئەم گەرمییەی کە دەگاتە زەوی وەك ئەوەیە ١٦ بلیۆن بەرمیل نەوت بسوتێنی لەرۆژێك دا، واتە: بەقەدەر ئەو نەوتەی لەماوەی ٦ ساڵ دا لەزەویدا دێتە دەرێ‌و بۆ ئەم هەموو بوارە بەکاردێت لەرۆژێك دا ئەوەندە ووزەی گەرمی لە خۆرەوە دەگاتە زەوی!! وەسڵێکیشمان بۆ نایەت داوای دراوەکەی مان لێ بکات!!!

---

[١٦٤] الکهف / ٢٩ .





روناكیەكەی: لەهەموو چركەیەك دا ٤٠٠ ترلیۆن ترلیۆن واط ئەگاتە سەر رووی زەوی.. بیربكەرەوە لەبارستایی زەوی ئەم قورساییو كێشی زەوییە ئەگەر زیاتر بوایە كەبس ئەبوین لەگەڵ زەویدا و ئەمان دەتوانی بجوڵێین ئەمان دەتوانی هیچ كارێك بكەین بەهۆی زۆری ئەو هێزی راكێشانەوە ئەگەر زەویش وەها نەبوایە سوك تربوایە لەئێستە ئەمان دەتوانی جێگیر ببین لەشوێنێك دا هەمیشە بەهەواوە دەبووین ئایا ئەم هاوسەنگیەی كە ئێستاكە هەیە هەر لەخۆیەوە بووە؟ ئایا ئەم راستیانە بەس نین بۆ وورووژاندنی ئەقڵ؟ بۆ باوەڕهێنان بە پەروەردگار (سبحانه و تعالى).

تێبینییەكی گرنگ: جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەقڵ و مێشك دا بۆ زانین گرنگی خۆی هەیە (مێشك) مەبەستمان ئەو بەشە مادیەیە كەلەناو سەردایە (مۆخە.. دەمارە.. خوێنە.. خانەیە....) ئەوە بەشێكی مادیە (ئەقڵ) مەلەكەیەكە ئەڕوات و دێت وەك رۆح كورد زۆر جوان پێكاویەتی كە دەڵێت (عەقڵ هەمیشە میوان نییە) بەڵكو دێت وەك میوانێك و ئەڕوات ئەگینا ئەو مێشكە ٢٤ سەعاتە لەناو ئەو قەباغی سەرەدایە ئەی بۆچی مرۆڤ هەڵە دەكات؟! لەكاتی نەشتەرگەریدا (بەنج كراو) مێشكی بوونی هەیە، بەڵام عەقڵی لەوێ نییە، كەواتە مێشكەكە ئەو دەورەی نییە بەڵام عەقڵ كە ئیش دەكات لەڕێی مێشكەوە ئیش دەكات، یەكێك كە مەشروبات دەخواتەوە مێشكەكە هیچی لێ نەهاتووە، خانەكانی وەكو خۆیەتی ئەی بۆ هەڵە دەكات؟! چونكە ئەقڵەكەی ئامادە نییە. لەبەرئەوە زۆر پێویستە ئێمە عەقڵ لەگەڵ مێشك دا جیابكەینەوە ئەگەر مێشك زۆر زۆر گرنگ بوایە خۆ مێشكی حووت ٥ ئەوەندەی مێشكی مرۆڤ قورسە، مێشكی (مەیمونی شامپانزی) لە ٩٨٪ لەمێشكی مرۆڤ دەچێت، ئەی بۆ عەقڵی نییە؟ ئەم دوو مەسەلەیە ئەبێت لەیەكیان جیا بكەینەوە، ئەقڵ هێزێكی

مەعنەویە لەلایەن خواوە دێت و ئەڕوات. بەڵام کە دێت لەکوێدا دائەبەزێ؟ لەمێشك دا دادەبەزێ بەڵام بەتووڕەبوون و بەمەشروبات خواردنەوەو بەتلیاك کێشان و بەغەفڵەت دەڕوات.

له ٢٠٠٠/٦/٢ دا کەناڵی (النيل الثقافية) بەرنامەی (رأيت الله) دکتۆر پرۆفیسۆر عبدالباسط محمد السيد له (مركز الدراسات والبحوث العلمية) کە دکتۆرای هەیە لەجیۆلۆجیدا (٣) شتی باس کرد دوانیان بیستوومانە بەڵام یەکێکیان نوێ بوو بۆمان، باسی

(إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾)[١٦٥]

ی کرد کەوا لەنێوان گرکان و بومەلەرزەدا پەیوەندیەك هەیە ئەمە بیستومانەو زانست سەلماندویەتیو دەرکەوتووە کە ئەو پەیوەندیە هەیە، سەبارەت بەراستییەکی تر

(وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾)[١٦٦]

ئەویش راستییەکی زانستییە، چڕی ناخی زەوی، واتە: ئەو کانزا تواوانەو بەردە تواوانە چڕییەکانیان زۆرترە لەدەرەوەی رووی زەوی، بۆیە خوا ناوی ناوە (أثقالها) ئەم دوو راستییەمان بیستووە بەڵام خاڵی سێهەمی تازە بوو: ئاژانسی ناسای فضائي ئەمریکی پەیوەندی کردوە لەگەڵ ئەم سەنتەرە زانستییەدا لەمیصر (قاهیرە) پێی ووتوون: دوا بومەلەرزە کە داویەتی لە(مەدینەی پیرۆز) بۆتە هۆی ئەوەی مەدینە دوورخاتەوە لەبازنەی ئەگەری بومەلەرزە... بەهۆی ئاخر

---

١٦٥ الزلزلة / ١ .

١٦٦ الزلزلة / ٢ .

بومەلەرزەوە جوڵەیەك رویداوە لەژێر زەویدا، چینەكانی زەوی گۆرانكارییەكی بەسەردا هات، بووە هۆی ئەوەی كەمەدینە بچێتە دەرەوەی ئەو فیلدە ئەمە وەك هەواڵێك لە ١٩٩٩دا دراوە بە (مركز الدراسات والبحوث العلمیة ) لەقاهیرە، دەستەی ئیعجازی زانستی وەڵامی داونەتەوە كە ئێمە پێش ئێوە ئەوە دەزانین ئەوانیش ووتیان: پێمان بڵێن چۆن؟ ووتیان: ئەو بومەلەرزەی كە ئێوە باسی دەكەن لەسەردەمی (عومەر ی كوڕی خەتتاب)دا بوو ئەو زاتەی كە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی دەفەرمووێت: (لو كان بعدي نبي لكان عُمَر ابن الخطاب)[١٦٧] ئەگەر پێغەمبەرێك دوای من هەبوایە عمری كوڕی خطاب دەبوو.

ئەم زاتە شەو نەئەنوست عیبادەتی ئەكرد بەرۆژیش خەریكی خزمەت بوو بە موسڵمانان. ئەی كەی ئەنووست؟ لەنێوان نوێژی نیوەڕۆ تا نوێژی عەسر، ئەو بومەلەرزەیەی كە روویدا دوای نوێژی نیوەڕۆ و پێش نوێژی عەسر بوو، حەزرەتی عومەر نوستبوو، لەبەرئەوەی بومەلەرزەكە هەربەردەوام بوو خەڵكی زۆر ترسان ناچار خەبەریان كردەوە ووتیان: (یا أمیر المؤمنین) ئەمە ماوەیەكە ئەم ئەرزە هەر ئەلەرزێ‌و ئەم خانوانە وەك بێشكە دێن و دەڕۆن و ئەویش دەستی دایە دووڕەكەی كە پارچەیەك پێست بوو (ئەڵێن: گوایە پارچەیەك لە نەعلی پێغەمبەر (ﷺ) بووە) گرتی بەدەستیەوەو هاتە ناو ئەو جەماوەرە، كێشانی بە ئەرزەكەدا فەرمووی: (أثبتي الم أعدله علی ظهرك)؟ جێگیر بەو مەلەرزە ئەی دادپەروەر نیم لەسەرت؟ یەكسەر بومەلەرزەكە نەما لەو بەروارەوە مەدینە چۆتە دەرەوەی ئەو فیلدە. ئەمەش ئیعجازێكە لەئیعجازەكانی ئیسلام، كە

---

[١٦٧] لو كان بعدي نبي... الرقم (٧٤٧٠) عن عقبة بن عامر (احمد في مسنده، الترمذي، الحاكم) عن عصبة بن مالك (طبراني في الكبير) قال الهيثمي وهو (ضعيف) ص٣٢٥ / ج٥ / فيض القدير شرح جامع الصغير.

ئێمە داکۆکی لەسەر ئەقڵ دەکەین وە بەئەقڵ شت دەدۆزینەوە ئەقڵ سنووری هەیە بێ توانایە بەرامبەر قەدەر بەرامبەر ئیمان بەرامبەر زیندووبونەوە بەرامبەر تسخیرو مەدەدی ئیلاهی نازانێت ئەمانە تەفسیر بکات، ئەقڵ مەسئەلەی هیدایەت و تەسلیم بوون بەخواو یارمەتی خوا تێ ناگات، ئێمە ئەوەی بەئەقڵ تەفسیر دەکرێ ئەیکەین وە ئەوەی کە ئەقڵ پێی ناوێرێ ئیمان بەکاردەهێنین کەبەرهەمی عبودیەتە، پەرستشی خوای گەورە نهێنی وەهای تێدایە یەکسەر یارمەتیت دەدات بۆ (تێگەیشتنی هیدایەت.. تێگەیشتنی غەیب.. تێگەیشتنی قەدەر.... ) کە ئەقڵ پێیان ناوێرێت خوای گەورە لەفەرموودەیەکی ئیلاهی دا دەفەرمووێت: (عبدي أطعني تكن مثلي، تقولُ للشيء كن فيكون) واتە: بەندەکەم بە پەرستە دنیا دەخەمە ژێر دەستت ئەمریان پێ دەکەی بەقسەت دەکەن، ئەوە لەئەنجامی پەرستشی خوایە (سبحانه و تعالى) ئێمە هیچ قورسایەک و ناڕەحەتییەک نابینین لەتەفسیری ئەم جۆرە دیاردانەدا زاتێکی وەک و حەزرەتی عومەر شتێکی وا بکات، لەبەر ئەوە عەقڵ ناتوانێت هەموو مەسئەلەیەک چارسەر بکات لەگەڵ ئەو هەموو ڕێزەی قورئان بۆ عەقڵ

(إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ )[١٦٨]

موسڵمانی ڕاستەقینە ئەوەیە کەهەموو وزەی ئەقڵی بەکار دەهێنێت لە چوارچێوەی ئیماندا، چونکە ئیمان و باوەڕ لەئەقڵ فراوانترن و لەئەقڵ گەورەترن.

---

[١٦٨] الحجر / ٧٥.

## باسی بیست و دووەم
## ئیعجازی قورئان و سوننەت لەبواری پزیشکی دا

ڕۆژانە خەڵك دەمرێت، دکتۆرەکان دەڵێن: فلاّن میکرۆب لەلەشیدا بوو، بەلاّم هەمان میکرۆب ئەچێتە لەشی یەکێکی تر کە لەو مردووە پیر ترو لاوازترە، کەچی دەشبێتە هەڵگری میکرۆبەکەو هیچ کاریشی تێ ناکات!! هەمان میکرۆب ئەچێتە لەشی کەسی سێهەمەوە نەك کاری تێ ناکات و دەبێتە هەڵگری ئەو میکرۆبە پاش ماوەیەك کە خوێنی دەپشکنی شوێنەواری میکرۆبەکە نابینیتەوە. پزیشکەکان وەلاّمیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە دەڵێن: فلاّن جۆر (لیمفۆ سایت)ی لاواز بووە، یاخود هۆکارێکی بۆماوەیی یان فاکتەرێکی تر ئەهێننەوە، بەلاّم لەراستیدا موقنع نییە، یاخود بۆچی ئەو جۆرە (لیمفۆ سایت)ە لەم مرۆڤەدا دروست نەبووە بەو بڕەی کەبتوانێ ئەو میکرۆبە لەناو بەرێت، بەلاّم لەو مرۆڤە بەتەمەنەدا توانی بەرگری بکات. ئێمەی موسڵمان وەلاّمی ئەم حاڵەتانە بە (توحید) ئەدەینەوە، کەماڵی یەك خواناسی ئەوەیە کە هەموو قەدەرێك بەدەست خوایە (سبحانە وتعالی) وەهیچ شتێك ڕوونادات بەفەرمانی خوانەبێت (جل جلالە) ئەو خوایەی کەژیانی بەدەستە هەمان خوایە کە مردنی بەدەستە، هەر ئەو خوایە کەڕزق و ڕۆزیو قەدەری بەدەستە هەر ئەو خوایەیە (جل جلالە)کە بە قورئان ئەدوێت لەگەڵماندا. لەخزمەت ئایەتێکدا دەبین کەباسی هەنگ و هەنگوین دەکات

(يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ﴿٦٩﴾)[١٦٩]

---

[١٦٩] النحل/ ٦٩.

لەناو سکی هەنگ دا شەرابێك (شلەمەنیەك) دێتە دەرەوە هەمەڕەنگە بەگوێرەی ئەو گوڵ و گوڵزارو هەلاڵەی کەلێی خواردووەوە شیفای تێدایە بۆ خەڵکی قورئان ١٤ سەددە لەمەوپێش دەفەرموێت: (شیفای تێدایە) ئەمڕۆ زانستی پزیشکی دەڵێت: هەنگوین ١٩ مادەی زۆر بەکەڵکی تێدایە (پرۆتیناتی تێدایە کە ماددەیەکی سەرەکییە بۆ دروست بوونی ماسولکە ڤیتامین B٦، B٢، B١ ی تێدایە کە بەرگری تایفۆئید دەکات ومناهێڵێت مرۆڤ دڵی تێکەڵ بێت، نیکۆتینك ئەسیدی تێدایە کە ترشەڵۆکێکە نایەڵێت ئەو مرۆڤە توشی نەخۆشی (کلاگرا) ببێت ئەم نەخۆشییە پێستی مرۆڤ تووشی هەوکردن دەکات، هەروەها بەردەوام سکی دەچێ و لەشی خۆراك وەرناگرێت و خواردن هەڵنامژێت تووشی خڵەفان دەبێت، بەلام ئەوەی هەنگوین بخوات لەم نەخۆشییە دوور دەبێت، ڤیتامیناتی زۆر تێدایە و مادەو کانزای وەهای تێدایە کە یارمەتی مرۆڤ دەدات مێشکی هێور ببێتەوە....) زانایەکی بەناوبانگ و جەڕاحێکی جیهانی بەناوبانگ ناوی (ئەلبێرت شۆپەنزار)ە خەڵکی (گابۆنە) ئەم نەشتەرگەرە خەلاتی (نۆبڵ)ی وەرگرتووە لە پزیشکیدا کە بەرزترین خەلاتی زانستییە لەجیهاندا، نەشتەرگەرییەك دەکات شاشێکی خاوێن ئەخاتە ناو هەنگوینی ساغەوەو بەوە تەداوی نەخۆشی پێ دەکات ١٠٠٪ چارەسەری دەکات... بۆ سووتاندن نایەڵێت ئەو پێستە بڵق بکات، چونکە میکرۆب لەناو هەنگویندا ناژی (فیە شفاءٌ للناس) هەنگوینیان دۆزیەوە لەگۆڕستانەکانی فیرعەونەکان، لای فیرعەونەکان ئەو باوەڕە هەبوو کە زیندووبونەوە هەیە، مرۆڤ کە زیندوو دەبێتەوە لەشی لاواز دەبێت بۆیە دەبێ هەنگوین بخوات ئینجا بڕوات بۆ ئەو دونیا، هەر بۆیە لەلای مردووەکانەوە هەنگوینیان دادەنا، هەنگوینیان دۆزیوەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ٥٠٠٠هەزار ساڵ لەمەوبەر، بەمەرجێك هیچ جۆرە تێك چونێك رووی نەداوە لەو

هەنگوینەدا کە تەمەنی ٥٠٠٠ هەزار ساڵە تەنها ڕەنگەکەی نەبێت کەمێك ڕەش بووە.

زانایەکی ئەمریکی لەکۆلیجی کشتوکاڵ لەزانکۆی (نۆرپ کۆلۆرادۆ) هەڵسا بەتاقی کردنەوەیەك، هەنگوینی هێنا لەتاقیگەیەکدا خستیە کەمۆڵەیەکی شووشەوە پاشان هەندێك میکرۆبی نەخۆشی خستە ناو ئەو نموونەی هەنگوینەوەو سەرقاپەکەی نایەوە، ئەو میکرۆبەی کە دەبێتە هۆی نەخۆشی (زوحار) کە بەکوردی پێی دەوترێت: (زەحیری) دوای ١٠ سەعات میکرۆبەکە شوێنەواری نەما، تەنها توانی ١٠ سەعات بژی، میکرۆبی (الحمی التیفیە) جۆرێکە لەپەتا، جۆرێکە لەگرانەتا، (٢٤ سەعات) بەرگری کرد، میکرۆبێکی لەوە بەهێزتری هێنا کەناوی (تایفۆس) بوو دوای (٤٨ سەعات) شوێنەواری نەما، میکرۆبێکی هێنا کەلەوانەش هەمووی بەهێزتربوو (جرثوم الالتهاب الرئوي) کە جۆرێکە لەجۆرەکانی سیل، دوای (٧٢ سەعات) هەنگوینەکە کوشتی، خوای گەورە دەفەرمووێت: (فیە شفاءٌ للناس).

سەرئەنجام دەرکەوت کە میکرۆبات ناتوانێت لەهەنگویندا بژی، بەڵام ئەوەی هەنگوین تێك دەدات (سرکەو ئاو)ە دکتۆرەیەکی فەڕەنسی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی سەبارەت بە (حیض) ئافرەت دەچێتە سەر ئیعجازێکی تر ئەو دراسەیەی پێشکەش کرد کە ئەو نەخۆشیانەو ئەو زەرەرەی کە ژن و پیاو تووشی دەبن لە(ممارسەی جنس) دا لەکاتێکدا کە ئافرەت لە (حیض)دا بێت، پاش پێشکەش کردنی ئەو لێکۆڵینەوەیە موسڵمانێك پێی ووت: قورئانی پیرۆز ئەو ئایەتەی تێدایە :

﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ ﴿٢٢٢﴾﴾[١٧٠]

لێت دەپرسرێ ئەی محمد (ﷺ) سەبارەت بە (حیض) بڵێ: زەرەرو زیانە توخنی ئافرەت مەکەون لەکاتی (حیض)دا. ئەم ئافرەتە زانایە کەئەم ئایەتەی خوێندەوە بەزمانی خۆی تێی گەیشت، ووتی: مرۆڤێك (طب نسائي) نەخوێندووەو زانستی تەشریحی نەخوێندووە، هەزارو چوار سەد ساڵیش لەمەوپێش قسەی لەم جۆرە بکات ئەمە ووتەی خالیقی مرۆڤە کەواتە ئەو مرۆڤە نوێنەری ئەو خالقەیە (اشهد ان لا الە الا الله واشهد ان محمداً رسول الله) ئیمانی هێناو موسڵمان بوو[١٧١] پێش ماوەیەك لەکەناڵی CNN سەرژمێرییەکی پیشان دا کە بەشێوەیەکی گشتی رۆژانە لەجیهاندا ٥٠٠ ئافرەت دەمرێت بەهۆی شێرپەنجەی مەمکەوە.. هەرچەندە هەندێك لەپزیشکەکان هۆکارەکەی دەگەڕێننەوە بۆ (بۆماوە) یان شتی تر بەڵام هۆکاری سەرەکی ئەوەیە کە ئافرەت شیری خۆی نەدات بەمنداڵ بۆ ماوەی ساڵ و نیو کەمتر، ئەوە ئەگەری شێرپەنجەی مەمکی هەیە، لەناو ئەم گەلانەی جیهاندا لەیاباندا شێرپەنجەی مەمك زۆر زۆر کەمە چونکە ئافرەتی یابانی لە ١٨ مانگەوە بۆ ٢٤ مانگ شیر دەدات بە منداڵەکەی، ئەو ئافرەتە موسڵمانانەی کە پەیڕەوی قورئان دەکەن ئەوا دوورن لە شێرپەنجەی مەمکەوە دەرکەوت کە ئەو ئافرەتەی شیر بدات بە منداڵەکەی ساڵ ونیو بەرەو ژوور تا دوو ساڵ زۆر زۆر دوورترە لە

---

[١٧٠] البقرة / ٢٢٢.

[١٧١] بڕوانە کتێبی (الطب الوقائي في الاسلام) نووسینی ڕاگری دەرمانخانە (عمر محمود عبدالله) لاپەڕە ٩٥.

شیرپەنجەی مەمکەوە. وەك لەئافرەتانی تر کە شیر نادەن بەمندالّ یا بۆ ماوەیەکی زۆر کەم شیر دەدەن بەمندالّیان قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت:

(وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ ﴿٢٣٣﴾)[172]

بەلاّم ئایەتێکی ترمان هەیە

( وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ ﴿١٥﴾ )[173]

٦ مانگیان داناوە بۆ تەمەنی مندالّەکە لەناو سکی دایکیدا سالّ و نیوێکیان داناوە بۆ شیردان، واتە: فوقەهاکان لەنێوان سالّ و نیو تا دووسالّ دادەنێن بەباشترین ماوەی شیردان بەمندالّ، نابێت ( ١ سالّ و نیو) کەمتر بێت.. ئەمەش ئیعجازێکی زانستییە وە زانست گەشتۆتە ئەو قەناعەتەی کە مندالّ نابێت پێش سالّ و نیو لەشیر بیبڕنەوە، وەمانای ئەوە نییە هەر تەنها شیری بداتێ و بەس بەلّکو کەچووە (٥ مانگ)موە ئیتر بۆی هەیە شتی تری بداتێ بەس لەشیرەکەی نەبڕێتەوە.

ئێستا دێینە خزمەت چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە پەیوەندی هەیە بە ئیعجازی پزیشکییەوە، ئەفەرمووێت: (نهى عن الشرب من في السقاء)[174] پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردوە کەلەدەمی لەگەنێکەوە یان دۆلکەیەکەوە بخورێتەوە، باپرسیار بکەین، بۆچی ئەم نەهییەی کردووە؟ لەو کاتەدا میکرۆبات

---

[172] البقرة / ٢٣٣.

[173] الاحقاف / ١٥.

[174] عن أبن عباس (صحيح) (أبي داود، الترمذي، البخاري، أبن ماجة) قال الحاكم صحيح وأقره الذهبي. فيض القدير شرح جامع الصغير/ ج٦ ص٣١٦ /رقم ٩٣٩٧.

نەدۆزراوەتەوە بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەفەرمووێت: (أوتيت القرآن ومثله معه)[١٧٥] خوای گەورە قورئانی پێ بەخشیوم وشتێکی تریش وەك قورئان کە فەرموودەکانی خۆیەتی

(وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٌ يُوحَىٰ ۝٤)[١٧٦]

ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) خوای گەورە پێی فەرمووە کە دەم دەبات بۆ دەمی ئەو دۆلکەیە یا ئەو قاپە لەوێوە ئاو دەخواتەوە ئەگەرێکی زۆرە کە میکرۆباتی ناو دەمی تێکەڵ بەو ئاوە بێت دوایی کەسانێکی تر بەهۆیەوە تووشی نەخۆشی یەکەم دەبن، هەرچەندە یەکەم لەوانەیە خۆی پێوەی دیار نەبێت کە هەڵگری میکرۆبە بەڵام بەو شێوەیە بڵاوی بکاتەوە، لەفەرموودەیەکی تردا (لايتنفس احدكم في الاناء اثناء الشرب ولاينفخ فيه)[١٧٧] واتە: کەئاوێك دەخۆنەوە لەکاتی ئاو خواردنەوەکەتاندا هەناسە مەدەن. وە (فوو)شی لێ مەکەن. چونکە باهەموو ئاوەکەشی بخۆیتەوە نەبا تۆ هەڵگری میکرۆبێك بیت بچێتە ناو ئەو پەرداخەوەو یەکێکی تر ئاوی پێ بخواتەوە و دوچاری نەخۆشی بێت، ئەمە بەڵگەیە کە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ئیعجازی پزیشکی تێدایە چونکە بێجگە لە راڤەی بوونی میکرۆب هیچ تەفسیرێکی تر هەڵناگرێ... جاران تانکی نەبووە لەبانی ماڵاندا زەمانی کۆن لەتەشت و لەمەرکانەدا ئاو کۆکراوەتەوەو بەگوێرەی پێویست

---

[١٧٥] ألا إني اوتيت الكتاب ومثله معه... الى آخر الحديث، روي (أبو داود والترمزي والحاكم) عن المقدام بن معد يكرب.

[١٧٦] النجم / ٣، ٤.

[١٧٧] رواه البخاري / وضوء ١٩ ، مسلم / طهارة ٦٣ ، النسائي / طهارة ٤١ ، الدارمي / أشربه ٢١ ، احمد بن حنبل ٥.

تَی وەرگیراوە، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) دەفەرمووێت: (إذا استيقظ أحدكم من النوم فلا يغمس يَدهُ في الاناء حتى يغسلها فلا يدري اين باتت يدهُ)[١٧٨] واتە: یەکێکتان کەلەخەو هەستا دەست نەخاتە ناو ئەو ئاوە زۆرەوە، لەوێ دەست و دەم و چاوی بشوات چونکە نازانرێ دەستت لەکوێ بووە (دەعبای بەسەردا هەلگەراوە.. دەستت بردووە بۆ لوتت.. پیس بووە) ئەمەش بەلگەیە بۆ ئەوەی کە دەست هەلگری میکرۆبە.. بۆیە ئەبێ ئاو دەربهێنرێت ئینجا دەستی پێ بشۆیت نەك دەست بخەیتە ناو ئەو ئاوە زۆرەوە کە ئەو ئاوەش پیس بوو هەموو ئەو خێزانە تووشی دەردو نەخۆشی دەبن. لەفەرموودەیەکی تریدا: (إتقوا الذر فإن فيه النسمة) خۆتان بپارێزن لە تەپ و تۆز چونکە (النسمە)ی تێدایە، لەزمانی عەرەبیدا بە مانای زیندەوەر دێت کە بەچاو نابینرێت.

تێبینی / بەداخەوە هەموو هەینییەك دەبینین لەمزگەوتەکاندا، ئەو کەسانەی کەلەدەرەوەی مزگەوتەکە نوێژ دەکەن، بەرماڵ دەهێنن لەگەڵ خۆیاندا، پاش ئەوەی ئیمامەکە سەلام دەداتەوە، هەڵئەسن بەرماڵەکە دەتەکێنن بەدەم و چاوی موسڵماناندا دوور نییە جومعەکەیان بەتاڵ بێتەوە یان گوناهیان بۆ بنووسرێت چونکە ئەو میکرۆباتی ئەرزە کەلکاوە بەژێر بەرماڵەکەوە بەرزی دەکەیتەوە ئەیکەیتە ناو چاوی ئەو خەڵکەوە ئەیکەیتە ناو لوتی ئەو خەڵکەوە ئەچێتە ناو سی ئەو خەڵکەوە لەبەرئەوە تەکاندنی بەرماڵ دیاردەیەکی ناشارستانییەو داواکارین لەموسڵمانان کەواز لەم جۆرە رەفتارە بهێنن لەشوێنێکی دوور بیتەکێنن کە دوور بێت لە خەڵکی.

---

[١٧٨] ئەم فەرموودەیە بەم (متن)ە هاتووە: اذا استيقظ احدكم من نومه فلا يدخل يده في الاناء حتى يغسلها ثلاثا فإن أحدكم لايدري أين باتت يده. عن ابي هريرة (احمد في مسنده، ابي داود، الترمذي، النسائي، ابن ماجة) فيض القدير شرح جامع الصغير / ج١ / ص٢٧٨ / رقم ٤٣٥.

لەفەرموودەیەکی تری پێغەمبەردا (ﷺ) دەفەرمووێت: (أوکئوا کربکم واذکروا اسم الله وغطوا آنیتکم واذکروا اسم الله)[179] ئەمەش بەلگەیەکی ترە کەوا خواردن و خواردنەوە نابێت بەرەلا بکرێت بەلکو ئەبێت هەمیشە داپۆشراو بێت چونکە هەوا میکرۆبی تێدایەو خواردن و خۆراکمان پیس دەکات.

ئیبن عومەر (رەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: عن النبی ﷺ (نهانا ان نشرب علی بطوننا، ونهانا أن نغترف بالیدي الواحدةِ وقال لایلغ احدکم کما یلغ الکلب ولایشرب باللیل من إناء حتی یختبره إلا ان یکون مخمراً)[180] ئەم فەرموودەیە ئامۆژگاریەکی پێغەمبەرە (ﷺ) کە مرۆڤ تینووی بوو چووە سەر روبارێکیان سەر کانیاوێك.

یەکەم: بەدەما پاڵ نەکەوێت.

دووەم: بەیەك دەست ئاو نەخواتەوە، چونکە یەك دەست ئاوێکی کەم دەگرێت ئەگەر ئاوەکە پیس بێت دەرناکەوێت بەلام کەبوو بەدوو دەست ئەگەر هاتوو ئاوەکە پیس بوو دەردەکەوێت.

سێهەم: دەمتان نەخەنە ئاوەکەوە وەك ئاژەڵ بەلکو بەهەردوو دەست بیخۆنەوە.

چوارەم: بەشەو ئاو مەخۆنەوە تا سەیری نەکەن یاخود ئاوەکە خۆی داپۆشراو بێ ئەوە قەی ناکا.

---

[179] الطب النبوي / ابن قیم الجوزي / ص[178] . رواه الشیخان. لە (البخاری)دا فەرموودەیەکی درێژەو لە (جابری کوڕی عبدالله)ەوە دەیگێڕێتەوە، ئەوەی لێرەدا هاتووە بەم شێوەیە: (..وأوکوا قربکم واذکروا اسم الله، وخمروا آنیتکم واذکروا اسم الله... الخ) کتاب الأشربة باب ٢٢، تغطیة الآناء رقم الحدیث ٥٦٢٣، وفي صحیح مسلم کتاب الاشربة / ج٣ باب ١٢ ، رقم الحدیث ٢٠١٢.

[180] الطب النبوي / ابن قیم الجوزي، ص١٧٨ / ابن ماجة، کتاب اشربة ٢٥.

ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ بوونی میکرۆب و خۆپارێزییەکی تەندروستیشە. بەزاراوەی زانستی ئەمڕۆ پێی دەوترێت: (الطب الوقائي) زانستی خۆپاراستن، ئاشکراشە کە خۆپاراستن لە چارەسەر کردن باشترە. ئەمڕۆ مرۆڤایەتی دەناڵێنێ لەپیس بوونی هەواو ژینگە، ئایا بەهۆی میکرۆبەوە بێت یان کەرەستەی کیمایی، ئەو دووکەڵە بەرز دەبێتەوە لەدووکەڵکێشی سەیارەوە یان لە دوکەڵ کێشی کارگەکانەوە یان لە هەر ئامێرێکی میکانیکییەوە کە بەگازو بەنزین و بەبەرهەمەکانی نەوت ئیش دەکەن، ئەم دوکەڵانە هەریەکەی جۆرە ماددەیەکی کیمیایی دەکاتە بەرگە هەواوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

(ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ ﴿٤١﴾)[181]

ئەم فەسادو تێکچوون و پیس بوونی ژینگەیە بەدەستی مرۆڤەکان دەکرێت، ئەگینا ژینگە خوای گەورە بەجوانی دروستی کردووە، بەڵام سزای مرۆڤی پێ دەدات

(بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾)[182]

هەندێك لەو ناسازیەیان پێ دەچێژین، بەڵکو بگەڕێنەوە، سەرخۆیان و ژینگە کە بپارێزن، ماددەی (T.E.L) ساڵی ١٩٢٥ زاناکانی ئەمریکا کردیانە ناو بەنزینەوە، پێش ئەوە دەیان ناڵاند کەوا تابتەکانی سەیارەکانیان تەقەتەق دەکات ئەم ماددەیە کە (تێترا ئیپایل لێدی) پێ دەڵێن کرایە بەنزینەوە ئیتر تەقە تەقی نەما،

---

[181] الروم / ٤١ .

[182] الروم / ٤١ .

ئەیان ووت: ئەمە ماددەیەکی پیرۆزە لەئاسمانەوە هاتووەتە خوار، دوایی دەرکەوت لە حەفتاکاندا پشکنینی پزیشکیان لەچەندین ولایەتدا بۆ منالآن کرد ٣٠٪ منالآن قورقوشم لەخوێنیاندا بوو، ئەو (P-B-S-O٤)ی کە لە ئەگزۆزی سەیارەی بەنزینەوەی دێتە دەرەوە، ژینگە پیس دەکات و ئەچێتە سییەکانەوەو تێکەڵ بەخوێن دەبێت، لەبەرئەوە بڕیاریاندا کە ئەو ماددەیە نەکەنە بەنزینەوە، ئەم بەنزینەی ئێستاش پێی دەڵێن (فری لێد) - بەنزینی ئێمە نا بەڵکو هی خۆیان - ئەو ماددەیە (T.E.L) لای خۆیان بەکارهێنانی قەدەغەیە بەلآم بۆ ئێمەی دەنێرن!! لەو جۆرە پیس بوونانە لەکارگەدا روونەدا بۆ نموونە: (کبریتات)ە یان (ئەکاسیدی کبریت)ە هەتا شیّ زیاتری تێکەڵ بێت مەترسییەکەی زیاتر دەبیّو بەرەو ئەسیدیتی واتە: ترشەڵۆکی دەڕوات، خوای میهرەبان هەمیشە هەوا دەجوڵێنێت، جولآنەوەی هەوا پاکردنەوەی ژینگەیە، دوورخستنەوەی میکرۆباتە، دوورخستنەوەی ماددەی کیمیاویە لەشارەکانداو هێنانی هەوای پاکی دەوروبەرە، لەساڵی ١٩٥٢ دا بۆماوەی چەند سەعاتێك خوای گەورە هەوای ناو لەندەنی راگرت، ئەو دوکەڵ و تەم و مژەی بۆ ماوەی چەند سەعاتێك راگرت ٤٠٠٠ هەزار کەس مردن![١٨٣] دەبزانە هەوا چەند پیس کراوە!!!

تێبینی / ئەو کەسانەی کەسەیارەیان هەیەو گەراجەکەیان داخراوە قەت ئیش بە سەیارەکە نەکەن لەناو گەراجەکەدا، چونکە یەکێك لەو بەرهەمانەی کەلە ئەگزۆزی سەیارە دێتە دەرێ یەکەم ئوکسیدی کاربۆنە، هەمان گاز لەخەڵۆزدا هەیە کاتێك لە ژوورێکی داخراودا گەش دەکرێتەوە بۆیە تکایان لێ دەکەین لەژووری داخراودا خەڵوز دانەگیرسێنن، ئەم یەکەم ئۆکسیدی کاربۆنە بۆنی نییە،

---

[١٨٣] بڕوانە کتێبی ئەپلاید فارمەکۆلۆجی (Applied Pharmacology) نووسینی: ئەندرۆ نێڵسن، ل[٥٦٠] .

رەنگــی نییــە، وە گــازێکی کوشــندەیە، تێکــەڵ بــەهیمۆگلۆبین دەبێــت، ئــەو هیمۆگلۆبینــە توانــای ئــەوەی نابێـت لەسـییەکاندا لێـی رزگـار بێـت و ئۆکـسجین وەربگرێـت بۆیـە بـە ژەهـراوی بـوون ئـەو منداڵـە یـا ئـەو کەسـە شـین دەبێتـەوە دەمرێت.

لەگەراجی داخراودا، هەندێك كـەس سـەیارەكەی دەشـواو لەسـەر سـلۆلی ئیـشی پـێ دەكات لەوانەشە منالەكەشی بهێنێت و لای خۆیەوە دای بنێت، ئەوە زۆر كارەساتی لێ كەوتومتەوە ئەو كەسانە بووراونەتەوەو گیانیان لەدەست داوە.

بەڵام (سبحان الله) ئەو خوایەی كەلەقورئاندا دەفەرمووێت:

﴿ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ﴾[184]

جۆرە بەكتریایەك دۆزراوەتەوە لەگڵدا دەژی، لەهەموو گڵێكدا هەیە، خـوای گـەورە دای ناوە كارەكەی پەلاماردانی یەكەم ئۆكسیدی كاربۆن بێت، لەژینگـەدا نایهێڵێت، لەهەموو شوێنكیشدا هەیە.. لەگڵی هەموو ولاتێكـدا، ژینگەكـە كـە پـاك دەكاتـەوە، گازەكانی تریش بەهۆی درەختـەوە، بەهۆی ماددەی (كلۆرۆفیل)ەوە زۆر لـەو دووەم ئۆكسیدی كاربۆنەو ناهێڵێت و ژینگەكە پاك دەكاتەوەو دەوری فلتەرێك دەبینێت.

بلاوبوونـەوەی نەخۆشـی تـەنها لەمرۆڤـدا نییـە بـەڵكو لەئاژەڵیـشدا هەیـە، لـە فەرموودەیەكی پێغەمبەردا (ﷺ) دەفەرمووێت: (لایرد ممرض علی مصح)[185] ئـەو كەسـانەی كـە خـاوەن ئـاژەڵن ئەگـەر یـەكێك یـا چـەند دانەیـەك لەئاژەڵـەكانی دەردەداربن با تێكەڵی ئاژەڵی تری نەكات، چونكە ئـەو نەخۆشییە دەگوێزرێتـەوە.

---

[184] المدثر / ٣١ .

[185] رواه الشیخان .

لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: (فر من الجذام فرارك من الاسد)[١٨٦] رابکە لەو کەسەی دووچاری نەخۆشی گولی بووە چۆن لەشێر رادەکەیت.

لەپێغەمبەریان (ﷺ) پرسی سەبارەت بە طاعون، هەرگیز پێغەمبەر (ﷺ) طاعونی نەدیووەو لەو ناوچەیەی ئەودا رووی نەداوە بەڵام بەم جۆرە وەصفی دەکات و دەفەرمووێت: (إذا سمعتم به بارضٍ فلا تقدموا عليه وإذا وقع بأرضٍ وأنتم بها فلا تخرجوا فراراً منهُ)[١٨٧] گەر بیستتان لەشوێنێکدا طاعون بڵاوبۆتەوە مەچن بۆ ئەو شوێنە، ئەگەر خۆشتان لەشوێنێکدا بوون تیا بڵاوبووەوە ئەوێ بەجێ مەهێڵن، بیربکەرەوە لەم ئامۆژگارییەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە بناغەی زانستێکە ئەمڕۆکە پێی دەوترێت (الحجر الصحی) بوونیادی ئەم زانستەیە، بەراستی هیومانیزمی ئیسلام پیشان دەدات، ئەتوانی رابکەیت و دەڵێت رامەکە، تووش دەبیت یا تووش بیت!! ئەمری یا بمریت!! گرنگ ئەوەیە خەڵکی تر پارێزراوبن!! ئەگەر مردیشی خۆگربە ئەوە شەهیدی چونکە دەفەرمووێت: (الطاعون شهادةٌ لكل مسلم)[١٨٨] واتە: (ئەو موسڵمانەی بەطاعون بمرێت شەهیدە) طاعون لەکتێبی پزیشکیدا کەدەیخوێنیتەوە بریتییە لە (میکرۆب)ێك ناوە زانستییەکەی (گرام نێگەتیف باسیللۆکۆکس)ە ئەم میکرۆبە لەناو جۆرە کێچێکدا ئەژی، ئەم جۆرە کێچە، کاتێ دێتە سەر مرۆڤ یا هەر ئاژەڵێك ئەو میکرۆبەی ناوخۆی دەگوێزێتەوە بۆ ناو خوێنی ئەو مرۆڤە یا ئەو ئاژەڵە، بەو جۆرە ئەو مرۆڤە یا ئەو ئاژەڵە دووچاری طاعون دەبێت، با مرۆڤ بکەین بە نموونە: کەچووە

---

[١٨٦] رواه البخاري / كتاب طب / ج١٠ / ص١٧١ مع فتح الباري .

[١٨٧] رواه الشيخان / له (البخارى)دا به ژمارەى (٥٧٣٠) هاتووە / كتاب طب باب٣٠ ، ما يذكر في الطاعون.

[١٨٨] رواه البخاري / له كتێبى (صحيح البخارى)دا ژماره (٥٧٣٤)ى پێدراوە.

ناو خوێنی‌یەوە بەهۆی گازلێگرتنی دڕندەیەك، ئەگەر گازەکە لەبەشی خوارەوەی گیرابێت.. با بزانین کێ بەرگری لەو مرۆڤە دەکات؟ (غودەی لەمفاوی) کە کەوتۆتە بەینی ڕان و سکەوە، ئەوێ دەئاوسێت و بەرگری دەکات، گەر گازەکە لەدەست گیرا بێت ( بۆ نموونە لەبەشی سەرەوەی لەشدا بێت) بن باڵ دەئاوسێت و غودەی لەمفاوی ژێر باڵ بەرگری دەکات و دەبێتە مەڵبەندی ئەو میکرۆبە. ئینجا سەیری وەڵامی پێغەمبەر (ﷺ) بکەن سەبارەت بە پرسی طاعون کە عائیشە لێی دەپرسێ، دەفەرمووێت: (غُدَة كغدة البعير تخرُج من المراق والابط)[189] واتە: غودەیەکە یا دووچاری (مراق) دەبێت (مراقیش ئەو غودەیە کەلەنێوان ران و سکی حوشتر)دایە (الابط)یش واتاکەی روونە کە یەعنی: بن باڵ لەکاتێکدا کە بە زیانی طاعونی نەدیووە بەڵکو مژدانەی داوەوە یەکێکیشە لە موعجیزاتی پزیشکی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووێت: (إن الطاعون لايدخلُ المدينة)[190] تا ڕۆژی قیامەت طاعون ناچێتە مەدینەی پیرۆزەوە، ئەمەش ئیعجازێکە تائێستا نەمان بیستووە کە گاعون چووبێتە مەدینەوە وەناشچێت ئەم (الحجر الصحى)یەی کە بوونیادێکی رەسەنی تەندروستییە تەنها بۆ طاعون نییە، هەندێك نەخۆشی هەیە ئەچوێنرێت بە طاعون، خێرا بڵاودەبێتەوە وەك (کۆلێرا) کۆلێراش هەمان حوکمی هەیە، ئەگەر بڵاوبووەوە لەشوێنێکدا نابێت ئەو شوێنە بەجێبهێڵیت،لەرووی شەرعییەوە بۆت نییە بەجێی بهێڵیت، چونکە گوناهبار دەبیت.

---

[189] رواه البخاري .

[190] رواه البخاري / في كتاب الطب / رقم الحديث (٥٧٣١) باب٣٠ ما يذكر في الطاعون. عن ابي هريرة

ئەم یاسای (حجر الصحی)یەکە پێغەمبەر دای ناوە (ﷺ) پاش (٧٥٠ ساڵ) رۆژئاوا پەیکەڵی کرد، ساڵی ١٣٤٨ نەخۆشی طاعون گەیشتە ئیطالیا تەتارەکان هێنابوویان ئیتر لەئیتاڵیاوە بەهەموو ئەوروپادا بڵاوبوویەوە. لەدەرەوەی شاری میلانۆ دەزگایەکیان دانا بۆ خەڵکی بێگانە، خەڵکی بێگانە کە دێت ناهێڵن بڕواتە ناو شاری میلانۆوە (٣٠رۆژ) لەوێ ئەیهێڵنەوە، خواردنی پێشکەش دەکەن و خزمەتی دەکەن نەبادا هەڵگری طاعون بێ، بەو شوێنەیان دەووت: (ترنتینا) لە (٣٠) وە هاتووە واتە: خانەی ٣٠ رۆژەکە.

دوایی سەیر دەکەن هەر بڵاودەبێتەوە کردیان بە (٤٠رۆژ ) هەرچی رێبوارێك لەوێوە دەهات بیەوێت بچێتە ئیتاڵیاوە (٤٠رۆژ)لەوێ گلیان دەدایەوە ناویان نا (کرنتینا) واتە: (مانەوەی ٤٠رۆژ)ی کە بە مێژوو سەیری دەکەیت بەراوردی دەکەیت لەگەڵ فەرمودەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) کە دەفەرموێت:: ئەگەر طاعون لەووڵاتی خۆتا نا بڵاوبویەوە ئەو شوێنە بەجێ مەهێڵن دەردەکەوێت ئیسلام (٧٥٠ ساڵ ) پێش رۆژئاوا یاسای (الحجر الصحی) داناوە.

فەرموودەیەکی ترمان هەیە بە رووکەش ناگونجێ لەگەڵ ئەو فەرموودانەی کە باسمان کردن (لا عدوى ولاطيرة)[١٩١] کە وورد دەبینەوە (فر من الجذام فرارك من الاسد)[١٩٢] کە گولێك دەبینیت راکە لێی چۆن لەشێرێك رادەکەیت. یان کە دەفەرمووێت: لە وەفدی (ثقیف)دا کەهاتن موسڵمان بېن، بەیعەت بدەن بەرسول

---

[١٩١] رواه البخاري ومسلم / عن ابا هريرة يقول قال رسول الله (ﷺ) : (لا عدوى ولا طيرة ولا هامه ولا صفر وفر من المجذوم كما تفر من الاسد) كتاب الطب / باب١٩ الجذام / رقم الحديث ٥٧٠٧ في صحيح البخاري واطرافه ٥٧١٧ ، ٥٧٥٧ ، ٥٧٧٠، ٥٧٧٣ ، ٥٧٧٥. وفي سنن ابي داود ج٣ / كتاب الطب، باب في الطيرة، رقم الحديث ٣٩١١ ورقم ٣٩١٦.

[١٩٢] هەمان سەرچاوەی رابردوو .

الله (ﷺ) یەکێکیان گول بوو پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری بۆ نارد کەوا بەیعەتی تۆمان قبوڵ کردو شایەتومانی تۆمان وەرگرت و بگەڕێرەوە (إرجع فقد بايعناك)[193] بۆ ئەوەی ئەو نەخۆشییەی بڵاونەکاتەوە، ئەمە لەلایەکەوە فەرموودەیەکی تریشمان هەیە (لاعدوى ولاطيرة) زۆر بەئاسانی ئێمە گونجان دەبینینەوە لەنێوان ئەم دوو فەرموودەیەدا ئەوەیان بۆ ئەو نەخۆشییانەیە کە گوێزەرەوەن، ئەمڕۆ زانستی پزیشکی دەڵێت: هەموو نەخۆشییەك مەرج نییە بگوێزرێتەوە لەرێی میکرۆباتەوە، کەواتە: ئەو نەخۆشیانەی وەکو طاعون و سیل و کۆلێراو جۆرەها هیپتایتز و سەحایا و هەڵامەت..... ئەمانە گوێزەرەوەن ئەوە دەبێت لێیان دوور بکەویتەوە، ئەو نەخۆشیانەی کە گوێزەرەوەشنین پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت: بزانن کە جۆرێکی تریش نەخۆشی هەیە پەتا نییە گوێزەرەوە نییە بەهەواو بەهەناسە ناگوێزرێتەوە ئەوە (لاعدوى ولاطيرة) نقڵ نابێت وە رەش بین مەبن مەیکەن بەواهیمە بچن بۆ لای ئەو نەخۆشانەو سەردانیان بکەن.

سەبارەت بەهەنگوین یەکێ لە دکتۆرە جیهانیەکان ناوی (هیرتویج)ە دەڵێت: (١٠٠گم) هەنگوین لەگەڵ نیولیمۆی ترشدا هەڵامەت لادەبات، پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێت: (من توضأ فأحسن الوضوء وعاد أخاه المسلم محتسباً بعد من جهنم مسيرة سبعين خريفا)[194].

دکتۆرەکان دەڵێن: ئەو کەسەی کە نەخۆش بۆچی نەخۆشییەکی تری بۆ بهێنری؟ خۆی گیرۆدەی نەخۆشییە بە راستی ئازاری دەدری، ئامۆژگاریەکەی پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوەیە: کە دەچن بۆ لای نەخۆش دەستتان بشۆن، دەست نوێژێك هەڵبگرن نەبا هەڵگری میکرۆبات بن و دەستتان میکرۆباوی بێت. ئەمە

---

[193] رواه مسلم .

[194] رواه أبو داود، عن انس.

ئەوپــەڕی شارســتانییەتە ئامۆژگــاری زانــستییانەیە، بەڕاسـتی کــە مێــژوو دەخوێنیتـەوە سـەرکردەیەك نابینیت کـە چـووبێتە ووردەکاریـەکانی ژیانـەوەو مـوفرەداتی ژیـانی بلاوکردبێتـەوە بـۆ خـەڵکی بەقـەدەر محمـد (ﷺ)، خێرێـك نـەماوە باسـی نـەکات، شـەڕێك نـەماوە کـە ئومەتەکـەی‌و مرۆڤایـەتی لێ ئاگـادار نەکردبێتەوە (ﷺ).

له فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: (لکل داءٍ دواء فإذا أصيبَ داءُ الداء بـرأ بأذن الله)[195] واتە: (خوای گەورە بۆ هەموو دەردێك دەرمـانێکی دانـاوە، ئەگـەر ئـەو دەرمانـە گونجاوە بهێنیـت بـۆ ئـەو دەردە بـەفرمانی خـوا شـیفا دروسـت دەبێـت) لەفەرموودەیـەکی تـردا: (مـاأنزل الله مـن داءٍ إلا أنـزل لـه شـفاء)[196] خـوای گـەورە دەردێك نانێرێت ئەگەر شیفای لەگەڵ دا بۆ نەنێررێت.

لەفەرموودەیەکی تردا: (علمهُ من علم وجهلهُ من جهل)[197] بـەلام کـەتۆ پیـی نەزانی مانای وانییە کە ئەو دەرمانە بوونی نییە، هەموو نەخۆشیەك چارەسەرەی خۆی هەیە بێجگە لە پیری. لەفەرموودەیـەکی تریـدا دەفـەرمووێت: (تـداووا عباد الله فإن الله تعالى لم يضع داءً الا وضع لهُ دواءً غير داءٍ واحدٍ الهرم).

واتە: ئـەی ئیمانداریـنـە عـیلاج وەرگـرن بگـەڕێن بەشـوێن دەوائـدا بەشـوێن چارەسەردا خوای گەورە دەردێکی نەناردوە گەر چارەسەری لەگەڵدا نەناردبێ. بەم فەرموودانە پێغەمبەر (ﷺ) کۆتایی هێنا بە سەردەمی نەزانی‌و تـرس و غەفڵەت و کەهانەت و موسڵمانی خستە جیهانی زانستەوەو سەردەمێکی پێشکەوتوو ترەوە.

---

[195] رواه مسلم .

[196] رواه الشيخان / عن ابي هريرة قال: ما انزل الله داء الا انزل له شفاء. في صحيح البخاري / كتاب الطب باب١ رقم ٥٦٧٨ .

[197] رواه احمد وابو داود والترمذي وقال حسن الصحيح.

تێبینی / دەرمانەکە هەیە تۆ بڵێیت من بەدوعا خۆم چاك دەکەمەوە ئەوە پێغەمبەریش (ﷺ) قبوڵی ناکات، دەفەرموویێت: (تداووا) شوێن چارەسەر بکەون، با دوعای لەگەڵ دا بێت دوعا مەسئەلەیەکی دەروونییە، ئارامی دەروونی لە (پزیشکی دەروونی)دا باس دەکرێت، بەلاّم لەڕووی شەرعییەوە دەرمانەکە هەبێت و بڵێیت من نایخۆم و دوعا دەکەم، ئەوە جائیز نیە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە سوننەتەکەیاو لە ژیانی دا فرمانمان پێ دەکات شوێنی جیهانی (هۆکار) بکەوین، وە کە هۆکارەکەش وەردەگرین ئەزانین کە شیفا کەلەناو ئەو دەرمانەدا نییە، شیفا خوا دەینێرێت بەلاّم واجبێکی شەرعییە لەسەرمان کەشوێن ئەو هۆیانە بکەوین.

سەبارەت بە پزیشکی دەروونییەوە ئاماژە بە چەمکێکی هەڵە دەکەین، بەداخەوە هەندێك موسڵمان هەیە ئەڵێن: لەو کاتەی ئەو سەیارەیەم کڕیوە رزقم داخراوە، لەوکاتەی چووینەتە ئەو خانووەوە، کاسبیەکەم تەواو نییە یا لەوکاتەی کە ئەم ژنەم هێناوە...

ئەم چەمکە (تەورات)ییە بەداخەوە چۆتە ئەقڵی هەندێك موسڵمانەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت: (قاتل الله اليهود يقولون الشؤم من ثلاث: المرأة والفرس والمسكن)[١٩٨] واتە: نەفرینی خوا لەجولەکە کە دەڵێن: ئەم سێ شتە شوومن: ئافرەت و ماین و خانوو. ئەمانە شوومیان تێدا نییە، تۆمەڵێ شووم، ئەم گەردوونە هەمووی خوای گەورە بەڕێوەی ئەبات گەلاّیەك ناوەرێت بە ویستی خوا

---

[١٩٨] بە چەند (متن)ێکی جیاواز لەم سەرچاوانەدا هاتووە: البخاري في الجهاد ٤٧ / أبا داود في طب ٢٤ / والترمذي في الأدب ٥٨ / والنسائي في الخيل / الموطأ لإبن مالك في استئذان ٢٢ / و احمد بن حنبل.

نەبێت، تۆ چۆن قەدەری مرۆڤێك، رزقێكی خۆت ئەبەستیتەوە بەخانوویەكەوە، دڵت تەنگ دەبێت بەخوێندنی قەلەڕەشێكەوە، یان بەبینینی كوندەبوویەكەوە ﴿ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴾[199]

ئەمە هەمووی بەپێی یاسای خوا (سبحانه وتعالی) ئەڕوات بەڕێوە، ئەم دنیایە پەیوەست نییە بەبینینی باڵندەیەكەوە، پەیوەست نییە بەدەنگی ئاژەڵێكەوە، خوا خۆی بەڕێوەی دەبات، ئەم شتانە كاری تێ ناكەن، ئەم شتانە كار ناكەنە قەدەر، لەبەرئەوە موسڵمان بابە دڵنیاییەوە روو بكاتە ئەم ژیانە، با گەشبین بێت، نابێت رەش بین بێت، بەتایبەت لەم سیانەدا كە خۆمان هەستمان كردوە هەندێك موسڵمان شوومیان تیا دەخوێنێتەوە، لە سەیارەكەیدا یان لە خانووەكەیدا یان لە خێزانەكەیدا، بەڕاستی سەربەرزی دنیاو قیامەتمان بەدەست گرتمانەوەیە بەم دینەوە ئەوەی كە توانیوویەتی نەفس و ئەقڵ و رۆح و جوڵەی موسڵمان راگرێت ئەم دینەیە، ژیانی راستەقینە پەیوەستە بەم دینەوە خوای گەورە دەفەرمووێت: (یاأیها الذین آمنوا استجیبوا لله وللرسول إذا دعاكم لما یحییكم)[200] ژیان و سەربەرزیمان پەیڕەوی كردنی فەرموودەی خواو پێغەمبەرمانە (ﷺ).

---

[199] الاحزاب / ٦٢ .

[200] الانفال / ٢٤ .

# باسی بیست و سێیەم

## شاهید نامەیەکی مێژوویی

**ئیعجازی ژیان و رەویەی پێغەمبەر (ﷺ) لەچاو تەمەن و خزمەت و ژیانی پێغەمبەرانی پێشینەدا.**

**تێبینی:**

**ئەم باسە لە (ڤیستیڤاڵی نوور) لە ساڵیادی هاتنە دنیای پێغەمبەری پێشەوا حەزرەتی محمد (ﷺ)لە هۆڵی (رۆشنبیری / سلێمانی) پێشکەش کرا.**

هەچ فیکرێك، هەچ بیردۆزێك، هەر رەئییێك، هەر چەند پەسەند بێت هەرچەند بەهێز بێت، بەپێز نابێت و بەرهەمی نابێت.. تاوەکو خاوەنەکەی ئەو فیکرمیە پەیکەڵ نەکات، بەرجەستە نەکات، لەخۆیدا. ئەبێ زانستکۆ (معلومات) جیا بکەینەوە لەگەڵ (معارف) دا، راست گۆیی، داوێن پاکی، ئەمانەت، ئەمانە کۆمەڵێك زانیارین، کاتێك کەبەرجەستە بوون لەمرۆڤێك دا دەبنە (معارف) مرۆڤ بەقسە هەڵ ناخەڵەتێ، لێکۆڵینەوەی نوێ لەساڵی ١٩٩٨-١٩٩٩ دەرچووە دەڵێت: مرۆڤ هەرچەند ساویلکە بێت و نەخوێندەواربێت ئاوازی دەنگ جیادەکاتەوە، ئەزانێت ئەو مرۆڤەی بەرامبەری راست گۆیە یا درۆزنە، دەم و چاوی ئەو مرۆڤە دەخوێنێتەوە، جگە لە ناومرۆکی ووتەکانی واتە: ئەبلەق بوونی چاوو سەرسوڕمان بوونی هۆش، مەسەلەیەکە وە رۆشن کردنەوەی تاریکی ژیانی مرۆڤ بەژین نامەی پێشەوایەك مەسەلەیەکی ترە، لەگەڵ ئەوەدا سەرسوڕمان شتێکەو شوێنکەوتنی



پێشەنگێك شتێکی تره، (طاغور)ی شاعیری بەناوبانگ لێیان پرسی ووتیان: کۆمەڵەیەکی ئایینی هەن پێیان دەڵێن: (براهمۆ سماج) ڕێزیان هەیە بۆ هەموو دینێك، ڕێزیان هەیە بۆ هەموو مرۆڤێك، کەچی ڕۆژ بەڕۆژ کەم دەبنەوەو گەورە نابن و زیادناکەن بۆچی؟ ووتی: چونکە پێشەوایان نییە، ئەو هەموو لێبوردنە، ئەو هەموو چەمکە بەرزانە سوودی نییە تەنها دەبێت یەکێکیان هەبێت تینووێتی دڵان بشکێنێت، تا بیکەن بەپێشەوا مرۆڤ شوێنی ئەو کەسە دەکەوێت کە تێکۆشەر (مجاهد) بێت نەك خەیاڵی (مثالی) بێت و هەر لە جیهانی تیۆردا بسوڕێتەوە، هەر مرۆڤێك و هەر گەلێك پێویستی بەپێشەوایەك هەیە، بەڵام پێشەواکە کێیە؟ (٤ مەرج ) دەبێت هەبێت لەپێشەوادا، کە وورد دەبیتەوە لەو (٤ مەرج)ە تەنها لەپێغەمبەراندا هەن:

١) دەبێت مێژوو شاهیدی بۆ بدات، واتە: بەڵگەی زانستی مێژوویی هەبێت گەواهی ڕاستی بدات.

٢) ژیاننامەی ئەو پێشەوایە ئەبێت هەموو بوارەکانی ژیانی گرتبێت نەك لەئەشکەوتێکدا بژیو دنیای تەرك کردبێت.

٣) ئەبێت کە زنجیرەی مێژووەکەی هەڵ دەدەیتەوە ئەڵقەیەکی وون بووی تێدا نەبێت.

٤) هەرچی کە وتوویەتی ئەبێت خۆی پێش هەموو کەسێك جێ بەجێ ی کردبێت.

وەرە ئەم چوار خاڵە ئەزموون بکە لەسەر ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) دەبینی هەر چواری تێدایە، مێژوو گەواهی بۆ دەدات، کە خاوەنی ڕاسترین کتێبی سەر زەوییە، دوژمنانی ئیسلام پێش موسڵمانان شایەتی ئەدەن کە ڕاسترین کتێبە لەسەر زەویدا، لەمێژوودا هەروەها شایەتیشی بۆ دەدەن کە ئەو پەیام و ژیننامەیە

**هەموو بوارەکانی ژیانی گرتۆتەوە وە هیچ ئەڵقەیەکی وون بووی تیا نییە، هەر شتێك خۆی نەریی لێ کردبێ پێش هەموو کەس لێی دوورکەوتۆتەوە، وە هەر فەرمانێك ئەمری پێ کردبێ، خۆی پێش هەموو کەسێك جێ بەجێ کردووە، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت:**

(لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾)[٢٠١].

**(ئەلێکسس کارلْ) کە پێناسەی مێژوو دەکات دەڵێت: (سجلّ لأعمال العظماء وسيرهم)[٢٠٢] تۆمارێکە بۆ ژیان و چالاکیو کاری مەزنەکان، گەورەکان، دەوەرە مێژوو بخوێنەرەوە بزانە چەند سەد کەسی هەبووە کە (تشریع)ی داناوە، وەك: حامورابی یان شارعەکانی شارستانی هندی یان فەیلەسوفەکان وەك: سوقرات یان ئەرستۆ تالیس کە تا ئێستاش هزرو فیکرەکانیان دەخوێندرێن لەپەیمانگەو خوێندنگاکانی جیهاندا، بەڵام چەند کەس هەن بڵێن: بەختەوەر بووین لەسایەی شەریعەتی حامورابییەوە یان پەیکەڵی فەلسەفەی سوقراتەوە، یان ئەرستۆوە، ئەوە گرنگە، لە ژیاندا ئەشێت بە کەسایەتیەك سەرسام بووبین، ئیتر ئەو کەسایەتیە مامۆستای قوتابخانە بووبێت یان مامۆستای مزگەوت یان خزم بووبێت یاخود بێگانە بەڵام ئیعجابەکە نەگەیشتووەتە ئاستێك بیانکەین بەپێشەوا چونکە ئەو چوار مەرجەیان تێدا نەبووە، بەلایەنی کەمەوە ئەو قسانەی کە خۆیان وتوویانە خۆیان پەیکەڵیان نەکردوون (٦٠-٧٠ ) پەیڕەو (مذهب) هەبووە بۆچی (٤)یان ماوون؟ چونکە هەر ئەم چوارە مجاهید بوون هەر ئەم چوارە بەرگەی**

---

[٢٠١] الاحزاب / ٢١ .

[٢٠٢] الانسان ذلك المجهول / الكسس كارل .

ستەم و زۆری دەسەڵاتیان گرتووە، بۆیە ئەو چوار پەیڕەوە بەهای خۆی پاراستووە.

شارستانیەت بەقسە دروست نابێت، بەرمنی دروست نابێت، بەڵکو بەئارەق ڕشتن.. بەخوێن ڕشتن.. بەماندوو نەناسی.. بەقوربانی دان.. دروست دەبێت. وە هەر چینێکیش بەشدار دەبێت لە بوونیاد نانیدا، هەرکەس لەبوارو ئاستی خۆیدا، بۆ بوونیاد نانی شارستانییەت ئەبێ سەرکردەکان دادپەروەر بن، ئەبێت سیاسەت مەداری وای تێدابێت هێڵ بکێشێت بۆ دواڕۆژێکی ڕۆشن و ڕووناك. ئەندازیاران نەخشە بکێشن بۆ شەقام و ڕێگەوبان. پزیشکان قەڵاچۆی نەخۆشی بکەن، دەرمانسازەکان دەرمان دروست بکەن بۆ ئەو میللەتە، کرێکار ئارەق بڕێژێت، سەرباز خوێن بڕێژێ بۆ بەرگری، جوتیار خۆراك بەرهەم بهێنێ، هونەرمەندان جوانی بدەن بە ئاوازی ژیان، چ بۆ شانۆگەریو چ بە شێوەکاری... هتد بەوانە هەموو و زیاتریش ئینجا شارستانییەت دروست دەبێت. بەڵام بەشێك دەمێنێتەوە بەم هەموو توێژانە ناکرێت، ئەویش دروست کردنی مرۆڤە، دەرهێنانی شەڕو هەڵکێشانی تەماع و ئارەزووە سەرکەشەکانە لەو مرۆڤەدا، ئەویش ئەرکی پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت) شارستانییەت نەبووە ئەرکی پێغەمبەرانی تێدا نەبووبێت، لەبەرئەوە سەرجەمی مرۆڤایەتی قەرزاری ئەوانن، ئێمەی موسڵمان هەستمان کردووە کە هەموو پێغەمبەرێك (سەلامی خوایان لێ بێت) ڕەنجیان داوە کۆششێکی بێشوماریان کردووە، لەپێناوی پێکهێنانی مرۆڤی پێکەوتووی سەرکەوتووی چاکخوازی پەروەردەکراودا خۆشەویستی زۆریان چاندووە لەدڵی ئەو کەسانەدا، مرۆڤیش یەکەم ڕەگەزی شارستانییەتە، بۆیە هەرچەند ناویان دەبرێت ئێمە دەڵێین: (سەلامی خوایان لەسەر بێت) هەرچ خێرێك ببینیت، بەشێوەی دادپەروەری.. بەشێوەی ڕەحم و بەزەی.. بەشێوەی

**هاوکاری.. بەشێوەی بەرەنگاری زوڵم.. بە دڵنیاییەوە جێ دەستی پێغەمبەرێکە لەو پێغەمبەرانە، شوێن نەبووە خوا پێغەمبەری بۆ نەناردبێت، نەك هەر لەئاستی ئوممەتاندا**

(وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾)[٢٠٣]

**بەڵکو لەئاستی هەموو قەومێکی بچوکیش دا**

(وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾)[٢٠٤]

**ئەومیە دادپەروەری خوای گەورە (سبحانە وتعالی) لەبەرئەوە ئەوپەڕی بێ شەرمییە کە ئێمە بێ وەفابین بەرامبەر ئەو پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت) ویژدانمان نەبێت بۆیان، ڕێزی ئەو پێغەمبەرانەمان بیر بچێتەوە، ئەم زاتانە (سەلامی خوایان لەسەربێت) کە بەشە رۆشنبیری شارستانییەتەکەیان پێك هێنا، وەك ئاشکرایە هەموو شارستانییەتێك بریتییە لە (مەدەنیەت و رۆشنبیری) ناوەرۆکی رۆشنبیرییە کە پێغەمبەران دایانمەزراندووە، نەوەك هەر بەقسە بەڵکو بە پەیکەڵی واقیعی بە خۆڕاگریو بە ئارامگرتن و بەکۆڵ نەدان، رۆژ نەبووە حەزرەتی نوح نەبووڕێتەوە، لە ئەنجامی ئەشکەنجەو ئازاردا دوای ١٣٠ساڵ ژنەکەی وازی لێ هێنا، توانای نەما**

(فَخَانَتَاهُمَا ﴿١٠﴾)[٢٠٥]

---

[٢٠٣] فاطر / ٢٤ .

[٢٠٤] الرعد / ٧ .

[٢٠٥] التحريم / ١٠ .

نعوذ بالله خیانەتی عەقیدەیە نەك خیانەتی تر، ئارامی نەما ووتی: راست ناکەیت، تۆ هەر دەڵێیت لافاو هەڵدەستێت من ١٣٠ ساڵە لەگەڵتدام هەموو رۆژێك بورانەوە، بەمردوویی ئەیانهێنایەوە ئاویان دەکرد بەدەموچاویا کاتێ کە هۆشی دەهاتەوە بەرخۆی خێرا دەرۆشتەوە ناوخەڵکی و بانگهێشتی دەکردن، ئەمە بەدەم خۆشە، لەبەرئەوە تاریکی ئەمرۆمان دەبێت بەنووری نبووەت بە گەوهەری رسالەت لابچێت وەخاتەمی ئەم نوورانە محمدە (ﷺ) ئەو نوورەی کە خوای گەورە دەفەرموویێت:

(يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ شَـٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾)[٢٠٦]

هەموو پێغەمبەرێك شاهید بووە مژدە دەربووە بێدارکەرەوە بووە بانگەواز بووە، بەڵام

(تِلۡكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۘ ﴿٢٥٣﴾)[٢٠٧]

حەزرەتی ابراهیم و عیسا (علیهما السلام) کەشێکی مژدەدەری زاڵ بووە بەسەریاندا، موساو لوط لەگەڵ داود (سەلامی خوایان لێ بێت) تەرزێکی جیهادی زاڵ بووە بەسەر ژیانیاندا، تەوبەکردن زاڵ بووە بەسەر حەزرەتی یونس دا (سەلامی خوای لەسەر)، بانگەواز کردن سیمای پەیامی حەزرەتی یوسف بووە (سەلامی خوای لەسەر) تەسلیم بوون و رازی بوون بە قەدەری خوا زاڵ بووە بەسەر ژیانی حەزرەتی یەعقوبدا (سەلامی خوای لەسەر)، بەڵام هەموویان لەپێغەمبەردا (ﷺ) کۆبوونەتەوە بەبێ لایەن گریو بە شێوەیەکی زانستی وەرە خوێندنەوە بۆ ژیننامەی پێغەمبەر (ﷺ) بکە بۆت دەردەکەوێ کە هەموو ئەو سیفەتە جوانانەی ئەو پێغەمبەرانە لەم خاتەمەدا هەیە. جیهادی پێغەمبەر

---

[٢٠٦] الاحزاب / ٤٥، ٤٦.

[٢٠٧] البقرة / ٢٥٣.

(ﷺ) لەموسا (سەلامی خوای لەسەر) کەمتر نەبووە، خۆڕاگریو ئارامی پێغەمبەر لە ئەیوب (سەلامی خوای لەسەر) کەمتر نەبووە، لەبەرئەوە مێژوو شاهێدی بۆ دەدات کە تەنها ئەوە شایستەی ئەوە بێت پێشەوای مرۆڤایەتی بێت (ﷺ) خاڵێکی تریش ئەوەیە کە پەیامەکەی دەست کاری نەکراوە، حەرفێکی زیادو کەمی نییە

(إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ۝١٧)[٢٠٨]

وەك دەرکەوتووە بە رووکەش ئەبو بەکر بەشداری کرووە لە کۆنووسی لاپەڕەکاندا (صحائف)ەکاناو حەزرەتی عومەر
بەشداری کردوو عوسمان هێناویەتە سەریەك خوێندنەوە، ئەویش خوێندنەوەی قورەیشە بەڵام سەیری سیمای قورئانی بکەن نەگۆڕاوە، تەنانەت سەیربکە ووشەی (صلاە) ئەگەر لەقورئانی مەککی دا بێت بە جۆرێك نووسراوەو لە سورەتی مەدەنیدا واوێکی لەگەڵە یەعنی: نوێژەکان بەڵام ئەوەی تر پەیوەندی کردنە لەگەڵ خوادا،

(إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝٩)[٢٠٩]

ئەم پاراستنە (حفظ) گشتییە، پاراستنی ناوەڕۆکی دەگرێتەوە، پاراستنی رەسم و سیمای دەگرێتەوە، پاراستنی زنجیرە بەندی سوورەت و ئایەتەکان دەگرێتەوە، چۆنی فەرمووە (ﷺ) ئەوها تۆمارکراوە بەبێ زیادوکەم.

---

[٢٠٨] القيامة / ١٧ .

[٢٠٩] الحجر / ٩.

پیاوێکی نصرانی هاتە کۆشکەکەی خەلیفە مەئمون، ئەم پیاوە زۆر بلیمەت و قسەزان بوو مەئمون پێی سەرسام بوو پاش و وتارەکەی پێی وت: بۆ شایەتومان ناهێنیت و بۆ موسڵمان نابیت!؟ وەڵامی پێ نەبوو، دوای ساڵێك سەریدایەوە لەخەلیفەو دەستی خستە ناو دەستی خەلیفەوەو ووتی: (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله) مەئمون لێی پرسی: پار لێت پاڕامەوە موسڵمان نەبوویت ئێستا هەر لەخۆتەوە هاتویت ئەمە یەعنی چی!؟ ووتی: ئەی خەلیفەی موسڵمانان قسەکەت کاری تێ کردم. چوم گەڕام بزانم چ دینێك راستە، هاتم نوسخەیەکم هێنا لەتەورات و چەند نوسخەیەکم پێ نووسیەوە، بەئارەزووی خۆم برگەم لێ پەڕاند، بەئارەزووی خۆم برگەم لێ نووسی، شەممەیەك هاتمە بەر دێرێکی جولەکە، کاتێك کە نوێژەکەیان تەواو بوو هاتنە دەرێ و تەماشایان کرد (فبعتها بأغلى الاثمان)[210] پاشان هاتم چەند نوسخەیەکم لە ئینجیل نووسییەوە، دیسان بەئارەزووی خۆم برگەم لێ پەڕاند، برگەی خۆمم کردە سەر یەك شەممەیەك دوای نوێژی قودداس، فرۆشتم لەبەردەم کڵێسەکەدا (بأغلى الاثمان)[211] پاشان هاتم (٥٤ ) نوسخەیەکم لەقورئان نووسیەوە، شتێکی خۆمم نەخستەسەریان بەڵام چەند ئایەتێکم لێ لابرد، جومعەیەك وەستام پاش نوێژی جومعە خەڵکی هاتنە دەرێ و دام نا ووتم: ئەمە دەست نووسەو زۆر کۆنە، چەند کەسێك دەستیان دایەو هەڵیان دایەوە، پاشان قۆڵیان گرتم و بردمیانە پەنایەکەوە تێرتێریان لێدام و نوسخەکانیان بەبەرچاوەمەوە سووتاند، ووتیان: جارێکی تر شتی وا بکەیت ئەتدەین بەدادگا، ووتم: گەلێك عەوامەکەی دەقەکانی لەبەربێت،

---

[210] فرۆشتم بە نرخێکی طران .
[211] بە طرانترین نرخ .

بەراستی خاوەنی ئایینی خوایە، مێژوو شایەتی دەدا بۆ ئێمە کە ئەم ئوممەتە خاوەنی کیتابێکە، دەقەکانی ووتەی خوایە (جل جلاله).

ئایین لەڕاستیدا هاتووە بۆ جێ بەجێ کردنی دوو جۆر ماف:

١- مافی مرۆڤ بەرامبەر خوا یا مافی خوا لەلای مرۆڤ.

٢- مافی مرۆڤ لەلای مرۆڤ.

کەمن ئەو حوکمانەی کە لە ئایینەکانی تردا بگونجێن لەگەڵ سەددەی بیست و یەکدا، لەوانەیە ٥-٦ حوکم بدۆزیتەوە، بەڵام ئەم ژیانە جەنجاڵە بە ٥-٦حوکم ناڕوات بەڕێوە، بەچاوێکی زانستییەوە بخوێنەرەوە دەبینی لەهندۆسیدا: نابێت هیچ مێروویەك و هیچ ئاژەڵێك بکوژیت، بەهەزاران جرج ئەگەونە ناو ئەو کێڵگانە لە هندستاندا، ئەو هەموو دەغڵە دەخۆن، دەڵێن: حەرامە بیانکوژن. ئەڵێن: روبار حەرامە بەستی بۆ بکەیت، خوا دایناوە نابێت!! بوذا ژنی خۆی بەجێ هێشت زۆری خۆش دەویست، تاقە کوڕێکی هەبوو بەجێی هێشت نەك هەرئەوە بەڵکو باوك و دایکیو عەشرەتەکەیو دۆستانی هەموو جێ هێشت، ڕۆیشت بەرەو دارستان ئیتر ئەوانی نەبینییەوە، ئەمە چ پێشەوایەکە! بوذییەکانی ئەمڕۆ ٢٥٪ ی دانیشتوانی سەرزەوین ئەگەر رەویەی ئەو جێ بەجێ بکەن، ئەبێت کەس خێزانی نەبێت، ئەبێت کەس لەگەڵ خێزانی خۆیا نەژی، ئەبێت هەموو کەس منداڵی خۆی فەرامۆش بکات، دووربکەوێتەوە لەباوك و دایکی و لەقەومیو لەوڵاتی و نەبێت ئەو کێڵگانەی کە ئەمڕۆ هەیانە ئەو شوێنانەی کەلەسەر ئایینی ئەون، ئەبێت واز لەکشتوکاڵ بهێنن، واز لەپیشەسازی بهێنن دەوڵەتەکەیان هەڵبوەشێننەوە، چونکە دوائاواتی بوذا ئەوەبوو کە دونیا تەرك بکەیت!! وەرە سەر (٥) سفرەکەی تەورات، باسی شەڕ.. جیهاد.. یەکتاپەرستی.. دەکات بەڵام (صیفات و اسماء) باس ناکات، باسی ناوی (اشخاص) دەکات و ناوی ناوچەکان






دەهێنێت کە لەوانەیە سوودێکی جوگرافی، مێژوویی هەبێت، ئەی موسا چۆن خوای ناسیوە؟ خۆشەویستی خوا لەدڵی دا چۆن و چەن بووە؟ پەرستشکەی چۆن بووە؟ چۆن بوە لەگەڵ خێزانیدا؟ چۆن بووە لەگەڵ دراوسێدا؟ چۆن بووە لەگەڵ کەس و کاریدا؟ لەگەڵ هاوەڵانیدا، لەگەڵ دۆستانیدا؟ تیانییە! ئەمە چۆن دەبێتە پێشەوا! مرۆڤ پێویستی بەووردەکاییەکی زۆر زۆر هەیە بۆ ئەوەی بیکاتە میتۆدی ژیان، ئەوە لەهەر (٥) سفرەکەدا نادۆزێتەوە لەبەر ئەوە مێژوو رەحمی پێ ناکات، با پێغەمبەریش بێت، لەسفری (تثنیة)دا کە کۆتا سفرە لەتەوراتدا کە سفری (٣٤ )ە برگەی ( ٥-١٠ ) ئەو بەشەتان بۆ دەخوێنمەوە تا حەقیقەتێك دەرکەوێت: (إن عبدالله موسی مات بإذن الله في أرض (مؤاب) ودفنه الله) گونجاوە ئەمە موسا نووسیبێتی؟! ئەگونجێت یەکێك بڵێت من لەفلان شوێندا مردم! فلان کەس منی ناشت؟ هەموو ئەقڵێك دەڵێت: ئەمە خوا نەینووسیوە. ئێمە دەڵێین: گریمان (٤ ) سفرەکەی کە موسا فەرموویەتی بەڵام ئەمە ئەقڵ قبوڵی ناکات کە (موسا) ئەمە بڵێت، باشە ئەی کێ ووتویەتی؟ نازانین! ئێمە جاری وا هەیە لەفەرموودەیکی محمد پێغەمبەردا (ﷺ) کابرایەکی زۆر زۆر بڕواپێکراو ریوایەتەکەی وەرناگیرێ تەنها لەبەرئەوەی تۆزێك (حفظی) تەواو نییە. دەی تەورات بەحساب ووتەی خوایە!! ئینجا دەڵێت: ( کەسیش قەبرەکەی نازانێت، دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێك نەهات وەك ئەو) دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێك نەهات وەك ئەو بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە لەدوای (٣٠٠، ٤٠٠، ٥٠٠ ساڵ ) ئەو برگەیە نووسراوەتەوە، ئەمە مێژوو چ شەفاعەتێك دەکات بۆ ئەو جۆرە کەسەکەبیکات بەپێشەوا؟ دەڵێت: لەتەمەنی (١٢٠)ساڵی دا کەوتە لەرزین لەو تەمەنەدا مرد (١٢٠ ساڵ!!!!) تەنها باسی لەدایك بوونی دەکات، باسی ئەو ماوەیە دەکات کەلەکۆشکی فیرعەون دا بەخێوکراوە، باسی راکردنەکەی دەکات بۆ مەدیەن نزیکەی (١٣٠٠) کیلۆمەتری

بڕی بوو بەشێوەی چەماوەیی، بنی پێ ی شەقی برد، دانی سەوز بوو (بەهۆی گەڵا خواردنەوە) چووە مەدیەن لەوێ ژنی هێنا (لەماڵە عەرەبێك) (لە پێغەمبەراندا چواریان عەرەبن) ئینجا هاتۆتەوە پاش ١٠ساڵ لەرێگادا بوو بەپێغەمبەر نورێكی بینی هاتەوە بۆ میصر قەومەكەی كۆكردەوە لەنیل پەڕینەوە كەوتە جیهاد ئیتر تەواو درێژەی ژیانی خێزانداری تیا نییە ئێمە دڵنیاین زۆر چاك بووە لەگەڵ خێزانیدا، دڵنیاین زۆرچاك بووە لەگەڵ خەڵكی دا، بەڵام ئەمە لە تەوراتدا نییە، تۆمارنەكراوە.

هەموو ئینجیلەكان دەڵێن: عیسا (علیه السلام) (٣٣) ساڵ لەسەر زەوی بووە، هەموو ئینجیلەكان باسی لەدایك بوونی عیسا دەكەن بەموعجیزە هەرچەندە بێ شەرمانە باوكی بۆ دادەنێن، خوشك و برایەكیشی بۆ دادەنێن، بەڵام كۆكن لەوەی كە ٣٣ساڵ بووە، هاتن لەخاچیان دا، ئێمەی موسڵمان دەڵێین: (بل رفعه الله الیه)[٢١٢] بەرزبۆتەوە وەك (زكریا) هێشتا نەمردوون، هەموو ئینجیلەكان باسی سێ ساڵی كۆتایی تەمەنی عیسا دەكەن، ئەی (٣٠)یەكەی تری كوا!؟ هەمووی ئەڵقەی ونبووی زنجیرەی تەمەنی ئەون لە (رێنان) و بەدەر لە رێنان و مێژوو نووسە رۆژئاوایەكان، خۆیان فەوتاند ٢٠ساڵ ٢٢ساڵ گەڕان و هیلاك بوون، نەگەیشتنە ئەوەی ئەڵقەیەكی ونبووی بدۆزنەوە لەژیانی منداڵییەوە تاكو بووە بە پێغەمبەرو تا تەمەنی ٣٠ساڵی هەرچی لەئینجیلەكاندا هەیە باسی ئەو ٣ ساڵەی كۆتایە دەكات، دەوەرە سەر محمد المصطفی (ﷺ) هەموو ژیانی كراوەیە، هەموو رۆژەكانی كراوەیە، هەموو فەرمودەكانی پۆلێن كراون، دابەش كراون بەسەر بابەتە سەرەكییەكاندا، گۆشەیەكی ژیان بهێنە كە پێغەمبەر (ﷺ) باسی نەكردبێت، هەر لەشێوازی نان خواردنەوە هەتا حوكم ڕانی، هەر لەشێوازی پاڵ

---

[٢١٢] النساء / ١٥٨ .



کەوتنەوە، چۆن دانت دەشۆیت؟ تا چۆن حوکم دەکەیت بەسەر میللەتدا؟ چۆن سوڵح دەکەیت؟ چۆن شەڕ دەکەیت؟ چۆن ئاشتی دەکەیت؟ بەڵام لەوە دەچێت ئیرادەی خوای لەسەر بووبێت (والله أعلم) کە ئەو مێژووی پێغەمبەرانە تۆمار نەکرێت، ئەو ژینناما‌نەیان ئاوا بەتەم ومژاوی‌و ئاوا بەبچوکی بمێنێتەوە، چونکە بۆ کاتێکی دیاری کراو خوا ناردوونی، لەلایەکی تریشەوە حیکمەتی خوای گەورە لەوەدایە کە هەموو درێژەی ژیانی ئەم محمدە بنووسرێت (ﷺ) چونکە پێویستمان پێیەتی تارۆژی قیامەت، پێغەمبەرانی تر هیواخواز بوون لەئوممەتی محمد (ﷺ) بن، بەبەرەکەتی شوێنکەوتنی ئەم پێغەمبەرە بەر رەحمەت دەکەوین، بەرشەفاعەت دەکەوین، ئەگەر گوناهی (کبیر)مشمان هەبێت، ئێمەی ئەهلی (السنه والجماعه) باوەڕمان وایە کە ئەهلی کبائریش بەمەرجێك یەکتاپەرست بن بەر شەفاعەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەون، هەروەها (إصر)[٢١٣] لاچوو لەسەر ئەم ئوممەتە، میللەتانی پێشوو گەر باڵندەیەك پیسایيەکی بکردایەتە سەر پێستیان دەبوایە بەچەقۆ هەڵیان بکەندایە، قورسایيەکی زۆر ئەرکی سەرشانی هەموو خواپەرستێك بووە، ئەمە لەسەر ئوممەتی محمد (ﷺ) لاچوو بەدەقی قورئانی پیرۆز

﴿ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ ﴾ (٢٨٦)[٢١٤]

خوا دوعاکەمان فێر دەکات لەوەڵامیشدا دەفەرموویت: (قد فعلت) ئەم کۆتاییەی سورەی البقرە (٢٠٠٠ ) ساڵ پێش دروست بوونی ئەرز خوای گەورە دایناوە

---

[٢١٣] باری قورس .
[٢١٤] البقرة / ٢٨٦ .

دوعامان فێر دەكات وە وەڵامەكەشی داوینەتەوە كە (اصر)م لابرد لەسەرتان، دوای نازڵ بوونی ئەم ئایەتە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (إن الله تعالى تجاوز لي عن أمتي الخطا والنسيان وما استكرهوا عليه)[215] شتێك كە نیەتت نەبووبێت بیكەیت بە هەڵە بیكەیت خوا لێت دەبورێت، بیرچوونەوە كە خوا رەخنە دەگرێت لەئادەم كە شتی لەبیر چۆتەوە، بەڵام ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەبیرچووی لەسەر حیساب ناكرێ، لێبوردنی لەگەڵ، شتێك كە بەزۆر پێی بكرێ لەسەری سزا نادرێ، لای ئێمە ئەمانە هەمووی ئاسان كارییە، خوای گەورە بەپێغەمبەرانی تری فەرمووە: (ادعوني استجب لك) بەهەموو پێغەمبەرێكی فەرمووە دوعا بكە دوعاكەت قبوڵ دەكەم، بەڵام بە بەرەكەتی شوێنكەوتنی محمد (ﷺ) بەئوممەتەكەی ووتراوە: (ادعوني استجب لكم)[216] بزانە چ زاتێكە (ﷺ) لەسەر هەموو ئوممەتی محمد (ﷺ) (حرج) لاچووە

(وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴿٧٨﴾)[217]

((عليكم)) لەسەر ئوممەتەكەی،

(فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾)[218]

---

[215] عن ابي ذر / الطبراني في الكبير، الحاكم / عن ابن عباس وعن ثوبان / صحيح / فيض القدير شرح جامع الصغير ج[2]، ص[219] رقم ١٧٠٥ .

[216] غافر / ٦٠ .

[217] الحج / ٧٨ . واتە: لە ئایینداكاری سەخت و قورستان لەسەر دانانێ.

[218] الاعراف / ١٥٧ .

بیر لەو ووشانە بکەینەوە: ئەوانەی کە باوەڕیان پێ هێنا پشت گیری بکەن بە مادی و مەعنەوی دینەکەی زیندوو بکەنەوە، سوننەتەکەی زیندوو بکەنەوە، ئەوانەن سەرکەوتوو رزگار.

لەسەر گۆی زەویدا دوو کەس نین بوونی دەروونی یان (وجود النفسیە) لەیەك بچێت زاناکان وجودی نەفسیان کردووە بە (٦ پلە)وە:

١) بوونی بەرژەوەندی: نزمترین مرۆڤ مرۆڤی (بەرژەوەندخواز)ە بەرژەوەندییەکەی چوارچێوەی بۆ ژیان و دەروونی کێشاوە.

٢) بوونی ئاکاری: لەو باشتر مرۆڤێکی ئاکارییە (سلوکی)یە ئەو کەسەیە بایەخ بەهەڵسوکەوت دەدات هەرئەوەندەی رەخنەی لێ نەگرن ئیتر رازییە.

٣) بوونی پسپۆڕی: مرۆڤێکە کە دەروونی لەئاستی پسپۆڕی خۆیدایە، لەئاستی هونەرمەندیو شارەزایی و لێهاتنی خۆیدایە لەڕووی دەروونی یەوە لەگەڵ کارەکەیدا ئاوێزان دەبێت.

٤) بوونی بەهایی: دەروونی لەگەڵ بەهاکاندا دەژی.

٥) بوونی پێناسەیی: بەهاکان فەرامۆش دەکات لەپێناو پێناسەو شوناس و ئەو (انتماء)ەی کە هەڵیگرتووە.

٦) بوونی رۆحی: لەهەمووی گەورەتر ئەوەیە دەروونی لەگەڵ رۆحیدا دەبێتە یەك.

محمد (ﷺ) مەخەرە بەرژەوەندیەکەوە مەیخەرە سلوکەکەوە، مەیخەرە لێهاتنەکەوە، مەیخەرە بەهاکانەوە، مەیخەرە پێناسەکەوە، بیخەرە رۆحتەوە لەهەموو ململانی یەکدا سەرکەوتوو دەبیت.

## باسی بیست و چوارەم
## ئیعجازی قورئان لەقولایی دەریاکاندا

**بەشی یەکەم:**

**قورئانی پیرۆز ووتەی خوایە، قورئانی پیرۆز ئەو بەها ئاسمانیانەی تێدایە کە جەوهەری ئاراستەکردنیان لەخۆگرتووە بۆ مرۆڤ کەلەسەری بڕوات، پەیرەوی بکات لە خودو ئاکاری خۆیدا، بەو جۆرە دەبێت بە مرۆڤێکی هیدایەت دراوو خاوەنی بەختەوەری دنیاو قیامەت، واتە: رێبەرێکە بۆ کۆنترۆڵ کردنی جوڵەی مرۆڤ لەژیاندا، لەسەر ئەم زەویەدا بەڵام رێگر چییە ئەگەر ئەم قورئانە پیرۆزە چەند ئیعجازێکی زانستی تێدا بێت بۆ هەموو نەوەیەك تارۆژی دوایی.**
**وەك خوای گەورە دەفەرمووێت:**

(سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ)[٢١٩]

**واتە: بەڵگەتان پیشان دەدەین تا بۆ هەموو مرۆڤایەتی دەرکەوێت کە ئەم قورئانە بەحەق نازڵ بووە وە لەپەروەردگارەوە هاتووە.**
**خشتەیەك هەیە کە لە ئەنجامی کۆکردنەوەی زانیاری مرۆڤ و شارەزایی سەبارەت بەگەشت کردن بەدەریادا وە سازدانی وەلێکۆڵینەوەی زانستییەوە بە ئاگامی گەیاندووە کە ئەو خشتەیە لەلایەن (U.N)ەوە دروست کراوەو وەرگێڕدراوە بۆ**

---
[٢١٩] فصلت / ٥٣ .

سەر زمانەكانی جیهان بۆ ئەوەی هەموو كەشتیوانێك بەكاری بهێنێت لەو كاتەدا كەگەشت دەكات بەناو دەریادا ئەو خشتەیە ئەم زانیاریانەی تێدایە:

١)هێزی (با).

٢)خێرای‌یەكەی.

٣)ناوی (با)یەكە.

٤)حاڵەتی دەریا.

٥)تێكڕا بەرزبونەوەی شەپۆلی دەریاكە.

پاش ووردبوونەوە لەو خشتەیە: كە ١٢ جۆر (با)ی تێدایە، لەگەڵ هەموو (با)یەكدا حاڵەتی دەریا ئەگۆڕێت، واتە: پەیوەندیەكی راستەوخۆ هەیە لەنێوان (با) و حاڵەتی دەریاكەدا، كە وورد دەبینەوە ئەبینین چوار جۆری سەرەكییە:

١)جۆرێكیان ئەتوانین بڵێین هێورە.

٢)جۆرێكیان پاڵ بەكەشتییەوە دەنێت بەشێوەیەكی رێك و پێك.

٣)دەبێتە رەشەبایەك زەرەو زیانی دەبێت بۆ كەشتییەوانان.

٤)كەشتییەكەو كەشتیەوانان لەناو دەبات و نگرۆیان دەكات.

كە دێینە سەر قورئانی پیرۆز ئەبینین ئەم چوار جۆرە سەرەكیە باس دەكات وە هاوشێوەیەكی سەیر هەیە لەنێوان ئەو راستیەو ئەو واقعەی كە دەركەوتووە بۆ كەشتی وانان و پسپۆڕان لەگەڵ ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزدا

(إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ ﴿٣٣﴾)[٣٣٠]

---

[٣٣٠] الشورى / ٣٣. واتە: ئەگەر خوای گەورە بیەوێ (با) رادەگرێت، تا كەشتیەكان لەسەر ئاوەكە لە بزووتن بكەون.

نموونـەمان هەیـە: کەشـتییەکە لـەناو دەریادایـەو دەریـا کـە هێمنـە بایەکـە لـەو ئاستەدا نییە کە پاڵ بەکەشتییەکەوە بنێت، یاخود دەبیـنین کـە دەریاکـە هێمنـە ووردە ووردە ووروژانـدێك پـەیا دەبێت ئـەبینین شڵەقاندنی دەریاکـە زۆر روون و دیار دێتە بەرچاو تا دەگاتە (سەرو ٢٨ تا ٥٥ ) گرێیە قورئانی پیرۆز وەصفی ئـەم حاڵەتە دەکات و وەصفی حاڵەتی دەروونی ئەو کەسانەش دەکات کە دووچاری ئـەو بارودۆخە دەبن ئەفەرموویێت:

(جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾)[٣٣١]

ئەو حاڵەتە کەئیتر رووی دەریاکە دەشڵەقێت بەرزو نزم دەبێتەوە بێگومان کەشتیەکەشی نزم دەبێتەوە لەگەڵیدا ئەو کەسانەی کەلەناو کەشـتیەکەدان ئاسـۆ نـابینن لەهـەموو لایەکـەوە تەماشـا دەکـەن گـەمارۆدراون بەشـەپۆلی بـەرزی ئـاو شەپۆکانی شەپۆل دەروون دەورووژێنێ، لەو کاتەدا پەنا دەبەنە بەر خوای گەورەو تەنها لەخوا دەپارێنەوە کە خوا رزگاریـان بکـات لـەو بەڵایـەوە وەك ئاشکراشـە کـە پێغەمبـەر (ﷺ) هـەرگیز دەریـای نـەدیوە وە هـەرگیز روبـارێکیش بـە شـارەکەیا نەرۆشتووە، حاڵەتێکی تـر هەیـە کەشـەپۆلەکان زۆر بـەرز دەبنـەوە وە ئـاو لەگـەڵ خۆیانـدا دێنن جاری وا هەیـە زیـخ دەگوازنـەوە لەگـەڵ خۆیانـدا، ئـیتر (بـا)یەکـە ئاسـایی (سـەرو ٥٦ ) گرێیـە، بـە عـەرەبی پێـی دەڵـێن: (زوبعـە) پێـشی دەڵـێن:

(اعـصار) وه ئهمـه حالـهتێكى زۆر زۆر ترسـناكه ئهمـه گهردهلولـه (هـاريكن) وه قورئانى پیرۆز دهفهرموويێت:

(فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ﴿٦٩﴾)[٢٢٢]

جا پریشکبارانتان بکات بايهکى تێكشکێنهر (که ئاوو زیخ و لى هـهلگرتبێ) لهبـهر ناسوپاسيتان نگرۆتان بکات. لهئايهتێكى تردا

(وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴿٣٢﴾)[٢٢٣]

تێبینى بکهن: کاتێك که شهپۆلێکیان بۆ دێت دایان پۆشێت ئیتر فهوتانـدیان ١٠٠٪ وه ئهگهر بهووردى سهیرى شهپۆلى تێكشکێنهر بکهین دهبـینین وهك چـهتر وایـه، جارى واههیه وهك سێ چهترى لهسهریهك روو به کهشتییهك دهوهستنهوه واتـه: ئهوهى سـهرى سـهرهوه خێرایيهکهى زیـاتره لـهوهى ناوهراستىو لـهوهى خـوارهوه ئـهو یهکـهم جـار دهکێـشێت بهکهشـتییهکهدا کهشـتییهکهو ئهوانـهى کهلـهناو کهشتییهکهدان لهناو دهبات تێبینى ئايهتهکهش بکهین (مـوج) تاکه بـهلام (ظلل) کۆیـه ئهمــه وهصـفێکى زۆر ورده لـهقورئانى پـیرۆزدا کـه بریتییـه لهحالـهتى (گـهردهلوول) وه بێگومـان ئهمـهش دیاردهیهکـه زۆر بهدهگمـهن روودهدات، بـهلام قورئانى پیرۆز ئاماژهى بۆ دهکات، که خهلکى باوهر به محمد (ﷺ) بهێنین چونکه وهك ئاشکرایه ئهو لهژیانیدا دهریاى نهبینیووه.

قورئانى پیرۆز دهفهرموويێت:

(مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾)[٢٢٤]

---

[٢٢٢] الاسراء / ٦٩ .

[٢٢٣] لقمان / ٣٢ .

واتە: دەریایەك لەگەڵ دەریایەكی تردا كە ئەگەنەیەك ئاویان تێكەڵ نابێت لەگەڵ یەكتردا (بینهما برزخ) واتە: پەردەیەك لەنێوانیاندا هەیە، ئیتر پەردەكە ئاویە یاخود شتی تر گرنگ ئەوەیە ئاوەكانیان تێكەڵ نابێت، نەخشەیەكی جیهانیمان لەبەردەمدایە هەندێك ناوچە دەبینین كاڵ ترە هەندێك ناوچە تیرەو هەندێكی تر تیرترە ئەمە لە ١٨٧٣ دا ئەم جۆرە لێكۆڵینەوانە لەلایەن گروپێك بەناوی (چالبنجەر) كە بەریتانی بوون دەستی پێ كردوە (رحلە چالینجەر) لە ١٩٣٣ ئەمریكیەكان سەدان وێستگەی دەریاییان داناوە بۆ (مسح البحار) وە لە ١٩٤٢دا وەك حەقیقەتێك دەركەوت دەریاكان بریتین لە ناوچە، ناوچە. هەر ناوچەیەك تایبەت مەندی خۆی هەیە، پلەی گەرماكەی جیاوازە لەدەوروبەری، سوێرییەكەی جیاوازە لەدەوروبەری، ئەو زیندەوەرانەی كە تیایدا دەژین جیاوازن لەدەوروبەر، (بینهما برزخ لایبغیان) دیوارێكی نەبینراو لەو دەریایەدا هەیە نایەڵێ دوو دەریاكە تێكەڵ ببن، دێین نموونەیەكی نزیك وەردەگرین وەك (جبل طارق) ئەمە گەرووی طارقە بەشی لای راستمان بەنسبەت ئێمەوە ئەوە دەریای ناوەڕاستەوە لای چەپیش ئەمە دەریای ناوەڕاستە كە ئاوەكە دێت دەگوێزرێتەوە بەسەر ئەو گردەدا (جبرالتەرهڵ) وە دێتە خوارەوە لەم لاوە دەڕوات، دێتە ناو زەریای ئەتڵەسییەوە، بەبێ ئەوەی ئاوەكە تێكەڵ ببێت، لەبەرئەوەی ئەو پەردەیە هەیە (بینهما برزخ) نزیكەی (٤٠٠) مەتر لە قوڵایی دەریادایە، ئایا پێغەمبەر (ﷺ) رۆشتۆتە ئەودیوو؟! چۆتە (٤٠٠ )مەتر قووڵاییەوە تا بۆ خەڵكی باس بكات!! ئەو ئاوەی تر لای چەپ ئەمە زەریای ئەتڵەسیە ئەڕوات بەرەو دەریای ناوەڕاست، بەبێ تێكەڵ بوون (بینهما برزخ لایبغیان) بەڵام لەنێوان روبارێك

---

[٢٢٤] الرحمن / ١٩، ٢٠.

دەریایەکـدا (بـرزخ) نییـە ئـەو ئـاوە نەتایبەتمەنـدی روبـاری هەیـە نـە تایبەتمەنـدی دەریـا بـەڵکو تێکەڵەیەکـە ناوچـەیەکی ئـاوێزان بـووە لـەنێوان روبارەکەو لەنێوان دەریاکەدا.

لەساڵی (١٩٠٠)دا هەندێ کەشتیوانی ئەسکەندەنافی بۆیان دەرکەوت کەوا لەقوڵایی دەریادا، شەپۆلی گەورەتر هەیە لەو شەپۆلانەی کەلەرووی دەرەوەی ئاوەکەدا دەرئەکەون، لەهەمان کاتدا ئاوێکی قوڵ هەیە پێی دەوترێت (الماء العميـق) یـا (البحـر العميـق) ئـەم ئـاوە قوڵـە، تاریکـە، ساردترە، لـە ئاوەکـانی سـەرەوە، هـەتا بڕۆیتـە خـوارتر تاریـك تـر دەبێـت وە وردە ووردە رەنگـەکان نامێنێت، بۆ نموونـە: رەنگی سوور تـا دەگاتـە قوڵایی ٢٠مـەتر ئـیتر نامێنێـت، رەنگی پرتەقاڵی تا (٣٠) مەترە دوایی نامێنێت وە رەنگی زەرد تـا ٥٠مـەترە وە رەنگی سەوز قوڵ تـرە تـا ١٠٠مـەترە وە رەنگی شین تـا ٢٠٠مـەترە، دوای ئـەو ٢٠٠مەترە شینیش نامێنێت واتە دوای ٢٠٠ مەتر هیچ جۆرە رەنگێك نامێنێـت، بۆ ئەو کەسانەی کە هیچ زانیاری یەکیان نییە لە فیزیـادا پێیـان دەڵێین: گـەر کەسێك تەماتەیـەکی سووری بەدەسـتەوە بێـت بڕواتـە نـاو دەریـاوە زیـاد لـە ٢٠مەتر قوڵ بێتەوە دوای ٢٠مەترەکە گەر تەماشای تەماتەکە بکات بـە سوور نایبینێـت بـەڵکو بـە رەش دەیبینێـت وە ئەگـەر پرتـەقاڵێکی بەدەسـتەوە بێـت دوای ٣٠مـەتر بـە رەنگـی پرتـەقاڵی نایبینێـت چـونکە دوای ٣٠مـەتر رەنگـی پرتەقاڵەکە هەڵدەمژرێت، دواتر بە رەش دەیبینێت وە ئەگـەر سێوێکی زەردی پێ بێت دوای ٥٠مەتر بە رەش دەیبینێـت وە ئەگـەر خـەیارێکی پـێ بێـت دوای ١٠٠مەتر بەرەش دەیبینێت وە ئەگەر پیرۆزەیەکی شینی لەپەنجـەدا بێـت ئـەوا دوای ٢٠٠مـەتر پـیرۆزە شـینەکە بـەهیچ رەنگێـك نابینێـت چـونکە دەسـت و دەوربـەری هەمووی تاریك و رەشە.

**ئینجا قورئانی پیرۆز کە وەصفی ئەم حاڵە دەکات ئەفەرمویت:**

(أَوْ كَظُلُمَـٰتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ۚ ﴿٤٠﴾)[٢٢٥]

**ئەگەر فڕۆکەیەك لەناو هەورێکەوە بڕوات، خوارەوەی بەتاریکی دەبینێت (ظلمات)ە گەر بێتە ناو هەورەکانیشەوە بێگومان دەکەوێتە نێوان دوو تاریکیەوە، ئایەتە پیرۆزەکە ئەفەرمووێت: (أو کظلمات في بحر لجي) وەك تاریکییەك لە دەریایەکی قوڵ دا (لجی) واتە: قووڵ، لەو تاریکیەدا (یغشاه موج من فوقه موج) بەشەپۆلێك داپۆشراوە، وە سەرو ئەو شەپۆلێکی ترە کە شەپۆلی سەر دەریاکەیە وە سەرو ئەویش هەورەکەیە باسمان کرد جا کۆتایی ئایەتەکە دەفەرمووێت::**

(إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ ﴿٤٠﴾)[٢٢٦]

**گەر کەسێکیش لەو قوڵاییەدا دەستی خۆی دەربهێنێت نایبینێت ووشەی (یکد) یا (کاد) لەزمانی عەرەبیدا دوو مانا دەبەخشێت: مانایەکیان (بالکاد) زۆر بەزەحمەت، وەمانایەکی تریان: (مستحیل) هەردووبارەکە تۆمارکراوە واتە: گەر لەقوڵاییەکەدا بێت هەندێك شەبەنگ مابێت ئەوە بەزەحمەت دەبینێت وەئەگەر لەقوڵاییەکی زۆرتردا بێت کە تیشك نەمابێ (وەك خوار ٢٠٠مەترەکە) ئەوە هەرگیز نایبینێت، ئایا کێ بە پێغەمبەر (ﷺ)ی ووت: کە**

دەریا بریتییە لە دوو جۆر دەریا یەکێکیان دەریایەکی قووڵ و تاریك وە گەر دەستی خۆت دەربهێنێت نای بینیت بێجگە لەوەی کە ئەم قورئانە

(تَنزِيلُ ٱلْكِتَـٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ۝١ )[٢٢٧]

دەرخەری رازی راستییە بۆ ئەو پەیامبەرە (ﷺ).

بەشی دووەم:

مرۆڤی بێ باوەڕ مرۆڤێکە ئەندێشەی هەیە لەگەڵ خۆیدا.. ململانێی هەیە لەگەڵ خۆیدا.. مرۆڤێکی پابەند نییە.. مرۆڤێکە نازانێ کێ دروستی کردووە.. نازانێ بۆچی هاتۆتە سەرزەوی.. نازانێ ئەرکی سەرشانی چییە.. وبۆ کوێ ئەڕوات.. لەبەرئەوە مرۆڤێکە ١٠٠١ کێشەی هەیە لەگەڵ خۆیدا بۆ نموونە: کە تووشی نەخۆشییەکی شەکرە دەبێت، دەست دەکات بەگریان، دەڵێت: بێ بەشم لەشیرینی، لەیەکێ وایە ئامانجی مرۆڤ لەسەر زەویدا پاقلاوە خواردنە، کەسێکی تر نەشتەرگەری پرۆستات دەکات، دەست دەکات بەگریان، چونکە لە چێژی زایەندی بێبەش بووە، لەیەکێ وایە پاتکردنەوەی زایەندی ئامانجی ژیانە، لەبەرئەوە ئەو کەسەی کە خالقی خۆی نەناسێت بەراستی بەساناترین شت دەڕوخێت و دەست دەکات بەگریان.

ئەگەڕێینەوە بۆ بابەتەکەمان: دوای ٢٤٠م ئیتر تاریکیەکی سەیرە، هیچ شتێك نابینرێت، بەڵام بەئامێری تایبەتی تەکنۆلۆجیایەکی زۆر پێشکەوتوو

---

[٢٢٧] الزمر / ١ .

ئەگەر بڕۆینە خوارەوە (وەك زاناكان رۆشتن) بەناو ئەو تاریكیەدا هەزاران مەتر ببڕین تا دەگەینە بنی دەریاكە، هەندێك شوێن (٧كم) هەندێك شوێن (٨ كم) هەندێك شوێن ١٠هەزار مەترە واتە: (١٠كم)و... زیاتریش، گرنگ ئەوەیە كە دەگەینە بنی دەریاكە چی دەبینین! تروسكاییەك دەبینین كە ئەوەبنی دەریاكەیە ئاخۆ ئەمە چی بێت لەناو ئەو تاریكیەو پاش بڕینی ئەو تاریكیە!؟ پاش هەزاران مەتر جا دەگەینە شوێنێكی لەو جۆرە، تروسكاییەك دەبینین ئەگەر زیاتر نزیك ببینەوە (بێگومان بەئامێر ئەگینا ناتوانین بگەینە ئەوێ) ئەبینین ئەو ناوچەیە رۆشن دەبێتەوە، رووناك دەبێتەوە، ئەبینین ئاگرە! ئاگر دێتە دەرێ لەبنی دەریاكەوە! لەگەڵ ئاودا لەژێر پاڵەپەستۆیەكی گەورەدا! گەرمی ئاوەكە مەزەندە دەكرێت بە (٤٠٠ پلەی سەدی) لە وێنەی بەڵگەنامەی زانستی دا دەردەكەوێت كە ئاگرو دووكەڵەكەی بە روونی دیارە، دەركەوت ئەمە تەنها لەیەك شوێندا نییە بەڵكو لەهەزاران شوێنی جیهاندا دۆزراوەتەوە، لە ئەمریكای باشوورەوە (نەخشەی تایبەتی) هێڵی ئاگرەكە دیارە كە بە هەزاران كیلۆمەتر دەڕوات لەژێر دەریادا، نەخشەی جیهان هەیە كە (ئاژانسی زانستی) گرتوویەتی گەر باش ووردبینەوە وسەیری بكەین هێڵی رەشی لەسەر دەبینین كە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە لە ژێر دەریاكاندان ئاگر دێتە دەرێ، لەوانە: زەریای هندی گرتۆتەوەو دەڕوات بەرەو زۆر شوێنی تر لەجیهاندا بە هەزاران كیلۆمەتر درێژ دەبنەوە تەنانەت دەگەنە كەنداویش وە دەڕۆن بەرەو دەریای عەرەب و بەرەو زەریای ئەتڵەسیو بەرەو زۆربەی دەریاكانی جیهان تا دەگەنە زەریای هێمن.

ئەو دەریایانە كە هەزاران مەتر قووڵن ئەو ئاگرە ناكوژێننەوە!!! ئەمەش راستیەكی زانستیە، زاناكانی رۆژئاوا بەئامێری پێشكەوتوو ئەوانەیان دۆزیەوەو ئەو نەخشانەیان دارشت واتە: لە هەزاران شوێندا لەژێر دەریاكاندا ئەم ئاگرە

هەیە، جا لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە سوێند دەخوات بە بەدیهێنراوانی زاتی خۆی وەك: بەرۆژ.. بەمانگ.. بەشەو.. بەعەسر.. بەبەرەبەیان.. بە بەیانیان.. بەکەعبەی پیرۆز.. بە (بیت المعمور).... بەو دروست کراوانەی کە گرنگیان هەیە واتە: سوێند دەخوات بەشتێك کە بوونی هەیە.. لەناو ئەو شتانەی کە سوێندیان پێ ئەخوا

(وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ۝٦ )[٢٢٨]

سوێند بەو دەریایانەی کە دەسوتێنرێن، بەو دەریایانەی کە داگیرساون، ئەمە نادیارێك بوو لەلای ئیمانداران، رازێك بوو لەلای تەفسیرکاران، تا ئەم دۆزینەوە زانستیە روویدا ئێستا تەفسیری ئەم سوێنە دەزانین چییە، ئێستا دێینە سەر (والبحر المسجور) لەزمانی عەرەبیدا (سجر) واتە: (أوقد وحرق) واتە: داگیرساند یا سووتاندی، ووشەی (سیجارە) یا (جگەرە) واتە: ئەو شتەی کە دەسووتێنرێت لێدەرهێنراوێکە لە (سَجَرَ).

فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) دەفەرموێت: (لاترکب البحر إلا حاجاً أو معتمراً أو غازیاً فإن تحت البحر ناراً وتحت النار بحراً)[٢٢٩] واتە: (لەبەر چەند هۆکارێك نەبێت مەچنە ناو دەریاوە، چونکە لەژێر دەریادا ئاگر هەیە وە لەژێر ئاگرەکەدا دەریا هەیە) جارێ ئەوە ئاگرەکە دۆزرایەوە، هاتنە دەرەوەی ئەو ئاوە بەو پالەپەستۆیە وە بەو پلە گەرمیە نەگەری ئەوە ئەدات بە دەستەوە کە دەریایەکیش هەبێت لەژێر ئەو ئاگرەدا، کاتێك کە سەیری نەخشەی جیهان

---

[٢٢٨] الطور / ٦.

[٢٢٩] رواه أبو داود / جهاد ت٩ / م٩ / رقم الحديث ٢٤٨٩، باب ركوب البحر، قال ابو داود هذا حديث ضعيف جدا، سنن ابي داود / ج٢ ص٢٠٨ ، حديث / ٢٠١٤، ط دار الكتب العلمية .

دەكەین بۆمان دەرئەكەوێت كە گۆی زەوی تەنها ئەو توێژانەی سەرەوەی نەبێت كەچەند سەد كیلۆمەترێكە ئەو هەموو بوونەوەرە لەسەری دەژیو وشكانییە لەگەڵ ژێر دەریاكانیش ئەگینا دەبینین ئەوی تری بریتییە لە دەریایەك لەئاگر، وێنەی تر هەیە ئەوەمان پیشان دەدات ئەو ئاگرە جاری وا هەیە شەپۆلەكانی دەگاتە سەرەوە، لەبنی دەریاكەوە ئاگرەكە بەرز دەبێتەوەو جاری وا هەیە لەروی دەریاكەوە دەردەپەڕێت گڕو بڵێسەكەیو دوكەڵەكەی زۆر بەئاشكرا دەبینرێت، ئەم رووداوە كە ڕوودەدات دەبێتە هۆی دروست بونی شەپۆلێكی زۆر ترسناك وە زۆر جار بومەلەرزەیەكی لەگەڵدا دەبێت وەك ١٠٠ساڵ لەمەوبەر لەناوچەی هندستاندا روویدا ئەو شەپۆل وگڕە بوو بەهۆی لەناوبردنی (٦٥٠٠٠ ) كەس، ئەو شوێنەی كە ئاگرەكەی لێ هاتە دەرەوە كەشتیەكی سەربازی لێ بوو كە پڕبوو لەسەرباز بەهۆی پاڵەپەستۆی ئەو شەپۆلە بوركانیەوە هەڵیدا بووە سەر چیایەك ئێستاش شوێنەواری ماوە.

ئەمە نموونەیەكە خوای گەورە پیشانمان دەدات بەچاوی خۆمان بیبینین ئەمە راستیەكەو لە سەرچاوەی زانستیدا تۆماركراوە، لە فلیمی سینەماوە وەرنەگیراوە، هەمووی باوەڕ پێكراوە، رۆژێكیش دێت كە هەموو دەریاكان و زەریاكان بەو شێوەیە دەسوتێن وەك قورئان دەفەرموێت: (وإذا البحار سجرت)[٢٣٠] رۆژێكیش دێت، لە رۆژی دواییدا كە هەموو دەریاكان وەك ئەو حاڵەتەیان لێ دێت.

فەرموودەیەكی تری پێغەمبەر (ﷺ) هەیە كە دەفەرموێت: (من ظلم قيد شبرٍ طوقهُ يوم القيامة من سبع ارضين)[٢٣١] ئەو كەسەی كەبستێ زەوی داگیر بكات (نافەرمووێت دوكانێك یان خانوویەك) لەهەر كەسێك بەناهەق خوای گەورە

---

[٢٣٠] التكوير / ٦ .

[٢٣١] رواه البخاري / كتاب بدء الخلق / مسلم، مسافات ١٣٧ – ١٤٢ .

لەقیامەتدا دەیخاتە ناو حەوت چینی زەوییەوە. ئەم حەوت چینە زەوییە گەمارۆی دەدا واتە: زەوی بریتییە لە حەوت چین، زاناکانی رۆژئاوا نەخشەیەکیان کردووە بۆ چینەکانی زەوی کە بە هەمان شێوە حەوت چین دەرچووە.

لەکۆتاییدا دەڵێین: قورئانێکە هەموو ووشەکانی لەلایەن خوای گەورەوە نازڵ بووە (جل جلالە)و بەئەمینی ئاسمانداو بە سەرداری فریشتەکاندا ناردوویەتی بۆ ناو دڵی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو دڵەی کە خوای گەورە پاراستویەتی لەهەڵە کردن لەبیرچوونەوە (لاتحرك بە لسانك لتعجل بە إن علينا جمعهُ وقرآنه)[٢٣٢] هیچ پەلە مەکە لەخوێندنەوەی قورئاندا، ئێمە بۆت کۆدەکەینەوە و ناهێڵین بیرت بچێتەوە.

---

[٢٣٢] القيامة / ١٦، ١٧.

## باسی بیست و پێنجەم
## لەبەرگرتنەوەی مرۆڤ

ئایا لەبەرگرتنەوەی مرۆڤ (استنساخ) چییە؟! ئایا لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە حەلاڵە یا حەرامە؟

پێشەکی: (استنساخ) یاخود (استنسال) دەکرێت بە (٣ جۆر)ەوە:

یەکەم: پێی دەوترێت (التكاثر الجنيني) یا (التكاثر الجنيني) با وای پێ بلێین مانای بریتییە لەئەو خانە پیتێنراوە کە بریتییە لە تۆوێکی پیاو تۆوێکی ئافرەت، ئەم خانەیە کە بە ئینگلیزی پێی ئەڵێن: (زایگۆت) وە بە زاراوەی قورئان پێی ئەڵێن (نطفة امشاج) ئەم خانە پیتێنراوە دەبێتە دووان، پاشان دەبێتە چوار، دوایی دەبێتە ١٦، و... ئاوا وورده وورده زیاد دەکات.

لە تاقیگە کە دەبێتە (٤ خانە) وورده وورده جیایان دەکەنەوە لەیەك هەندێك قەوزەی ناو دەریا دەهێنین (چونکە بەدەست دەشکێت) ئەبێتە چوار خانەی جیاواز، ئەم چوار خانەیە ئەگەر بچێنرێن لە رەحمدا (٤ مرۆڤ) دروست دەبن کە لەیەك دەچن، ئەمە هیچ کێشەیەکی شەرعی تێدا نییە، بەمەرجێك ئەو تۆوە لەژن و مێردەوە هاتبێت ئەمە ئەچوێنرێت بە ئەو مندالآنەی کە لە (تیست تیوب)دا دروست دەبن، لە (انبوب الاختبار)دا ئەویش کێشەیەکی شەرعی تێدانییە، بە دوو مەرج:

١) ئەو تۆوە لەئەو ژن و مێردە بن.

٢) نەچێنرێت لە رەحمێکی تردا تەنها دەبێت لەرەحمی دایکەکەدا بێت واتە رەئی شەرع بەرامبەر ئەم حاڵەتە بەو مەرجانە دروستە.

دووهەم: (لەبەرگرتنەوەیەکی سەرانسەری مرۆڤەکە) کە پێی دەڵێن: (کلۆنینگ) (ئیجماعی رەئی لەسەرە کەحەرامە).

سێهەم: کە بەشێك لەمرۆڤ (استنساخ) دەکرێت، ئایا رەئی ئیسلام بەرامبەر بەمە چۆنە؟ جارێ خودی مەسەلەکە روون بکەینەوە، دوو رووی هەیە، روویەکیان خێرەو بەرژەوەندی تێدایە، رووەکەی تریان شەرە، ئەو رووەی کە خێرە بۆ نموونە: هۆرمۆنێك هەیە لەلەشی ئێمەدا پێی دەڵێن: (ئینسۆلین) ئەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشی شەکرە دەبن ئەم هۆرمۆنە لەلەشیاندا لاوازە ئەم جۆرە زانستە بۆی دەرکەوتووە کە هەموو بەشێك لەلەشدا کە دروست دەبێت ئەگەرێتەوە بۆ دوگمەیەك زانست ناوی دەنێت (جین) جینێك لێپرساوی ئەنسۆلینە لەمرۆڤدا.

ئەو جینە لەتۆزێك پێستی مرۆڤێکەوە دەیگوێزنەوە ئەیخەنە ناو ناوکی بەکتریایەك پێی دەڵێن: (ئیشرشیا کۆلای) ئەو بەکتریایە دەست دەکات بەدروست کردنی ئەنسۆلین بەبەلاش ئەم ئەنسۆلینە بەشێوەی دەرزی دەدرێت لەو کەسانەی کەنەخۆشی شەکرمیانە، ئایا ئەمە زیانی هەیە؟ ئایا ئەمە خێرنییە؟ بێگومان ئەمە ئیشێکی باشە.

ماددەیەك هەیە لەلەشی مرۆڤدا پێی دەڵێن (ئینتەرفیرۆن) جینێك لێی لێپرسراوە، ئەم ئینتەرفیرۆنە پەلاماری خانەی شێرپەنجە دەدات ئەگەر دروست بوویێت لەناو لەشی مرۆڤدا واتە: بەرگری لەلەش دەکات، ئەو جۆرە گرانەتایانە، ئەو جۆرە هەوکردنەی جگەر، کە پێی دەوترێت: (هێپاتایتس B و C ) کە کوشندەن، ئەم ئینتەرفیرۆنە پەلاماریان دەدات، بەڵام جاری وا هەیە هەوکردنەکە بەهێزە، ئینتەرفیرۆنەکە کەمە دەرەقەتی نایەت، ئەبێت بە دەرزی لێی بدرێت، جینێك هەیە بەرپرسیارە لەدروست کردنی ئەو ئینتەرفیرۆنە، زاناکان دێن ئەو

جینە لەمرۆڤ دەردەهێنن ئەیخەنە ناو خانەی بەکتریایەکەوە ئەو بەکتریایە دەست دەکات بەدروست کردنی ئەو ئینتەرفیرۆنە کۆ دەکرێتەوەو بە دەرزیەك لە مرۆڤ دەدرێت ئەمە لایەنە خێرەکەیەتی.

لەئافرەتدا جینێك هەیە لێپرسراوی دروست کردنی پرۆتینە لە شیردا، ئەو جینەیان هێناوە گواستوویانەتەوە ناو مانگا، واتە: شیری ئەو مانگایە پرۆتینەکەی ئینسانییە نەك ئاژەڵی، کەواتە ئەو شیرە زۆر سوودی زیاترە لە شیرە ئاساییەکە بۆ منداڵ، لایەنی باشی تری ماوە هەندێك لەصیفاتی مرۆڤ لەو جینانەی کە لێپرسراون لە گورچیلە.. لە جگەر.. لەدڵ.. ئەیان گوێزنەوە بۆ ناو ئاژەڵ، بۆ بەراز.. بۆ گوێرەکە.. و... ئاژەڵانی تر. پاش ماوەیەك ئەو مرۆڤەی کە پێویستی بە جگەر یان گورچیلە یان دڵ دەبێت هی ئەو ئاژەڵە کە سیفاتی ئینسانی تێدایە بۆی دەگوێزنەوە چونکە دەگونجێت بۆ ئەو مرۆڤە، ئەمە لایەنە چاکەکانیەتی، ئەمە شەرع بە مەرج لەگەڵیدایە، ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: (هەر شتێك خێری کۆمەڵی تێدا بێت ئەوە دینە، ئەوە شەرعە، هەرشتێکیش زەرەری تێدا بێت بۆ مرۆڤ بۆ کۆمەڵ ئائەوە دژی دینەو شەرع نییە).

بەڵام لایەنە خراپەکەی کە دێن مرۆڤێك فۆتۆکۆپی دەکەن ١٠٠٪ پیاوێکە دەیەوێت کەسێك دروست ببێ وەك خۆی وابێت، بێگومان تا ئێستا دروست نەبووە، بەڵام نیازیان هەیە دروستی بکەن، مەڕێکیان دروست کرد بەم جۆرە ناوی (دۆڵی) بوو ئێستا (فۆڵیش) دروست کراوە، خەریکن وورده وورده دەیگەیننە قۆناغێك کە مرۆڤیش دروست بکەن بەو شێوەیە، کە یەکێك دروست دەکرێت وەك ئەو پیاوە یان ئافرەتە ئەوکەسە چی ئەمەیە کە لەبەری گیراوەتەوە ؟ نە کوڕیەتی، نە کچیەتی، وە نە دووانەن چونکە هەموو سیفاتێکی ئەمی تێدایە،

دووانەن بەڵام جیاوازی تەمەنیان بەینە، هیچ شەریعەتێك هیچ قانونێك قبوڵی ئەمە ناكات.

لە رووییەكی ترەوە: ئەیانەوێت مرۆڤ دروست بكەن وەك شمەكی یەدەگ (ادوات إحتیاط) دوایی لەناوی بەرن و پارچەكانی دەربهێنن بۆ مرۆڤێكی نەخۆش، لەرۆژئاوا خەڵك سەرەی گرتووە، ناوی نووسیووە لەزۆر دەزگادا، دەزگایەك هەیە (B.B.L)ی پێ دەڵێن (٣٠٠ تاقیگە)ی هەیە تەنها لە ( U. S. A) بۆ ئەم ئەزموونكردنانە جیناتی مرۆڤ دەگوێزنەوە بۆ (ئاژەڵ) بۆ (حەشەرات) بۆ (میكرۆبات) خەریكی ئەم ئەزموونانەن، بۆ نموونە: ژن و مێردێك كچێكیان هەیە تەمەنی ٦ ساڵە شێرپەنجەی ئێسقانیەتی ناوی خۆیانیان نووسیووە بۆ ئەوەی خێرا فۆتۆكۆپیەكی كچەكەیان بكەن مانای خانەیەك وەربگرن لەپێستی كچەكەیانەوە، ناوكەكەی بخرێتە ناو هێلكۆكەی ئافرەتێك بەبێ ناوك هەر (سایتۆپلازم)ەكە بێت، بچێنرێت لەرەحمی هەر ئافرەتێكدا، منداڵێك دەردەچێت ١٠٠٪ لەمنداڵەكەی ئەمان دەچێت، بۆ ئەوەی كە گەورە بوو ئێسقانەكانی دەربهێنن و بۆ ئەمی بەكار بهێنن!! ئەمە هیچ دینێك قبوڵی ناكات، جا مەترسییەكی زۆریش هەیە لەمەدا زاناكان دەڵێن: پەنجا هەزار تا سەد هەزار جین هەیە لەمرۆڤدا زۆربەی كەشف نەكراون چونكە سستن، ئەگەر بوروژێن نازانین چی روو ئەدات، لەوانەیە بوونەوەری سەیر دەرچێت، زانایەكی زۆر گەورە كە ناوی (جۆزێف رۆت پلان)ە ئەم پیرەزانایە كە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵە لەفیزیادا (لەفیزیای ناوكی)دا ئاژانسی رۆیتەر نامەیەكی ئەم زانایەی بڵاوكردەوە نووسیوویەتی بۆ زاناكانی سكۆتلەندە كە سەرقاڵی ئەم ئیشەن، دەڵێت: گەر بەردەوام بن ئەگەنە ئەوەی كە مرۆڤێك دروست بكەن بەشێوەی فۆتۆكۆپی بەڵام تكاتان لێ دەكەم ئەمە مەكەن كاتی خۆی سیاسەت مەدارانی ئەمریكا ئێمەیان

هەڵخەڵەتاند ووتیان: ئەڵمانیا بۆمبی ئەتۆمی هەیە ئێوە خێرا دروستی بکەن بۆ ئەوەی بترسن و تێمان نەگرن، ئێمەش قومبەلەیەکی هایدرۆجینیمان دروست کرد کەچی تەماشا دەکەین کێشایان بەیاباندا بەهیرۆشیماو ناکازاکیدا کە جەنگەکەشی تەواو بوو بۆمان دەرکەوت کە ئەڵمانیا بۆمبی ئەتۆمی هەر نەبووە، ئێستاش خەومان لێ ناکەوێت لەو کاتەوە ویژدانمان ئارام نییە، ئێوە گەر بەردەوام بن و ئەو جۆرە مرۆڤانەتان پێك هێنا ئیتر خەون نابینن وە هەموو مرۆڤێك بەم شێوەیە پێك دێت بۆمبی ئەتۆمی هەرزانە.

پێویستە ئێمە ئەم دووحاڵەتە جیابکەینەوە ئەوەی کەسیفەتێکی مرۆڤ دەچێتە ناو ئاژەڵێکەوە ئاژەڵەکە وەك کەلوپەلێکی یەدەگی بەکاردێت. جا ئایا ئاژەڵەکە نەخۆشی تری لەگەڵ دا ناگوێزێتەوە (واللە اعلم) ژیاری رۆژئاوا هەموو بەهایەك لەم جۆرە زانستانەوە وەردەگرێت، بەڵام ئێمەی ئیماندارو موسڵمان بەها لەدینەوە وەردەگرین دین لەوەحیەوە هاتووە، وەحی لەخواوە هاتووە، خوای گەورەش پەروەردگارە زانستێك کەلەسنووری رەوشت دەربچێت، زانستێك کەلەسنووری بەهاکانی خوای گەورە دەربچێت، زانستێکی زەرەرمەندە، زانستێکی وێران کار دەردەچێت، ئەم مەسەلەی (استنساخ)ە جیایە لەگەڵ ئەندازە گیریدا واتە: جیایە لەگەڵ (خلق)دا. (خلق) تەنها ئیشی پەروەردگارە (سبحانە وتعالی) کە لەنەبوون (مخلوقات) بەدی دەهێنێت، بەڵام ئەم کارەی کە ئەمان دەستیان داوەتێ بریتییە لەبەکارهێنانی بوونەوەری خوای گەورە، دەستکاری خانەکانیان دەکەن، (خانە) خوا دورستی کردووە، دەستکاری (جینات) دەکەن لەسەر کرۆمۆسۆمات، (جین) خوای گەورە دروستی کردووە، ئەیخەنە ناو خانەیەکی ترەوە ناوکەکەیان فڕێداوە ئەیخەنە ناو سایتۆپلازمەکەوە سایتۆپلازمەکە خوای گەورە دروست

کـردووە، ئەمــە دەسـتکاری کردنــی بەرنامــەی خوایــە، قورئــان دەفــەرمووێت:

(فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ﴿١١٩﴾)[٢٣٣]

باسی شەیتان دەکات کە رۆژێـك لـە رۆژان فرمـان دەکات (ولآمـرنهم فليبـتكن آذان الأنعــام ولآمــرنهم فلــيغيرن خلــق الله) رۆژێــك دێــت شــەیتان فرمــان دەکــات بەئــەولیاکانی خــۆی کــە دەســت کــاری بەرنامــەی خــوا بکــەن، ئەمــە یەکێکــە لەتەفسیراتی ئەو ئایەتە کە مرۆڤ ئاوا دەستکاری بەرنامەی خوا دەکات، دەیـەوێت بە رێگای شەرعیەکەیا بەرێگە سروشتیەکە مرۆڤ دروست نەبێت بـەڵکو بەرێگـەی فۆتۆکۆپی کە کارەساتێکی گەورەی لەدواوەیە دروست ببێت، بەرێز مامۆستا دکتۆر (ئەحمـەد کوبەیـسی) راڤـەی ئایـەتێکی کـردووە کـە خـوای گـەورە دەفـەرمووێت:

(حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾)[٢٣٤]

(فتحت) واتە: (کرایەوە) واتە: شتێك هەبووە بەڵام لەوەو پێش داخراوە، تەفسیری دەکات بەم جیناتەی کەلەمرۆڤدا هەیە کە سستن، بەهۆی دەست لێدانی بەرنامـەی خواوە ئەورووژێت بوونەوەری سەیرو سەمەرە دروست دەبێت (یـأجوج ومـأجوج) ئەمانــە میللــەتێکی دیــاری کــراو نــین ئەمانــە کۆمەڵــە بوونــەوەرێکن قورئــان دەفەرمووێت: (من کل حدب ینسلون) (حدب) واتـە: سنگ، لـە هـەموو سـنگێکەوە پەیادەبن، واتە: لە رێگـە سروشـتیەکەوە دروسـت نـابن، لەنێوان هاوسـەرەکان یـا نێـرو مێـوە دروسـت نـابن، ئـەم رێگـای فۆتۆکۆپیەیـە کەلـە وەرگرتنـی خانـەی

---

[٢٣٣] النساء / ١١٩ .

[٢٣٤] الأنبياء / ٩٦ .

جەستەوە دروست دەبن، جا قورئانی پیرۆز زۆر وورد دەفەرموویت: (ینسلون) نافەرموویت: (یتناسلون) بە صیغەی (یتفاعل) بەکاری ناهێنێت (ینسلون) واتە: بەبێ پەیوەندی زایەندی دروست دەبن، واتە: رۆژێك دێت ئەو نهێنیە دەکریتەوە مرۆڤایەتی بەو جۆرەی لێ دێت، (یأجوج ومأجوج) لە (اج یأج) واتە: هەلگیرساندنی فیتنەو ئاشوب و ئاگرو دووبەرەکییەوە هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) لەچەند فەرموودەیەکیا وەصفیان دەکات و دەفەرموویت: کورتە باڵان.. زۆردڕن.. خوێن مژن.. توندوتیژن (عتاه).. تاوانبارن.

ئاوا وەصفیان دەکات دەفەرموویت: کە دێنە سەر هەر شتێك بخورێت، هەمووی دەخۆن و هیچی ناهێڵنەوە، کە دێنە سەر ئاوێك، سەر روبارێك، ئەوەندە زۆرن کە بە کاروان دێنە سەر روباری بچوك بچوك ئەو بەشەی کەلەدواوەن کاتێك دێنە سەر روبارەکە ئاوی تێدا نەماوەو دەڵێن: ئەمە کاتی خۆی ئاوی تێدا بووە، دەڕۆنە سەر هەرشتێك لەناوی دەبەن ئەمانە نەئاژەڵن نەمرۆڤن، وای لێ دێت خەڵك پەنا دەبات بۆ خوای گەورە لەشەڕی ئەوانە، ئەمە یەکێکە لەو تەفسیرانە چونکە قورئانی پیرۆز دووبەشە:

١) بەشێکی پێی دەوترێت (محکم).

٢) بەشێکی پێی دەوترێت (متشابە).

(محکم) دیاری کردنی - قەدەغەکراو (حرام) و رێپێدراوە (حلال) - بۆ ژیانی رۆژانەی مرۆڤ کە بریتییە لەو شتە ئاشکرایانەی کە تەفسیرکراون و ئیتر روون و ئاشکران بەڵام (متشابە) لەهەموو زەمانێکدا تەفسیری خۆی هەیە، ئەمە لەو ئایەتە متشابهانەیە ئەمڕۆ بەم شێوەیە تەفسیر دەکرێت کە ئەگەرێکی زۆرە بەهۆی دانەخستنی دەرگای ئەم جۆرە زانستەی کە دەستکاری بەدیهێنراوی خوا دەکات. لەوانەیە ئەو جۆرە بوونەوەرانە دروست ببن کە زەرەرمەند دەبن بۆ

مرۆڤایەتی، لەفەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) کە باسی ئەوان دەکات بەشێك لەفەرموودەکە ئەفەرمووێت: (تنفجر فیکم غمامە) سەیری دەربڕینی پێغەمبەر (ﷺ) بکەن (إنفجار) هەورێك ئەتەقێتەوە لەناوتانا (مثل الترس) وەك قەڵغانێك، هەموو لەفلیمدا بینیوومانە، قونبەلەی زەری کە دەتەقێتەوە، بەرزدەبێتەوە وەك درەختێك وەك قەڵغانێکی لێ دێت پاشان (تنشر) بڵاودەبێتەوە (وهی دخان) دووکەڵیشە (فتقبض ارواح الناس)[٢٣٥] رۆحی خەڵکی رادەکێشێت، ئەمە بێجگە تەفسیری قونبەلەی زەری چ تەفسیرێکی تر ئەتوانێ ئەو مانایە هەڵگرێ، ئاشکرایە ووشەی (تنفجر) بەکاردەهێنێت، لەکۆتاییدا دەڵێت: ئێمە لەگەڵ هەموو زانستێکداین کەسوودی هەبێت بۆ مرۆڤایەتی وە دژ بەهەموو زانستێکێن کە زەرەر دەدات وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (اللهم إني أعوذ بك من علم لاینفع)[٢٣٦] پەنا دەگرم بەتۆ خوای گەورە لەزانستێك کە سوودی نەبێت.

وآخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمین

---

[٢٣٥] قبض الارواح، البخاري مواقیت ٣٥ / ابي داود، أدب ٤٣ / النسائي، إمامة ٤٧ / ابن ماجة، جهاد ١٠ / مسلم، فتن١١ / الترمذي، فتن٥٩ / أحمد بن حنبل ١٨٢/٤٢٠.

[٢٣٦] ئەم فەرموودەیە بە چەند (متن)ێك هاتووە، کە خزمەت بەم ناوەڕۆکە دەکەن، وەك: اللهم اني اسألك علما نافعا، ورزقا طیبا، وعملا متقبلا. ابن ماجة وغیره، وانظر صحیح ابن ماجة ١/١٥٢ ، وجمع الزوائد ١١١/١٠.

# باسی بیست‌و شەشەم

# ئیعجازی زانستی لە بوونی مرۆڤدا

*** لە بواری ڕەنگدا:**

ئاشکرایە کە تۆوی مرۆڤ ((سپێرم))، ئەوەندە وردە بە ((میکرۆسکۆب))ی ئاسایی نابینرێ، بەڵکو بە ((مایکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنی)) سەروو ((٨٠٠)) هەزار جار گەورەکردن ئینجا ڕوون و ئاشکرا ئەبێت و تۆزێ بریسکەی لێوە دێت، هەروەها هێلکۆکەی ئافرەتیش ئەو بریسکەیەی هەیە کە بە ((مایکرۆسکۆب)) تەماشا ئەکرێ. لە مشتەقاتی ووشەی ((نطفة)) ((النطف)) واتە: ((مرواری)) مرواریش بەچی بەناوبانگە؟ بە بریسکە دانەوە. بریسکە ئەدەنەوە.

ئینجا لێرەدا پاش ئەوەی تەکنۆلۆجیای وێنەگری وەك مایکرۆسکۆب، گەشەی پێ درا، گەیشتە ئەوەی کە ڕەنگی ئەو سپێرمە، (ئاوی پیاو) سپییە، بەڵام هی ئافرەت زەردە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکدا ئەفەرموێ:

((ماء الرجل ابيض وماء المرأة أصفر))[٢٣٧]

ئایا کێ پێی ووت؟ خۆی زانی؟ میکرۆسکۆبی ئەلکترۆنی هەبوو؟ یاخود ئەمە پشتگیرییە لەلایەن خواوەو لەوێوە هەواڵی پێ ئەدرێ؟ بەهیواین کە ئەم باسە هۆکارێکی هیدایەت بێ بۆ ئەو جۆرە کەسانەی کە لە گوماندا ئەژین، بەڵکو بەخۆیاندا بچنەوەو بزانن بەڕاستی ئەمە معجزەیەو ئەمە بە بەشەر ناکرێ.

---

(٢٣٧) صحيح ابن حبان / الجزء ١ / ص٤٤١، هەروەها مسند ابي عوانة ٢ / الجزء ١ / ص٢٩٤.



★له بواری زاراوه:

بێینە سەر ئیعجازێکی تر کە پەیوەستە بە زاراوەو، بە ((تێرمنۆلۆجی))یەوە قورئان ووشەی ((علقە)) بەکار ئەهێنێ لەگەڵ ووشەی ((مضغة)) بۆ قۆناغەکانی لە کۆرپەلە.

((علقـە)) دوو مانـای هەیـە:- مانایـەکیان واتـە کـرم، مانایەکیـشیان واتـە خۆهەڵواسین، ئەمڕۆ بەهۆی گەشە کردنی کۆرپەلە ناسینەوە ((ئیمبریۆلۆجی)) بۆیان دەرکەوت بە کامێرا بەشێوەیەك کە بوەتە حەقیقەتی زانستی کە ئەو ((تۆوە پیتێنراوە)) وەك کرمێکی لێ دێت کە ئەگاتە ڕەحم، بۆ ماوەی ((١٤)) ڕۆژ خۆی هەڵئەواسێ بە دیواری ڕەحمەوە بەشێوەی کرم پاشان شێوەکەی دەگۆڕێ بۆ شێوەیەکی تر کە پێی ئەوترێ ((مضغة)) ئەو ((مضغة))یەش نزیکەی ((٣ سێ)) هەفتە بەو شێوەیە دەمێنێتەوە جا وورده وورده شێوەکەی دەگۆڕێ.

مەرجە خۆی هەڵواسێ بەدیواری ڕەحمەوە تا کۆتایی، هەرکاتێك ئەو پەیوەندیـیە نەما (ئەو خۆهەڵواسینە نەما) ((اجهاض)) لەبارچوون ڕووئەدات.

لەبەرئەوە هیچ ووشەیەك ناتوانێت دابنێیت لەجیاتی ((علقـە)) بەو مانایەی ((علقە)) بێت شێوازەکەشی وەك کرمە ئیشەکەشی خۆهەڵواسینە سبحان الله العلی القدیر.

زاناکانی ڕۆژئاوا بۆیان دەرکەوت کە کۆرپەلە لەم قۆناغەدا شێوەی کرمی هەیە، ئیشەکەی ئەوەیە خۆی هەڵدەواسێ بەدیواری مناڵدانەوەو ناویان نا ((لیچ لایك)). Leachlike

((لیچ لایك)) یانی ئەشوبهێتە کرم واتە ((علقە)) کە ئاگایان لە قورئانیش نییە، وە ((١٤)) ڕۆژ ئەخایەنێو پاشان ئەگۆڕدرێ وەکو بنێشتێکی جوراوی لێ دێ. خوای

گەورە ئەوەی ناو ناوە ((مضغة)) واتە: ((جوراوە)) ئەگەر بێیتە سەر زاراوە ئینگلیزییەکەی پێی ئەووترێ ((چووت لایک)) یەعنی: ((جووراو)) ((سبحان الله))!!.

ئینجا هیچ ووشەیەك ناتوانیت دابنێیت کە ئەو مانایە ببەخشێت بەو قووەتە. ئەمەش جۆرێکە لە ئیعجازی ووشە لە قورئانی پیرۆزدا لە بواری پزیشکیدا.

★لەبواری زنجیرەبەندیدا:

هێلکۆکەی ئافرەتە کە گەورەترین خانەی لەشە نزیکەی ((٤٠٠ ـ ٥٠٠)) دانە لە تەمەنی ئافرەتەدا بەتێکڕایی هەموو ((٢٨)) ڕۆژێك دانەیەك بەشێوەی دەرپەڕینێك دێتە دەرێ لە هێلکەدان بەرەو خوار.

قورئانی پیرۆز ووشەی ((سلالە))ی بۆ بەکار دەهێنێت. ((إستل)) واتە هاتنە دەرەوە، لەو هێلکەدانەوە هەموو ((٢٨)) ڕۆژێك هێلکەیەك دێتە دەرێ وە لەژێریدا ئۆرگانێك هەیە شێوازی ڕەحەتی هەیە ئەیگرێتە خۆیو برژانگی تیایە پاڵی پێوە ئەنێ بۆ ناو کەناڵێك پێی ئەووترێت کەناڵی ((فالوپ)) ئەگەر لەوێدا تۆوی پیاوەکە هاتبێتە ئەوێ لە ماوەی ((٣ سێ)) ڕۆژدا دەپیتێنرێت ئەگەر نەبوو لەوێدا دەپوکێتەوە. دوای ئەوە وورده وورده دەڕواتە خوارێ شایانی باسە کە هەر ئەو ڕۆژەی کە دەپیتێنرێت لەولاوە ((مەشیمە)) دروست دەبێت لەناو ڕەحمدا ((سبحان الله)).

کاتێك کە ئەم تۆوە پیتێنراوە ئەڕوات و ئەگاتە ڕەحم خۆی هەڵئەواسێ بە ڕەحمەوە وە پێشتر ئاماژەمان پێدا، قورئان ناوی ناوە بە ((علقە)) کەمانای هەڵواسراو دەبەخشێ.

پاشان ئەبێتە ((مضغة)) وە پاشان((مضغة))یە ئەبێتە دوو بەش:-

بەشێکیان ئەندام و ئۆرگانەکانی تری لەشی لێ دروست دەبێ، بەشەکەی تری ئەبێتە دەمارێك کە خوێن دەهێنێت لە ((ڕەحم))ەوە لەدیواری منداڵ دانەوە بۆ ئەو کۆرپەیەی کە لە سەرەتای قۆناغی یەکەمدایە، خۆراکی بۆ ئەهێنێت لەڕێی خوێنەوە، ئۆکسجینی بۆ ئەهێنێت لەڕێی خوێنەوە.

ئینجا دەرهاوێشتەکانی (افرازات)و ئەو ماددە ژەهراویانەی کە هەن لەگەڵ دووەم ئۆکسیدی کاربۆنەکەدا کە ئەڕۆنەوە دەرێ بەم جۆرە گەورە ئەبێ پێی ئەووترێ ((والآش)) جا ئەگەر وورد بینەوە قورئانی پیرۆز باسی ئەکات: ((من مضغة مخلقة وغير مخلقة)) ئەم ((مضغة))یە ئەم ((جووراوە)) دوو شێوازی هەیە یان دوو بەشی هەیە، بەشێکی ((خلق)) لێی دورست ئەبێ ((سەر و قاچ و دەست و)) هەموو ئەندامەکانی دەرەوەو ناوەوە، ئەوەی تریان گەورە ئەبێو ئەبێتە والآش، کاتی لەدایك بوون کە هەردووکی بەیەکەوەن هەردووکی خانەنویەك سەرچاوەیان هەیە لە باوك و دایکەوە هاتوون، کاتێك ئەبینی ئەمیان ئەبڕرێو فڕێ ئەدرێ، ئەوی تریشیان باوەشی پیائەکرێو بەساقەو بەقوربانی ئەبن.. ئەویش مرۆڤەکەیە. خوای گەورە ئەفەرموێت:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ

هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ۝ ...[٢٣٨]

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای متعال دەفەرمویٚ:

ئەی ئەو کەسانەی کە گومانتان هەیە لە زیندوو بونەوە بیربکەنەوە ئەوە ئێوە لە گڵ دروست کراون، لە زانستی ئەمرۆدا ڕوونە هەرچی پێکهاتەمان هەیە لە گڵدا هەمان پێکهاتەیە. گۆشت و ماسولکەو ئێسك و خوێن و ئەم لەشەی ئێمە کە شیتەڵ ئەکرێتەوە هەمان پێکهاتەی گڵە وەك: ماددەکانی مەگنیسیۆم و کاربۆن و نایترۆجین و فۆسفۆرو مەنگەنیس و ئاسن و مس و.. هتد ئەمە لەناو زانایاندا زۆر ڕوونە، ڕەگەزێك نییە کە لە گڵدا هەبێت و لە لەشمانا نەبیٚ یان بە پێچەوانەوە ئێمە پێکهاتەی گڵین لە ڕووی لەشەوە لە ڕووانگەی زانستەوە، پاشان ئەفەرمویٚ: ثم من نطفة.... نطفە کەش بەهۆی مایکروسکوبی ئەلیکترۆنییەوە بینرا، پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام ڕەنگەکەشی دیاری کرد. ئینجا ئەفەرمویٚ ((من علقە)) ئەمەشمان ئامازە پیٚ کرد کە بەهۆی هۆکاری پێشکەوتووی نویٚوە ڕوون و ئاشکرا بینراوە. ئینجا :

((مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ ۝ ))[٢٣٩]

شێوازی جووراوەکە هەردوو جۆرەکەمان باس کرد دوای ئەوە مانەوەیەك لە ڕەحمدا کە مەزندە ئەکریٚت بە ((٢٦٠)) ڕۆژ

---

([٢٣٨]) الحج / ئایەتی (٥).

([٢٣٩]) الحج / ٥

((إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ))[٢٤٠]

بۆ کاتێکی دیاری کراو ((٢٦٠) ڕۆژە، وە کە پیتاندنەکە لە ((قەناتی فالوب))دا ئەمێنێتەوە دوای نزیکەی حەفتەیەك یان زیاتر دێتە ڕەحمەوەو ئەمێنێتەوە، ئیتر دوای ئەوە

(( ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلًا ۚ ))[٢٤١]

منالّ لەدایك بوونە کە هەموو کەسێك دەیزانێ.

بەڵام ئەم قۆناغانەی کە منالّ شیر ئەخوات و ئینجا دوایی گالگۆلکێ ئەکات و پێ ئەگرێ ئەو قۆناغانەی کە هەموو کەسێ ئەیبینێو هەموو کەس پیایدا ڕۆشتووە ئەبێ بزانین قۆناغی دیکە هەبووە کە وەختی خۆی نەبینراوە لەناو سکی ئەو دایکەدا هەمووی ڕووی داوە..

زنجیرەبەندیەکی سەیر، زنجیرەبەندیەکی چوونیەکی سەد لەسەد لەگەلّ زانستدا بەڵام بەداخەوە تا ئێستاش هەندێ کەس لە گێژاوی گوماندا ئەژین، وە وابزانم کاتی ئەوە هاتووە خۆیان لەو گێژاوە ڕزگار کەن و خۆیان تەسلیمی پەروەردگار کەن و خۆیان ئاوێزانی بەرنامەکەی خوای گەورە بکەن و خۆیان لە کانیاوی سازو دلگیری قورئانی پیرۆز تێر ئاو بکەن.

خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێ

---

([٢٤٠]) الحج / ٥.

([٢٤١]) الحج / ٥.

((مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ ))[٢٤٢].

خـوای گـەورە شایـستەی ئـەو ڕێزەیـە، ئـەو خوایـەی کـە بـە قۆنـاغ قۆنـاغ ئێمـەی دروست کردووە.

* بێینە سەر ئیعجازێکی زنجیرەبەندی تر.. کە ئەو کۆرپەلەیـە لـە سـەرەتادا کـاتێ کـە درێژییەکـەی ئەچـێتە ((١٣)) ملـم، واتـە بەقـەدەر نینـۆکی پیاوێـك دەبێـت، نینۆکێکی بچکۆلانە لەم حەجمەدا ئەبینیت دوو خەتی بۆ دروست ئەبێت یان دوو کونی بۆ دروست ئەبێت لەملاو لەولا کە ئەوە سەرەتای گوێی ئەو مرۆڤەیە، پاش ئەوە دوو چاڵی بۆ دروست ئەبێت، لە ناوەڕاستی ڕوویا، یەکەمجار ڕوومکە دروست ئەبێت، ڕوومکە واتە: بونیادی دەم و چاومکە، ئەو ڕووە دروست ئەبێت ئینجا ئـەو دوو کونەی ئەملاولای کە دەبنە سەرەتا بۆ هەردوو گوێی مرۆڤ.

وە پاشان دوو چاڵ دروسـت ئـەبێت لـە ناوەڕاسـتی ئـەو ڕووەدا کـە دەبنـە چـاو لـە داهاتوودا.

(وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿٩﴾ )[٢٤٣].

پێغەمبەری خوا (((صلی الله علیـە وسـلم)))، ئـەو جـۆرە زانـستەی پـێ بـووە، ئـەو زانیاریەی هەبووە، هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێ:

(أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾ أَلَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ عَيۡنَيۡنِ ﴿٨﴾ )[٢٤٤]

---

([٢٤٢]) نوح / ١٣ و ١٤.

([٢٤٣]) السجدة / ٩.

ئەی دوو چاومان بۆ دروست نەکرد؟ پاشان دەممان بۆ دروست نەکرد؟ بە نسبەت زنجیرەبەندیەوە یەکەمجار ئەو کونی گوێیانە دروست ئەبن، پاشان ئەو چاڵانە دروست ئەبن بۆ چاو پاشان بۆ دەم.. ئەم زانیاریە لە ئاسمانەوە دراوە بە پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) بۆیە لە سجدەدا لەیەکێ لە دوعاکانیدا ئەیفەرموو ((سجد وجهي للذي خلقه...)) تێبینی بکەن یەکەم جار دەم و چاوەکە (ئەو ڕووە) دروست ئەبێت.

((سجد وجهي للذي خلقه وصوره وشق سمعه وبصره بحوله وقوته فتبارك الله احسن الخالقين))[٢٤٥] سوجدەی بردووە بۆ ئەو خوایەی کە ڕووی بۆ دروست کردووە کە گوێی بۆ دروست کردووە، کە چاوی بۆ دروست کردووە، گەورەیی هەر بۆ ئەو خوایەیە.

لە درێژایی ((١٣ ملم)) دا ((١٣)) ملم بەو بچوکیە، ناگاتە سانتیمەتر و نیوێك، پێغەمبەری خوا کێ پێی ووت لەو کاتەدا سەرەتای دروست بوونی چاوەو سەرەتای دروست بوونی گوێیەو ئینجا دەمەو ئینجا زمان و لێوو. ئەمە کێ پێی ووت..؟!... بێجگە لە زاتی پەروەردگار. (سبحانه تعالی).؟

خوا ئەفەرموێ:

((ئێسقان دروست ئەکەین، پاشان دای ئەپۆشین بە گۆشت))

تا ماوەیەکی کەم لەمەوبەر باوەڕیان وابوو کە گۆشت و ماسولکەکان دروست ئەبن یەکەمجار پاشان وورده وورده لەناویانا ئێسك دروست ئەبێ. بەڵام قورئان وا نافەرموێ.. بەڵکو ئەفەرموێ: ئێسك دروست ئەکەین و پاشان دایئەپۆشین بە گۆشت. بەهۆی پێش کەوتنی تەکنۆلۆجیاوە دەرکەوت بە شێوازێك کە ئیتر هەڵە

---

([٢٤٤]) البلد / ٧ و ٨.

([٢٤٥]) الترمزي / ٢ / ٤٧٤ واحمد ٦/٣٠ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ٢٢٠/١ والزيادة له.



قبـولْ ناكـات و بوومتـه راسـتييەكى زانـست دەركـەوت يەكـەم ڕۆژى هەفتـەى حەوتەمـدا سـەرەتاى دروسـت بـوونى ئێسقانە. هەنـدێ وێنـه هەيـە لـه حەفتـەى هەشتەمدا ئێسقانەكانى پەنجەى دەست و قاچەكە زۆر بـه ڕوون و ئاشكرا ديـارن لەو كۆرپەلەيەدا پاشان برِبـڕەى پـشتى بـەڵام هـيچ ئاسـەوارى گۆشـت وە ماسـولكە ديـار نييـە. ئەمـە سـەلماندى كـە ئێـسقانەكان دروسـت ئـەبن يەكـەمجار پاشـان دائەپۆشرێن بە گۆشت.. وەك قورئان ئەفەرموێ:

((لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ ﴿٦٧﴾ ))[٢٤٦]

هەموو خەبەرێك شوێنەكانى خۆى هەيـە، ئـەو خەبـەرە هێـشتا ڕوون نـەبووبووەوە بۆ خەڵكى، بۆ زاناكان ڕوون نەبوو، تا ئەو پێشكەوتنە ڕوويدا لە كامێرا.. كە بەڵێ يەكەمجار ئێسكەكە دروست ئـەبێ‌و پاشان دائەپۆشرێ سەد لـە سـەد وەك خـواى متعال فەرموويەتى.

جا ئەوانـەى كـە ئـەڵێن محمـد زيـرەك بـووەو قورئـان خـۆى داينـاوەبەڕاسـتى ئـەوە ئەوپەڕى بێ عەقڵييە چونكە ئەو كامێراو شتانە هەمووى چەند ساڵێكە دروست بـووە، ١٤٠٠ سـاڵ لەمەوبـەر محمـدێكى بەشـەر چـۆن ئـەزانێ وەهـا بڵـێ ئەگـەر وەحيەكى ئيلاهى‌و پشتگيرى ئاسمان نەبێت.

بێينە سەر ئايـەتێك لـە قورئـانى پيرۆزدا كـە ئـەم قۆناغانـەمان بـۆ بـاس دەكـات..

((وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً

---

([٢٤٦]) الأنعام / ٦٧.

فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ))[٢٤٧]

ئەم بەدوایەکدا هاتنە ئەوەستێ بەرامبەر ڕاستییەکانی زانست جا لێرەدا هەر لەم ئایەتە پیرۆزەوە کە گوێ بیستی بووین تا بەو قۆناغانەدا ئەڕوات ئینجا ((ثم انشأناه خلقا آخر)) ماوەیەکی پێ ئەچێ دوایی ئەگۆڕدرێو ئەبێتە شێوازێکی تر، ئێستا دەرکەوتووە کە لەو قۆناغە سەرەتاییانەدا ناتوانی خانەی پیتێنراوی مرۆڤ جیاکەیتەوە لەگەڵ خانەی پیتێنراوی مریشکدا، یان ماسی، یان کیسەڵ، خانەی پیتێنراوی مانگادا، یان مەیمون.. هتد هەمووی ئەو شێوازە بچکۆلانەیەی هەیەو دوایی دوو کونی بۆ دروست ئەبێ بۆ گوێو ئینجا دوو کونی بۆ دروست ئەبێ بۆ چاو ئەمانە جیاناکرێنەوە، ناتوانی بڵێی ئەمانەتایبەتن بە کێوە، لە تەمەنی ((١٢ و ١٥ و ١٦))ڕۆژدا ناتوانی بڵێی ئەمە مرۆڤە یا مریشکە، ناتوانی جیای کەیتەوە، بەڵام دوای ئەوەی کە ووردە ووردە ئەڕوا.. کە ئەم ئایەتە ئیعجازی تایبەتی خۆی دەرخستووە.

((ثم انشأناه خلقا آخر)) جیاکردنەوەی ئەم مخلوقە نازدارە لای خوا، لەگەڵ مخلوقاتی تردا هەر لەخۆیدا ئیعجازێکی زۆر گەورەیە، جگە لە ((خلقا آخر)) ((فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ ))[٢٤٨] یان ((انشأناه)) نەشئەی پێ ئەڵێین ((تسویه))ی پێ ئەڵێین جیای ئەکاتەوە لەگەڵ مخلوقاتی تردا..

---

([٢٤٧]) المؤمنون / ١٣ و ١٤.

([٢٤٨]) القیامة / ٣٨.

خوشك و برای بەڕێزم: ئێمە وەك ئیماندار دڵنیاین باوەڕدارین و هیچ گومانێكمان نییە كە ئەو خوا گەورەیە دەست بەردارمان نەبوو كاتێ كە هیچ نەبووین، دەست بەردارمان نەبوو لە مرحلەیەكدا

((لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ۝١ ))[٢٤٩].

كاتێ كە تۆو بووین چی بووین هیچ نەبووین، لەو قۆناغەدا خوای گەورە دەست بەردارمان نەبوو وونی نەكردین، بەڵكو سەرپەرشتی كردین، قۆناغ بە قۆناغ ئێمەی پاراست، تا ئەو ئاستانەمان بڕیو بووینە منداڵ و بە پلەی منداڵیشدا ڕۆیشتین، خوای گەورە ((جل جلالە)) پاراستینی هەتا باڵغ بووین. ئایا ئێستا دەست بەردارمان ئەبێت.؟ حاشا.. بەتایبەت پاش ئەوەی كە یەكخوا ناسیمان ڕاگەیاند جاڕمان دا كە ((الله)) خاوەن مان بێت، شارع مان بێت، ئیسلام منهج و بەرنامەی ژیانمان بێت، ڕازی بووین بە سەركردایەتی ((محمد المصطفى)) (((صلى الله علیه وسلم))) كە بە شێوازە فەرموودەییەكەی هاتووەو ئەفەرموێ:

((رضيت بالله ربا، وبالاسلام دينا، وبمحمد نبيا ورسولا))[٢٥٠].

پاش ئەوەی كە لە هەوڵ و كۆششداین كە پەرستشی ئەو خوایە بكەین تەنها لەڕێی محمدەوە (((صلى الله علیه وسلم))) چونكە خوا هەر ئەوەی پێ خۆشە، هەر بەوە ڕازی ئەبێ كە عبادەتی بكەین لەڕێی محمدەوە نەك لەڕێگەی كەسی ترەوە

((إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ۝١٩ ))[٢٥١]

---

([٢٤٩]) الانسان / ١.

([٢٥٠]) سلسلة أحاديث الصحيحة / مجلد ٦ / رقم (٢٦٨٦).

([٢٥١]) آل عمران / ١٩.

ئایا دوای ئەم هەموو عبادەتەو ئەم ((ولائە)) بەبێ شەریك بۆ خوا.. دەست بەردارمان ئەبێت.. حاشا.. حاشا لله بەتایبەت کە ئیعلانی خۆشەویستی خوامان کردووە، ئیعلانی خۆشەویستی پێغەمبەر مان کردووە، لە هەوڵ و کۆشش داین کە شوێن ئەو زاتە بکەوین ((علیه الصلاة والسلام)) سوننەتەکانی زیندوو بکەینەوە، بدعەکان بمرێنین، لە هەولا بین کە ئەم خێر و بەرەکەتە بگا بە هەموو کەس، وە هەرچی ئەو توحیدەی لە دڵایە ئێمە خۆشمان ئەوێ، بەڵکو ئەوەی دەرەوەی بازنەی تەوحیدیشە تەمەننای خێری بۆ ئەکەین هەوڵیش ئەدەین نەك هەر تەمەنایەکی قلبی هەوڵی عەمەلی ئەدەین کە ئەسبابی هیدایەتیان پێ بگا. ئایا دوای ئەمانە خوای گەورەدەست بەردارمان ئەبێت؟ بێگومان نەخێر، بەڵام ئێمە خەفەت بۆ ئەوکەسانە ئەخۆین کە بەردەوام لە خولگەی گوماندان، بەردەوام گومانیان هەیە، لە خەوی غەفڵەتدان خەمی ئەوانمانە کە بڕۆنە ئەودنیا بەبێ توحید، بەبێ خواناسین، بەبێ پەرستش.. یەعنی هەوڵ ئەدەین کە ئەم قسانەی کردمان، ئەم ئیعجازاتانەی کە باسمان کرد هاندەرێك بێت بۆیان دەریان بهێنێت لەو خەوی غەفڵەتەو خەبەریان بێتەوە.

((يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ۝٦ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ۝٧ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ۝٨))[٢٥٢]

ئەو خوا گەورەیە داوامان لێ ئەکات کە غرور نەمان گرێت، ئەو خوایەی کە ئێمەی دروست کردووە،

---

(٢٥٢) الانفطار / ٦ و ٧ و ٨.

((خلقك فسواك فعدلك)) چەند بەرێك وپێكی بەشەری دروست كردووە جیای كردۆتەوە لەگەڵ ئاژەڵدا، هەموو هۆكانی هدایەتی پێ داوە، بیر بكەرەوە ئەی مرۆڤ. بیربكەرەوە هەر لەدەستت ((٢٥)) جومگەی تێدایە لە هەموو دەستێكدا ((٥٨)) حەرەكەت ئەكا.. هیچ ئامێرێكی ئاوا بزۆك (متحرك) نییە لەسەر زەویدا تواناو (كەفائە)ی دەستێكی هەبێت، لەناو هەر جومگەیەكی جومگەكانی لەشی مرۆڤدا شلەمەنییەك هەیە سائلێكی زەیتی هەیە كە هەرچی مختبرات و كارگەكانی دنیا هەیە ناتوانن قەترەیەك لەوە دروست بكەن.

تەماشای دڵی خۆت كە ئەو دڵەی لە تەمەنی ٧٠ حەفتاساڵیدا نزیكەی ((٥٥)) ملیۆن گالۆن خوێن پاڵ پێوە ئەنێ مەزەندە ئەكرێت بە بەهێزترین ئامێر لەسەر ئەرزدا، دوو خانەی دڵیان هێنایە دەرێ لە تاقی كردنەوەیەكدا، دوو خانەكەیان جیا كردەوە. ئەبینن ئەو دوو خانەیە ترپەیان تیایە ((سبحان الله)) لە ترپەی خۆیان وازیان نەهێناوە بچڕاویشن لە دڵەكە!! دوایی هەر لەو تاقی كردنەوەیە ئەو دوو خانەیەیان دایەوە لەیەك دوای ئەختێ ئاوازەكانیان بویەوە بەیەك، ئەمە كێ كردی؟ ئەمە ئەیسەلمێنێ كە هێزێكی غەیبی هەیە ئەمە ئەبات بەڕێوە.. سەیری لەشی خۆت كە!! بیر لە جگەرت یان زراوت یان پەنكریاست یان هەرس كردنت بكەرەوە، سەیری بینین كە ((٩٠٪)) لە مەعلوماتت لە بینینەوە دێت، ((١٦٠٠)) هەزار و شەش سەد دەنگ جیائەكەیتەوە بە ئامێری گوێ.. ئەو دەنگە ئەكا بە كارەبا و خەزنی ئەكا..چاو ئەو ڕەنگە ئەكا بە كارەبا و خەزنی ئەكا، كەی ویستت جوابت ئەداتەوە لە مێشكتدا كۆی ئەكاتەوە، هەر خانەیەك لە لەشدا ((١٠٠)) هەزار ملیۆن)) خانەیە، كامی ئەگری ئەو كرۆمۆسۆماتەی تیایە ئەو جیناتەی تیایە هەموو هۆكارەكانی بۆماوە لەوێدا تۆمار كراوە، واتە هەموو خانەیەك لەو ((١٠٠)) هەزار ملیۆنە تۆیت.. هەموو خانەیەك تۆیت و خۆتیت.

لەبەرئەوە پێویستە بزانیت کە ئینسانی عاقڵ کردارێك ناکات کە هەدەفێکی نەبێت و لەبەر ئاواتێك نەبێت هەموو کارێکی خواحکمەتی تیایە، مەرجیش نیە ئێمە هەمووی تێ بگەین، وەکو خلقی خوا حکمەتی تێدایەو هەندێکی بۆمان دەرئەکەوێ ئاوا بە سەرزارەکی تەماشای کۆرپەلەیەك ئەکەیت لە سکی دایکیدا ((دوو دەست و دوو قاچ و زمان و گوێو..)) باشە ئەمانەی بۆچی پێ داوە لە ڕەحمێکی داخراودا؟! قاچی بۆچییە؟ خۆ ناڕوات دەستی بۆچییە؟ خۆ نایجووڵێنێو بەکاری ناهێنێ؟ دەمی بۆچییە؟ خۆ خواردنی پێ ناخوات؟ بە ئامادەیی لە ئاوکیەوە بۆی دێت. بەڵام پاش کەمێك بیرکردنەوە بۆت دەرئەکەوێت کە ئەمانە بۆ قۆناغێکی دیکەن. ئەمانە بۆ دەرەوەن کاتێکیش کە دێتە دنیاوە هەست ئەکەیت کە ئەو هەست و خۆشەویستیەت و شعورت هەموو دنیا پڕی ناکاتەوە. ئەبێ تێ بگەیت ئەمە دانراوە بۆ عالەمێکی تر بۆ قۆناغێکی تر.
مردنەکەش حکمەتی تێدایە نەك هەر خەلقەکە.. مردنیش جۆرێکە لە خلق، ((خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ ﴿٢﴾))[٢٥٣]

هەر ئەو پەنجانەی خۆمان کە لە سکی دایکماندا بوین پێستێك هەبوو پەنجەکانی ئەبەست بەیەکەوە، کاتێ دێت وردە وردە نامێنێ مردن ڕوونەدات هەر لەو چرکەیەوە، هەموو سەعاتێك ئێمە ((٦٠)) ملیۆن خانەی خوێنمان دەمرێ، بەڵام هی نوێ دێتەوە شوێنی.. بە ملیۆنەها خانەی پێستمان ئەمرێ بەڵام دێتەوە شوێنی، مردن بەشێکە بۆ بەردەوام بوونی ژیان، حکمەتی تێدایە هەوڵ بدەین تێی بگەین.. حاڵەتی دروست بوونی چاڵەکە بۆ چاو، وە ئەو کونانە بۆ گوێ ئەمانە هەمووی نموونەن بۆ مردن هێشتا کۆرپەلەکەش دروست نەبووە، بۆیە

---

(٢٥٣) الملك / ٢.

خانەی تر دێتە شوێنی، ئەمە بەرنامەیەکی ئاڵۆز و گەورەیە.. مەگەر هەر خوای گەورە پێی بزانێ هەروەها زیندوکردنەوەشمان حکمەتەکەی لەوە کەمتر نیە، جا تکامان وایەئەو کەسانەی لەو قەیرانەدا دەژین، لەو خولگەی بێ باوەڕی و کەم باوەڕی و گومانەدا دەژین، کە ئیتر ویستی ئازادی خۆیان بەکاربهێنن بەتایبەت بۆ قورئان، اعتصامی پێ بکەن، هەوڵ بدەن لێی تێ بگەن وەڵلاهی بەختەوەری دنیاو قیامەتی مرۆڤ لەم قورئانەدایە..

وە لە کۆتاییدا داوای خێر و ڕەحمەت ئەکەم بۆ هەمووان.

## باسی بیست و حەوتەم

## چەند بوارێك لە ئیعجازی قورئان و سوننەت

**لەم باسەماندا ئەدوێین لە چەند ئیعجازێکی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).**
**یەکەمیان: سەبارەت بەو ماوە شەرعیەیە کە خوای گەورە داینـاوە بـۆ هـەموو دایکێك کە بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو شیر بدات بە کۆرپەکەی.**
**خوای گەورە ئاماژە بەوە دەکات:**

((وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ وَعَلَى ٱلۡمَوۡلُودِ لَهُۥ رِزۡقُهُنَّ وَكِسۡوَتُهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ لَا تُكَلَّفُ نَفۡسٌ إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةُۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوۡلُودٞ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦۚ وَعَلَى ٱلۡوَارِثِ مِثۡلُ ذَٰلِكَۗ فَإِنۡ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٖ مِّنۡهُمَا وَتَشَاوُرٖ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَاۗ وَإِنۡ أَرَدتُّمۡ أَن تَسۡتَرۡضِعُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا سَلَّمۡتُم مَّآ ءَاتَيۡتُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٢٣٣﴾))[٢٥٤].

---

([٢٥٤]) البقرة / ٢٣٣.

ئایا ئەو ماوە شەرعیە ئەو ((حولین کاملین)) دوو ساڵی تەواو، پاڵپشتێکی پزیشکی طبي زانستی هەیە.؟

وەڵامی ئەم پرسیارە: بەڵێ. لە چەندین سەرچاوەو دراساتی باوەڕپێکراوەوە جەخت و داکۆکی ئەکرێ لەسەر ئەوەی کە ئەبێت دایك بۆ ماوەی دوو ساڵ شیر بدات بە کۆرپەکەی. یەکێك لەوانە سەرچاوەیەکی پزیشکی منالە ((طب الأطفال)) هی پرۆفیسۆرێکی زۆر بەناوبانگە ((بۆج نێلسن)) لەم کتێبەدا ئەم پرۆفیسۆرە باسی پەیوەندی لەنێوان شیری قتوو لەلایەك و توش بوون بە نەخۆشی شەکرە لەلایەکی ترەوە، بەو واتایەی شیری قتوو علاقەیەکی ڕاستەخۆی هەیە لە دواڕۆژدا بە نەخۆشی شەکرەوە.

لە دراسەیەکی تردا لەسەر ئەو منالانە کراوە لە ((سوید و دانیمارك و نەرویج)) ئەڵێن خانەکانی ((بێتا)) دەپارێزێ، خانەکانی ((بێتا)) ئەو خانانەن کە ((ئەنسۆلین)) دروست دەکەن لەناو پەنکریاسدا، بەڵام ((لە دراسەیەکی تردا)) ئەو پرۆتینەی شیری قتووە زیان ئەگەیەنێ بەو خانانە بەڵکو ئەو پرۆتینە صناعیە فاکتەرێکە بۆ تووش بوون بە نەخۆشی شەکرە لە دواڕۆژدا بۆ ئەو منالە شان بەشانی فاکتەرە ((وراثی))یەکە دەوەستێت.

لە دراسەیەکی تردا دکتۆر ((مجاهد محمد أبو المجد)) کە پسپۆڕە لە نەخۆشییەکانی شەکرە لە کۆلیژی ((المنصورە)) لە مصر، سەرۆکی تیمێکی زانستی بوو لە ساڵی ((١٩٩٥)) بۆی دەرکەوت ئەو منالانەی کە شیری دایکیان ناخۆن بەڵکو شیری قتوو ئەخۆن لە سیرەمی خوێنیاندا ئەنتیبۆدی هەیە بەرامبەر ئەو پرۆتینە حەیوانیە بەڵام ئەو منالانەی کە شیری دایکیان ئەخۆن ئەو ((ئەنتیبۆدی))یەیان نییە، لەهەمان کاتیشدا کە دوو ساڵ تەواو ئەکەن، بەردەوام ئەبن لە سەر ئەو شیری قوتووە ئەو ئەنتیبۆدییە نامێنێت. ئێستا پرسیارێ بکەین بۆچی

نامێنێت..؟ بۆچی شیری قوتو زەرەر ئەدات لە منال، لەپێش ئەوەی دوو سالّ تەواو بکات، بەلاّم دوای دووساڵەکە سودی لێ وەرئەگرێت؟ ئەمە پرسیارێکی زۆر گرنگە.. چەندین دراسات هەیەلەسەر ئەم بابەتە وە بلاّوکراونەتەوەلەسەرچاوە باوەرپێکراوەکانەوە بۆ نموونە: گۆڤاری ئۆتۆ ئینیۆمیتی(دراسەتێکی ئیرلەندییە) تیایە لە (ژمارە٣)ساڵی ٩٤ لەم دراسەتا ئەوە ئەسەلمێنێ کەدیواری ناوەوەی ریخۆڵە ناتوانێت ئەو پرۆتینە حەیوانییە بشکێنێت، گۆڤاری (الاعجازالعلمی) ژمارە (٤) وێنەی ریخۆڵەی منالەکەشی بلاّوکردووەتەوە، ئەبینیت ئەو پرۆتینە حەیوانییە لەناو ریخۆڵەکەدا هەلّئەمژێ‌وئەرواتەناو خوێنەوە بەبێئەوەی بشکێنرێت بەبێ ئەوەی ببێتە(ئەمینۆئەسید).

بەلاّم دوای ئەوەی ئەومنالّە ئەگاتە(٢) سالّ لەدراسەتێکی تردا لە(٩٢)کراوە (لۆکەس لانسێد) سەرچاوەیەکی باوەرپێ کراوەئەلێ:- ئەوئەنزیمانەی کەلەریخۆڵەکەداهەن، وەدیواری ریخۆلەکەومیکانیزمی ریخۆڵەکەوە حەرەکەتی دینامیکییەکی هەرس کردن‌وهەلّمژین ئەکەوێتەگەر بەشێوەیەکی تەواو پاش ئەوەی‌منالّ دووسالّ تەواوئەکات.واتەپاش ئەوەی منالّەکە دووسالّ تەواوئەکات هەچ شیرێکی قوتوبخوادەشکێنرێت وەپاشان بەشێوەیەکی سەپێنراو( ئەمینۆئەسید) دەچێتە ئامرازی لفاوی‌و هەزم دەکرێ‌و دەرواتە ناوخانەکانەوەبەشێوازێك کە(ئەنتی بۆدی)بۆدروست نابێت،بەم جۆرەبۆمان دەرکەوت..طبیعی دراساتەکان زۆرن کەعلاقەیەکی راستەوخۆ دەسەلمێنن لەنێوان شیری قوتوو وەتوش بونی ئەو منالّە بەشەکرەلەدوارۆژدا. هەتاشیری قوتوونەخوات، شیری دایك بخوات دوورترە لەنەخۆشی شەکرە، بەم جۆرەحکمەتی(حولین کاملین)بۆمان دەرکەوت کەنەبێ دوودانەسالّی تەواو ئەومنالّە شیری دایك بخوات،جگەلەوەش کە لەکۆباسی تردا باسمانکردووەکەچەند جۆرە ڤیتامینات‌و (مضاد)ی حەیەوی هەیە لەوشیری

دایکەو وەپلەی گەرمیەکەی ئەگونجێ لەگەڵ لەشی ئەومناڵەوچەندین حکمەتی تری تیاهەیە.خوای گەورە لەقورئاندا ئەفەرمووێ :

(سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾)[٢٥٥]..

شیرخواردنەوە زۆر بەنرخە پاش ئەوەی ئەومناڵە دووساڵ تەواو ئەکات هەتا ئەمرێ شیر سوودی هەیە بۆی..پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەچ جۆرە خواردنێکی بخواردبایە ئەیفەرموو(اللهم بارك لنافيما رزقتناوارزقناخيرامنه)[٢٥٦] واتە: خوایە بەرەکەت بخەیتە خۆراکەکەمانەوەو لەوەش باشترمان پێ ببەخشە، بەلآم ئەگەر شیری بخواردایەتەوە (ﷺ)ئەیفەرموو: خوایە بەرکەت بخەیتەئەم شیرەوەوبۆمان زیادکەیت، نەیئەفەرموو: لەمەباشترمان پێ ببەخشی چونکە لەشیرباشترنیە دەیفەرموو (... وارزقنا منه) لەکاتێکدا ئەوجۆرە ستایشە بۆ گۆشت نەهاتووە، بۆ نمونە: جارێکیان باسمان کرد لەفەرەنسا هۆرمۆنی (ئەستڕۆجین)یان ئەدا لەگوێرەکەی نێر وەگۆشتەکەیان ئەناردبۆدەرەوەی فەرەنسالای‌خۆیان قەدەغەبوو، ئەوگوێرەکەنێرەیەی کەئەو هۆرمۆنی مێینەیەی لێدراوە. کێش زیائەکا، وەبزێویشی کەم ئەبێتەوە دوایی دەرکەوت لەمصر ئەومنالآنەی کەلەوجۆرە گۆشتەیان زۆرخواردووە، منالی کوڕ (نێرینە) سنگیان دەرپەڕیوەو موویان دواکەوتووە، دەنگیان ناسك ئەبێت وەپاشان چەندین جۆرلەنەخۆشیەکانی

---

([٢٥٥]) فصلت / ٥٣.

([٢٥٦]) بە مەتنی کەمێك جیاواز هاتووە لە الترمذي / ٥ / ٥٠٦ و ٢ / ١٥٨.

شێرپەنجە(سرطان) دروست ئـەبێ چونكە ئەوجۆرەهۆرمۆنانەبەكولآنـدنو لێنـان نافەوتێن.

ئەمرۆجۆرەنەخۆشییەكی تـر پەیدابووە كـەپێی ئـەووترێت(C.G.D)كـە (جنـون البقر)ی پێ ئەڵێن واتە: (شێتی مانگا)ئەمەش ڤایرۆسێكی نوێیە زیاترینی لەئاڵفی ئەومانگایـــەدا هەیـــە، چـــونكە ئاڵفەكەزۆرپیـــسە ئێـــسكی هـــارپراوەی تیایـــە.. ئەدرێبەمانگا بۆئەوەی زووقەڵەوبێت.

ئەوجۆرەنەخۆشیانەڕوونوئاشكران لەووڵاتەكانی ئەوروپادا، جارێكیان باسمانكرد كـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ئەوئاژەڵانـەی كەگـەڕۆكن، ئەومەڕومانگایانـە، گۆشتوشـیرەكەیان مـەخۆن، تـاومكو ماومیـەك(حـبس)ئـەكرێن ئەوخواردنـەی ئەگۆڕدرێو خواردنێكی خاوێن ومرئەگرێو ناوسكی پاك ئەبێتەوەوخانەكانی پـاك ئەبنـەوەو ئـەو گۆشـتەی پـاك ئەبێتـەوە ئینجا جائیزەبخورێت.. (نهـی رسـول الله (ﷺ) عن یا أكل الجلالة أوشرب ألبانها أوكما قال..)[٢٥٧].

★ لـەكتێبی (بحـوث مقارنـة بـین العلـم الحـدیث والكتـاب والـسنة) هـی د.دلاوەر محمدصـابر لەلاپـەڕە ١٦٧دا باسـی توێژینەوەیـەك ئـەكات كەلەیابانـدا كـراوە، ئیعجـازێكی پێغەمبـەری تیایـە (ﷺ) خۆیباسـی گۆشـتی مانگائـەكات. كەگۆشـتی مانگا كاریكردۆتە سەرجۆرەبەكتریایەك (سالۆنیلا لەتایفـەی مۆنیـەت)ئـەم جـۆرە بەكتریایـە (D.N.A)كـەی گـۆڕاوە واتـە: دووچـاری (طفـرة وراثیـة) بـووە واتـە: (بـازی بۆمـاوەیی بـووە) لەئـەنجامی خـواردنی ئەوگۆشـتەدا، هـەمان شت ڕوئـەدات بەنـسبەت مرۆڤـەوە، ڕوونـە كـە(D.N.A)ئەوشـریتە بۆماوەییەیـە لەنێومرۆڤـدا كەگۆڕرا ئیتر ئەوە گەورەترین فاكتەرە بۆ تـوش بـوون بـە شێرپەنجە (سـرطان)..

---

([٢٥٧]) به مەتنی جیاواز بەلآم بەهەمان چەمك و واتا هاتووە لە سنن الترمذي / كتاب الأطعمة / ١٧٤٧، النسائي / رقم (٤٣٧١)، سنن ابی داود / رقم (٣٢٣١).

گەورەترین فاکتەرە بۆ تێکچوونی میتابولیزمی ئەو مرۆڤەوهەموو چالاکی لەشییەوە. گۆشتی گا بەو ڕێژە زۆرانە،زۆرئاسانەکەئەوکەسە توشی(طفرة وراثیة) بێت. لە (فلۆریدا) ناوەندێکی زانستی هەیە بۆ (طبی بدیل) د.احمدالقاضی ئەیبات بەڕێوە لەشاری (تامپا) پاش لێکۆڵینەوەیەکی چەندین ساڵە ئەم دکتۆرە گەیشتەئەوەی کەخۆراکی پێغەمبەری (ﷺ) بۆ دەرکەوێ کە تەنها ١٢٪ی سەرچاوەی ئاژەڵی بووە واتە: لە(١٠٠)گم خۆراکی پێغەمبەردا(ﷺ) (٨٨)گم ی ڕووەکی بووەو تەنها ١٢گم ی ئاژەڵی بووە.

★ بێینەسەرمەسەلەیەکی تر، ئیعجازێکی دیکە. سەبارەت بەحەرام کردنی گۆشتی بەراز لەگۆڤاری (الإعجاز العلمی)دا ژمارە (٤) لاپەڕەی (٢٦) چاوپێکەوتنێکە لەگەڵ (د.جون لاحین) ئەم پزیشکە لەگەورە پزیشکانی خەستەخانەی (کۆپنهاگن)ە لە پایتەختی دانیمارك ناونیشانی بابەتەکە (اکتشاف جرثومةجدیدة فی لحم الخنزیر) ئەم دکتۆرەمیکرۆبێکی نوێی دۆزیوەتەوە لەگۆشتی بەرازداسەرەڕای ئەم هەموو کوتان‌وئەم هەموو(ئەنتی بایۆتیك)ە کە ئەدرێتە بەراز، لەم ماوەیەدا زانایەك بۆی دەرکەوت ٨٠٪-٩٠٪ لەومیکرۆبانە کۆبونەتەوە لەزمانی بەرازدا.. (ئەورپاییەکان) زمانەکەی ناخۆن ڕاستەوخۆ ئەو زمانەدەچێتە قووتوکراوەکان‌و(قووتوسازییەوە) کە سەروو (١٤)ملیون بەراز ساڵانە سەردەبڕێت بۆ ئەو مەبەستە.لێرەدا کۆتایی ئەهێنین بەو ئایەت پیرۆزە کەخوای گەورە گۆشتی بەرازی تیایاحەرام کردووەو ئەفەرموێ:

(قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمًا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ

فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾)[٢٥٨].

**لەتەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان (م/برهان محمدأمین عبدالکریم) سەبارەت بە ڕاڤەی ئەم ئایەتە ئەفەرموێ: پێیان بڵێ ئەو شتانەی کەباسی دەکەن نابینن وەحیو نیگام بۆ هاتبێت کەحەرامن وهەرکەس بیان خوات مەگەر مردارەوە بوو یان خوێنێکی ڕژێنراو یان گۆشتی بەراز، ئەوانە هەموی پیس وناپاکن.**

---

(٢٥٨) الأنعام / ١٤٥.

## باسی بیست‌و هەشتەم

## ئیعجازی قورئانی پیرۆز لە بواری زمان و ڕەوانبێژیدا

بەردەوام ئەبین لەئیعجازی قورئانی پیرۆز.. باسمان کرد ووتمان چەندین جۆر ئیعجاز هەیەلەقورئاندا، حکمەت لەمەدایە کە بگونجێ لەگەڵ ڕۆشنبیری‌وعەقڵ و دەروونی هەموو مرۆڤێکداچونکە ئەم قورئانە بۆ هەموو کەسێك هاتووە.

وە ووتمان ئیعجازی زمانەوانی تیایە، ئیعجازی مێژوویی‌تیایە، ئیعجازی تیایە لەهەموو بوارێکی زانستەوە، ئیعجازی تیایە لەیاساو تەشریعاتدا، ئیعجازی غەیبی تیایە.بەلآم...؟

نابێت بڵێین قورئان کتێبێکی مێژووییە، یان کتێبێکی پزیشکیە، یان کتێبێکی غەیبیە. نەخێر قورئان کتێبێکی خوایە بۆ هدایەتی ئینسان بۆ ناسینی خوای وەپاشان بۆ پەیوەندی‌کردن لەگەڵ خوای گەورەدا لەڕۆشنایی ئەو قورئانەوە. ئێمە باوەڕمان وایە وەك (ئەهلی سوننەت) کەلە زاتی قورئاندا هدایەت هەیە (لەزاتی قورئاندا) مژدە هەیە، لەزاتی قورئاندا هۆکاری شیفاو ڕەحمەت هەیە، بەپێچەوانەی بۆچوونی معتزلە.

بۆ نمونە قورئان ئەفەرموێ:

(وَهَـٰذَا كِتَـٰبٌ أَنزَلۡنَـٰهُ مُبَارَكٌ ﴿٩٢﴾)[٢٥٩] (وَهَـٰذَا ذِكۡرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلۡنَـٰهُ ﴿٥٠﴾)[٢٦٠]

---

([٢٥٩]) الأنعام / ٩٢.

**لەخودی خۆیدا پیرۆزە.. لەشوێنێکی تردا**

(إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾)[٢٦١]

**واتە: هۆکاری شیفای تیایە، هۆکاری رەحمەتی تیایە**

(وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾)[٢٦٢]

**کەواتە شفاو ڕەحمەت لەخودی قورئانەکەدایە، بۆیە زاناکان ئەفەرموون (المتعبد بتلاوتە) هەرکاتێ مرۆڤ قورئانی خوێندەوە ئەچێتە عبادەتەوە، جا تێنەگەیشتن لە ووشەکانی قورئان مرۆڤ بێبەش ئەکات لەو ئیعجازە بەیانیە، لەو ئیعجازە زمانەوانیە، وەکو جارێکیان باسمان کرد قورئان کاری کردۆتە سەر دڵی هەموو بیسەرێکی عەرەب...**

**پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)عەرزی کرد ئەی محمد تۆجاربۆچی ئەدەی؟ هەوڵ بۆچی ئەدەیت.؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوەڵامدا فەرمووی:(أدعو الى شهادة أن لا إلـه إلاّ الله وأن محمداً رسول الله) فەرمووی: جارِی ئەوە ئەدەم کە (لااله إلاّ الله محمد رسول الله) بچێتە دڵی خەڵکییەوە.کابرای دەشتەکی وتی(اذاً اتقاتلك العرب والعجم) کەواتە هەموو دنیا ئەجەنگێت لەگەڵت.**

---

(٢٦٠) الأنبياء / ٥٠.

(٢٦١) الاسراء / ٩.

(٢٦٢) الاسراء / ٨٢.

.بۆچی وای ووت ؟ چونکە لەزمانەکە تێ ئەگات (لااله الاالله محمد رسول الله) مانای سەندنەوەی (حاکمیەتی مرۆڤ) بۆ مرۆڤ وەگێڕانەوەی بۆ بەدیهێنەری مرۆڤئەمەش سەرکردەکانی عەرەبوعەجەم. ئەوانەی کەدەستەلاتیان بەدەستە قبوڵی ناکەن لەبەرئەوە هەموو دنیا دێت بەگژیدا. ئەوها عەرەب لەقورئان تێئەگەیشتن.

ئیعجازی زانستی لەلای ئەوان شاراوەبوو، ئەمرۆ ئێمە ئەڵێین (٩٠٠)ئایەت هەیە سەبارەت بە ئیعجازی زانستی.. ئەوان ئیعجازە رەوانبێژیە کە کەکاری تێ ئەکردن، ئەمرۆ کەم بۆتەوەو جۆری تر پەیدابووە، چونکە عەجایبی قورئان لەبن نایەت وەك لەحەدیثا هاتووە(... لاتنقضي عجائبه)[٢٦٣].

اصمعی / زمانەوانێکی زۆرشارەزابوو زۆرپسپۆڕبوو لەزمانی عەرەبیدا دەرسی بەقوتابیەکانی خۆی دەوت، لەمزگەوتدا. وەك ئەزانین کە مزگەوت شوێنێکی کراوەیە خەڵکی غەریبەش دێن لەمزگەت دائەنیشن و گوێ دەگرن،..

لەدەرسەکەیدا کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی نوێژەکەی تەواوکردوو لەوێدا دانیشت تاشتێك فێربێت، شتێك ببیستێ.

(ئەصمەعی) وتاری دەدا بۆقوتابیەکانی:

(والسارق والسارقة فاقطعوا أيديهما جزاءاً بما كسبا نكالاً من الله والله غفوررحيم)

کابرای دەشتەکی وتی (كلام من هذا)؟

ئەمە ووتەی کێیە..؟ أصمعی فەرمووی (كلام رب العالمين).. وتەی خوایە، وتی: ئەمە هیچ قسەی خوا نیە!! ئیتر تەلەبەکان ئاوڕیان لێ دایەوەو زۆریان پێ ناخۆش بوو کەوا ئەم کابرایە خەریکە کفرئەکات وتیان ئایا تۆزانایت .. قوتابیت؟ ووتی:

---

([٢٦٣]) بەم وتنە (ولا تنقضي لاتفني عجائبه) لە (فضائل القرآن) ٢٥/١ رواه الدرامي هاتووە ، (في ثواب القرآن) / ١٤ / رواه الترمذي هاتووە.



نەقوتابیم و نە زانام.! قورئانت لەبەرە.؟ نەخێر. ئایا ئەم ئایەتەت لەبەرە؟ نەخێر! ئەی چۆن لەخۆتەوە ئەڵێی ئەوەهی خوانیە.؟

ووتی: قەت خواشتی واناڵێ ئەم ئایەتە غەڵەتە.

ووتیان: ئەی ئەو قورئانەت چاولێیە لەمزگەوتەکەدا؟ ووتی: بەڵێ.

ئەمانە قورئانن؟ وتی بەڵێ ئایەتی(٣٨)سورەتی (المائدە) خوێندیانەوە بۆ ئەوەی باوەڕبکات کەئەمە قورئانە.

(وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾)[٣٦٤].

ووتی: ئەمەتەواوە ئەمەقسەی خوایە (اصمعی) یەکەم جار کەخوێندبوویەوە لەکۆتاییدا ووتبوی(غفور رحیم) بەلأم خوا (عزیزحکیم)ە..

ووتیان چۆن زانیت؟

خۆتۆ خوێندەوارنیت و قورئانت لەبەرنییە؟ وتی: ئەمە باسی غیرەتی خوا ئەکات، باسی عزەتی شەرعی خوا ئەکات، کەدەست بڕینی دزە، ئەو دزەی کە دەست درێژی ئەکاتە سەرسەروەتو سامانی خەڵکی، ئەم شەرعە عزەتی خۆی پیشان ئەدات، کە دەست بڕینی ئەو دزیە، وەلەهەمان کاتیشدا حکمەتی تیایە بۆ ئەوەی نەفس نزمەکان بترسن وئەو دزینە دوبارە نەبێتەوە لەناو کۆمەڵگادا.

هەڵوێستەکە هەڵوێستی (عزەتوحکمەتە) کۆتاییەکەشی (عزیزحکیم)ئەمە زۆر تەواوە، بەلأم تۆ بەمن ئەڵێی (غفور رحیم) ئەمە ناگونجێ.

(اصمعی) ووتی: ئێمە عەرەبی نازانین ئەم پیاوەئەیزانێ.

---

([٣٦٤]) المائدة / ٣٨.

وەك (مالك بن نبی) ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەڵێ: (حاسە الشم الاجتماعیە) هەربەبۆن ئەو پیاوە هەستی کرد کە ئەو ئایەتە تەواو نییە. بەڵام ئەمڕۆ بێگومان دورکەوتوونەتەوە لەو سەرچاوەیە بۆیە لە ئیعجازە ڕەوانبێژیەکە بێ بەش ئەبن.

تێبینی بکەن: جارێکیان هەندێ ئایەت لەسورەتی (المؤمنون) دابەزی کەباسی قۆناغەکانی دروست بوونی مرۆڤ ئەکات، کۆرپەلە لەسکی دایکیدا

(وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلۡنَٰهُ نُطۡفَةٗ فِي قَرَارٖ مَّكِينٖ ﴿١٣﴾)(٢٦٥)

ئاوا ئایەتەکان دابەزینە سەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش بەزمانی موبارەکی ئەیفەرموومو وە نووسەرەکانی وەحی ئەیان نووسییەوە یەکێکیان لەو ئامادەبووانە(معازی کوری جبل) بوو کاتێ رسول الله (ﷺ) گەیشتەئەو ئایەتە (ثم انشأناه خلقنا آخر) دوای ئەم هەموو قۆناغانە ئەبێتە مرۆڤ. ئەو قۆناغانەی کە زانست پێی گەیشتووەو هیچ جیاوازیەك نییە لەگەڵ وەصف و بەیانی قورئان دا. کاتێ کە ئەگاتە ئەو ئایەتە (معاذ) ئەڵێ (فتبارك الله احسن الخالقین) عەزەمەت و گەورەیی بۆ ئەو خوایە کەباشترین خالقە، چاکترین خالقە، چاکترین ئەندازەگیرە. دوای کەمێك رسول الله، تەماشای ئەکات و زەردەخەنەیەك ئەیگرێ. معاذ ئەڵێ: بۆچی یا رسول الله پێ ئەکەنیت..؟ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: (بها ختمت)! خواش وائەفەرموێت (فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾)(٢٦٦)

---

(٢٦٥) المؤمنون / ١٣.

(٢٦٦) المؤمنون / ١٤.

ئێستا بابێین گەشتێ بکەین بەهەندێ ووشەدا، بێگومان زۆربەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ئیعجازێکی رەوانبێژی تێدایە، ئیعجازێکی بەیانی تێدایەکە لەسەرووی دەسەلاتی بەشەرەوەیە.

بۆنمونە دوو فەرمانمان هەیە ((رأیت)) و (رأی) هەردووکیان بەکارهاتوون لە وەصفی خەوێکدا لەسورەتی (یوسف)دا کە خوای گەورە ئەفەرموێ:

(يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ ۝٤)[٢٦٧]

یوسف (علیه السلام) ئەوخەونەی بۆ باوکی ئەگێڕێتەوە ئەڵێ باوکە: لەخەومدا یانزە هەسارەو خۆرو مانگ سوجدەیان بۆبردم؟ باوکیشی فەرمووی: ئەمە بۆ براکانت باس مەکە. ئەم مژدەیە دوای (چل)ساڵ هاتەدی کەباوکودایکی یان باوکوپوریو.. لەگەڵ یانزە(براکەی) هاتنەکۆشکەکەیو قەدرو ڕێزیان پیشان داو خەوەکەی هاتەدی. فەرمانەکە لێرەداچییە؟ (رایت) (بینیم) لەخەودابینیم کەهەسارەوخۆرومانگ سوجدەم بۆ ئەبەن.بەلام کە باسی خەوەکەی حەزرەتی ئیبراهیم ئەکات کەخوای گەورە ئەمری پێ ئەکات کە ئیسماعیلی کوڕی سەر ببڕێ

(قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ)[٢٦٨]

کوڕی خۆشەویستم.. کوڕی شیرینم. من لەخەودا دەبینم بەبەردەوامی (نەك بینیم کەوا سەرت ئەبرم).. جاچی ئەڵێی؟؟ بۆچی لەخەوەکەی یوسفدا خوای گەورە ئەفەرموێ (رایت) بەلام لێرەدا ئەفەرموێ(أری)..

---

([٢٦٧]) یوسف / ٤.

([٢٦٨]) الصافات / ١٠٢.



هـەردوکی خـەوە ئـەمیان لەلایـەن یوسـفەوە کەدەبێتـە پێغەمبـەر بـۆ بـاوکی دەگێڕینەوە کە پێغەمبەرە. ئەویشیان لەئیبراهیمەوە بۆ کوڕەکەی دەگێڕێتەوە کە دەبێتە پێغەمبەر. بۆچی لەویا ڕابـردووەو لێرەدا بەبـەردەوام...؟ بزانـە قورئـان چەند وورده: ئەوەی یوسف مژدانەیە پێویستی بە دووبارە بوونەوە نییە. دوای چل ساڵ هاتەدی بەڵام ئەوەی ابراهیم ئەمرە ئەبێت جێبەجێی بکات بریتییە لەسـەر برینـی کوڕەکـەی، ئـەوکوڕەی کـە لـەدوای ئـەم هـەموو نـزاو پاڕانەوەیـە لەتەمـەنی (١٢٠)سـاڵ خـوای گـەورە ئـەم کـوڕەی پـێ بەخـشی کوڕەکـەش گەیشتۆتە(٢٠) ساڵ.. نووری پێغەمبەرایەتی لەنێوچاوانیدایە. سەرەڕای ئەویش بێ تاوانە چۆن بەیەك (خەوبینین) بچێت جێبەجێی بکات؟ لەبەر ئەوەپێویستی بەچەندخەوێکە پێویستی بەچەند جارێکە جبرائیل بچێتە خەوی ئەم ئەمرە وای لێ بکات دڵنیاییەکی بۆ دروست بکات ئینجا بچێت جێ بەجێی بکات بزانە چەند وورده قورئان..

* بابێنە سەردوو ووشەی تر. (افرغ) ەمان هەیە لەگەڵ (صب) ئەمڕۆلە عەرەبی ئاسایی بەغاییدا هەردووکی وەك یەك بەکاردێت ئەڵێ: (فرغ لی چای) یاخود (صُب لی مای) (فرغ) و (صب) واتە: تێ کردن، بەیەك مانابەکاردێت.کە ئەچێتە ناو قورئانەوە. .

ئەبینی (افرغ) تێکردنێکی نەرمونیانە، خوای گەورە بەکاری دێنێ بۆ ئیماندااران (رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا ﴿١٢٦﴾)[٢٦٩]

---

([٢٦٩]) الاعراف / ١٢٦.

خوایە خۆگرییەك بكەیتە ناو دڵمانەوە كە بتوانین ئارامگربین لەجهادداو لەدژایەتی بێ باوەڕاندا. بەڵام(صب) تێكردنێكی توندوتیژە، ڕۆكردنە، ڕشتنە، بۆ بێباوەڕان بەكاردێت

(فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ )[٢٧٠]

بزانە چەند ووردە.

*بێینە سەر دوو ووشەی تر. لەعەربیدا یاسایەكمان هەیە ( زیادە المبنی تدل علی زیادە المعنی) واتە: (هەج ووشەیەك كەپیتەكانی زۆر تربوو مەعناكەی بەهێزترە).

قورئان ئەفەرموێ: كەباسی ئەو دیوارەئەكات كە (ذو القرنین) دروستی كرد بۆپاراستنی میللەتێكی بێ دەستەڵاتی بچكۆلەی باوەڕدار كە بیان پارێزێ لە (یأجوج مأجوج). ئەو دیوارە بەرزەی بۆ دروست كردن قورقوشمی تواوەی تێ كرد بەپاڵپشتی عەمەلی جەماوەر و سوپاكەی خۆیو چوون تاقیكەنەوە.

(فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبًا ﴿٩٧﴾ )[٢٧١]

بۆ سەركەوتنی شاخەكە (اسطاعوا)ی بەكارهێنا، بۆ هەوڵدان بۆكون كردنی شاخەكە (استطاعوا)ی بەكارهێنا.

ئایا سەركەوتن بەسەر شاخێكدا یان سەركەوتن بەسەر دیوارێكدا نارەحەترە؟ یان كون كردنی شاخێك یان دیوارێك كەناوكارەكەی لە قورقوشمی تواوەبێت؟؟ بێ

---

([٢٧٠]) الفجر / ١٣.

([٢٧١]) الكهف / ٩٧.

گومان کون کردنی ناڕەحەت ترە. ئەبینی ووشەیەکی گەورەتری بەکارهێناوە بۆ کون کردن (استطاعوا)ی بەکارهێناوە.

لەئایەتێکی تردا ئەفەرموێ (وليطوفوا بالبيت العتيق) ئەگەر بیفەرمووایە:

(وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ﴿٢٩﴾)[٢٧٢]

هیچ هەڵەی تیانییە. (باحاجییەکان تەواف بکەن بەدەوری بەیتا)بەلاّم لەبەرئەوەی کە تەوافەکە زۆرەو حەوت جارە ووشەیەکی بەکارهێنا کە پیتەکانی زۆرترە ووشەی (وليطوفوا) بەکارهێنا کە شددە لەسەر (ط) ئەکەیە.

نمونەیەکی تر خوای تعالی لەدوو شوێندا قەدەغەی کوشتنی منداڵ ئەکات لەلایەن باوکانەوە پێش و پاش بونیان. ئایەتی یەکەمیان ئەفەرموێ:

(وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡ)[٢٧٣]

لەئایەتەکەی تردا ئەفەرموێ :

(وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُهُمۡ وَإِيَّاكُمۡ ﴿٣١﴾)[٢٧٤]

ئەبینی ڕاناوەکە گۆڕاوە و پاش‌وپێش خراوە، لەئایەتی یەکەمیان ئەو ڕاناوەی کە دەگەڕێتەوە بۆ دایک‌وباوکەکە پێش خراوە، ئەوەی کە سەربە منالەکەیە دواخراوە، بەلاّم دووەمیان بەپێچەوانەوە ڕاناوی منداڵەکە پێش خراوە ڕاناوی دایک‌وباوکەکە دواخراوە..بۆ..؟ بزانە قورئان چەند ووردە.. مفسرین ڕەحمەتی

---

([٢٧٢]) الحج / ٢٩.

([٢٧٣]) الانعام / ١٥١.

([٢٧٤]) الاسراء / ٣١.

**خوايان لێبێت ئەڵێن: ووردبنەوە لەو ئایەتەی یەکەم کەلەسورەتی (الانعام)دایە ئایەتی(١٥١) گووتارەکە کەلەگەڵ کێدایە..؟**

**ئاراستەی کێ کراوە؟..**

**ئەم ئەهییە ئاراستەی دایكوباوکی هەژارکراوە، ئەو باوکە ئەڵێ من خۆم نان نییە بیخۆم چی بدەم بەومنداڵە؟**

**کەواتـــە: لێـــرەدا خەتەرییەکـــە خۆیـــەتی بەپلـــەی یەکـــەم، بەپلـــەی دووەم منداڵەکەیەتی. خوای گەورە بەپلەی یەکەم وەلاّمی خۆی ئەداتەوەو ئەفەرموێت: تۆ بەخێوئەکەم و ڕزقت ئەدەم، ئەویش مەراقی مەکە ئەویش ڕزقی خۆی هەیـە، بەلاّم. . لەئایەتی دووەمدا گوتارەکە لەگەڵ ئـەو دایكو باوکانـە کـە دەوڵەمەنـدن بـەلاّم ترسـێکیان هەیـە لـە دواڕۆژ کەکوڕەکـەیان دەرامـەتی نـەبێو نـەتوانێ ئـیش پەیدابکات، نەتوانێ پارە پەیدابکات، نـەتوانێ خانویـەکی هـەبێ.. لێـرەدا بەپلـەی یەکەم خەمی کوڕەکەیانە ئەبینێ ئایەتەکە ڕاناوی منداڵەکەی پێش خستووە(نحـن نــرزقهم و ایــاکم) خــەمی ئــەوانتان نــەبێت ئــەوان ڕزق ئــەدەین و ئێـوەش ڕزق ئەدەین).**

**دێینـــە ســـەرئیعجازێکی تـــر، عـــەرەب وەختـــی خـــۆی زۆر شـــانازیان ئـــەکرد بـــە دروشمێکـەوە (القتـل انفـی للقتـل) واتـە: کوشـتن کوشـتن نـاهێڵێ یـان کوشـتنەوە کوشتن ناهێڵێ، بەم مەتنەیان ووت (زۆر فصیحە) زۆر (بلیغە) سێ وشـەیە بوومتـە قانونێـك، ئەشـڵێن گوایـە لەفارسـەوە وەرگـیراوە، بـەلاّم ئـەم عبارەتـە عبـارەتێکی عەرەبیـە، کاتێـك قورئـان هـات و دژ بـەم یاسـایە وەسـتا. عبـارەتێکی بـەکارهێنا لەئایەتی :**

(وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِي ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾)[٢٧٥]

(القصاص حياة)ی بەکارهێنا سزادان ژیانی تیایە،ئەگەر جائیز بێت بەراوردێ بکەین لەگەڵ ئەو یاسا جاهیلیەو ئەم یاسا قورئانیە. ئەمیان سێ ووشەیە ئەویان دووانە.

خوا جل جلالە تەحەددای کردن بەو روون بێژیو رەوانبێژیە. بەزمانەکەی خۆیان، چۆن لەهەموو قورئاندا (الم ، عسق، ق، ن..) ئەمە حەرفەکانی ئێوەن، ئێوە بەم پیتانە ووشە دروست ئەکەنو رستە دروست ئەکەن و قسەی پێ ئەکەن. ئەم قورئانەش هەر ئەو پیتانەیە، دەومرن ئەگەر ئازان ئایەتێك بهێننەوە. دەستەواژەی سەردەمی نەزانیە کە (١٤) پیتە بەلام ئەوەی، قورئان (١٠) پیتە. یەکەمیان مەبەستی تیانییە، دووەمیان مەبەستی روونو ئاشکرای ژیان و مردنی ئینسانە. جاومرە سەیری ئەم کەموکورِی و نوقسانییە، (القتل أنفى القتل) کاتێ ئەگەر کوشتنەکە دەست ئەنقەست بووبێ، چۆن کوشتنەوە بنەبرِی ئەکات..؟ بەڵکو تۆڵەسەندنێکی بەردەوام دروست ئەبێ، تەنها ئەو کوشتنە نەبێ کە بەدادپەروەریو بەحەق ئەکرێ، واتە: ئەمە لێرەدا هەڵەیەکی زۆر گەورەیە بەلام لە دەستەواژەکەی قورئان دا (قصاص) هەر قەتڵ نییە بەڵکو سزایە، سزایەك بێت کەشایستەی ئەو تاوانەبێت کەکراوە پرِبەپرِی ئەو تاوانە بێت، نە زیاتر نە کەمتر. ئەمیان جاهلیەکە، تکرار بووەتەوە، قورئانیەکە تکراری نییە، ئەم قەتڵە تاوانی ترناگرێتەوە بەلام (قصاص) هەمووی ئەگرێتەوە، یەکێ پەنجەیەکی برِیبووی ئەچی ئەیکوژیتەوە..؟ ئەی دان شکاندن؟ ئەی گوێ برِین؟ ئەی لووت ئەزیەت

---

([٢٧٥]) البقرة / ١٧٩.

دان؟ئەمانە هەمووی ئەچێتە ژێر ناونیشانی قصاصەوە، جاقصاصیش لەهەمان کاتدا(سێ) ڕێگای تێدایە بۆخاوەن خوێنەکە.

١- ئەتوانی قەتڵ بەکاربێنێ. ٢- ئەتوانێ(دیە) وەرگرێ لەبری خوێنەکەی. ٣- ئەشتوانێ عەفوی بکات،.

ئیمامی زەمەخشەری(ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەگەڵ ئیمامی ڕازیوئیمامی سیوطی دا نزیکەی (٢٠-٢١) خاڵیان دەرهێناوە لەحکمەتی (القصاص الحیاه)دا کەچەندی فەرقە لەگەڵ قسەی بەشەردا..

* ئیعجازێکی ترمان هەیە: ئینسان تووشی بێزاری (ملل) نابێ لەبیستنی قورئان. یعنی کام شیعر ئەڵێی، کام پەخشان ئەڵێی کام فلیم، کام شانۆگەری، کام مۆسیقا، کەلەزەتی لێ ئەبینیو چێژی لێ ئەبینی تەنانەت ئەگەر شعرەکە خۆت نوسیبێتت، وەرە بیبیسەرەوەو چەند جارێك بیست، سی، چل، پەنجا، تاقەتت لێی ئەچێ. بەڵام لەهەموو نوێژێکدا، یەکێکم بۆ بێنە، کەسێکم بۆ بێنە(٧٠)ساڵ نوێژئەکات بزانە تووشی (ملل) بووەلەسورەتی (الفاتحە)؟؟ بێگومان توشی (ملل) نەبووە، هەروەها بۆ هەر ئایەتێك لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆز.

* بابێینە سەر ئیعجازی (مێژوویی) بێگومان پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) لەگەڵ بەنی هاشمی کەسوکاریدا دەرکران لەمەککەو خرانەشیوێکەوە. قورەیشیەکان ڕێکەوتن لەسەر نووسینی چەند خاڵێك و هەڵیان واسی لەناو ژووری کەعبەدا. ئەو عەهدوپەیمانەی کەوا ڕێکەوتن لەسەری: کەوا بنی هاشم بۆیان نییە بێنە شارەوە، بۆیان نییە کڕینو فرۆشتنیان لەگەڵدابکرێت، ژنوژن خوازی... هتد، ستەمێکی ئاوایان لێکردن وەشاربەدەریانکردن(سێ دانەساڵ) زۆر ناڕەحەت بوون، توشی بەدخۆراکی بوون، حەزرەتی خەدیجە کەیەکەم پشتیوانی پێغەمبەربوو (صلی الله علیە وسلم) بەبەدخۆراکی وەفاتی فەرمووپاشان مامی

ئەمری خوای کرد کە دووەم پشتیوان بوو بۆیە ئەو ساڵەیان ناونا (عام الحزن) (ساڵی خەفەت) ئالەو کاتەدا لە فەرموودەیەکدا هاتووە لەسیرەدا کە موسوڵمانان پێستی حەیوانیان کوڵاندووەو خواردوویانە.

لەو بارودۆخەدا هاتنەلای مامی ووتیان ئیتر بەسیەتی ئەیکەین بەسەرکردەی خۆمان چی ئەوێ بۆی ئەکەین بەلاّم واز لە(توحید) بێنێ، واز لە(لاالە الاالله)بێنێ. مامیشی داواکرای قورەیشییەکانی گەیاند بە رسوالله وتی:- کوڕی خۆم، برازای خۆم، من وەك جاران نیم بەرەو پیربوون ئەڕۆم بەرەو مردن دەی ئیتر واز لەمە بهێنە، ئەوا ئەتکەنە پاشاودەوڵەمەندت ئەکەن چیت ئەوێ بۆت ئەکەن تەنها وازلەم دینەبهێنە.

پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمووی:- مامەگیان نەك هەرشتی سەرزەوی والله خۆرومانگ بێنەدەستمەوە واز لەم دینەناهێنم، مامەگیان من بەڵگەی دنیایشم پێیە.

وتی: چیت پێیە برازاخۆشەویستەکەم؟

رسول الله صلی الله علیه وسلم فەرمووی:- مامە گیان ئەو نووسراوەی (سێ) دانە ساڵە لەناو کەعبەدا دانراوە.

فەرمووی: کەس دەرگای کەعبەی کردۆتەوە؟ ووتی: نەخێر. فەرمووی: دەبابڕۆین بیکەینەوەمن خواپێی راگەیاندووم هەموو قەباڵەکە مۆرانە خواردوویەتی تەنها ناوی خوا نەبێت. ووتی: شەرت بێت ئەگەر وەهابوو پشتت نەدەم لەعەرز هەتامردن.

ڕۆیشتن ئەبینن هەمووی (مۆرانە)خواردوویەتی تەنها (بأسمك اللهم) نەبێت.

- وەلەصحیحدا هاتووە کەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ئەفەرموێ(لما کذبتی قریش حین أسري بی) کاتێ کە خوامنی نارد بۆ قدسی پیرۆز لەوێوە

چووم بۆئاسمان قورەیشییەکان منیان بەدرۆزن زانیو لێیان پرسیم وەصفی چۆنە؟ خوای گەورە قدسی هێنایە بەرچاوم (بیت المقدس) منیش وورد وورد بۆم وەصف ئەکرد بۆیان ئەوانەی کە بینیبوویان قەناعەتیان کردوو قسەیان پێنەئەما، پاشان ووتیان: ئێمە کاروانێکمان ناردووە بۆئەوێ دەمێکە.. بینیت.. فەرمووی: بەڵێ لەئاسمانەوە بینیم.. ئەمەندە حوشترە، بارەکەیان ئەوەیە لەپێشی پێشەوە حوشترێکی بەڵەك بەڵەکە. تەنانەت وەصفی هەموو شتێکی کرد وەصفی ژمارەی زەلامەکانی کرد وەفەرمووی فلانە ڕۆژ، دەمەو ئێوارە دەگەنە وە مەککە.. بەڕاستیش ئەوەهابوو. ئەمانە بەڵگەی مێژووین. سەبارەت بە خودی پێغەمبەر (ﷺ)کە بابەتێکی سەربەخۆیە ئەگەر عمر باقی بوو ئەوا بەجیا باسی ئەکەین.

# باسی بیست‌و نۆیەم

# ئیعجازی زانستی لە میحرابی نوێژدا

لەتوێژینەوەیەکی زانستیدا دکتۆرە (سلوى محمد رشدى) ئەم دکتۆرە مصرییە هەستا بەپێشکەش کردنی لێکۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی (تأثير الصلاة على رفع الكفأة الوظيفة للقلب لدى المسلين فوق ستين سنة)ئەو نەخۆشانەی کە تەمەنیان (٦٠) ساڵ، وە نەخۆشی دڵیان هەیە، توانای دڵیان بێگومان کەمترە لە خەڵکی تر، بۆی دەرکەوت (نوێژ) کارئەکاتە ئەو توانایەو تواناکە بەرز ئەکاتەوە.
کورتەی ئەو لێکۆڵینەوەیە بەم جۆرە بوو: شەست نەخۆشی هێنا لەوانەی کەتەمەنیان سەرو(٦٠)ساڵەو وە توانای دڵیان لاوازە، ئەم شەست نەخۆشە بەژن‌و بەپیاوەوەکردنی بە دووبەشەوە، بە (٣٠) کەسیانی وت کە نوێژی عیشاو نوێژی تەراویح لەمزگەوت بکەن، (٣٠) کەسەکەی تر نوێژی عیشابکەن لەماڵەوە ئەمە لەڕەمەزاندا، بێگومان ، تخطیطی دڵی هەموویانی وەرگرتوەهەموویان نەخۆشی دڵیان هەیە توانای دڵیان لاوازەو ئیش ناکات وەك پێویست، لەکۆتای مانگی ڕەمەزاندا بۆ جاری دووەم تخطیطی دڵی بۆ کردنەوەو دەرکەوت کە ئەو (سی) کەسەی دەڕۆن بۆ مزگەوت وەتەراویحەکەش دەکەن لەوێ ئارامیەك ڕووی کردۆتە دڵیان، چاکیەك ڕووی کردۆتە دڵیان، لە تخطیطە کەدا جیاوازیان هەیە لەگەڵ ئەوانەی هەڵنەستاون بە تەراویحەکە. کەواتە لێکۆڵینەوەکە دەری خست پەیوەندیەك هەیە لەنێوان ژمارەی نوێژ لەگەڵ چاکبوونەوەی دڵدا.

* (د٠توفيق) لەزانكۆی (الاسكندريە)، لەساڵی ١٩٨٦دراسـەیەكی (ماجستێر)ی كـرد، چەندين خـاڵی تیـابوو تیـشك ئەخەینـە سـەر هەنـدێكی. ئـەم دكتـۆرە هەسـتا بـە پێوانەی ئەو پاڵەپەستۆی خوێنە لەسەرئەو دوو شادەمارەی هەردوو لاقی مـرۆڤ، لەكاتی وەستانداو خوێندنی (الفاتحە) پاڵەپەستۆی خوێن لەسەر دیـواری ئـەو دوو وەریدەگەورەیـە (٩٠سـم ئـاوبوو) بـە پێـوەری ئـاو نـەك جیـوە، لـەكاتی (ڕكوعـدا) دەبێـە (٤٩) و لەكاتی ( سمع الله لمن حمده) دەبێتە (٨٦) ئەمە پاڵەپەستۆی خوێنـە لەسـەر دیـواری ئـەو خـوێن هێنەرانـە. لەسـوجدەی یەكەمـدا ئەبێتـە (٣) لەدانیشتەكەدا، (ئەودانیشتنەی كە بەداخـەوە زۆر كـەس نوێـژی بـەتاڵ ئەبێتـەوە، چونكە لەهـەموو مەزهەبێكـدا ئەمـە ڕوكنـەو مەرجـە لـەش لـە حركـەت بكـەوێ (الجلسە بين السجدتين) روكنە خويـشی( ابـن القـيم) ئامـاژەی بـەوەكردوە كـە زۆر كـەس نوێـژی بـەتاڵ ئەبێتەوەكـەوا لەشی لەحەرەكـەت ناكـەوێت، ئەگـەر سـەرنج بدەین لەسونەتی پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم) چەندی پێ چووە لە سوجدەدا كە ئەوەندەشی پێ چووە لە نێوانی هـەردوو سوجدەكەدا، ئـەحادیثمـان هەیـە كـە چەندین دوعای فەرمووە لەو دانیشتنەدا لەو مەسـافەیەدا(رب أغفـر لـی وارحمـنی وأهدنی وأجبرنی و ارزقنی و عافنی و رافعنی وأعفو عـنی) ئەمانـەی فـەرموو هـیچ نـەبێ، هـیچ نـەبێ ئێمـە ئەوەنـدە فریاكـەوین جارێـك بڵـێین (رب اغفرلـی، رب اغفرلی). لە دانیشتنەكەدا(ضغط) لەسەر ئەو دووشادەمارە دەبێتـە (١٦) چـون بـۆ سـوجدەی دووەم(ضـغط) ئەبێتـە(١) واتـە: نزیكـەی (سـفر) لەوەسـتاندنەكەدا(٩٣) لەسوجدەی دووەمـدا ئەبێتە(١) سبحان الله نوێژ چ پشوویەك ئەدات بـەلاقی مـرۆڤ چەند ماندوبێت پشووی پێ ئەدات، چونكە لـەكاتی سـوجدەدا ئـەو كێـشی مرۆڤـە دابەش ئەبێ بەسەر (ناوچەوانیو لوتیو هەردوو لـەپی دەستـیو هـەردوو كڵاوەی ئەژنۆی لەگەڵ پەنجەكانی قاچیدا).

پاڵەپەستۆ نامێنێ لەسەریان، لە ڕکوعدا ئەگەر دیقەت بدەین ماسولکەی بڕبڕەی پشت گرژدەبێتەوە، وەلاقی مرۆڤ بەتایبەت ناوچەی ڕانی ئەکشێت، ئەمە ڕێگری لە نەخۆشی (دەوالی)ئەکات، ئەگەر بەڕێکوپێکی موسڵمان نوێژ بکات ئەوقەدی لەشەی گۆشەی (٩٠) پلە بێت لەگەڵ ڕانیدا لەو حاڵەتا ئەو ماسولکانە هەموو ڕائەکێشرێن ئەو نوێژکەرە دووچاری نەخۆشی، دەوالی نابێت کە ئێستا تیشکێکی ئەخەینە سەر.

لەحاڵەتی ڕکوعەکەدا ئەو ماسولکەی لە (سکا) هەیە پێی ئەوترێت (العضلة المربعة البطنية) فشارێك ئەخاتە سەر دەمارەکانی ناوسك، لەهەمان کاتدا هەردوو صەمامی خوێن هێنەرەکان دائەخرێن (واتە خوێن ناچێ بۆلاقەکان) تەنها بە پاڵەپەستۆیەکی بەهێزەوە ئەو خوێنە دەگەڕێتەوە بۆ دڵ، لەسوجدەشدا (خولی خوێن) لەگەڵ هێزی ڕاکێشانی زەویدایە، زۆر بەئاسانی خوێن ئەچێتە دڵەوە، چونکە لەشەکە لەحاڵەتی سوجدەدایە، سەر لەسەر ئەزرە، زۆر بەئاسانی خوێن دەگەڕێتەوە بۆ دڵ وە زۆر ئاسانی خوێن لەدڵەوە دێتە دەرێ. مەسەلەی نەخۆشی (دەوالی): کەرەستەیەك هەیەگرنگترین پێکهاتەی دیواری خوێن هێنەرەکەیە پێی دەوترێت (هایدرۆکسی پۆلیین) ئەومادەیە ئەگەر کەم بویەوە دیواری دەمارەکەدا ئەو دەمارە ئیتر تێك ئەچێت، ئەو دەمارە توانای هەڵگرتنی فشاری هەیە، ئێستا با بزانین نەخۆشی (دەوالی) کامەیە؟!

ئەم نەخۆشییە ئەگەر موسوڵمان بە ڕێکوپێکی نوێژەکانی بکات دوچاری نابێت. بەڵام هەندێ کەس ڕکوعەکەی تەواونییە، وەستانەکەی تەواونییە دوچاری دەوالی ئەبێت. لەدراسەی ئەم دکتۆرەدا هەستا بەپێواندنی ئەو مادەیە کەپێی ئەووترێت (هایدرۆکسی پۆلین) لەدیواری خوێن هێنەرەکانی لاقدا لە(٢٠) نەخۆشدا کە دووچاری ئەم نەخۆشییە بوبن(دوالی الساقين) دەرکەوت هەندێکیان ڕێژەکەی

بریتییــه لــە(١٦) وە هەنــدێکیان(٢٦) ئەمــەش بــە (مــایکرۆگرام) ئــەپێورێت. نەمەنەگەڕێتەوە بۆ ئەو نیمچە رکوعەی کەئەیکا، ئەگینا بەڕێکی بیکات توشی ئەم دەردە نابێت، لەدراسەیەکی تریا. گەرا بەدوای (هیدرۆکسی پۆلێن) لەو کەسانەی کەساغن کە نەخۆشی(دوالی)یان نییە، دەرکەوت لەهەندێ کەسدا کەنوێژ ئەکات(٨٠)یە کەنوێژناکات (٦٣)یە، تەنها (گۆڕەر) لەوێدا بریتییە لەنوێژکردن، ئەو ماسولکانە ڕائەکێشێ نایەڵێ ئەو نوێژ خوێنەتووشی دەوالی ببێت.

بێینەسەر لێکۆڵینەوەیەکی تر، هۆڕمۆنێك هەیە لەمرۆڤدا ئەو ڕێژنانە دەرئەکات کە لە گورچیلەوە سەرئەکەن، ئەو هۆڕمۆنە پێی ئەووترێت (ئەدری نالین) ئەم (هۆرمۆنــە) چالاکییەك ئــەدات بــەدڵ، لەحاڵــەتی ئیــشکردندا دروســت ئــەبێ، لەحاڵەتی وتوێژی توندو هەڵچوون و هەواڵی ناخۆش‌و دیمەنی ناشرین‌و توڕبوون دروست ئەبێ. ئەم هۆڕمۆنە چالاکییەك ئەدات بەدڵ وەلەئەنجامی ئەو دەردراوانە، تریەی دڵ زیاد ئەبێت، شەکرە بەرز ئەبێتەوەو پاڵەپەستۆ بەرز ئەبێتەوە، لەزیادبوونی ئەم هۆرمۆنەدا دەرکەوت دوو لوتکەی هەیە لەکاتی دیاری کراودا.

یــەکێکیان پــێش نوێــژی نیوەڕۆیــە، یــەکێکیان پــاش نوێــژی نیوەڕۆیــە، تاقیکردنەوەیەك کرا لەسەر (٣١) نەفسەر کە نیشان بگرنەوە، ماندویان کردن بۆماوەی (٧٥) سەعات نەیان هێشت بنوون، نەیان هێشت لەو تاقیکردنەوەیەدا هیچ جۆرە پشوویەك بدەن، شەکەت بوون بەڵام زوو زوو تخطیطی دڵیان بۆ ئەکردن، هێلکاری خوێنیان بۆ ئەگرتن. خوێنی ئەم(٣١) نەفسەرە دەرکەوت کە لوتکەی ڕژاندنی ئەدرینالین بۆناو لەشیان (لوتکەی ڕژاندنی ئەدرینالین بۆ ناو خوێن بێگومان خۆی دوو دەقیقە لەناو خوێندا ئەمێنێتەوەئیتر شانەکانی لەش هەڵی دەمژن) دووسەعات زیاتر ئەمێنێتەوە پاشان لەگەڵ دەردراودا لەگەڵ ((میز))دا ئەچێتە دەرێ. لەگەڵ ئەوەی کەئەمانە(٧٥)دانە سەعات ماندووبون

دەرکــەوت لــەنیوەی شــەودا (ئــەدرینالّین) کــەمترین بــڕ دێــو وەزۆر هەســت بەماندوی‌و هیلاکی‌و شەکەتی ئەکەن وەلەکاتی پاش نیوەڕۆدا لە سەعات(١٢،٣٠)ی نیوەڕۆ ئەدرینالّینەکە زۆر دەبێت.

لێکۆڵینــەوەی تــر هەیــە کەهــەمووی ئــەوە ئەســەلمێنێ کەئــەم هۆرمۆنــە لــەپاش نیوەڕۆوە زیاد ئەکات لەکاتی عەسردا ئەگاتە لوتکە. تێکڕای دەرپەڕینی خوێن لە دڵــەوە لەســـەعات (٣)دایـــە، ترپـــەی دڵ ئەگاتـــە ئەوپـــەری لەســـەعات(٤)دا، پاڵەپەستۆکەی دوای ئەوە بەرزئەبێتەوەئەمە لەهەموو مرۆڤێکدا وایە ئیتر ئەو مرۆڤە: ماندووە، نەخۆشە، ساغە، لە پشوودایە یان ناو ئەم دیاردەیە ڕووئەدات، وەك یەکە لەسەر هەردوو ڕەگەزەکە(ژنە) پیاوە گەنجە بەتەمەنە لەهەچ وولاتێك بێت لەو کاتی(بعد الزوال)ە دا ئەو دیاردەیە ڕووئەدات. (گب) وەلامی چییە بۆئەم دیاردەیــە؟ ئــەڵێ: ئەمــە پەیوەســتە بــە کاتــژمێرێکی نــاوخۆی مرۆڤــەوە کــەپێی ئــەوترێت: (الــساعە البایلوجیــە) بــە کاتــژمێری بــایۆلۆجی ئــەو دەردراوە دروست ئەبێ،بۆچی دروست ئەبێ؟ تائیستا زانست (علم) نازانێ بۆچی..؟

بــەلام وەك پێوانــدن بۆیــان دەرکــەوتووە: کــە ئــەو هۆرمۆنــە، زۆرتــرین کــات دێتــە خوێنەوەو ناو لەشەوە کاتی نیوەڕۆیەو ئەگاتە لوتکەکەی لە کاتی عەسردا.

قورئانی پیرۆز ئەفەرموێ:

(حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ)[٢٧٦]

واتــە: خــوای گــەورە ئــەمرمان پــێ ئــەکات کــە نوێــژەکانمان لــەکاتی خۆیــدا بکــەین بەتایبەت نوێژی ناوەڕاست کە زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کەنوێژی ناوەڕاست نوێژی (عەسرە) ئیمامی زەمەخشەری لە کشاف داو (ابن کثیر) وەها ئەفەرمووێ‌و

---

([٢٧٦]) البقرة / ٢٣٨ .

وه سيد قطب وهها ئهڵێ و غهيری ئهمانهش لهسهر ئهو ڕايهن. پشتيان بهستووه بهفهرموودهيهكی پێغهمبهری خوا(ﷺ) كه لهڕۆژی جهنگی (الاحزاب)دا فهرمووی (شغلونا عن الصلوة الوسطى،العصر ملأ الله قبورهم و بيوتهم نارأ)[٢٧٧]. واته: سهرقاڵيان كردين ئهو بێ باوهڕانه، ئهو موشريكانه له نوێژی ناوهڕاست له نوێژی عهسر، خوا قهبرو ماڵيان پڕ بكات لهئاگر.

ئهم فهرمووده ئهيسهلمێنێ كه نوێژی ناوهڕاست كهلهقورئاندا هاتووه، بريتييه له نوێژی عهسر، ئهم هۆڕمۆناتانه كهزيادئهبێ ترپهی دڵ لهلوتكهدايهو.. هتد. لهبهرئهوه خوای گهوره ئهمرمان پێ ئهكات بۆ ماوهيهك دوركهوينهوهلهدنيا، دوركهوينهوه له جهنجاڵی ژيان ڕووبكهينه خوا بانهوكاته بهسهلامهتی تێپهڕ بێت چونكه ههچ كارێكی زياده، ههچ ئيشێكی زياده، خهبهرێكی ناخۆش، ههڵچوونێكی دهروونی لهو كاتهدا هۆڕمۆنهكه زياتر ئهبێت دڵهكه بهرگهی ناگرێ.

له لێكۆڵينهوهی زانستی تردا زانای گهوره وهكو (ئلترلگام) وهك (بۆپسن) به ئاماركردن بۆيان دهركهوتووه كه نسكۆكردنی (مضاعفات)ی دڵ لهسهعات (١-٣) ڕووئهدات زياترينی وهستاندنی دڵ لهكاتی (١-٣)يه.

جائهو دراساتانه ئهسهلێمنێ كه دهردراوی (ئهدريناڵين) زۆره لهوكاتهدا لهبهر ئهوه پێويستی به پشوويهكه دور كهوێتهوه له سهرقاڵی ژيان ، خوای گهوره فهرمانمان پێ ئهكات كهلهوكاتهدا دووركهوينهوه،سهرگهرم بين بهدهست نوێژشتنهوه، ئهو دهست نوێژه پێی ئهووترێت، (جهد متوسط) ئهوه ئهو چالاكی دهسته، ئهو حهرهكهتی دهست نوێژه وورده ووردە هۆڕمۆنی (ئهدری ناڵين)هكه كهم ئهكاتهوهو ئهو جوڵانهمان ڕۆشتنێكی لهسهر خۆ بهرهو مزگهوت، چاوهڕوان كردنی نوێژ ههتا مامۆستا دێت، نوێژ كردنی جهماعهتهكه پاشان ئهو وێردوو

---

([٢٧٧]) صحيح مسلم / رقم (٤).

تەسبیحاتەی دوای نوێژ، ئەو سوننەتانە کە هەن، ئەوانە هەمووی نزیکەی نیوسەعاتێك ئەبات، ئەبینیت لەو کاتە ترسناکە تێپەڕئەبیت، نوێژ تەواوئەبێ (ئەدری ناڵینەکە) دائەبەزێت، پاشان ئەو مرۆڤە توانای رووبەرووبوونەوەی تری لا دروست ئەبێت چونکە پاڵەپەستۆکە دابەزیوەتەوەو ئەو فشارەی کەلەسەر دڵ بووە لاچووە.. ئەم دیاردەیە ڕوونەدات لەهەموو مرۆڤێکدا و لە هەموو شوێنێکداو تەنها لە دەوروبەری عەسردا، کەواتە بۆمان دەرئەکەوێت ئەم شەریعەتە پیرۆزە لەگەڵ زانستدا دەڤاودەڤن، هیچ جیاوازیەك نییە لەگەڵ لێکۆڵینەوەی فەرموودەکانی خواو پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) وەهەرچی ئەم شەریعەتە فەرموویەتی ئایا لەقورئانەوە بێت یان لەرسول الله وە بێت (ﷺ) لەبەرژەوەندی مرۆڤدایە.



## باسی سی یەم
## ئیعجازی مێژوویی لە قورئانی پیرۆزدا

جارێکیان باسمان کردو ووتمان (اعجاز) کارێکە خوا ئەیکا، (جل جلالە) لەئاسایی بەدەرە وە ئەو کارە ئەو دیاردەیە لەسەر دەستی پێغەمبەرێکی خۆی دەرئەکەوێ شێوازی (تحدی) وەرئەگرێت بۆ بەڕاست زانین وپشتگیری ئەو پێغەمبەرە لە پێناوی‌ئەوەی خەڵکی باوەڕی پێ بکەن، وەکو عەصاکەی موسا (علیە السلام)..وەکو ئەو دەستە پیرۆزەی عیسا کەئەیهێنابەسەر گوڵو کوێرو تەناتەت مردووش بەقودرەتی خوا چاك ئەبوونەوە، ئەو معجزاتانە لەئاسایی بەدەربوون لەپێناوی ئەوەی خەڵکی باوەڕ بکەن ئەمانە ڕەوانە کراوی خوان.
(محمد المصطفی) (ﷺ) خوای گەورە معجیزەیەکی هەتاهەتایی گەورەی پێدا، پێی ئەوترێت قورئانی پیرۆز کەکەلامی خوایە. بەڵام جگە لەقورئان دەیان بەڵکو سەدان معجیزاتی تر ڕویداوە لەسەر دەستی پێغەمبەردا (ﷺ) کە زیادبوونی ئاو بووە، چاك کردنەوەی نەخۆش بووە، چاك کردنەوەی کوێربووە، بەڵکو گەنجێك لە جەنگدا چاوی دەرپەڕی لە شەڕێکدا، چاوی بەدەستیەوەبوو عەرزی کرد: یارسول الله من تازە ژنم هێناوە، حەزناکەم بەم ناشرینییە بڕۆمەوە لای ژنەکەم، پێغەمبەری خوا بەزەیی پیاهاتەوە چاوەکەی لێ وەرگرتو بەدەستی مبارەکی خستییەوە چاڵی چاوی بەقدرەتی خواچاك بووە وە، دەیان معجزاتی واهەیە کەلەسەر دەستی پێغەمبەردا ڕوویداوە، هەندێکی شێوازی (تحدی)ی وەرگرتووە، هەندێکیشی شێوازی(تحدی) وەرنەگرتوە، بەڵام زانا بەڕێزەکانی ئیسلام لەبەرئەوەی ئەم کارە نائاساییانە، منافسەی قورئان ئەکەن تێکەڵ بەقورئان نەبن



ناویان ناوه، (دلائل النبوه) واته: بەڵگەو نیشانەی پێغەمبەرایەتی، بۆ ئەوەی لە معجیزەگەورەکە جیای کەنەوە، لەهەمان کاتیشدا جوان نییە بۆ پێغەمبەری خوا ئەم کارانە پێی بوترێت (کەرامات) کە بۆ (ئەولیایە) بەڵام پێغەمبەر مەقامی (پێغەمبەرێتی) هەیە بەڵکو مەقامی ٠(خاتم الانبیاء والمرسلین)ی هەیە(ﷺ).

لە قورئاندا ئەم موعجیزانە زۆر هەمەچەشنەن، ئیعجازی زمانەوانیو رەوانبێژیو مێژووی هەیە، ئیعجازی زانستی هەیە لەبوارەکانی زانستیدا لە گەردوون ناسیەوە تادەروون ناسی. ئیعجازاتی ژمارەیی تیایە، ئیعجازاتی تەشریعی تیایە بۆنمونە: ئیعجازاتی ژمارە، (مامۆستا سعید نورسی) (خوا دەرەجەی عالی کات و لێی خۆش بێت) لە سورەتی الکهف دا کەخوای گەورە باسی کۆمەڵێك لاو ئەکات کەنەیان توانی دینداری خۆیان ئەنجام بدەن لەناو کۆمەڵگایەکی فاسددا، هەڵهاتنو دورکەوتنەوە لەو کۆمەڵگایە بۆئەوەی دینیان بپارێزن چوونە ئەشکەوتێکەوە ماندووبوون خوای گەورە (٣٠٩) ساڵ خەواندنی

(أَمۡ حَسِبۡتَ أَنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡكَهۡفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُواْ مِنۡ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا)[٣٧٨]

ئەروات باسەکە تا ئەگاتە

(وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ﴿٢٥﴾)[٣٧٩]

وشەی تسعا (٣٠٩) هەمین وشەیە لەو چیرۆکەدا! ئایا ئەمە رێکەوتە...؟ ئایا محمد ئەتوانێ شتی وەها دروست کات..؟ ئەمە گەورەترین ئیعجازە کە قورئان کەلامی

---

(٣٧٨) الکهف / ٩.

(٣٧٩) الکهف / ٢٩.

خوایە. ئەفەرموێ (٣٠٩)ساڵیان پێچوو، وشەی (نۆ)کە (٣٠٩)هەمین ووشەیە لە سورەتەکەدا (سبحان الله).

جامەبەستمان لەم هەمە چەشنیە لە ئیعجازی قورئانی پیرۆز کەمرۆڤ پەیوەندی بکات بەخوای گەورەوە لەرێی کتێبەکەیەوە، لەرێی قورئانەکەی خواوە لەپێناوی ئەوەی کە مرۆڤ ئیمان دەست گیر بکات. ئیمان کۆنترۆڵی ژیانی ئینسان ئەکات. ئەو ساکە بەختەوەری دنیا و قیامەت ئەبیت، ئەمرۆ لەکتێبەکانی مفسرین‌و رۆشنبیرانی رۆژئاوادا ووشەیەك بەکار ئەهێنین پێی ئەوترێت(کووالەتی ئۆف لایف) کە بەعەرەبی (جودە الحیاە) ئەگرێتەوە، واتە: چاکی ژیان، دووکەس لە جێیەکدا ئەژین بەلاَم ئەمیان بەجۆرێك ئەژی ئەویان بەجۆرێکیتر. جۆری ژیانیان جیاوازە، جابۆچاکی ئەو ژیانە کۆمەڵێك پێوەر دانراوە وەك پێوەری زانستی لەوانە: هاوسەنگی عەقڵی‌و دەروونی ئەوکەسەیە. پلەی لێبوردنی ئەوکەسەیە پلەی بەخشینی ئەو کەسەیە، ئیرادەو ویستی خێر لەو کەسەدا، تاچ رادەیەك حەز بەزانست‌و فێربوون ئەکات، تاچ رادەیەك ئامادەیە خزمەتی خەڵکی بکات لەسەر حسابی بەرژەوەندی خۆی، بڕی ئەو بەهایانەی کەئەو مرۆڤە هەڵی گرتووە، چەند هەوڵدەدات ئەو بەهایانە پەیکەڵ بکات لەژیانیداو بلاَوی کاتەوەو بیگەیەنێت بە خەڵکی، تاچ رادەیەك گوێرایەڵی یاسایە، تا چ رادەیەك رێزی هەیە بۆ بەرامبەر، تا چ رادەیەك خۆشەویستی ئەبەخشێ بەبێ مەرج.

ئەمانە پێوەری ژیانن هەرهەموو یان سەرچاوەیەکی ژیانیان هەیە ، بەمانایەکی تر خوا ئەیەوێ مرۆڤ ژیانی چاك کات لەسەر زەویدا، بەختەوەر بێت لەسەر زەویدا، بەختەوەر بێت پاش مردنیش. کەواتە داوا کراوە لەهەموو مرۆڤێك گۆڕانکارییەك بکات لەناو خۆیدا. وەك خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێ:

(لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٞ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ١١)[٢٨٠].

خوای گەورە گۆڕانکاری ناکات لەهیچ کۆمەڵێکدا تاوەکو خۆیان دەست پێشخەری نەکەن. دوای ئەوە سەرکەوتنوقەدەر و یارمەتی خوا دێت. هەنگاوی یەکەم ئەبێ تۆبیت، بۆچی ئاوا ئەم موعجیزانە هەمەچەشنن؟ چونکە مرۆڤ هەمە چەشنەیە. هەیە هەر مێژووکاری تێ ئەکات، هەیە بوارێکی زانستی کاری تێ ئەکات، وەك: (طب) بواری نۆژداری.. هەیە زمانو داهێنانی زمان وە روون بێژیو رەوانبێژی کاری تێئەکات، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ

(وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَٰهُ بَيۡنَهُمۡ لِيَذَّكَّرُواْ فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورٗا)[٢٨١].

واتە: لەهەموو بابەتێك ئێمە شتێکمان ناردووە کەبگونجێت لەگەڵ بایەخدانی مرۆڤدا، بەڵام کەبیرێك ئەکەینەوە ئایا ئێمە ئەتوانین ئەو گۆڕانکاریە ئەنجام بدەین؟ بەچی ئەکرێت ئەم گۆڕانکاریە؟، ئەو گۆڕانکاریە بەعەقڵ ئەکرێت عەقڵمان پێ دراوە، بە ویژدان ئەکرێ ویژدانمان هەیە بەڵام ئەگەر هاتوو قفڵێکمان دا لەو عەقڵە، ئەو ویژدانەمان کەلەپچە کرد، وە ئەو هێزی داهێنانەی کەتیاماندا هەیەسڕمان کرد، وە ئەو ئیرادەو ویستە سەربەخۆو ئازادە کە تیامانا هەیە کردمان بەبەندەی دنیا بێگومان ناتوانین ئەو گۆڕانکاریە بکەین.

---

([٢٨٠]) الرعد / ١١.

([٢٨١]) الفرقان / ٥٠.

ئەمە هەمووی لەپێناوی ئەوەیە کەباوەڕ ببێتە سەرکردەی هەڵسوکەوتمان لە ژیاندا، ئەوەیە مەبەستی خوای گەورە (والله أعلم)، ئەم هەموو جۆرە موعجیزانەی لە قورئان و زاتی پێغەمبەردا، (صلی الله علیەوسلم) کۆبوونەتەوە لەپێناوی ئەوەدایە مرۆڤ پەیوەندی بکات بە خوای گەورەوە، وەخوای گەورە ئیمانی پێ ببەخشێ چونکە ئێمە پێویستمان بەئیمانە، زانست بەتەنیا سوودی نییە، ئەوەتا ئەبینین زانست بەبێ ڕەحمەت چ زەحمەت و بەڵایەکە. مرۆڤی زانا بەبێ ئیمان خۆی ئەفرۆشێ، میللەتی خۆی ئەفرۆشێ، خاکی خۆی ئەفرۆشێ، لەبەرئەوە هەموو کەسێك پێوستی بەئیمانە، پێوستی بە یەکتاپەرستییە، پێوستی بەناسینی بەرنامەو پەیامەکەی خوایە کەقورئانی پیرۆزە. لەم کۆباسەدا هەوڵ ئەدەین لە پەنجەرەی مێژووەوە سەیری قورئان بکەین و لێی رابمێنین.

کاتێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیەوسلم) ئەرکی پێغەمبەرایەتی کەوتە سەرشان وەدەستی کرد بە خوێندنەوەی قورئان بۆ قورەیشیەکان، ئەوان زۆر رەوانبێژو روونبێژبوون زۆر خزمەتی زمانەکەی خۆیانیان دەکرد. کام کەڵە شاعیرە ئەڵێی کە چامەیەك یان دووانی خوێندبێتەوە تەماشا ئەکەیت چەندین ڕەخنەی لێگیراوە لەلایەن رەخنەگران و شاعیرانی ترەوە. کاتێ کە پێغەمبەری خوا ئایەتەکانی قورئانی بۆ یەکەم جار لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا خوێندەوە هیچ جۆرە ڕەخنەیەك رووبەڕووی قورئان نەبوویەوە، تەماشائەکەن نەشیعرەو نەپەخشانە بەڵام کارئەکاتە سەر هەموو دڵێك، مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کەسێ کەس لە سەرکردەکانی قورەیش(ئەخنەسی کوڕی شورەیق و ئەبو جەهل و ئەبو سوفیان) ڕوویان نەئەهات لەبەردەمی جەماوەردا گوێ بگرن لە قورئان لەزاری پێغەمبەرەوە(صلی الله علیەوسلم) کە لەناو بەیتا ئەیخوێندەوە، بۆ ئەوەی جەماوەر چاویان لێ نەکەن، چونکە ئەمانە سەرکردەن بەشەو بەدزییەوە

ئەرۆشــتنە نزیــك مــاڵی پێغەمبــەریخوا (صــلی الله علیەوســلم) لــەکاتی شــەودا لەنوێژدا بۆ ئەوەی گوێ بیستی ئەو ئایەتانەی خوابن. لەگەڕانــەوەدا توشــی یــەکتر ئــەبوون ئــەم ئــەیوت تۆلــەکوێ بویــت، ئــەو ئــەیوت تــۆ لــەکوێ بویــت، درۆم لەگــەڵ مەکە، بۆ یـان دەرئەکـەوت کەهەرسـێکیان چووبوون بـۆ بیـستنی قورئـانی پـیرۆز لــەزاری پێغەمبــەرەوە (صــلی الله علیەوســلم)بڕیاریانــدا کــەئیتر نەچــنەوە، بــەڵام جــارێکی تــریش ئەمــە ڕووی دایــەوە بــۆ ســێهەم جــار ئــیتر ســوێنینان خــوارد بەبتەکانیان کەئیتر ئەم پەیمانە ببەنەسـەر، ئەگـەر هـاتوو یـەکێك لـە جـەماوەری سادەو ئاسایی ئەمەی بینی. ئەوساکە ئەوانیش شوێن محمـد (صـلی الله علیەوسـلم) ئەکەون لەبـەر ئـەوە وازیـان لـەوە هێنـا، ئەمـەدەلیلێکی مێژوویـیـە بـۆ گـەورەیی قورئانو کاریگەری بۆ دڵانی بێ باوەڕ

(قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا )[٢٨٢]

قورەیشیەکان پیلانی زۆریان گێڕا، یەکێك لەوانە ئەوەبوو: بۆ ئـەوەی خـەڵك گوێ بۆ پێغەمبەر نەگرێ(صلی الله علیەوسلم) (نە ضر) ناوێکیـان لـە (طـائف)ەوە هێنـا بـۆ مەککە بەتایبـەت بـۆ داسـتان بێـژیو حیکایـەت خـوانی چونکە زۆر سـەفەری کردبـوو بـۆ شـام ئێـرانو کۆشـکی پاشـاکانی بینیبـوو، لەگـەڵ پیـاوە گەورەکانـدا دانیشتبوو ئا ئەمانەی بۆخەڵکی باس ئەکرد بڕێك لەو جەماوەرەی ڕاکێشا تـا خـڕ ئەبنەوە بەدەوری پێغەمبەردا(صلی الله علیەوسلم)، پاش ماوەیـەك سەرگوزەشـتەو بەسەرهاتەکانی کۆتاییـان هـات و ئـیتر هیـچی پـێ نـەما، هـەموو خەڵکەکە دیـسان

**هاتنەوە خزمەت پێغەمبەری خوا (علیه الصلاه و السلام) ئینجا پیلانێکی تریان گێڕا کەوا ئەم قورئانە هی پیاوێکەو محمد فێرئەکات، هی محمد نییە، پیاوێکە لە(نەجد) فێری ئەکات، عەرەبەکان ئەمەیان وتووە لەکۆندا. قورئان بۆمان ئەگێڕێتەوە :**

(وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَـٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾)[٢٨٣].

**ئەوکەسەی کەئەوان ئەڵێن مامۆستای محمدە فارسە عەرەبی نازانێ ئەی چۆن ئەم عەرەبییە پاراوە ئەنووسێ؟! ئەمە قوڕی دابەدەمیاندا، لەهەمان کاتیشیدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیەوسلم) لەهەمووتەمەنیا سەفەری نەکردووە بەرەو (نەجد). بەڵکو بەرەو شوێنانی تریش سەفەری نەکردووە بەمناڵی نەبێ، یەك جار گەیشتە (بوصرا) کە لەوێ (بوحەیرا)ی راهیبی مەسیحی بینیو ئەویش نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی تیابەدی کردو ووتی خێرا بیبەنەوە بیپارێزن لەجولەکە، ئەمەنیشانەی پێغەمبەری ئاخر زەمانە.**

**ئەبو طالبی مامی خێرا بەهەڵەداوان وازی لە گەشتەکەی هێناو هێنایەوە بۆمەککە، تالەژیاندابوو بەرگری لەم برازایەی کردو خزمەتی کرد. لە گەنجیشداو لە تەمەنی (٢٢-٢٥)ساڵیدا بەپارەی خدیجە سەفەری کرد بۆشام، ئیتر ئەمە هەموو گەشتەکانی پێغەمبەر بووە(صلی الله علیەوسلم)وە قورئان بۆمان ئەگێڕێتەوە لەزمانی پێغەمبەرەوە :**

(فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾)[٢٨٤]

---

([٢٨٣]) النحل / ١٠٣.

ئەی ئەو کەسانەی کەوا دەڵێن، بیربکەنەوە من عومرێکم بەسەربردووە لە ناوتاندا (٤٠) ساڵە سەفەرێکم نەکردووە بۆهیچ شوێنێك، من(٤٠) دانە ساڵە شیعرێکم نەوتووە، وتارێکم نەداوە، ئێستا کتوپڕ ئەم گەوهەرە معجیزە لەسەر زمانم دێتە دەرێ ئیتر باوەڕ بێنن کەئەمە هی خۆم نییە هی خوایە.

پێغەمبەریخوا(صلى الله عليەوسلم) نەخوێندەوار بووە، ئەگەر نەخوێندەواری عەیب بێ بۆ هەموو کەسێك بۆ پێغەمبەری خوا سەربەرزیە و ئیعجازە، ئینجا جیاوازی شێوازی فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليەوسلم) لەگەڵ سورەتەکانی قورئاندا بۆ کەسێ عەرەبی بزانێ ئەرزو ئاسمانە. لەفەرموودەکانی پێغەمبەردا زۆر جار باسی خێزانە خۆشەویستەکەی خۆی ئەکرد حەزرەتی خدیجە کە (١٥) ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی خێزانی بووەو وە(١٠)ساڵ پاش پێغەمبەرایەتی واتە(٢٥) ساڵ خێزانی بووە، پاش وەفاتی زۆر بە ڕێزو خۆشەویستیەوە باسی ئەکرد، بەڵکو خەڵات و خزمەتی هاوڕێکانی(خدیجە)شی ئەکرد وەکو لەسیرەدا هاتوە بەجوانی باسی ئەوی ئەکرد، ئەگەر قورئان نووسینی پێغەمبەربووایە ئەبوایە نیوەی باسی خدیجە بوایە بەڵام بە پێچەوانەوە نەزۆرو نەکەم باسی خدیجەی تیانییە. ئەگەر یەکێك کتێبێك بنوسێت ناتوانێ زەمی خۆی بکات، ناتوانێو ناکرێ هەڕەشە لەخۆی بکات، ئەوانەی کەمێك ڕۆشنبیریان هەیە،ڕۆشنبیری ئیسلامی هەرگیز هەڵەی واناکەن بڵێن قورئان زادەی محمدە.هەر (عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ )[٢٨٥]

یان بەسە، کەخوا سەر زەنشتی پێغەمبەرەکەی ئەکات بۆچی وات کرد..؟

---

([٢٨٤]) يونس / ١٦.

([٢٨٥]) عبس / ١.

(عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾)[٢٨٦]

(...فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾)[٢٨٧] وه

(لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾)[٢٨٨]

(وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾)[٢٨٩].

**ئەمانە بەڵگەی نەهین بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.**

**نوێژی کرد لەسەر دووڕوویەك دوایی خوا پێی فەرموو: نوێژ نەکەی لەسەر دووڕوو. چۆن ئەیسەلمێنی ئەمەهی ئەوە؟ جگەلەئیعجازە زمانەوانیەکەی ئیعجازەغەیبەیەکەیو ... هتد شاعیران و زمانەوانان دەستەوەستان بوون بەرانبەر ئەم قورئانە، خێرا کاری تێ ئەکردن یەکێك لەوان (ئەنەسی غەفاری) ناوبوو هاتەوە بۆناو عەشیرەتەکەی، بەبراکەی ووت: براکەی ناوی (ئەبو زەڕ)بوو کە پاشان بوو بەو ئەصحابە بەرزە، ووتی: براکەم لەمەککە پیاوێك پەیدابووە ئەڵێت پێغەمبەرم شتێك ئەڵێ: لەگەڵ هیچ بەحرێکی شعردا ناگونجێو پەخشانیش نییە، بەڵام کارئەکاتە سەر هەموو دڵێك وەڵلاهی ئەو ڕاست ئەکات وەڵلاهی قەومەکەی درۆئەکات.**

---

(٢٨٦) التوبة / ٤٣.

(٢٨٧) یونس / ١٠٦.

(٢٨٨) القیامة / ١٦.

(٢٨٩) التوبة / ٨٤.

(عتبــەی کــوڕی ربیعــە) چــوو ڕێکــەوتنێکی لەگــەڵ پێغەمبــەردا(صــلی الله علیەوســلم)کــرد کــەوا ئەگــەر پــارەت ئــەوێ بــۆت کۆنەکەینــەوە تائەبیتــە دەوڵەمەندترینمان، ئەگەر حەز بەکورسی و پلەو پایە ئەکەیت ئەتکەینــە پاشای هەمووامان، ئەگەر نەخۆشی دکتۆرت بۆئەهێنین لەوپەڕی دنیاوە، چیت ئەوێ بۆت ئەکەین. پێغەمبەری خوا(صلی الله علیەوسلم) گوێی لێگرتبوو بـە (یـا أبـا الولیـد) قسەی لەگەڵدا ئەکرد بـەناز ناوەکـەی پـاش ئـەوەی کـەلێ بـووەوە. پێغەمبـەری خـوا (صلی الله علیەوسلم) فەرمووی: یاأبا الولید (أفرغت) لێ بویتەوە؟

ئەویش ووتی بەڵێ. جا فەرمووی: دەتۆش گوێ لەمن بگرە. قورئانی بۆ خوێندەوە تا گەیشتە

(فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةً مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾)[٢٩٠]

خێرا ئـەم عتبـەی کوڕی ربیعەیـە دەسـتی خـستە سـەرلێوی پێغەمبـەری خـوا بـۆ ئـەوەی ئـەو ئایەتـە نـەڵێ ئەمەنـدە کـاری تـێ کـرد پێغەمبـەری خـوا(صـلی الله علیەوسـلم) بـەردەوام بـوو لەخوێندنـەوەی قورئانـدا تـا گەیـشتە سـوجدەکەو سوجدەکەی برد، ووتـی مـن ئەمـەم پێیـە. عوتبـە گەڕایـەوە بـۆلای سـەرکردەکانی قوڕەیش ووتیان (عتبە) دەموچاوت گۆڕاوە، ووتی وەڵڵاهی ئەم پیاوە ڕاسـت ئـەکاو وەبەرز ئەبێتەوە لەدوارۆژداو سەرئەکەوێ... ئەمانە هەمووی بەڵگەی مێـژوویین بۆ گەورەیی قورئان و ڕێزو شکۆی پێغەمبەر(صلی الله علیەوسلم).

ڕۆژ بـەڕۆژ ژمـارەی بـاوەڕداران لـەزۆر بوونـدابوو، تایـەکێك لـەپیاوانیان نـاوی (وەلیـدی کـوڕی موغـەیرە) بـوو، کەڵـە پیـاوانی قوڕەیـشی کـۆکردەوەو ووتـی:

---

([٢٩٠]) فصلت / ١٣.

ماوەیەکی تر کاتی حەجە با بەدرۆ نەکەوینەوە، بەرانبەر بەمحمد بارێك بکەوین ناوەو ناتۆرەیەکی لێ بنێین.

بابەتەکە دوورو درێژە لەکۆتاییدا بڕیاریاندا ناوی بنێن(ساحر) گوایە ئەفسون ئەکاو کار ئەکاتە سەر مرۆڤو دڵ ئەخاتە کریشمەوەو دووری ئەخاتەوە لەماڵو منالیو ئالەم بابەتە.

پێشتر خۆیان ناویان نابوو (الصادق الامین) (ڕاست گۆی دەست پاکی داوێن پاك) لەگەڵ ئەم هەموو تەشویشەدا، لەگەڵ ئەم هەموو عەزیەتدانە هەر پێیان ئەوت (الصادق الامین) پێشیان ئەوت ساحر، یەکێك لەو سەرۆك عەشرەتانە ناوی (طوفەیل کوڕی عەمری دوسی)بوو، کەهات بەخێرهاتنێکیان کردو سەرکردەکانی قوڕەیش ڕێزیان گرت و پێیان ووت: فەرموو بەخێر بێیتو ئەوە طوافی خۆت بکە، بەلاّم محمدی کوڕی عبدالله لەوێدا دانیشتووە هەوڵبدە کە هیچی لێ نەبیستی چونکە یەکسەر سحرت لێ ئەکات، لە ڕوایەتدا هاتووە ئەڵێ پارچە لۆکەیەکم خستە گوێم بۆئەوەی گوێم لەو نەبێت، طوافی خۆم کرد دوایی پرسیارێکم لەخۆم کرد وتم (طفیل) تۆ شاعیری، تۆ سەرۆك عەشرەتی کێشەی خەڵکی چارە ئەکەی، ئێستا ئەترسی گوێ دێری ئەم پیاوە بیت و زایە ببیت؟ وتی: لۆکەکەم لە گوێی خۆم دەرهێنا، دوای طواف چومە بەر دەمی ووتم: قسەم بۆبکە،پێغەمبەریش(صلی الله علیەوسلم) کەمێك قورئانی بۆ خوێندم، هەردوای چەند دەقیقەیەك (طفیل) دەستی درێژکرد و پەیمانی پێداو شایەتمانی هێنا کەئەمە کەلامی خوایەو ئەویش ڕەوانەکراوی خوایە(صلی الله علیەوسلم) بەرامبەر بەوە خێرا نورێك هاتە دەمو چاوی (طفیل) وە نوری راستگۆییو دڵسۆزی بۆخوا، لەدورەوە ئەبینرا کەنورێك لەنێو چاوانیەتی، داوای لەپێغەمبەر کرد کە ئەو نورە لابچێ نەبا قەومەکەی بڵێن خواوەندەکان کاریان تێکردویتو نەبا بە (شێواندنەوە) تەفسیربکرێ،

پێغەمبەری خوا دوعای بۆ کرد نورەکەی هاتە ناو ئەو دارەی کەبەدەستییەوە بوو، ئەمە بوو بە هۆکارێك کە هەموو عەشرەکەتەکەی موسوڵمان ببن وە هەموویان بێن (بەیعە) بدەن بەپێغەمبەر.

پاشای ڕۆم (هرقل) کە ئەبوسفیان چوو بۆلایو باسی کێشەکانی خۆیانی بۆ کردوو ووتی کە پیاوێك پەیدابووە ناوی محمدەو داوای پێغەمبەرایەتی ئەکات.

(هرقل) لێی پرسی کێ شوێنی کەوتووە؟ ووتی: فەقیروهەژار. ووتی: هەموو پێغەمبەرێك ئاوایە. ئەی درۆتان لێ بیستووە؟ ووتی: نەخێر قەت درۆمان لێ نەبیستوە(هرقل) ووتی: عەقڵ نەیگرێ لەگەڵ خەڵکیدا درۆنەکاو لەگەڵ خوادا بیکا؟!

قورەیش لەگەڵ ئەم هەموو هێرشی ڕاگەیاندنەدا لەپێش پێغەمبەرایەتیو پاش پێغەمبەرایەتی هەر پێیان ووتووە (الصادق الامین) (صلی الله علیەوسلم)، حەزرەتی عمر کەیەکێ بوو لەسەرکردەکانی قورەیش بڕیاری دا محمد بکوژێ ڕۆژێکیان تووڕەبوو شمشێرکەی هەڵگرتو ئەگەڕا بزانێ لەکوێیە؟

موسوڵمانێك بینی (نعیم کوڕی عبدالله)ی ناو بوو بەنهێنی موسوڵمان بووبوو، ووتی (عمر) وا تووڕەی بۆکوێ ئەچی؟ ووتی: سەری محمد لێ ئەکەمەوە وتی: ئەی ناترسیت (بنی هاشم) تۆڵەت لێ بسەنەوەو لەگەردنت بدەن، ووتی بالەگەردنم بدەن کەزانی ئاوا بەڕاستیەتی، ووتی: تۆ بڕۆ ئاگات لەخوشکەکەی خۆت بێت ئەوانە هەموو شوێن محمد کەوتوون، ئەی ئەزانی کە فاطمە ی خوشکت و مێردەکەی (سعیدی کوڕی زیدە یەکێکە لەمزدەپێدراوەکانی بەهەشت) مووسڵمان بوون و دەرس هەیە لەماڵیاندا لەلایەن مامۆستایەکەوە کەناوی (خەبابی کوڕی ئەرەتە) عومەر گەڕایەوە لەو خەیاڵەی کردبووی بەتوڕەییەوە ڕۆیشت و خۆی کرد بەماڵی سەعیددا، مامۆستاکەیان شاردەوە و (سەعید) لێدانی خواردوو

(فاطیمە)ی خوشکی لێدانی خواردو داوای ئەو قورئانەی ئەکرد کەبەدەستیانەوە بوو، (پارچە پێستێك قورئانی تیانوسرابوو) پێیان نەدا، بەلاَم کەبینی خوێن بەلالێوی خوشکەکەیدا دێتە خوارەوە تۆزێ بیری کردەوەو چۆن ئەبێ لەئافرەت بدرێ دوایی سوێندی خوارد ووتی: (لن امسة بالسوء) ئەم صەحیفەیە عەزیەت نادەم هەر بمدەرێ بیخوێنمەوە، خوشکەکەی فەرمووی: تۆ پیسیت ئەمەش کەلامی خوایە، نابێت ئینسانی بێ باوەڕ دەست بدات لە قورئانەوە بڕۆ خۆت بشۆو وەرەوە، عومەر خۆی شتودوای ئەوە ئەو پێستەیەی گرت بەدەستەوە:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ (طه ۞١۞ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ)[291]

ئاوا چەند ئایەتێکی خوێند دوای هەستا ووتی: (ما أحسن هذا الكلام و ما أكرمه دلوني على محمد).

چەند بەرێزە ئەم گوفتارە، چەند بەرزە ئەم شاکارە، محمد لەکوێیە باشایەتمان بێنم، لەو کاتەدا ئەزانن ئەمە ڕاست ئەکات ئینسانێکی ئازاو مەردە، لەوکاتەدا (خەبباب) خۆی دەرخست ووتی: من شوێنەکەی ئەزانم، و بردی بۆلای پێغەمبەری خواو شایەتمانی هێنا.

ئەمانە هەموو بەلگەی مێژووین، ئیعجازو گەورەیی قورئان نیشان ئەدەن بۆ کەسێك بیربکاتەوە..

---

([291]) طه / ١ و ٢.

## باسی سی‌و یەك
## پایەی نوێژ لەژێر تیشكی ئیعجازی زانستیدا

نوێژ پاكژیەكی هەیە، دەست نوێژێكی هەیە، سەرەتا لە حیكمەتی دەست نوێژەوە دەست پێ ئەكەین انشاءالله..

ئیسلام ووشەی (الطهارة)ی بەكارهێناوە وەك زاراوەیەك واتە (پاكژی) پاكژی دڵ و دەرون لەهەموو گومانێك‌و لەهەموو ترسێك‌و هەموو دڵەڕاوكێیەك و هەموو ئاڵۆزیەك دەروون پاك بێتەوە لەوانە عەقڵ پاك بێتەوە لەهەموو خورافات و ئەفسانەیەك وە لەش پاك بێتەوەو جل‌وبەرگ و هەروەها پاكژی ژیانی كۆمەڵایەتی، پاكژی كومەڵگا لەهەموو ئافاتێكی ماددی‌و ڕەوشتی ئەو پاك و تەمیزییە ئەو دەست نوێژ هەڵگرتنە ئیسلام وا تەماشای ئەكات وەك فەرزێك بەبێ ئەو دەست نویژە نوێژەكە نابەسترێ قبوڵ ناكرێ وەرناگیرێ ئەو طهارەیەی نزیكەی (٣)جارلەقورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووە بە مشتەقاتییەوە، لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە (صلی الله علیەوسلم) (الطهورشطرالایمان)[٢٩٢] ئەو پاكژییەو ئەو دەست نوێژە نیوەی ئیمانە لەئامۆژگاری‌یەكی پێغەمبەردا بۆ ئەنەسی كوری مالك ئەفەرموێ: یابنی ان أستطعت أن لاتزال علی طهارة فأفعل فأنه من أتاه الموت وهو علی وضوء أعطي الشهادة أو كما قال.

واتە: كوڕی شیرینم ئەگەر ئەتوانی هەمیشە بادەست نوێژت هەبێ چونكە ئەوكەسەی كەمردن یەخەی پێ ئەگرێ‌و لەسەر دەست نوێژبێ، ئەوا پلەی

---

([٢٩٢]) صحيح مسلم / كتاب الطهارة / رقم / (٣٢٨) عن أبي مالك الأشعري.








شەهیدی پێ ئەدرێ، ئایا چ دینێك ئەوەندە داکۆکی ئەکات لەسەر پاکژی وپاك و خاوێنی(گلاسکۆ) پزیشکێکی سکۆتلەندیە کەلەجەنگی جیهانی دوەمدا بەشداری کردوو لەسوپای بەریتانی لە هیندستاندا، ئەڵێ: هیچ جارێك سەربازێکی موسڵمانی هیندی دووچاری ئەو نەخۆشیە نەبووە کە پێی ئەڵێن (پلۆراتسی ئەنای) واتە ئەو ئلتهابو ئەو خوراندنەی دەوری کۆم ئەگرێ، هەمیشە هندۆسەکان و سیخەکان دووچاری ئەبوون. لەبەرئەوەی موسڵمانان ئاوبەکارئەهێنن، تارەت ئەگرن دووچاری ئەو نەخۆشییە نابن. ئیسلام ئاینی پاك و پاکژیە، وە پاش ئەو ئامادەبوونە دێینەسەر دەست نوێژ کە دەموددان ئەگرێتەوە پێغەمبەر(صلى الله عليه‌وسلم) لەفەرموودەیەکا ئەفەرمووێ (لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك مع كل الصلاة)[٢٩٣]، واتە: ئەگەر نارەحەت نەبوایە لەسەر ئوممەتەکەم ئەمرم پێئەکردن کەسیواك بەکاربهێننلەگەڵ هەموو نوێژێکدا،لە فەرموودەیەکی تردا ئەفەرموێت (السواك) (مطهرة للفم مرضاة للرب)[٢٩٤] لە ڕوانگەی زانستەوە پرسیارێ بکەین، ئایا ئەم سیواك کردنەی پێغەمبەر (صلى الله عليه‌وسلم)کردوویەتیو ئەو داری (آراك)ەی پێی ئەوترێ (مسواك) بەهایەکی زانستی هەیە، ئایا زانستی نوێ ئەڵێ چی سەبارەت بەئەم مسواکە؟ لە کتێبی (السواك و العنايه بالاسنان) (د.عبدالله عبدالرزاق سعيد)لە لە (٤٥-٥٢) باسی سیواك ئەکات لەڕوانگەی نۆژداریەوە (طب) ئەڵێ: ماددەی (تانیك ئەسیك) واتە: (ترشەڵۆکی تانیك) ئەم ترشەڵۆکی تانیکە بەکتریای زیان بەخشی

---

([٢٩٣]) رواه الشيخان ، هەروەها سنن الدرامي / كتاب الطهارة / ٦٨٠.

([٢٩٤]) صحيح البخاري / كتاب الصوم. سنن النسائي / كتاب الطهارة / رقم (٥) عن عائشة . مسند أحمد / رقم (٢٣٧٧٨).

دەموددان لـەناو ئـەبات، پاكژكەرەوەيـە دژبـە ئـەزيف كـار دەكـات وە دژبـە سـك چوونيش بەكاردێت.

دكتۆر عبدالحميد القضاة لـەزانكۆی كەراچـی هەسـتا بەلێكۆڵينەوەيـەك دەربـارەی سيواك سەلماندی كەسيواك پێـنج جۆر لەبـەكترياى زيـان بەخشی نـاو دەم لـەناو ئـەبات، دكتـۆر (غـافر العطـار) هەسـتا بەلێكۆڵينەوەيـەك لـەم بارەيـەوە ئـەڵێت: تاڵەكانی سيواك (Na Co ٣)تيايە واتـە: (كاربۆنـاتی سۆديۆم)ی تيايـە كاربۆنـاتی سۆديۆم گرنگترين كەرەستەيە كە ئەبێ لەگيراوەی پاكژكردنـەوەی دانـدا هـەبێت.. لەوانەيە هەبێت بڵێ ئەمە ڕای دكتۆرە موسڵمانەكانە، بەڵام دكتۆری تـريش هەيـە وەكو دكتۆر (كنت كنديل) كە موسوڵمان نيە ئەڵێ: سيواك ماددەيەكی تيايـە دژبـە كلۆر بـوون. پرۆفيـسۆرێكی ترنـاوی (ڕۆدات)ە بەڕێوبـەری پەيمانگايـەكی ئەڵمانيـە كەسەر بە زانكۆی ڕۆستۆدە لـە توێژينەوەيەكدا ئـەڵێ: سـيواك دەوری پەنـسلين ی هەيە بۆ قەڵاچۆكردنو نەهێشتنی زياد بوونی ميكرۆب.

بێينە سەر بەشێكی تر لەدەست نوێژ كەبريتيە لەپاك كردنـەوەی لـوت، كۆمـەڵێك لەپزيشكانی زانكۆی (الاسـكندريە)ی مـصر بـەهاوكاری لەگـەڵ كـۆڕی توێژينـەوەی زانــستی (مجمـع البحـوث العلميــة) كەسـەر بـە (أكاديميــة البحـوث العلميــة و التكنلوجية)ی ميصريە ئەم دوو تيمە هەستان بەتۆێژينەوەيەك بـۆ سـەقفی لـوتی ئەوكەسـانەی كـە دەسـت نوێـژ هـەڵ ئـەگرن، وەئـەو كەسـانەی كەدەسـت نوێـژ هەڵناگرن واتە: بەراووورد كردنێكە لەنێوان لوتی ئەو كەسـانەی كەنوێژئەكەن وە ئەوكەسـانەی كەنوێژناكـەن، لەئـەنجامی ئـەو لێكۆڵينەوەيـەدا دەركـەوت ئـەو كەسانەی كە دەست نوێژناشۆن هەميـشە سـەقفی لوتيـان لـەديوی نـاوەوە مەيلەو ڕەشـە، وەمووەكـانی ئەوكەناڵـە داپۆشـراوە بـەجۆرە كرێـشێك وەك تـەپوتۆز وە بەئاسـانی ئـەو مووانـە دەوەرێـن بەپێـچەوانەی ئەوكەسـانەی هەڵدەسـتن بەدەست

نوێژگرتن سەقفی لوتیان کاڵە، مووەکانی لوتیان بەمیکرۆسکۆب تەماشا ئەکرێ ئەبریسکێتەوە، وە هیچ جۆرە تەپوتۆزێك و کرێشێکی پێوە نییە لەئەنجامی ئەوەی کە ئاوی بەرئەکەوێ رۆژی پێنج جار.

هەر لە هەمان لێکۆڵینەوەدا نموونە وەرگیراوە لەلوتی ئەوجۆرە کەسانەوە لەهەردوولا ئەوانەی نوێژ ئەکەن و ئەوانەی کە نوێژناکەن، دەرکەوت ئەوانەی کەنوێژناکەن چەندین جۆر میکرۆبات وا لە لوتیاندا، بەلاّم ئەوانەی کەدەست نوێژهەڵدەگرن دەست نوێژی رێك وپێك وەك سونەتی پێغەمبەر (صلى الله عليەوسلم)داگۆکی لەسەر ئەکات (استنشاق)ی تیایە (استنفاری)ی تیایە ئەو ئاوە هەڵ دەمژرێت پاشان فم ئەکرێتەوە سێ جار لەگەڵ هەموو دەست نوێژێکدا رێگەنادات بەمیکرۆبات کە زیاد بکەن وجێنشین بن لەلوتدا، بەپێچەوانەی نوێژکەرەکان ئەوانەی کەنوێژناکەن چەندین جۆرە میکرۆبات والەلوتیاندا.

بێینەسەر ئەم دەست نوێژە لەرۆژی قیامەتدا، ئەصحابەکان عەرزی پێغەمبەریان کرد(صلى الله عليەوسلم)یارسول الله لەناو ئەوقەرەباڵەغیەدا چۆن ئەماننناسیتەوە فەرمووی: بەنوری دەست نوێژ ئەتان دۆزمەوە.

جائێمە لێرەدا پرسیارێك ئەکەین ئەو کەسانەی پەنابەخوا باوەڕیان بەنوێژ نییە ئایا چۆن ئەیسەلێنن لەئوممەتی پێغەمبەردان؟ یەکەم بەلگەو یەکەم شوناس بۆ ئەم ئوممەتە پاش شایەتومان نوێژە، نوێژ موسوڵمان جیا ئەکاتەوە لەگەڵ بێ باوەڕ، جا ئەو کەسانەی کەنوێژ ناکەن چ بەلگەیەکمان پێیە لە ئوممەتی پێغەمبەردان (صلى الله عليەوسلم)..

بێینە سەر لایەنێکی دەروونی د.محمد یوسف خلیل کە راوێژکاری نەخۆشیە دەروونییەکانە (سەرچاوەی ئەم باسانە ئەم کتێبەیە (الاستشفاء بالصلاة دراسةحول الفوائد الصحية للصلاة على ضوء العلم الحديث) ئەم کتێبە هەمووی

بۆچوونی نوێیە، تۆژینەوەی نوێیە، هی زانکۆکانی جیهان، دەستەی ئیعجازی زانستی لە مەککەی پیرۆز کۆی کردۆتەوە، ئەم پرۆفیسۆرە باسی خشوع ئەکات لەنوێژدا کەئالۆزیوگرژی دەروونی لائەبات دڵەڕاوکێی دەمار لائەبات، بەتاقی کردنەوە گەیشتونەتە ئەم ئاکامانە، شێوازێکی نوێ هەیە پێی ئەوترێ (تهدئه التوتر بتغير الحركه) بەگۆڕانکاری لەجم‌وجۆڵدا دڵەڕاوکێ ناهێڵن، خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێ:

(قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ۝٢)(٢٩٥)

سەربەرزی وسەرفرازیو سەرکەوتویی بۆ ئەو جۆرە ئیماندارانەیە کەلەنوێژدا مل کەچیو خشوعیان هەیە، وەلە ئایەتێکی تردا

(أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ۝٢٨ )(٢٩٦)

پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه‌وسلم)ئەفەرموێ (أرحنا بها يابلال)[٢٩٧] بلال باپشوو بدەین بادەست کەین بەنوێژ (يابلال أقم الصلاه أرحنا) نوێژەکە بەرپاکە باپشوو بدەین با ڕۆحو دەرونمان پشوو بدات. جا ئەمڕۆ جۆرە ڕاهێنانێك هەیە ڕاهێنانی (استرخاء)ی پێ ئەڵێن، مەبەست لەوەیە کەئەوکەسە دوورخاتەوە بۆ چەند ساتێك لەو واقعەدژوار و جەنجاڵەی کەتیادا دەژی، لەدەنگەدەنگو هەڵسوکەوت و ئەو پەیوەندیانەی کەهەیەتی بپچڕێو پیاچوونەوەیەکی خۆی بکات حاڵەتێکی

---

(٢٩٥) المؤمنون / ١ و ٢.

(٢٩٦) الرعد / ٢٨.

(٢٩٧) لە چەندین سەرچاوەدا هاتووە ، وەك: مجمع الزوائد / الجزء ١ / ص١٤٥، روي أبو داود والطبراني في الكبير. هەروەها: المجتمع الكبير / الجزء ٦ / ص٢٧٧. وە هەروەها: كشف الخفاء / الجزء ١ / ص١١٧، علل الدار قطني / الجزء ٤ / ص١٢١، نيل الاوطار / الجزء ٣ / ص٩٣.

دوورەپەرێزیو تەنهایی دابڕانی دەروونی بۆ دروست بێت... بەوە ئەو ناڕەحەتەییە دەروونییەی کەم ئەبێتەوە، لەسەرەوەی ئەم هەموو ڕاهێنانە نوێژە ئەگەر ئێمە مەرجەکانی جێبەجێ بکەین، خشتەیەك هەیە ئەم نەخشەیە پێی ئەوترێت (خشتەی کارۆتیر) زانایەکە هەستاوەبە لێکۆڵینەوەیەکی قوڵ. دەربارەی ئەو فاکتەرانەی کار ئەکەنە دەروونی مرۆڤ، جالە حاڵەتی ماندووبوندا وەلە حاڵەتی پشوداندا، ئەو ڕاهێنانی پشووی بۆ داناوە لەخشتەکەدا نووسراوە (مثل مایحدث من الصلاة)وەکو ئەوەی لەنوێژدا ئەکرێ، ئەبینی هۆڕمۆناتی (تیستۆستیرۆن) لەگەڵ ئەنسۆلین لەکاتی ماندووبوندا کەم ئەبێتەوە، بەلام لەکاتی خشوعی نوێژدا زیاد ئەبێ.

ئەگەر تەماشاکەین (تخثرالدم) واتە: خەست بوونەوەی خوێن ئەو خەست بوونەوەیە زیاد ئەکات لەکاتی ماندوویەتیا بەلام لەکاتی نوێژدا کەم ئەبێتەوە، ئەو هۆڕمۆناتانەی کە پەیوەندی بەمێشکەوە هەیە کەم ئەبێتەوە، لە کاتی نوێژدا ڕژێنی دەردراو کەم ئەبێتەوە، ترپەی دڵ کەم ئەبێتەوە، پاڵەپەستۆی خوێن کەم ئەبێتەوە. ئەو دیاردانەی کەلە تخطیطی دڵدا دەرئەکەوێ بەهۆی کەم وەرگرتنی ($O_2$)بۆ دڵ لەکاتی نوێژدا کەم ئەبنەوە... ئەمە لەو جۆرە نوێژانەیە کەئیتر ئەومسوڵمانە ئاگای لەدەوروبەری خۆی نییە بەلام تۆ فکرت لای دوکانەکەی خۆت بێ فکرت لای مەنجەڵەکەت بێ، فکرت لای مناڵەکەت بێ ئەوە پێی ناوترێت نوێژێکی ڕاستەقینە (لیس للمرءمن صلاته الا ما عقل)چەند هۆشت لای نوێژەکەبوە ئەوەندە بۆت ئەنوسرێ.

بەلام ئێمە ئەگەر ئەوەجێبەجێ بکەین بەتەواوەتی دوورکەوینەوە لەدەوروبەر(الصلاة معراج المؤمن)بڵندبیتەوە ئەو ڕۆحەت بڕوات پەیوەندی کەیت

لەگەڵ جیهانی مەلەکوتدا، بگەیتە پلەو پایەی (احسان) پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوای گەورەدا بکەیت، ئەو دڵ و دەروونە ئەم هەموو سوودانەی پێ دەگات.
ئەو نوێژەی کەباسی ئەکەین ئەونوێژەی پێغەمبەربێت (صلی الله علیەوسلم)خێزانەکانی دەیگێڕنەوە قسەمان بۆ دەکرد قسەی بۆ دەکردین، کاتی نوێژ کەنزیك دەبوەوە (کأنە لایعرفنا ولانعرفە)وەك نەمان ناسیێت و نەشی ناسین. ئیمامی علی لەیەکێك لە غەزاکاندا ئەڵێن تیرێك بەرقاچی کەوتبوو لەترسی نەزیف و لەترسی ئازار نەیان ئەوێرا بۆی دەربهێنن بەڵام فرسەتیان هێنا لەکاتی نوێژدا ئەوتیرەیان دەرهێنا لەقاچی پیرۆزی وە بۆیان تەداویکردو ئاگاشی لەخۆی نەبوو، پاش نوێژ ووتی ئەوە چیلێهات تیرەکە عەرزیان کرد دەرمان هێنا!! ئەوەیە نوێژ ئەوەیە خشوع. ئیمام جەعفەری صادق (ڕەحمەتورەزای خوایلەسەر)لەکاتی دەست نوێژ هەلگرتندا ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕا.
عەرزیان ئەکرد قوربان بۆچی وات لێ دێت؟ ئەیفەرموو نازانن من ئەچم مقابلەی کێ ئەکەم. .؟ ئیمامی بوخاری (رەحمەتی خوای لێ بێ) کورەی زەردەواڵە کەوت بەسەریا، پێوەیئەدا نوێژەکەی نەبڕی، ئیمام ئەبو حەنیفە ئیمام بوو موسڵمانان لەپشتیەوە نوێژیان دەکرد کتوپڕ لەسەقفی مزگەوتەکەوە مارێك کەوتە خوارەوە هەموو بلاوەیان لێکرد کاتێك ئەبو حەنیفە سەلام ئەداتەوە ئەفەرموێت؛ ئەوەموسڵمانان لەکوێن ئاگای لەو هەموو هەرا هەرایەو ڕاکەڕاکەیە نەبووە ئەوەیە خشوعی نوێژ!!
ئەگەر بەو جۆرە نوێژ بکەین سوودەکەی ئابەو جۆرەیە کەلەو خشتەیەدا هەبوو...
دووزانا لە ئەمەریکا هەستان بەلێکۆڵینەوەیەك بۆ تەرتیلی قورئان بۆ جۆرە کەسانێك کەعەرەبی نازانن، کەمەعنای ووشەکان نازانن، یەکێکیان (د.احمد

القاضی)بوو یەکێکیشیان (د.نجیب الرفاعی) بوو دوو لێکۆڵینەوەی جیاواز بە(٢١٠) تاقیکردنەوە، وە(احمد القاضی ) گەیشتەئەوەی کە خوێندنەوەی قورئان‌و تەرتیلی قورئان کارێکی ئیجابی هەیە بۆ هێنانە خوارەوەی گرژیی‌و ئاڵۆزی دەروونی و دڵەڕاوکێی دەروونی بەقورئان چاك ئەکرێ‌و کەم ئەکرێتەوە، د.الرفاعی هەستابە بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر تەرتیلی قورئان بەشێوازێکی تر، بێگومان کارەباییەك هەیە لەمێشکدا، جائەوکارەباییە ئەبەستن بەو ماسولکەیەی کە لەنێوەڕاستی ناوچەواندا هەیە، فەرقی کارەبایەکە لەئامێرەکەدا ئەخوێنرێتەوە کاتێکیش قورئانەکە دەخوێنین بۆ ئەوەی کەلە ژێر تاقی کردنەوەکەدایە ووردە ووردە ئەو کارەباییە دائەبەزێ بەهۆی قورئان خوێندنەوە، بەلاَم ئەگەر ووشەی عەرەبی بڵێت تەرتیبی بکەیت واتە ووشەی عەرەبی جگە لە قورئان بەتەرتیل بڵێیت هیچ دەورێکی نیە، هیچ سودێکی نىیە تەنها قورئان نەبێت ئەمە ئیعجازێکی زانستیەو لەو تاقیکردنەوانەدا سەلێنراوە.

ئەم پرۆفیسۆرە، د. نجیب الرفاعی ئەڵێ ئەو شەپۆلی بەخەبەربونەوەیە لەکاتی بێداری یا لەمرۆڤدا هەیە لە تخطیطی مێشکدا هەیە لەنێوان (١٣ — ٢٥) شەپۆل هەیە لەچرکەیەکدا، ئەو کەسە کەدای ئەنێت جیهازەکەش ئیش ئەکات جیهازی تخطیطی مێشك کەقورئانی بۆ ئەخوێننەوە دائەبەزێ لە(٨-١٨) بامەعناکەشی نەزانێ. . ئەمەی کەتاقیکردنەوەکانیان لەسەر کراوە هی هەردوو پرۆفیسۆرەکە عەرەبیان نەهێناوە، کەسێکیان نەهێناوە کە قورئان تێ بگات. تەنها تەرتیلەکەی کار ئەکاتە سەر ئەو دەروونەوە (٨-١٨) ئەم جۆرە شەپۆلانە پێی ئەوترێ (حالة الهدوء العمیق داخل النفس)ئەو پەڕی دڵ ئارامییە کە ئەگات بە ئەو کەسانە بەهۆی بیستنی تەرتیلی قورئانەوە... ئەبێ بشزانین کە پرۆفیسۆرێکی تر ناوی (لۆرانس ئێس کۆلب)ە گەیشتە دۆزینەوەی جۆرە شەپۆلێك لە کەسانی دینداردا

هەیە، خۆیبە ئیرادەی خۆی دروستی ئەکات ئەتوانێ بەرگری بکات، بەحاڵەتی خشوعەکەی واتە: لێرەدا خشوع بونیادێکی یاخوود تەفسیرێکی ماددی هەیە، قسەیەکی وەهمیو خەیاڵاوی نییە.

ئەم بەشەی کەئێستا باسمان کرد لە حکمەتولەهەندێ سوودی نوێژ ئەمە نابێتە مەبەستێك بۆمان ئێمە نوێژبکەین بۆ ئەوەی کولێسترۆڵمان دابەزێ بۆ ئەوەی ئەنسۆلینمان زۆر بێو شەکرەکەمان دابەزێ، نەخێر ئەمانە ئاگامن، چونکە (العبادة تؤدی طاعة) پەرستش ئەومیە فەرمانێکی خواییەو جێبەجێ ئەکرێ، بەلاّم ئەمە ئەوە ئەسەلمێنێ کەئەو خالقە (سبحانە و تعالی) هەرچی کە فەرموویەتی کەجێبەجێی کەی لەبەرژەوەندی مرۆڤدایە، ئەو شەریعەتە پیرۆزەی کەخوا ناردوویەتی هەچ خاڵێکی کە جێبەجێ ئەکرێ لەبەرژەوەندی مرۆڤدایە، هەچ بەشێك لەم شەریعەتە کە مرۆڤ جێبەجێی ئەکات وەك پێویستە بەرژەوەندی دنیاو قیامەتیەتی، لەبەرژەوەندی لەشیەتی، لەبەرژەوندی ڕۆحیەتی، لەبەرژەوەندی مێشکیەتی، لەبەرژەوەندی دەروونیەتی. لەبەرژەوەندی هەموو گۆشەکانی ژیانیەتی. ژیانی ڕاستەقینە وا لەم شەریعەتەدا، ژیانی ڕاستەقینە وا لەو پەیوەندیە لەگەڵ خالقدا، ژیانی ڕاستەقینە بە نوێژکردن دروست دەبێ (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ ﴿٢٤﴾)[٢٩٨]

---

([٢٩٨]) الانفال / ٢٤.

ئەی ئیمانداڕینە بچن بەدەم ئەو بانگەوازەی خواو پێغەمبەرەوە، ئەگەر چوون ژیانی ڕاستەقینەتان دەست گیر ئەبێت ئەچنەناو ژیانی ڕاستەقینەوە، لەزەت لەژیان ئەبینن..

# باسی سی‌و دوو
# چەند بەڵگەیەکی زانستی لە قورئانی پیرۆزەوە

خوای گەورە لە قورئانەکەیدا ئەفەرمووێ – اعوذ بالله من الشيطان الرجيم – (وجعلنا السماء سقفاً محفوظاً وهم عن اياتها معرضون)(٢٩٩).

ئەفەرمووێ – سەقفێکمان دانا بۆ ئەم ئاسمانە، سەقفێك بۆئەوەی ئاسمان بپارێزێ، بەڵام زۆر لەبێ باوەڕان بیر لەمە ناکەنەوە یا خۆیانی لێ گێل ئەکەن.

(راناوی کۆ) سەربەخۆ بێت یا لکاو بێت وەکو (نا) یا (نحن) یان (إنا) کە خوای گەورە بەکاری ئەهێنێ لەقورئانەکەیدا هەمیشە لەگەڵ فرمانێکدا دێت کە ئاماژەیە بۆ صیفەتێك یان ناوێك لەناوەکانی خوای گەورە –وجعلنا السماء...

بەڵام ئەگەر هاتوو (راناوی تاك) بەکارهات، ئەوا خوای گەورە مەبەستی ناوو سیفاتی خۆی نییە. بەڵکو مەبەستی زاتی خۆیەتی (جل جلاله) وەکو ئەفەرمووێ (إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي ﴿١٤﴾)(٣٠٠).

لەوێدا مەبەستی زاتی خۆیەتی. لەروانگەی زانستەوە چەند راستیەك دەرکەوتووە بۆ ئەو سەقفە پارێزراوە، ئەو سەقفەی کەخوا پاراستویەتی زانست بۆی دەرکەوتووە کە دەستەڵاتێك هەیە قودرەتێکی ژێری سەرووی دەستەڵاتی بەشەر ئەم بەرگە هەوایەو ئەو ئاسمانانە دەبات بەرێوە بەوپەڕی رێك و پێکی و

---

(٢٩٩) الانبياء / ٢٤.

(٣٠٠) طه / ١٤ .








وردەکاری‌یەوە. کە هەمووی ئەیسەلمێنێ ئەم ئایەتە کەلامی خوایەو هیچ جۆرە گومانێکی تیا نییە.

یەکێك لەو راستیانە: (بەهەڵم بوونی ئاو لەساڵێکا) ئەگۆڕە واتە لەساڵێکا چەند لەو رووبەرە ئاوییانە دەبنە هەڵم هەموو ساڵێ هەمان برە.(برێکی دیاری کراوە) بەڵگو سەرسوڕمانەکەشی لەوە دایە کە بۆیان دەرکەوتووە هەمان بڕ دائەبارێتەوە هەمدیس واتە ئەو بڕەی کە دەبێتە هەڵم هەمان بڕە دەبارێتەوە. وە دۆزیانەوە کە ١٦ ملیۆن تەن لەهەموو چرکەیەکدا دەباری لەسەر زەوی بەتێکڕای ساڵەکە هەمووی.

واتە: برێکی دیاری کراوە بڕەکەش ١٦ ملیۆن تەن باران دەبارێت لەهەموو چرکەیەکدا.

دەبڕوانە ئەم ئایەتە پیرۆزە

(وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ ...)[٣٠١]

جارێ ئایەتەکە تەواو ناکەم، خوای گەورە ئەفەرمووێ (وانزلنا) ئەو (نا)یە دیسان (راناوێکی کۆیە) لێرەدا لکاوە بەفرمانێکەوە، پەیوەندی بەفرمانێکەوە هەیە کە (انزال)ە وەك ئەفەرمووێ:

(إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ۝١ )[٣٠٢]

خوای گەورە ئەفەرمووێ: تەنها ئێمە باران دەبارێنین هاوەڵمان نییە

---

([٣٠١]) المؤمنون/ ١٨

([٣٠٢]) القدر/ ١.

لەو کارەدا وە ئەو بارانە کە دەیبارێنین (بقدر) لەئاسمانەوە بەبڕێکی دیاریکراو کـە وەك دۆزراوەتـەوە ئـەمڕۆ ئـەوبڕە بریتییـە لـە١٦ ملیـۆن تـەن لەهـەموو چرکەیەکدا.

راستە هەنـدێ جار هەنـدێ شوێن بێبـارانی دەیگرێتـەوە بـەڵام شـوێنی تـر لافـاو ئەیبات، تۆفان لێی ئەدا گرنگ ئەوەیە هەمان برِ دەبارێ.

راستیەکی تر، زانست گەیشتە ئەوەی کە ئەو ئاوەی کە لەسەر زەویە وە ئەو ئاوەی کە لەشێوەی بەستەڵۆکە وە ئەو ئاوەی لەژێر زەمینە کە پێی دەڵێن (ناخاو) کۆی هەموویان نەزیاد بووەو نە کەم بـووەو نـەگۆڕە لـەو رۆژەی کـە خـوای گـەورە ئـەم زەویەی دروست کردووە.

واتـە زیـادو کـەمی نییـە، ئەگـەر هاتو ئـەم بەرگـە هەوایـە کونێکی تیـا هەبوایـە هـەڵمی ئـەو ئـاوە ئەچـووە دەرێو هەواکـەش ئەچووە دەرێ، ژیـان نـەدەما لەسـەر زەوی وە زەوی وشك دەبوو، (٤٥٠٠) ملیۆن سـاڵە ئـەم زەویـیـە هەیـە خـوای گـەورە سـەقفێکی پـارێزراوی بـۆ دانــاوە، ئـەو ئـاوە زیـادو کـەمی نـەکردووە بـەڵکو لەخولێکدایە دەبێتە هەڵم، دەبێتە باران، دەبێتەوە ئـاو، دەبێتـە سـەهۆڵ، دەچێتە ناخاو، گرنگ ئەوەیە لەدەوراندایەو زیاد ناکاو کەم ناکات.

ئەمە هەمووی دەلیلی زانـستیە بەڵگـەی زانـستیە بـۆ ئـەو سـەقفە پـارێزراوەی کـە خوا (سبحانەو تعالی) لەئایەتەکەیدا خوێندمانـەوە ئامـاژەی بـۆ دەکـات. ئایەتەکـە تەواو دەکەین دیسان :

﴿وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَسۡكَنَّٰهُ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابِۢ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ١٨﴾[٣٠٣].

لێرەدا تێبینی بکەن لەسەر دوو وشە: وشەی (أسكناه) لەگەڵ وشەی (ذهاب) خوای گەورە کە ئەفەرمووێ: من بارانتان بۆ ئەبارێنم بەبڕێکی دیاری کراو ئەو بارانە کە دەبارێ (سوکنا) دەکات لەسەر زەوی وە ئەشتوانین لای بەرین.

ساکن: واتە: (دانیشتوو) کە پرسیار ئەکرێ دانیشتووی کوێی؟ نیشتەجێی کوێی؟ ساکن‌و سکناو سکان‌و لتسکنوا و....هتد هەموویان پەیوەندی مرۆڤ پیشان ئەدات لەگەڵ زەویدا یان لەگەڵ خێزاندا یان لەگەڵ خاکدا یان لەگەڵ نیشتمانەکەیدا وە... هەروەها پەیوەندیەکە ئەوەندە پتەوە خەڵکی دێت بەشانازییەوە خوێن ئەڕێژێ لەپێناوی نیشتمانەکەیدا لەپێناوی خاکەکەیدا لەپێناوی خێزانەکەیدا لەپێناوی ماڵ‌و سامانیدا... ئەم وشەی (سکنا)یەباسی پەیوەندیدمان بۆ دەکات، پەیوەندییەکی پتەو بەڵام کە تۆ بیر دەکەیتەوە بەرووکەش ئەڵێی: کوا ئەو پەیوەندییە؟ زاهیرەن کوا ئەو پەیوەندیە پتەوە هەیە لەنێوان باران‌و خاکدا، ماوەیەك ئەو خاکە تەڕ ئەبێت شێدار ئەبێت‌و وردە وردە هەتاو لێی ئەداو پاشان وشك ئەبێتەوە بەهەڵم بوونێکی ئاسایی پێویستی بەقودرەتێکی گەورە نییە تا ئاوەکە لابەرێت (وانا على ذهاب به لقادرون) هەر خۆی بەیاسایەکی خوایی سادە کە بریتییە لە بەهەڵم بوون.... ئاوەکە وردە وردە لەدەست دەدات...ئەی بۆچی خوای گەورە وا دەفەرموێ؟! سەرەتا ئەفەرموێ ئەو ئاوە نیشتەجێ ئەکەین وە ئەشتوانین لای بەرین. لەروانگەی زانستەوە (کە ئەمە

---

(٣٠٣) المؤمنون/ ١٨.



بواری پسپۆری خۆمه، چونکه دەرچووی بەشی گڵم لەکۆلێجی کشتوکاڵ) هەموو گەردیلەیەکی گڵ clay (کلەی) چەند وشك بێت لەژێر خۆرا لەچلەی هاوینا لەبیاباندا بیهێنە ئەو گڵە وشکە بەمایکرۆسکۆب تەماشای کە ئەبینیت بەرگێك دەوری داوە لە(هەڵمی ئاو) ئەمەندە هێزێکی راکێشانی پتەو هەیە لەنێوان ئەو دوو گەردیلەیەدا، گەردیلەی گڵ‌و ئەو بەرگە هەڵمەی ئاوە تەنانەت بەو تیشکە بەهێزەی چلەی هاوینیشت زایە نابێت ئەومیە رازی نهێنی تێگەیشتنی (وانا علی ذهاب بە لقادرون) نەشتوانین ئەو بەرگی هەڵمی ئاوە لابەرین، بەڵام چۆن بێگومان لەتاقیگەدا لە پلەی ٢٠٠و ٣٠٠ی سەدی ئینجا ئەشکێت وە پاشان ئەو سامپڵە ئەکێشی کێشەکەی کەمی کردووە، ئەو کەمبوونەومیە بریتییە لە کێشی هەڵمی ئاوەکە کە لەدەستی داوە.

بێینە سەر وشەی (بقدر) کە باسمان کرد بەبڕێکی دیاریکراو خوای گەورە باران ئەبارێنێ وە دۆزرایەوە چەندە، بەڵام لە دوو روانگەیەوە تەماشای باران کەین، یەکێکیان: لەروانگەی بارینیەوە، دووەمیان: لەروانگەی پێکهاتەکەیەوە بێگومان باران لەهەورەوە دێت، هەوری ئاسایی ١٢٠٠ مەتر بەرزە، هەوریش هەیە هەڵگری بارانیشە ١٠٠٠٠ هەزار مەتر بەرزە، بەڵام تێبینی بکە ئەچوێنرێت بەسەنگێکی یەك کیلۆیی کە ئەگەر لەبۆشاییدا دڵۆپەیەك ئاو لە ١٢٠٠ مەترەوە بێتە خوارەوە لەبۆشاییدا ئەوە وەکوکیلۆیەك لەبەرزایی ١٥ سانتیمەوە بەرتدابێتەوە بەسەری یەکێکدا ئەگەر حسابی ئەو هێزە بارانە بکەین کەلە ١٠٠٠٠ مەترەوە واتە: لە ١٠ کیلۆمەترەوە دێتە خواریٚ خێراییەکەی دەچێتە سەرو( ٥٥٨) کیلۆمەتر لەکاتژمێرێکدا وەکو کیلۆیەك ئاسن وایە کەبماڵرێت بەسەری یەکێکدا لەبەرزایی مەترێك‌و ١٠ سانتیمەوە.

ئێمە باسی دڵۆپە ئاو دەکەین باسی تەرزە ناکەین، ئایا کێ خۆی ئەگرێ لەبەر ئەم رەحمە یان ئەم راجیمانەدا؟

بەڵام خوای گەورە کە ئەفەرمووێ ئەم ئاسمانەم بۆ کردوون بەسەقفێکی پارێزراو وە یاسای لێخشاندن (فریکشن)ی داناوە، (با)ی داناوە ئەو چرپەی هەوای داناوە، ئەمانە هەمووی بۆ ئەوەیە ئەو خێراییە کەم بکەنەوە بۆ نێوان ٨ تا ١٠ کیلۆمەتر لەسەعاتێکدا، عەزیەتی نەك ئینسان نەك ئاژەڵ عەزیەتی گوڵیش نادات ئەمە هەمووی بەڵگەیە کە ئەم گەردوونە ئیدارە ئەکرێ لەلایەن عەلیمو خەبیرەوە(سبحانە وتعالى) لەلایەن لەطیف و خەبیرەوە، لەلایەن خوایەکی رەئوفو رەحیمەوە.

جۆرە هەورێك دۆزراوەتەوە پێی ئەڵێن: کیۆمیۆلۆ نێمبەرس، ئەم جۆرە هەورە کێشەکەی هەزاران تەنە لەهەندێك کتێبدا ئەڵێ: ٣٠٠٠٠٠ تەن، ٣٠٠٠٠٠ تەن ئاو بەئاسمانەوە لەروانگەی زانستەوە واپۆلێن کراوە پێی ئەوترێ (هەوری قورس).

بێینە سەر قورئانی پیرۆز باسی هەوری قورس ئەکات ئەفەرموێت:

(وَهُوَ ٱلَّذِى يُرۡسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَىۡ رَحۡمَتِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابًا ثِقَالاً سُقۡنَـٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٲتِۚ كَذَٲلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ)[٣٠٤].

خوای گەورە باسی ئەوە دەکات هەر خۆیەتی (سبحانە وتعالى) کە (با) ئەنێرێ وەك مژدانەیەك چونکە ئەگەر (با) نەبێت هەموو ئەو هەورانەی کە دروست ئەبن بارانەکەیان دەبارێتەوە بەسەر دەریاو زەریاکاندا بەڵام بەهۆی سیستەمی

---

([٣٠٤]) الاعراف/ ٥٧.

(با)وە ئەم هەموو هەورانە دەگوێزرێنەوە بۆ وشکانی، وە هەندێك لەو هەورانە قورسن خوای گەورە ناوی ناون (سحابا ثقالا) کە ئەگاتە ولاتێکی مردوو، ولاتێکی بێباران زیندووی ئەکاتەوە ئێوەش بیرتان بێ، ئاوهاش زیندووتان دەکەینەوە لەئاخیری زەماندا.

دووەم: پێکهاتەی ئەو بارانە: بێگومان هەموو بارانێك لەهەورەوە دێت، هەموو هەورێکیش لەهەڵم بوونی ئاوەوە دێت. ٩٧٪ی هەور لەهەڵمی زەریاکانەوە هاتووە، ئەوی تریشی لەرووباری ئاوی شیرینو لەقوڕاوو زەلکاوو شوێنی ترەوە، گرنگ ئەوەیە ئەو هەڵمە کە بەرز دەبێتە هیچ جۆرە خاشاکێك، هیچ جۆرە کەرەستەیەك لەگەڵ خۆیدا بەرز ناکاتەوە، ئاوی ئەو زەریاو دەریایە چەند سوێرە لەسوێریدا تاڵ بووە، بەلام ئەو سوێریە بەرز ناکاتەوەلەگەڵ خۆیدا بەڵکو هەڵمێکی پاكو خاوێن بەرز دەبێتەوە بۆئەوەی ئاوێکی سازگار بباری بەسەر ئەم زەویەدا.

خوای گەورە دەفەرمووێ :

(لَوۡ نَشَآءُ جَعَلۡنَٰهُ أُجَاجٗا فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ ٧٠)(٣٠٥).

اجاج یەعنی سوێر – ئەگەر بمانەوێ ئەو بارانەتان بۆ دەکەین بەسوێراوێك کە ماڵی هەمووتان کاول کات، ئەگەر دوو سێ بارانی سوێر بباری زەوی کشتوکاڵی نامێنێ لەسەر ئەرزدا هەمووی تێك دەچێت، ئەوەش نیشانەیەکە بۆ ئەو سەقفە پارێزراوەو ئەو سەرپەرشتی کردنو ئەو سیستەمەی کە خوا داینـاوە، لەم بەرگە هەوایەدا ئەوەی کیمیای (ئەتمۆسفیر) بخوێنێت شتی سەیری بۆ دەرئەکەوێ هەمووی توێژ توێژە بایۆسفیرە، میزۆسفیرە، ستراتۆسفیرە، ئۆزۆنۆسفیرە... هتد

(٣٠٥) الواقعة/ ٥٧.

هەر چینەی چری خۆی و پێکهاتەی خۆی هەیەو تایبەتمەندی خۆی هەیە ئەرکو پیشەی تایبەتی هەیە، ئەگەر ئەو هەڵمە لەقورپیشەوە بڕوا هیچ جۆرە کەرەستەیەک لەگەڵ خۆی دا بەرز ناکاتەوە، واتە: زانست ئەمڕۆ ئەڵێ، ئاوی باران ئاوێکی زۆر زۆر پاکە. خوای گەورە ئەفەرمووێ

(وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾)[٣٠٦]

ئاوێکی سازگارتان پێئەبەخشین لەرێی بارانەوە. خوای گەورە ئەفەرمووێ:

(وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾)[٣٠٧]

ئاوێکی پاک پاکژو پاکتان بۆ دەبارێنین لەشوێنێکی تردا ئەفەرمووێ: موبارەکو پیرۆزە بەڵام بەهۆی دەست کردی بەشەرەوە ئەم بەشەرە کە فەسادی بڵاو کردەوە لەسەر زەوی بەهەموو جۆرێک فەسادی ماددیو مەعنەوی ژینگەی خاپور کرد ژینگەی پیس کرد چ دوکەڵی سەیارە چ دوکەڵی کارگەکانی، راستە یەکێک لەئەرکەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە زەوی ئاوەدان کاتەوە بەڵام نەک خاپووری کات. نابێت بیر لەوە بکاتەوە کە هەر خۆی لەسەر ئەم زەوییە دەژی، بەڵکو بیر لەو نەوانەی دوای خۆی بکاتەوە ژینگەیەکی پاکو خاوێنیان بۆ بەجێ بێڵێ، خۆراک پەیدا بکە کشتوکاڵ، پیشەسازی، تەکنەلۆجیا هەمووی بکە بەڵام لەسەر حسابی پیس بوونی هەوا نەبێت، لەسەر حسابی خاپوور کردنی خاک نەبێت، لەسەر حسابی پیس کردنی وە بەژەهربوونی ئاوەکان نەبێت.

ئەو بارانە پاکو خاوێنەی کە دەبارێ لەناوچەیەکدا کە هەمووی کارگەو دووکەڵە، تێکەڵ بەو دوکەڵە دەبێت و جۆرە ترشەڵۆکێک دروست دەکات بەملیۆنەها بەڵکو

---

(٣٠٦) المرسلات/ ٢٧.
(٣٠٧) الفرقان/ ٤٨.

بــەملیارەها دۆلار زەرەر ئــەدات، وەك لەئــەمریكاو كەنــەدا روویــداوە بــەهۆی كارگەكانیانەوە زۆربەی رووەكـەكانیان لـەناو چوون، زۆربـەی رووبارەكانیـان تێـك چـوون بەنموونـە: لـە ١٨٠٠ – دەریاچـە لەسـوید ئـەمرۆ ٦٠٠ی بـەمردوو حـسابەو مەرجی تەندروستی نییەو ژیانی ئاوی تیا نەماوە، بەهۆی ئەو ترشە بارانـەوە كـە پـێی دەوترێت (ئەسەد رین) (acid rain). خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ ۗ ﴿٢٨٢﴾ ﴾(٣٠٨)

واتـە: لـەخوا تـرس بـن خـوا زانیاریتـان پـێ دەبەخـشێ. مرۆڤـی خوانـاس زانـستی تایبەتی پێ ئەبەخشرێ، چ جای بـاس ئەگـەر یـەكێك نـەك هـەر لـەخواترس بێـت بەڵكو پێشەوای لە خواترسان بێت، لەزەمانی خۆیدا یەكێك هاتە خزمەتی پێـشەوا عــەلی نــەخۆش بــوو داوای چارەســەری لێ كــرد، فــەرمووی: بــڕۆ درهــەمێ لەخێزانەكـەت وەربگـرە لـەو پـارە مارەییـەی كـە پێـت داوە (پێـشەكییەكە) بـا بەگـەردن ئـازایی درهـەمێكت باتـێ، بـچۆ بیـدە بەهـەنگوین، قورئـانی بەسـەردا بخوێنە، ئاوی بارانت هەیە؟ ووتـی: بـەڵێ كۆم كردۆتـەوە. فـەرمووی: تـۆزێ ئـاوی بارانیشی بكە بەسەردا بیخۆ ئینشاءالله چاك ئەبیتـەوە، كـابرا چـاك بـوەوە هاتـەوە خزمەت پێشەوا عەلی (كرم الله وجهه) لێی پرسی قوربان ئـەوە چـی بـوو كـە بـۆت نووسیمو چاك بوومەوە؟

فەرمووی ئەو مارەییەی كە نیـشانەی ڕاسـتگۆیی پیاوەكەیـە بەرامبـەر ئافرەتەكـە، پارەیـەكی زۆر حەڵاڵـە وە كـە بەگـەردن ئـازایی ئـەو درهەمـەت ئـەداتێ بـەو پـارە حەڵاڵە چوویت چیت كڕیوە؟

---

(٣٠٨) البقرة / ٢٨٢.

خۆراکێکت کڕیوە خوا مەدحی ئەکات لەقورئانا، کە هەنگوینە کە ئەفەرمووێ: (فیە شفاء للناس) شیفای تێدایە کە قورئانیشی بەسەردا ئەخوێنی قورئان (شیفای لەش‌و دەروون‌و ڕۆح)

(وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٢﴾)[٣٠٩]

شفایشەو ڕەحمەتیشە. ئەوەشت کردووەتە سەر دەرمانەکە وە پاشان ئاوی بارانت کردووە بەسەردا کە خوای گەورە ئەفەرمووێ: موبارەك‌و پیرۆزە ئەم هەمووە کۆبۆتەوە چۆن چاك نابیتەوە؟!!

بێگومان ئەمە تێگەیشتنێکە لەرێی مامۆستاوە تێ ناگەیت بەڵکو ئەمە زانستێکی حزووری‌و شهودی تایبەتە ئەدرێ بەهەندێك کەس کە خوای گەورە خۆی بیەوێ.

بۆیە ئەبینی یەکێ لەکوڕەزاکانی پێشەوا عەلی کە کوڕی حەزرەتی حسێنە ناسراوە بە زەین العابدین.

ڕۆژێکیان لەکۆڕی خەلیفەدا وابزانم متەوەکیل بووە، متەوەکیل زاناکانی کۆ کردبۆوە پێی وتن: من سوێندێکم خواردووە یان نەزرێکم کردووە ئەگەر فلان شتم بۆ بوو پارەیەکی زۆر ئەکەم بەخێر. (دنانیر کثیرە) جا ئێستا شتەکە بووە. من چەند بکەم بەخێر؟

زاناکان، نەیانئەزانی چۆنی وەڵام بدەنەوە، سەرەی قسە گەشتە سەر ئیمام زەین العابدین ڕەحمەت‌و ڕەزای خوای لەسەر بێت فەرمووی: خوای گەورە لەقورئانا بەهەشتا ئەفەرمووێ زۆر لەقورئاندا واهاتووە (٨٠) دینار بکە بەخێر. ئیتر ڕزگارت ئەبێت لەو سوێندە یان لەو نەزرە.

---

(٣٠٩) الاسراء / ٨٢.

زاناکان روویان کرده زەین العابدین وتیان: کوا ئایەتی وا هەیە لەقورئاندا؟ فەرمووی: بەڵێ هەیە با بۆتان بخوێنمەوە. سەیری ئەم تێگەیشتنە بکەن: ئایەتەکەی بۆ خوێندنەوە:

(لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ﴿٢٥﴾)[٣١٠]

واتە: لەزۆر جەنگدا ئێوەم سەرخست وشەی (زۆر)ی بەکار هێنا خوای گەورە وە ئەفەرمووێ: (ويوم حنين) لەرۆژی (حنين) یشدا ئێوەم سەرخست.

غەزاکان بژمێرن جەنگە سەرکەوتووەکان بژمێرن پێش (حنين) دەبینین (٨٠ ) جەنگە لەبەر ئەوە (٨٠ ) خوا بەزۆری دائەنێ تۆش ٨٠ دیناری ئاڵتون بکە بەخێر.. ئەوانە زانستی (لدنی)ن خوای گەورە بە هەموو کەسیان نابەخشێ.

دێینەوە سەر باسەکەمان: بەڵگەی زانستی ترمان زۆرە، یەکێك لەو بەڵگانەی سەقفی پارێزراو ئەوەیە کەخوا ئەم بەرگە هەوایەی داناوە ئەمان پارێزێ لە تیشکاوەری زیان بەخش، بێگومان کە تیشکی جۆراوجۆر لەخۆرو خۆرەکانی ترەوە دێت ئەوەی کە سوودی هەیە رێی پێدەدرێ بێتە سەر زەوی وە ئەوەی کە زیان بەخشە هەمووی دەرئەکرێت لەرێی بەرگە هەواوە لەرێی ئەو چین و توێژانەی پێشتر ئاماژەمان پێدا.

لەلایەکی تریشەوە ئەمانپارێزێ لەو هەموو بەردە ئاگرینەو نێزەکانەی کە لەهەموو چرکەیەکدا نزیکەی ٥٠ دانە خۆی ئەکا بەم بەرگە هەوایەداو دەسوتێ وە ئێمە ئاسایی دانیشتووینو ئاگامان لێی نییە، ئەم بەرگە هەوایە (سێ سەد)و ئەوەندە کیلۆ مەترە بەرگریمان لێدەکات.. ئەو بەردە ئاگرینانە کە خۆیان دەکەن بەزووردا دەسووتێنرێن وە هیچ شوێنەوارێکیان دیار نی یە بەڵکو بەشێوەی

---

([٣١٠]) التوبة / ٢٥.

سووتویەکی نادیار وردە وردە دەنیشێتە سەر ئەرزو ئێمە هەستی پێناکەین ئەمە هەمووی پارێزگاری کردنە لەلایەن خواوە (سبحانە و تعالی).

مەسەلەی ئەم پارێزگارییە لەلایەن خوای گەورەوە بەم شێوە وردەکاریە تەنها بۆ ئەتمۆسفیرەکە نییە، تەنها بۆ بەرگە هەوا نییە، بەڵکو بۆ دەرەوەی ئەوەشە.

لەگۆڤاری (ساینس ئەند تەکنەلۆجی) ژمارەی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٨٣ باسی خولگەی زەوی ئەکات بەدەوری خۆردا، ئەڵێ: هەموو سوڕانەوەی ١٨ میل زەوی بەدەوری خۆردا ئەگەر بیکەیت بەراستە هێڵێك جیاوازیەکەی لەگەڵ ئەو چەمانەوەدا٢,٨ ملمی مەترە ئەگەر ٠,٣ میللی مەتر زیاد یان کەم بکات لەو چەمانەوە (١٨ میل)ە یان زەوی هەمووی ئەیبەستێ بەهەواکەیەوەو ژیانی تیا نامێنێ یان هەمووی دەبێتە ئاگر.

ملیارەها ساڵە زەوی بەو خولگەیەی خۆیدا دەڕوا بەبێ هەڵە. هەروەها مانگیش، ئەمە راستییەکی زانستییە بینراوە بەچاو بەژمارە حساباتی بۆ کراوە، با بزانین خوا (سبحانەو تعالی) سەبارەت بەم بابەتە چی ئەفەرمووێ:

(وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسۡبَحُونَ ﴿٣٣﴾)[٣١١].

خوای میهرەبان کە شەوو رۆژی دروست کردووە، مانگ و خۆری دروست کردووە، هەریەکێك لەمانە رێچکەی خۆیان هەیە، خولگەی خۆیان هەیە، پیایدا دێن و دەڕۆن وە پۆلیسی هاتووچۆیان نییەو ترافیك لایتیان نییەو بە ملیاردەها هەسارە

---

([٣١١]) الأنبياء / ٣٣.

هەیـە لـەم گەردوونـەدا بەریـەکتر ناکـەون، بۆچـی؟ چـونکە هـەموویان ڕێنمـایی کراون، بەرنامەی خۆیان پێیە، خوای گەورە ئەفەرموێ:

(كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ ﴿٤١﴾)[٣١٢].

دێینە سەر ڕاستییەکی دیکە، زانست دۆزیویەتیەوە کەوا خۆر ٣٣٣٠٠٠هەزار جار لە زەوی گەورەترە، وە بـە بـەردەوامی تەقینـەوەی نـاوکی هایـدرۆجینی تیاڕوودەدات بڵێسەکەی چەند ملیۆن کیلۆمـەتر بەرزدەبێتـەوە لـە خۆرەوە، ڕەنگـی زەردە، ئـەم بڵێـسانە کۆمـەڵێك لـە زاناکـانی ئـەڵمانیا لـەڕێی تەلەسکۆبی فەزائییـەوە توانیـان ڕەسمی بگرن، بۆیان دەرکەوت ئەم بڵێسانە ڕەنگیان زەردە وە ڕەسمیشیان گرت، کە وورد دەبیتـەوە لە وێنەکە بۆت دەرنەکەوێت لە کۆمەڵەحوشترێك ئەچێت کـە ئـەو بڵێسەیە هـەموو چـرکەیەك ئەوەتـەی دنیـا دنیایـە ئـەم تەقینەوەیـە هەیـەو ئـەم شێوەیە هەچ وەختێك ئەو ڕەسمە بگیرێت ئاوا ئەم نموونەی حوشترەت پێ ئـەدات، قورئانی پیرۆز باسی ئەم تەقینەوەیە دەکات خوای گەورە ئەفەرموێ:

(إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ ﴿٣٢﴾)[٣١٣]

ئەو خۆرە پریشکی ئاگرین ئەهاوێژێ فڕێی ئەدات، ئەم بڵێسانە فڕێ ئەدات هـەتا دووری ئەخاتەوە لـەخۆی (جمـال) کـۆی (جمـل)ە یـەعنی حوشـتر وەکـو کۆمـەڵێك حوشتر وەهایـە وە ڕەنگیـشی زەردە، ئایـا پێغەمبـەری خـوا (صـلی اللە علیـە وسـلم) تەلیسکۆبی هـابڵی هـەبووە، هـەزار و چوارسـەد سـاڵ لەمـەوپێش تـا وەصفی ئـەو تەقینەوەیە بکات بەو ڕەنگەو بەو شێوەیە؟

---

([٣١٢]) النور / ٤١.

([٣١٣]) المرسلات / ٣٢.

بەڕاستی ئەوکەسەی فێڵ لەخۆی نەکات وە خۆی غافڵ نەکات یەکێك لەم بەڵگانەی بەسە وە وابزانم کاتی ئەوە هاتووە کە ئەو کەسانەی ئەم ئایات و بەڵگانەی خوایان پشت گوێ خستووە کاتی ئەوە هاتووە کە بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە، داوا ئەکەین کە ئەم بەڵگانە ئیمانمان زیاد بکات، یەقینمان زیاد بکات تا بگاتە ئاستێك ئەو یەقینە، مەعریفەو ئیمانمان زیاد بکات ئەو مەعریفەت و زانستەمان ببێتە هۆی زیادبوونی خۆشەویستی ئێمە بۆ خوای گەورە، ئەو خۆشەویستیەش پاڵپێوەنەرێك بێت بۆ زیادبوونی ملکەچیمان بۆ پەیڕەوی خوای گەورەو گوێ ڕایەڵی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم).

## باسی سی‌و سێ

## فراوانی چەمکی عیبادەت

مـرۆڤ تـامی شـت ناکـات لـەجیهانی ماددیـدا تـا ئـەو شـتە نـەخوات، کـام خواردنە بەلەزەتە نـاتوانی لەزەتەکـەی هەسـت پـێ بکـەی تـا نەیخەیتـە دەمتـەوە، لەجیهانی مەعنەویشدا بە هەمان شێوەیە هەتا ئەو عیبادەتـە جـێ بـەجێ نەکـەی لەزەتەکەی نازانی.

صەحابەکان فـەرموویان ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـەوە سـەلام ئـەزانین ئـەی صـلاە چۆنە؟

فەرمووی: ﴿ قولوا اللهم صلی علی محمد﴾[٣١٤].

(صلاە) سێ مـەعنای گرنگـی تیایـە وە (سلام) دوو مـەعنای گرنگـی تیایـە بەسـێ ووشە ئەیبڕینەوە بەڵام پشت بەخوا لەبیرتان نەچێ با ئەو سەڵەوات دانە هەمیشە لەناو بۆتەی ئەو سێ مەعنایەدا بێت:

مەعنای یەکەم: خۆشەویستیە، ئەی محمد ئێمە تۆمان خۆش ئەوێ.

مەعنای دووەم: مەرجە مەدحی محمد بکەی چیت بیستووە. بۆ ئەو کەسـانەی کـە نەیانبیـستووە باسـی بکـەی. بـۆ ئـەو کەسـانەی بیـستوشیانە چـونکە بیرخـستنەوە سوودی هەیە.

مەعنای سێیەم: پاش خۆشەویـستی‌و مـەدحی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) دوعاکردنە بۆ پێغەمبـەر لەهەموو سەڵەوات دانێکدا ئەم سێ مەعنایە ئامادە بکـە

---

(٣١٤) البخاري مع الفتح ٦/٤٠٧ و ٤٠٨، مسلم ٣٠٦/١.

هەروەکو ئەوەی خوای گەورە پێمان ئەڵێ خۆشتان بوێت مەدحی بکەن دوعای بۆ بکەن.

شوێنێك هەیە لەڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەی بچێتە ئەو شوێنە خوای گەورە دەرەجەی شەفاعەتی پێئەدا پێی دەڵێن (الوسیلە)، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەفەرموێ: (دوعام بۆبکەن ئەو شوێنە بەنسیبی من بێ ئەوەی دوعام بۆ بکات لەدنیا منیش لەو دنیا شەفاعەتی بۆ ئەکەم)[٣١٥]. وە مەعنای سەلام دوو مەعنای گرنگی تیا هەیە:

یەکەم: لەمێشکتا هەمیشە بزانە کە محمد لەهەموو عەیبێ دوورە لەهەموو کەم و کورتیەکی بەشەری، هەموو کەماڵاتێکی بەشەری تیایە دووەم مەعنا: محمد بپارێزن شوێنی کەون دینەکەی سەربخەن ناوەکەی بپارێزن، بیربکەرەوە، لەتەحیاتدا سەلامی تیانییە، (صلى الله عليه وسلم) دوای ئەوە ئەڵێی (اللهم بارك) چونکە صەلاتەکە ئێمە نازانین بیکەین، ئەو خۆشەویستیەی کەلائیق بێ بەپێغەمبەر ئێمە نازانین چەندە ئەو مەدحەی کە پێویستە بکرێ نازانین چۆنە، ئەو دوعایەی کەشایستەی ئەوبێ ئێمە نازانین چۆنە، بۆیە ئەم مەسئەلەیە ئەدەین بەخوای گەورە (صلى الله عليه وسلم) لەتوانای ئێمەدا نییە ئەو صلاتە، تێبینی بکەن لەسورەتی (الاعلی)دا خوای گەورە چوار بەڵگە ئەهێنێتەوە بۆ گەورەیی و قودرەتی خۆی.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣﴾[٣١٦]

---

(٣١٥) صحيح البخاري / كتاب الأذان / ٥٧٩.

(٣١٦) الاعلى / ١-٣.

بڵندی و بەرزیو گەورەیی بۆ ئەو خوایەی کە ئەم گەردوونەی بەهەموو مەخلوقاتێکەوە بەشە زیندەکیەکەیو بەشە نازیندەکیەکەی دروست کردووە، براکانم بڕۆن مێژوو بخوێننەوە: دێیەك نییە لەهەموو مێژوودا لەهەموو جیهاندا کەپەرستگای تیانەبووبێ، ئەمە نیشانەیە کەبەشەر خوای پەرستووە، شارو شارۆچکەی وا هەیە گەرماوی تیانەبووە خەستەخانەی تیانەبووە، ئەشێ شورەی نەبووبێ بۆ بەرگری لەخۆی، ئەشێ کۆشك و خانووی جوانی تیا نەبووبێ، بەڵام شوێنێ نییە لە جیهاندا وە لەمێژوودا پەرستگای تیانەبووبێ، خوای گەورە لەم سورەتا چەمکی تێگەیشتنی خەڵك کۆئەکاتەوە لەوەدا کە هەمووی یەك بەدیهێنەری هەیە، نەك روبار، خواوەندی خۆی هەیەو باران خواوەندی خۆی هەیەو نەخۆشی خواوەندی خۆی هەیەو چارەسەکردن خواوەندیخۆی هەیە، هەمووی ڕاست دەکاتەوە و ئاراستەیان دەکات بۆ یەك خالق، یەك ڕازق، یەك پەروەردگاری ژیێنەرو مرێنەر.

(فسوی) سوی واتە: ڕێك و پێك کردن، ئەم بەدیهێنراوانەی دروست کردووە بەڕێك و پێکی، ئەم هەوایەی کەهەناسە ئەدەین، ئەم بەرگە هەوایە، ڕێژەی ئەو گازانە نزیکەی لەسەدا بیست و یەك ٢١٪ ئۆکسجینەو حەفتاو هەشتی ٧٨٪ نایترۆجینەو جا نزیکەی لە ١٪ ی ١٠ جۆر گازی ترە. ئەگەر دەستکاری ڕێژەکەیان بکرێ ژیانەکە تێك ئەچێ تەماشای هەر گۆشەیەکی ژیان بکە یاسایەکت بۆ دەرئەکەوێ، ڕێك و پێکیت بۆ دەرئەکەوێ:

(ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣)[٣١٧]

---

([٣١٧]) الاعلى / ٢ و ٣.

هەموو شتێ بەپێوانەیە هەموو شتێ بەحسابە هەموو شتێ بەڕێك و پێكییە، (وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ۝٢١)(٣١٨)

لە کتێبێکی (طب)یدا خوێندمەوە کە پڕۆفیسۆرێکی ڕوسی بەناوی (پیترۆف) ئەڵێ: چاوی مرۆڤ ١٥٠ ملیۆن خانەیە، ١٥٠ ملیۆن خانە پەیوەستە بەمێشکەوە بە (٨٠٠,٠٠٠) هەشت سەد هەزار دەمار (٨٠٠٠٠٠) وایەر یەکێ بەریەکێ ناکەوێ، لەکاتی بەخەبەربوونا هەتا ئەنوێ چاوی ئەو مرۆڤە دوو ملیۆن جار وێنە ئەگرێ، ئەم ١٥٠ ملیۆن خانەیە هەمووی هی بینین نییە، هەندێکی هی دیاری کردنی مەسافەیە ئیشەکەی ئەوەیە پێت ئەڵێ: ئەو شتەی سەیری دەکەی ئەوەندە دوورە لێتەوە هەندێکی هی جیاکردنەوەی تەنی جووڵاو و نەجوڵاوە.. تۆ لەدوورەوە یەکێ ئەبینی ئەجوڵێتەوە ئەڕوا ئەبزوێنێت، ئەو خانانە خەبەر ئەنێرن ئەڵێن ئەوەیان ناجوڵێ ئەوەیان ئەجوڵێ، هەندێکی تریان ڕەنگە کە دەگوێزێتەوە.

دێینە سەر گوێ لەدیوی ناوەوەی گوێی مرۆڤ (٤٠٠٠) هەزار تەنی هیلالی هەیە، لەهەموو شەپۆلێکی دەنگدا ئەمانە بەریەك ئەکەون لەڕێی دەمارەکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مێشك، هەروەها تام کردن ئایا شتێ سوێرە، تاڵە، شیرینە، زمانەکە هەستی پێ ناکات بینینەکەش لەچاوا نییە، بۆنکردنە کەلەلووتانییە تەنها گواستنەوەکەی لەوێوەیە. هەر هەمووی ئەڕوا بۆ ژێر مێشك تەنێکی تیایە بەقەد پەنجەیە کە پێی ئەوترێ (قەدی مێشك)، (Brain Stem) (جذع الدماغ) ئەم هەموو ئاراستەکردنە لەوێوەیە، تۆ چاوت داخستووەو دەست ئەدەی لەشتێ گەرمە، ساردە، زبرە، نەرمە، ئەوە هەموو ئەم دەمارانە دەیگوێزێتەوەئەو شوێنە (قەدی مێشك) ئەینێرێ بۆ ئەم بەشە تایبەتەی تەفسیری ئەکات، دەنگەکە جیا

---

(٣١٨) الذاريات / ٢١.

دەکاتەوە، پەرداخ شکاندنێ لەگەڵ دەنگی باوکتا، لەگەڵ هۆڕنی سەیارە. تامی شیرین و تاڵ (وفي أنفسكم أفلا تبصرون) ئەو خواردنەی کەئەیخۆیت هەر کە لەگەدەوە ئەچێ بۆ ناو سەرەتای ڕیخۆڵە ناوچەیەکی پێی ئەوترێ (دیودینۆم) سبحان الله لەماوەی چەند چرکەیەکدا ئامێری وای تیایە، دەماری وای تیایە ئەگەر خواردنەکە چەور بێ خێرا بەمێشك ئەڵێ خواردنەکە چەورە، مێشك خێرا بەزراو ئەڵێ ئەو مادە زەردە دروست بکە. بەڕێژەیەك دروستی ئەکات بەقەدەر ئەو چەوریە کەلەو خواردنا هەیە زراوێکی بچکۆلانە (١٠) دەجار بەقەدەر قەبارەی خۆی ئەو زەرداوە دروست ئەکات. کام وڵات لەجیهاندا خۆی بەپاك و خاوێن دائەنێ لەجارێ زیاتر لەڕۆژێکدا ناتوانێ سەیارەی خۆڵ بنێرێ بۆ کۆکردنەوەی زبڵ و زاڵی ماڵان ئەوە دووجار ناردی توانی سێ جار بینێرێ کەشتی وانییە، بەڵام هەموو دڵۆپەیەکی خوێنی ئێمە (٣٦) سیو شەش جار بەگورجیلەدا ئەڕوات لەشەوو ڕۆژێکدا پاکی ئەکاتەوە، فەزڵی خوا لەسەرمان زۆر زۆرە.

باواز لەئینسان بێنین تەماشای ئەم مەخلوقاتانەی دەوروبەرمان بکەین، کە باڵندەیەك کۆچ ئەکات هەزاران کیلۆمەتر ئەبڕێ ڕێی لێ تێك ناچێت (فهدی) هیدایەتی داوە. هەموومان مریشکمان دیوە کە کڕدەکەوێت بۆچی بەشتێکی سادەی ئەزانی؟ بۆچی یەکەم سێ ڕۆژ ئەو هێلکەیە دەستکاری ناکات؟ بۆچی دوای ئەوە ئەمدیوو ئەو دیوی ئەکات؟ بۆچی ئەخیر سێ ڕۆژیش نایجوڵێنێ؟ کێ پێی وت؟ چۆن ئەزانێ کە پێویستی بەوەندە گەرمییە؟ کە زۆر گەرم ئەبێ دوور ئەکەوێتەوە لێی کەهەست ئەکات هێلکەکە ساردە ئەچێتەوە سەری ئەمە هیدایەتی خواییە. سەیری ڕێژەی ئاژەڵ بکە کە زاوزێ ئەکەن، بۆچی لەکەروێشکدا زۆرە لەپڵنگدا کەمە؟

(ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠)[٣١٩]

هیدایەت یەعنی چی؟ هیدایەت دوو جۆرە: جۆرێکیان پێی ئەوترێ هیدایەتی بەڵگە. جۆرێکی تر پێی ئەوترێ هیدایەتی یارمەتی ئەم جۆرەی کە باسمان کرد هیدایەتی یارمەتییە.بەڵام بۆ مرۆڤ یەکەم جار خوای گەورە هیدایەتێکی گشتی ئەدات (عام) تایبەتی نییە، گشتی بۆ هەموو مرۆڤ موسڵمانە کافرە مادام بەشەرە موکەللەفە ئامێری وای داوەتێ کەخوا بناسێ (فیطرە)ی داوەتێ، منداڵێ بێنە هیچ دەرسێکی وەرنەگرتووە هیچ شتێ فێر نەکراوە زیندەوەرێ لەبەردەمیا سەرببڕەو سەیری دەم و چاوی کە بزانە چۆن تێك ئەچێ.

شتێکی چاك بکە لەبەردەمیا بزانە چۆن ئەگەشێتەوە، بۆچی؟! ئەو نرخی خێرەی کەلەو منداڵەدا یەکێ پێ‌ی‌دا؟ بەجوان بڵێ جوانەو بەناشیرین بڵێ ناشرینە، بەچاك بڵێ چاکەو بەخراپ بڵێ خراپ، کێ پێی ووت؟! ئەوەیە (فیطرە)ی پاك  کە خوای گەورە ئەیدات بەمناڵ، ئەیدات بەبەشەر، ئینجا ئەقڵ ئینجا شعور بۆچی؟ چونکە ئەمە تەکلیفی لەسەرە. ئەگەر هاتوو ئەم ئامێرانەی بەکارهێنا بۆ دۆزینەوەی (حەق) ئەوساکە خوای گەورە هیدایەتی یارمەتی ئەدات. وەك پێغەمبەر ئەفەرموێ (صلی الله علیه وسلم): ﴿ لو أنکم توکلتم علی الله حق توکله لرزقکم کما یرزق الطیر تغدوا خماصا وتروح بطانا ﴾[٣٢٠] ئەگەر بەڕاستی پشت ببەستن بەخوای گەورە ڕزقتان بۆ ئەبارێنێ وەك باڵندە بەیانیان لەهێلانەکەیان ئەڕۆنە دەرێ بەبرسیەتی ئێواران بەتێریەتی ئەگەڕێنەوە. هیدایەتی خوای گەورە بۆ ئەو

---

([٣١٩]) طه / ٥٠.

([٣٢٠]) سنن ابن ماجة / کتاب الزهد / ٤١٥٤. مسند أحمد / رقم (٣٤٨).

مەخلوقانە هیدایەتێکی تایبەتە. ئەگەر بەشەر پشتی بەست بەخوای گەورە، خوای گەورە بەو جۆرە هیدایەتی ئەدات.

جارێکیان بەحەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی (سەلامی خوایان لێ بێ) یان ووت، قوربان رۆژێ لەرۆژان نەماندی دەست بەڕووی یەکێکەوە بنێی هەرچی داوای شتت لێ ئەکات ئەیدەیتێ، جاری وایە نیتە ئەچیت قەرزی بۆ ئەکەیت، هەرچی سوالکەرێ دێتە بەردەمت بێئومێد نابێ لێت بۆچی؟ فەرمووی: من خۆم سوالکەرم لەخوای گەورە ئایا پێم خۆشە خوا جوابم نەداتەوە؟ عادەتێکم هەیە لەگەڵ خوا هەرچی شتێ داواکەم ئەمداتێ منیش هەمان عادەت بەکارئەهێنم لەگەڵ مەخلوقاتی خوا، ئەوەیە خواناسین ئەوەیە تەوەکلی ڕاستەقینە.

خوای گەورە لەقورئاندا ئەفەرموێ:

﴿وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾﴾[٣٢١].

ئەوەی پەنا بەرێ بۆ دینی خوا، خوای گەورە هیدایەتی ئەدات ئەیخاتە سەر ڕێی ڕاست:

﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١﴾﴾[٣٢٢].

ئەوەی ئیمانی ڕاستەقینە بهێنێ بەخوای گەورە، خوای گەورە هیدایەتی ئەدات، ئێمە خۆمان بە ئیماندار ئەزانین، شێخی گەیلانی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) ئەفەرموێ: کە ئەڵێی (لا اله الا الله) ئەوە ئیدعا ئەکەی فریشتەکان پێت ئەڵێن بەڵگەکەت کوا؟ ئەبێ بەڵگەکەت کردەوەی چاك بێت، سەیری قورئان بکە:

---

([٣٢١]) آل عمران / ١٠١.

([٣٢٢]) التغابن / ١١.

﴿الذين أمنوا وعملوا الصالحات﴾[٣٢٣]

هەمیشە ئیمان لەگەڵ کرداری چاکدا هاتووە نزیکەی (٣٦٠) سێ سەدو شەست جار ووتراوە لەقورئاندا. هاوکێشەیەکە ئەگەر ئیمانت بەرز بۆوە، وەڵلاهی کردارت چاک ئەکەیت. ئەگەر کرداری چاکت کرد وەڵلاهی ئیمانت بەرز ئەبێتەوە. قانونێکی خوایی هەیە لەو کردارە چاکانەدا، کرداری چاک پێش هەموو شتێ (عیبادەتە) چونکە هەموو گفتارێك هەموو کردارێك، هەموو هەڵوێستێك خوا پێی خۆش بێت پێی ئەوترێ (عیبادەت).

(تعبد) بریتییە لەنوێژو ڕۆژوو حەج و زەکات ئەمە گۆڕەپانی (تعبدە). گۆڕەپانێکی ترمان هەیە، گۆڕپانی ئەمر بەچاکەو نەهی لەخراپە، لەوەش ئەتوانی عیبادەت بکەی گۆڕەپانێکی ترمان هەیە گۆڕەپانی بیرکردنەوە.

﴿وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾﴾[٣٢٤]

ئەم ئایەتە حەزرەتی پێغەمبەر ئەفەرموێ: ﴿ويل لمن لاكها بين فكيه ولم يفكر في معناها أوكما قال﴾ وەیل شیوێکە لەجەهەنەم بۆ ئەو کەسەیەکە ئەم ئایەتە ئەخوێنێ‌و بیری لێ ناکاتەوە.

کەواتە گۆڕەپانی بیرکردنەوەش جۆرێکە لەعیبادەت ئینجا ویژدان و شعورو هۆش و دەرك و هەستانە هەمووی عیبادەتە. تەنانەت هەموو کڕین و فرۆشتنێکت هەموو شتێکی موباح هەر ئەونیەتەی لەگەڵدا بێ ئەویش ئەبێ بەعیبادەت.

---

([٣٢٣]) لەچەندین شوێنی قورئانی پیرۆزدا هاتووە وەك: (سورەتی البقرة / ٨٢، ٢٧٧، آل عمران ٥٧، النساء / ١٧٣/١٢٢/٥٧، المائدة /٩٣/٩)... هتد.

([٣٢٤]) آل عمران / ١٩١.

نوستنەکەت ئەبێ بەعیبادەت لەشەرع دا شەرم نییە چوونە لای خێزانەکەت ئەبێتە عیبادەت

﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾﴾[٣٣٥]

ئەگەر عیبادەت هەر نوێژ بێ خوای گەورە ئێمەی بۆ نوێژ دروست کردبێ لە ٢٤ سەعاتەکا بە نیوسەعات ئێمە هەر پێنج فەرزەکە ئەکەین، ئەی بیست و سێ و نیوەکەی تری؟ ئەگەر عیبادەت زەکات بێ ساڵێ جارێکە ئەیدەی. ئەگەر ڕۆژوو بێ یانزە (١١) مانگەکەی تر ئەی چییە؟ ئەگەر حەجیش بێ لە عومرا یەك جارە. ئەمە مەفهومێکی زۆر تەسکە بۆ عیبادەت ئەو عیبادەتەی خوا ئەیەوێ یەعنی هەموو ساتێکت پەیوەندیت هەبێ لەگەڵ خوای گەورەدا.

لەو مەسائلی عیبادەتانە لەو بەڵگانەی کە ئەیسەلمێنێ تۆ ئیمان داریت (ڕەوشتی جوانە) ڕەوشتی جوان کە پێغەمبەر ئەفەرموێ ﴿ أثقل ماڤي الميزان﴾[٣٣٦] قورسترین کرداری چاك لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەوشت بەرزییە وە ئەفەرموێ نزیکترینتان لەمەجلسی من لەڕۆژی قیامەتا ﴿ محاسنكم أخلاقا ﴾[٣٣٧] ئەوانەی ڕەوشتیان بەرزە ڕەوشت بەرزی شتێکی کەمالیات نیە لەدنیاکەماندا ئەساسی شەریعەتەکەمانە، لەنوێژدا کەکۆڵەکەی دینە بزانە پێغەمبەر چی ئەفەرموێ: ﴿من لم تنهه صلاته عن الفحشاء والمنكر لم نزده من الله إلا بعدا﴾[٣٣٨] ئەوەی نوێژەکەی دووری نەخاتەوە لەفسق و فجور دووری نەخاتەوە لەبێ شەرعی

---

([٣٣٥]) الذاريات / ٥٦.

([٣٣٦]) عن أبي درداء عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: ما اثقل شئ في الميزان يوم القيامة خلق حسن، مسند أحمد / كتاب مسند القبائل / رقم (٢٦٢٧٥).

([٣٣٧]) مسند احمد / رقم (١٧٠٦٦).

([٣٣٨]) مسند الشهاب / الجزء ١ / ص٣٠٥. (كشف الخفاء) الجزء /٢/ ص٣٦٤.

هەموو نوێـژێکی ئەومنـدە دوور ئەکەوێتـەوە لـەخوای گـەورە. خـوا ئەفـەرموێ

﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ (٤٥)﴾[٣٢٩]

ئەمە رووە ئەخلاقیەکەیەتی لەنوێژدا. لەزەکاتدا زەکات روویـەکی ئـەخلاقی زۆر بەرزی تیایە ئادابی هەیە نابێ ئەو زەکاتە بدەی بە فەقیر پێی بڵێی هانێ رێو شوێنی هەیە بیدەتێ ئەبێ دەستت دانێی ئەولێت بسەنێ. چونکە پاکت ئەکاتـەوە ئـەبێ دەستی ئـەو لەدەستی تـۆ بـەرزتر بـێ نـابێ شعوری بریندارکەی بانـەزانێ خێری پێ ئەکەی. زەکات حەقە حەقی هەژارە لای تـۆ بۆیـە لەدەوڵەتی ئیـسلامدا خـۆی زەکاتـە کـە دابـەش ئـەکات بـۆ ئـەوەی ئـەو شـعور برینـدار کردنـە نـەبێ، واجبێکی حکومەتیە ئەوە تەوزیعەکەی خۆی ئەزانێ کێ هەژارەو کێ هەژار نییـە. لەرۆژوودا رووبەکی ئەخلاقی بەرزی تیایـە. لەفەرموودەیـەکی پێغەمبـەردا (صلى الله عليـه وسـلم) ئەفـەرموێ ﴿رب صـائم لـيس لـه مـن صـيامه الا الجـوع﴾[٣٣٠] چەندین کەس هەیە لەرۆژووەکەیانـدا تـەنها ئـەجری ئـەومیان بـۆ ئەنووسـرێ کـە ئاوو خواردن و خواردنەومیان نەخواردوە، یـەعنی چاوی لـە حـەرام نەپاراستووە، گوێی لە حەرام نەپاراستووە، زمانی لە حەرام نەپاراستووە، ئەمانە هەمووی رووی ئەخلاقیە. لەحەجدا خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلْحَجِّ ۗ (١٩٧)﴾[٣٣١]

ئەو رووە سلبیەی بەزمان دروست ئەبێ جنێودانە غەیبەت کردنە، درۆکردنە، ئەو خراپەکاریەی بەزمان ئەکرێ (مجادله) کردنە ئەمانە نابێ لەحـەجا بکـرێ، ببینـە

---

([٣٢٩]) العنكبوت / ٤٥.

([٣٣٠]) تحفة المحتاج / الجزء ٢ / ص٩٤. رواه النسائي وابن ماجة والحاكم وقال على شرط البخاري.

([٣٣١]) البقرة / ١٩٧.

سەر جهاد ئیتر ئەمە جەنگە چەند فەرمووده هەیە باسی چی ئەکات (ئەسیر نەکوژن، پیر نەکوژن، درەخت نەبڕنەوە، کشتوکاڵ نەسوتێنن، ئاژەڵ نەکوژن) ئەوە ئەو پەڕی ئەخلاقیاتە لەحاڵەتی شەڕدا، کە بەپێی (ئەحکامی عورفی) یاسا نامێنێ لە شەڕدا بەڵام لای ئێمە ئەمێنێ. لەئیسلامدا شتێ نییە پێی بوترێ (عونفی ثوری) ستەمی شۆڕشگێڕی ئەم میللەتە ستەمی زۆر لێکراوە، با زوخاوی خۆی برژێنێت نەء شتی وانییە لەئیسلامدا.

لەکۆتایدا کاتەکەمان کەمە فەرموودەیەکی پێغەمبەر هەیە (صلی الله علیه وسلم) ئەفەرموێ ﴿ما یُصیب المسلم من نصب ولا وصب ولاهم ولا حزن ولا غم ولا أذی حتی الشوکة یشاکها إلا کفر الله بها من خطایاه﴾[٣٣٢] خۆگرتن ئەویش جۆرێکە لەکردەوەی چاك. وە ووتمان صڵاوەت دان جۆرێکە لەکرداری چاك، رەوشتی بەرز ئەویش جۆرێکە لەکرداری چاك. کرداری چاك ناژمێرێ ئەمەندە زۆرە ووتمان هەر هەڵوێستێك هەر قسەیەك هەر کردارێك خوای گەورە پێی خۆش بێ عیبادەتە، کردەوەی چاکە بەمەرجێ بۆ خوا بێ بەمەرجێ لەسنوری شەریعەت دەرنەچێ.

ئەم فەرموودەکە باسی صەبر ئەکات: ئەڵێ: هەچ هیلاکیەك تووشی ئیماندار بێ گوناهی لێ ئەوەرێنێ.

کەواتە تا زیاتر ماندووبی زیاتر خوای گەورە لەگوناهت خۆش ئەبێ چونکە موسڵمان لەناحەقدا هیلاك نابێ. موسوڵمان هەمیشە خەریکی خەیرە هەموو جۆرە نەخۆشییەك خوای گەورە گوناهی ئەو ئیماندارەی پێ ئەوەرێنێ بەنیسبەت ئیماندارەوە قسە ئەکەین ئەمە تایبەتی موسڵمانە بەڵام غەیری موسڵمان

---

([٣٣٢]) بە چەند مەتنێك هاتووە ، لە (صحیح البخاري) الجزء ٥ / ص٢١٣٧. عن ابي سعید الخدري. مسند أحمد / الجزء ٣ / ص١٨ و ص٣٣٥.

نەخۆشیش بێ ئەکەوێ و هیچ ئەجرێکی بۆ نانووسرێ کەواتە: هەتا نەخۆشیەکە زۆرتر بێ ئازاری زۆرتربێ زیاتر گوناهی ئەوەرێنێ زیاتر بمێنێتەوە زیاتر گوناهـ ئەوەرێنێ.

(ولاهم)یەعنی مەراق مەراق چییە؟ شتێکە پەیوەندی هەیە بەداهاتووەوە مەراق ئەکەی برایەکت رۆیشتوە نەهاتۆتەوە خۆشەویستێکت رۆیشتوە ئەترسێ شتێکی لێ بێ ئەوە گوناهـ وەرینە بەو مەراقە.

(ولا حزن) خەفەت پەیوەندی بەچ کاتێکەوە هەیە؟ پەیوەندی بەرابردووەوە هەیە، شتێ کەرووی داوە. موسیبەتێکت بەسەرا هاتوە خەفەتی داوە پێت. هەموو جارێ کەئەو خەفەتەت بیر ئەکەوێتەوە بەمەرجێ بڵێی:

( إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾)[٣٣٣]

هەموو جارێ خوای گەورە ئەجرێکی زۆرت بۆ ئەنووسێ و گوناحێکی زۆرت بۆ ئەوەرێنێ. (ولاغم) غم: پەیوەندی بەرانەبردوەوە هەیە دڵتەنگی، دڵتەنگی جاری وا هەیە هۆکاری هەیە جاری وا هەیە هۆکاری نییە. کاممان دڵمان تەنگ نابین؟ هەموو دڵتەنگیەك گوناهـ وەرینە انشاء الله.

(ولا أذى) أذى: یەعنی عەزیەتدانی جسمی بێ، یان نەفسی بێ، بەجسم عەزیەتت بدەن یان بەووشە عەزێتت بدەن تیرت تێ بگرن، گاڵتەت پێ بکەن، کەسایەتیت بشکێنن، کرامەتت بشکێنن، غەیبەتت بکەن، هەمووی گوناهـ وەرینە، (حتى الشوكە یشاكها) تەنانەت دەست بەری بۆ گوڵێ درکەکەی بچێ بەدەستتا گوناحت ئەوەرێ.

---

([٣٣٣]) البقرة / ١٥٦.

**باسی سیو چوار**

**دڵت بکەرە نشینگای خۆشەویستی خوا**

**پێغەمبـەری خۆشەویـست ﷺ لەفەرموودەیەکـدا ئەفـەرموێ: سـەیرم لەوکەسـە دێت کـە فریـای ڕەمـەزان ئەکـەوێت و تەوبـە ناکـات، ئـەو ڕەمەزانـەی کەهـەمووی بەرەکەتـە، ئـەو ڕەمەزانـەی کـە پێغەمبـەری خـوا لەفەرموودەێکـدا ئەفەرموێ: (من صام رمضان ایماناً واحتساباً غفر له ما تقدم من ذنبه)[٣٣٤].**

**ئەوەی لەبەر خوا بەڕۆژوو بێ لەڕەمەزانا وە بەتەمای ئـەجرو پاداشت بـێ، خـوای گەورە لەهەموو گوناهێکی خۆش ئـەبێت. لەفەرموودەیـەکی تـردا (صلی الله علیـه وسلم) ئەفەرموێ: ﴿وسلسلت الشیاطین﴾[٣٣٥] ئەگـەر ڕەمـەزان هـات شـەیتانەکان ئەبەسـترێنەوە، کەلەبـچە ئـەکرێن. باشـە ئـەی بۆچـی ئێمـە گوناهـ کـار ئـەبینین لەڕەمـــەزانا؟ بۆچـــی خـــەڵکی گوناهـــ ئـــەکات لەڕەمـــەزانا؟ گـــەر شـــەیتانەکان بەسترابێتنەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کەسەرچاوەی گوناهـ دووانـە: نـەفس لەگەڵ شەیتان.**

**بـۆ نموونـە: ئـەوەی سـەوزەو میـوەی دانـاوە جوانەکـەی لەپێـشەوەیەو گـەنیوە خراپەکەت بۆ دائەنێ، فێڵت لێ ئەکات، یان دزی ئەکات، هـەر دەرفـەتێکی بـۆ بلوێ دزیەکەی خۆی ئـەکات. ئـەم جۆرە گوناهانـە کە بەچاو ئـەیبینین پەیوەنـدی بـە شەیتانەوە نییە، ئەوە دەروونی ئەو مرۆڤـە نەخۆشـە، گرفتەکە لـەئیمان و لـەدڵی**

---

**([٣٣٤]) صحیح البخاري / کتاب الایمان / رقم (٣٦) و (١٧٦٨). مسند أحمد / رقم (٢١٧٠٠).**

**([٣٣٥]) إذا دخل شهر رمضان فتحت أبواب السماء وغلقت أبواب جهنم وسلسلت الشیاطین. / عن ابي هریرة / صحیح البخاري / کتاب الصوم / ١٧٦٦.**

ئەوکەسایە کە ئەم کردارانە ئەکات پەیوەندی بە شەیتانەوە نییە. باشە ئێمە چۆن گوناهـ جیا بکەینەوە. بڵێین ئەم گوناهە سەرچاوەکەی شەیتان بوو، ئەم گوناهە سەرچاوەکەی نەفسی ئینسان بوو؟ زۆر ئاسانە جیاکردنەوەیان ئەو گوناهەی کە بەردەوامەو یەك جۆرە ئەوە هی نەفسە. چونکە شەیتان قەت ڕازی نییە بەیەك جۆر لە گوناهـ، هەمیشە کە گوناهێکی بچوکت پێ دەکات دوای ئەوە گوناهی گەورەترت پێ ئەکات وە هەروەها بەم چەشنە. بەڵام بزانە کەخوا (جل جلالە) ئینسانی دروست کردوە (هێزی)ی داوەتێ عزەتی داوەتێ، تەکریمی کردووە بەعەقڵ و بەڕۆحێکی تایبەت و ئامادەیی تایبەتی داوەتێ:

﴿فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ٤﴾ [٣٣٦] ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ٧٠﴾ [٣٣٧]

کردوویەتی بەسەرکردەی مەخلوقاتەکان بەڵام خۆی کەبەوویستی خۆی وازئەهێنێ لائەدا، ئەوساکە شەیتان یاری پێ ئەکات. ئەو شەیتانەی کەلەڕۆژی قیامەتا چی ئەڵێ بەخوای گەورە وەك قورئان بۆمان باس ئەکات:

﴿وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ ٢٢﴾ [٣٣٨]

ئەڵێ هیچ جۆرە دەسەڵاتێکم نەبووە بەسەرتانا تەنها بانگم کردوون ئێوە وەڵامتان داومەتەوەو بەقسەتان کردووم ئەمڕۆ لۆمەم مەکەن لۆمەی خۆتان بکەن. خوای گەورەش مژدانە مان ئەداتێ لەقورئانا ئەفەرموێ

---

([٣٣٦]) التين / ٤.

([٣٣٧]) الاسراء / ٧٠.

([٣٣٨]) إبراهيم / ٢٢.

﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ﴿٤٢﴾﴾[٣٣٩]

واته: ئەوانەی ئەمپەرستن لە بەندەکانی خۆم ئەی شەیتان تۆ دەسەڵاتت نییە بەسەریانا. کەئەڵێین: شەیتان ئیتر سەربازەکانیو داروودەستەی لە مرۆڤ و پەری (جن) هەمووی ئەگرێتەوە. خوا مژدەمان ئەداتێ ئەوانە دەسەڵاتیان نییە بەسەرتانا لەوانەیە لەحاڵەتێکی غەفڵەتدا هەندێ خەیاڵ و شتت بۆ بێنێ ئەوە شتێکی زۆر سروشتییە بەڵام خێرا هۆشت دێتەوە بەر خۆت خوای گەورە کە وەصفی ئیمانداران ئەکات کە بێ گوناه نین ئەفەرموێ:

﴿إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِّنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ﴾[٣٤٠]

کەشەیتان دێ بۆ لایان خەیاڵ و شتێکیان بۆ دروست ئەکات لەنەفسیانا خێرا هۆشیان دێتەوە بەخۆیاناو خەبەریان ئەبێتەوەو چاوی دڵیان ئەکەوێتە گەڕ. تەنها لەحاڵەتی غەفڵەتدا شەیتان زەفەرت پێ ئەبات. ئینسانیش بەچی بەرگری لەخۆی ئەکات بەئیسلامەتیەکی ڕاستەقینە، ئیسلامەتی چییە؟ باوەکو ئەو حکایەتەی کەچەند جارێ باسمان کردووە[٣٤١] پێنج نابینا لەشوێنێکدا ئەژیان ناڵێم (حافظ) چونکە نابینا هەیە (حافظ) نییە (حافظ) یەعنی قورئانی لەبەرە. یەکێکیان نەخۆش ئەبێو گوێیان لەهاوارێك ئەبێ (فیل، فیل) چوارەکەیان ئەڕۆنە دەرێو دێنەوە نەخۆشەکە پێیان ئەڵێ: فیل چییە؟ یەکەم کەس ئەڵێ: وەك پێستێك وایە (دەستی داوە لەگوێی). دووەمەکە دێتە ژووری: ئەڵێ: فیل وەك ڕم وایە (دەستی داوە لەکەڵبە درێژەکەی کە پێی ئەڵێن (ناب) بەگۆچان لێیداوە

---

([٣٣٩]) الحجر / ٤٢.

([٣٤٠]) الاعراف / ٢٠١.

([٣٤١]) لە (مثنوي) مەولانا جلال الدینی رۆمی دا هاتووە.

زرنگـەی هـاتوە شـتێکی زۆر پتـەوە لەئێـسقان زۆر بـەهێزترە ئـەڵێی پۆڵایـە نوکەکەشی تیژە، هەر ئەڵێی ڕمە). کابرای نەخۆش نەیئەتوانی گونجانێك دروست کات لەنێوان ڕم لەگەڵ پێست دا. ئەم ناسکە و ئەمیش شتێکی پتەوو.سێهەم هاتـە ژووریٚ ووتـی: وەکو قـەدی دار وایـە (دەسـتی بردبـوو بـۆ قاچـی). چوارەم هاتـە ژووریٚ، ووتـی: (وەکو پـەت و گـوریس وایـە). دەسـتی بردبـوو بـۆ کلکی ئایا فیـل پەیوەندی هەیە بەم شتانەی باسمـان کـرد؟ ئـەوەی کـەداخڵی کۆلیـژی ئەنـدازیاری ئـەبیٚ یەکـەم جـار چـی فێـر ئەکـەن؟ زانـستێکی فێـر ئەکـەن (دروسـت کردنـی نەخشە)ی پێی ئەڵێن فێری نەخشەیان ئەکەن لەسەر زەوی، ئینجا دوای ئەوە ئـەو بینایەی کە هەڵزناوە بە ئاسماندا نەخشەکەی چۆنە؟ لەپێـشەوە چـۆن ئـەبینریٚ؟ لەلاکانـەوە چـۆن ئـەبینریٚ؟ لەسـەرەوە چـۆن ئـەبینریٚ؟ لـەدواوە چـۆن ئـەبینریٚ. واتە: یەك بینا چەندین نەخشەی هەیە. یـەکێکیش شـارەزا نـەبێت وائـەزانیٚ ئـەم نەخشانە هی بینای جیاجیان.

ئەندازیاری لێهاتوو لەهـەج لایەکـەوە سـەیر بکـات ئـەتوانیٚ نەخـشەی ئـەو بینایـە بکێشێت. جا نموونەکەمان بۆ مەبەستی تێگەیـشتن بـوو لـە ئیـسلام ئـەم ئیـسلامە عەزیمەی ئێمەش، گوناهـە لەگۆشـەیەکی تەسـکەوە وەصـفی بکـەین، ئـەم ئیـسلامە گەورەیە کـە ئیـسلام مەبەسـتم دینـی خوایـە لەحـەزرەتی ئادەمـەوە تـا حـەزرەتی پێغەمبەر (صەلات و سەلامی خوایان لیٚ بیٚ).

گوناهە ئەم ئایینە گەورەو گرنگـە کۆکەیتـەوەو بڵێـی بریتییـە لەنوێـژ و لـەڕۆژوو رووبینای بچوك ئەمە دروست نەکات، دێینـە سـەر پێناسـەیەکی پێغەمبـەر (صلی اللە علیە وسلم) ئەو چۆن پێناسـەی ئیـسلامی کـردوە، پیاوێـك چـەندین پرسـیاری لەپێغەمبەر کرد (علیە صلاە وسلام) یەکیٚ لەو پرسیارانە چی بـوو (مـن الاسلام)

ئیسلام چییە؟ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: ﴿أن یسلم قلبك لله وأن یسلم المسلمون من لسانك ویدك﴾[٣٤٢].

پێناسەیەکی جوانە، دڵت تەسلیمی خوا بێت وە موسڵمانان پارێزاوبن لەزمانت و لەدەستت. دوو برگەیە فەرموودەکە. پێناسەکە دوو بەشە بەشێکیان (باطن)ە ناوەوەی خۆتە، خودی ئیمانەکەتەو بەشێکیشیان: هەڵس و کەوتەکەتە (ڕەفتارو گفتار) جا بێین، بەو پێوەرە ئیسلامییە لەخۆمان بپرسینەوە (حاسبوا انفسکم قبل أن تحاسبوا)[٣٤٣] موحاسەبەی خۆمان بکەین ئەو ئامێرە بێنین کە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) بزانین تا چ ڕادەیەك ئیسلامەتی چۆتە دڵمانەوە، وە تا چ ڕادەیەك جێ بەجێمان کردووە، ئیمان نوورێکی خواییە: ئەبێ بچێتە دڵەوە پاشای ئەندامەکان دڵە شوێنگەی ئیمانە، کۆشکە، کۆشك گەر سەقفی نەبێ پێی ناوترێ کۆشك، خانووێك ئەگەر دەرگاو پەنجەرەی نەبێت ئەو کەسانەی کەلەناویدا ئەژین ئەشێت ڕووبەڕووی دزیو سەرما ببنەوە، هەروەها ئیمانیش کەلەناو دڵێکی شەق و شڕا بێت ئەو ئیمانە بریندار ئەبێت، ئەو ئیمانە ڕائەکات لەودڵا. لەبەر ئەوە پەیکەری دڵ کەبەتەواوەتی تەسلیمی خوای گەورە بێت ئەبێت چەند صیفەتێکی تیابێت کە پێیان ئەوترێ صیفاتی (صەمەدانی) صیفاتی خوایی صیفاتی ڕەبانی. پەیوەندیەکان لەگەڵ خوا (جل جلاله) یەکەم: (اخلاص)ە دڵێك دڵسۆزی تیا نەبێت قەت ئیمان نایەتە ناویەوە. دووەم خۆشەویستی خوای گەورە، خۆشەویستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، حەیاو شەرم لەخوای گەورە، ترس لەخوای گەورە، ناسینی خوای گەورە، تکاو داوا لەخوای گەورە پشت بەستن (توکل) بەخوای گەورە، خۆگرتن لەسەر نەهامەتیو

---

([٣٤٢]) بەمەتنی کەمێك جیاواز لە مسند أحمد / ژمارە (١٤٤٦٥) هاتووە.

([٣٤٣]) ئەمە گوفتارێکی جوانی (عومەری کوڕی خەتتاب)ە.

ناڕەحەتی خوایی، ڕەزابوون بەقەدەری خوای گەورە، تەوبەکردن. ئەمانە صیفاتن، مەرجە لەدڵ هەبن ئینجا ئیمان دێتە ناویەوە، ئینجا ئەو دڵە شایستەیە بۆ ئەوەی ئیمان ببارێ بەسەریا، ئیمان بێت بحەوێتەوە لەناویا. ئەمە مەرجی یەکەمی فەرموودەکەیە ئایا ئێمە ئەمانەمان تیایە؟ یان تێکەڵمان کردووە ترسی خواو خەڵك و شوێن و... لەناو دڵمانایە. تکاو داوامان لە کەسی تریش هەیە جگە لەخوای گەورە، پشت بەستنمان بەغەیری خواش هەیە، کە دڵەکە ئاوا دوولایەنی تیابوو ئیمانی ڕاستەقینە نایەتە ناویەوە.

ئەم صیفاتانەی باسمان کرد، مەرجی یەکەمی فەرموودەکەیە، یەکێك لەمانە کە مادام لەناو دڵایە و دڵیش ووتمان پاشای ئەندامەکانە، هەمووی، ئەبێتە گفتارو ئەبێتە کردارو ئەدرەوشێتەوە پێویستە بدرەوشێتەوە لەژیانی ڕۆژانەماندا، هەر خاڵێك لەمانە بەکۆباسێکی تایبەت و جیاواز تەواو نابێ بۆ نموونە: خۆشەویستی خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

جابر کە بەعبدالله ی کوڕی ئەڵێ لەغەزای ئوحودا: کوڕی خۆم تۆ بمێنەرەوە لای خوشك و دایکت. بامن شەهید ببم. ئەڵێ: باوکە بۆ هەموو شتێ بەقسەت ئەکەم بەڵام ئەمە بەهەشتە بەهەشت. ئەمە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەیەتی. یەعنی ئەم صیفاتانە لەناو دڵیانا بەتەنیا بەشێوەیەکی (نظري) نەبووە، بەڵکو بووەتە حاڵ لە کردارو گوفتاریاندا..

لەزەمانی (صلاح الدینی ئەیوبی)دا (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە کۆتایی هێنا بەجەنگێکی (١٩٧) ساڵی خاچ پەرستەکان کە فەلەستینیان داگیرکردبوو. لەو ماوە دوورو درێژا ئیسلام شەش سەرکردەی هەبوو، پێنجیان تورك بوون، دواهەمینیان کوردبوو عەرەب موشەڕەف نەبوو بەسەرکردایەتی لەو (١٩٧) ساڵەدا ئەو (صلاح الدینی ئەیوبی)یە کە ئەم هەموو نەخشە جوانەی دانا بۆ ڕزگار کردنی قودس،

لێیان پرسی چۆن (قودس)ت ڕزگار کرد؟ فەرمووی: بەشەو نوێژ ئەو صیفاتانەی کە باسی ئەکەین بەپاڕانەوەو بەتەوبەکردن. بەڵام ئایا هۆکاری، بەجێ هێشتووە، نەخێر! کتێب بخوێننەوە بزانن چ هۆکارێکی گرتووەتە بەر، بەجلی قەشەوەو بەخاچی ملەوە چەندەهای ناردووە بۆ ئەوەی بچنە قودسەوە. ئاوها مەفرەزەی خستۆتە ناویانەوە.

هۆکارەکانی هەموو جێبەجێ کردووە. هێزی ئەو وەختەی هەموو بەکارهێناوە، بەڵام پشت بەستنی سەرەکی تەنها خوای گەورە بووە. فەرمووی بدەن لەیەك شوێن با ئەو دیوارە بڕوخێ هەتا دەلاقەیەك کەوتە شورەی قودسەوە ئەوانیش هەموو ڕمەکانیان هێنا بۆ ئەوەی کەس نەیەتە ژوورێ، (صلاح الدین) فەرمووی: با یەك کەس بەقەڵغانەکەیەوە خۆی بکات بەناویانا ئێمەش دوای ئەکەوین. قسەکەی تەواو نەکرد برادەرێك خێرا بەپەلە بەقەڵغانەکەی چوو بەناویاناو ئەمانیش بەدوایا خوای گەورە ئەو ئینسانەی کرد بەسەبەب کە قودس ڕزگاری ببێ. (١٩٧) ساڵ جەنگ کۆتایی هات. گەڕا بەشوێنیا پاش دوو ڕکعەتی نوێژی شوکر، پرسی کێیە؟ کەسێك نەبوو بیناسێ خەڵاتی بکات، پاشان نامەیەکی بۆ هات کە تیایدا نووسرابوو (ئەو کەسە بۆ خۆئاشکراکردن سێمەرجی هەیە. یەکەمیان: ناوی نەڵێی بەکەس. دووەمیان: هیچ خەڵاتێکی نەکەی. سێیەم: هیچ پلەو پایەیەکی نەدەیتێو نزیك خۆتی نەخەیتەوە.) هەر ئەو نامەیەو بەس، تا ئەمڕۆش کەسێ نییە بزانێ ئەو مەردە دڵسۆزە کێ بوو؟ ناوی چی بوو؟

مێژوو ئەو کابرایە ناناسێ ئەمەیە دڵسۆزی. قودس پاش (١٩٧) ساڵ ڕزگاری نەبێت، نازانێ کێ ڕزگاری کردووە، ئەمەیە ئیخلاص..

مەرجی دووەم لەفەرموودەکەدا ئەوەیە کە موسڵمانان پارێزراوبن لەزمان و دەستت، ئەو پێوەرە بێنە بیخەرە دڵتەوە موحاسەبەی خۆت بکە لەبچوکترین

بازنەی ژیانی کۆمەڵایەتی کە خێزانە بیرکەرەوە لەناو خێزانەکەدا عەزیەتی چەند کەست داوە بەزمان و دەستت، ئەگەر سەرکردەی خێزانەکەیت چەند جار عەزیەتی ژنەکەت داوە؟ عەزیەتی منالەکانت داوە؟ ئەگەر ئەندامێکی لەو خێزانە چەند جار عەزیەتی باوکت و دایکتت داوە؟ عەزیەتی خوشك و برات داوە؟ بەزمان و دەستت. بازنەکە فراوانتر کە بۆ سەر دراوسێ و گەڕەك، فراوانتری کە بیکە بەهەموو کۆمەڵگەکە لەدائیرەکەتا لەقوتابخانا لەبازاڕدا. ئایا مەرجی ئیسلامەتییەکە بەتەواوەتی تیامانا هەیە؟ ئەو ئەخلاقە ڕەببانیەی کەباسمان کرد لەچەند کەسدا هەیە. زیان نەدات لەموسڵمانان بەزمان و بەدەست لەچەند کەسدا هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەس نییە بێگوناح بێت کەس نییە بێتاوان بێت خوای گەورە قاپی ڕەحمەتی کردۆتەوە، ئەوەی نائومێد بێ لەخوای گەورە نیشانەی کوفرە (نعوذ بالله)

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ ﴿٥٣﴾﴾[٣٤٤]

هەموو گوناحەکان ئەسڕێتەوە، بەمەرجێ بزانی چۆن ئەو سکاڵایە بەرز ئەکەیتەوە بۆ خوا کە ئەڵێی (استغفر الله) ئەوە سکاڵاکەت نووسی، بەڵام تەوبە سکاڵاکە ئەگەیەنێ بەخوا. (استغفر الله) ئیقرار ئەکەی دان بەوەدا ئەنێی ئەڵێی فلان کردارم هەڵە بوو خوای گەورە، ئەشیکەیتەوە، ئەوەپێی ئەڵێن (تەوبەی درۆزنان). بەڵام تەوبە سێ مەرجی هەیە: یەکەمیان: هەست بەپەشیمانی بکەیت، هەست بەتاڵیەك بکەیت لەدڵتا هەرچەند گوناحەکەت بیر ئەکەوێتەوە مووچڕکەت پیا بێت عەرەق بڕێژی ئەوە مەرجی یەکەمە، ئەگێڕنەوە: یەکێ لەهاوەڵەکانی موسا لەهەموو غەزاکاندا لەگەڵیابوو، کەوەفات ئەکات موسا دوعای

---

([٣٤٤]) الزمر / ٥٣.

بۆ ئەكات ئەفەرموێ: خوای گەورە لەم وەلیە خۆش ببە. خوای گەورە جبرەئیل ئەنێرێو ئەفەرموێ: ئەمە لەناو دۆزەخدایەدوعای بۆ ئەكەیت، ئەفەرموێ:چۆن خوایە لەگەڵما بووە لەهەموو غەزاكانا؟! ئەفەرموێ: كەباسی ڕابردووی ئەكردو باسی گوناحەكانی ئەكرد پێئەكەنی واتە: مەرجی تەوبەی تیانەبووە. مەرجی دووەم: پاش پەشیمانی ڕاگرتنی ئەو گوناحەیە. مەرجی سێیەم: پەیمان بدەیت بەخوای گەورە تاماوی نەچیتەوە بەلای ئەو گوناحەدا. ئەم سێ مەرجە جێبەجێ بكە ئەوە لەو گوناحە خۆش ئەبێ بەڵام لەگوناحی تر خۆش نابێ كەدیاریت نەكردووە. بەڵام ئەگەر بگەیتە حاڵەتێك دابنیشی بیر بكەیتەوە لەهەموو گوناحەكانت فلیمی هەموو ژیانت لێ بدەی بە (استغفر الله) وە بەپەشیمانییەوە هەموو حاڵەتێ كەدێتە بەردەمت ئەو زوڵمانەی كە كردووتە بەزمان، بەدەست، بە پشت گوێ خستن، چونكە ئەمە گوناحەكەی زۆر زیاترە لە (فاحیشە) كردن، ئەمانە كە دێت بەبەردەمی چاوی دڵتا ئەگەر هەمووی پەشیمانیەكی گشتی بۆ بكەیت پاشان نیەتێكی وابێنی بڵێی خوایەگیان بەو پەڕی پەشیمانییەوە بەو پەڕی ئیرادەوە كەئیتر لەمەودوا ئەوەی فەرزە بیكەم وە ئەوەی حەرامە نەیكەم، وە پەشیمانم لەهەموو گوناحێ كە كردوومەو هەموو گوناحێ كە بیرم نییە، وە هەموو گوناحێ كە نەمزانیوە گوناحە، بگەیتە ئاستێك كە پێی بووترێ (نیۀ عامۀ للتوبە) نیەتێكی گشتی بێنی خوای گەورە تەوبەیەكی گشتی ئەبارێنێ بەسەرتا انشاء الله تەنها حەقی خەڵكی نەبێت.

پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ئەفەرموێ: (الحجّ مبرور لیس لهُ جزاءُ إلاّ الجنة) واتە: حەجی قبوڵ كراو بەو مەرجانەی كە هاتووە بكرێ هەریەكەو بریتی شتێك ئەكەوێت، وەك: بریتی گوناحی چاو ئەمە بریتی گوناحی دەستە ئەمە بریتی گوناحی زمانە ئەو ڕەجمانەی كەلەشەیتانەكان ئەكرێ. كەدەست ئەدات لە (الحجر

الاسود)ەوە پەیمان ئەدات بەخوای گەورە، خوای گەورە لەگوناحی خۆش ئەبێ بەلاّم ئەگەر هاتوو دووبارەی کردەوە ئەوانەیشی بۆ زیندوو ئەکاتەوە، خوای گەورە تەوبەکاری زۆر خۆش ئەوێ بەتایبەت (گەنج)، گەنج چونکە توانای مەعصیەتی زۆر زیاترە لەپیر (أحب ثلاثة وحبي لثلاثة اشد)[٣٤٥] سێ جۆر خەڵکم خۆش ئەوێ فەرموودەیێکە ماوە نابێ باسی کەین، بەلاّم یەکێکیان (تەوبەکارانە) خوای گەورە ئەفەرموێ: خۆشم ئەوێن بەلاّم گەنجەکانیانم زیاتر خۆش ئەوێن.

---

([٣٤٥]) بەم مەتنە (... الثلاثة الذين يحبهم الله...) لە (المستدرك على الصحيحين) الجزء ١ / ص٥٧٧ دا هاتووە.

# باسی سی‌و پێنج
# عیبادەتی خوا لە بەرژەوەندی کۆمەڵدایە

**خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ**

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾[346]

**ئایینی ئیسلام وە ناردنی محمد المصطفی (صلی الله علیه وسلم) رەحمەتە بۆ مرۆڤ و پەری، ڕەحمەتی ئیسلام کە کافرانیشی گرتۆتەوە، ئاژەڵی گرتۆتەوە، رووەکی گرتۆتەوە، هەموومان باوەڕ ئەکەین کەشەریعەتی خوای گەورە هاتووە بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ هاتووە، بۆ خێری دنیا وە خێری قیامەت وە دوور خستنەوەی شەڕ لەتاك و لەکۆمەڵ وەهێنانی خێر بۆ تاك وبۆ کۆمەڵ، بەڵام لای خەڵك بەگشتی‌و لای زۆر موسڵمان ئەم باوەڕە تۆوێکە ئاو نەدراوە، زانیاریەکە تەنها لەسەر زمانەو دەوترێت: شەریعەتەکەمان خێری ئینسانی ئەوێو زەرەری ناوێو ... هتد، هەموو بەزمان ئەیڵێین بەڵام ئەبێ بەئاوی هوشیاری (وعی) ئاو بدرێ، بۆ ئەوەی ببێتە زانست و حاڵ، حاڵ لەڕوانگەی ئیسلامەوە یەعنی نور، نورێکە خوای گەورە ئەیخاتە دڵی خۆشەویستانی خۆیەوە، ئەو دڵە رۆشن ئەبێتەوە، پاشان ئەو مەعریفەو حاڵ ونورە لەکردارو رەفتاریا دەرئەکەوێ، خۆی سوودی لێ وەرئەگرێ، ئەوانەی لەدەوروبەریدان سوودی لێ وەرئەگرن، زانستی حەقیقی ئەبێ ئاوەها بێت، ئەگینا زانستی سەر زمان بێ بەرەکەتە هەرچی مەعلوماتێکمان هەیە**

---

(346) الأنبیاء / ١٠٧.

سەبارەت بەشەریعەتی خوای گەورە بابیگەیەنینە ئاستێك کەببێتە حاڵ و زانست ببێتە نورو هەر قسەی سەر زمان نەبێ، ئامانجی شەریعەتی خوای گەورە (٥) مەبەستی سەرەکی هەیە، دین واتە شەریعەتی خوای گەورە هەوڵ ئەدا بۆچی؟

یەکەم: بۆ گەیاندن و چەسپاندنی بەهاکانی ئاسمان یەعنی عەقیدەو رەوشت بۆ دڵی هەموو مرۆڤێك.

دووەم: پاراستنی ژیانی ئینسان واتە: پاراستنی نەفسی ئینسان.

سێهەم: پاراستنی عەقڵی ئینسان گەشە پێدان و پاراستنی لەهەموو جۆرە گومانێ وەلەهەموو جۆرە دەردێ.

چوارەم: پاراستنی شەرەف و ناموسی ئینسان.

پێنجەم: پاراستنی سامانی مرۆڤ.

ئەم پێنج مەبەستە شەرعیە هەمووی لەبەرژەوەندی تاك و کۆمەڵدایە، یەکەمیان: بیروباوەڕە، ئیمانە، ئایینە، شەریعەت هەوڵئەدا ئایینبچێتە دڵی هەموو ئینسانێکەوە وەهەموو ئینسانێ جێ بەجێی کا، گرنگترین میکانیزم بۆ چەسپاندنی ئەم دینە لەعیبادەتەوەیە وەگرنگترین عیبادەت نوێژە، با ئەم عیبادەتانە شیتەڵ بکەینەوەو بزانین تا چ رادەیەك لەبەرژەوەندی ئینسانایە، لەبەرژەوەندی کۆمەڵایە، چونکە: نەخۆشیەك هاتووە لە ئایینە دەستکاری کراوەکانەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەڵێ: عیبادەت بریتییە لەپەیوەندی ئینسان لەگەڵ خوای خۆیدا بەڵام لای ئێمە نەخێر، بریتیە لەپەیوەندی ئینسان لەگەڵ خوای گەورەو لەگەڵ کۆمەڵا بەگەیاندنی خێرو بەرەکەت بۆ کۆمەڵ، بەرژەوەندی مرۆڤ دووبەشە، بەشێکیان دوورخستنەوەی زەرەروزیانە، بەشەکەی تریشی هێنانی خێرو بەرەکەتەو سوود پێ گەیاندنە، ئایا لەعیبادەتا ئەم دوو مەرجە هەیە؟ ئایا ئەو مەبەستە شەرعیانە (ئەو پێنج خاڵەی کە باسمان کرد) ئەم

مەرجانەی تیایە؟ بەڵێ لەهەموویاندا هەیە خوای گەورە لەقورئانا سەبارەت بەنوێژ دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ ﴿٤٥﴾﴾[٣٤٧]

نوێژ ئینسان دورئەخاتەوە لەهەموو کارێکی ناڕەوا، کەواتە: لە ڕێی نوێژەوە تاکەکەس دوور ئەکەوێتەوە لەهەموو زەرەرو زیانێک واتە: کۆمەڵیش دوور ئەکەوێتەوە لە زەرەرو زیانی ئەوتاکە کەسەی کە نوێژ دەکات.

ئەمە بەشی یەکەمی بەرژەوەندیەکەیە بەشی دووەمیش کە سوودو دەستکەوتە... مەگەر خوای گەورە خۆی بزانێ چەندە!! تۆ پەیوەندی ئەکەی بەپەروەردگارەوە کەلامی خوا بەکار ئەهێنی، بۆ گفتوگۆ لەگەڵ (الله) ئەبێ پاداشتەکەی چەندبێ! ئەبێ سوودی قیامەتەکەی چەندبێ، کە ئەچیتە سوجدەوە پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ ﴿أقرب مايكون العبدُ من ربه وهو ساجد﴾[٣٤٨] نزیکترین حاڵ لەگەڵ زاتی خوای گەورە حاڵەتی کڕنووشە ئەوپەڕی ڕێزو گەورەیی خوا پیشان ئەدەی، چۆن ئەمە بەبێ سوودی قیامەتی بەسەرتدا گوزەر ئەکات!؟

ئینجا بێینە سەر فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێ: (صلاة الجماعة أفضل من صلاة الفذ بسبع وعشرين درجةِ)[٣٤٩] واتە: نوێژێکی جەماعەت خێرو پاداشتی زیاترە لەنوێژێکی تاکەکەس بە (٢٧) پلە، باشە با بیری

---

([٣٤٧]) العنكبوت / ٤٥.

([٣٤٨]) صحيح مسلم / كتاب الصلاة / رقم (٧٤٤).

([٣٤٩]) متفق عليه. بە مەتنی (بخمس وعشرين درجة)ش هاتووە لەلای (البخاري) في الصحيح / كتاب (شعب الايمان) الجزء ٣ / ص٤٨.

بکەینــەوە ئەگــەر نوێــژ تــەنها مەبەســتەکەی ئــەوەبێ پەیوەنــدی بکــەی بــەخوای گەورەوە خۆ تاکە کەسەکە پەیوەندی کردوە بـەخوای گـەورەوە، ئەگـەر مەبەسـتی ئــەوەبێ کــەلامی خــوا بــەکاربهێنێ تاکــە کەســەکە لەنوێــژە کــا کــەلامی خــوای بەکارهێناوە قورئانی خوێندووە سـوجدەی بـردووە، ئـەی بۆچـی لێـرا ئـەم نوێـژی جەماعەتە (٢٧) جار زیـاترە، ئـەبێ هۆیـەکی تیاهـەبێ ئـەگینا ٢٧ جار لـەو باشـتر نابێ، هۆیەکەی بـوونی ئەوتاکەکەسـەیە لـەناو کۆمەڵەکـەیا بـۆ ئـەوەی خێـر بـدات بەکۆمــەڵ هۆکارەکـەی ئەوەیــە خێرەکـەی (٢٧) پلەیـە کـە تـۆ خێـرت بـچێتە نـاو کۆمەڵـەوە، ئایـەتێ ئـەزانی بـلاوی کـەرەوە ئەمـە فـەرموودەی پێغەمبـەری خوایـە (صلى الله عليه وسلم) فەقیر ئەدۆزیتەوە بەهۆی جەماعەتـەوە دەوڵەمەنـد فـەقیر ئەناسێ، دەسەڵات دار بێ دەسـەڵات ئەناسـێ لـەناو ئـەو جەماعـەتا پرۆسـەی کامـڵ بـوون دروسـت ئـەبێ بۆشـایی‌و پێویـستی یـەکتری پڕئەکەنـەوە، کەواتـە: بۆمـان دەرکەوت کە نوێژ خێری تاکەکەسی تیایەو خێری کۆمـەڵی تیایـە تاکەکـەس دوور ئەخاتــەوە لەشــەڕ وە کۆمــەڵ دوور ئەخاتــەوە لــەزەرەرو زیــان، بــەلام! حاڵــەتی وا هەیە ئەو (٢٧) پلەیە بەتاڵ ئەکاتەوە، حاڵەتێ کە موسڵمانێ (سیر)ی خواردبێ یان پیــاز یــان کــەوەر هــەر مادەیــەك کــە بــۆنی هــەبێ بۆچــی؟ بیربکــەرەوە؟ لێــرەدا جەماعەتەکەی کردووە!! ئەی بۆ خێرەکەی بۆ نانوسرێ؟ چونکە زەرەرئەدا!! بزانە نوێــژ چــەند گەورەیــە!! چــەند پەیوەســتە بەکۆمــەڵگاوە!! کــە خێــرت هەیــە بــۆ کۆمەڵگا بچۆ بەجەماعەت، خێرەکەت لە ٢٧ پلە زیـاترە کـە خێـرت نیـیەو شـەڕت هەیە نەچیت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفـەرموێ سـەبارەت بـەو بابەتە ﴿من اكل من هذه الشجرة فلا يقربن مسجدنا﴾[٢٥٠] واتە: ئەوەی لەو شتەی خوارد بێ مەبەستی لەو (سیر)ە، بێ گومان زاناکان ئەڵێن پیاز، کـەوەر، هەرشـتێك

---

([٢٥٠]) صحيح البخاري / كتاب الطعمة / رقم (٥٠٣١). هەروەها صحيح مسلم / رقم (٨٧٣).

ئەو سیفەتە زیان بەخشەی هەبێ بۆنەکەی ئیزعاج بێ بۆ نوێژ کەران هەمان حوکمی هەیە (فلا يقربن مسجدنا) ئەوەی ئەو شتەی خواردووە بانزیکی مزگەوتەکەمان نەبێتەوە، لەریوایەتێکی ترا (من اكل من هذه الشجرة شيئا فلا يقربن أولا يصلين معنا)[٣٥١] نزیکمان نەبێتەوە، لەگەڵمان نوێژ نەکات، کەواتە: بۆمان دەرئەکەوێ ئەو عیبادەتانەی کەئەم شەریعەتە پیرۆزە نەخشەی بۆ کێشاوە خوای گەورە وای داناوە هەمووی لەبەرژەوەندی ئینسانایە، هەمووی زەرەر لەئینسان دوور ئەخاتەوە، زەرەر لەکۆمەڵ دوورئەخاتەوە وە ئینسان و کۆمەڵ ئەخاتە ناو سوودو قازانجەوە.

وەرە سەر ڕۆژوو، ڕۆژوو کەلە رەمەزانا فەرزە بیربکەرەوە هەر لەکۆمەڵگایەکی ئیسلامی وەرگرە، بۆ نموونە: لەسەدا چەندی پیرە رۆژووی بۆ ناگیرێ بەژن و پیاوەوە؟؟ لەسەدا چەند نەخۆشن نەخۆشی یەکی هەمیشەییان هەیە، ئەویش رێژەیەکی زۆری هەیە، رێژەیەکیش تووشی سەفەرێك ئەبن تووشی عوزرێکی شەرعی ئەبن، هەندێکیش لەو مانگانەدا نەخۆش ئەکەون ڕۆژێ دوورۆژ زیاتر یان کەمتر، ئەمە کە فارەتەکەی چییە؟ کەفارەتەکەی ئەوەیە ئینسانی برسی تێر ئەکەی ئینسانی فەقیر تێرئەکەی، ئایا سوود لەوە زیاتر هەیە؟ کەواتە نەك هەر نوێژ و ڕۆژوو سوودێکی کۆمەڵایەتی هەیە وە هەر هەموو ئەوەی نەخۆش کەوتووەو نەخۆش نەکەوتووە ئەوەی بەڕۆژوو بووەو ئەوەی بەڕۆژوو نەبووە مەرجە سەرفترەکە بدات، خێرێکی راستەوخۆ بۆ فەقیرو هەژار، ئەم شەریعەتە حەز ئەکەین ئاوا هەموو کەس بیکاتە عیلمێك (نوربێ) لەدڵیا بەقەناعەتەوە بزانێ کەهەموو فەرموودەیەك هەموو ئایەتێك بەرژەوەندی ئینسان و کۆمەڵی تیایە وەئینسان دوور ئەخاتەوە، کۆمەڵ دوورئەخاتەوە لە زەرەرو زیان. وەرە سەر

---

([٣٥١]) مسند أحمد / باقي مسند المكثرين / رقم (١٢٤٦٩).

حەج دوو ملیۆن کەس ساڵانە دەچن بۆ حەج، دوو ملیۆن کەس بەچی چوون؟ بەفڕۆکەو بەپاپۆڕو بەسەیارەو... هتد چەند هەزار کەس سوودی وەرگرتووە لەگواستنەوەی ئەم دوو ملیۆن کەسە؟ بۆتە مایەی ڕزق و ڕۆزی چەند هەزار کەس، ئەم دوو ملیۆن کەسە نان ئەخۆن چەند هەزار کەس سوود وەرئەگرێ لەفرۆشتنی ئەو خۆراکە لەلێنانی ئەو چێشتە گەیاندنی ئەو خۆراکە بەو دوو ملیۆن کەسە، جگە لە خزمەتەکانی تر خوای گەورە لەقورئانا دەفەرمووێ: ﴿لِّيَشۡهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمۡ ﴿٢٨﴾﴾[٣٥٢] بڕۆن بۆ حەج بۆ ئەوەی سوود وەرگرن، سوودی دنیاو قیامەت، وەك سوودی ڕۆحی لەو حاڵەتە تەوبەیەو ئەو حاڵەتە خۆشییەو ئەو شیرینییە ئیمانیە کە لە کێوی عەرەفاتەوە دەبارێتە سەر دڵی ئەو حاجیانە جگە لەو دەرس و حەلەقاتی دەرس بەهەموو زمانێ ئەوترێ ئەوە هەمووی سوودە جگە لەویەکترناسینەی کەلەگەڵ خەڵك و میللەتانی دنیادا ساز ئەکرێو کەلوپەل ئەکڕێت و دەهێنرێتەوە بۆ ماڵ و منداڵ و دۆست و ناسیاو.

وەرە سەر زەکات پارەیەکی ڕاستەوخۆیە ئەیدەی بەموحتاج ئەویش لەخزمەتی کۆمەڵدایە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چەند درهەمێکی بینی بۆنێکی خۆشی پێوە بوو بە عائیشەی ووت: عائیشە ئەم درهەمانە چین لێرا فەرمووی: یارسول الله ئەمە زەکاتی خۆمە، فەرمووی: ئەی بۆچی بۆنی واخۆشە؟ ووتی: یارسول الله تۆ فەرمووت ئەوەندە موبارەکە پارەی زەکات یەکەمجار دەچێتە دەستی قودرەتی خوای گەورەوە ئینجا ئەچێتە دەستی فەقیرەکە، حەزم نەکرد بێ عەتر بچێتە دەستی خوای گەورەوە عەترم پێوە کرد! ئەمە ئەدەبێکە لەئادابی زەکات دان هەر ئەوەنییە تۆ پارەکە بگەیەنیتە ئەو فەقیرو هەژارە،

---

([٣٥٢]) الحج / ٢٨.

بەڵكو مەرجی هەیە ئەبێ شعور وهەستی بریندار نەكەی بڵێی براكەم خوشكەكەم ئەمە پارەی حەقی تۆیە لای من تكات لێ ئەكەم لێم وەرگرە دەست دائەنێی ئەو لێت وەرگرێ، ئەبێ دەستی ئەو بەرزتر بێ لەتۆ چونكە ئەو ئەبێتە هۆكار بۆ پاك بوونەوەی گوناهت ئاوا زەكات ئەدرێ. لەو عیبادەتانەی تر كە فەرز نییە خێراتە:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ﴾[٣٥٣]

ئەی ئیماندارینە خێرو خێراتتان بەتاڵ مەكەنەوە بەمنەت كردن بەعەزیەت دان بڵێی هانێ!! كاتێ پارەكەی دەدەیتێ لێی تورە ببیت!! یان بیڵێیتەوە بیكەی بەمنەت بەسەریا!!! بەم جۆرە بەتاڵ ئەبێتەوە.

بڕوانە ئایەتەكە كە خوا دەفەرموێ (لاتبطلوا) واتە بەتاڵی مەكەنەوە خێرو خێراتتان بەمنەت كردن، ئەو خوایەی كە ئەوی هەژار كردووە بەلەحزەیەكیش وا لەتۆ دەكات ئەگەر بیەوێ، لەبەر ئەوە هەج عیبادەتێ تەماشابكەی بەرژەوەندی مرۆڤ بەرژەوەندی تاك و كۆمەڵی تیایە، هەر هۆكارێك ببێتە مایەی گەیاندنی حەقیقەتێكی خوایی بۆ دڵی ئینسان ئەو هۆكارە دەبێتە هۆكارێكی شەرعیو خوا پێی خۆشە وە بەپێچەوانەش دەبێتە كۆسپ بۆ گەیاندنی، ئەبێ بوەستێنرێو ئەبێ لابرێ، پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ (صلى الله علیە وسلم) (المرءُ علی دین خلیلە فلینظر احدكم من یخالل)[٣٥٤] واتە: مرۆڤ لەسەر دینی هاورێكەیەتی،

---

([٣٥٣]) البقرة / ٢٦٤.

([٣٥٤]) بەم شێوەیەی مامۆستا هێناویەتی لە (مسند أحمد) ژمارە (٨٠٦٥)دا هاتووە. بەمەتنی (الرجل....)یش لن سنن الترمذي / كتاب الزهد / رقم (٢٣٠٠) وسنن ابي داود بە ژمارە ی (٤١٩٣) / كتاب الأدب هاتووە.

دەتەماشاکەن بزانن هاوڕێکانتان کێن، لێکۆڵینەوەی دەروون ناسی ئەم سەردەمە لەگەڵ ئەم فەرموودەدایە، بەهۆی ئاڵوگۆڕی ئەو خۆشەویستییەوە، مەبدەئیش ئاڵوگۆڕ دەکات، ئینجا ئەم حاڵەتە: حاڵەتی هاوڕێیەتی سەلبیو ئیجابیشە ئەگەر باش بوو خاوەن دین بوو ئەو باشیەیو ئەو دینەی ئەگوێزرێتەوە بۆت ئەگەر- نعوذ بالله - دینەکەی خراپ بوو لاواز بوو ئەو لاوازیە ئەو خراپیە ئەگوێزرێتەوە بۆ تۆ، لەبەرئەوە خوای گەورە ئامۆژگاری ئەم حاڵەتانەمان دەکات ئەفەرموێ:

﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ﴿٢٨﴾﴾[٣٥٥]

ئەمە کە فرمانێکە بۆ پێغەمبەری خوا فرمانێکیشە بۆ ئێمە واتە: خۆڕاگربە، ئارامت هەبێ، لەگەڵ ئەو کەسانە بژی کەروویان کردۆتە خوای گەورە کە هەمیشە زیکری خوا دەکەن وە نازیشیان هەڵگرە، چیان ئەوێ بۆیان جێبەجێ کە لەئایەتێکی تردا :

﴿فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا ﴿١٠٣﴾﴾[٣٥٦]

ئولفەت و موحیببەتی خستە نێوان ئێوە، وە ئێوەی کرد بەبرا، برایەتی نیعمەتێکی زۆر گەورەیە برایەتیە پاڵت پێوە ئەنێ بۆ چەندین چاکەکاری لەگەڵ تاك و لەگەڵ گشتدا دین بگەیەنی بەو کەسانەی هەستی دینداریان لاوازە، چونکە

---

([٣٥٥]) الكهف / ٢٨.

([٣٥٦]) آل عمران / ١٠٣.

**هەست ئەکەی ئەرکێکی سەرشانت جێبەجێ ئەکەیت ئەو دینەی بەپوختی پێ بگەیەنیت، فەرمانێکی خوایە:**

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوٓا۟ أَنصَارَ ٱللَّهِ ۝١٤﴾[٣٥٧]

**لەقیرائەیەکیشدا ﴿أنصاراً لله﴾ ئەی ئیمان دارینە نوصرەتی خوا بکەن واتە: ئایینی خوا سەربخەن، کە بەو شێوە خۆتت سەرخستووە... ئەم سەرخستنە چۆن ئەکرێ؟ ئەوەی عەقیدەکەی تەواونییە فێری بکە، ئەوەی کە هەڵە دەکات هەڵەکانی بۆ راست بکەرەوە، ئەوە سەرخستنی دینی خوایە، ئەو مەعریفەتەی کە ئەیزانی ئەوەی کە خوا پێی بەخشیوی، ئەو زانیاریەی کەهەتە بیگەیەنە باکەمیش بێ، پێغەمبەر ئەفەرموێ: (بلغوا عني ولو آية) وەك لەپێشەوە باسمان کرد. ئەم دینە بگەیەنن با یەك ئایەتیش بزانن، لەهەمان کاتدا دەفەرموێ: دوورکەونەوە لەو کەسانەی کەخراپن**

﴿فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا﴾[٣٥٨]

**دووربکەوەرەوە لەو کەسەی لە خوا دورکەوتۆتەوە وە باوەشی کردووە بەدنیا، ئەگینا ئەو نەخۆشیە دەروونیانەی ئەگوێزرێنەوە بۆ تۆ، لەئایەتێکی ترا دەفەرموێ:**

---

([٣٥٧]) الصف / ١٤.

([٣٥٨]) النجم / ٢٩.

﴿وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾﴾[٣٥٩]

بەگوێی ئەو کەسە نەکەی دڵی غافڵە لەئیمان، دڵی بەتاڵە لەئیسلامیەت، دڵی بەتاڵە لەناسینی خوای گەورە، دڵی بەتاڵە لەشەرم لەخوای پەروەردگارو دڵی بەتاڵە لەخۆشەویستی خواو پێغەمبەر وەشوێن ئارەزوو نەفسی خۆی کەوتووە، بەگوێی نەکەی سەرگەردان ئەبی، هەروەها لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَـٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱلْكَـٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾[٣٦٠]

واتە: ئەگەر لەدانیشتنێکدا.. لە کۆڕێکدا.. بەگاڵتەوە باس لەئایەتەکانی خوا کرا ئەو دانیشتن و کۆڕە بەجێبهێڵە

ئەگینا خوا وەك ئەوان تەماشات ئەکات :

﴿إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱلْكَـٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾﴾[٣٦١]

---

([٣٥٩]) الكهف / ٢٨.

([٣٦٠]) النساء / ١٤٠.

([٣٦١]) النساء / ١٤٠.



ئەوەی وای وتووە بێ باوەڕە کە تۆش دانیشی لەگەڵیان دووڕوو دەبیت خوای گەورە بێ باوەڕ و دووڕوو بەیەکەوە کۆدەکاتەوە لەناو دۆزەخدا.. تێبینیەکی گرنگ: گوفتوگۆ کردن و پەیڤین (حیوار) شتێکی چاکە ئەگەر لەئاستی زانستدابێ، بەلۆژیك بە (کتاب منیر) ئەمە پەیڤینی

﴿بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ ﴿١٢٥﴾﴾ [٣٦٢]

ە ئەمە ڕاگۆڕینەوەی شەرعیە، من دێم لەگەڵ هەر کەسێکا کەبیەوێ (حیوار) بکا ئەم سستەمە مەعریفیەی خۆمی بۆ ئەکەمەوە وەك کتێبخانەیەك، ئەویش ئەیکاتەوە، ئاڵوگۆڕی ئەم زانست و زانیاریە ئەکەین بزانین حەق لای کێیە، بەڵام ئەو بیەوێ سیستەمە پیرۆزەکەی ناوەوەی من دەستکاری بکات، من نایەڵم، تۆش نەبێ نەیەڵی، هەندێ شت هەیە پیرۆزە دانانەوێ بۆ ململانێی جەدەل و لێکۆڵینەوە.

---

(٣٦٢) النحل / ١٢٥.

## باسی سی‌و شەش
## روانگەی تر بۆ عیبادەتی خوا و بەرژەوەندی کۆمەڵ

بەردەوام دەبین لەسەر باسی رابردومان کە پەیوەندی بە مەبەستێکی تری شەرعیەوە هەیە، کە شەریعەت نەفس دەپارێزێ، پێشتر ئاماژەمان پێداوە کە لە گوتاری پێغەمبەردا (ﷺ) لە (حجه الوداع)دا باس کراوە کە خوێنی موسڵمان، شەرەفی موسڵمان، موڵك و سەروەت و سامانی موسڵمان، حەرامە بۆ یەکتر تاقیامەت زوڵم و تەعەددا حەرامە تارۆژی قیامەت، ئەم شەریعەتەش هاتووە بۆ پاراستنی نەفسی موسڵمان، ژیان بەمەفهومی ئیسلامەتی ئەبێ پڕبێ لەکەرامەت، لەئاشتی، لەهاوکاری، لەخۆشەویستی، پڕبێ لەدادپەروەری، ژیانێك کە ستەمی تیابوو پێی ناوترێ ژیان، لایق نیە بەئینسان، ژیانێك خۆشەویستی تیانەبێ، تامی ژیانی تیانیە، ژیانێك ئاشتی تیانەبێ بەمەفهومی ئیسلامی شیاو نییە بەئینسان، دەسەیری دەوروبەری خۆت بکەو نەخشەی جیهان بخەرە بەردەمت چ ناوچەیەك ململانێو شەڕو ستەمگەریو ئاشوبی تیانییە؟! تێبینی بکە: سادەترین شت رادیۆ، رادیۆ کە جیهازێکە پەیوەندیت پێ ئەکا لەگەڵ دونیادا بۆچی ٣٪ی رادیۆ لەو ئەفەریقا گەورەدابێ بەڵام ٤٣٪ی لەئەمەریکا دابێ؟ ئەفەریقا کە چواریەکی دانیشتوانی سەر زەوی پێك دەهێنێ لەوێدا چل و ئەوەندە دەوڵەتن ٣٪ رادیۆ ئامادەیی هەیە!!! لەسەد کەسی ئەفەریقا تەنها پێنجیان رادیۆیان بەرئەکەوێ!! میلیۆنەها مناڵیان لێ دەمرێ لەبەر نەبوونی ڤاکسینی (لوقاح) کە پێی بکوترێن دژ بەشەلەل و کۆکە ڕەشەو سورێژە... لە حەفتاکانساڵانە (نۆ ملیۆن) مناڵ مردوون دەرمانەکەش بایی چەندە؟ بایی سەد فلسی ئێمەیە!! بێینە سەر

تەلەفزیۆن، هەموو ماڵێك لەئەمەریكا دوو تەلەفزیۆنی بەردەكەوێ، حكومەتی ئەمەریكی (وەزارەتی تەندروستی ئەمەریكی) ئەو دەرمانو ڕێگا چارانەی وەزارەتەكە ئەیكا بۆ یەك كەس كە نەخۆش بێ بە دەردی (H.I.V) ئایدز، بۆیەك هاوڵاتی خۆیان زیاترە لەبودجەی وەزارەتی تەندروستی چەند وڵاتێكی ئەفەریقی، بەئێمە ئەڵێن جیهانی سێیەم، سەدو ئەوەندە دەوڵەتین نابێ نفوستان زیادبێ، خواردنی جیهان بەش ناكا، بەڵام نفوسی سەگەكانیان زیا ئەكا ساڵ بەساڵ نابێ بەشەر زیادبێ! بەڵام سەگەكانیان قەیناكە! بازیاد بن! خواردن بۆ بەشەرنیە بەڵام بۆ سەگەكانیان هەیە!! وڵاتێكی وەكو (بەنگلادش) كە ئەگەر ڕێژەی داهاتی ئەو ووڵاتە دابەش كرێ بەسەر هاوڵاتیانا ساڵانە یەكی (٥٠) دۆلاری بەرئەكەوێ، بەڵام هەموو هاوڵاتیەكی ئەمەریكی نزیكەی (٢٠٠) دۆلار خەرج ئەكا لەسەگەكەیا ساڵانە بەشامپۆو بەخواردن و بە عەیادەو دەرمان! بەڵام تێڕوانین بۆ مرۆڤ لە ڕووبینای ئیسلامەوە جۆرێكی ترە: كاتێك ئەو منداڵە دروست ئەبێ لەسكی دایكیا هەموو مافێكی بۆ دابین دەكات، هێشتا چاوی دنیای نەبینیوە میراتی بەرئەكەوێ، فەرمان دەكات بەو دایكە هەر جووڵەیێك زەرەری بۆ ئەو منداڵە هەبێ نەیكا، هەچ خواردنێ هەر دەرمانێ زەرەری هەبێ بۆ ئەو منداڵە نابێ بیخوا، جگەرە حەرامە بۆ دایكێك حامیلە بێت جگەرە بكێشێ چونكە زەرەری ئەبێ بۆ ئەو منداڵە، پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ (ﷺ) (لا ضرر ولا ضرار)[٣٦٣] ئەم فەرموودەیە زۆر وردو كورت و پوختە، لەبەری كەن (لا ضرر ولا ضرار) یەكێك دكتۆرای وەرگرتووە لەحەفتاكاندا لە ئەزهەر لەسەر ئەم فەرمودەی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) واتە: هەرشتێ زەرەری بەشەرێكی تیابێ زەرەری كۆمەڵێكی

---

([٣٦٣]) موطا مالك / المكاتب / باب: مالایجوز من عتق المكاتب، هەروەها هەمان سەرچاوە كتاب / الأقضیة / رقم (١٢٣٤) هاتووە.. هەروەها مسند أحمد / رقم (٢٧١٩).

تیابێ با ئێستاش نەبێ بالە دواڕۆژدا بێت هەر حەرامە بکرێ، ئەمەندە پیرۆزە ئەم دینە لەبەرئەوەی ئەو جگەرەیە ئەو نیکۆتینە زەرەر ئەدا لەو منالە حەرامە ئەو دایکە جگەرە بکێشێ، دیسان فرمانێ هاتووە بۆ دایکەکە سەبارەت بە منالەکەی :

﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴿٢٣٣﴾ ﴾[٣٦٤]

دایك نەبێ شیر بدا بەو منالە نەبێ بیپارێزێ لەسەرماو گەرما نەبێ خزمەتی بکا. بەم جۆرە ژیانی مرۆڤ لەهەموو بوارێکەوە ئەبێ سەعادەت و کامەرانیو بیمەی تیابێ بۆ مرۆڤ، پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ (لا تؤذي جارك بريح قدرك) عەزیەتی دراوسێکەت نەدەی بەبۆنی مەنجەڵەکەت، ئەگەر خواردنەکە خۆشە عەزیەتی مەدە، ئەگەر ناخۆشە عەزیەتی مەدە، هەندێ کەس حەمام گەرم ئەکەن بەلاستیك و عەلاگەو نایلۆن کە ئەم ماددانە هۆکاری تووش بوونن بە شێرپەنجە (ئەم زەرفو نایلۆنانەی لەولاتی ئێمەدا هەیە لەزۆر ولاتا چەند ساڵێکە نەماوون، هەمووی بۆتە کاغەز، چونکە ئەو نایلۆنە ئەگەر بیسوتێنی هەر خراپە ئەگەر نەشی سوتێنێ رووبەرێکی زۆر گەورە داگیر ئەکا، ئەمە هەمووی زەرەرە لەدراوسێ، ئەو دراوسێیەی کە پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ: (مازال جبريل يوصيني بالجار حتى ظننتُ انهُ سيورثهُ)[٣٦٥] ئەمەندە جبریل پێی ئەوتم (دراوسێ دراوسێ) وام ئەزانی کە میراتی بەرئەکەوێ. تۆ یەیت بەهەوەسی خۆت لەحەمامەوە

---

([٣٦٤]) البقرة / ٢٣٣.

([٣٦٥]) صحيح البخاري / كتاب الادب / ٥٥٥٥.

دووکەڵ دروست ئەکەی لەسەریارەکەتەوە دووکەڵ دروست ئەکەی پێغەمبەری خواش ئەفەرموێ (لا ضرر ولا ضرار) ئەو دووکەڵەی کەلەسەیارا هەیە (pbso₄) ی تیایە کە منداڵ هەڵی ئەمژێ لەخوێنیەوە ئەچێتە مێشکی ئیتر زیرەکی یەکەی ئەکوژێ، ئەو ماددەیە ئێستالە ئەوروپا نەماوە، نایکەنە بەنزینەوە، هی ئەوان پێی ئەوترێ (Free lead) ئەوەی ئێمە ئەو ماددە ژەهرەی تیایە بەهەوسی خۆت بە پاسەکەت بەسەیارەکەت دووکەڵ بڵاوئەکەیتەوە بەڕووی خەڵکا.

مەسەلەی دەنگ: ئەو بڵندگۆیە نارەحەتی کردووین. (لەم کاتەدا ماڵێك(مولود) یان دەخوێن بە (مکبرە) ە دەنگەکەی دەگەیشتە ئێمەو تێکەڵ دەبوو بەووتارەکەمان.) لەساڵی ١٩٢٩ لەشاری (نیویورك) مەسحێ کرا بۆ ئەو کەسانەی پیشەیان هەیە (صەنعەت کارن) (ئێمە شت بەکیلۆ ئەکرین، دەنگ بەدێسەبل ئەپێورێ کە قیاسێکی (لۆگارثم)ییە بۆ تەوژمی شەپۆلی دەنگ)، ئەم زانایانە هاتن: بەرگ دروو، ئاسنگەر،... هەر سەنعەت کارێك ئامێرەکەیان لەلای گوێیەوە دائەنا، بزانن چەند لەتەوژمی دەنگ ڕۆژانە دێتە گوێی ئەو سەنعەت کارەوە؟ لەلایەکی ترەوە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیان کرد کەلە (٦٠) دێسەبڵ و بەرەو ژوور زیان ئەدا لەگوێی ئینسان، زیانی ئەو (٦٠) دێسەبڵ و بەرەوژووورە ئەگەر بەردەوام بێ گوێی گران دەکات، پاش ئەو ئامارەی کە کرا ئەو دەنگانەی کەسەروو (٦٠) بوون یەکسەر ئامۆژگاری یان کردن یان گۆڕان کاریەك بکەن لە ئامێرەکەیاندا یان شتێ بکەنە گوێیانەوە بۆ ئەوەی گوێیان بپارێزێ.

خوای گەورە گوێی وا دروست کردووە کە چوار هەزار قەوسی تیایە لەناو گوێی ئینسانا، کە تەوژمی دەنگ دێتە ناوی ئەم قەوسانە ئەلەرنەوە لەگەڵ دەماری بیستندا دەنگەکە دەگوێزنەوە بۆ قەدی مێشك کەیەکسەر تەفسیری دەکات، بەڵام کە دەنگەکە زۆر بوو گەیشتە (٦٠) دەسیبڵ و بەرەوژوور، لێدانی ئەم تەنە

هیلالیانە (قەوسەکان) سوواندنی تیا دروست دەبێ، ئەو ئامێرەی فێری پێ هەڵئەکەنرێ (١٢٠) دەسیبڵ ئەخوێنێتەوە! کەچی زۆر کەس یەن بەدیار ئەو کرێکارەوە ئەوەستێ کە جادەکە هەڵدەتەکێنێ منداڵەکانیش دێن ئەوەستن (کە گوێی منداڵ زۆر ناسك ترە لەگوێی من و تۆ پێویستە منداڵ دووربخەنەوە لەویا کەچی جاری واهەیە گەورەکان منداڵەکان بانگ ئەکەن) بەدیار ئەو کرێکارەوە دەبن! کە ئەو ئامێرە بەکار دەهێنێ (١٢٠) دەسیبڵ ئەخوێنێتەوە، دووقاتی ئەوەی کە لە جیهاندا ڕێی پێ دراوە) یاخود ئاسنگەر هەندێ جار کە چەکوشی پۆڵا ئەکێشێ بە ئاسنا ئەچێتە (١٥٠) دەسیبڵ، زەلام کاس ئەکا. پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ (ﷺ) (لاضرر و لا ضرار) هیچ مافێکت نیە هەوا پیس بکەی بەدووکەڵ. هیچ مافێکت نیە ئەو دەنگە بگەیەنی بەمن. مافی ئەوەی نییە ئێستا ئەو دەنگەبە (بڵنگۆ) ئەگەیەنێ بەئێمە، حەرامە.

مەسەلەی بانگ: مەسەلەی بانگ دان بەڕێزان لە (١٢٠) هەزار صەحابە پێغەمبەری خوا دووسێ کەسی هەڵبژاردووە کە بانگ بدەن، نەی هێشتوە کەسی تربانگ بدات، بانگەکە بەزەنگ و بەئامێرو بەمانە نەبووە، بەڵکو بەدەنگی ئینسان بووە، چونکە خۆشترین شێوازە بۆ گەیاندنی بانگ، (عبداللە ی کوڕی أم مکتوم لەگەڵ بیلالی حەبەشیو چەند کەسێ کی دیکەش هەموو دەنگ خۆش بوون) هەرگیز دەنگی ئینسان لەمەسافەی دوورەوە پێی سەغڵەت نابی قەد ناگاتە (٤٠) دێسەبڵ، ئەمڕۆ کە بڵندگۆ پەیا بووە پێویستە بەمنارەوە بێ بۆیە بەرزتربێ لەماڵان کەبەرزتر بوو لەماڵان دەنگەکە راستەوخۆ نایەتەژوری نوستنەکەتەوە،، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە بانگەوازکردن بۆ نوێژو بۆ خواپەرستی لەگەڵ بەرنامەی خوادابگونجێو دەنگێکی ئەزیەت دەرو نارەحەت کەر نەبێت... کاتێك کەسێك فێرانی بەسەرتا، زوویر ئەبی، بۆچی؟ چونکە دەنگەکە بەرزترە لە (٦٠) دێسەبڵ

ئەگینا یەکێك لە (٦٠) دێسەبڵ کەمتر قسەت لەگەڵ بکا ئیزعاج نابی پێی، خوا ئەم بەشەرەی وا دروست کردووە کە بەدەنگی بەرز نارەحەت بێ.

تێبینی کەن ئەو بڵندگۆ گەورانە دانراون بۆ دەرەوەی بینا، بەلام لای ئێمە لە هۆڵی شایی‌و ئاهەنگەکان لەناو بینادا بەکاردێن!!! ئەو بڵندگۆ گەورانە پێیان دەوترێ (Outbuilding loud speaker) کە تایبەتن بە دەرەوەو حەوشە وە بەلام لێرە لەناو هۆڵدا بەکار دەهێنرێن خەڵکەکە کاس ئەکەن، زۆربەی خەڵکەکەش لەتاو هەڵپەرکێ‌و بەزمی خۆی ئاگای لەخۆی نییە تا ئەچێتەوە ماڵەوە، خەوی ناخۆش ئەبینێ و دەنگی نزم نابیستێ‌و هەست بە ماندوویێتی‌و بێ تاقەتی ئەکات ئەمە هەمووی کاریگەری ئەو دەنگە دەنگەیە لەسەری...

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەم شتانەی هەموو چارەسەر کردووە، ئەگەر لەسەر ئەم دینە بڕۆین، لەسەر ئەم شەریعەتە بڕۆین کەس گوێی گران نابێ‌و کەس نارەحەت نابێ، تەنها بەجێبەجێ کردنی (لا ضرر ولا ضرار).

# باسی سی‌و حه‌وت

## دروست کردن و هیدایه‌تدانی دروستکراوان

**خوای گه‌وره له‌قورئانی پیرۆزدا ده‌فه‌رموێت:**

﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾﴾[٣٦٦]،

**شێخی رفاعی له‌ته‌فسیری ئه‌م ئایه‌ته‌دا ده‌فه‌رموویت: یه‌ك په‌رده هه‌یه له‌نێوان مرۆڤ و خوای گه‌وره‌دا، گه‌ر مرۆڤ ئه‌و په‌رده‌یه لابه‌رێت ئه‌توانێت په‌یوه‌ندی بكات له‌گه‌ڵ خوای گه‌وره، ئه‌وپه‌رده‌یه‌ش په‌رده‌ی بێئاگاییه، كه‌واته گه‌ر مۆڤ ئه‌و په‌رده‌ی بێئاگاییه لابه‌رێت و یادی خوای گه‌وره بكات ئه‌وا به‌پێی حوكمی ئه‌و ئایه‌ته (فاذكروني اذكركم) په‌یوه‌ندی ده‌كات به‌خوای گه‌وره‌وه، خوای گه‌وره خۆی ده‌فه‌رموێت یادم بكه‌نه‌وه یادتان ده‌كه‌مه‌وه.**

**(ذكر) چه‌ند جۆرێكی هه‌یه: بیرخستنه‌وه‌ی خه‌ڵكی بۆ دروستكراوه‌كانی خوای گه‌وره (ذكر)ێكی به‌رزه، هه‌روه‌ها بیرخستنه‌وه‌ی خه‌ڵكی بۆ ده‌سه‌ڵات و توانای په‌روه‌ردگار (ذكر)ێكی گه‌وره‌یه، باوه‌ڕهێنان یان قه‌ناعه‌ت كردن به شتێك به‌عه‌قڵ، پاڵ به‌مرۆڤه‌وه نانێت كه‌ژیانی بگۆڕێت به‌هۆی ئه‌و باوه‌ڕهێنانه عه‌قڵیه‌وه‌و پێی ده‌ڵێن باوه‌ڕهێنانی (مجرد).**

**به‌ڵام باوه‌ڕهێنان به‌خوای گه‌وره جگه له‌قه‌ناعه‌ته عه‌قڵیه‌كه قه‌ناعه‌تی دڵی له‌گه‌ڵدایه كه ده‌چێته ناوه‌ڕۆكی ده‌روونی مرۆڤه‌وه و كۆنترۆڵی مه‌ڵبه‌نده‌كانی**

---

(٣٦٦) البقرة / ١٥٢.

ویست دەكات (المراكز الارادیه). ئەو كاتە هەموو ساتەكانی ژیان بریتییە لەمۆر كردنی ئەو كردارانەی بەخۆشەویستی خوای گەورە. جا كە بیر دەكەینەوە لەم گەردوونەو لەدروستكراوەكانی خوای گەورە ڕێك و پێكیو یاساو سیستمی خوای گەورەمان بۆ دەردەكەوێت، ئایا خوایەك بەم گەورەییو جوانیو بێ كەم و كورپیە ئەم گەردوونەی دروست كردووە تۆ بڵێی پرۆگرامێكی نەبێت بۆ ئەم مرۆڤە، ئایا جگە لەوەی خوای گەورە ئەم گەردوون و هەموو دروستكراوانەی دروست كردووەو مرۆڤی بە بەنرخترین دروستكراوەكانی دروستكردووە، ئەشێ ئاوا مرۆڤی بەجێ هێشتبێ بەبێ ئەوەی پرۆگرامێكی بۆ بنێرێ كە پەیوەندی بكات لەگەڵ خوای گەورەدا؟!

ئەو پەیوەندی كردنە پێویستیەكی مرۆڤایەتییە، كێ پەیڕەوی دەكات؟ پێغەمبەران پەیڕەوی دەكەن. ئەوەی لەگەردوون و زیندەوەران بكۆڵێتەوە بەشێوەیەكی زانستیانە، بۆی دەرئەكەوێت كە (ڕێكەوت) و (عبثیة) بەهیچ شێوەیەك بناغەی زانستی نیە. خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾[٣٦٧]

واتە، وائەزانن ئاوا بەفیڕۆ ئێوەمان دروستكردووە؟ بەڵكو هەموو دروستكراوێك حیكمەت و مەبەستی خۆی هەیە لەدروستكردنیدا هەندێ توێژینەوەی زانستیو بۆچوونی چەند زانایەك دەخەمە بەر دیدی بەڕێزتان:

لەو توێژینەوانەی كەكراوە دەڵێت، ملیۆنەها ساڵە ئەم زیندەوەرانە هەیە بۆچی نەگۆڕان؟

---

([٣٦٧]) المؤمنون / ١١٥.

ئەو گۆڕان کاریو پێشکەوتنەی کەداروین لەکتێبی (اصل الانواع) باسی لێوەکرد (١٢٠ساڵ) لەمەوپێش، هەر لەوکاتەوە رەخنەی لێگیراو ئەمڕۆ بەبابەتێکی زانستی دانانێن، (١٤٠ملیۆن) ساڵە مێش هەیە، بۆ باڵەکانی نەبوون بەسێ باڵ؟ بۆ قاچەکانی زیادی نەکرد؟ بۆ شێوەی نەگۆڕا؟

هەندێ لەزانایان دەڵێن مرۆڤ نیو ملیۆن ساڵە هەیە، هەندێکی کەشیان دەڵێن یەك ملیۆن ساڵە هەیە، ئەو جومگەیەی مرۆڤ کە دۆزراوەتەوە خراوەتە بەر شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەوە دەرکەوتووە تەمەنی ئەو فۆسفۆرو کاربۆنە دیاری دەکەن کەلە ئێسکی مرۆڤ دا هەیە، جومگەی زۆر کۆنیان دۆزیوەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ نیو ملیۆن ساڵ، ئەو مۆخەی لەسەری ئەو مرۆڤەدا هەبووە هەمان مۆخە لەسەری من و تۆدا هەیە، بۆچی گۆڕانکاری بەسەردا نەهات؟!

کە دەڵێن مرۆڤ لەمەیمونەوە هاتووە، کەچی ملیۆنەها ساڵە مەیمون هەیە بۆچی گۆڕانکاری و پێشکەوتنی بەسەردا نەهاتووە؟

هەموو مەیمونەکانی جیهان بێنە، کە شمبانزی لەهەموویان زیرەکترە، هەر وێنەیەك یان شتێکی پیشان بدەیت پاش ماوەیەك بیری دەچێتەوە ئەگەر دایکی خۆیشی بێت، بۆ ئەمە گۆڕانکاری بەسەردا نەهات؟

پرۆفیسۆرێك لەو بوارەدا لەزانکۆی (هیلسنکی) وانەبێژە، ناوی (بۆرن تیرتن)ە، لەساڵی ١٩٧٢دا کتێبێکی داناوە، ناونیشانەکەی بەعەرەبی (لیس من القردە) کەوەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، ئەوەی گرنگە لەم کتێبەدا ئەوەیە کە ئەیسەلمێنێ: بەهیچ شێوەیەك مرۆڤ لەمەیمەنەوە نەهاتووە!

زانایەکی تر لەیەکێتی سۆڤیەتی جاران ناوی (ئەلکسەندەر نوبارین)ە، پاش ٣٧ ساڵ لێکۆڵینەوە، دەڵێت: ڕێی تێ ناچێت کەژیان هەر لەخۆیەوە بەڕێکەوت دروست بووبێت.



زانایـەکی فیزیـا کـە ئێـستاش لەژیاندایـە نـاوی (سـێرفرێد)ە لەسـاڵی ١٩٨١ دا لەکتێبێکی دا دەڵێت: بەهیچ جۆرێك ڕێکەوت بناغەو سەرچاوەیەکی زانـستی نیـە وەڕێکەوت کاری نیە لەدروست بوونی مرۆڤ دا بەڵکو دەبێت ئـەم مرۆڤـە هێزێکی بە توانای عاقڵ هێنابێتیە بوونەوە، کاتێك گوێ لەرادیۆیەك دەگرین یـان سـەیری تەلـەفزیۆنێك دەکـەین ئـەو شـەپۆلە رادیۆیانـەی کـەهاتووە بـۆ رادیۆکـەو ئـەو شەپۆلەی کەلە ئێزگەکەوە هاتووە بـۆ تەلەفزیۆنەکـە ئێمـە نـایبینین، تـەنها گوێ گرتن لەرادیۆکـەو بینینـی رەنگەکـە لەتەلەفزیۆنەکـە ئەیـسەلمێنێت کـە ئـامێرێکی پـەخش هەیـە لەکاتێکـدا ئـامێری پـەخش و شـێوەی پەخـشەکەشمان نـەبینیوە کەلەئاسمانـدا دێـت، بۆچـی باوەڕدەکـەین کـەئامێری پـەخش هەیـە تـەنها بینینـی تەلەفزیۆنەکە کـەئیش دەکات و گـوێ گـرتن لەرادیۆکـە دەیـسەلمێنێت کـە ئـامێری پەخش هەیە ئەی بینینی ئەم هـەموو دروسـتکراوانە نایـسەلمێنێ کـەخوای گـەورە هەیە؟

پرۆفیـسۆرێك نـاوی (کلـۆد ئـێم هاتـاوای)ە لـەکتێبی (الله یتجلی فی عـصر العلـم)دا لەلاپەڕە (٩٠)دا دەڵێت: فیزیای نـوێ کـەپێی دەڵـێن مـۆدێرن فیزیـك، فێـری کـردم کەسروشت زۆر لەوە لاوازتـرە کـەکاری خـۆی ڕێـك بخـات و کـۆنترۆڵی خـۆی بکـات، بەکارهێنانی ووشـەی سروشـت و غـەریزە ڕاکردنـە لـە (حقیقـەت) چـونکە ئەوانـە هیچ ڕاڤەکردنی زانستی نین.

دەسەڵاتی پـەروەدگار بەسـەر مـرۆڤ و هـەموو دروسـتکراوەکانیو گـەردوون دا زۆر ئاشـکراو ڕوونــە، (لطـف)ی خـوای گـەورە لــەمن دا لــەتۆدا، لــەدرەختێك دا، لەمێروولەیەك دا بەبەردەوامی هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو پـەردەی بێئاگاییـە لابەیت و بەدڵێکی پاکـەوە بـەرەو رووی خـوای گـەورە بڕۆیـت، بەچاو ئـەم شـتانە ئەبینیت.

شتێك هەیە لەناو سنگماندا (٤/١)ی كیلۆیەكە پێی دەڵێن (دڵ) ئەم دڵە لەتەمەنماندا گەر حەفتا ساڵێك بژین بڕی ئەو خوێنەی كەوا پاڵی پێوە دەنێت بڕی (٢٥٠) هەزار تەنە، ئەو ترپانەی كە دەیكات هەر جارەی ئەوەندە (سم^٢) فڕێ دەدات بەبەردەوامی گەر كۆی بكەیتەوە ئەو ماتۆڕەی كە چارەكە كیلۆیەكە (چارەكە ملیۆنێك) تەن خوێن پاڵ پێوە دەنێت لەتەمەنی مرۆڤ دا، ئەمە چ نیعمەت و بەخشندەییەكە؟ بەچی ئیش دەكات؟! جگە لە (لطف)ی خوای گەورە.

خوای گەورە ئامێرێكی تری پێ بەخشیوین كە گورجیلەیەو كێشەكەی نزیكەی (٩٠غرامە)، ئەو خوێنەی لەشمان ٣٩جار لەشەو ورۆژێكدا پیایدا دەڕوات و دەیپاڵێوێ لەزەهرو یوریاو چەندین شتی بێ كەڵكی تر، و پاكی دەكاتەوە بەبێ بەرامبەر و بڕی ئەو خوێنەی لەشەوو ڕۆژێك دا پیای دەڕوات (٢٠٠ لیترە).

لەسەرمانەوە تاكاكیلەی خوارەوە شریتێك هەیە وەك لاستیك وایە كێشەكەی نزیكەی (١٠٠ گرامە)، لەكاتی قسەكردن و نان خواردندا (٢٠هەزار) جار دەجوڵێتەوە بەخۆشمان نازانین لەڕۆژێكدا، و ئەوەی زۆر قسە بكات و نان بخوات زیاتر دەجوڵێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وفي انفسكم أفلا تبصرون﴾ سەیری خۆتان بكەن باكەمێك (بصیرە)تان هەبێت بەڵكو ئەوە ببێتە هۆیەك بۆ نزیك بوونەوە لەخوای گەورە.

چاو كێشەكەی (٨گرامە) چەوریەكە ئەو وێنانە نەگوێزێتەوە بە خێرایی (١٠٠٠/٢)ی چركەیەك، كەبەخەبەر دەبیت (١٠٠هەزار) جار ئەم چاوە دەجوڵێت لەڕۆژێك دا، نزیكەی (٢ملیۆن) وێنە دەگوێزێتەوە ڕۆژانە.

ئەو ئامێرەی كەخوای گەورە پێی بەخشیووین لەخوێنماندا پێی دەڵێن (ئامێری پاراستن) چەندەها جۆر خڕۆكەی سپیو ئامێری لمفاوی هەیە كەپەلاماری میكرۆب و هەموو زیندەوەرێكی نامۆ دەدات لەلەش دا، كە نەشیتوانی لەناوی

بەرێت نیشارەتێك ئەنێرێت بۆ سپێ... بۆ جگەر (جگەر ١٢٠ نیشی هەیە) ئەڵێ فریام بکەون ناتوانم ئەم میکرۆبە لەناو بەرم، جگەریش دێت بەهانایەوەو پلەی گەرمی خوێن بەرز دەکاتەوەو میکرۆبەکە لەناو دەبات.

هەندێ جار ڤایرۆسێك دێتە لەشەوە کەلەمیکرۆب زۆر بچوکترە و زۆر ووردە، مرۆڤێك چەند بچووکە لەچاو هۆڵێکی زۆر گەورەدا، ڤایرۆسیش ئاوهایە لەچاو خانەیەك دا، ئەچێتە ناو ناوکی خانەکەو لەوێوە پرۆگرامی ئەو خانەیە دەگۆڕێت ئەم خانەیە زۆر بێ دەسەڵات دەبێت و ناتوانێت لەناوی بەرێت چی دەکات؟ زەنگێك لێئەدات بۆ خانەکانی دەوروبەری بەرشتنی ماددەیەك واتە: خۆتان فریای خۆتان بکەون وامن فەوتام و لەناو چووم جۆرێکە لەفیداکاریو خۆبەخت کردن و ئێمە بێ ئاگاین لێیان، بەڵام زانست ئەمانەی دۆزیوەتەوە.

زۆر شتی تر هەیە کەلێرەدا ماوە نیە باسی بکەین، وەك دەنگی مرۆڤێك لە دەنگی مرۆڤێکی کە ناچێت، خوێنی کەسێك لەیەکێکی تر ناچێت بۆ نموونە لە (التحقیق الجنائی)دا کەتاوانی کوشتنێك لەشوێنێك دا ڕوودەدات ئەو تاوانبارە دڵۆپێك خوێنیش بەجێ بهێڵێ گەر (٦٠) ڕۆژیشی بەسەردا بڕوات هەر دەیدۆزنەوە، (DNA) کەلەناو خوێنی مرۆڤدایە هی کەسێك لەیەکێکی تر ناچێت.

بۆنی کەسێك لەیەکێکی تر ناچێت، بانکی بۆن هەیە لەلەش دا. لەناو شوقەیەك یان ماڵێك دا تاوانبارێك دێت کەسێك دەخنکێنێ و دەیکوژێ و رادەکات، پۆلیس دێت بۆ ئەو شوێنە دەبینێت مرۆڤێکە مردووە، لەلایەوە یەکێك دانیشتووەو قسەی لەگەڵدا کردووەو لەپڕ پەلاماری داوە ئەو شوێنەی کەئەو کەسەی لێ دانیشتووە پەڕۆی پاکژ دەهێنن و دەیخەنە سەر ئەو شوێنە پاشان دەیخەنە ناو زەرفێکەوە و دایئەخەن ئەڵێن بۆنی ئەو کەسەی وەرگرتووە، کەیەکێکیش دەگرن گومانی لێ دەکەن ئەیخەنە ناو (١٩) کەسەوە کە هەموویان پۆلیس و تێکەڵی ١٩

پۆلیسی دەکەن ئینجا سەگێکی پۆلیسی دەهێنن ئەو پەڕۆیەی بۆ دەکەنەوە بۆنی دەکات پاشان سەگەکەش لەناو ١٩ پۆلیسەکەدا بەبۆن دەیدۆزێتەوە گەر دوای چەند ساڵێکیش بێت.

جۆرێك لە قەلەرەشکە کە جوجکەکانی هەڵدێن پەڕو باڵیان سپییە دایکەکە بەجێیان دێڵێ ئەڵێ: ئەمانە بەچکەی من نین، چونکە خۆیو باوکەکەیان ڕەشن ئەوانیش سپی دەڕوات و بەجێیان دێڵێ، خوای گەورە (لطف)ی وایە وا دەکات لەو جوجکانە دەمیان بکەنەوە، خوای گەورە (مێش)یان بۆ دەنێرێت و ڕێنماییان دەکات کە مێشەکان قوت بدەن تا ماوەیەك مێش و مێشوولە قوت دەدەن و وورده وورده پەڕەکانیان بۆر دەبێت و بەرەو ڕەشی دەچێت پاشان دایکەکە دێتەوەو بەخێویان دەکات.

مشك ئەو چەند مووەی لەدەوروبەری دەمیایەتی (بلاتشبیە)وەکو سمێڵ وایە بیقرتێنەو فڕێی بدەرە ئاوەوە ناتوانێت مەلە بکات یەکسەر دەخنکێت، چونکە ئەو سمێڵەی وەکو ئامێرێکی هاوسەنگی وایە. خوای گەورە کەلەقورئان دا دەفەرموێت ﴿افلا ينظرون الى الأبل كيف خلقت﴾ هەر تەماشای حوشتر بکەن ئەی عەرەبەکان لەلاتانەوەیەو شەوو ڕۆژ دەیبینن جگە لەسیفەتی ئارامی ((وشتر)) کەتیایەتی، ئەو حوشترە لەبیابانێکدا دابنێ نزیکترین شوێن کە ئاوی تێدا بێت گەر ١٠٠ میل لێیشی دوور بێت ئەیدۆزێتەوە، کێ پێی ووت؟

تا ئێستا (ملیۆنێك و ٣٠٠ هەزار) جۆر لەزیندەوەران تۆمار کراوە لەلایەن زانایانەوە، ئەوەی تۆمار نەکراوە مەزندە دەکرێت بە (١٢ – ١٥ملیۆن) جۆرێك نیە لەگەڵ جۆرێکی تردا زاوزێ بکات، سەگی پۆلیسی کەلە سەگ و گورگەوە دروست دەبن یان ئێستر کەلە ئەسپ و گوێ درێژەوە دروست دەبن ئەمانە نەزۆکن واتا پۆلێکی سەربەخۆنین.

هەزاران جۆر مێروو هەیە یەك جۆر خواردن دەخۆن لەیەك شوێندا دەژین کەچی لەگەڵ یەکدا زاووزێ ناکەن. ئەوەی کەمێك زانیاری هەبێت لەسەر زانستی بۆماوەییو کرۆمۆسۆم و (الطفرة الوراثیة) ڕاستەوخۆ باوەڕ دەهێنێ کەڕێکەوت دەورنابینێ و زانست دژی ڕێکەوتەو هەمووی ڕێکخراوە. ئەم سیفاتە بۆ ماوەیانە دەگوێزرێتەوە بەیاسایەك، بۆچی بێچوی مراوی هەر لەهێلکەکەی دێتە دەرەوە بەرەو ئاوەکە ڕێ دەگرێ و خۆی تێ فڕێ دەدات و دەست دەکات بەمەلە کردن؟ ئەی بۆچی جوجکی داڵ و چۆلەکە نازانن مەلە بکەن؟! بۆچی؟ هەموو شتێك یاسا و سیستمی خۆی هەیە.

باڵندەیەك هەیە لەق لەقی پێیدەڵێن لەهەندێ شوێن دوژمنێکی هەیە جۆرە باڵندەیەکە، دێت هێلکەکانی دەشکێنێ ئەم لەقلەقە گەڕاوە گەڕاوە جۆرە ڕووەکێك هەیە کەئەو باڵندەیە پێی پەست دەبێت، دەچێت ئەو ڕووەکە دێنێت لەهێلانەکەیدا دایدەنێت، ئیتر ئەو باڵندەیە ناتوانێت نزیکی هێلانەکەی بکەوێت، ئەمەکێ فێری کرد؟ ڕێکەوت فێری کرد؟!

ڕێوی کەهەندێ درندە ڕاوی دەنێن وەك سەگی ڕاو یان تانجی پشت دەبەستێت بەبۆنی جێگە قاچەکانیو شوێنی دەکەوێ، ئەم ڕێوییە زۆرجار ئەچێتە لەگەڵ مەڕو بزن لەگەڵ ئەو ڕانەمەڕو بزنەدا دەڕوا پاش ماوەیەك لەوێ دائەبەزێو ئەڕوات، ئەمەکێ فێری کرد؟!

لەناوچە بەستەڵەکەکان دا ورچی سپی هەیە تەنها لوتی ڕەشە زۆرجار لەدوورەوە کە مرۆڤ دەبینێ بۆ ئەوەی نەیبینن دەست ئەخاتە سەر لوتی بۆ ئەوەی لەگەڵ بەفرەکەدا وون ببێت کێ ئەمەی فێر کرد؟ جۆرە قرژاڵێك هەیە قەوزەی ئەو ناوچەیە چ ڕەنگێك بێ دەچێت ئەو قەوزەیە دێنێت دەیخاتە سەرپشتی خۆی و بەدڕکەکانی پشتیەوە هەڵی دەواسێت کەی برسی بوو دەیخوات، زاناکان هاتوون بۆ

نموونه لەناوچەیەك دا قەوزەی سەوزی تێدایە، ئەم قرژاڵەیان هێناوەتە شوێنێك قەوزەی سوری تێدایە سەیریان کردووە خێرا قەوزە سەوزەکەی فڕێ داوەو هی سووری خستۆتە سەرپشتی بۆ ئەوەی نەبینرێ هەمیشە خۆی بشارێتەوە ئەمەکێ فێری کرد؟ ئەمە ڕێکەوتە؟



## باسی سی‌و هەشت
## گرنگی دان بە منداڵ و خێزان

لەهەموو پەیڕەوێکی پەروەردەییدا هەوڵ دەدرێت مرۆڤ وا پەروەردە بکرێت، کەلە دوارۆژدا بتوانێ نانی خۆی پەیدا بکات لەدوا ڕۆژدا زەرەرو زیانی نەبێ بۆ گەل و کۆمەڵ و نیشتمانەکەی، ئەمەش مەبەستێکی زۆر پیرۆزە مەبەستێکی زۆر بەرزە، ئیسلامی پیرۆز هەوڵ دەدات لەو مەبەستە زیاتر بگا بە مرۆڤ کە بریتییە لەجێ بەجێ کردنی پەیامەکەی خوای گەورە چونکە دەزانێ کە مرۆڤ لەوە زیاتری پێیە کە زەرەر نەدات لەکۆمەڵ بەڵکو سوود ببەخشێ بەقەومەکەی خۆی بەکۆمەڵگەکەی خۆی.

مەسەلەی پەروەردەش لەمنداڵەوە دەست پێدەکات، ئیسلام زۆر بەقووڵی نەخشە نەکێشێ بۆ پەروەردەی منداڵ. ئیسلام نەخشەی داناوە کە پیاو لەسەر چ بناغەیەك هاوسەری خۆی بدۆزێتەوە وەئافرەتیش لەسەر چ پێشینەیەك هاوسەری خۆی بدۆزێتەوە، پێوانەی داناوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەفەرموێت: ئافرەت دەخوازرێت لەلایەن پیاوەوە بەچوار هۆ:

١-جوانی.

٢-پارەکەی.

٣-عەشرەت و کەس و کارەکەی.

٤-دینەکەی.

﴿تنكح المرأة لأربع، لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينها فأظفر بذات الدين تربت يداك﴾[٣٦٨] بەلام تۆی موسڵمان خاوەن دینەکە هەڵبژێرە، چونکە ئەوە بناغەیە چونکە جوانیەکەیان پارەو پولەکە لەوانەیە بەشەو ڕۆژێك نەمێنێت، لەوانەیە بەچەند چرکەیەك نەمێنێ، ئەگەر خێزان لەسەر بونیادی جوانی دامەزرا ئەوە هەڵدەوەشێت بەلام ئەگەر لەسەر بناغەی دین بوو ئەوە هەڵناوەشێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەموێت: ﴿إذا أتاكم من ترضون خلقه ودينه فزوجه﴾[٣٦٩] واته: ئەگەر یەکێك هات داوای کچەکەتانی کرد ڕازی بوون لەدین و رەوشتی، کچەکەتانی بدەنێ، دینی بەتەنها نەووتوە بەڵکو دوومەرجی داناوە، کچەکەتان مەدەن بەیەکێ خاوەن دینە بەلام حەسودە، خاوەن دینە بەلام دڵی پیسە، خاوەن دینەکە بەتەنها بەس نییە، هەروەها هەردووکیان ئاراستە دەکات و دەفەرموێت ﷺ ﴿تزوجوا في الحجر الصالح﴾[٣٧٠].

واته: ببنە هاوسەری یەکێك کەلەخێزانێکەوە هاتبێت کە دایك و باوکەکە (صالح) بن، چۆن شیردراوە بەو منداڵە ئاواش رەوشتی دراوەتێ چونکە دایك و باوکەکە (صالح)ن صالحێتیەکەی خۆیان داوە بەو منداڵەش، ئیسلام ئەم هەموو نەخشەیە ئەکێشێ بۆ ئەوەی ئەو منداڵە لەشوێنێکی ئاسوودەدا چاوبکاتەوە لەشوێنێکدا کەئامادە بێت رەوشت و بەها جوانەکانی تیا وەربگرێت، لە ئیسلامی پیرۆزدا دایك و باوك پابەندن بەچەند مەرجێکەوە بەرامبەر بەمنداڵ، کە ئەمانەن:

١- پێویستە ناوی جوانی لێ بنێن.

---

(٣٦٨) صحيح مسلم / كتاب الرضاع / رقم (٢٦٦١).

(٣٦٩) سنن ابن ماجة / كتاب النكاح / رقم (١٩٥٧).

(٣٧٠) رواه الديلمي والبيهقي عن ابن عباس / مرفوعا في الحديث... عن أنس بلفظ تزوجوا في الحجر الصالح / كشف الخفاء / الجزء ٢ / ص٧٧.



٢- پێویستە ئەو دایکە شیر بدات بەو منداڵە. قورئان دەفەرموێت:

﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ ﴿٢٣٣﴾﴾[٣٧١]

هەروەها دەفەرموێت:

﴿وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ ﴿١٥﴾﴾[٣٧٢].

٣- یاری کردن لەگەڵ منداڵدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ﴿من كان له صبيّ فليتصابى له﴾ واتە: هەر کەس لەئێوە منداڵێکی هەیە بایاری لەگەڵدا بکات. ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر (ﷺ) زمانی موبارەکی دەرهێناوە بۆ حەزرەتی حسین ئەویش پەلاماری داوە ویستویەتی بیگرێت ئاوا یاری لەگەڵدا کردووە.

٤- ماچ کردنی منداڵ چونکە بەو ماچانە پاداشت دەست دەکەوێت وە هەروەها دەبێت یەکسانی هەبێت لەماچ کردندا، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانمان پێدەکات کە یەکسان منداڵەکانمان ماچ بکەین. ریوایەت کراوە کە جارێك پیاوێك ناوی (الأقرع بن حابس) بوو هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا حەزرەتی (حسن و حسین) ی ماچ دەکرد ئەویش پێی ناخۆش بوو، ووتی یارسول الله من (١٠) منداڵم هەیە تا ئێستا یەکێکیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەر فەرمووی جا من چیت لێ بکەم ئەگەر خوای گەورە رەحم و بەزەیی لەدڵی تۆدا دەرهێنابێت. ریوایەت کراوە کەلەنوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و چەندین کاتی تر (ئومامەی کچی زەینەبی کچی پێغەمبەر) کاتێ

---

([٣٧١]) البقرة / ٢٣٣.

([٣٧٢]) الاحقاف / ١٥.

پێغەمبەر ﷺ ئیمام بووە هاتووە کراسەکەی ڕاکێشاوە پێی گوتووە: بابە گەورە، یەکسەر پێغەمبەر ﷺ هەڵی گرتووە کردوویەتیە باوەشی، ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر ئیمام بووە لەنوێژی جومعەدا فەرموویانە: ﴿یا رسول الله أطلت السجود﴾ ئەی پێغەمبەری خوا سوجدەکەت زۆر درێژ کردەوە بۆچی؟ فەرمووی: ئەو کوڕەم (ئیشارەتی بۆ حەزرەتی حسین کرد) هاتە سەر ملم منیش حەزم نەکرد عەزیەتی بدەم، لەبەر ئەوە سوجدەکەم درێژ کردەوە تا خۆی تاقەتی چوو ئینجا لاچوو. ئیسلام فێرمان دەکات مامەڵە بکەین لەگەڵ منداڵدا، چەند ئەو منداڵە پێویستی بە شیرو بەخواردنە ئەوەندەش پێویستی بەیاری کردن و بەڕەحم و بەزەیی‌و سۆز هەیە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت ﴿من لایرحم لایرحم﴾[٢٧٣] واتە: هەرکەس ڕەحم نەکات بەخەڵکی خوای گەورەش ڕەحمی پێ ناکات.

٥- بەکار هێنانی توندو تیژی بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەوشتی منداڵەکە کارێکی زۆر خراپە، چونکە دوو حاڵەت هەیە یان ئەو منداڵە کەسێتی بەهێزە یان کەسێتی لاوازە. ئەگەر لاواز بوو لێدان و هێزی لەگەڵدا بەکار هێنرا ئەمەندەی کە کەسێتی لاواز دەکەیت، ئەوا ترسنۆك دەبێت بۆ جێ بەجێ کردنی کاری خۆی، درۆ دەکات فێڵ دەکات. ئەگەر کەسێتی بەهێز بوو هەر لێدان و توندی لەگەڵدا بەکارهێنرا ئەو منداڵە یاخی‌و (متمرد) چاو قایم دەردەچێت دژی خۆشی نەك تۆ، دوایی دەبێت دایك و باوك باجەکەی بدات.

٦- درۆ نەکردن لەگەڵ منداڵدا، پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتێکی بینی دەستی داخستبوو، بانگی کوڕەکەی دەکرد وەرە ئەم شتەت ئەدەمێ پێغەمبەر

---

([٢٧٣]) ئەم فەرموودە بەچەند مەتنێك هەیە. لە (صحيح البخاري) بەم شێوەیە هاتووە (من لايرحم الناس لايرحمه الله).

فەرمووی: دەستت بکەرەوە دەستی کردەوە خورمایەکی تیا بوو فەرمووی ئەگەر ئەو خورمایەی تیا نەبوایە لای خوا بەدرۆ حساب دەبوو، نابێ درۆ بکرێت لەگەڵ منداڵدا. ئینجا زاناکان دەفەرموون کە منداڵ دەگاتە تەمەنی (تمیز) تەقدیر کراوە بەسێ ساڵی، بەگوێرەی زیرەکی ئەو منداڵە ئەبێت فێری نوسوڵێك بێت لەقورئانی پیرۆزدا پێی دەوترێت (استئذان) قورئان دەفەرموێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُواْ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَـٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَـٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ ﴿٥٨﴾ ......﴾[٣٧٤]

واتە قورئانی پیرۆز سێ کات دیاری دەکات کاتی ئیسراحەت و جل دا کەنینە (کاتی پێش نوێژی بەیانی، کاتی پاش نوێژی نیوەڕۆ، کاتی پاش نوێژی عیشایە (خەوتنان) چونکە لەم سێ کاتەدا کاتی جل داکەنینە، کاتی ئەوەیە کە عەورەت دەردەکەوێت. پێویستە لەسەر ئەو خێزانە ئەو منداڵە بانگ بکرێو فێر بکرێت کە بەبێ پرس خۆی نەکات بەژووردا بەڵکو داوای ئیزنێك بکات. کە دەگاتە تەمەنی حەوت ساڵی فێری نوێژ بکرێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿مُروا أبنائكم بالصلاة لسبع سنين...﴾[٣٧٥].

---

([٣٧٤]) النور / ٥٨.

([٣٧٥]) مسند أحمد (رقم ٦٤٦٧). هەروەها صحيح أبو داود / ١ / ٤٩٥ / ص١١٩.

٧- منداڵ كە تەمەنی لەحەوت ساڵی تێپەڕ بوو پێویستە جیا بكرێنەوەو لەسەر جێگا بەریەك نەكەون. ئادابی كۆمەڵگە فێربكرێت ئەو منداڵە وەك ڕێز لەگەورە، ڕێز لەدایك و باوك. هەندێ شت فێر بكرێت، هەندێ شتی پیشان بدرێت بووترێت: بڕوانە ئەمە خوای گەورە دروستی كردووە. دوایی ئەو منداڵە فطرەتی تێك ناچێت، چەند بیروباوەڕی تری بۆ بێت ئەم شتە پیرۆزەی لەبیرناچێ، چونكە لە (فطرە)ییدا هەیە ئەو ڕێچكانە كاری تێ ناكات. مەسەلەی پەروەردە ئەركە قورسەكەی لەسەر دایك و باوكە، بەڵام ئەركێكی تری لەسەرشانی قوتابخانەیە، ڕاستە دایك و باوك ئاگاداری هەموو قۆناغەكانی پەروەردەی ئەو منداڵەن بەڵام مامۆستا لەگۆشەیەكی ترەوە تەماشای ئەو منداڵە دەكات پەیوەندی ئەو منداڵە لەگەڵ منداڵانی تردا، گۆشەگیرە یان دەست درێژی دەكات یان چاكە یان خراپە.. مامۆستا دەیزانێت لەبەر ئەوە هاوكاری لەنێوان خێزان و مامۆستادا كارێكی زۆر چاكە و پێویستە.

ئەمڕۆ ڕاگەیاندنیش كاریگەری خۆی هەیە، ڕاگەیاندنی چاك، پەیڕەو پرۆگرامی چاك ئەوەندەی تر ئەو منداڵە جوانتر پەروەردە دەكات. كەواتە: ١)خێزان ٢) قوتابخانە ٣) ڕاگەیاندنی چاك كار دەكەنە سەر پەروەردەی منداڵ.

زانایانی دەروون ناسی (علم النفس) دەڵێن: زۆر جار دیمەنێكی ناشرین یان دەنگێكی بەرز كار دەكاتە سەر ئەو منداڵە چەندین ساڵ، منداڵ مەخلوقێكی زۆر ناسكە، زۆر حەساسە. ئەمە بۆچونی ئیسلامە بەرامبەر بەمنداڵ ئەبێت ئاوا ڕێزی لێ بگیرێت، بەڵام كە ئەڕۆیتە سەر ئەم جیهانە هەواڵی منداڵ دەخوێنێتەوە لەراپۆرتێكی (unicef) دائەڵێت كە ئێستا (٢٠٠٠٠٠) دووسەد هەزار منداڵ چەكیان هەڵگرتووە زۆر بەیان لەئەمریكای لاتینین لە شەڕدا بەكاریان دەهێنن،

کەتەمـەنیان (١٢،١٣،١٤) سـاڵە. لەسـریلانکا ئەفرۆشـرێن لـەزۆر وولات لەتەمـەنی دوانـزە سـاڵیدا ئیشیان پـێ دەکـەن وەك چۆن داوا لەکەسێکی (١٨) سـاڵ دەکـەیت هەشت سەعات ئیش بکات ئاوا ئەو منداڵانەش (٨) سـەعات کـار دەکـەن لەبـەرازیل منداڵی تریان پێ دەکوژن وە حیمایەی نـاو بازاڕیـان پـێ دەکـەن، لەچین قانونێك هەیە کـە دانیـشتوی شارەکان نابێت لەیـەك منـداڵ زیـاتر یـان هـەبێت دانیـشتوی گوندەکانیش نابێت لەدوومنداڵ زیاتریان هەبێت، هەیـە حـەز دەکات منـداڵی زۆر بێـت لەبەرئـەوە ئـەم منداڵەکـە لـەدایك دەبێـت ناتوانرێـت ببرێـت بکوترێـت، ناتوانرێت ناوی تۆمار بکرێت، ناتوانرێت بخرێتە قوتابخانـە ناتوانرێت بەهۆیـەوە کۆبۆنی خواردنی زیاد وەرگـرێ، لەبـەر ئـەوە ئـەم منداڵانـە بـێ بەشـن لەهەنـدێك ماف، مافی تەداوی، مافی خوێندن، (نۆ ملیۆن) منـداڵی ئاوا هەیە. لەزۆر شوێن بـۆ خراپەکاری بەکاریان دەهێنن. ئامارێـك کـراوە کـە دەڵـێ: (سـێ ملیـۆن) پیـاو حـەز دەکـەن لەگـەڵ منـداڵی بـچوکدا خراپـە بکـەن، لـەدانیمارك کـچێکی کـورد نـاوی (شیرین) بوو دیار نەماوە پاش گەڕان بەدوایدا لەزەرفی زبڵدا دۆزیویانەتـەوە پـاش ماوەیـەك لێکۆڵینـەوە پیاوەکـەیان دۆزیـەوە پیـاوێکی گـەورە لەگـەڵ منـداڵێکی (٦) ساڵدا خراپەکەشی لەگەڵ کردووەو کوشتوشیەتی. پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێت: ﴿خيركم خيركم لإهله وأنا خيركم لأهلي﴾[٣٧٦] واته: چاکترین و خۆشەویسترینیان لای خوای گەورە ئەو کەسەیە کە خێـر ئـەدات بـەماڵ و منـداڵی خێـری چـی؟ دوو جۆر خێرکردن هەیە: خێری مەعنەوی، واتە: وشـەی شـیرین و ڕوی گـەش و کـات، ئـەبێ کاتیـشیان بـۆ دابنێـی. تـەنها پارەیـان نـەداتێ و خۆشـی لەناویانـدا نـەبێت، ئـەبێت خـەرجییان بـداتێ خۆیـشی لەناویانـدا بێـت و ڕوویـشی خـۆش بێـت لەگەڵیاندا، ئاوا ئیسلام مـاف ئـەدات بـەماڵ و خێـزان. خێـری مـاددی: واتـە شتێك

---

([٣٧٦]) سنن الترمذي / كتاب المناقب / رقم (٣٨٣٠).

ببەخشی لەپێناوی خوادا. لەناوەوەو لەدەرەوەی کۆمەڵگە کێ باشترە لەکێ؟ کێ تەرازووەکەی بەرزترە لەکێ؟ کێ خێری زیاترە لەکێ؟ ﴿خيرُ الناس من نفع الناس﴾ خەڵك چی بکات لەتەسبیحات وشە و نوێژ؟ ئەمە لایەنێکی شەخسی خۆتە ئەمە خێرێکە بۆ خۆتی دەکەیت، بەڵام میللەت پێویستی بەزۆر شتە، پێویستی بەفێرکردنە میللەت پێویستی بەئاوەدانکردنەوەیە، میللەت پێویستی بەهەموو جۆرە یارمەتیەك هەیە. ﴿إرحموا من في الارض يرحمك من في السماء﴾[٣٧٧] واتە: ڕەحم بکە بەخەڵکی سەر زەوی خوای گەورەش لەئاسمان ڕەحمت پێ دەکات پێچەوانەکەی وەربگرین/ ڕەحم مەکە بەخەڵك خواش ڕەحمت پێ ناکات. وەسفی پیاوێکیان کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ووتیان: پیاوێك هەیە لەدێکەماندا زۆر موسڵمانە بەڕۆژ بە ڕۆژووە بەشەو شەو نوێژ دەکات پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (کێ لێپرسراویەتی لەنان پەیدا کردندا) فەرمویان (كلنا نتكفل إطعامه) هەموومان لێپرسراوین لەنان خواردنیدا و هەر ڕۆژەو یەکێ خواردنی بۆ دەبات، پێغەمبەر فەرمووی (كلكم خير منه) هەمووتان لەو باشترن، ئیسلام ئاوا مەسەلەی پەروەردە ڕوون دەکاتەوە ئیسلام دەڵێ: ئەو کەسەی کە تێکەڵ دەبێت بەقەومەکەی خۆیی‌و ئارام دەگرێت لەزیانیان چاکترە لەو کەسەی کە گۆشە گیرەو تێکەڵ بەخەڵکی نابێت.

﴿المؤمن الذي يخالط الناس ويصبر على اذاهم خير من الذي لايخالط الناس ولا يصبر على اذاهم﴾[٣٧٨] مەسەلەی ڕەحمیش ئیسلام گرنگی پێداوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿ليس منا من لم يرحم صغيرنا ولم يوقر كبيرنا﴾[٣٧٩].

---

([٣٧٧]) سنن الترمذي / كتاب البر والصلة / رقم (١٨٤٧) قال أبو غيسى هذا حديث حسن صحيح.

([٣٧٨]) مسند أحمد / كتاب باقي مسند الانصار / رقم (٢٢٠١٩) بە مەتنێکی جیاواز.

([٣٧٩]) سنن الترمذي / كتاب البر والصلة / رقم (١٨٤٢).

واتە: لەئومەتی من نییە ئەو کەسەی بەزەیی بەبچوکدا نەیەتەوە وە ڕێز لەگەورە نەگرێت. ئەم ڕەحم و بەزەییو ڕێز لەگەورەگرتنە لەقارەکانی ئەورووپاو ئوستڕالیا نەماوە. لەسەر شەقامەکان پیاو پەلاماری ئافرەت دەدات ئافرەتەکە ڕادەکات لەدەستی، تۆ بۆت نییە قسە بکەیت دادگایی دەکرێی لەسەری، دەڵێن: تۆ پۆلیس نیت، ناچار ئەو ئافرەتە سپرایەك هەڵدەگرێ بۆ پارێزگاری خۆی دەستی پیا دەنێت بۆ ئەوەی بچێت بەلوتی ئەو کەسەدا ئیتر لەهۆش خۆی دەچێت، وازی لێ دەهێنێت، ئێستا یاسایەك دەرچووە کە نابێ ئافرەت ئەو سپرایەی پێ بێت چونکە پاش ماوەیەکی تر زەرەر دەدات.

لەسوید لەبەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا وتراوە کە هەر کچێك باوکی پەلاماری دەدات بابەتەلەفۆن پەیوەندیمان پێوە بکات (لەماوەی (١) یەك سەعاتدا (١٠) دە هەزار ئافرەت پەیوەندی کردووە) ئەوە یاسای پەروەردەییە لەڕۆژئاوا. لای ئێمەش قورئان دەفەرموێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١﴾[٢٨٠].

واتە: ناوو ناتۆرە گاڵتە پێکردن ئەمانە هەمووی حەرامن لەدینی ئێمەدا کەس نابێت گاڵتە بەکەس بکات ناوو ناتۆرە لەیەکتری بنێن. لەم شەوانەدا ئافرەتێك

---

([٢٨٠]) الحجرات / ١١.









بەتەلەفۆن فەرموبووی کە ئێمە کوڕێکمان کوژراوەو ئیمانداریین جلی ڕەشمان نەکردووە خەڵکی گاڵتەمان پێدەکەن دەڵێن ڕێز لەمردووەکە ناگرن. ئایا ڕێزی مردوو بەجلی ڕەشە؟ ئایا ئەوە دایکیەتی خەم و خەفەت ناخوات؟ هەروەها ئەم دینە لەدەستورێکی تردا دەفەرموێت :

﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ بِغَيۡرِ مَا ٱكۡتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحۡتَمَلُواْ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴿٥٨﴾﴾(٢٨١).

واتە: ئەوەی عەزیەتی ئیماندارێك بدات ژن بێت یان پیاو ئەوەبە بوختان و بەگوناهێکی گەورە (کبائر) لەسەری دەنوسرێت. (کبائر) ئەو گوناهانەن کەبەتەوبەی ئاسایی ناسڕێتەوە.

باوکێك و کوڕێك کۆچیان دەکرد لەمەککەوە بۆ مەدینە بۆ ئەوەی بگەنە شارۆچکەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆمەڵێك لەکۆمەڵەکانی کوفر ئەم باوك و کوڕەیان گرت زانیان کە بەرەو مەدینە کۆچ دەکەن، ئەگەر بیانگێڕنەوە بەزۆر لەشوێنێکی ترەوە دەڕۆن ئەگەر بشیانکوژن هاوزمانی خۆیانن بەڵام بۆیان دەرکەوتووە کە شوێنکەوتوانی پێغەمبەر درۆ ناکەن و خاوەن پەیمانن، پێیان ووتن کە محمد بەنیازە لەشکرێك کۆبکاتەوە بۆ جەنگ پەیمانمان بدەنێ کەبەشداری نەکەن لەم شەڕەدا باوك و کوڕە ووتیان: پەیمانتان دەدەمینێ، ووتیان: دەفەرموو بڕۆن. کاتێك ئەمان گەیشتنە ئەوێ. لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا (٣١٣) کەسی بۆ کۆکرابۆوە. لەمێژوودا باس کراوە کە پێغەمبەر ئەوەندە دەستی بەرزدەکردەوە عەباکەی سەرشانی دەکەوتە خوارەوە (أبوبکر) خوا لێی ڕازی بێت

---

(٢٨١) الاحزاب / ٥٨.

دەیخستەوە سەرشانیو پێی دەوت: یارسول الله بەسە. ئەمەندە دەپاڕایەوە (إن تهلك هذه العصابة لاتعبد أبدا)[٢٨٢] خوای گەورە ئەگەر ئەم کۆمەڵە لەناو بەریت ئیتر ناپەرسترێیت. لەم کاتەدا کە پێویستی بەهەموو کەسێکە ئەم دوانە هاتن وتیان یارسول الله ئێمە هاتین بۆ خزمەتی تۆ بۆ ئەوەی بەشداری لەم جەنگەدا بکەین بەڵام لەرێگا تووشی ئەو کۆمەڵە هاتین و پەیمانمان پێدان. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿إمضيا إليهم عهدكما﴾ لەسەر پەیمانی خۆتان بمێننەوە، بەشداری مەکەن لەشەڕەکەدا. ئەمە ڕەوشتە. ئەمە لەچ دینێکدا هەیە لەچ بیروباوەڕێکدا شتی وابەدی دەکرێت!!!

خوای گەورە دەفەرموێت

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ ۝١﴾[٢٨٣]

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر پەیمانتان دا بەزمان یان بەئیمزا کردن ئیتر ئەبێت بیبەنە سەر. زۆر لەو کەسانەی کەلەهەندەران دێنەوە، دەڵێن لەوێ شت ئەشکێنین دەڵێین هی کافرە ئەمە هەڵەیە، تۆ کەچویتە وڵاتێکەوە ئیتر پەناهەندەی سیاسیت یان ئینسانیت، بە کۆچ کردن چویت بە هەچ شتێك چویت تۆ نان و ئاوو هەموو شتێکت لەو وڵاتە دایەوە سوود لەوان وەردەگریت ئەبێت ڕێز لەیاسای ئەو وڵاتە بگریت، زانایانی ئێستا دەڵێن: ئەو کەسەی کە موسڵمانە ئەچێتە وڵاتێکی بێگانە ئەگەر بزانێت ئەو کەسەی کە پێنج فەرزە لە (المركز الاسلاميه) شان بەشانی یەکترین بەڵام باج (ضريبه) نادات ئەبێت بچێت شکاتی لێ بکات سەیری ئەم شارستانیەتە بەرزە!! ئەمە لە چ دینێکدا هەیە؟!

---

(٢٨٢) صحيح مسلم / كتاب الجهاد والسير / رقم (٣٣٠٩).

(٢٨٣) المائدة / ١.



## باسی سی‌و نۆ
## بەڵگە گەردوونیەکان

**لەقورئانی پیرۆزدا وشەی (آیة) و (آیات) پۆلێن کراوە بۆ سێ جۆر: یەکەم: وەك خوای گەورە دەفەرموێت :**

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأَيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾﴾[٣٨٤]

**لەشوێنێکی تردا :**

﴿وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ ﴿٣٧﴾﴾[٣٨٥]

﴿وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ﴿٣٣﴾﴾[٣٨٦]

**ئەمانە پێیان دەوترێت (آیات الکون) بەڵگەی گەردوونی.**

**دووەم: (آیات المعجزات). جۆری سێیەم: ئەو گەردوونە نوسراوەکە ئایاتی قورئانی پیرۆزە (آیات) واتە: بەڵگە، نیشانە، دەلیل. (آیات الکون) واتە: ئەو مەخلوقاتانەی کەخوای گەورە دروستی کردوون لەئاسمان و زەوی بەشی زیندەگی**

---

([٣٨٤]) آل عمران / ١.

([٣٨٥]) یس / ٣٧.

([٣٨٦]) یس / ٣٣.

و بەشـی نازینـدەگی، ئەمانـە پـێش دروسـت بـوونی مـرۆڤ بـوون خـوای گـەورە دروووسـتی کـردوون بەیاسـا. پـەرژینێك هەیـە لـەنێوان ئێمـەو لـەنێوان ئەوانـدا پەرژینی نەزانیە، بەعەقڵ یان بەشێوازی زانستی تۆ دەتوانی سوود وەربگـری لـەو هەموو نیعمەتانە لەو هـەموو بەڵگـە گەردوونیانـە تـەنها بەعـەقڵ عـەقڵیش واتـە شێوازی زانستی، کەواتە ئەو کەسەی کەعەقڵ بەکار دەهێنێـت بـۆ سـوود وەرگـرتن لەدەوروبەری سوودی لێ وەردەگرێ بائیمانـداریش نـەبێت وە ئـەو کەسـەی عـەقڵی بەکارنـەهێنا بـۆ سـوود وەرگـرتن لەدەوروبـەری سـوود وەرنـاگرێ بـا ئیمانـداریش بێـت. بـۆ نموونـە: بزانـە تیـشکی خـۆر چـۆن سـوودی لێ وەردەگـیرێ، کارەبـای لێ دروست دەکرێ، هەندێ سەیارە بەو تیشکە دەڕوات. (ئایسلاند) وڵاتێکە ناوی خۆی بەخۆیەوەتی (ئایس) واتە: بەفر (لاند) واتە: خاك، ئەو وڵاتە هەمیشە برسـیەتی، بەهۆی بەکارهێنانی زانستەوە سـوودیان لەئایـەتێکی گـەونی وەرگـرت کـە دەریایـە لەقووڵاییەکی دیاریکراودا بۆریان هێناوە ڕایان کێشاوە چەندین کیلۆمـەتر لـەوێوە ئاو ڕادەکێشت ئاوەکە (١٢،١٣) پلەی سەدییە، ئەگەڕێتـەوە بـۆ بـۆ وڵاتەکـەی خۆیـان کە پلەی گـەرمی (ژێـر سفرە) نـیتر بـەم شێوەیە ئاوەکـەیان گەیانـدووە بەهـەموو ماڵەکان و سوودی گەرمیەکەی لێ وەردەگرن. زۆر کەس دەڵێت ئـاوی ئەحمـەد ئـاوا لەزستاندا گەرمەو لەهاویندا ساردە شتی وانییـە گـەرمیپێوێك بهێنـە تەماشـا بکـە هەریەك پلەی گەرمییە، بەڵام چونکە دەروروبەرت گەرمترە لەئاوەکە لەهاویندا وا هەست دەکەیت ئاوەکە ساردەو لەزستانیشدا بەپێچەوانەوە.

نمونەیەکی تر: لەزستاندا تۆ فوو دەکەیت لەدەستت گەرمی دەبێتەوە هـەر فوەکـە ئەیکەیت لەچایەك ساردی ئەکاتەوە مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەر عـەقڵ بـەکارهات سـوود وەردەگریـت لەدەوروبـەر.. دیاردەیـەکی تـر هەیـە کـە پێـی دەوتـرێ (مـەدو جەزر) واتە: هەڵکشان و داکشان بەهۆی عەقڵەوە دەرکەوت کەهـەموو (٦سـەعات و








٢٠ دەقیقـە) جارێـك كـشاندنێك لـەدەریاو دەریاچـەكاندا ڕوودەدات كـە ئاوەكـە هەڵئەكشێو ئەچـێتە سەرووشـكانیو دوای (٦سـەعات و ٢٠دەقیقـە) دەگەڕێتـەوە، مرۆڤ عەقڵی بەكارهێنا حەوزی جوانیـان دروسـت كـرد ئاوەكە دەكشێ و دەچێتە حەوزەكە كەناهێڵن بگەڕێتەوە، لەو حەوزەدا دەمێنێتەوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك دوای ئەوە ئاوەكە دەبێت بەهـەڵم و خوێكە ئەكەنـە كیسەوە ئەیفرۆشـن، لـەزۆر شوێنی تـر ئاوەكـە دەكەنـە حەوزەكـە كـە دەبێتـە (جـەزر) چـەند دەرگایـەكی بـۆ دروسـت دەكـەن تـەنها یـەك دەرگایـان دەكەنـەوە ئاوەكـە بەتـەوژم دەردەچـێت تۆڕبینی لەبەردەمـدا دادەنـێن و كارەبـای لێ دروسـت دەكـەن، چـەندەها نموونـەی واهەیە بـۆ گێڕانـی ئاشـی بـا بـۆ كارەبـا دروسـت كـردن هـەزاران دێ سـوود لەمانـە وەردەگرن، مەبەست ئەوەیە بەكارهێنانی بەڵگەی گەردوونـە بـە عـەقڵ بـێ سـوود نابێت.

بـەڵام لـە پـەروەردەی مرۆڤـدا عـەقڵ بەتـەنها بـەس نییـە، تێكـەڵ ناكرێـت مـرۆڤ پێویستی بەكەسێتی بەهێزە. كەسێتیەكی تەواوكە بتوانێت پـەیامی خـوای گـەورە جێ بەجێ بكات ئەو كەسێتیە بە تەنها بە لۆجیك و عەقڵ دروست نابێت.

بۆئەوەی ئیمان بچێتە ناو عەقڵەوە ئەبێ بچێتە ناو دڵەوە چونكە ژیـان هـەمووی خۆشەویستی لەگەڵە، ئیصلاحی لەگەڵە، وەفای لەگەڵە، ئەمانە هیچی لۆجیك نین، ئیمان كەچووە دڵەوە ئەو وورده سۆزو هێزەی دڵ دەچێت بەرەو كوێ؟ بەرەو ئـەو شوێنەی كەعەقڵ دۆزیویەتەوە، ئەڵێت: ئەمە خێرە هەوڵ دەدات ئـەو خێـرەت بـۆ جێ بەجێ بكات، ئەوەی كەدەڕوات بـەرەو عـەقڵ ئـەوە شـەڕە خێرنییـە ئـەو دڵـە، ڕقی لەو شتە دەبێتەوە ڕقی لەو كارە دەبێتەوە ئەڕوات و هـەوڵ دەدات جێبـەجێی نەكات. كام عەقڵ؟ ئەو عەقڵەی كە دەوری پڵێتەیەك دەبینێت و سووتەمەنیەكەی شـەریعەتی خـوای گەورەیـە. هـیچ بیروباوەڕێـك مرۆڤێكـی كامـڵ دروسـت ناكـات

ئیسلام نەبێت، ئیسلام ئەو (فطرة)ە پاکەیە، ئەو تۆوە جوانەیە کەخوای گەورە دەیخاتە دڵی هەموو مرۆڤێکەوە تۆوی هەموو جۆرە خێرێکە. داوای یەک شتت لێ دەکات کە بەناوی ئیسلام ئاو بدرێت بەروبومێکی دەبێت هەڵەی بەشەریەت لەوایە کە ئەم دڵە ئاو نادات بەناوی ئیسلام بۆیە دەکەوێتە ئەو زەلکاوەی کە دەبینرێت.

ئیسلام دەکرێت بەسێ بەشەوە:

بەشی یەکەمی (عەقیدە)یە بیروباوەڕە بۆئەوەی ئەم عەقڵە ڕاوبۆچوونێکی ڕێک و ڕاستی بۆ دروست ببێت.

بەشی دووەم: عیبادەتە بۆ ئەوەی دڵنیایی بدات بەدڵ بیدات بەرۆحی ئەو مرۆڤە.

بەشی سێیەم: (تشریع) تەشریعە بۆ ئەوەی ئەو مرۆڤە پارێزراو بێت، عەقڵی پارێزراو بێت، ناموسی پارێزراو بێت، خێرو ژیانی پارێزراوبێت و ماڵ و سامانی پارێزراو بێت. ئیتر چی دەمێنێتەوە؟!

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿لا يؤمن احدكم حتى اكون أحب اليه من ولده ووالده والناس أجمعين﴾[٢٨٧] واتە: ئیمانت تەواو نابێت هەتا پێغەمبەرت لەماڵ و سامان و منداڵ و هەموو خەڵکی‌و نەفسی خۆیشت زیاتر خۆش نەوێ دینەکە ئاوامان فێر دەکات کەبەتەنها (لۆجیك وعەقڵ) بەس نییە بۆ کەسێتی مرۆڤ.

کەسێتی مرۆڤ دووبەشە: بەشێکی فکریەو بەشێکی نەفسییە بەشە فکریەکە ئەوە عەقڵ و لۆجیك و ئەمانە چارەسەری دەکەن ئەی بەشە نەفسییەکەی چۆن؟ لێرەدا بۆت دەردەکەوێت کەشارستانیەتی ڕۆژئاوایی‌و ئەو کەسانەی کەشارستانێتی ڕۆژئاوایی کاری تێ کردون وە لەناو ئێمەشدا دەژین هەندێکیان، بیروبۆچونی سەرسوورهێنەریان هەیە کە نامۆیە لەلامان. ئێمە هەر بۆچوونێکمان هەیە

---

([٢٨٧]) صحيح مسلم / كتاب الايمان / رقم (٦٣).

هەرچی بیروباوەڕێکمان هەیە ئەگەڕێتەوە بۆ (لا الـه الا الله محمد رسول الله) بوونیادی ژیان و بوونی ئێمە (عەقیدەی تەوحیدە) بیروباوەڕی یەکتاپەرستیە. یاسای ئەخلاقمان لەسەر ئەوە دروست بووە، یاسای کۆمەڵایەتیمان لەسەر ئەوە دروست بووە، یاسای ڕۆشنبیریمان لەسەر ئەوە دروست دەبێت، یاسای ماڵداریمان لەسەر ئەوە دروست دەبێت. جگە لەمانە لەسەر شتێکی تر دروست دەبێت.

تێبینی بکەن: (بەرژەوەندی گشتی) واتە: لەزەتی شەخسی شارستانیەتی ڕۆژئاوا لەسەر ئەوە دروست بووە، هەر لەمنداڵیەوە ئاوا فێر دەکرێت کە هەچ شتێك لەسوودی خۆتدا نەبوو نەیکەیت هەچ شتێك زەرەری خۆتی تیابوو نەیکەیت با سوودی خەڵکی تێدا بێت. ئەمە ئەچێتە عەقڵی ئەو منداڵەوە ئەچێتە ناو دەروونیەوە ئەچێتە ناو ئاکارو رەوشتیەوە وەچووە. برایەك ئەگێڕێتەوە لەئوستڕالیاوە ئەڵێت کەمن جار بەجار یارمەتی ئەنێرمەوە بۆ باوکم خەڵکی ئەوێ سەریان سوڕدەمێنێ، ئەڵێن چۆن حەقی خۆت دەدەی بەیەکێکی تر، ئەڵێم: باوکمە! نیەتی! ئێمە لەووڵاتێکدا دەژین ئەگەر لەلای ئێوە لە (٩-١٠٪) گەنجتان ئیشی نەبێت لای ئێمە لە (٨٥٪) زیاتر ئیشیان نییە، باوکم منی بەخێو کردووە، پەکی کەوتووە، ناچێت بەعەقڵیاندا چۆن ئەو گرفتی هەیەو تۆ بۆی چارەسەر دەکەیت، بزانە ئەو (مبدأ)ە چی لێ کردوون!؟ مەسەلەی هاوکاری و فیداکاری و یارمەتی یەکتردان ئەمانە لەلایان بوونی نییە چونکە بەشێرێکی تر پەروەردەکراون زۆر کەس حەز دەکات موناقەشە ببێت لەنێوان ئیسلامی‌و غەیری ئیسلامی ئەوەنیەتێکی باشە بەڵام ئەوە چارەسەر ناکرێ چونکە ئەو بەشتێکی تر پەروەردە کراوە تۆ ئەتەوێ دوولق بدەی لەیەك بیانکەیت بەیەك بۆ ئەوەی ببێت بەیەك لق بەڵام قەدەکانیان جیاوازە ئەوە هەرناکرێ تەنها لەحاڵەتێکدا نەبێت ئەو شتە دەرکا لەمێشکی خۆی نەبێ لەسفرەوە دەست پێ بکات ئینجا ڕێدەکەوین،

تۆمەنجەڵێك یا قاپێكت هەیە نەتەوێت شلەمەنییەكی تێبكەی تەماشا ئەكەیت بڵقە بڵقێك دەكاو هەواكەی دەرەچێت و ئینجا ڕێدەدات ئەو شلەمەنییە بێتە ناوی (ما جعل الله لرجل من قلبين في جوفه)[٣٨٨] ئەوە دەبێتە دژیەك لەبیروباوەڕدا ئەبێ واز لەوە بێنێت ئینجا ئەوە قبوڵ دەكات. لێرەدا خاڵێكی گرنگ هەیە پێویستە ڕوونی بكەمەوە: لە قورئانی پیرۆزدا (دووسەد)ئایەتی خوای گەورە پەیڤین و گوتار لەگەڵ غەیری موسڵماندا وەك:

﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ ۝١﴾[٣٨٩]

دینەكەمان ئیمانی بەو گفتوگۆیە هەیە بەڵام لەسنووری سیستمی مەعریفیدا كەهەموو كەسێ هەیەتی، ئێمە سیستمێكی ترمان هەیە پێی دەڵێن (سیستمی حرمات) بۆ ئەوەی روون ببێتەوە نموونەیەك دەخوازین:

ئەگەر یەكێك بە میوانی بڕوات بۆ ماڵێك كەدانەنیشێ خاوەن ماڵەكە ئەچێت ئاو یان شتێكی تری بۆ ئەهێنێ ئەو كەسە لەو ژوورەدا ئازادە ئەتوانێت لەو شوێنەی كە دانیشتووە بچێتە شوێنێكی تر یا تابلۆیەكی هەڵواسراو سەیری ئەكات یا كتێبخانەیەك دانراوە كتێبێك دەردەهێنێت و ئەیخوێنێتەوە لێرەدا ئازادە، بەڵام ئایا كەس قبوڵ دەكات كە بچێتە ژووری نووستنی ئەو خێزانەوە دەستكاری جل و بەرگ و كەل و پەلی ئەو خێزانە بكات؟ ئەوەی زەڕەیەك مرۆڤایەتی تیا بێت ئەوە قبوڵ ناكات هەروەها خۆیشی ئەو كردارە ناكات بۆچی؟ چونكە ئێمە سیستەمێكمان هەیە موناقەشەی ناوێت پێی دەوترێ سیستمی شەرەف و ناموس و ئەخلاق ئەوە قابیل نییە بۆ موناقەشە كەپێی دەوترێ (سیستمی حورومات) ئەو

---

(٣٨٨) مسند أحمد / كتاب مسند بني هاشم / رقم (٢٢٨٥).

(٣٨٩) الكافرون / ١.

کەسانەی کە ئیسلام پەروەردەی نەکردوون ئەمە ناچێ بەمێشکیاندا لەموناقەشەدا ئەیانەوێت قسە بەپێغەمبەرەکەت، دینت، قورئانت، بڵێن و تۆ قسە نەکەیت ئەیەوێ ئەمە بە موناقەشە بزانیت ئەیەوێ تۆش قسە نەکەیت، ئێمە ئەو شتە قبوڵ ناکەین، ناچێت بەعەقڵیاندا چونکە خۆیان ئەم سیستەمەیان نییە، بەچی پەروەردە بوون؟ بەوەی کەهەموو شتێك ئەگەڕێتەوە بۆ (منطق) و بۆ بەرژەوەندی تایبەتی... لەوانەیە ئەو بەراوردێکی ماددی بکاو بڵێ باشە تۆ ئەم کتێبەبایی (٥٠٠ دینارە) بۆ دەستکاری ئەکەم تورە نابێت کەچی جلی خێزانەکەت بایی (٥٠دینارە) تورە دەبیت ئەوان بەماددە شت دەپێون، ئایا تۆقبوڵتە بەوە.؟!

خاڵێکی تر هەیە کە زانستی پزیشکی (طب) سەلماندی کە (٨٠ تایبەتمەندی زیاتر) هەیە لەمێشکی مرۆڤ دا ئەم مێشکە دووبەشە: بەشی لای ڕاستمان هەیەو بەشی لای چەپمان هەیە کە کۆمپیوتەریان دروست کرد ئەیانەوێ بە کۆمپیوتەر لاسایی کاری لای چەپی مێشك بکەنەوە. پنتیۆمی یەکەم و دووەم و سێهەم تا گەیشتۆتە پنتیۆمی پێنجەم هێشتا مێشکەکە زۆر ڕاقی ترە لەو بەس لاسایی مێشك دەکاتەوەکە وەرگرتنی زانیاریو پۆلێن کردنیو پێشکەشکردنەوەی لەکاتی داواکردنیدا.. کۆمپیوتەر لاسایی لای چەپی مێشکی مرۆڤ دەکاتەوە مرۆڤی رۆژئاوایی زۆر ئەو بەشە بەکاردەهێنێت چونکە بەشی لۆجیك (منطق) لەوێدایە، ئەی بەشی لای ڕاست (خۆشەویستیو سۆزو بەزەییو ڕاستگۆییو ئەمانەت و وەفا و فیداکاریو... هتد دەگرێتەوە) ئایا ئەم بەشە بشۆمەوە؟! سەیرە، چۆن دەگونجێت!! بێجگە لە ئیسلام ئەو دووبەشە پڕ دەکاتەوە هیچ مەبدەئێکی تر پڕی ناکاتەوە.

٢/ئایاتی موعجیزات: لەقورئانی پیرۆزدا ئەو بەڵگانەی کەبەشێوەی موعجیزە هاتووە بۆ پێغەمبەران ووشەی (آیات) ی بەکارهێناوە (ان في ذلك لآية) باسی

حوشترەکەی حەزرەتی صالح ئەکات و پێی دەفەرموێت (آیة) باسی موعجیزەکانی حەزرەتی (عیسا) دەکات (علیە السلام) بە (آیـة) ناویان دەبات. (عەصاکەی) حەزرەتی موساو پەرجووەکانی حەزرەتی موسا ئەمانە (آیات)ن.

پەرجوو (معجزە) چییە؟ بێین پێناسەی بکەین موعجیزە پێنج مەرجی هەیە:

١/أمر خارق للعادة: واتە کارێکە لەئاسایی بەدەرە.

٢/خوای گەورە ئەیکات.

٣/ لەسەر دەستی پێغەمبەرێك ڕوودەدات.

٤/ بۆ بەڕاست زانینو پشتگیری ئەو پێغەمبەرەیە بۆ ئەوەی خەڵك باوەڕی پێ بکات.

٥/ تەحەددای لەگەڵە.

بۆ نموونە: دارەکەی حەزرەتی موسا بوو بەئەژدیها ئەمە شتێکە لەئاسایی بەدەرە چونکە ئەژدیها لەدارەوە دروست نابێت لە هێلکەیەکەوە دروست دەبێت ئەمە لەئاسایی بەدەرە، کێ ئەمەی کرد؟ خوای گەورە. لەسەر دەستی چ پێغەمبەرێك؟ لەسەر دەستی حەزرەتی مووسا. بۆچی کردی؟ بۆ ئەوەی خەڵك باوەڕی پێ بکات، ئەوانیش بەیانیەکەی ساحیربوون و کافربوون ئێوارەکەی شەهیدبوون. وەشێوازی چییە؟ شێوازی تەحەددای هەیە. وە هەموو موعجیزەکانی کە خوای گەورە داوێتی بەپێغەمبەران (علیهم السلام) پێی دەوترێ (موعجیزانی بینراو) هەستی پێ کراوەو بینراوەو ئەو گەلە بینیوویانە شادبوون پێی ئەو پێغەمبەرەیان پێ بەڕاست زانیوە، هەستیان بەبەرەکەتی کردووە. بەس ئەوەی دوای ئەوان مەحروم بوون لێی. بەڵام یەك موعجیزە هەیە کەعەقڵییە وەهەتا هەتاییە ئەویش کە قورئانی پیرۆزە ئەوەی کە شاهیدە لەکاتی (نزول)یدا ئەوەی ئێستا هەیە ئەوەی هەزار ساڵی تریش دێت بێ بەش نییە لەبەرەکەتەکەی.

**جیاوازی موعجیزە لەگەڵ کەرامەتدا چییە؟**

**موعجیزە بۆ پێغەمبەرێکە لەناسایی بە دەرە، کەرامەت بۆ پیاو چاکێکە، بۆ بەڕاستزانینی پێغەمبەرێکە، بۆ پشتگیریەتیو تەحەددای لەگەڵە بەڵام کەرامەت تەحەددای لەگەڵ نییە وەداواکاری لەگەڵدا نییە خوای گەورە خۆی کەرامەتی ئەدات بەو کەسە یاخود بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات لەگرفتێك یاخود بۆ ئەوەیە ئەو کەسە بزانێ خوای گەورە خۆشی دەوێت، خەڵاتێکی ئەداتێ.**

**پێغەمبەر وەك هەموو پێغەمبەرانی تر (علیهم السلام) موعجیزاتی هەبووە لە (موعجیزاتی بینراو) وەك ئەو کاتەی کە داوایان کرد مانگ لەت ببێ، ئەویش دوعای کردو مانگ لەت بوو لەبەرچاوی هەموویان. وە موعجیزاتی تر (١٣) جار ویستیان بیکوژن بەڵام خوای گەورە بەتاڵی کردەوەو دەفەرموێت:**

﴿وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۝٦٧﴾[٣٩٠]

**بەڵام کەراماتی زۆر زۆرە بۆیە دەڵێین کەرامات چونکە تەحەددای تیانییە و جیاوازە لەگەڵ (معجیزات) چەند دانەیەك باس دەکەین: لەشەڕی (مؤتە) ئەصحابەکان (١٠هەزار) کەس بوون کەم خواردن بوون و خەریکبوو بێ ئاویش دەبوون. پێغەمبەر فەرمووی: چیتان پێیە بیهێنن لەسەر ئەو ڕاخەرە داینێن هەندێك خورمایان پێبوو هێنایان بۆ خزمەتی فەرمووی وەرن بەشی خۆتان وەرگرن هەر (١٠هەزار) ەکە هاتن بەشی خۆیان وەگرت و تێربوون و لێشیان زیادبوو ئەمە کەرامەتێکە کە خوای گەورە پێی بەخشیوە.**

**هەر لەشەڕی (مؤتە)دا خەریك بوو ئاویان پێ نەدەما. فەرمووی: چی ئاوێکتان پێیە وەرن بیکەن بەدەستمداو داوای تەشتێکی کرد. ئاوەکەیان کرد بەدەستیا**

---

(٣٩٠) المائدة / ٦٧.

فــەرمووی وەرن بەشــی خۆتــان ئــاو وەربگــرن. تەماشــایان کــرد لەهــەر (١٠پەنجەکەیەوە) ئاوی لێ دێت هەر دەهەزارەکە ئاویان خواردەوەو دەست نوێژیان لێ گرت. کەرامەتێکی تر، هەندێ شیریان لە (لەگەنێکدا) بوو بەشی دووکەس یان سێ کەس ئەبوو دایانە دەست (ابی هریرة) ئەویش بردیە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی بیبە دەرەوە بیدە بەئەهلی (صفە) ئەمانیش ٦٠ کەس یان ٧٠ کەس دەبوون هەر هەموویان لێیان خواردەوە هەتا تێر نەبوونایە نەیان ئەدا بەوی تر هەمویان تێربوون ئینجا (ابی هریرة) هاتە ژوورەوە فەرمووی: یارسول الله هەروەکو خۆی وایە فەرمووی خۆشت لێی بخۆ خۆیشی لێ خواردو هەر پێی دەوت (اشرب اشرب) بخۆرەوە بخۆرەوە هەر ئەی خواردەوە. ئینجا خۆی خواردیەوە هێشتا هەروەکو خۆی مابووەوە. چەندین کەراماتی وای هەبووە (ﷺ).

بەشی سێیەم: (معجزات القرآن) ئاياتی قورئانە خۆی قورئانی پیرۆز (تحدی)یەو ئەفەرموێ بەکاری بهێنن بۆ (تحدی) وەمەترسن (لاتنقضي عجائبه) لەهەچ بارێکدا قورئان بەکاربهێنی سەرسام بوون پێی تەواو نابێ، شتێك نییە بلێی بەسەر ئەچێت، خوا ئەفەرموێ:

﴿وَجَٰهِدۡهُم بِهِۦ جِهَادٗا كَبِيرٗا ۝٥٢﴾[391].

هەروەها لەقورئانی پیرۆزدا (تحدی)یەکی تیایەو ئەفەرموێ :

﴿قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا﴾[392].

---

([391]) الفرقان / ٥٢.

هەموو مرۆڤ و پەری کۆببنەوە بیانەوێ قورئانێك دروسکەن ناتوانن هەرواش بوو نەیاتوانی. (تحدی)کەی کەم کردەوە

﴿قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ ﴿١٣﴾﴾ (٣٩٣).

دە سورەت بهێننەوە هەر نەیان توانی (تحدی)ی کەمتر کردەوە.

﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن ﴿٢٣﴾﴾ (٣٩٤)

واتە: سورەتێك بهێننەوە (من مثله) یەعنی وەك (محمد) نەخوێندەوار بێت، قورئان کەباسی پێغەمبەر دەکات:

﴿قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾﴾ (٣٩٥)

قورئان لەزمان پێغەمبەرەوە دەدوێ: ئەگەر خوا نەبوایە من چوزانم قورئان چییە من (٤٠) ساڵ لەناوتاندا بووم زانیتان کە نەخوێندەوارم ئێستاش نەخوێندەوارم ئەی لەکت و پڕێکدا ئەم هەموو حیکمەت و گەوهەرە چی بوو لە زاریەوە باری (ﷺ) ئەگەر وەحی نەبوایە. دەبڕۆن ئێوەش یەکێك بێنن نەخوێندەوار بێت وەك محمد دەیابزانین یەك سورەت بهێنێتەوە. تحدی کەی کەم کردەوە:

﴿فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ ﴿٣٨﴾﴾ (٣٩٦)

---

(٣٩٢) الاسراء / ٨٨.

(٣٩٣) هود / ١٣.

(٣٩٤) البقرة / ٢٣.

(٣٩٥) یونس / ١٦.

**(من) کەی لابردو کەمتری کردەوە بەلاّم هەر نەیان توانی، کەمتری کردەوە:**

﴿فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ ﴿٣٤﴾﴾[٢٩٧]

**هەر ووشەیەك بێت هەر لەو بچێت، هەر نەیانتوانی، کە خۆیان ئەهلی (بدیع وبیان) بوون. قورئان (تحدی) تری تیا هەیە وەك:**

﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ ﴿١﴾﴾[٢٩٨]

**کە (تاکید)یەکی خوای گەورەیە کە ئەو مامەی پێغەمبەرە ئەچێتە دۆزەخ.**

**قورئان دەفەرموێو خوا دەزانێ کە ئەو پیاوە ئیمان ناهێنێ ئەمەش یەکێکە لەئایاتی قورئانی پیرۆز کە (معجزات)ە، (استاذ)ێك کە مامۆستای (القانون المقارن) لەپاریس ئەڵێ: هەڵەیەکی گەورەیە هەست بە گەورەیی شەریعەتی ئیسلامی نەکرێ سیستەمێکی فیقهی زۆر گەورە و گرنگە لەجیهانی نوێدا. لەساڵی (١٩٣٧)دا ئەمە گوتارێك بێت بۆ ئەو کەسانەی (مؤتمر القانون الدولي) لە لاهای بەسترا بەشداربووەکان زۆربەیان موسڵمان نەبوون کەهەمووی یاساناسی رۆژئاوایی بوون لەبڕیارەکان، (ئەو کۆنفرانسە) ئەمانەی تیابوو:**

**١/ اعتبار الشريعه الاسلاميه مصدرا من أهم مصادر التشريع. بڕیاردرا لەو کۆنفرانسەدا کە شەریعەتی ئیسلامی گرنگترین سەرچاوەیە بۆ یاسادانان.**

**٢/ اعتبار الوحي صالحاً للتطور. ئەبێ ئاوا شەریعەتی ئیسلامی تەماشا بکرێ کە شەریعەتێکی زیندووە وەهێزی پێشکەوتنی تیا هەیە.**

---

(٢٩٦) یونس / ٣٨.

(٢٩٧) الطور / ٣٤.

(٢٩٨) المسد / ١.

٣/ اعتبارها قائمة بذاتها وليست مأخوذة من غيرها. شەریعەتێکی سەربەخۆیە وەلەهیچ سەرچاوەیەکی ترەوە وەرنەگیراوە.

## باسی چل

## پەیڤین لەمەڕ ژیننامەی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ

تێبینی /

ئەم پەیڤینە لە مانگی رەبیع الاولی ١٤٢٢ لەگەڵ بەڕێز مامۆستا شەماڵ موفتی دا لەلایەن ئامادەکارەوە ساز کراوە.

* * *

+ سەرەتا بەخێرهاتن لەجەنابی مامۆستا شەماڵ ئەکەین.

- سەلامەتبن، سوپاس.

+ پرسیاری یەکەممان لەخزمەت بەڕێزتاندا ئەوەیە ئایا ئەرکی پێغەمبەری گەورە حەزرەتی محمد (ﷺ) لەژیانداچی بوو...؟

- بسم الله الرحمن الرحیم... الحمد للهوالصلاه والسلام علی رسول الله وعلی اله وصحبهومنوالاه..

پێشەکی من زۆر زۆر لەوە بچوکترم کەباسی پێغەمبەربکەم.ﷺ ، بەڵام ئەوەی کەدەیزانم ئەوەیە ئەرکی سەرەکی رسول الله. ئەوەبوو.. ئەو پەیامەی کەبۆی هاتووەئەو ئەمانەتەکەلەخواوە بۆی هاتووە بیگەیەنێتە خەڵکی (التبلیغ عن الله..)

+ ئەکرێت روون کردنەوەی لەسەربفەرموون.. چۆن؟

- بەڵێ خوای گەورە ئەفەرموێت

(هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولاً مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَـٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾)(٣٩٩)

**ئەمە یەکێکە لەئەرکەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)،کەڕوون کردنەوەی پەیامەکەی خوایە، ئەوە ئەرکی یەکەم، پاشان ، ویزکیهم واتە: پەروەردەی ئیمانداران بکات..بەو شێوەیەی کەخوا پێی خۆشە.دڵودەروونیان وە رەوشتیان، ئاکاریان جوان بکات وەپاشان،ویعلمهم الکتاب، شەریعەتیان فێرکات، والحکمە، ئینجا حیکمەت و داناییان فێرکات،کە هۆکارێکی زۆر زۆر پێویستە بۆ ژیان..**

**ئەرکێکی تر:**

(وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَـٰلَ ٱلَّتِى كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡ ﴿١٥٧﴾)(٤٠٠)

**ئەم پەروەردەیە چەند کۆسپێك ڕێگریەتی وەکو: ئەو ڕکەبەری (عنادی)و قەسوەتەی کەلەدڵی ئەوخەڵکەدایە، بەهۆی هۆزگەرییەوەبێت،بەهۆی ئەو ژینگەسەختەوەبێت ئینجا ئەو قەسوەتە لەهەستا بێت یان، لەمێشکدا... هتد، ئەمانەئەبێت هەمووی لابرێن، ڕۆژانێك هەبوو زیندەبەچاڵی کچیان ئەکردئەم هەمووداردە کۆمەڵایەتیانەو، بۆچونی تەسك و ئاسۆی تەسك، لەبیرکردنەوەدا بەشێوەی تاكوکۆمەڵ ئەمە هەمووی (اغلال‌واصر)بوو لەسەر ئەو خەڵکەو**

---

(٣٩٩) الجمعة / ٢.

(٤٠٠) الأعراف / ١٥٧ .

قورساییەك بوو كەڵكە كرابوو لەچەندین لاوە ئەركی رسول الله (صلی الله علیه وسلم)ئەوەبوو كەلای ببات.. والله أعلم..

+ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)چۆن توانی هەڵسێت بەم كارەگرنگانە؟

- خوایگەورە لەناو مرۆڤایەتیدا دڵی ئەوی بەچاك تر وپاك ترو رێكوپێكتر زانی كەشایستەی ئەو پەیامەبێت واتە (أطهرمن في الأرض) (علیه الصلاە والسلام)كەشایستەی ئەو پەیامەبێت، واتە: یارمەتییەكی خوایی لەگەڵدابووە، خوای گەورە ئەفەرموێت:

(وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾)[401]

بەڕاستی ڕەوشتت بەرز و جوانە.. هەموو ڕەوشتەكانت بەرزو گرنگن، خوای متعال ئەفەرموێ: (گرنگ) وە رسول الله ئەفەرموێ: أدبني ربي فأحسن تأديبي[402]جا زاتێك خوا ستایشی بكاو خوا پشتگیری بكات.

(وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ ﴿٦٧﴾)[403]

بێگومان ئەتوانێت هەڵسێت بەوكارانە.

+ ئەكرێت بەڕێزتان چەند نموونەیەك پێش چاو بخەن لەچەن بوارێكی جیاوازی ژیانی پێغەمبەری خوادا.

- پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ خەیرێك نەما باسی نەكات و ئەمری پێ نەكات، خۆی جێبەجێی نەكات، هیچ ڕەوشتێكی ناشیرین نەماكەنەهی لێ نەكات، لەو

---

(٤٠١) القلم / ٤.

(٤٠٢) هەرچەندە فەرموودەیەكی زۆر بڵاوو دیاری بەڵام ئێمە تەنها لەم سەرچاوەیەدا دۆزیمانەوە (أبجد العلوم) الجزء ٢ / ص٣٨٧ / صديق بن حسن القنوجي / ١٩٨٧ / المحقق: عبدالجبار رزكار.

(٤٠٣) المائدة / ٦٧.

ڕەوشتانەی کە (رسول الله) ﷺ ئەمری کردووە کە ئومەتەکەی جێبەجێی بکات، هەموو جۆرە ڕەوشت و ئاکارێکی جوان بووە، وەکاتێکیش کە جێبەجێی کردووە لەئاستی لوتکەدا جێبەجێی کردووە بۆ نموونە: لەئازایەتیدا هاوەڵانی ئەگێڕنەوە(كنا إذا حمي الوطيس نحتمي برسول الله ﷺ ) لەکاتی گەرمەی شەڕدا ئەچووینە پشت پێغەمبەرەوە((ﷺ))چونکە ئەو لەپێشیپێشەوەبووە وهەمیشە ئەوبەرەو ڕووی دوژمن بووەتەوە، ئەوەنمونەیەکە بۆ ئازایەتی (رسول الله)ﷺ .

+ ئەی سەبارەت بەدڵفراوانیولێبوردنی پێغەمبەر.

- بەڵێ پێغەمبەری خوا((ﷺ)) لەچەندین فەرموودەدا هانی موسڵمانان ئەدات کەلێبوردەبن، خۆیپێش هەموویان لێبوردەبووە، کاتێ سیانزەدانەساڵ ئەشکەنجەوناڕەحەتیومل ملانێ لەگەڵ ئەهلی مەککە تاوایان لێکردووە جگەلەو ناوناتۆرە ناشیرینانەکە ڕاوی بنێن وە عەزیەتی بدەن وەعەزیەتی هاوەڵانی بدەن وایان لێ بکەن ئەو نیشتمانە بەجێ بهێڵن کاتێکیش کە فەتحی مەککەی کرد ((ﷺ))چی بەخەڵکەکەوت (أذهبوا فأنتم الطلقاء)[٤٠٤] هەموویانی عەفوکرد.

+ پێغەمبەر(ﷺ)وەك سەرکردەیەك چۆن بووە؟

- سەرکردەی دنیایی شتێکەو سەرکردەیەك کە لەهەمان کاتدا پێغەمبەربێت شتێکی ترە، ئەم پێغەمبەرە ((ﷺ))لەکاتی فەتحی مەککەدا ئیتر کاتی سەرکەوتنە سەرکەوتنێکی سیاسیوسەرکەوتنێکی ئابورییە، سەرکەوتنێکی سەربازییە لەوکاتەدا ئیترکاتی سەربەرزکردنەوەو غرورەوکاتی فەخرو شانازیە کەئەو سەرکردەیە ئیتر وتار بخوێنێتەوە ئێمەوامان کردو وامان کرد(رسول الله) صلى الله عليه وسلم سەری لێ دانەواندبوو ڕیشی موبارەکی بەرپشتی حوشترەکەی ئەکەوت ئاوامل کەچ بوو بۆخوای گەورە لەوکاتی سەرکەوتنەدا پاشان کەوەفاتی

---

([٤٠٤]) نيل الاوطار / الجزء ٨ / ص١٤٨.

فـەرموو ئـەوەی بـەجێ‌ی هێـشت نەئەگەیـشتە چـەندپەنجاییەك. وە بیمـەی کۆمەڵایەتی دا بەمیللەتەکەی ((انـا ولی ومـن لاولی لـه)) ئـیتر ئەوکەسـەی کـەباوکی نییە ئەفەرموێ، من باوکی ئەوم، ئەوکەسـەی کـە کەسـی نییـە مـن کەسـی ئـەووم، ئەگـەر قـەرزدارە مـن قـەرزی بۆئەدەمـەوە، ئەگـەر ئیـشی نییـە مـن ئیـشی بۆئەدۆزمـــەوە، ئەگـــەر پـــەنای نییـــە مـــن ئەبمەپەنای‌ئـــەو، ئەمەیـــە ســـەرکردە..((ﷺ))تـــەرکیزی ئەخـــستەسەر خۆشەویـــستی ســـەرهاوکاری سەربرایەتی((ﷺ))لەهەمووکەسێکی ئەپرسیـیەوە، پیرەژنێـك هـەبوو مزگـەوتی پاك ئەکردەوە ماوەیەك دیارنەما ئەحواڵی پرسی، وتیان: یارسول الله وەفاتی کـرد، فـەرمووی: بۆپێتـان نـەوتووم، تەشـریفی موبـارەکی بـردە سـەرگۆڕەکەی‌و لـەوێ دوعـای خێـری بۆکرد، کـەرەتێکیان ئـەحواڵی دوکانـدارێکی پرسی عـەرزیان کـرد یارسـول الله وەفاتی فـەرمووە، بەهـەمان شێوە فـەرمووی: بۆچی پێتـان نـەوتووم، بـەلای هاوەڵانیـشەوە زۆر گـرنگ نـەبوو لـەلایان کابرایـەکی سـادە بـوو ئـەهلی صـفەنەبوو بڵێـی بیـست‌وچوارسەعات لەمزگەوتـدابێ، یـاخود ئـەهلی زانـست و زانیاری بێـت بـەڵکو دوکاندارێك‌ولەفەرزەکانـدا دەهـات بـۆ مزگـەوت و بـەگرنگیان نـەزانی کـە لـەکاتی پێغەمبـەر بگـرن بۆمەسـەلەیەکی ئـاوا، دیـسان چـووە سـەر گۆڕەکـەی‌و وەبـە هاوەڵـەکانی فـەرموو: (انـه کـان یحب اللەورسـوله) زۆر گـەورەیـە لەلای خوائەم پیاوە، خاوەنی خۆشەویستی خـواو پێغەمبـەربوو ئەمەزۆرگەورەیـە ئەوە وای لێکرد کە رسول الله هەمیشە ئەحواڵی بپرسێ.

+ یـەکێ لەوسـیفەتانەی پێغەمبـەر(ﷺ)کەتائێـستاش بـاس ئـەکرێ ئەوەیـە کەلەڕووی خێزانی‌و کۆمەڵایەتییەوە وەك باوکێك نموونەی: باوکێکی گەورەوچاك بووە لەو بارەیەوە چی ئەفەرموون..

- ئەگێرنەوە کاتێك کە فاطمە ی کچی (سەلامی خوای لێبێت) تەشریفی هێناوە بۆماڵی باوکی(پێغەمبەریخوا) ﷺ پێغەمبەرلەبەری هەستاوە باوەشی پیاکردووە بەخێرهاتنی کردووە لەلای خۆیەوە دایناوە، ئەوەئەگەر سەیر بکەین چۆن فاطمە ی دابەشوو بۆئەوەی هەموو باوکێك دەرس وەرگرێت بزانێ چۆن کچەکەی ئەگەیەنێتە ماڵی مێردی خۆی، چونکە زۆر گرنگە ئەوە ئێستا مەجالی ئەوەنییە باسی بکەین.کە بەڕاستی نموونەیەکی زۆرزۆر گەورەبووە، پێشەوابووە:

(لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾)[٤٠٥]

واتە: لە گوفتارەکانیو کردارەکانیو حاڵی داو لەژیانی خێزانیداو لەژیانی کۆمەڵایەتیداپێغەمبەری خواپێشەوایە.. تاڕۆژی قیامەت ﷺ.

+ وەك بەخێوکەرێك پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەبینیت؟

- ئافرەتێك هاتەخزمەت پێغەمبەر((ﷺ)) منداڵێکی دەساڵەی لەگەڵدابوو وتی حەزئەکەم یارسول الله ئەم منداڵە لەماڵیتۆدا پەروەردەبێتولەڕەوشتی تۆوەرگرێووەخزمەتیشت بکات، ناوی(ئەنەسی کوڕی مالیك) بوو،پێغەمبەری خواقبوڵی کرد. بەدەساڵی (ئەنەس) چووە ماڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ)(١٠)ساڵ لەوێ مایەوە تا تەمەنی بوو بە (٢٠) ساڵ، پێغەمبەریخوا لە خۆشەویستیدا بە (ئونەیس) بانگی دەکرد کە ئەوە لەڕووی دەروونیەوە زۆر گرنگە بۆ بەرامبەر حەز بەچ ناوێك ئەکا تۆبەوناوە یا بەو نازناوەوە بانگیکەی ئەوە ڕەحمەت وخۆشەویستی و سۆز ئەکەوێتە نێوان هەردوولا..

ڕۆژێکیان چەند پەنجاییەکی دایەو فەرمووی: ئابڕۆ پەنیرم بۆبکرە.

---

(٤٠٥) الاحزاب / ٢١.

(ئونـەیس) رۆی هـەر نەهاتـەوە، لەبـەر ئـەوەی ئەمـە ئەمانەتێکیـشە لـەلای پێغەمبـەری‌خوا(ﷺ) چـوو بـۆ سـۆراغی، کـاتێ ئـەبینێ لەسـەری کۆڵانەکەلەگـەڵ منداڵاندا یاری دەکات.

پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: (انـیس یـاانیس این الأقـط) کوانێ پەنیرەکـە؟ ئەویش لە شەرماندا وەڵامی نەدایەوە.. رسول الله تـێ گەیـشت.. بۆیـە فـەرمووی: (أضـیعت الـدراهم)؟ واتـە: پەنجایـەکانت وونکـرد؟ أنـیس ووتـی: نعـم یارسـول الله...بەڵێ پێغەمبەری خوا وونم کردن.

دەوەرە ئێـستا ئـەم نمونەیـە بەسـەر خۆمانـدا جێبـەجێ بکـەین، پـارە بـدە بەکوڕەکـەت‌و ونـی بکـات‌و وەختـێ بـچیت بەدوایـدا تەماشـا بکـەی یـاری دەکـا، هەربەشـەق‌و زللـە نایهێنیتـەوە مـاڵێ ؟؟ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) چـی فـەرموو؟ مامۆستای مرۆڤایەتی..فەرمووی (یأتی الله بخیر منها)..خوا أنشاءالله لەوە باشترمان پـێ ئـەدات.. (أکمـل لعبـك والحقـنی بالبیـت) یاریەکـەت تـەواو بکـە پاشـان وەرەوە ماڵێ.. توخوا ئەمەبـەکێ ئـەکرێ؟! بەوسـەرکردەیە نـەبێ، بـەو مامۆسـتا گەورەیـە نەبێت (ﷺ).

+ پێغەمبەر صلى اللەعلیەوسلم وەك بەرگری کەرێك لەستەم لێکراوچۆن ئەبینن؟

- لەوفەرموودانەی کە داکۆکی دەکەن لەسەر دادپەروەری‌و بەرگری کردن لە ستەم لێکراو دژایەتی کردنی ستەمکاران، خۆی پێش هەموو کەسێك صلی اللەعلیەوسلم هەستاوەبەو ئەرکانە، کاتێك کەلەمەککەبوو، ڕۆژێك پیاوێك خۆی ئـەکات بەشاری مەککەدا ئەچێتەناوبەیتەوە، کۆمەڵێك لە بێ باوەڕان لەوێ دانیشتبوون ئەڵێ: مـن غەریبەیەکم کابرایەك ناوی(عەمری کوڕی هـشام)ە کۆمـەڵێك حوشـتری لێ کڕیـوم پارەکـەمم نـاداتێ وەنێـوە هـەوڵێکم بۆبـدەن.. ووتیـان: ئەوسـەرکردەمانە هـەوڵی چیت بۆبەین؟! بەڵام بۆ نوکتەو ڕابواردن مـاڵی پێغەمبـەریان پیـشاندا، بـۆ ئـەوەی

ئاگرەکە خۆشکەن وتیان ئەو پیاوە برادەریەتی بچۆ بەوبڵێ، ئەو حەقەکەت بۆئەسەنێ. ئەمانیش لەدوورەوە تەماشا ئەکەن بزانن ئەم شانۆیە بەرەو کوێ ئەڕوات، کابرای غەریبیش لەدەرگای ماڵی پێغەمبەری داو صلی اللەعلیە وسلم قاپی لێ کردەوە وتی: من غەریبم، بێکەسم، پیاوێکی ئەم شارە ناوی (عمری کوڕی هشام)ە لەودەشتە کۆمەڵێ حوشتری لێ کڕیوم، ئێستاهاتوم پارەکەم ناداتێ‌و ئینکاری‌و نکوڵی ئەکا..

پێغەمبەر (ﷺ) یەکسەرلەگەڵێدا ئەڕوات، بەرگری لەو ستەم لێکراوە غەریبە بێ کەسە ئەکات،لەدەرگای ماڵی (عمرو) ئەدات دەرگاکەی لێ کردەوە یەکسەر پێی وت: بۆ حەقی ئەم پیاوە ئەخۆی؟ خێراپارەکەی بدەرێ.

یەکسەر (عمرو) چووە ژورێ پارەکەی بۆهێناو حەقەکەی دایێ، کابراش دووعای خێری کردبۆ رسول اللە و وتی بەڕاستی کەئەو خەڵکە وتیان ئەوپیاوە حەقەکەت بۆئەسێنێ (اشهدباللە) وابوو، دوعای خێری بۆپێغەمبەر کردو ڕۆی.

دوایش بێ باوەڕان بە ئەبو جەهلیان وت واتە: (عمرو):

ئەرێ ئەوەچی بوو بووی بە فەروج بەرانبەر بە محمد؟ وتی: نازانم دووشت لەسەرشانی بوون هەرتۆقیم، نازانم لەسەری حوشتر ئەچوون! لەمار ئەچوون،!! بۆئەوەی ئەوشەڕەم لێدورکەوێتەوە خێراپارە کەم دا بەکابرا ئەمەنموونەیەکە، نموونەیەکی راستەکەپێغەمبەریخوا(ﷺ) بەرگری لە ستەم لێکراو کردووە.

+ خوای گەورەجل‌وجلالە چۆن وەصفی ئەم پێغەمبەرە ئازیزەئەکات(صلی اللەعلیەوسلم)...؟

- وەکو لەسەرەتادا ووتمان ئایەتێك هەیە

(وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾)[٤٠٦]

ئاوەها وەصفی ئەکات کەخاوەنی ڕەوشتە بەرزەکانە وە لەئایەتێکی تریشدا بەشێوەیەکی تر وەصفی ئەکات:

(لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾)[٤٠٧].

ئەم بڕگەیە با تیشکێکی بخەینە سەر.(عزیزعلیەماعنتم) ...(عزیز) یەعنی: قورسەلەلای (ثقیل علیە معاناتکم).. ئەوناڕەحەتیەی کە ئیماندار پیایدا ئەڕوات، زۆر قورسە لەلای پێغەمبەری خوا، بۆیە لە(حدیث)ێکدا فەرمویەتی:

(مایشاك المسلم من شوكة فمادونها إلاوجدت ألمها فی قلبی) أوكما قال.. واتە: دڕکێك بچێ بەلەشی یەکێکتاندا یان لەو دڕکەیش کەمتر هەست بەئازارەکەی ئەکەم. خوائەفەرموێ (عزیزعلیەماعنتم) زۆرقورسە لەلای محمد(صلی اللەعلیەوسلم)ببینێ ئوممەتەکەی لەکێشەدایە یان لەناڕەحەتیدایە، وەزۆر زۆرقورسە لەلای ئەگەر یەکێك لە ئوممەتەکەی بڕوات بەرەو دۆزەخ.

(حریص علیكم)هەمیشەخەمخۆرتانە،خەم خۆری دنیاو قیامەتت نە(بالمؤمنین رؤف رحیم)هەمیشەبەڕەحمو بەبەزییە بە ئیمانداران، هەمیشە هەوڵیداوە کەمافی پیر نەخورێ، مافی کەم دەم و دووەکان نەخورێ. لەوەسیەتەکانیا وەك (حجە الوداع) کەگەورەترین سەرچاوەیە زۆر جەختی لەسەر ئەمانە کردووتەوە،

---

(٤٠٦) القلم / ٤.

(٤٠٧) التوبة / ١٢٨.

لـه ئـاخر سـاتەكانى ژيانيـدا ئەفـەرموێ: (استوصوابالنـساءوماملكت أيمـانكم)[٤٠٨] ئەوانەی كە لەژێر دەستتاندان ئاگاتـان لێيـان بێت، كاتێ كەخوای گەورە بـەرزی ئەكاتەوە بۆ (معـراج) بۆمقابەلـەی خـوا لـەنێوان پەردەيەكـدا،خوای گەورە ئاشـتی خۆی دەبارێنێ بەسەريا(السلام عليك أيها النبىَ و رحمةالله وبركاته).

لـەو كاتـەدا ئێمـەی بيرناچـێ نـەك هـەر ئۆممەتەكـەی بـەڵكو هـەموو ئيمانـدارانی پێشينانو هی داهاتووشی بيرناچێ (السلام علينا) ئەو سەلام و ئاشـتی و ڕەحمـەت و بەرەكەتەی خوا ئەی ئێرم بۆ ئۆممەتەكەم. (وعلى عبادالله الصالحين) بۆهەموو صـالحێك، بۆهەمووخواناسـێكی يەكتاپەرسـت كـەپێش ئوممـەتی ئيـسلامی ئێمـە هـاتوون و شـوێن پێغەمبـەری خۆيـان كـەوتوون، سـەلامەكە بەئـەوانيش ئـەگا بۆهەموو مەلائيكەتێك بۆهەموو خواناسێك لە (مرۆڤ و پەریو فريشتە) كـاتێكش كەخوای گـەورە زينـدووی ئەكاتـەوە، يەكـەم وشـە كەپێغەمبـەریخوا ئەيفـەرموێ: (كيف حال أمتي ياجبريـل)؟ واتـە: جبريـل حـاڵی ئوممـەتم چۆنە؟بزانە چـەند بـە پەرۆشـە كـە خـوا ئەفـەرموێت (بـالمؤمنين رؤوف الـرحيم) ئەمـە ئـاوا بەئاسـانی نەووتـراوە، بەڵكو لەژيانيداولەساتی سەرەمەرگيداو لە زيندوو بوونەوەو حەشريدا (ﷺ)هەميشە خەريكی ڕەحمەتو هەميشە بەپەرۆشە بۆ ئوممەتەكەی، كاتێكيش كـە ئەگاتـە ئاسـتی قيامـەتو ميـزان و صـراط لەوێـشدا هـاواری خوائەكا(أمتي،أمتي)[٤٠٩] بە هەزارەها دروودو سڵاو بۆ سەر گيانی پيرۆزی.

+ هەڵوێستی پێغەمبەرصلى اللهعليهوسلم لەبارەی ئافرەتانەوەچۆن بووە؟

(٤٠٨) بە مەتنی جياواز هەيە لە (الجامع الكبير) روي أحمد وأبو داود باسناد صحيح عن أبي ذر، وروي الشيخان عن أنس كتاب (كشف الخفا) الجزء ١ / ص٧١.

(٤٠٩) مسند أبي عوانة (٢) / الجزء ١ / ص١٥٨.

- فەرموویەتی: (علیەالصلاەوالسلام) (أستوصوا بالنساءخیرا)[٤١٠] ئەوگۆڕانکاریەی کە پێغەمبەری خوا کردی لەمرۆڤدا هەموو ئاستێکی گرتەوە ئەو ئافرەتەی کە زیندەبەچاڵ ئەکرا، ئەو ئافرەتەی کاتێ کە مێردی دەمرد ئەبوو بەموڵکی کوڕەکەی‌و بەچاوێکی نزم تەماشای ئەکرا، کە ئەم هەموو بیرە چەوتانەی گۆڕی (النساء شقائق الرجال)[٤١١] کردی بە هاوشانی پیاو.. ئەو ئافرەتەی کە جاران زیندەبەچاڵ ئەکرا میراتی بۆدانا، لەم ئاینە پیرۆزەدا کچ ئەبێتە کلیلێک لەکلیلەکانی بەهەشت بۆئەوباوکە، مێرد کەبیەوێ بچێتە بەهەشت ئالیەتی چوونە بەهەشتی ئافرەتە، ڕێزگرتن لەپیاو پێوەرەکەی ئافرەتە، بەو واتایەی تێبینی ئەم فەرموودەیە بکە (ماأکرمهن الاکریم وماأهانهن إلألئیم) هەرچی ڕێزیان لێ بگرێ ڕێزدارەو هەرچی سووکایەتیان پێ بکا بێ نرخە، کەواتە پێوەری پیاو ژنەکەیەتی (خیرکم خیرکم لأهلة وأناخیرکم لأهلي)[٤١٢] چاکترینتان ئەوانەن کەچاکن لەگەڵ خێزانەکانیانا، وە من چاکترینم لەگەڵ خێزانمدا. توخوا یەکێك لەگەڵ نزیکترین کەسیاباش نەبێ لەگەڵ منوتۆیا باش ئەبێ؟! یەکێك وەفای نەبێ بۆ نزیکترین کەسی خۆی کەجلی ئەشواو خزمەتی ئەکاو نان ئەهێنێتە بەردەمی‌و شەرەفی ئەپارێزێ لەگەڵ خەڵکیدا گرنتی چییە کە باش بێت؟ ئەوئافرەتەی لەو شوێن و پێگەیەوە هێناو کردی بە شان بەشانی پیاو، وەبەرامبەر بەم شەریعەتە یەکسانن، بەرامبەر بەخوا یەکسانن، ئیتر ئافرەت کەواز لەنوێژبهێنێ حوکمی وەکو حوکمی پیاو وایە کە ڕۆژوو فەرزبوو بەسەرپیاو و ژنیشدا فەرزبووە، لەهەموو تاوانێکدا یەکسانن لەساتی هەموو عیبادەتێکدا یەکسانن.

---

([٤١٠]) صحیح مسلم / کتاب الرضاع / رقم (٢٦٧١).

([٤١١]) سنن الترمذي / کتاب الطهارة / رقم (١٠٥).

([٤١٢]) سنن ابن ماجة / النکاح / رقم (١٩٦٧).

+ خەڵكانێك هەن دەڵێن: گوایەپێغەمبەری خوا(ﷺ)شانازی بەعەرەبیەتی خۆیەوە كردووە، بەو بەڵگەیەی خۆڵی مەككەی هەڵگرتوەو باسی خۆشەویستی مەككەی كردووە ئایا ڕاستە پێغەمبەری خوا شانازی كردووە بەعەرەبیەتی خۆیەوەیان نا؟

- ئەم پرسیارە دوو بەشی جیان، شانازی بەخاكەوە بابەتێكە، شانازی بەقەومیەتێكی بێ فكرەوە شتێكی ترە، خوای گەورە فەرموویەتی: لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) (احب بقاءالله الى الله) خۆشەویسترین زەوی لەلای خوا مەككەیە، نەك چونكە عەرەبی تیایە كاتێ ئەو شوێنە خۆشەویست بووە، كەسی تیانەبووە،لەبەر شەرافەتی (بیت) ئێستائێمە ئەڵێین نوێژێك لەوێدابە(١٠٠هەزار)نوێژ حسابە لەبەرخاتری ئەوپیرۆزیەیە ئەمەپەیوەندی نیە بەعەرەبەوە ئیبراهیم (علیەالسلام) خۆی عەرەب نەبووە كەبینای كردووە، وە(ادم)علیەالسلام خوای گەورە لەویا دایبەزاند، ئەوە پەیوەندی چییە بەعەرەبەوە؟ ئەم پیرۆزییە بۆ شوێنەكەیە (العربیەلسان) عەربیەت بریتییە لەزمان نەك هەستێكی نەتەوایەتیو قەومی ئەمانە نەبووە (دعوها فانها منتنە) پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: دووركەونەوە لێی ئەمە بۆگەنە جیایی دروست ئەكات.

+ لەڕووداوی سێ دواكەوتووەكەی شەڕی(تبوك)دا هاتووەكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە كەعبی كوڕی مالكی وتووە: ئەبێ لەخێزانەكەت دابڕێی، ئەمە پێچەوانەی ئەوداوایانەی پێغەمبەر نییە(ﷺ) كە داوای بچوكترین مافی كردووە...؟

- نەخێر..ئەمە حوكمێكی ئاسمانییە، سزایەكی ئاسمانی هات لەپێناوی پەروەردەكردنی ئەوسیانەدا كەنەچوون بۆجهاد،حوكمەكە ئەوەبوو كە

دووركەونەوە لە خێزانیان هەتا بزانن، ماوەیەكی بۆداناون، لەوماوەیەدا ئەگەر تەوبەكەیان ڕاست بووئەوا دێنەوە بازنەی ئیمان كە هاتنەوە بازنەی ئیمان ژنەكانیان دەبنەوەحەلاڵیان بۆیان، بەلاّم لەوفەترەیەدا جارێ كە فەترەیەكی (انتقالی)یە لەبەرئەوەی كە گوناهێكی گەورەیان كردووە، (الفراریوم الزحف)ئەمانە نەچوون بۆجیهاد، لەبەرئەوە سزادران باماوەیەك لەسەر تەوبەكەیان بەردەوام بن بزانن ئاستی راستگۆییان چەندە،تەوبەكەیان ڕاستە یان نا؟ئەگەر تەوبەكەیان ڕاست بوو ئەوا ژنەكانیان بۆ حەلاڵ ئەبێتەوە ئەوەیە مەبەستەكە.جائێمە پێشووتر باسی ئافرەتمان كرد وباسی ڕێزی ئافرەتمان كرد كە پێغەمبەری خوا (ﷺ)چ ڕێزێكی بۆدانان حەزئەكەم ئەم فەرموودەیەشتان بیرخەمەوە كە ئەفەرموێ (ومن تزوج علی صداق وهو لاینوی علی أداءه فهو زاني) پێغەمبەری خوا ئەیەوێت هەموو ئافرەتێك سەربەخۆیەكی تایبەتی خۆی هەبێت لەڕوانگەی ئابوورییەوە بۆ ئەوەی پاشكۆی پیاونەبێت، ئێستا ڕۆژئاوا هەوڵی ئەوەئەدا.پێغەمبەر(ﷺ)(١٤سەددە) لەمەوپێش هەوڵی ئەوەی داوە كە ئافرەت دەستپان نەكاتەوە، هەرچەندە واجبی مێردەكەیەتی كە بیژێنێ ئەی بۆچی میراتی بۆ نێرینە دووئەوەندی مێینەیە؟چونكە پیاو واجبە لەسەری خزمەتی ئەو ژنە بكاو واجبی پیاو ئەوەیە خۆراكی ئەوخێزانەی بداتو جلو بەرگی بۆئامادەبكات وە لەشوێنێكدا بیژێنێت بەگوێرەی عورفی ئەوشوێنە گونجاو بێت. ئەمە واجبی پیاوە ئەمە هیچ منەتی تیانیە، بەلاّم جگە لەم حاڵەتە ئافرەتەكەش بابودجەیەكی خۆی هەبێت میزانییەكی تایبەتی خۆی هەبێت، جائەم فەرموودەیە ئەفەرموێ: ئەوپیاوەی كەنیەتی وابێ مارەیی بخوا یا نەیداتێ ئەوەخێزانی نیە!! زانیە! جائێستا با بیركەینەوە ئەوكەسەی كە ژنێكی هێناوە لەسەر(٢٠٠)لیرە لەسەر(٣٠٠)لیرەی ڕەشادی لەسەر(٥٠٠) لەسەر(١٠٠٠)ئەمەكێ

ئەتوانێ بیداتەوە!؟ یەعنی ئەومێردە نیەتەکەی ئەومیە کەبیخوا، فەرموودەکە ئەفەرموێ (وهولاينوي على أداءه) نیەتی نییە بیداتەوە، ئەبێتە زانی!! هەرچەند ئەچێتە لای خێزانەکەی بەزینا بۆی حسابە، جابیربکەرەوە کوڕێك لە باوکی خۆی هەڵئەیاو کچێك دژی باوکی ئەوەستێ ئەوە ئەوباوکانەن کەنیەتیان هەبووە مارەیی دایکیان بخۆن.. (والله أعلم ولاحول ولاقوة ألابالله)

+ لەکۆتاییدا ئێمەزۆرزۆر سوپاسی بەڕێزتان ئەکەین کەئەو دەرفەتەتان پێ داین سەبارەت بەیادی ئەوپێغەمبەرە شکۆدارە، ئەگەر جەنابتان دوا ووتەتان هەبێت ئەتوانن بفەرموون..

- دوا وتەی من ئەوەیە ئەڵێم سەرفرازیو چاو ڕوونی بۆئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خوای هەڵبژاردبێ بەپێشەوای ژیانی، بەشەفیعی خۆی لەقیامەتدا، بەپێشەوای لەدنیاو لەقیامەتدا...

وەهەر ئەوەندە ئەتوانم بڵێم...

صلى الله عليك ياسيدى يارسول الله.. وعلى ذلك وأصحابك ،اللهم صل عليه صلاة اتكون لك رضاءًا وله جزاءً ولحقّه أداءاً صل اللهم عليه بما أنت أهله وبما هو اهله صلى الله عليك في الآولين والآخرين صلى الله عليك ياسيدى يارسول الله.. وعلي ألك وأصحابك وأتباعك عدد القطر والنبات مادامت الأرض و السموات.

لەکۆتاییدا..

+ سوپاسو ڕێزمان هەیە بۆجەنابتانو دوعای پایەداریتان بۆئەکەین.

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

# باسی چل‌و یەك

# ئیعجازی زانستیی لە سێ بواری جیاوازدا

**١- ئیعجازی زانستی لەبواری ئاوی سپی چاو. /**

**خوای گەورە باسی یەعقوب پێغەمبەرمان بۆ دەكات(سەلامی خوای لێبێت) كە بەهۆی خەفەت خواردنەوە (كاتێ یوسفی كوڕی لێی دوركەوتەوە) چاوی لەدەستداوە.. ئایەتەكە دەفەرمێ:**

(وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٨٤﴾ )[٤١٣]

**سەردەمی پێغەمبەر یەعقوب رستەی (لاحول ولا قوة الا بالله) هێشتا فێری مەردوم نەكرابوو، ئەگینا وەك پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) ئاماژەی پێدەكات پێغەمبەر یەعقوب لەبری (یا اسفی) ئەیوت: لاحول ولا قوة الا بالله.. دەردی گرانم بۆ یوسف كەوا دووركەوتەوە لێم، ئەو خەم‌و خەفەت‌و ئاهەلكێشانە بووە هۆی دروستبوونی ئاوی سپی چاوی‌و پاشان نابینا بوو.(فهو كظیم) خۆڕاگریشە... سكالاَ ناكات بۆكەس..**

**لەرووی زانستیەوە لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات: ئایا خەفەت دەبێتە هۆی دروست بوونی ئاوی سپی؟ ئایا ئاوی سپی دەبێتە هۆی نابینا بوون؟**

---

**[٤١٣] سورەتی یوسف ئایەتی ٨٤**

زاناکان‌و پزیشکەپسپۆڕەکان ئەفەرمون: بەڵێ یەکێك لە هۆکارەکانی دروستبونی ئاوی سپی چاو خەفەتە. ئاوی سپی tract ی پێدەڵێن بەئینگلیزیی .

چاو ڕێکخستنێکی تێدایە.. عەدەسە (هاوێنە) ی چاو ڕێکخستنێکی پرۆتینی تیایە، ئەو ڕێکخستنە تێکدەچێ... دەبێتە هۆی دروستبوونی ئاوی سپی‌و ناهێڵێ تیشکی خۆر بێتە ژورەوە بۆ ناو عەدەسەکە، ئیتر ئەو مرۆڤە هەست بە نابینایی دەکات.

پزیشکێکی میصری بەناوی (د.عەبدولباست سەید محەمەد)ە، ئەم پزیشکە ئیماندارە بیری لەو ئایەتە کردەوە کە حەزرەتی یوسف (سەلامی خوای لێبێت) کراسەکەی خۆی بە براکانیا نارد بۆ باوکی، وەك قورئانی پیرۆز باسی دەکات (فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾)[414]

کراسەکەم بدەن بەدەم‌و چاوی باوکمان چاکدەبێتەوە، چاوی چاکدەبێتەوەو بیهێنن‌و هەمووشتان (کەس‌و کارم) وەرن بۆ میصر (چونکەماڵی باوکی لە فەلەستین بوون). ئەم پزیشکە دەڵێ: زۆر بیرم لەو ئایەتە کردەوە، ئاخۆ ئەو کراسە چی تیایە کە ببێتە هۆی چاکبوونەوەی چاوی باوکی، کاریگەریی لەسەر چاوی باوکی دروستکات؟ بێجگە لەوەی کە ئەمە بۆنی حەزرەتی یوسفی پێوەیە (سەلامی خوای لێبێت) (بۆن)یش یەکێکە لەو کۆدانەی کە مرۆڤ هەیەتی‌و تایبەتمەندیی کەسایەتی مرۆڤ خۆیەتی، چۆن سەرپەنجەی هەر مرۆڤێ کە بۆ (پەنجە مۆر –ناسینەوە) بەکاردێت‌و هی دووکەس لەیەك ناچێ، بەهەمانشێوە

---

[414] سورەتی یوسف ئایەتی ٩٣

ئەمڕۆ DNA مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤدالەیەك جیا دەكاتەوە... "لیك"ی مرۆڤێك لە مرۆڤێكی تر جیادەكاتەوە. . هەروەها جۆری "قژ"و "دەنگ"و" چاو" بەهەمان شێوە هی مرۆڤی یەكەم لەگەڵ مرۆڤی دووەم جیایەو دەكرێنە نیشانە بۆ ناسینەوەی هەركامیان...(لەم ماوەیەی دواییدا دەركەوت كە چاوی هیچ كەسێ لەیەكێكی تر ناچێ).. بۆنیش یەكێكە لە كۆدەكانی ناسینەوەی كەسەكان، هەرچەندە دەمێكەو لەسەردەمی یەكێتی سۆڤیەتداو لەوێ بانقی بۆن هەیە، بۆ دەرخستنی ئەو كەسایەتیانەی كە لەپشت تاوانەوە هەنو جێبەجێكەری تاوانەكەن (دەستەسڕێكی پاكژ دادەنێن لەوێو پاش نیو سەعات دەیخەنە زەرفێكەوەو دایئەخەن، بەروارو شوێنەكەی لێدەنوسن، بۆنی ئەو شوێنەی وەرگرتووە) بۆنی مرۆڤیش دەگەڕێتەوە بۆ عارەقی مرۆڤ ئەو عارەقەی كە لەپێستیەوە دێتە دەرێ، هەرچەندە پەیوەندییەكی هەیە لەگەڵ خۆراكدا بەڵام پەیوەندییە سەرەكییەكەی بەخودی كەسەكەوە هەیە(وەك خود) چونكە مەسەلەیەكی بۆماوەییە(وراثي) كەواتە لێرەدا نهێنیەكە لە عەرەقەكەدایە، خوای گەورە یارمەتی ئەم دكتۆرەی داو سەركەوتوی كرد لەم كارەدا بۆ دەرخستنی ئەم نهێنییە..

ئەو هاوێنەی چاوانەی (عەدەسە) كە بەنەشتەرگەریی دەرهێنراون لەچاوی نەخۆشەكاندا فرێدراونو عەدەسەی تر خراوەتە چاویانەوە، ئەو عەدەسە فرێدراوانەی هێنا نوقمی كرد لەناو عەرەقی لەشی مرۆڤدا، پاش سەعاتێك بینی ئەو هاوێنانە روون دەبنەوەو چاك دەبنەوە، ئەم ئەزموونە بۆ ئەو دكتۆرە بوو بە كلیلی لێكۆڵینەوەیەكی زۆر قووڵ كە لەپێشدا لەئاژەڵدا بەكاریهێنا، ئەزموونی كرد سەركەوتوو بوو، پاشان لە مرۆڤیشدا ئەزموونی كرد، بۆ مرۆڤی نەخۆش

کەچاوی توشی ئاوی سپی بوو بێت تاقیکردەوە سەرکەوتوو بوو، بەهۆی ئەمەوە بڕوانامەی (بەرائەتی داهێنانی ئەوروپی)[٤١٥] لە ١٩٩١دا وەرگرت.

نهێنییەکە لەوەدا بوو مادەیەك هەیە(گواندین)ی پێدەڵێن، مادەی گواندین لە عەرەقی لەشی مرۆڤدا هەیە، ئەو رۆڵە گرنگە دەبینێ، توانی ئەو مادده گواندینە پاڵفتە بکاتو بیدا لە چاوی ئەو کەسانەی کە ئاوی سپی هەیە لە چاویاندا، پاشان بەو ئاکامە سەرکەوتووە گەیشت.

چەند هۆکارێك هەن کە ئەبنە هۆی ئەم نەخۆشییە، (خەفەت خواردن) یەکێکە لە هۆکارەکان.. پاش ٦٠ خولەك بە تەواوی روون دەبێتەوە.

ئەم دکتۆرە بەرائەتی داهێنانێکی تر لە ئەمەریکاو لە بواری پزیشکییدا وەرگرت لە ساڵی ١٩٩٣دا.

بوارەکانی قورئانی پیرۆز ئەوەندە بەرفراوانن، دەوڵەمەندن.. هەر جیلێكو هەر چینێك بەشی خۆی لە قورئاندا هەیە...(لاتنقضی عجائبه)

(وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٢﴾)[٤١٦]

شیفاو رەحمەت هەیە بۆ ئیماندار بەدرێژایی مێژوو تا رۆژی دوایی

(وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ﴿٩٢﴾ )[٤١٧]

ئەم قورئانە لە خودی خۆیدا بەرەکەتی تیایە، بەشی هەموو نەوەیەکی تیایە. .

---

[٤١٥] بڕوانامەیەکی بەرزە لە ئەوروپا دەدرێت بەوانەی کە داهێنانێکی نوێی گرنگ لە بواری پزیشکیی دائەهێنن.

[٤١٦] سورەتی ئیسرا ئایەتی ٨٢

[٤١٧] سورەتی ئەنعام ئایەتی ٩٢

**له قورئانی پیرۆزدا دوجار وشەی (تفیض) هاتووە.. له کاتێکدا که وشەیەکی ناسکەو وشەیەکی زانستیشە.. جارێکیان له سورەتی (المائده ئایەتی ٨٣) هاتووە، که باسی قەشەکانی حەبەشە دەکات که جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب سورەتی (المائده)ی بۆ خوێندەوە کاری تێکردن:**

(وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾ )[٤١٨]

**جاری دووەمیان له سورەتی (التوبه – ئایەتی ٩٢) دا هاتووە:**

(وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوۡكَ لِتَحۡمِلَهُمۡ قُلۡتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحۡمِلُكُمۡ عَلَيۡهِ تَوَلَّواْ وَّأَعۡيُنُهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ )[٤١٩]

**باسی ئەو موجاهیدانە ئەکات که دەیانەوێ بچن بۆ جیهاد بەڵام ئیمکانەتیان نییە کەواتە تەنها ئەم دووجارە ئەم وشەیە هاتووە له قورئاندا.. (تفیض) یەعنی (سەرڕێژ). ئەگەر بە ووردیی تێبینی بکەین دەبینین که باسی فرمێسك دەکات، فرمێسکی چاو سەرڕێژ دەکات.. لەناو چاودا غودەی فرمێسك هەیە ٢٤ سەعاتە ئیش ئەکات لەپێناو دوو هۆکاری سەرەکیدا.. بۆئەوەی:**

---

[٤١٨] سورەتی (المائده ئایەتی ٨٣)

[٤١٩] سورەتی (التوبه – ئایەتی ٩٢)

١- چاو وشك نەبێتەوە... تا لە ئیش نەكەوێ.

٢- ئەو فرمێسكە كەرستەیەكی پاكژ كەرەوەیە دژ بە میكرۆباتو هەموو تەنێكی نامۆ كەبێتە ناو چاوەوە.

ئەگەر هەر بۆ تێگەیشتن لەم خاڵی دووەمە ئەم ئەزمونە بكەیت باشتر بۆت دەردەكەوێت(چاویلكەیەكی تایبەت بە تیشكی خۆر "شمسی" لەچاو بكەو برۆ بۆ بازاڕو هەندێك پێوەی بگەڕێو پاشان بگەڕێوە، چاویلكەكە دابگرەو سەیری بكە جا ئەزانی چەند تەپو تۆزو غوباری لێنیشتووە. . ئەگەر ئەو چاویلكە نەبوایە هەموو تەپو تۆزەكە ئەهاتە چاوتەوە. . ئەمە هەروایە كە بەردەوام تەپو تۆزو غوبار دێتە ناو چاومانەوە بەڵام بەهۆی فرمێسكی چاومانەوە پاكیی چاومان رائەگیرێ).

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئەو غودەی فرمێسكەی كە بەردەوام فرمێسك دەرژێنێتە ناو چاوەوە بۆكوێ دەڕوات؟

پزیشكەكان وەڵاممان دەدەنەوە: كەناڵێك هەیە پێیدەڵێن كەناڵی فرمێسك لەوێوەوە وەكو جۆڕاوگە ئەڕواتە خوارێ ئەچێ بۆ لوت.. بەڵام ئەگەر هاتوو هەڵچونی مرۆڤەكە دەرەجەی سۆزو خەفەتی مرۆڤەكە زۆر بوو، گریانەكەی زۆر زۆر بوو، ئەو جۆڕاوگەی نایكێشێ بەشی ناكات سەررێژ دەكاتو بەشێوەی فرمێسك بەرومەتدا دێتە خوارێ. . كە ئەم تەعبیرە (سەررێژ - تفیض) دەربڕینێكی زۆر ناسكو زۆر زانستییە.

٢/ ئیعجازی زانستی لە بواری نهێنیەكانی كولەكەدا:

خوای گەورە باسی حەزرەتی یونس پێغەمبەر دەكات، كاتێ كە (عقاب)ی لێگرتووە بەرامبەر بەجێهێشتنی ئومەتەكەی بەبێ پرس، ئەوەیە ئەكەوێتە زاری

نەهەنگێکەوە بۆماوەی چەند رۆژێك (نزیکەی حەوت رۆژ) لەبەرئەوەی ئیجتهادی دەکرد، "ئەینەوا" ی بەجێهێشت بەبێ وەرگرتنی رەزامەندیی خوا (هەموو کەسێك بۆی هەیە ئیجتهاد بکات لە جلەوو بزوتنیا تەنیا پێغەمبەران نەبن کە ئەبێ بە وەحیو سروش بجوڵێنەوە) لەبەرئەوەی کە ماوەیەکی زۆر بوو لە نەینەوا مابویەوەو کەس ئیمانی پێ نەهێنابوو، وای بە باشزانی کە بڕوا بۆ شوێنێکی ترو ئەو تەمەنەی کەماوە لەگەڵ کەسانی تردا بە خەرجی بدا بەڵکو بەرهەمێکی باشتری هەبێت.. خوای گەورە ئەو جۆرە سزایەی دا، بەڵام لەناو سکی حوتەکەدا تەوبەی کرد ئەمە خوای گەورە دەیگێڕێتەوە کە یونس پێغەمبەر فەرموویەتی:

﴿لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَـٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ [٤٢٠]

لەبەر ئەوەی یونس ناوی خوای بە پاکی راگرتووە (مسبح)و (مستغفر) بووەو بەردەوام داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە کردووە.. خوای میهرەبانیش لێی خۆشبووەو نەهەنگەکەش فڕێیداوەتە وشکانییەك. . تۆ بیر بکەرەوەو بیهێنەرە بەر لێکدانەوەی خۆت مرۆڤێك لەناو زاری حوتێکدا بێتو ئەو هەموو رژێنەی ناو زاری حوتو زەرداوەو لیکی دەمی ئەو حوتە رژابێ بەسەر دەمو چاو و گیانی ئەو کەسەدا ئەبێ چۆن بێ؟ بێگومان عەزیەتی پێگەیشتووە.. هەفتەیەکە ئاسایی ئاژی چەندەها رژێن رژاون بەسەریدا، کاتێ کە فڕێدرایە دەرەوە.. لەسەر زەوییەکی وشکانی کەوت، خوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرمێ

﴿فَـَٔامَنُواْ فَمَتَّعۡنَـٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ ﴿١٤٨﴾﴾ [٤٢١]

---

[٤٢٠] سورەتی ئەنبیا ئایەتی ٨٨ .

[٤٢١] سورەتی صافات ئایەتی ١٤٨ .

ئەمامێکمان بۆ دانا کە هەر بە بۆنو بەرامەکەی، سێبەرەکەی، سەمەرەکەی چاك بووەوە.لێرەدا ئیعجازێکی رووەکی هەیە سەرنج بدەن:

(يقطين) لە فەرهەنگەکاندا ئەو رووەکانەن کە قەدی سەربەخۆی نییە. قەدێکی تەواوی نییە.. وەکو (کاڵەكو شوتیو خیارو کولەکەی شیرینو کولەکەی خەیاریو....هتد) دەگرێتەوە.. ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە (کولەکەی شیرینە).. کە بەرەکەی پێیدەوترێ (قرع) پێشیدوترێ (دباء).

لەم چەند ساڵەی رابردوودا زاناکانی ئەڵمانیا بۆیان دەرکەوت: چەند مادەیەك هەیە لەناو (کولەکەی شیرین)دا سەنتەری (یادکردنەوە) لە مێشکدا دەوروژێننو چالاکی پێئەدەن..

تێبینی بکەن هێزی عەقڵی پێنج شێوازی هەیە:

١. هێزی بیرکردنەوە. تفکر.
٢. هێزی یادکردنەوە. تذکر.
٣. هێزی گوێگرتن.
٤. هێزی فێربوون.
٥. هێزی تێروانین. تأمل.

ئەم هێزانە پێیان دەڵێن(هێزی عەقڵ) هەریەکەیان جۆرە سەنتەرێکی هەیە لە مێشکی مرۆڤدا.. ئەوەی کە پەیوەندی بە یادکردنەوە (الذاکرة) وە هەبێت، ئەو مادەیەیە کە لە کولەکەدا هەیە دەیوروژێنێت... واتە: ئەو کەسانەی کە زۆر شتیان بیر دەچێتەوە جارجار کولەکەی شیرین بخۆن سودمەند ئەبن لێی.. ئەمە زاناکانی ئەڵمانیا دۆزیویانەتەوە.. بێجگە لەوەی کە (چالاککەرە – المنشط)[٤٢٢] سودی تریشی هەیە.

---

[٤٢٢] ئەو زانیاریانەی لەم باسەدا هاتوون لەم سێ سەرچاوەوە وەرگیراون:

مرۆڤ كه توشی شۆك (صدمه)یەك دەبێ شتی بیر دەچێتەوە.. لە كوردەواریدا ئەگەر كەسێك دوچاری حاڵەتێكی وابێ ئەڵێن: تەكانی خواردووە... (تەكان) یان (شۆك) لەوە گەورەتر دەبێت نەهەنگێك قوتت بدات !!

خوای گەورە یەكجار ئاماژەی بەو (یقطین)ە كردووە لە قورئانی پیرۆزدا... كە بۆ ئەم حاڵەتە بەكاریهێناوە كە وەك زاناكانی ئەڵمانیا دەریانخستووە: (ئامێری یادكردنەوە) چالاك دەكات، دەمارەكانی دەنگ (دەنگە ژێكان) چالاك دەكات.. هەروەها:

١- ئامێری (یادكرنەوە) چالاك دەكات.

٢- ئامێری (دڵ) بەهێز دەكات.

٣- بۆ هەوكردنی بۆری میزكردن سودمەندە. . لە هەمانكاتدا دەرهاویشتن ئاسان دەكات.

٤- تۆوەكەی لەگەڵ تۆوی خەیار و كاڵەك (خصوبە) جیا ئەكات.

لەسەر ئەم سوودانە چەندان سودی تریش كە لە بواری پزیشكیدا هەیە، بریاردرا ئەو ژەمە خواردنەی لە خوێندنگاكانی ئەڵمانیادا خوێندكاران ئەیخۆن ئەبێ لە هەفتەیەكدا یەك ژەمی كولەكە بێت.

عائیشە دایكی ئیمانداران ئەگێڕێتەوە پێغەمبەر فەرمویەتی: یا عائیشة اذا طبغتم قدرا فاكفروا فیها من الدباء... فانها تشد قلب الحزین *. واتە: ئەگەر كولەكەتان لێنا زۆری تێكەن چونكە سودی هەیە بۆ دڵی خەفەتبار.. وەكو زانیشمان سەلمێنراوە كە بۆ ماسولكەكانی دڵ سودی هەیە.

---

ا- الطب في الظلال القران والسنة/ كۆلیژی پزیشكی زانكۆی موسڵ دەریكردووە ساڵی ١٩٩٩ ل٢٥.

ب- چاوپێكەوتنێك لەگەڵ د.محمد جمیل الحبال لە كەناڵی الجزیرة.

ج – حقائق العلم الحدیث/ عبد الرحمن العصافیر.

له فەرمودەیەکی تردا هاتووە: (علیکم بالقرع فانه یخذي العقل)** واتە دۆزینـەوە زانستییە نوێکان جەخت دەکەنەوە لەسەر ناوەڕۆکی ئەم ئایەتو فەرمودانە.

ئەنەسـی کـوڕی مالـك دەفـەرموێ: بەرگدرویـەك دەعـوەتی پێغەمبـەری کـردو فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا خواردنمان کردووەو حەز ئەکەم تەشریف بێنی بۆ ماڵمان، منیش لە خزمەت پێغەمبەر چووم بۆ ماڵەکە.

پیاوە بەرگدرووەکە نانی جۆی هێناو قاپێك شلەی بۆهێنا کولەکەی تیابوو لەگەڵ گۆشت، ئەو گۆشتەی وەکو قاورمە ئامادەکراوە.

ئەنەس تێبینی خۆیمان بۆ باسدەکات لـەکاتی خـواردنی ئـەو ژەمـەی پێغەمبـەری خوا کە دەفەرمێ (یتتبع) ئەگەڕا بە دوای کولەکەکانداو ئەیخواردن..

من لەو ڕۆژەوە حەزم لە کولەکە کرد. دەقی فەرمودەکە بەمـشێوەیەیە: ( فرایـت رسول الله ((صلی الله علیه وسلم)) یتتبع الدباء منحو الی الـصفحتي، فلـم ازل احـب الدباء منذ لك الیوم )[٤٢٣]

---

* تخريج أحاديث الإحياء، الإصدار ٢,٠٧ - للحافظ العراقي المجلد الثاني .. بيان أخلاقه وآدابـه في الطعام :٩ - حديث "يا عائشة إذا طبختم قدرا فأكثروا من الدباء فإنها تشد قلب الحزين. روينـاه في فوائد أبي بكر الشافعي.

** فيض القدير، شرح الجامع الصغير، الإصدار ٢,١٥ - للإمام المنـاوي الجزء الرابـع حـرف العـين. ﴿ص ٣٤٦﴾ ٥٥٤٥ - (عليكم بالقرع) بسكون الراء وفتحها لغتان والسكون أشهر وهـو الـدباء وقيـل إنـه غير عربي بـل معـرب (فإنـه يزيـد في العقـل ويكـبر الـدماغ) أي لـما فيـه مـن الرطوبـة. قـال الديلمي: ويروى عليكم بالأترج بدل القرع، والقرع بارد رطب في الثالثة وهو أقل الثمار الصيفية مـضرة ولـه في دفـع الحميـات اليـد البيـضاء والحـظ الأوفـر. (طب عن عطاء مرسلاً) ورواه أيضاً الحاكم في التاريخ وعنه تلقاه البيهقي مصرحاً فلو عزاه إليه لكان أولى ثم إن فيه مخلد بن قريش أورده في اللسان وقال: قال ابن حبان في الثقات يخطئ.



٣- ئیعجازی زانستی لەبواری شەو وخەون:

شەو ئەو وشەیەیە کە (پشودان)و (حەوانەوە)و (کەمی جوڵەوباری ئارامی)و (سوبات)و (خەون)و (راکشان)مان بیر دەخاتەوە... ئەمە سونەتێکە خوای گەورە دایناوە بۆ مرۆڤ تا جێبەجێ بکات.. تا مرۆڤ لە شەو دا بحەوێتەوەو پشوو بدات. لەم بارەیەوە ئایەتمان زۆرن:

﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ۝٩ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ۝١٠ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ۝١١﴾ [٤٢٤]

(سبات) بۆ حەوانەوە و بۆ پشودانە. زۆرینەی ئەو هۆرمۆناتانەی کە لەش دەریدەکات، لەکاتی بەخەبەر بوندایە.. لەکاتی رۆژدایە. لەشەودا رێژەیان کەمدەبێتەوە. لەکاتی نوێژی عەسردا (ئەدرینالین) بەرزدەبێتەوە، لەهەمانکاتدا مادەمان هەیە وەکو میلاتۆمین کە غودەی سنەوبەری دەیرژێنێو پشوو دەدات بە لەش، دەرکەوتووە هەتا دەوروبەرەکە تاریکتر بێت ئەو مادەیە زیاتر دەرژێتە خوێنەوە. ئەم راستییە کەوا شەو بۆ نووستنو حەوانەوەیە. .

---

[٤٢٣] رواه الصحيحين . صحيح البخاري، الإصدار ٢,٠٣ - للإمام البخاري الجزء الثاني ٣٩ - كتاب البيوع. ١٦ - باب: السهولة والسماحة في الشراء والبيع، ومن طلب حقا فليطلبه في عفاف.ـمزيدـ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) خبزا ومرقا، فيه دباء وقديد، فرأيت النبي (صلى الله عليه وسلم) يتتبع الدباء من حوالي القصعة، قال: فلم ازل أحب الدباء من يومئذ. ﴿٥٠٦٤، ٥١٠٤، ٥١١٧، ٥١١٩، ٥١٢١، ٥١٢٣﴾﴿ش أخرجه مسلم في الأشربة، باب: جواز أكل المرق واستحباب أكل اليقطين، رقم: ٢٠٤١.(مرقا) كل طعام طبخ بماء. (دباء) القرع واليقطين. (قديد) لحم مجفف. (حوالي) جوانب﴾. (مجموع الأحرف: ٦٠٧)

[٤٢٤] سورەتی النباء ئایەتی ٩ — ١١ .



(وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ۝١١)[٤٢٥]

واتـه: مرۆڤـەکان بڵاوببنــەوە بـۆ جێبـەجێکردنی کاروبـژێوی خۆیـان لـە ڕۆژدا و ئەویتریــشی بــۆ پــشووە... لــە باڵنــدەو ئاژەڵیــشدا ئــەم سیــستەمی پــشوودان‌و حەوانەوەیە هەیە. هەروەها لە ڕوەکیشدا ئەمە هەیە.

★ کــشتیارێکی یابــانی زەوییــەکی هەیــەو هــەمووی کــردووە بــە چــەڵتوك، کۆمپانیایەکی یابانی دێت گڵۆپ‌و بلاجکتـۆرو ڕووناکیـەکی زۆر بەشـەودا دائـەنێت بۆ پروپاگەندەی خۆی. ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە بە شـەویش ئـەو کێڵگەیـەی تەنیشتیان ڕوناك بێت، پاش ماوەیـەك کشتیارەکە هەست بـە لاوازی کشتوکاڵ‌و چەڵتوکەکەی دەکات‌و دەبینێ کە لاوازو سیسە هـەر بۆیـە سکاڵایان لەسـەر بـەرز دەکاتەوەو دەنوسێ لاوازی چەڵتوکەکەم بەهۆی ئـەو گڵۆپ‌و بلاجکتۆرانەوەیـە کـە ئەو کۆمپانیایە دایگرساندوون. . پاش لێکۆڵینەوەیەکی وورد لەسکالاّی کشتیارەکە دەردەکەوێت کە بەڵێ ئـەم کشتیارە ڕاسـتدەکات‌و هۆکـاری ئـەو دابـەزینی ئاسـتی نەشـونمای چـەڵتوکە پەیوەنـدی هەیـە بـە ڕونـاکی شـەوانەی ئـەو گلۆپانــەوە بـۆ کێڵگەکە.. کێشەکە ئەباتەوەو کۆمپانیاکەش قەرەبوی ئەداتێ.

لاباسێکی پێویست:

کەواتە ئەمە سیستمێکی خواییەو دایناوە بـۆ هـەموو مەخلوقاتـەکانی.. بەداخـەوە کە کەسانی وا هەن کە زەرەر لە نزیکەکانیان ئەدەن بەچەندەها شێواز وەك:

---

[٤٢٥] سورەتی النباء ئایەتی ١١ .

١- هۆڕین لێدان بە شەو یان پێش بانگی بەیانی بۆ خەبەر کردنەوەی بۆ سەفەر.

٢- چونە ماڵان بۆ میوانداریی لەکاتی درەنگدا. .

٣- دەنگی بڵندگۆکان کەدەبنە هۆی پەشێوی دروستکردن، بە تایبەت هی وایان هەیە لێی نوسراوە (ئاڵت بڵدنگ لات سپیکەر) واتە ئەم بڵندگۆیە بەکاردێت بۆ دەرەوەی بینا، سەیر دەکەیت لەناو مزگەوتێکدا دانراوە، کاتێ وتاری هەینی دەخوێنێتەوە ئینسان پەشێو دەبێ، گوێی کاس دەکات.. یاخود لەناو تەعزییەخانەکاندا دایئەنێن کە پەردەی گوێ عەزیەت ئەدات، ئازاری پێ دەگەیەنێت. چونکە شێوازو ستایلی دروستکردنی بڵندگۆی ناو بینا لەگەڵ دەرەوەی بینا جیاوازە. . ئەو بڵندگۆیانەی کە شێوەیان لە رەحەتی دەچێت ئەوانە دروستکراون بۆ رێپێوان، وتاردان لە دەشتدا، گوتار خوێندنەوە لە هەوای کراوەدا، هوتافکێشانی سەرشەقام نەك بۆ وتاردان لەناو بینادا.

# باسی چلو دوو
# ئیـعجـازی گـەردوونی

ئیعجازی قورئـانیی دوایـی نایـەت، وەكـو پێـشەوا غـەزالی ئەفـەرمێ: زانـستی قورئانو زانیارییەكانی لـەبن نایـەن. لـە هـەموو بوارێكدا قورئـان زانـستی پێیـە، گرنگ ئەوەیە زانایان بیدۆزنەوە.

(الشمس) ٣٣جار لە قورئاندا هاتووە. وشەی (القمر) ٢٧جار بەڵام ئەو جارانـەی كـە بەیەكەوە ناویان هاتووە لە قورئاندا ١٩جـارە. جا تێبینـی بكـەن: زانـستی گـەردون یان گەردونناسەكان دەڵێن: ١٩ساڵ جارێك زەویو مانگـو خۆر دەكەونە سـەر یـەك خەت (هێڵ) هەموو ١٩ساڵ جارێك بەمشێوەیەیە ئایا ئەمە رێكەوتە؟!

ساڵ ٣٦٥ رۆژو پێـنج سـەعاتو چـەند خولەكێكە واتـە ناكاتـە ٣٦٦ رۆژ بـەڵكو ٣٦٥ رۆژە. بە عـەرەبی بـە رۆژ دەڵێن (الیـوم) لـە قورئانیـشدا ٣٦٥جـار وشـەی (الیـوم) هاتووە ئایا ئەمە رێكەوتە؟!

مانگ بە عەرەبی پێیدەڵێن (الـشهر) سـاڵیش ١٢ مانگـەو وشـەی (الـشهر) ١٢جـار لـە قورئاندا هاتووە.

١٢٠٠ ئایەت لە قورئاندا یان زانستییە یان پەیوەندی هەیە بـە زانـستەوە ٩٣٪ ئـەم ١٢٠٠ ئایەتە پەیوەندییـەكی ئیمانی لەگەڵە.. مـەرجێكی تـری پەیوەسـتە واتـە لـە پاشكۆی رەوتە زانستییەكەدا ئەفەرمێ: (افلا تعقلون) (افلا تذكرون)...هتد.

ئەم بیرخستنەوانە لایەنی ئیمـانی لەگەڵە. . جا لـەم روانگەیـەوە گونجانێكی زۆر هەیە.

وشـەی (الـبر) واتـە چـاکە کـردن، چـاکە کـردن پاداشـتی هەیـە، پاداشـتەکەش پێیدەوترێ (الثواب) تێبینی بکەن وشەی (البر) ٢٠جار لـە قورئانـدا هـاتووە وشـەی (الثواب) ٢٠جار هاتووە سبحان الله ! ولا عجب في امر الله.

خوای گەورە بۆیە زمانی داوە بە مرۆڤ بۆ ئەوەی یان خێر بڵێو بڵاویبکاتـەوە یـان بێـدەنگ بێـت. وشـەی لـسان ٢٥ جـار لـە قورئانـدا هـاتووە هـەروەها وشـەی (الموعظە)ش بەهەمانشێوە ٢٥جار لە قورئاندا هاتووە، واتە ئامۆژگاریکردن، خێـر وتن. وشەی (رافت) لەگەڵ (غلظە) واتە (نـەرمو نیـانی)و (توندوتیـژی) هەریەکـە ١٣جار لە قورئاندا هاتووە.

وشـەی (الرجـل) پیـاو لەگـەڵ وشـەی (امـرأة) ئـافرەت بـە یەکـسانی هـاتوون هەریەکەیان ٢٤جار هاتوون.

بەهەشت(الجنە)و دۆزەخ (الجهنم) هەریەکەیان ٧٧جار هاتوون. ئایا ئەمانـە گشتی رێکەوتە!

لەبـەر ئـەوە هـەر کـەس بـە چـاوێکی وردو زەینێکـی بـە ویژدانـەوە ئایەتـەکانی قورئانی پیرۆز بخوێنێتەوە پاش ماوەیەکی کەم دەگاتە ئەو رایەی کە ئەم قورئانە لەلایەن خوای گەورەوە (جل جلالە) دابەزیوە. بۆنمونە:

١/ پزیـشکێکی بـەناوبانگ بـەناوی (د.مـۆریس بۆکـای) فەرەنـسی سـاڵی ١٩٦٧ لەئـەکادیمیای زانـستیی فەرەنـسی بـە ئامـادەبونی پـسپۆرانی پزیـشکیی حەقیقەتەکانی قورئانی هێنایە بەردەمیان:

*٤٠٠ئایـەت هەیـە لـە قورئانـدا هـەر باسـی کۆرپەلـە ئـەکات.. زانـستی ئـەمڕۆش ئەیسەلمێنێ.

محمدێك بە نەخوێندەواریو ١٤٠٠ساڵ لەمەوبەرو لەناو بیابانێكدا چۆن ئەو هەموو راستییەی كەشف كرد؟! دەی وەڵام بدەنەوە ئەو هەموو راستییەی چۆن زانی؟

بێگومان كەس نەیتوانی وەڵامی بداتەوە.. پاش ئەوە خۆی وتی: وەڵامی ئەم پرسیارە ئەمەیە كە محمد پێغەمبەری خوایە. پاشان موسڵمان بوونی خۆی راگەیاند.

٢/ پرۆفیسۆرێكی تر بەناوی (تیشا مۆر) سەرۆكی بەشی كۆرپەلەناسییە لە زانكۆی تۆرنتۆ لە كەنەدا.. بانگكرابوو لەگەڵ چەندین پزیشكی تردا كە موسڵمان نین بۆ كۆنفراسێكی (ئیعجازی زانستی قورئانو سوننەت) كە لە مۆسكۆ ساڵی ١٩٩٥ بەسترا.. لە كۆتاییدا بڕیاردرا كە:

(ئەو ئایەتانەی لە قورئاندا سەبارەت بە كۆرپەلە هاتوون جوانترین پۆلێن كردنن بۆ ئەو مەبەستە)

ئەم (د. تیشامۆر)ە كتێبێكی هەیە لەسەر كۆرپەلە بەناوی (علم الاجنه السریری – كلینك ئیمپریۆلۆجی) كە لە چەندین زانكۆی جیهانداو لە كۆلیژی پزیشكیدا ئەم كتێبە ئەخوێنرێ.. چاپی سێیەمی كتێبەكەی كە دەرچوو ئایەتە قورئانیەكەی خستە پشت لاپەڕەی یەكەمی كتێبەكەوە.

ئێستاش مرۆڤی واهەیە قەوانی كۆن لێئەداو ئەڵێ:

محمد خۆی زیرەك بومو ئەم هەموو شتەی زانیوە.. ئاخر محمد سۆنەری هەبووە تابتوانێ ئەم هەموو قۆناغانەی كۆرپەلە باس بكات!! یاخود محمد تەلەسكۆبی هەبووە تا بتوانێ باسی ئاسمانو بۆشایی گەردوون بكات كە (تاریك)ە! محمد كەشتی ئاسمانی هەبوو تابتوانێ بەسەر چینی (ئەتمۆسفیر)دا بڕواتو وێنەی بگرێو بڵێ: (یرسل علیكما شواظ من نار ونحاس فلا تنتصران) " سورەتی

الرحمان ئایەتی ٣٥" !! یاخود باسی (رتق)و (انفجار) و (بیك بانگ)و ئەم هەموو مەسەلە فیزیاویانە باس بکات!؟ بەراستی باوی ئەمجۆرە لێکدانەوانە نەماوە. چونکە زاناکان سەری نەوازش دائەنەوێنن بۆ خوای گەورەو نێرەری ئەم قورئانەو تەسلیمی ئەبن.

٣/ بەچەند سەعات دانیشت لەسەر روانگەی گەردوونی(مرصد) لەگەڵ بەڕێوبەری روانگە تۆکیۆ بەناوی (برۆسۆ یوشادی کوزای) کە بێگومان (روانگەی تۆکیۆ) دوەمین روانگەیە پاش روانگەی (بالۆمار) لە ئەمکەریکا.

چەند سەعاتێك لەگەڵ ئەم پرۆفیسۆرەدا دانیشتن‌و باسی ئیعجازی گەردونی‌و فەلەکیان بۆکرد لە قورئانی پیرۆزدا شایەتمانی هێناو موسڵمان بوو.

خوای گەورە ئەوەندە ئیعجازی لە قورئاندا داناوە بەشی هەر کەسێك ئەکات کە خاوەنی عەقڵ‌و ژیریی بێت.

*لەئایەتێکدا هاتووە (وجعلنا من الماء کل شيء حي) " سورەتی الانبیاء ئایەتی ٣٠" هەرچی زیندەوەرێك بگری لەژیاندا، لە ڤایرۆسێکەوە تا دەگاتە نەهەنگ، ئەبێ لە بونیدا ئاو هەبێت نابێت زیندەوەرێك هەبێت‌و ئاو لە لەشیدا نەبێت لە پێکهاتەیدا نەبێت لە خانەکانیدا نەبێت.

بەڵێ رێژەکان جیاوازیان هەیە.. لەم خانە تا ئەو خانە لەم زیندەوەر بۆ ئەو زیندەوەر. جیاوازی هەیە لە رێژەی ئاوەکاندا. ئەوەی کە میتابۆریزمی تیا روئەدات‌و کارلێکی کیمیاوی تیادا رووئەدات لەسەدان کارلێك کەلە هەموو چرکەیەکداو لەناو خانەیەکدا رووئەدات. ئەو سۆڵەنکەو ئەو موزیبە ئەبێ ئاو بێت ئەگەر خوانەخواستە ئەو ئایەتە بەو شێوەیە نەبوایەو باسی لە چەمکی دروستبوونی زیندەوەران لە هەوا بکردایە. هەندێ جۆری بەکتریا کە پێیان

دەوترێ (ئەن ئەرۆبك بەكتريا) بیهێنەرەوە ئاو هەوا ئەمرێ. ئەبێ لە شوێنێكدا بژی هەوای تیا نەبێ. بەلأم زیندەوەر نییە ئاو لە پێكهاتەیدا نەبێت.

جا خوای گەورە كە دەفەرموێ (ادع الی سبیل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة) " سورەتی النحل ئایەتی ١٢٥" داواكراوە لە زانایانی ئیسلام كە حیكمەت بەكاربهێنن لەكاتی گفتوگۆی خەلكیو هەریەكەو بەپێی ئاستی خۆی لەگەلیدا بدوێن. واجب ئەوەیە كە هەموو جوانیەكانی ئیسلام پیشان بدرێن:

- هەیە لایەنی زانستیی كاری تێ ناكات، لایەنی هەلسوكەوت و رەوشت كاری تێدەكات.
- هەیە لایەنی زمانەوانی قورئان كاری تێدەكات..
- هەیە لایەنی ویژدانی كاری تێدەكات.
- هەیە لایەنی كردەوەو خزمەتگوزاریی كاری تێدەكات.

لەبەر ئەوە ئەركی سەرشانی زانایانی ئیسلامە كە لە هەمو بوارەكانو گۆشە نیگاكانەوە وێنەی ئیسلام پیشان بدەنو بەجوانی بیخەنە بەرچاوی خەلكی بە هۆشیارییەكی شارستانیانەی سەردەم.

## باسی چل و سێ

## موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ

### بەشی یەکەم

موعجیزە یان (پەرجوّ)[٤٢٦] ئەوکارانەیە کەلەئاسایی بەدەرن (خوراق العادات) واتە: ئەو شتانەن کەلەوەوپێش چاو نەیبینیبن، گوێ نەیبیستبێ، فیکرو بیر رانەهاتبێ لەگەڵیاندا، ئەم خەوارقانە چوار جۆرن:

**١/ موعجیزە/**

ئەم جۆرەیان خوای گەورە لەسەر دەستی پێغەمبەرێك دەریدەخات بەشێوەی تەحەددا. کەتاك و کۆمەڵ ناتوانن پێیهەڵسن، ناتوانن هەستن بە کردنی ئەو رووبەرووبونەوەیە ئەمەش لەپێناوی ئەوەدایە کە خەڵکی باوەڕ بەو پێغەمبەرە بکەن، راوەستاندنی (تصدیق)ی پەیامەکە بکەن، ئەمجۆرە خەوارقانە پێیان دەوترێ (موعجیزە) تایبەتن بە پێغەمبەران.

**٢/ کەرامات/**

کاری خوایە بەلاّم بەشێوەی تەحەددا نییە، دەردەکەوێ بەشێوەی پشتگیریکردنی بەندەیەك لە بەندەکانی خوا، یان سەرکەوتن و (نصر)ی ئایینی، یان نیشاندانی بەلگەیەك لە بەلگەکانی هیدایەتی خوا، یاخود ببێتە هۆیەك بۆ بڕواهێنانی

---

[٤٢٦] بڕوانە فەرهەنگی کوردستان ـ نوسینی گیوی موکریانی چاپی یەکەم ١٩٩٩. ل٧٦: پەرجوّ: فەرمان و کردارێکی رسکاوی ئەوتۆیە، کە کەسێکی تر نەتوانێ بیکات.

کۆمەڵێك یان چەسپاندنی ئیمانیان بەخوا.. ئەمە تایبەتە بە خواسوڵحاوانی ئەم ئومەتەو پیاوچاکانی هەتا رۆژی دوایی بەردەوامە.

٣/لەتوانابەدەر/

بۆتاقیکردنەوەی ئومەتی پێغەمبەرە دەردەکەوێت لەسەردەستی ئینسانێکی خراپ وەکو (دەجال) کە لە ئاخر زەماندا دێتو چەندین خەوارق لەسەر دەستی ئەو روودەدات، کەئەمە بۆ ئەزمونکردنو (ابتلاء) چونکە بە ئومەتی پێغەمبەر وتراوە کە ئەو توانایانەی پێدراوە کەدێت.

٤/ سیحرو جادوو/

ئەمجۆرەیان لەلای خەڵك وانەکەوێتەوە کە (خوارق)ە ئەگینا لە واقعدا وانییە، کە ئەمەیان لەسەر دەستی درۆزنەکانو ساحیرەکانو جادوگەرەکان روودەداتو دەردەکەوێت.

پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بێجگەلەوەی کە (قورئانی پیرۆز) موعجیزەی ئەمرو لەبن نەهاتووی بوەو مایەی کەرامەتو عیزەتی بوەو ئەبێت تا رۆژی دوایی (ولا تنقضی ولاتفنی عجائبه) لەسەر راڤەی قورئان.

چەندین موعجیزاتی بینراو و بیستراوو هەستپێکراو لەسەر دەستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) رویداوە کە زانایان دەیانخەمڵێنن بە (١٠٠٠ – ٢٠٠٠) موعجیزە.

ئەم موعجیزانەی لێرەدا باسدەکرێن (صحیح)نو خیلافی تیا نییە لەنێو ئەو ژمارە زۆرانەی کە ئامازەمان پێدا، جا بەکورتی موعجیزەکانی کە بەشێوەی (صحیح) پێمان گەیشتوون ئەمانەن:

**١- شەوڕەویی (الاسراء):**

**گواستنەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە مەککەوە بۆ قودس.**

**٢- بڵندبونەوە (المعراج):**

**پاش شەوڕەویی هات، لە قودس-ەوە بۆ ئاسمانەکانو هاتنەوەی بۆشوێنی خۆی، کە ئەمە نەدراوە بەهیچ پێغەمبەرێکی پێشین.**

**٣- خۆڵ لەچاوکردن:**

**کاتێ کە بێباوەڕان بڕیاریاندا کە ئەم ئایینە نوێیەی ئیسلام لەناو ناچێت تەنها بەکوشتنی کەسایەتی پێغەمبەر نەبێت، لەو بڕیارەدا هاتووە هۆزەکانی عەرەب تێکڕا کۆك بن لەسەر جێبەجێکردنی ئەم کارەو بەوەی کە لەهەر هۆزەی لاوێکی ئازاو بەخۆ بنێرنو هەموو پێکەوە محمد (صلی الله علیه وسلم) بکوژن، بەمجۆرە خوێنی بڵاودەبێتەوەو بەنی هاشم ناتوانن داوای خوێنەکەی بکەن، بەمشێوەیە هاتن دەوری ماڵی پێغەمبەریان دا، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هاتە دەرەوەو کەمێ لە گڵی سەرزەوییەکەی هەڵگرتو کردی بەدەمو چاویاندا. فەرموی (شاهة الوجوه) واتە خوایە کوێریان بکە لەئاستم، بەم موعجیزەیە هەموو کوێربوون لەئاستیداو نەیانبینی پاشان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گڵی زەویەکەی هەڵگرت و دەیکرد بەسەر دانە دانەی ئەو لاوانەی کە لەدەوری ماڵەکەی پێغەمبەر بوون، کاتێ کە پێغەمبەر دورکەوتەوە ئینجا کوڕە گەنجەکان هەستیان هاتەوە بەرخۆیانو خەبەریان بوەوەو گاڵتەیان بەیەك دەکرد کە تۆ**

هەموو گیانت تەپوتۆزاوییەو یەک بە یەکیان ئەوت تا دەرکەون کە هەر هەموویان لەلایەن پێغەمبەرەوە (صلى الله علیه وسلم) ئاوەهایان لێکراوە.

٤- گورگان خواردوو:

عوتەیبەی کوڕی ئەبو لەهەب کە یەکێك بوو لە ئامۆزاکانی پێغەمبەر زۆر ناهەقیو بەدگۆییو نابەجێی بە پێغەمبەر دەوت، چەندجارێك پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) هۆشیاری پێدا کە وازبێنێ، بە باوکیشی وت هەر بێسود بوو، ئەو زیاتر زمانی پیس دەبوو بەرامبەر پێغەمبەر، تا رۆژێکیان پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لەناو خەڵکدا ئەم نزایەی فەرموو: "اللهم اصلت علیه كلب من كلابك" واتە خوایە سەگێك لە سەگەکانی خۆتی بۆبنێرە، ئەبو لەهەبی باوکی عوتەیبە زۆر ترسا لەم نزایە، ئەو رۆژە کوڕەکەی لەگەڵ کاروانێکدا ئەڕۆشت بۆ بازرگانی، بەپیاوەکانی خۆی وت: لەم دوعایەی محمد زۆر ئەترسم، شەو کە ئەنون بەشێوەی بازنە بنون باعوتەیبەی کوڕم لە ناوەڕاستدا بێتو لەچەقی بازنەکەدا بێتو ئێوەش بەدەوریدا بنوون، باش ئاگاتان لێی بێت.

کاروان بەمەبەستی بازرگانیی لە شار دەرچوو، شەوی بەسەردا هات، خەوتنو پشوویاندا، بەوجۆرە خەوتن کە ئەبولەهەب وتی، بەڵام بەیانی بینیان عوتەیبە نەماوە، تەنها تۆزێك ئێسقانو چمکێکی جلەکانی نەبێت هیچی نەمابوو، نەیانزانی شەو چ گیانەوەرێ ئەوی بەو دەردە بردبوو. پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) هەرکاتێ دوعای لەکەسێ کردبێ هاتوەتە دی.

٥- سێ نزای خێر:

له مەدینەدا ئافرەتێك كوڕەكەی خۆی هێنابوو بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناوی ئەنەس بوو، ئافرەتەكە كە هێنایە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەزنەكەم ئەم منالەم لەخزمەتی تۆدابێ و خزمەتت بكات.. پێغەمبەریش قبولی كردو (٩-١٠)ساڵ لە خزمەتیدا مایەوە. رۆژێكیان ئافرەتەكە هات بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوعایەك بۆ ئەنەسی كوڕم بكە.. پێغەمبەریش سێ دوعای بۆ ئەنەس كرد:

١- تەمەن درێژیی.

٢- فراوانبوونی رزق.

٣- منالی زۆر.

ئەم سێ دوعایە چۆن هاتنەدی ؟

ئەنەس:

١- نزیكەی ١٠٠ساڵ ژیا.

٢- ئەو باخە خورمایەی كە هەیبوو، ساڵی دو بەری دەگرت، كە ئەمە بۆ خورما زۆر دەگمەنە، بەهۆی ئەمەوەئەنەس زۆر دەوڵەمەند بوو.

٣- لە كوڕەزاو كچەزاكەی خۆی فریای ئەوە كەوت كە ١٢٠نێرینە لە نەوەی خۆی ببینێ.

٦- قەت پیر نەبوو:

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دوعای كرد بۆ هاوەڵێكی خۆی ناوی (یەزیدی كوڕی ئەختەب) بوو، دەستی هێنا بەدەم و چاو و سەریاو دوعای تەمەن

درێژیی بۆ کرد.. ئەمیش ١٢٠ساڵ ژیا لە کۆتایی تەمەنیدا تاکەتاکە مووی سپی پەیدابوو بوو لە سەرو ریشیدا.

٧- یەکێ لە عومەرەکان:

پێغەمبەر نزای کرد کە یەکێ لە عومەر-ەکان موسڵمان ببن، (عومەری کوڕی هیشام) یان (عومەری کوڕی خەتاب) ئەوەبوو خوای گەورە نزاکەی گیراکردو عومەری کوڕی خەتاب موسڵمان بوو.

٨- زیادبوونی زانست:

پێغەمبەر دوعای کرد بۆ عەبدوڵای کوڕی عەباسی عەبدولموتەلیب بەم شێوەیە (اللهم فقه في الدين وعلمه التؤيل) واتە: خوایە زانستی فقهی دینو زانستی (التؤيل)ی فێربکەیت. ئەگێڕنەوە لەسەردەمی خۆیدا وێنەی نەبوو لە زیرەکیو زانستمەندیدا هەربۆیە پێیان دەوت (حبر الامة).

٩- کیسرای یەکەمیش تیاچوو:

جارێکیان پێغەمبەر نامەیەکی لە پارێزگای یەمەنەوە پێگەییشت، کە لەوێ حوکم بەناوی کیسراوە ئەکرا.. ئەو نامەیە وەك هەڕەشەیەك وابوو کەواز لەو دینە تازە بێنێو وەلائی بۆ کیسرا هەبێت، پێغەمبەریش بەو وەفدەی نامەکەی هێنابوو فەرمووی: (ربي قتل ربك هذه ليلة) واتە ئەمشەو خواکەی من خواکەی تۆی کوشت. کاتێ دەڕۆنەوە دەبینین وایەو زۆر راستەو پاش نامە ناردنو خەبەر گەیاندن دەردەکەوێ هەر ئەوشەوەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی خوا کوشتویەتی.

١٠- کیسرای دووەم هاتە سەرحوکم:

پێغەمبەریش (صلى الله علیە وسلم) فەرموی: (اذا هلك کیسرا فلا کسری بعده، واذا هلك القیصر فلا قیصر بعده)[٤٢٧] واتە: ئەو کیسراو قەیسەرەی ئێستا لەسەر حوکمن ئەگەر لەنێوچوون ئیتر کیسراو قەیسەری دیکە نایەنە شوێنیان.

ئەمەش موعجیزەیەکی تری پێغەمبەر بوو کاتێ هێرشی موسڵمانان لەشکری کیسرایان روخاند، ئیتر کیسرا نەما. .. ئەو قەیسەرەی کەتاسەردەمی عومەری کوڕی خەتاب) مابوو ناوی (هیرقل) بوو کە لەنێو چوو ئیتر قەیسەری تر نەهاتە شوێنی.

١١- برینێکی کەم بەڵام بە مەرگەوە:

---

[٤٢٧] جامع البيان عن تأويل آي القرآن. الإصدار ١,١٣ - للإمام الطبري الجزء ٢١ .. سورة الأحزاب .. القول في تأويل قوله تعالى: {إذ جاؤوكم من فوقكم ومن أسفل منكم .

٢١٦٣٢-حدثني يونس، قال: أخبرنا ابن وهب، قال: قال ابن زيد، قال: قال رجل يوم الأحزاب لرجل من صحابة النبي (صلى الله عليه وسلم): يا فلان أرأيت إذ يقول رسول الله (صلى الله عليه وسلم): "إذا هلك قيصر فلا قيصر بعده، وإذا هلك كسرى فلا كسرى بعده، والذي نفسي بيده لتنفقن كنوزهما في سبيل الله". فأين هذا من هذا، وأحدنا لا يستطيع أن يخرج يبول من الخوف؟ {ما عدنا الله ورسوله إلا غرورا}فقال له: كذبت، لأخبرن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) خبرك، قال: فأتى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ، فأخبره، فدعاه فقال: "ما قلت؟" فقال: كذب علي يا رسول الله، ما قلت شيئا، ما خرج هذا من فمي قط! قال الله: {يحلفون بالله ما قالوا ولقد قالوا كلمة الكفر} ﴿التوبة: ٧٤﴾ حتى بلغ {وما لهم في الأرض من ولي ولا نصير} ﴿التوبة: ٧٤﴾ قال: "فهذا قول الله: {إن نعف عن طائفة منكم نعذب طائفة} ﴿التوبة: ٦٦﴾

ئوبەی کوڕی خەلەف یەکێ بوو لە سەرکردە دڵڕەقو کەللە رەقەکانی قوڕەیش، زۆر رقی لە پێغەمبەر بوو.. رۆژێکیان بە پێغەمبەری وت: وڵاخێکم (ئەسپێکم) کڕیوە، مەشقی پێدەکەم، هەموو رۆژێ ئالیکی باشی ئەدەمێ تا ئەگەر لە شەڕێکدا روبەڕووی یەك بوینەوە لەسەر پشتی ئەوەوە لەناوت بەرم، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئینشائەڵا من ئەتکوژم.. ئەوەبوو لە غەزای بەدردا ئەوە رویداو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شمشێرەکەی بەحاڵ بەر ملی ئوبەی کەوتو زامدار بوو، گەڕایەوە لای هۆزەکەی زۆر ئەترسا هاواری ئەکرد قتلني محمد. واتە محەمەد منی کوشت. وتیان: هیچ تۆی نەکوشتوەو تەنها برینێکی سادەیەو روشاندنێکەو زۆر ئاسایەو مەترسی نییە، کەچی هەر لەوکاتەدا بەوە مرد.

١٢- مۆرانەی نامەی لێکدابڕان:

کاتێ پێغەمبەرو بەنی هاشمو موسڵمانان لەدۆڵی ئەبو تالیب ئابڵوقە دران، قەدەغەبوو ژنو ژنخوازیانو کڕینو فرۆشتنیانو خواردنو شتومەکیان بۆ نەئەچوو، هەموو جۆرە کۆژینییەکیان قەدەغە بوو.. تا پاش سێ ساڵ غیرەتی هەندێ کەس جوڵاو لێیان خۆشبوونو هاتنەوەشار، لەوماوەیەدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مامی واتە (ئەبوتاڵیب)و خێزانی واتە خەدیجەی کچی خوەیلد کۆچی دواییان کرد. لەوکاتەدا داوایان لێکرد موعجیزەیەکیان نیشانبدات.. بێگومان پێشتر ئەو نامەیەی کە نوسیبوویان (صحيفة المقاطعة) یان پێدەوت کەمەبەست پێی لێکدابڕانی ئەوان بوو لەگەڵ خەڵکی مەککە لەپێناوی بڵاونەبونەوەی ئایینی ئیسلام.

ئەونامەیەی کە تیایدا هاتووە:

ئێمـەی خـەڵکی مەککـەو ئەشـرافی مەککـە بڕیارمانـدا لەگـەڵ بـەنی هاشـم دا کە....هتد ئـەم نامەیـە لـەناو کەعبـەدا هەڵواسـرابوو، پـاش سـێ سـاڵ ئـەبینین کـە مۆرانە دارو تەختەی ئەو نامەیەی خواردبوو تەنها (بسمك اللهم)ی هێشتبووەوە..

ئەوەش موعجیزەیەکە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێشوەخت فەرموی بڕۆن سەیری بکەن بزانن چی بەسەرهاتووە کەبێگومان تـەنها (بـسمك اللهم)ی ماوەو ئەویتری مۆرانـە خواردوویـەتی.. کەچوون بینیـان راسـتدەکاتو وایـە، ئـیتر ڕێیان پێدان بێنەوە مەککە.

١٣- کەرتبوونی مانگ:

پـاش ئـەو ئابلۆقەیـەی کەسـێ سـاڵی خایانـدو کـاتێ پێغەمبـەرو هاوەڵـەکانی هاتنەوە مەککە، ئەنەسی کوڕی مالـك ئەگێڕێتـەوە داوای موعجیزەیـەکیان لـە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرد ئەویش ئاماژەی بۆ مانگ کردو دووجار مانگ دوو کەرت بوو، ئیبن مەسعود ئەفەرمێ: ان فلق القمروا ونحن مع رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وفـار فـرقتين. فرقـة مـن وراء الجبـل وفرقـة دونـة فقال (صلى الله عليه وسلم) اشهدوا.[٤٢٨]

---

[٤٢٨] جامع البيان عن تأويل آي القرآن. الإصدار ١,١٣ - للإمام الطبري الجزء ٢٧ .. سورة القمر .. القول في تأويل قوله تعالى: {اقتربت الساعة}

٢٥٢٩٦ - حدثني أبو السائب، قال: ثنا معاوية، عن الأعمش، عن إبراهيم، عن أبي معمر، عن عبد الله، قال: انشق القمر ونحن مع رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بمنى حتى ذهبت منه فرقة خلف الجبل، فقال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): " اشهدوا". ٢٥٢٩٧- حدثني إسحاق بن أبي إسرائيل، قال: ثنا النضر بن شميل المازني، قال: أخبرنا شعبة، عن سليمان، قال: سمعت إبراهيم، عن أبي معمر، عن عبد الله، قال تفلق القمر على عهد رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فرقتين، فكانت فرقة على الجبل، وفرقة من ورائه، فقال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): "اللهم اشهد".

واتە ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا بووین کاتێ کە دوعای کردو مانگ دوو کەرت بوو، کەرتێکیان چویە ئەودیوی شاخەکەو کەرتێکیان ئەم دیوی شاخەکە.

لەباسێکی تردا ئاماژەمان بەوەدا کە لەئایینی هندۆسەکاندا باسی ئەوەکراوە کە ئاماژە بەو بەروارە ئەکرێ زۆر پەیکەریان هەیە کە لەسەری نوسراوە ئەمەندەساڵ پاش کەرتبوونی مانگ بۆ دووکەرت. بیستیان کەوا پێغەمبەرێك لە مەککە ئەو دوعایەی کردووە، چونکە ئەو دووکەرتبونی مانگە هەموو خەڵکی سەرزەوی بینیوویانە. . ئەوەبووە هۆی ئەوەی کە هەندێ لە هندییەکان بیربکەنەوەو بچنە ناو ئیسلامەوە. . ئەمڕۆ ژمارەی موسڵمانەکانی هندستان سەرو ١٠٠ملیۆنە.

شایانی باسە کە دایەلۆگێك بوو لە تەلەفزیۆنی بی بی سی لەنێو دوو بۆچونی بەریتانیو ئەمەریکی دا.. خاوەن بەرنامەکە پرسی: کە ئێوە سەدان ملیۆن دۆلارتان سەرف کرد بۆئەوەی لەسەر مانگ دابەزن باشە وا دابەزین چ سودێکتان بینی.. ئەوانیش وتیان: ئێمە تەنها بۆ ئەوە نەچووین کە بەردو گڵی سەر مانگ ببینین بەڵکو ئەمانەوێت بزانین کە بۆچی مانگ دوو کەرتبووە؟ چونکە تا ئێستاش دیوی ئەودیوی مانگ یەکی نەگرتوەتەوە بەڵکو قڵیشێکی تیایە حەوت کیلۆمەترەو یەکی نەگرتوەتەوە.

ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە یەکێك لە بینەران بەناوی دەیڤد پەیکۆك کە کتێبی ئیسلامی خوێندوەتەوەو ئەو ئایەتەی بینیوە: (اقتربت الساعه وانشق القمر) " سورەتی القمر ئایەتی ١ " واتە ڕۆژی دوایی نزیکبوتەوەو یەکێك لە نیشانەکانی کەرتبوونی مانگە.. دەیڤد هیکۆك کە بینی لەتبوونی مانگ مەسەلەیەکی زانستییەو تائێستاش دانی پیائەنرێ کە هێشتا مانگ بەتەواوی خۆی نەگرتوەتەوەو ئێستاش شوێنەواری لەتبونەکە دیارە.. ئەم (دەیڤد هیکۆك)ە

موسـڵمان بـوونی خـۆی ڕاگەیانـدو پـاش تێپـەڕینی چـەندین سـاڵو موتـاڵاو خوێندنەوەیەکی زۆر ئێستا ئەم پیاوە سەرۆکی حیزبی ئیسلامی بەریتانیایە.

**١٤- موسڵمانبوونی شوانێك:**

لەکاتی کۆچکردنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆ مەدینـە لـەڕێگا شـوانێکی بینی ناوی عەبدوڵای کوڕی مەسعود بوو کە بەتەمەن منداڵکار بوو کەپاشان بـوو بەو هاوەڵە بەڕێزو بەناوبانگە.. بانگیان کرد کەتۆزێ شیریان بداتێ لـەو مەڕانـە، وتـی: هیـچیان تیانییـە، جـا داوای مـەڕەلاتێکی کـرد، هەرلەبـەردەم شـوانەکەدا دەستی پیرۆزی هێنا بەگوانیداو پـڕ شـیربوون، ئەبوبـەکر گـەڕا بـۆ بـەردێك چاڵ بێت، پاکیان کردەوەو شـیریان دۆشـیو بەشـی شوانەکەشـیان داو خۆشـیان تێریـان لێخواردەوە.. ئەوەبووە هۆی موسڵمانبوونی عەبدوڵای کوڕی مەسعود.

## باسی چلو چوار
## موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ
## بەشی دووەم

**١٥- شیر بۆ داپیرە:**

**هەر لەرێی هیجرەتداو پاش ئەو مەسەلەی شوانە، ریوایەتێك هەیە کە بەریوایەتی (ام معبد) بەناوبانگە کە ئەڵێ: رەشماڵێکیان بینیو لێی نزیکبونەوە ئەبینین پیرەژنێکی لێیە سەلامیان لێکردو داوای شیریان لێکرد، وتی: نیمانە. بەڵام مەرە لاتێك لەوناوەدا بوو کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموی: ئەی ئەمە چییە؟ پیرەژنەکەش وتی: ئەمە لەبەر هیلاکیو ماندویەتی لە ران دواکەوتووەو نەچووە بۆ لەوەڕ، لەبەر لەرولاتی ناتوانێ بڕوات. پێغەمبەریش دەستی پیرۆزی هێنا بە گوانیداو دوعای خوێند ئیتر خۆی بێت یان ئەبوبەکر مەڕەکەیان دۆشیەوە لە جامێکدا ئەبوبەکر لێی خواردەوەو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لێیخواردەوەو پیرەژنەکەش لێیخواردەوەو بۆیان پڕکردەوە بۆ مێردەکەشی.**

**١٦-کوژرانی ئێوەم لێ روونە:**

**پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە شەوی پێش جەنگی بەدردا فەرموی: هذا مصرع فلان انشاء الله غدا. دەستی لەسەر ئەرزەکە دانا. واتە ئەمە شوێنی**

کوژرانی فلانـی کوڕی فلانـه بۆ بـەیانی پشت بـەخوا. . ئەچووە شوێنێکی تـرو دەستی لەسەر ئەو شوێنەش دائەناو ئەیفەرموو: ئەمەش شوێنی کوژرانی فلانـەو بەوشـێوەیە.. ئینجـا ئەنـەس ئەگێڕێتـەوەو ئەفـەرمێ: ( فوالـذی بعثـه بـالحق ماخطیء تلك الحدود )

واته قەسەم بـەو خوایـه پێغەمبـەری بەهـەق رەوانـەکردووە، ئـەو کوژراوانـه لـەو هێڵانه دەرنەچوون که پێغەمبەر بۆی دەستنیشان کردبوون.

١٧- چنگێ زیخ بۆ دەشتێ پیاو:

هـەر لـه جـەنگی بـەدردا کۆمـەڵێك لـه پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) نزیکبوونەوە چنگێ زیخی هـەڵگرتو کـردی بـه روویانـدا، یـەکێ لەوانـه (حـەکیم کوڕی خوازم) بوو، خزمی خەدیجەی خێزانی بوو، که لەوکاتەدا (حەکیم) لەگـەڵ بێباوەڕەکاندا بوو. پاشـان ئـەیوت: بـەو مـشته زیخـه هـەر هـەمووومان رامـان کـرد ئێستاش نازانین بۆچی؟ که بێگومـان ئـەو مـشته زیخـه رۆڵێکی بـڵاوە پێکـەری باشی بینیو دواتر ئایەت هاته خوارەوە: ( وما رمیت اذ رمیت ولکن الله رمـی ) " سورەتی الانفال ئایەتی ١٧ ".

١٨- چنگێ خۆڵی تر:

لەجـەنگی ئوحـوددا هـەمان هەڵوێـستی چـنگه خـۆڵ دووبـاره بویـەوە، کـاتێ پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) تـەنها رێژەیـەکی کـەم لـه هـاوەڵانی لـه دەورمانەوە، هەندێ له بێباوەڕان دەوریان دان، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) له ئەسپەکەی هاته خوارەوەو چنگێ خۆڵی هـەڵگرتو فـەرموی (شـاهة الوجـوه)و

کردی به رویاندا ئەمە بووە بۆهۆی بڵاوە پێکردنیان، ئەمە لە (صحیح المسلم)دا هاتووە.

**١٩- شمشێرێ لە دار:**

لەجەنگی بەدردا موسڵمانان زۆرکەم تفاق بوون، هەر بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دارێکی دا بە هاوەڵێکی لەبری شمشێر، دارەکە عورجون بوو واتە: ئەو دارەی کە نزیك لە هێشوی خورمایە، چەماوەیە، کە شەڕ دەستی پێکرد بە قودرەتی خوا بوو بە شمشێر.

**٢٠-ئەم سەرکەوتنە چ مەزن بوو:**

یەکێکی تر لە موعجیزەکان لە بەدردا. . ئەو سەرکەوتنە مەزنە بوو کە بەدەستیان هێنا، لەکاتێکدا کە ئامادەنەبوون بۆ شەڕ . چووبوون کاروانێك راگرن کەچی روبەڕوی سوپایەکی جەنگ بوونەوە، سوپایەکی پڕتفاقی جەنگی ئەوکاتە کە پێکهاتبوون لە ٩٥٠کەس‌و ئەمانیش ٣١٣کەس.. واتە یەك بەسێ ئەوەستان.. بێگومان لەو جەنگانەدا ولاخ زۆر دەوری هەیە، یەکێ سواربێت لەگەڵ یەکێکدا کە پیادەبێت زۆر جیاوازە چونکە سوار بەرزترەو زاڵە بەسەر ئەوەدا کە پیادەیە.. بێباوەڕان زۆربەیان سواربوون بە (ئەسپ‌و ماین‌و حوشتر) موسڵمانان تەنها دوو ئەسپیان پێبوو زۆرینەیان پیادەبوون، تەدارەکی جەنگیشیان وەك پێویست پێنەبوو کەچی خوای گەورە سەریخستن بەسەر بێباوەڕاندا. خوا فریشتەی ناردە خوارەوە بۆ یارمەتیان، لە تاج الدینی سبکی یان پرسی (رەحمەتی خوای لێبێت) حیکمەت چییە لەوەدا کە لە بەدردا فریشتەی هێنایە خوارەوە کە شەڕ بکەن؟

چونکه سوننەتی خوای گەورە پێش ئەو بەرواره ئەوەبوو کە خوا رقی لە هەر گەلێك بوایە فریشتەیەکی بۆ ئەناردن‌و لەناوی ئەبردن، جبریل علیه السلام کە نێردرا بۆ (المؤتفكات) پەرێکی خستەژێر (المؤتفكات)ەوە حەوت دێی هەلگێڕایەوە. .. ئێستا بۆچی فریشتە ئەنێرێ کە بەشمشێرو شتی لەوجۆرە شەڕبکەن؟

تاج الدينی سبکی فەرموی: حیکمەتی خوا لەوەدا ئەوەبوو کە سەرکەوتنەکە بۆ محمد پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) بنوسرێ، بۆ پێغەمبەرو یارانی بنوسرێ‌و دڵیان بەو سەرکەوتنە خۆشبێت.

٢١- سارێژبوونی چاو:

لەجەنگی ئوحوددا ئەبو زەری خەفاری هاتە خزمەتی پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) تیرێك دابوی لەچاوی، پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) تفی کردە ناو برینەکەوەو چاوەکەی چاکبویەوە، هەتا لەدنیادا بوو ئەو چاوەی باشتربوو لەچاوەکەی تری.

٢٢- سارێژبونێکی تر:

لە روداوێکدا ئەبو قەتادە چاوی هەلکۆڵراو هاتە دەرەوە، هاتە خزمەتی پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) ، پێغەمبەریش بە دەستی پیرۆزی خستییەوە شوێنی خۆی. . وتاله ژیاندا بوو ئەو چاوەی چاکتر سافتر بوو لە چاوەکەی تری.

٢٣- شیفای ئازارێکی کەسکون:

عەبدوڵا کوڕی عەتیقی ئەنساری، پیاوێکی لەناوبرد زۆر زۆر دوژمنی خواو پێغەمبەر بوو، لە شورمیەکدا دەژیا، لەکاتی گەڕانەوەدا لەسەر پەیژەیەك کەوتە خوارەوەو قاچی هەم زامداربوو هەم ئێسقانەکەشی شکا، هاتە خزمەت پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم))و خەبەرەکەی بۆهێنا، پێغەمبەریش دەستیهێنا بەسەر قاچی پڕ لەئازارو برینیداو یەکسەر چاکبووەوە لە (صحیح بخاری)دا هاتووە.

٢٤- برینێکی بێ ئازار:

هاوەڵێك ناوی (سلمە) یەو بە (ئەبو مسلم) ناسراوە، جارێکیان میوانێکی دەبێ‌و سەیری قاچی (سلمە) دەکات‌و لێی دەپرسێ:

-ئەوە قاچت بۆ وای لێهاتووە، چییە ئەو جێگا برینانە؟

+لە جەنگی خەیبەردا ئاوا بەسەختی بریندار کرام، بەڵام پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) سێ تفی پیاکرد، لەو رۆژەوە ئازارم نەدیووە.

٢٥- موعجیزەی رۆژی خەیبەر:

پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) پێش هێرش بردنە سەر خەیبەر فەرموی: سبەینێ ئاڵاکە ئەدەمە دەست یەکێك کە خواو پێغەمبەری خۆش بوێت، خواو پێغەمبەریش خۆشیان بوێت. هەریەك لە هاوەڵان لەلای خۆیەوە ئاواتەخواز بوو کە ئەوکەسە ئەوبێ، کە پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) ئەو رێزەی لێدەنێت.. پاشان فەرموی: کوانێ عەلی؟ وتیان: لە ماڵەوە کەوتوەو چاوی زۆر زۆر دێشێت‌و ناتوانێ شت ببینێ. فەرمووی: برۆن بانگی بکەن.

سەلە دەڵێ: خۆم هێنام بۆ خزمەت پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) قۆڵیم گرتبوو نەیدەتوانی شت ببینێ، تا هێنامە خزمەت پێغەمبەر. پێغەمبەر (صلی

الله عليه وسلم) دوعای خوێندو دەستی هێنا بەسەریداو تفی کردە چاوی، یەکسەر چاوی چاك بوویەوەو ئالاکەی هەڵگرتو چووین بۆ خەیبەرو خوای گەورە لەسەر دەستی ئەودا سەرکەوتنی پێبەخشین. پێشەوا عەلی (رەزای خوای لێبێت) ئەفەرموێ: ما رمدت ولا صدعت منذ مسح رسول الله (صلى اللله عليه وسلم) على راس وتفلت في عيني واتە: لەو بەروارەوە کە پێغەمبەر دەستی هێناوە بەسەرما سەرئێشەم نەبینیوەو لەو دەمەوە تفی کردوەتە چاوم، چاوئێشەم توش نەبووە.. (البيهقي) ریوایەتێکی تریشی هەیە سەبارەت بە پێشەوا عەلی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دوعای بۆکردووە کە سەرماو گەرما کارنەکاتە سەر پێشەوا عەلی، هەر بە واقعیش وابووەو ئیتر لە ژیانیدا هەستی بەسەرماو گەرما نەکردووە.

٢٦- ئارەقت گوڵاو و بۆنت وەنەوشە:

عەرەقی پیرۆزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موعجیزە بووە، دووکەس کە زۆر نزیکی پێغەمبەری خوا بوون، یەکێکیان کە عائیشەی خێزانیەتی (رەزای خوا لە خۆیو باوکی) ئەڵێ: كان عرق رسول الله ((صلى الله عليه وسلم)) في وجهه مثل اللؤلؤ اطيب من مسك الاصفر. واتە: شێوەی ئارەق بە روخساری پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) وەك مرواری وابووە، ئەبریسکایەوەو بۆنەکەیشی لەمیسکی (اصفر[٤٢٩]) خۆشتربوو. ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێبێت) دووەم کەسیانە کە نزیك بە پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) بوەو دەوری ١٠ساڵ خزمەتکاری بوەو ئەڵێ: ما شممت عنبرا ولا مسكا اطيب من ريح رسول الله ((صلى

---

[٤٢٩] خۆشترین بۆن بۆنی میسکەو لەناو جۆرەکانی میسکیشدا خۆشترینیان (اصفر) ە کە تا ئەمڕۆش نرخەکەی زۆر گرانەو تەنانەت کیلۆیەکی بە وشکی نزیکەی (٥٠٠٠ – ٦٠٠٠) دۆلارە.

الله عليه وسلم)) (رواه شيخان) [٤٣٠] واته:هيج عـەترو ميسكێك بۆنى لـه عـەرەقى پێغەمبەرى خوا خۆشتر نەبوه، كاتێكيش تەوقەى لەگەڵ كەسێكدا بكردايـە بۆنى دەستى ئەو كەسەش خۆش دەبوو.

٢٧- نورى نبوەت:

عائيـشه (رەزاى خـواى لێبێـت) ئـەڵێ: اسـتمرة ابـرة مـن حفـصته بنـت رواحـة فطلبتها فلم اقدر عليها. واته: داواى دەرزييەكم لە حەفصە كرد، دەرزى دروومـان بۆ دورينەوەى هەندێ جلوبەرگى پێغەمبـەر ((صـلى الله عليـه وسـلم)) پاشـان لـێم ونبوو، گەرام بۆم نەدۆزرايەوە. فدخل رسول الله ((صلى الله عليـه وسـلم)) فتبينـة الابرة بشعاع وجه. واته كاتێ كە پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) خۆى كـرد بـە ژوردا ئەفەرموێ يەكسەر دەرزييەكەم دۆزيەوە بەهۆى روناكيىو نـورى روخسارى پێغەمبـەر ((صـلى الله عليـه وسـلم)). (رواه ابـن عـسكر) و (اصـفهانى في دلائـل) و (ديلمى في مسنده الفردوس (جامع الكبير).

٢٨- مێش نزيك نابێتەوە:

---

[٤٣٠] سنن الترمذي (وشرح العلل)، الإصدار ٢,١٣ - للإمام الترمذي المجلد الثالث .. أبوابُ البرِّ والصلةِ عن رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم). .. ٦٨ - بابُ ما جاءَ في خلقِ النبيِّ (صلى الله عليه وسلم) . " ٢٠٨٤ " حدثنا قتيبةُ أخبرنا جعفرُ بنُ سليمان الضُّبعيُّ عن ثابتٍ عن أنسٍ قال:(خدمتُ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) عشر سنينَ فما قال لي أفٍّ قطُّ وما قال لشيءٍ صنعتهُ لمَ صنعتهُ؟ ولا لشيءٍ تركتهُ لم تركتهُ؟ وكان رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) من أحسنِ الناسِ خلقاً وما مسستُ خزّاً ﴿ص ٢٤٩﴾ قطُّ ولا حريراً ولا شيئاً كان ألينَ من كفِّ رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) ولا شممتُ مسكاً قطُّ ولا عطراً كان أطيب من عرق رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم)) . . وفي البابِ عن عائشةَ والبراءِ هذا حديثٌ حسنٌ صحيحٌ.

**هەرگیز مێش نزیکی پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) نەکەوتوەتەوە.**

**٢٩- جەستەیەکی پاکیزە:**

**هەرگیز جلێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەشۆرراوە بەهۆی پیسیەوە، جلی دەشۆررا بەڵام نەك ئەوەی پیس بووبێ.. عەرەق کاریگەریی نەبوو لەسەر جلوبەرگی بەهیچ شێوەیەك.**

**٣٠- بەرەکەتی خۆراك:**

**هیچ ریوایەتێك جێگرنەبووە کە باس لەوە بکات خواردن لەبەردەم پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) تەواو بوبێت یان کەم بووبێتەوە.**

**باسی چلو پێنج**

**موعجیزەکانی پێغەمبەرﷺ**

**بەشی سێیەم**

**٣١- بەردیش حورمەتی ئەگرێ:**

**بەرد سەلامی لە پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) دەکرد.. خۆی ئەفەرموێ: بەردێك هەبوو لە مەککە پێش پێغەمبەرایەتیم کە بەوێدا ئەڕۆیشتم سەلامی لێدەکردم، ئێستاش ئەیناسمەوە. ( رواه المسلم صحيح والترمذى).**

**ئەمە بێجگە لەوەی کە هاوەڵانیش لێی دەگێڕنەوە سەبارەت بە رسول الله ((صلى الله عليه وسلم)) مرة الا وسمعته باذن (السلام عليك يا رسول الله) واتە: هیچ جارێك بەلای ئەو بەردەدا تێنەپەڕیوین لە خزمەت پێغەمبەر ((صلى الله عليه**

وسلم)) هەتا بەگوێی خۆم گوێم لێبووە، بەردەکە وتویەتی: سڵاوت لێبێت ئەی پێغەمبەری خوا.

٣٢- بینایی بۆ گەڕایەوە:

یەکێك لە هاوەڵان نابینا بوو ناوی عوسمانی کوڕی حونەیف بوو، داواو سکاڵای کرد لای پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) کەوا نابینایی زۆر ناخۆشەو حەز ئەکەم بینناییم بۆ بگەڕێتەوەو روناکیی‌و نور بکەوێتەوە بەردیدەم. خۆشەویستیش فەرموی: ئەگەر سەبر بکەیت خێری زیاترە. ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەزئەکەم شت ببینم( هەڵبەتە مەبەستی ئەوە بوو پێغەمبەری پێ ببینێ) پاش ئەوەی کە پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) داواکاریی‌و پێداگیری ئەمی بیست فەرموی: ئەم دوعایە بکە (اللهم اني اسالك واتوجه اليك بنبيك محمد ((صلی الله علیه وسلم)) نبيا رحمة يا محمد اني اتوجه بك الى ربي في حاجة هذه فيقضى هذه اللهم اشفعه في فافعل فقام هبت ابصرت) واتە: خوایە من داوات لێدەکەم لەرێی پێغەمبەرەوە کە پەیامبەری رەحمەتە داوات لێدەکەم کە ئەوم بۆ بکەیت بە شەفیعو چاوم چاك بکەیتەوەو بیناییم بۆ بگەڕێنیتەوە) بیگومان پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) ئامۆژگاری کرد بوو کە دەستنوێژ بگرێت‌و دوو رکات نوێژ بکات‌و ئەم دوعایە بخوێنێ، ئەفەرموێ: کە لە دوعایەکە بویەوە هەستایەوە و یەکسەر چاوی چاك بویەوە (رواه البخاري والبيهقي في دلائل وهو صحيح وابو نعيم في معرفة).

٣٣- ناوەکە سەرریژ ئەکات:







له ( صحيح البخاری)دا ج٦ ص٥٨١ ريوايەت ئەكات كە: پێغەمبەر ((صلی الله عليه وسلم)) لەگەڵ ٧٠ كەسێكدا ئاويان پێ نامێنێ له بياباندا داوا ئەكات كێ ئاوی پێ ماوه، تەنها يەك كەسێك ئاوی پێ ماوه لە جامێكدا، پێغەمبەر ((صلی الله عليه وسلم)) داوای ئەكات دەستنوێژێكی لێدەگرێو هەر چوار پەنجەی دەخاتە سەر ئەو جامە، بە قودرەتی خوا ئاوەكە زياد دەكاتو ئەفەرموێ: قوموا فتوضوا واتە: هەستن دەستنوێژ هەڵگرن. ئەو (٧٠) كەسە بەو ئاوە كەمە هەمويان هەم دەستنوێژ دەگرنو هەم لێيدەخۆنەوە بە هۆی بەرەكەتی پێغەمبەر ((صلی الله عليه وسلم)) ئەو ئاوە زياد دەكات.

٣٤- مشتێ ئاو بۆ لەشكرێك:

لە فەرمودەيەكی ترداو لە مجلدی ٦ ص٥٨٠ پێشەوا بوخاری ريوايەت ئەكات:
حدثنا ابو عدي عن سعيد عن قتادة عن انس، اني النبي ((صلی الله عليه وسلم)) باءناء وهو بالزورا فوضع في الاناء فجعل الماء ينبع في اصابعه فتوضا القول.
له روداوێكی تردا پێغەمبەر ((صلی الله عليه وسلم)) لەگەڵ كۆمەڵێكدا دەبێت ئاويان لێدەبڕێت، داوای كەمێك ئاو ئەكات دەستی پيرۆزی ئەخاتە ناو ئاوەكەوە بە قودرەتی خوا ئاوەكە زياد دەبێتو هەموو ئەوانەی كەلەخزمەتيدا ئەبن دەستنوێژ هەڵدەگرن.. قەتادە كە ريوايەتەكەی لە ئەنەس-ەوە گوێ لێبووە ئەپرسێ: ئەنەس چەند كەس بوون ئەو رۆژە؟ ئەنەس-يش ئەڵێ: دەوروبەری ٣٠٠كەس دەبووين. ئەم ريوايەتە جيايە لە ريوايەتی (٧٠) كەسەكەی رابردوو.

٣٥- خوانێكی پڕ بەرەكەت:

بەرەکـەتی پێغەمبـەر ((صـلی الله علیـە وسـلم)) بـۆ خـواردن چـەند ریوایـەتو موعجیزەی لێدەگێڕنەوە.. لە هەڵکەندنی چاڵی خەنـدەق بـە دەوری (مەدینـە)دا، بۆ ئەوەی بێباوەڕان نەتوانن بێنە ناو شارو ستەم لـە خەڵکەکەی بکـەن.. چـونکە موسڵمانەکانیش کەمبوون بە بۆچوونی (سـەلمانی فارسی) (رەزای خـوای لێبێت) ئەوچاڵەیان هەڵکەند بە دەوری مەدینـەدا کارەکە زۆر بـوو سێ رۆژ بـوو خـەریك بـوون، موسـڵمانان بـە مۆڵـەت خواسـتن لـە خزمـەت پێغەمبـەر ((صـلی الله علیـە وسلم)) نەبوایە نە ئەگەڕانـەوە نـاو مـاڵو منداڵیـان، بـەو مـاوەی سێ رۆژە شـتێکی ئـەوتۆیان نـەخواردبوو لـە چـاڵەکەوە چـەند هاوەڵێـك هـاتن بـۆ لای پێغەمبـەرو عــەرزیان کــرد: ئــەی پێغەمبــەر ((صــلی الله علیــە وســلم)) گابــەردێك لــە رێگەکەماندایەو بۆمـان ناشـکێت، لـە رووی ئـەو بەرەومیـە. پێغەمبـەر ((صـلی الله علیـە وسـلم)) تەشـریفی بـردە ئـەوێ لـەکاتی دابەزینـدا جـابری کـوڕی عەبـدوڵا (رەزای خوای لێبێ ) وتی: بینیم پێغەمبەری خـوا بـەردێکی بەسـتبوو بەسـکییەوە لـە برسـان.. پاچـەکەی هـەڵگرتو (بـسم الله)ی کـردو وەشـاندی، بەردەکـەی وردو خاش کـرد... جـابر ئـەڵێ: مۆڵـەتم لـە پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) خواسـت بچمەوە ماڵ.. مۆڵەتی دام، رۆیشتمەوە مـاڵو بـە خێـزانم وت: نـافرەت پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم) بـەردی بەسـتووە بـە سـکییەوە لـەتاو برسـییەتی خەریکـە سوێم ئەبێتەوە بۆی چیمان هەیەو ئەتوانین چی بکەین. . وتی: ئـەم (صـاع[٤٣١]) ەمان هەیە جۆی تیایەو ئەو گیسکەشمان هەیە.. جۆکە ئەتوانرێ بکرێت بە ئاردو گیسکەکەش سەر ببڕی.. ئیتر هیچمان نییە، جابر ئەڵێ چوم گیسکەکەم سەربڕیو کردمە مەنجەڵەوەو جۆکەشم هاڕیو کردم بە ئاردو وتم: ژنەکە بیکە بە هەویرو ئەچم پێغەمبەرو یەك دوو کەسی تر بانگ ئەکەم.

---

[٤٣١] نزیکەی کیلۆو نیوێك تا دوو کیلۆ دەگرێ.

گەڕامــەوە بــۆ خزمــەت پێغەمبــەر و پــێم وت: فــەرموو بــۆ ماڵــەوەمان ئــەی پێغەمبەری خوا، ئینجا یەك دوو کەسیش بانگ بکە لەگەڵ خۆتدا. خۆشەویست فەرموی: خواردنەکە چییە؟ جابر دەڵێ: بۆم باسکرد، فەرموی: ئەوەزۆرە. بڕۆ ماڵەوە بڵێ دەستکاریی هەویرو مەنجەڵەکە مەکەن‌و دایپۆشن هەتا خۆم دێم. .
جابر گەڕایەوە ماڵ‌و بە خێزانەکەی وت: چیم بە خۆم کرد لەوانەیە پێغەمبەر خەڵکێکی زۆر بێنێ لەگەڵ خۆیدا. .. خێزانەکەشی وتی: خەفەت مەخۆ، تۆ پێت وتووە چی‌و چییە خۆراکەکەمان. وتی: بەڵێ. وتی: دەی خەفەت مەخۆ. ئەوا ئێمەش داینەپۆشین‌و دەستکاریی ناکەین تا خۆی تەشریف دەهێنێت.. کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەشریف ئەهێنێ هەموو هاوەڵانی خەندەقی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.. نوری دیدە بەدەستی پیرۆزی خۆی نان‌و گۆشت‌و گۆشتاوەکەیان بۆ تێکەڵ دەکات‌و هەرکەس بەشی خۆی ئەداتێ، پاش تێرکردنی هەموویان خواردنەکە وەك خۆی مایەوەو هەویرەکە هەر وەك خۆی بوو، زستان بوو نزیکەی سێ ڕۆژ بوو ئەو موسڵمانانە برسی‌و ماندوو بوون خەندەقیان هەڵکەندبوو، ژمارەیان ١٠٠٠ کەس بوەو بەوشێوە تێر دەبن‌و لێشیان دەمێنێتەوە.
پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموی خۆشتان لێی بخۆن‌و بەشی دەرو دراوسێی‌و هەژارانیشی لێبدەن، خەڵك برسییەتی.

٣٦- زنە، کانیاوی نبوەت:

لە حودەیبیەدا موسڵمانان هاتن گلەییان دەکردو داوایان دەکرد: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاو نەما وا خنکایین، فریامان کەوە، نوری دیدەمیش فەرموی: ئەم تیرە ببەن (تیرێکی لەوانەی لە تیردانەکەی دەرهێنا) و بیچەقێنن لە شوێنی ئاوەکە بە پشتیوانی خوا زیاد دەبێت، تیرەکەیان بردو بینیان ئاوەکە

وشکی کردووە، لەشوێنی کانیاوەکە تیرەکەیان چەقاندو بینیان ئاوەکە دەستی بە هەڵقوڵین کردو هەموو تێر ئاو بوون‌و دەستنوێژیان لێشت‌و دەفرەکانیان لێ پڕکرد.

٣٧- بوخچەیەك خورما:

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێبێت) چەند خورمایەکی هێنایە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوعایان بەسەردا بخوێنە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوعای بەسەردا خوێندو فەرموی: ئەی ئەبو هورەیرە بیانخەرە زەمبیلەیەکەوە ئیتر بڵاوی مەکەرەوە، هەموو جار (بسم الله) بکەو لێی دەربهێنە. ئەبو هورەیرە ئەڵێ: خورماکانم کردە زەمبیلەیەکەوەو لە ماڵی خۆمان هەڵمواسی و لێمان ئەخوارد بەشی میوانمان لێ ئەدا، خێرمان لێئەکرد، هەتا ساڵی ٦٣ی کۆچی کاتێك کە شامییەکان خۆیان کرد بە مەدینەداو ئەزیەتی هاوەڵان‌و ئەوەی هاوەڵانیان دا، کە بەناوبانگە بە (حادثه الحاره) تەعەدایان لە شەرەف‌و ناموسی موسڵمانان ئەکرد، ئیتر بەرەکەت نەما. ئەڵێ: لەو رۆژەوە ئیتر خورما لە زەمبیلەکەماندا نەما، جا ئەگەر بزانین ئەبوهوریرە سێ ساڵ پێش وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موسلمان بوە، واتە سێ ساڵ لە خزمەت پێغەمبەردا بە موسڵمانی ژیانی گوزەراندووە، ئەگەر لە ساڵی کۆتایی تەمەنی پێغەمبەریشدا ئەم مەسەلەیە روویدابێ، واتە ئەبوهورەیرە ٥٣ ساڵ لەو خورمایەی خواردووە.

٣٨- جامێ شیر بۆ ئەهلی صوففە:

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێبێ) ئەڵێ جارێکیان زۆرم برسی بوو حەزم ئەکرد کەسێ دەعوەتم بکات، چوومەسەر ئەو ڕێگەیەی کە ئەبوبەکری لێوە تێپەڕ دەبێ، ئەبوبەکر منی بینی وەڵامی دامەوەو تێنەگەیشتو ڕۆیشت. پاشان عومەری کوڕی خەتاب هات سەڵامم لەویش کرد، وەڵامی دامەوەو تێنەگەیشت لەمەبەستی سەرەڕێگرتنەکەمو ڕۆیشت، پاشان بینایی دیدە هات بەهەمانشێوە سەلامم لێکرد پێکەنیو فەرمووی: وەرە، بردمیەوە ماڵەوەو فەرمووی بە خێزانەکانی. . ئەرێ چیمان هەیە.. وتیان: ئەم جامە شیرەمان هەیەو بە دیاریی بۆمان هاتووە، رووی تێکردمو فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە بڕۆ بۆ مزگەوت بزانە کێی لێیە دەعوەتی بکە... ئەبو هورەیرە ئەڵێ حەزم ئەکرد ئەو جامە شیرە بدات بە من چونکە من زۆرم برسی بوو بەوەش تێرم نەئەخوارد، بەڵام چووم دانیشتوانی مزگەوتم بانگ کرد، فەرمووی: بۆیان بگێڕە منیش جامەکەم ئەگێڕا هەریەکەو تێری ئەخواردو ئینجا ئەیدامەوەو ئەمدا بەویتر... بەویتر.. هەتا ئاخر کەس، ئینجا فەرمووی: دەی ئەبوهورەیرە خۆیشت بخۆرەوە. ئەبوهورەیرە ئەڵێ: منیش خواردمەوە هەتا تێر بووم، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فەرمووی: ئەمجارەش. دیسان لێم خواردەوەو فەرمووی: ئەمجارەش.. وتم: بەو زاتەی تۆی ناردووە جێگەنەما زۆرم خواردەوە، پاش ئەوە ئینجا پێغەمبەری خوا خۆشی لێی خواردەوە، واتە لەو جامەشیرە ڕێژەیەکی زۆر لە موسڵمانان تێر بوون.

جا لێرەدا تێبینیەکتان ئەخەمە بەرچاو..

مەسەلەی (بەرەکەت) لەگەڵ (سیحر)دا جیایە، زیادبوونی شت لە کردەی (سیحر)ەکەدا خودی شتەکە زیاد ناکات بەڵکو بۆچوونو خەیاڵی کەسەکە زیاد ئەکات، ئەیگۆڕێت بەڵام لە(بەرەکەت)دا خودی شتەکە زیاد دەکات چونکە مەسەلەی (برسییەتی ) مەسەلەیەکی (حسی)یەو هەستییە، مرۆڤ کە برسی بوو

به (سیحر) تێر ناخوات بە هەوا تێر ناخوات.. بەهەوا تونیەتییەکەی ناشکێت بەلاّم بە بەرەکەت واتە بە زیادبوونی پێویستییەکە ئیتر (خۆراك، خورما، ئاو، شیر....هتد) هەرچییەك بێ خودی ئەو شتە زیاد بومو بەکارهێنراومو پێویستییەکەی پێ جێبەجێکراوە.

٣٩- یەکەمجارە پشتی بدرێت لە زەوی :

پاڵەوانێکی ئەو سەردەمە ناوی (روکانەی کوڕی ئەلحارس) بووە، لە هەموو دورگەی عەرەبدا کەس نەیتوانیوە پشتی ئەم پیاوە بدات لە زەوی. .. ئەم روکانە کاتێ کە بێباوەڕ بووە هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەر پێی فەرمووە: روکانە بۆ زۆرانێك نەگرین. ئەویش دەڵێ: محەمەد تۆ خۆت بۆ ئەشکێنی. خۆت ئەزانی کە من لەناوت ئەبەم تاکو ئێستا کەس منی نەداوە بە ئەرزدا. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموی: من ئامادەم لەگەڵتا ئەویش هەر ئەیوت: محەمەد سوعبەتی وا مەکە، چونکە عەزیەتت ئەدەم. . بەلاّم پێغەمبەر فەرموی: من ئامادەم. هەڵئەستن‌و زۆران ئەگرن بە بەرچاوی ئەو هەموو گەنج‌و لاوە خوێنگەرمەوە بە گوڕەوە کە زۆریان پێ خۆش ئەبێ ئەم گەمەیەش لە پێغەمبەر ببینن. چونکە دیارە کە لاوان حەزیان لە پاڵەوانێتی‌و ئازایەتی‌و عەرزی بازوو ماسولکەهەیە.. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) روکانە هەڵدەگرێ‌و بە بەرچاوی هەموو ئامادەبوانەوە تەپ ئەیدات بە زەویدا، روکانە زۆر بەلایەوە سەیر دەبێ کەهەڵدەسێتەوە، پێغەمبەر ئەفەرمێ: باوەڕت هێنائەڵێ: با ئەمجارە دوبارە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەڵی ئەگرێ و بە خراپتر لە جاری پێشوو ئەیدا بە زەویدا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەفەرموێ: روکانە باوەڕت هێنا کە پێغەمبەری خوام. . روکانە قسەی نامێنێ

بەڵام هەر لاریی ئەكاتو ئەڵێ: با ئەمجارەش تاقیكەینەوە. سێیەم جاریش كە هەر پشتی ئەدرێت لەزەوی شایەتمان ئەهێنێو ئەڵێ: كە ئەمە تۆنیت وا لەمن ئەكەیت بەڵكو قودرەتێكی غەیبیی پاڵپشتەو ئەوە من هەڵئەگرێو ئەمكێشێ بە زەویدا.

٤٠- ئەم بارانە خۆش ناكاتەوە:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جارێكیان لەسەر مینبەر وتاری ئەفەرموو، یەكێ لە هاوەڵان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوعا بكە بێ بارانی ئەمساڵ دەغڵمان فەوتا، ئاژەڵمان هەمووی زایە بوو بەهۆی بێ لەوەرپیەوە یەكسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستی پیرۆزی هەڵبڕیو لە خوای گەورە پارایەوە كە باران ببارێنێ. . هاوەڵان ئەگێڕنەوە، تا ئەوكاتە ئاسمان هەوری لێ نەبوو كەچی لەوكاتەدا كە دوعاكەی كرد هەورێك هاتە سەر مەدینەو بڵاو بوویەوەو دەستی كرد بە تاوە بارانێك نەئەوەستایەوە هەتا پێغەمبەر چوویەوە سەر مینبەر و دوعای كرد (اللهم حوالینا لاعلینا)[٤٣٢]

---

[٤٣٢] صحيح البخاري، الإصدار ٢,٠٣ - للإمام البخاري الجزء الأول .. ١٧ - كتاب الجمعة .. ٣٢ - باب: رفع اليدين في الخطبة.

" ٨٩١"حدثنا إبراهيم بن المنذر قال: حدثنا الوليد قال: حدثنا أبو عمرو قال: حدثني إسحق بن عبد الله بن أبي طلحة، عن أنس بن مالك قال: أصابت الناس سنة على عهد النبي صلى الله عليه وسلم، فبينما النبي (صلى الله عليه وسلم) يخطب في يوم جمعة، قام أعرابي فقال: يا رسول، هلك المال وجاع العيال، فادع الله لنا. فرفع يديه، وما نرى في السماء قزعة، فوالذي نفسي بيده، ما وضعها حتى ثار السحاب أمثال الجبال، ثم لم ينزل عن منبره حتى رأيت المطر يتحادر على لحيته (صلى الله عليه وسلم)، فمطرنا يومنا ذلك، ومن الغد وبعد الغد، والذي يليه، حتى الجمعة الأخرى. وقام ذلك الأعرابي، أو قال غيره، فقال: يا رسول الله، تهدم البناء وغرق المال، فادع الله لنا. فرفع يديه فقال: (اللهم حوالينا ولا علينا). فما يشير بيده إلى ناحية من السحاب

واتــه: خوایــه بــۆ دەوروبەرکــەمان، نــا لەســەر خۆمــان چــونکە ئەترســان خانوبەرەکانیان بڕوخێت.

٤١- هەواڵێکی پێشوەخت:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موعجیزاتی لە بواری غەیبایەتیدا زۆر بووە، بۆ خوێندنەوەی داهاتووی کەسانی دەوروبەری جارێکیان میوانی (ئوم حەرامی کچی مەکان) ی خێزانی عوبادەی کوڕی صامت بووەو وابزانم.. پاش نانخواردن سەرخەوێك ئەشکێنێ‌و خەبەری ئەبێتەوەو پێئەکەنێت، ئەویش لێی دەپرسێ ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆچی پێدەکەنیت؟ فەرموی: هەندێك لە ئومەتەکەمیان پیشاندام ماومیەکی تر لە دەریادا جیهاد دەکەن، وشەی پیرۆزی (الله) لەرێی دەریاوە بە وڵاتانی تر ئەگەیەنێن. ئەویش ئەڵێ: دەی دوعا بکەئەی پێغەمبەری خوا منیش یەکێك بم لەوانە، دوعای بۆ ئەکات. پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەرخەوێکی تر ئەشکێنێ‌و خەبەری ئەبێتەوە، دیسان بە پێکەنینەوە خەبەری ئەبێتەوە ئەفەرموێ (ان کی من الاولین) تۆش یەکێکی لەوانەی کە شەرەفمەند ئەبیت بە جیهادی دەریایی.. لە سەردەمی (موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) ئەم ئافرەتە لە کەشتیەکەدا بومو پەڕیوەتەوەو پاشان سواری

---

إلا انفرجت، وصارت المدينة مثل الجوبة، وسال الوادي قناة شهرا، ولم يجيء أحد من ناحية إلا حدث بالجود. ﴿ر: ٨٩٠﴾ ﴿ش أخرجه مسلم في صلاة الاستقاء، باب: الدعاء في الاستسقاء، رقم: ٨٩٧.(سنة) شدة وجهد وقحط. (العيال) هم كل من يعوله الرجل ويقوم بالإنفاق عليه. (قزعة) قطعة غيم، أو الغيم الرقيق. (ثار) هاج وانتشر. (السحاب) الغيم. (يتحادر) ينزل ويقطر. (حوالينا) أنزل المطر في جوانبنا. (الجوبة) الفرجة المستديرة في السحاب، أو أحاطت بها المياه كالحوض المستدير. (قناة) اسم لواد معين من أودية المدينة. (بالجود) المطر الغزير﴾.

ولاخێـك بـوەو کەوتوەتـە خـوارەوە ئینجـا لەسـەر ولاخەکـە شـەهید بـووە، لـەو جیهادەدا ناوی چەند کەسێکیشی بردووە کە بە هەمان ئەنجام گەیشتوون.

٤٢- هەواڵێك لەکاتی مەرگدا/

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموی: ئەوا (ئەسـوەدی عـەنف)یـش کـە داوای پێغەمبەرایـەتی ئـەکرد، خـوا فـەوتانی، کـە زیـاد لـە ١٠٠٠کیلۆمـەتر لـە مەدینـەوە دوور بـووەو پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) هەواڵەکـەی راگەیانـدووەو پـاش ماوەیەك خەبەر هاتووە کە هەر لە هەمان بەرواردا مردووە.

٤٣- با ئەم خوێنە نەرژێ/

لە موعجیزەیەکی تردا ئامازە بۆ (حەسەنی کوڕی عەلی) ئـەکات، (سـەلامی خـوای لەسەر بێت) ئەفەرموێ: ان ابني هذه سیدة ولعلی الله ان یـصلح بـه مـبین فـاتیني عظمتیني من المسلمین. واتـە: ئـەم کوڕەی خـۆم سـەیدە وە خـوای گـەورە لەسـەر دەسـتی ئـەو سـوڵحێك ئـەکات لـەنێوان دوو کۆمـەڵی گـەورەی موسـڵماناندا، لـە بارودۆخێکدا (چل هەزار)کەسی ئامادەبوو خوێنی خۆی بـرژێ و فیـدای ئـەو زاتـە بکاتو تا ئاخر دڵۆپی خوێنیان بەرگری لە پێشەوا حەسەن بکەن (سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) فـەرموی: مـن ئەمـەم نـاوێو بـا ئـەم خوێنـە نـەرژێ. . بـەهۆی ئـەم لەخۆبوردییەی ئەم پیاوە مەزنەوە ئەو موعجیزە گەورەیە کەشـف بـوو، کـە پـێش چەند وەخت پێغەمبەر هەواڵی راگەیاندبوو، وە خەلافەتی تەسلیمی (موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) کرد.

٤٤- مەحاسینی شەریف/

مووی پرچی پێغەمبەری خوا لە زۆر وڵات بەکاردێت بۆ باران بارین، کە ئەمە دوو موعجیزەی تیایە.

یەکەم ئەوەی کە ئەم چەندین ساڵەی بەسەردا رۆشتومو ماوەتەوە.

دووەم ئەوەی کە دەبێتە هۆی بارانەکە.

لە رووی زانستییەوە دوای (٧٠)ساڵ (قژ) ئەپوکێتەوەو زایە ئەبێت، بەڵام ئەم مووە پیرۆزانە (مەحاسینی شەریف)ی پێغەمبەر ﷺ بە ژمارەی زیاد لە (١٤٠٠) ساڵە هەر ماون‌و زایە نەبوون. کە لە چەندین شوێن تا ئێستاش هەر ماون وەك (میصر، هندستان، سوریا، لە کوردستانی خۆشمان لە ناوچەی هەورامان " خانەقای تەوێڵەو بیارە ") هەن‌و هەر ماون.

# باسی چلو شەش
# ڕێگەکانی پاك کردنەوەی دەروون

مەبەستی سەرەکی ژیانمان ڕەزامەندی خوایەو پەیامی ژیانی موسڵمان لەسەر زەویدا ڕازی کردنی خودایە. . عبودیەتە.
ترسناکی ئەوەیە ئینسان ئەو پەیامەی بیر بچێتەوە. .
ترسناکی ئەوەیە مرۆڤ جەوهەری خۆی بیربچێتەوە. .
کەنەو "روح"ە بەزاراوە قورئانیەکە "نەفس"

(يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ﴿٢٧﴾)[٤٣٣]

ئەو نەفسەی کە بە پاك و خاوێنی خوای گەورە تەسلیمی ئێمەی کرد، داوای ئەو ئەمانەتەمان لێ دەکات بە پاك و خاوێنی بگەڕێتەوە لای خاوەنەکەی ئەو جەوهەرەی کە لە ناو ئێمەدایە فەرامۆش نەکرێت لەسەر حیسابی ئارەزوو. . لەسەر حیسابی دونیاو مەشغوڵ بوون بە دونیا جا لەو ڕێگەیەدا کە ئێمە هەوڵی بەدیهێنانی ئەو پەرستشەین

(وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ )[٤٣٤]

---

[٤٣٣] سورەتی الفجر ئایەتی ٢٧

[٤٣٤] سورەتی الذاريات ئایەتی ٥٦

هەرگیز ئەو پەرستشە خوا پێویستی پێی نییە. . نەقازانجی پێ دەگات نە زیان. .
بۆ خۆمانە بۆ ئەوەی ڕاقی بین ، دوورکەوینەوە لەو قورەی کە بەشێکە لە پێکهاتەی لەشمان، دوورکەوینەوە لەو ئاژەڵییەی کە بە شێکە لە نەفسیەتمان.

جاری واهەیە هەستی پێ دەکەین بەتایبەتی لە ڕەمەزاندا کە ئەو پەردانە نامێنێت، پەردەی خواردن و چڵێسی و نوستن و تەمەڵی و ئەو ڕۆحە هەست بە شەفافیەتێك دەکات، پەردەکانی ئەم سجنەی لێکەم دەکەیتەوە چونکە خۆی مادەی ئێرە نییە ئەو بەشە سەربەجیهانی مەلەکوتە بۆ ماوەیەك زیندانی گراوە لەناو ئەم بۆدیانەی ئێمە ئەم لەشانەی ئێمە تەنها لەکاتی نوستن دا پشوو دەدات تا خەبەرمان دەبێتەوەو دێتەوە ناو قەفەزەکە.

سەیری خۆمان دەکەین: یەکێك یان بە شێك لە پێکهاتەمان ئارەزووە کە پێی دەگوترێ "شهوات" ئارەزووی نان خواردن. . ئارەزووی سێکس. . ئارەزووی جل و بەرگ. . ئارەزووی دەستەلات و موڵکدارێتی و زاڵبوون بەسەرماڵ و خەڵکدا. . ئارەزووی سومعە و. .. هتد.

ئەم ئارەزووانە خوای گەورە داویەتی بە مرۆڤ لە سنورێکدا بەکاری بهێنین ئەمانە هیچی ناڕەوا و زیاد نین لە مرۆڤدا، هەموو پێویستە ئەگەر ئارەزوویەك نەبێت پاڵت پێوەبنێت بۆ خواردن لەوانەیە بمری لەبرساو ئاگات لە خۆت نەبێت، خواستێك دروست دەبێ تیاتا بۆ ئەوەی بچی نان بخۆیت. . خواستێك دروست دەبێ تیاتا بۆ ئەوەی بچی بنوویت. . خواستێکی زکماك و فیترییە بە ڕووتی نەڕۆیت جل لەبەربکەیت، بەڵام چەند جل لەبەربکەیت ؟ چەند بنوویت ؟چەند بخۆیت ؟ئەگەر خواستێك نەبێت زاوزێ ناکات. . دوای ئەوەیەك کۆتایی پێدێت. . بەڵام چەند نیکاح بکەیت ؟چۆن بیکەیت؟ هەموو ئەمانە سنووری بۆ دانراوە. . شەیتان دێت دەیەوێت لەو سنوورانە بتکاتە دەرێ. .

ئەوەیە ئەو هاوکێشەیەی کە پێویستە ئێمە لەسەری بمێنین. . ئەگەر لاماندا مەبەستەکەمان لێ تێک دەچێ . . عبودیەتەکەمان لێ تێک دەچێ. . لەلایەکی ترەوە نەفسمان هەیە ئەم نەفسە سروشتێکی هەیە. . طبع یان طباع ناوی خۆی بە خۆیەوەتی طبع بووە لێی جۆرە صیفاتێکە وەری گرتووە لە دایک و باوکیەوە لە کۆمەڵگەکەیەوە کە تیایدا ژیاوە چاك و خراب طبع بووە تیایدا ئەوانەش کۆسپن هەندێك طبع دژی ئەو پەیامەیە دژی عبودیەتەکەیە. . طبعی ستەم طبعی ڕەزیلی طبعی خۆویستی دژی کەژاوەی ئەو مرۆڤەیە بۆ بەدیهێنانی ئەو پەرستشە. . بۆ ڕازی کردنی خودا "سبحانە وتعالى". . ئەم نەفسە حەز بەتەمەن درێژی دەکات حەز بە پەرستش دەکات. . هەندێك صیفاتی تیایە بۆ مانی ئەو ئینسانە پێویستە. . بەڵام نابێ لە سنوور دەرچێ. . وەکو ئارەزووەکان پێویستیشی هەیە. . پێویستی مادی. . پێویستی وەکو چی؟ وەکو ئەوەی کە شوێنێك کەتیایدا بژیت و بنوویت. . ماڵێك، جلوبەرگێك، خواردنێك. .. هتد ئەمانە پێویستی مادین. .

پێویستی سۆسیۆلۆجی و کۆمەڵایەتیمان هەیە ئەمە چێنراوە تیاماندا، هەموو کەسێك لەسەر گۆی زەویدا حەز دەکات ڕێزی لێ بگیرێت. . چۆن ئەمە بەدیدەهێنیت، ئەگەر ئەم پێداویستیانە ئامادە نەکەیت ناتوانی ڕێی عبودیەتەکە بگریت (کیف أصلی وأنا جائع) چۆن نوێژ بکەم کەمن برسیم. . دە نان مەخۆ. ... نان مەخۆ گلوگۆز لەلەشدا دادەبەزێ ناتوانی بە پێوە بوەستی. . ناتوانی بیر بکەیتەوە. . لە هۆش خۆت دەچیت. . چۆن نوێژ دەکەیت ؟!

دەبێ ئەم پێداویستیانە ئامادە بکرێ. . بەڵام نابێ لەسنوور دەرچێ. . ئێمە ناڵێین ئەرکی دونیا نا..نا... ئەمانە ئەبێ جێبەجێ بکرێ کۆمەڵایەتیەکەش دەبێ بێتە دی. . فیترەیەکە خوا داویەتی پێمان هیچ کەسێك حەز ناکات کەرامەتی بریندار

بكرێت. . هەر كەس حەز دەكات ڕێزی لێ بگیرێ، بەلآم نەگاتە ئاستێك ببێتە مەبەست لە ژیانتاو حەز بكەیت ئامازەت بۆ بكرێت و بوترێت: ئەمە مامۆستا فلآن كەسە. . واش نا لە سنورێكدا كەرامەتت پارێزراو بێت.

پێداویستی عەقلی لە هەموو كەسێكدا هەیە بەچی دابیندەكرێ بەوەرگرتنی زانیاری (معلومات) ئەوكەسەی كە دائەنیشێ لەسەر ئینتەرنێت كۆمەڵێك زانیاری وەردەگرێت كەخۆی پێویستی پێیەتی. . نەك وەكو ئەو ژنەی كەلەبەردەرگا دانیشتووەو لەگەڵ دراوسێكەیدا ئەدوێت ئەوە كێیەو ئەوە كێیە؟ئەوە چی بردە ژوورێو ئەو عەلاگەیە چی تیابوو ؟ ئەوە شێوازێكی ساویلكانەیە بەلآم هەمان مەبەست بەدیدەهێنێت.

پێویستیەكی عەقلیە. . بەلآم عەقلی ئەو بچووكە. . بەوە تێر ئەخوات بەلآم ئەوی تر عەقلی گەورەیە بە ئەنتەرنێتەكەش تێر ناخوات.

هەركەسە بە گوێرەی ئاستی خۆی بیردەكاتەوە. . هەیە بەكتێب، هەیە تەنها بە گوێگرتن، كابرا خوێنەوار نیە، هەرچەندە زانستی تازە دەڵێ ٩٠٪ "زانیاری مرۆڤ "چاك و خراپ كە خەزن بووە لە مێشك دا. . لە چاوەوە هاتووە ٩٠٪. . زانیاری لە چاوەوە دێت واتە: لە خوێندنەوەوە، لە سەیركردنەوە. .. إقرأ قرائەی ٩٠٪ ئیتر ئەو قیرائەیە ڕاستەوخۆو دێڕ دەخوێنێتەوە، یان ڕەسم دەخوێنێتەوە. . گرنگ ئەوەیە بەچاو شت وەردەگرێت. لەوانە پێویستی مادی . . پێویستی كۆمەلآیەتی. . پێویستی عەمەلی. . پێویستی ڕوحی. . هەموو مرۆڤێك پێویستی بە خۆشەویستی یە حەزدەكات خەڵك خۆشی بوێت. . خۆشی خەڵكی خۆش بوێت. . بەبێ مەرج ، پێویستیەكە لەو مرۆڤەدا هەیە . . لە ڕێزی منالێكەوە نیگای باوك بۆ منداڵ مەرجی تیانیە. . ئازاری ئەو باوكەی دەدات. . كەچی خۆشی دەوێت . . شتێكی بۆ دەكرێ بەپارەیەكی زۆر لەبەردەمیدا دەیشكێنێ

کەچی باوکەکە پێی خۆشە و ئازاری نادا (حب بلا شرط) پێویستیەکە لە هەموو ئینسانێکدا.

ئەمە کورتە باسێکی نەفسە. . ئەوەی تر کورتەیەکی باسی ئارەزوو بوو. . ئەگەر لەسەر ئارەزووەکە لەسنوور دەرچووی. . پێی دەوترێ الهوی. . ئەوە زیادەڕەویە بە نیسبەت نەفسەکەشەوە خوا ئاگاداری کردووین (إن النفس لأمارة بالسوء) "سورەتی یوسف ئایەتی ٥٣" واتە: بەراستی نەفس هەمبانەیەکە لە خراپە. مرۆڤ وا دروست کراوە عینادە. . وەکو حەسەنی بەصری دەفەرموێ: ئەگەر خوای گەورە نەیوتایە صبر بکەن و مەئیوس مەبن پێچەوانەی ئەمەی بوتایە صەبر مەگرن مەئیوس ببن. . هەموو بەشەر صبری دەگرت. . سروشتی ئینسان ئاوا عینادە. . کەواتە ئەم حەقیقەتەمان زانی. . دەبێ بزانین ئەم نەفسە تاڕادەیەك دەبێ ئێمە بەقسەی بکەین. . پێداویستییە سەرەکیەکانی بۆ دابین بکە: مادی، کۆمەلایەتی، عەقلی، ڕۆحی. . دوای ئەوە ئەبێ بلێی نییە. نان خوارد ئیتر بۆ دەیکەیت بە چەند ژەم ئەی جل و بەرگەکەت ٣ تا ٤ جل و بەرگت هەیە بۆ چوونە دەرەوە و تەواو ئەمانەی تر زیادەن .

٥،٦ تا ٧ سەعات نووستیت لەوە زیاتر بەسە و تەواو. . نەفس داوای زیاتر دەکات ئەگەر بە قسەی بکەیت توشی بەلا دەبێت. . لە حالەتێك دا بۆ نموونە: حالەتی ترسنۆکیمان هەیە و حالەتی ئازایەتیمان هەیە و حالەتێ هەیە دەبێ ئالێرەدا کۆنترۆلی کەین نابێ بەرەلای کەیت:

(قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ )[٤٣٥]

---

[٤٣٥] سورەتی الشمس ئایەتی ٩ - ١٠

ئەوەی کەنەو نەفسە ڕێك دەخات. . ئەوە تووشی سەرفرازی و سەرکەوتنی دنیاو قیامەت دەبێ، کە کۆنترۆڵمان کرد ئیتر یارمەتیمان دەدات بۆ گەیشتن بە دوا ئامانجمان کە ڕازی کردنی خودایە. . بەدیهێنانی عبودیەتە لە تەمەنماندا گرنگ ئەوەیە لەسەر ئەو ڕاستە ڕێیە بمرین ئیتر ناگەینە لوتکە. . ناگەینە ئەو لوتکەیەی کە رسول الله ((صلی الله علیه وسلم)) گەیشت. . بەڵام گرنگ ئەوەیە لەو ڕێگەیەدا بمرین، لەو ڕێگەیەدا تەمەنمان کۆتایی بێت. . لە لاڕێیدا کۆتایی نەیەت پەنا بە خوا، ئارەزوو ڕاتدەکێشێ، لەم لاوە نەفس لاڕێیت پێ دەکات . . لەلایەکی تریشەوە ئەم دنیایە بەرازاوەییەوە بەسەرنج ڕاکێشانی هەڵخەڵەتێنەرانەیەوە کە هەندێکی ئارەزوو دەوروژێنێ. . لەولاشەوە ئەو مەلعونە هەیە کە پێی دەوترێ شەیتان. . بوو بە ٣ خەتەر شەیتانیش ئەم سیانە ڕێکدەخات. . دەکاتە کەرەستەی دەستی خۆی بەتەنها هیچی بۆ ناکرێت. . تەنها لە ڕێگەی ئەم سیانەوە نەبێ عەزیەتت دەدات ئەگەر هاتوو لەسەر ڕێگەکەی خۆت بوویت ئەوە دەرەقەتت نایەت نەفسێکی ڕێکوپێك لەرێ لانادرێت. . دنیایەکە لە سنووری مەبەستەکەی خۆتا بەکاری ئەهێنیت:

(إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾)[٤٣٦]

زۆر مەزنە ئەم ئایەتە هەرچی لەسەر ئەرز هەیە زینەتە چونکە زەوی مەبەست نییە دونیا مەبەستی ئیماندار نییە. . لێی وەرگرە کامی بەرژەوەندی ڕێگەکەتی تیایە وەکو سەیارەیەك وەکو هۆکارێك بۆ خزمەتی دینەکەت بۆ

---

[٤٣٦] سورەتی الکهف ئایەتی ٧



خزمەتی ئەو مەبەستەی کە بەدیهێنانی عبوودیەتی خوایە (لنبلوهم ایهم احسن عملا) کرداری چاکی تیا بکەیت. . ئیتر تۆ چنگێك وەردەگریت پێویستیت بە چنگێکە. . من ٤ چنگم پێویستە. . بەلاْم هیچ عەیب نییە دونیا بێتە ژێر پێتەوە. . دونیا بێتە گیرفانتەوە . . بەلاْم عەیبە، عارە، شورمییە بێتە دڵتەوە. . دەبیتە بەندەی ئەو.

پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ (ﷺ)( حفت الجنة بالمكارم وحفت النار بالشهوات)[437]

[437] الجامع لأحكام القرآن، الإصدار ٢،٠٢ - للإمام القرطبي الجزء ٤ من الطبعة .. سورة آل عمران .. الآية: ١٤ {زين للناس حب الشهوات من النساء والبنين والقناطير المقنطرة من الذهب والفضة والخيل المسومة والأنعام والحرث ذلك متاع الحياة الدنيا والله عنده حسن المآب} قوله تعالى: "زين للناس" زين من التزيين واختلف الناس من المزين فقالت فرقة: الله زين ذلك وهو ظاهر قول عمر بن الخطاب رضي الله عنه، ذكره البخاري. وفي التنزيل: "إنا جعلنا ما على الأرض زينة لها" ﴿الكهف: ٧﴾ ولما قال عمر: الآن يا رب حين زينتها لنا نزلت: "قل أأنبئكم بخير من ذلكم" ﴿آل عمران: ١٥﴾ وقالت فرقة: المزين هو الشيطان وهو ظاهر قول الحسن، فإنه قال: من زينها؟ ما أحد أشد لها ذما من خالقها. فتزيين الله تعالى إنما هو بالإيجاد والتهيئة للانتفاع وإنشاء الجبلة على الميل إلى هذه الأشياء. وتزيين الشيطان إنما هو بالوسوسة والخديعة وتحسين أخذها من غير وجوهها. والآية على كلا الوجهين ابتداء وعظ لجميع الناس، وفي ضمن ذلك توبيخ لمعاصري محمد (صلى الله عليه وسلم) من اليهود وغيرهم. وقرأ الجمهور "زُيِّن" على بناء الفعل للمفعول، ورفع "حبُّ". وقرأ الضحاك ومجاهد "زَيَّن" على بناء الفعل للفاعل، ونصب "حبَّ" وحركت الهاء من "الشهوات" فرقا بين الاسم والنعت. والشهوات جمع شهوة وهي معروفة. ورجل شهوان للشيء، وشيء شهي أي مشتهى واتباع الشهوات مرد وطاعتها مهلكة. وفي صحيح مسلم: (حفت الجنة بالمكاره وحفت النار بالشهوات) رواه أنس عن النبي (صلى الله عليه وسلم). وفائدة هذا التمثيل أن الجنة لا تنال إلا بقطع مفاوز المكاره وبالصبر عليها. وأن النار لا ينجى منها إلا بترك الشهوات وفطام النفس عنها. وقد روي عنه (صلى الله عليه وسلم) أنه قال: (طريق الجنة حزن بربوة وطريق النار سهل بسهوة...) وهو معنى قوله (حفت الجنة بالمكاره وحفت النار

چواردەوری بەهەشت نارەحەتیە بەردەوامیە لەسەر پەرستش. . لەسەر نارەحەتی. . هەمووی نارەحەتیە، تۆ لە رێی ئەو نارەحەتیەوە لە قاپی بەهەشت دەدەیت. . بەلآم ئەی دۆزەخ لە کوێ وە بۆی دەچیت ؟

لە لارێیەوە. . لە ئارەزووە وە جا ئەم شەیتانە زۆر زیرەکە. . ناتوانین بیکوژین بەلآم ئەتوانین سنوورێکی بۆ دانێین. . لەو سنوورە زیاتر نەهێڵین بێت بەملاوە

(إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ ﴿٦﴾ )[٤٣٨]

خوا دەفەرموێ بەراستی شەیتان دوژمنتانە. . حیسابی دوژمنی بۆ بکەن. . گومان ببە لە هەر شوێنێکەوە بۆت بێت. . گومان دەکەم لێرەوە بێت. . بەشەو. . بەرۆژ. . کە تۆ چاوەچاوی دوژمنت کرد واتە: وورپای بەرامبەری حیسابی بۆ دەکەیت. . بەلآم کە حیسابت بۆ نەکرد دەبیتە نێچیرێك بۆ ئەو و ئەزیەتت دەدات.

ئەم رێگایە جۆرەها و چەندەها کۆسپی تیایە. . یەکێك لەو کۆسپانە نەفسە ئەو خەسڵەتە ناشیرینانەی کەلە نەفسدا هەن هەمووی بەدەستهێنراوون. . ئاگات لێ بێ خوا مرۆڤی دروست نەکردووە کە عیناد بێ کە رەزیل بێ کە خۆویست و بوغزاوی و حەسود بێ نەخێر ئەمانە هەمووی موکتەسەبە خۆی کەسبی دەکات پەنا بە خوا ئەمانە ئەگەر خوا خۆی بیدا مانای وایە ئەمە زوڵمە چۆن صیفەتێکە کە خوا داوێتی پێی کەچی پێ ی ئەڵێی ئەوەت بۆچی پێ یە ئەمانە هەمووی موکتەسەبە ئینسانەکە کەسبی دەکات بە ئیرادەی خۆی خوا ئیرادەیەکی

---

بالشهوات). اي طريق الجنة صعبة المسلك فيه أعلى ما يكون من الروابي، وطريق النار سهل لا غلظ فيه ولا وعورة، وهو معنى قوله (سهل بسهوة) وهو بالسين المهملة.

[٤٣٨] سورەتی فاطر ئایەتی ٦

داوەتێ صیفەتی ڕەزیلی لە عەرەبی دا ئەگەر لە بواری ماددەیا بێ. . لەبواری پارەو ماڵ و موڵك و سەروەت و سامان دا بێ پێی دەوترێ (بخل) بەلأم ئەگەر لەبواری مافدا بێ لە بواری معنوی دا بێ پێی دەوترێ (شح) هەردووکی منقولە لای خوا بەلأم دوژمنت جیا کەرەوە کردەوەیەکی ڕەزیلانە جیاوازە لە هەڵسوکەوتێکی ڕەزیلی دەکەوێتە هەڵوێستێکەوە ڕەزیل دەبێت تیایدا دەتوانی یارمەتی فلأن کەس بدەیت بەلأم لەوکاتەدا یارمەتیت نەدا. . حاڵەتێکی ڕەزیلی دەرکەوت تیاتا. . ئەوەندە هەیە زۆرجیاوازە لەوەی کە تۆ هەمیشە ڕەزیل بیت ئێمە هەمووەمان کەوتوینەتە ناو ئەو حاڵەتانەوە کە هەندێ هەڵوێست بەسەرماندا تێپەڕبووە حاڵەتێکی غەفڵەت بووە یان ئەوەتا شەیتان زاڵبووە بەسەرماندا یان ئارەزوومان ئەو خێرەمان نەکردووە تێپەڕ بووە ئەوە جیاوازی هەیە لەوەی کە تۆ بەردەوام ڕەزیل دەبیت. . لە مافداندا بەرامبەر دایك و باوك داوای شتێکت لێ دەکەن ئا بمبە بۆ ماڵی فلأن نایبەیت دەی بمبە بۆ لای دکتۆرەکە با دەرزیەکم لێ بدات نایبەیت. . ئەوە حاڵەتی شوحە ئەوە زۆرجیاوازە لەوەی کە بە هەمیشەیی بە قسەیان نەکەیت. . ئەگەر هاتوو بوو بە صیفەت لە ئینساندا (بخل)

(وَمَن يَبۡخَلۡ فَإِنَّمَا يَبۡخَلُ عَن نَّفۡسِهِۦۚ ٣٨ )[٤٣٩]

ئەوە زەرەر لەخۆی دەدات. . گرفتەکە لەوەدایە ئەگەر هاتوو سنوورێکت بۆ دانەنا بۆ ئەو ڕەزیلییە گەورە ئەبێ دەبێتە شێرپەنجەی دەروونی. . دەبێتە شێرپەنجەی کۆمەلأیەتی:

---

[٤٣٩] سورەتی محمد ئایەتی ٣٨

(ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ ﴿٣٧﴾ )[٤٤٠]

هــەرخۆی دەبێتــە ڕەزیلێکــی بــەردەوام بــەڵکو ئــەم دەردە بــەناو کۆمــەڵگادا بڵاودەکاتەوە واتە: بەناوی دروشمی سەیر سەیرەوە خەڵکیش والێدەکات. . کاکە منداڵەکانت گرنگترن حەجی چی ئەو پارەیە بدەبە کوڕەکەت با دوکانێکی پێ دانێ یان بیدە بە کوڕەکەت با ژنێکی پێ بهێنێ ئەرزێکی پێ بکڕە خانوەکەت بچکۆلەیە بەناوی بیمەی کۆمەڵایەتی و دواڕۆژو دوایی کەس فریات ناکەوێ وکەس پشتت ناگرێ ئەم پارەیە خەرج مەکە ئەو نەخۆشی یە بڵاودەکاتەوە لەوەش خەتەرترو لەوەش سەقەتتر:

(أَشِحَّةً عَلَى ٱلۡخَيۡرِۚ ﴿١٩﴾ )[٤٤١]

ئەوە خەسڵەتی ووڕوە. . دووڕوویش کە دانی خێر بەیەکێك دانانێ سوور ئەزانێ ئەو ئینسانە باشە کەچی بەچاکە لەناو کۆمەڵگادا باسی ناکات. . ئەوە ڕەزیلە لە بوارێکی مەعنەویدا شتێکی خێر هەیە نای گەیەنیت بە خەڵك (شح) هەیە لە زانستدا شتێك ئەزانیت بە براکەی خۆتی ناڵێیت. . ئەی نازانی "وعن علمه فإذا عمل به" یەکێکە لە پرسیارەکانی ڕۆژی قیامەت ئەو زانیاریەی هەت بوو بڵاوت نەکردەوە بەتایبەت بۆ تەلەبە. . شتێك ئەزانی. . مامۆستایەك توێژینەوەیەکی پێ وتووی یان خۆت بەرهەمت هێناوە هەست ئەکەیت لە تاقیکردنەوەدا بێتەوە بۆ بە براکەی خۆت ناڵێی !؟ بۆ پێی ناڵێی ئەمە زۆر گرنگە !؟ ئەمە وایە ؟! ئەمە وا شیکار دەکرێ ؟! ئەگەر نەت وت ئەوا ئەبیتە شحیح.

---

[٤٤٠] سورەتی النساء ئایەتی ٣٧

[٤٤١] سورەتی الاحزاب ئایەتی ١٩

شح لەبواری ماف لەگەڵ کەس و کارا باوك و دایك و خوشك و برا لەگەڵ دراوسێ و خزم و کەس و کار لەگەڵ غەریبە ئەویش مافێکی هەیە لەگەڵ میواندا ئەو ماوەیەی کە دانەنیشی مافی هەیە نەبێ ڕێزی لێ بگری کە عبوس بوویت لەگەڵی شحیحیت. . جا هەندێ کەس خوا دەستەلاَتی داوەتێ پلەوکورسی هەیە. . عەشیرەتدارە. . سومعەیەکی گەورەی هەیە. . دەوڵەمەندە . . مافی خەڵك زیاترە لەسەری. . فەقیرێك لە دەرگای تۆ دەدات مافەکەی ئەوەیە بڵێی مامە گیان خوا بداتێ ئەوە مافیەتی دەبێ واجوابی بەیتەوە بەلاَم ئەگەر دەوڵەمەند بووی ئەوە مافی نیە دەبێ بەکردەوە خزمەتی بکەیت دەبێ پارەی بەیتێ یارمەتی بەیت هەرکەسە بە گوێرەی ئاستی خۆی ئینجا ئەگەر هاتوو توانیمان زاڵ بین بەسەر ئەم دوو دەردەیا (بخل وشح) مانای ئەوە نیە تەواو ئیتر ڕێگەکە پانە لەبەردەمماندا ئەگەینە مەقامی عبودیەت نا. . هێشتا کۆسپی تر هەیە.

ئایا ئەو کردارەی کە من دەیکەم ئیخلاصی تیایە خالصا بۆ خوایە ئەگەر هاتوو وەلاَمەکە بەڵێ بوو هێشتا کۆسپی تر ماوە. . کێ ئەڵێ ئەصوەبە کێ ئەڵێ گونجاوە ١٠٠٪ لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ).

هیندۆسەکانیش ئیش دەکەن خالص بۆ خوا. . ئاگرپەرستەکان ئیش دەکەن یارمەتی خەڵك دەدەن خالص بۆ خوا . . مەسیحیەکانیش کار دەکەن خالص بۆ خوا. . بەلاَم ئێمە مەرجی دووەممان هەیە دەبێ بەرامبەری سوننەتی رسول الله (ﷺ) بێت چونکە أن لا إله إلا الله محمد رسول الله یعنی:

١. أن لا یعبد إلا الله. یەکەم: تەنها خوا بپەرسترێ.

٢. أن لا یعبده الله إلا بما جاء به محمد (ﷺ). . دووەم خوا نەپەرسترێ تەنها لە ڕێگەی محمدەوە نەبێ (ﷺ).

کۆسپێ دێتە بەردەمت پێی دەوترێ ریا ئەو ڕیایە لە (بینین) وە هاتووە. . حەز دەکەی ئەو کردارەی کە کردووتە. . ئامانجت ئەوەیە خەڵك ببینێ کە خەڵك بینی لای خوا نانوسرێ. . یەعنی لەم لاوە ڕزگارت بووە لە ڕەزیلی و لە شح و خۆتت کۆنترۆڵ کردووە و هەوڵ دەدەیت ئەو ئیشەی کە دەیکەیت ئیشێك بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردبێ و هەمووی ڕێك و پێك. . کەچی لەم لاوە هەدەفێ پەیدا دەبێ لەنەفستا ئەو نەفسەی کە باسمان کرد کە چ بەڵایەکە حەز بە چی دەکات بەوەی کە خەڵك ببینێ بۆ ئەوەی مەدحت بکەن . . ئەوە پێی دەوترێ ریا.

ریا یەکێك لە پێناسەکانی ئەوەیە کە حەز بکەیت دەستەڵاتێکت هەبێ لەناو دڵی خەڵکیدا. . ئێستە کە من هاتووم بۆ ئێرە ئەگەر مەبەستم ئەوە بێ بچمە ناو دڵتانەوە غایە بێ لەلام مەبەستم بێ کە دەستەڵاتێکم هەبێ بەسەر دڵی ئێوەدا. . بەسەر فیکری ئێوەدا. . خۆم فەرزکەم بەسەرتاندا. . قوڕ بەسەر ئاژدادم . . یەعنی بۆ خوا ئیشم نەکردووە ! بۆ مەبەستێکی زاتی خۆم ئیشم کردووە ئەمەوێ وەلائێکی ئێوە بۆ لای خۆم ڕاکێشم .

عبودیەت ئەوەیە وەلائی خەڵکی ڕاکێشی بۆ أرحم الراحمین باسی چی دەکەین حفت الجنة بالمكارم کۆسپێکی تر پەرژینێکی تر تاسەیەکی تر لەو ڕێگایە پێی دەڵێن: سومعە ئەمە بەڵایەکە، لە ڕیا خەتەرترە هەوڵت داوە ئەو کردارە چاکەی کە دەیکەیت ئەو عیبادەتە کەس نەی بینێ نوێژ دەکەی ئێ تۆ ئەگەر خەڵك هەبێت و نەبێت تۆ نوێژی خۆت دەکەیت مەبەستت ئەوە نەبووە سەیرتکەن بە نهێنی چوویت دینارێك بدەیت بە هەژارێك غایەت ئەوە نەبووە خەڵك بت بینێ یا لەپڕ لەسەر کۆڵانەکەوە زەلامێك تۆی دی بەشەرتێ دڵخۆش

نەبی ئاگاداربە ئەگەر دڵخۆش بووی بە بینینەکەی ئەویش دەستەڵاتی تۆی تیا نەبوو هیچ مەترسی ئەو کردارەچاکە إن شا الله لە ڕیا بەدوورە.

ئێستا ئەم ئیشەی کە من دەیکەم لێرەدا ئەگەر بە ڕیا تەفسیر بکەیت هەمووی ڕیایە هەمووتان ئەیبینن لە حاڵێکدا لای خودا بەڕیا دەنووسرێ ئەگەر مەبەستم بینینی ئێوە بێت ئەگەر ئەوە بوو بە هەدەف لای خودا أشهدوا بالله دەبێتە ڕیا بەڵام من هاتووم سجلی خۆم پڕبکەمەوە لای خودا ئیتر یەك کەس دانیشتووە هەزار دانیشتووە گرنگ نیە لام بەڵام گرنگ بوو لەلام کە وەلائێکی ئێوە ڕاکێشم بۆ لای خۆم ئەوە دەبێتە ڕیا. . خۆشەویستیەك هەبێ لە دڵم دا کە تۆ منت خۆش بوێت لەبەرخۆم بەقسەی من بکەیت لەبەرخۆم ئەوە ڕیایە. . دەسەڵاتێکم هەبێ بەسەر دڵتاندا ئەوە ڕیایە حەز بکەم کە ڕۆشتیتەوە باسم بکەیت ئەوە ڕیایە جا عەرزتان دەکەم ئەگەر هاتوو خۆت پاراست لەمە هیچ مەغرور مەبە کۆسپێکی تر هەیە کە پێی دەوترێ سومعە. . لەو قورسترە لە سماعەوە هاتووە حەزدەکەی خەڵکی ئەم ئیشەی تۆ بچێتە گوێ یانەوە ئەو کردارەی کە کردووتە خەڵکی بیبیستێ بەخوا فلانە کەس خێرکەرە مولودی خوێند بڵندگۆی داناوە جا ئەوە ئەو بڵندگۆی داناوە گەورەترین سوودە یەعنی حی علی الصلاة هاوار ئەکات ئەوە بۆ خوا نییە. . گوێتان لێی بێ بۆ خوا نیە. ئەوانەی کە مەولود دەخوێننەوە. . زۆر روونە سومعە یەعنی ئەچێتە سەماعی خەڵکەوە. . کردەوەی چاکە ئەوەیە کە ئەم دەستە خێردەکات دەبێ ئەو دەستەی تر پێی نەزانێت ئەم جارئەدا بە بڵندگۆ. . خواردنیش بۆ هەژار نیە بەس بۆ ئەو کوڕو کچانەی کە دەعوەت کراون لەوێ تێکەڵیان دەکەن بەیەکەوە ناوی دەنێن مەولود. . گوناهەکەی زۆر زۆر زیاترە لەو خێرەی کە ئەیکات. . خواردنێك هەژار لێی نەخواو دراوسێ لێی نەخوا ئەمە چ صەدەقەیەکە. ... نازانم!

ئەو کرداره جوانەی دەیکەیت بێجگە لە خوا با کەس پێی نەزانێت. . ئەوە لە ڕیا پاراستووتە لـە سـومعەش پاراسـتووتە ئاگـاداری خـۆت بـە لـەکاتی تورەبوونـدا. . شەیتانەکە دێت ئەو نەفسەی کەلەسەرەتای دەرسـەکە باسمان کـرد خـاڵی لاوازت دەزانێت وات لێدەکات باسی ئەو خێره بکەیت لەکاتی توورەبوونتدا مامۆستا فلان نەزانی فلان کەس غەیبەتت دەکات قسەت پێ ئەڵێ ! چۆن قسەم پێ ئەڵێ ئـەوە ١٠ساڵە من مەعاشم بۆ بڕیوەتەوە. . بەو قسەیە خۆی کەشف کـرد. . ئـەو کـردەوە چاکەی کە کـەس پێـی نـازانێ لەحاڵـەتی وادا دەرکانـدی بـوو بـە سمـاع ئینجا لای خـوای گـەوره تۆمارێـك هەیـە "تۆمـاری نهێنـی" مەگـەر خـۆی بزانـێ ئـەجرو سەوابی چەنده ئەگەر هاتوو باست کرد لە تۆماری نهێنییەوە دێتە تۆماری ئاشکرا پاداشـتەکەی زۆر کـەم دەبێتـەوە جـارێکی تـر دوپاتـت کـردەوە رەش دەبێتـەوە و نـامێنێ. . دەوەره بـەم دوو پێـوەره بـە سـومعەو بـەڕیا وەره پـشکنینێك بـۆ کردارەکانت بکە. . لەوانەیە لەوەتەی باڵغ بـووی تائێـستا بڵێین ملیۆنێـك کـرداری چاکەت هەیە ملیۆنێك کرداری جوانت هەیـە وەره بزانـە چـەندی بـەر ڕیاکـەوتوە کاتێك فلان و فیسار بینیوویەتی هەستت بە خۆشی کـردووە کەواتـە ئـەوە ڕیایـە ئـەبێ هەسـت نەکـەی بـە خۆشـی چـونکە کـردەوەی چاکە تـاج و ئەسـتێره نیـە لەسەر شان خۆتی پێوە هەڵکێشی. . خودا دەفەرموێ:

(وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ ﴿١٠﴾ )[٤٤٢]

ئەگەر بـوو بەصاڵح بەتـەرازووی خـوا بـەرزی ئەکاتـەوە بـۆ لای خـۆی بـۆت حـازر دەکات بۆ قیامەت ئەگەر نا ئەوە بوو بە سومعەو بـوو بـە ڕیـا و پـەنا بـە خـوا کـە ئێمـە سـەیری کردارەکـانی خۆمـان دەکـەین دەبیـنین زۆر خەتـەره. ڕیـا ٣ ڕوبعـی

---

[٤٤٢] سورەتی فاطر ئایەتی ١٠

خواردووه سومعەش ئەوانی تری خواردووه مەگەر تاکەتاکە عەمەلی صالّح مابێ لەبەر ئەوە زۆر پێویستە کە ئێمە بەخۆداچوونەوەیەکی خۆمان بکەین.

جگە لەو کۆسپانە. . کۆسپەکان ناژمێرێن. . مکارهەکان ناژمێرێن لەو ڕێگایەدا دەبێ بزانیت لەهەموو لەحزەیەکدا ئێمە لە چوار ئەگەردایین نابێت بە پێنج:

١. لە حاڵەتی ئیتاعە.

٢. لە حاڵەتی مەعصیەت پەنابە خوا.

٣. لە حاڵەتی نیعمەتدایت.

٤. لە حاڵەتی بەلادایت. . بەلاو تاقی کردنەوە.

حاڵەتی پێنجەممان نییە . . ئەگەر هاتوو کەوتیتە ئیتاعەتەوە دووشەممان و پێنج شەممان بەڕۆژووبوویت. . شەونوێژ دەکەیت شەووڕۆژێك جزئێك قورئان دەخوێنیت مانگێك خەتمێکت هەیە قیام لەیلت هەیە أذكارو إستغفار و لەسەر زمانتە الحمدالله زۆر لەسەر زمانتە سبحان الله خەریکی ئەم جۆرە عیبادەتانەیت هەد بەچاوێکی سووك تەماشای خەڵکی تر مەکە بڵێ ی ئەو وەکو من نیە ڕاستە ئەو وەکو تۆ زاکرو عابد نییە گوناهێك کە لەلایەن کەسێکی جاهلەوە دەرچێ زۆر ئاسانە سڕینەوەی. . گوناهێك کەلەیەکێکەوە دەرچێ شارەزا بێت زەحمەتە. . لەبەر ئەوە نەبێت شعور بکەین کە ئەو لە تۆ زۆر باشترە بڵێ ئەو معصیەتی کردووە لە جەهلەوە بەلام من گوناهەکانم لە عیلمەوە بووە پەنا بە خوا کە دێمە ئەم بازنەیەوە شوکری خوا بکەم لەسەر ئیتاعەتم بڵێم خوایە ئەمە بە فەزلی تۆیە منت خستۆتە ئەم ئیتاعەتەوە ئاوا مامەڵە دەکرێ لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا.

حاڵەتی ئیتاعەت دەبێ بەردەوام بیت لەسەری بەو شەرتانەی کە باسمان کرد وە بڵێی ئەمە فەزڵی خوایە. . لەوانەیە دەرگای ڕەحمەتت بۆ بکرێتەوە بەلام مەرج نیە دەرگای قبوڵت بۆ بکرێتەوە. .

ئێستا یەکێکی وەکو من دەرگای موەفەقیەتم بۆ کراوەتەوە . . ڕۆژ نیە کاغەزم بۆ نەیەت یەك لاپەڕە دوعای تیا نەبێت بۆ من تەمەن درێژ بیت و لەش ساغ بیت وخوا بەهەشتت پێ ببەخشێ و ئینجا پرسیارێ دەکرێ و ئینجا بەهەموو شێوەیەك لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ دەرکەوم و ئەمە دەرگای موەفەقیەتە. . بەڵام من نازانم دەرگای قبوڵەکە کراوەتەوە یان نا کەسیش نازانێ.

ئەگەر بکەویتە حاڵەتێکی ئیتاعەتەوە قەد مەغرور نەبیت چونکە نازانیت ئەم دەرگایە قبوڵی لەگەڵە یان نا. . ئیبلیس ١٠،٠٠٠ساڵ عابد بوو لەگەڵ جوبرائیل و میکائیل، خوا لەعنەتی لێ کرد تا ڕۆژی قیامەت. . ئەو ڕەحمەتە گەورەی کە ئەبارێ لە ڕۆژی قیامەتا ئەمەندە گەورەیە ئەمەندە گەورەیە ئیبلیس وادەزانێ ئەویش دەگرێتەوە.

حاڵەتی دووەم: حاڵەتی گوناهە، مەعصیەتە، هەڵسوکەوتمان چۆنە لەگەڵ گوناهدا. . چۆن لە پەرستشەکە دەترسایت هەمیشە دەبێ بترسی.

لە حەسەنی بەصریان پرسی لەگەڵ ئەم هەموو پەرستشەدا وەزعت چۆنە لەگەڵ خوا . . فەرمووی: لە پاپۆڕێکدا لەناوەڕاستی دەریا کەلەت و پەت ئەبێ و نکرۆ دەبێ چۆن ئەو کەسانە هەوڵ ئەدەن پارچە تەختەیەکیان دەست بکەوێت بچنە سەری. . من پارچە تەختەیەکم دەست کەوتووە بەقەدەر سنگی خۆمە لەناو ئەو دەریادا تۆزێك ئەجوڵێمەوە سەرم ئەچێتە ناو ئاوەکە. . تۆزێکی تر ئەجوڵێمەوە ، خەریکە دەکەومە ناوی ئاوا بە هاوسەنگیەکی ترس و لەرز خۆم ڕاگرتووە (هذا حالي مع الله).

ئەوە بارو دۆخی منە لەگەڵ خوا ئەوە حەسەنی بەصری یە کە ئیمامی عەلی مامۆستای بوو کە عەبدوڵای کوڕی مەسعود مامۆستای بوو کە ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) بە ٧٠-٨٠ساڵی مەمکی خۆی دایە شیر

هاتە دەرێ. . سەیدی تابیعینە ئاوا دەفەرموێ ئەوە حاڵی منە لەگەڵ خوا ئێمەش دەبێ ئەو ئیتاعەتە بەترس و لەرزەوە پێشکەشی بکەین بەبەردەوامی چونکە نازانین قبوڵ دەبێ یا نا.

ئەگەر کەوتینە حاڵەتی گوناھەوە ھەڵوێستمان دەبێ چۆن بێ ؟ خێرا تەوبە و گەڕانەوە خێرا تەرکی ئەو گوناھە.

کەوتینە حاڵەتی سێھەم نیعمەتێکی خوا باری بەسەرماندا:

﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴿٣٤﴾ ﴾[٤٤٣]

نەك ھەمووی وەرە یەك نیعمەت بھێنە بۆت ناژمێرێ مەڵێ نیعمەتی چاو وەرە سەیری چاو کە بزانە چەند جۆر خانەی تیایە ١٥٠ملیۆن تەلەفزیۆن وێنە دەگوێزێتەوە جوڵە دەگوێزێتەوە. . چۆن؟

بە ٨٠٠،٠٠٠ وایەر بۆ ناوەوە ھەندێ لەو خانانە ڕەنگ دەگوێزێتەوە (تلوین) ھەندێکی جووڵە. . ھەندێ ئەژماری ماوە "تقدیری مسافە" دەکات (سبحان اللە) ناژمێرێ ئەو نیعمەتانە.

تەماشای سێوێك دەکەی یەك شتە بەلأم وەرە بزانە نیعمەتەکانی خوا چەندن. . چەند جۆر ڤیتامیناتی تیایە ؟ چەند جۆر کانزای تیایە ؟ چەند کەس سوودی لێ وەرگرتووە ؟ ھەر لەو کەسەی کە چاندویەتی لە باخەکەدا. . کە فرۆشتویەتی. . و بازرگانی کۆ. . ئەو لۆریەی کە ھێناویەتی. . حەماڵەکە. . و عەلوەکەو. . دوکانداری کۆو. . دوکانداری تاك. . و ھەتا ئەو سەیارەی نەفەرانەی کە سواری دەبیت و میوەکەت ھەڵگرتووە دەیبەیتەوە بۆ ماڵەوە و چەندین کەس سوود لەم سێوە دەکات. . ئەمە یەك نیعمەتە:

---

[٤٤٣] سورەتی ابراھیم ئایەتی ٣٤

﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ (٣٤) ﴾[٤٤٤]

ئینجا ئەمە سلیلۆزی تیایە نیعمەتەکان ناژمێررێن. . بەڵام دەبێ هەڵوێستمان چۆن بێ ئەگەر کەوتینە ئەوەوە ئەبێ شوکری خوا بکەین. . ئەبێ شوکری نیعمەتێك بکەین کە خوا ڕووی نایە لێت بسەنێتەوە. . پیاوێکی نەوەت ساڵە دەزووی ئەهێناو دەیکرد بە دەرزیدا وتیان: مامە ئەمە چۆن چاوت لاواز نەبووە خۆ منداڵەکانت هەموو مردوون منداڵی منداڵەکانت ٥٠ ساڵن !!

وتی بۆچی لاواز دەبێ ؟ وەڵلاهی حەرامم پێ نەبینیون. . وەڵلاهی شوکری خوا لە زمانم نەوەستاوە هی ئەم نیعمەتە، خوا چۆن لێم ئەسەنێتەوە، چۆن لاوازی دەکات. ئەوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ خوا.

حاڵەتی بەلاکەش کە کەوتینە ناویەوە. . ئەوە قەدەرە. . بەشێکە لە ئیمان ئیتر چۆن ئەبارێ ئەو قەدەرە تەندروستیت لێ ئەسەنێتەوە ؟ ئەمین و ئومانیت لێ ئەسەنێتەوە ؟ قۆڵێکت ئەپەڕێ ؟ تووشی هەژاری دەبی ؟ زیندانی دەکرێی ؟ دەربەدەر دەبی ؟ هەرچی کە پێی دەوترێ بەلا ئەوە هەڵسوکەوتەکەی صبرە. . ئەبێ هەڵوێستت لەگەڵیدا بەصەبربێ ئیتر دەکەویتە کامیانەوە ئەوە ئیشی من و تۆ نییە. . ئیشی خوایە.

جاری واش هەیە لەهەرچواری داین !

لەلەحزەیەکدا لەهەرچواریدایت لەلایەکەوە لە ئیتاعەتیت لەلایەکەوە هەندێ مەعصیەتت هەیە لەلایەکەوە نیعمەتەکانت بیر چۆتەوە شوکری خوای لەسەر بکەیت لەلایەکەوە کەوتویتە هەندێ ئیبتلائاتەوە لەگەڵ هەر حاڵەتێکدا ئەدەبێکی تایبەتی هەیە. . ذکری خوا (جل جلالە) ئەوەندە پێویستە چونکە

---

[٤٤٤] سورەتی ابراهیم ئایەتی ٣٤

دڵنیـایی دەبەخـشێ بـەو نەفـسە (ألا بـذكر الله تطمـئن القلـوب) هاوكێـشەیەكە یاسایەكە ! تۆ بەردەوام بە لەسەری (سبحان الله وبحمده سبحان الله العظيم) ئەوەی ١٠٠جـار بیخـوێنێ بـەیانیان (غفـر لـه ذنوبـه ولوكانـت كالرمـل عـالج)[٤٤٥] عـالج بیابانێكی گەورەیە لە خوار مەدینەوەیـە تـا یەمـەن پێغەمبـەری خوا دەفـەرموێ (عليـه الـصلاة والـسلام) ئـەوەی ١٠٠جـار بـەیانیان ئەمـە بڵـێ گوناهـەكانی ئەگـەر بەقەدەر دەنكە لمەكانی ئەو بیابانە بێت خوا ئەیسڕێتەوە ئایا بـەردەوامین ئێمـە لەسـەر ئەمـە ؟ تـۆ بەردەوامبـە بزانـە چ دڵنیاییـەكت پـێ ئەبەخـشرێ بـەڵام بەمەرجێ وەكو پیرەژنەكان نا بە زمان دەیڵێ و سەیری زنجیرەی شەوانە دەكات بە زمـان دەیڵـێ و لەگـەڵ دوو ژنـی تـرە غەیبـەتی خـەڵك دەكـەن. . خـوای تعـالی بـە حەزرەتی موسای فەرموو یا موسا مـن ئـەو كەسانەم خۆش ناوێت كـە بـە زمـان لەگەڵمدان بەڵام بە دڵ لەگەڵمدا نین باوێـشك دەدەیت لـە نوێـژداو (إهـدنا صـراط المستقيم) دەخوێنی ؟

كام صراط ؟

تۆ هۆشت لای خۆت نییە. . هیدایەتی چیت بدات ؟

هـەموو لەحزەیـەك پێویـستمان بـە جـۆرە هیدایەتێكـە فـەرقی هەیـە لەگـەڵ هیدایەتەكانی چەند سەعاتێك لەمەوپێش. . چونكە هەڵوێستەكان دەگۆڕێن. . لـە دوای نوێژی بەیانیـەوە تـا نوێـژی نیـوەڕۆ پێویـستم بـە كۆمـەڵێك هیدایـەت بـووە داوام كـردووە لـە نوێـژی بـەیانی دا (إهـدنا صـراط المـستقيم) ئـەو كۆمەڵـە

---

[٤٤٥] زيادة الجامع الصغير، والدرر المنتثرة، الإصدار ٢,٠٥ - للإمام السيوطي كتاب "زيادة الجامع الصغير"، للسيوطي ..حرف الميم ٣١٤٥- من قال حين يأوى إلى فراشه: أستغفر الله الذي لا إله إلا هوالحي القيوم وأتوب إليه ثلاث مرات غفر الله له ذنوبه، وإن كانت مثل زبد البحر، وإن كانت عدد ورق الشجر وإن كانت عدد رمل عالج، وإن كانت عدد أيام الدنيا.(حم ت) عن أبي سعيد.

هیدایەتەی کە پێویستە بۆ ئەو ماوەیە. . خوای گەورە پێم ئەدات دڵنیائەبم پێم ئەدات. . ئەی لە نیوەڕۆوە بۆ عەصر شەحنەکان کەم دەبێتەوە بە دڵێکی حازر بە تەوەکولێکی ڕاستەقینەوە بە دڵ داوا ئەکەم ( إهدنا صراط المستقيم ) هۆکاری هیدایەتی ترت پێ ئەدات (والذين آمنوا وعملوا الصالحات يهديهم ربهم بإيمانهم) هیدایەت بۆ ڕانەبردوو هاتووە بە بەردەوامی دێت. . لەگەڵ داوادا، داوای هەموو کەسێك تا ئەو کەسەی کە (اياك نعبدوا)ئەوەی جێبەجێ کردووە. . ئەوانە هیدایەتیان بۆ دێت (اياك نعبدوا) مەکە جێبەجێ بکە (اياك نستعين) ئاکامە. . ئەنجامە. بەلأم تۆ عبودیەتەکەت ڕێك و پێك نەبێت بە چ ڕوویەکەوە داوائەکەیت هەموو نمرەکانت صفرە. . ئەچیتە لای بەڕێوەبەر (بلا تشبه) ئەڵێیت ٩٠نمرەم بدەرێ لە فلأن دەرس وە لە فلأن وفیسار دەرسا دەرم چێنن بابە تۆ ١٣ات هەیە لە ١٠٠ چیت دەرچێنین !

(اياك نستعين)بۆ ئەو کەسانەیە (اياك نعبدوا) یان جێبەجێ کردووە. . ئینجا ئەگەر شەیتان توانی ڕاتکێشێ پەنا بەخوا بۆ شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی ئەو(خطوات الشيطان) ئەوە ئینحرافت کردووە و ناگەیتە ئەو هەدەفەی کە خوا داوای کردووە. . تووشی لاڕێی دەبیت ئەگەرهاتوو وریا بوویت ڕێگەیەکی تر بەکاردەهێنیت وات لێدەکات خۆت ببیتە (الە) سەرسامیەکت پێئەدا شانازیەکت پێئەدا شەیتان کێیە ؟ گاڵتە بەشەیتان ئەکەیت ! خۆت ئەبیتە خواوەندی خۆت (أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ ﴿٢٣﴾ )[٤٤٦]

---

[٤٤٦] سورەتی الجاثية ئایەتی ٢٣

ئەو هەوایەی کەباسمان کرد من. .مـن..مـن..هتـد.ئـەو (انـا) یـە زۆر بەلأیـە. . وات لێدەکات بەها بـۆ خـەڵك و کەسـەکان وەك خۆیـان دانـەنێیت. . باشـە ئـەو زەلامـە چییە. . ئەوە چییە. . جانەوە چییە. . وات لێدەکات خۆت بپەرستی !

بەلأم ئەگەر بیربکەیتەوە ( لو کان دون تقی درجە لکان خیر خلق الله ابلیس) وەکـو شـافیعی دەفـەرموێ: ئەگـەر خـوای گـەورە بـە تـەقوای نـەمان کێشـێ لـە ڕۆژی قیامەتـدا بـە زانـست بمـان کێشـێ ئـەبێ ئیبلـیس یەکـەم کـەس بڕواتـە بەهەشـت چونکە کەس بە قەدەر ئەو زانـستی نییـە بـەلأم عیلمێـك کـە تـەوزیف نـەکرێ بـۆ خزمەتی خوا بۆ دینی خوا وە بۆ عبودیەت بەکارنەیەت نرخی نییە.

ئەو بەخۆ گەورەزانین گڕی لە زانستەکەی بەردا. . سووتاندی.

عـیلم چـیە بەتـەنها کـە خۆبەگـەورەزانینی لەگەڵـدا بـێ و خۆهەڵکێـشان و خۆبەزلزانینی لەگەڵ دابێت. . کەواتـە ڕێگەیـەك هەیـە ڕاتئەکێشێ بـۆلای خـۆی ئەبیتە جەماوەری شەیتان. . شوێن هەنگاوی دەکەویت ڕێگایەکی تر هەیە ئەگەر بەرگریت کرد ئینجا وات لێدەکات خۆت ببیتە خوا (الە) پەنا بەخوا ئەگەر ئاواش نەبوو. . دنیات بۆ جوان دەکات. . ئەگەر ئاواش پێت نەوێرا لە ڕێی چییەوە بـۆت دێت ؟ لە ڕێی ئیسلامەتیەوە ئەمە زۆر ترسناکە !!

(قل أندعوا من دون الله مالا ينفعنـا ولا يـضرنا ونـرد علـى أعقابنـا بعـد إذ هـداناالله كالذى استهوته الشيطين فى الارض حيران له اصحب يدعونه الى الهدى ائتنـا قـل إن هـدى الله هـو الهـدى وأمرنـا لنـسلم لـرب العـالمين ) ئایـەتی ٧١ سـوره الأنعـام . . وای لێـدێت ئـەو موسڵمانە لاواز دەبـێ لـە عیبادەتـا. . ئـەو موسڵمانەی کـە ماوەیـەك خواپەرستی بردۆتەسەر. . ماوەیەك ژیاوە لەناو کۆمەڵێکی ڕێك و پێکدا بـرادەری چاکی هەبووە ئەو زادی خۆی هەبووە قیرائەی قورئـانی هـەبووە ڕۆژووی هـەبووە جۆرەهاو چەندەها پەرستشی هەبووە ڕێك و پێك ماوەیەك تووشی ساردی دەبێ. .

ئاگای لە خۆی نیە  یان نەفسەکەی تێک چووە یان شوێن ئارەزوو کەوتووە یان دونیا سەرقاڵی کردووە. . سزای دونیا ئەزانن چییە ئەگەر هاتوو ئەم زینەتەی دونیا کاری تێ کردی دونیا بوو بە مەبەست سزاکەی ئەومیە یەکسەر ناوچەوانی ئەو زەلامە ڕەش ئەبینی خوای ئەکرد بە جوانترین و گرانترین صابون دەم و چاوی ئەشت ئیماندار هەستی پێ دەکات ئەودەموچاوە ڕەشایی مەعصیەتی تیایە.

دووەم ئەو مرۆڤە خوا قەناعەتی لێ ئەسەنێتەوە. . تێر ناخوات لەم دونیایەدا.

سێیەم ژیانی پڕ دەکات لە مەراق.

چوارەم سەرقاڵی ئەم دنیایە بێت. . بەندەی ئەم دنیایە بێت. . وەختی نیە بۆ ماڵ و مناڵی. . وەختی نیە بۆ خۆی. . بۆ لەشی. . من کەسانێك ئەناسم ئەڵێن مامۆستائێمەش وەکو تۆ هەڵدەستین شەو ئینجا چوزانن من هەڵدەستم ئاخر ئێمەش هەڵدەستین وتم: خواسەرکەوتووت بکات إستغفار زۆر بڵێ ووتی ئەوەڵا ئێمە لەپڕ خەبەرمان دەبێتەوە تۆ بڵێی ئەو ڕزقە زەرەر بکا ؟ چەند گڵۆپ دادەگیرسێنین. . مولیدە. .. چرا دادەگیرسێنین. .. لە پڕ حاسبە دەردەهێنین و ئەڵێین تۆ بڵێی ئەو ڕزقە ئەومندە قازانج نەکات؟ خەمێکی بۆ دروست دەبێ کۆتایی نایەت. . ئەمە تۆڵەی حەز لێ کردنی دونیایە جا ئەم ئایەتە ئاوا دەفەرموێ  کە موسڵمان سارد بوویەوە لە عیبادەت دەگاتە حاڵەتێك هەندێ هاوڕێ ی بۆ پەیدا دەبێ. . ئەڵێن وەرە ئەمە بپەرستین ئیتر ئەمە چی یە ؟ بەدیهێنراوێکە جگەلە خوا ئەم ئیماندارانەش دەڵێن چی (أن دعوا من دون الله مالا ینفعنا ولا یضرنا ) باشە ئێمە هەوڵ و کۆشش بدەین بۆ بەدیهێنراوێك نەسوودی بەدەستە نەزیان (بعد إذ هدانااللە) پاش ئەوەی کە خوا هیدایەتی داین بەڵام ئەم دوو دڵییە زۆر بەڵایە خوا ئەفەرمێ (کالذی إستهوته الشیاطین) حاڵی ئەو کەسانە وەکو ئەو کەسەیە کە مێشکی ئیش ناکات (إستهوته الشیاطین) ئەلف

و سین و تاو هەرهاتە بەرچاو یەعنی داخوازیە داواکاریە (إستغفرالله) یەعنی (أطلب أستغفرك من الله) إسترحمك یەعنی داوای ڕەحمتت لێ دەکەم إستهدیك خوایە داوای هیدایەتت لێ دەکەم إستعطفك داوای سۆزت لێ دەکەم (کالذی إستهوته الشیاطین) ئەو کەسە دوودڵە. . وەکو حەیرانێك وایە شەیاتین داوای چی لێ دەکات. . جێبەجێی دەکات. . چۆن ئارەزوو بەکاربهێنە. . ئەمە مافی خۆتە. . هاوڕێ ی بۆ پەیدا دەبێ. . ئەڵێ ئەمە ڕێی هیدایەتە.

بەناوی ئیسلامەتیەوە ڕای ئەکێشێ

(قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰ ﴿١٢٠﴾)[٤٤٧]

تەنها هیدایەت و ڕێی خوایە. . هیدایەت نیە لە ڕێی ترەوە. . ئێمە ئاوا فەرمانمان پێ کراوە هیدایەت وەرناگرین بێجگە لە خوا . . لەبەر ئەوە ئەگەر رزگارمان بوو لە هەندێ پیلانی شەیتان پاڵی لێ نەدەینەوە بڵێین ئیتر ئەوە پێمان ناوێرێ نا. . ڕێگەی تردێت. . بەناوی ئیسلامەتیەوە لاڕێیت تووش دەبێت. لە کۆتاییدا دەڵێم:

با هەمیشە ئێمە پەنا بگرین بە خوا. . پاسایەکمان هەیە خوا ئەفەرموێ ڕاست لەسەر ڕێی هیدایەتە

(وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٠١﴾)[٤٤٨]

ئەوەی پەنا بەرێ بۆ ئەو خوایە بەدڵێکی پاك نافەرموێت هیدایەتی ئەدەم، ئەفەرمێ: ڕاست لەسەر ڕێی هیدایەتە فقد هدی الی صراط المستقیم. ئەگەر

---

[٤٤٧] سورەتی البقرة ئایەتی ١٢٠

[٤٤٨] سورەتی ال عمران ئایەتی ١٠١

هاتوو تووشی نارەحەتی بوویت تووشی هەندێ حاڵەت بوویت واتە: ئەزانی دەرگاکان داخراوە قەت واتە: بیر مەکەرەوە:

(وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ﴿٢﴾ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ ﴿٣﴾)[٤٤٩]

تەنها تەقوات هەبێ خوا بناسە شەرمی لێ بکە ئیتاعەی بکە چەند بکەویتە نارەحەتیەوە خوای گەورە دەرگات لێ دەکاتەوە (يجعل له مخرجا) ئایا ڕووتدێ خوا بە درۆ بخەیتەوە "پەنا بەخوا" ئەفەرموی دەرگات بۆ ئەکەمەوە. . چی تریش (ويرزقه من حيث لا يحتسب) لە ڕێگەیەکەوە رزق و خێرت بۆ ئەنێرم هەر حسابت بۆ نەکردووە.

ئەوە یاسای خوایە سبحانه وتعالى کۆسپەکانمان زانی هەندێکی لە خۆمانە هەندێکی دەرەکییە هەندێکی لە دنیاومیە بەلآم بزانە شەیتان هیچ دەورێکی نییە ئەگەر تۆ نەفسەکەت رێك وپێك بێ حەز لە دنیا نەکەیت ئەوە زۆر زۆر گرنگە.

---

[٤٤٩] سورەتی الطلاق ئایەتی ٢-٣

# باسی چل‌و حەوت
# کـلیـلـەکانی غەیـب لـەگەڵ نیشانەکانی قیامەت

پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێ: (مفاتح الغیب خمس لا یعلمهن إلا الله ) پاشان ئایەتەکەی خوێند کە ئەمـە دەقەکەیـەتی: (إن الله عنـده علـم السـاعة وینزل الغیث ویعلم مافی الارحام وما تدری نفس ماذا تكسب غدا وما تـدری نفس بای الأرض تموت إن الله علیم خبیر) صدق الله العظیم لقمان -٣٤

واتە: بوارەکانی غەیب پێنجن کەس نایان زانێ خوا نەبێ: کە بریتین لەمانە:

١- میعاد وکاتی ڕۆژی قیامەت

٢- بارین. . بەشێوەی لێزمە و ڕەهێڵە ( الغیث ) نەك باران (المطر).

٣- زانینی مەخلوقاتی ناو ڕەحم.

٤- زانینی ڕوداوی دوارۆژ.

٥- شوێنی مردنی هەموو مەخلوقێ.

ئەمانە خوای گەورە دەیانزانێ و کەسی تر عیلمی نیە.

تێبینـی / هـەموو پێغەمبـەرێك، هـەموو شـوێنکەوتوانی پێغەمبـەرێك شـوبهات هاتۆتە ڕێیان، ئەو کەسانەی کەلەدەرەوەی ئەو بازنە ئیمانیەن گۆسپ دێننـە ڕێـی ئـەو شـوێنکەوتوانە. . ئـەو ئیماندارانـە. . گومـان دێننـە ڕێیـان. . لـەبواری عەقیدەکـەیان بـێ، لـەبواری مەنهەجەکـەیان بـێ، لـەبواری سـەرکردەکانیان بـێ، ئەمە پلانێکی زۆر کۆنە. . ئێستاش بەردەوامە، لەوانەیـە پێتـان بڵێن ئێستا بـە ئامێری (سۆنەر) جنسی منداڵ نێرە یان مێ یـە دەرئەکەوێ ئیتر عیلمی غـەیبی

چی و و قورئـانی چی (نعـوذ بـالله)، تـۆش ئـەی موسـڵمان کەلەسـەنگەری فیکـری ئیسلامیدایت و بەرگری لە فیکری ئیسلامیی دەکەی، سەردەم سەردەمی حیوار و گفتوگۆیە و هەرکەس چی پێ یە هەڵی دەرێژێ تا بزانن حەق لای کێ یە ؟!
دڵنیابـە حـەق لای تۆیـە . لەگەڵتایـەو خـوات لەگەڵـە. . بـەرگری لـە دینـی خـوا ئەکەی بەرگری لە بەرنامەی خوا ئەکەی (سبحانه وتعالی ).
بڵێ ئەو شتەی ئێوە ئەیڵێن پەیوەندی بە ئایەتەکەوە نیە کە ئایەتەکە دەفـەرموێ (یعلم ما فی الارحام) ئەوەی یەك تۆز لەعەرەبی بزانێت (ما) لەگەڵ (من) لەیـەك جیادەکاتـەوە.
(ماتفید العاقل ولغیر العاقـل ولحـی ولیمیـت) "مـا" هـەموو شـتێ دەگرێتـەوە نـەك هەر ئینسان واتە چی زیندەوەر هەیە چی لە ڕەحما هەیە خوای گەورە نـەزانێ و عیلمـی هەیـە نـەك هـەر جنـسەکەی شکلی چۆن ئـەبێ چـەن ئـەژی بەسـەرهاتی ژیانی چۆنە ؟ ڕزقی چۆنە ؟ ئەمە هەمووی ناواخنی زانستی خوایە.
تێبینیەکی تر /
لەوانەیە پێتان بڵێن لە ئەمەریکا بارانی پیشەسازی هەیە، بە فڕۆکە ئەچێتە سەر هەور تۆزی پاودەر یان شتێکی وەك نـارد وابـزانم جۆرێکە لـە (کبریتـات ) فڕێـی دەدەنە سەر هەورەکە ئیتر باران دەبارێ ئەوەش پەیوەنـدی نیـە بـەو ئایەتـەی کـە (ینـزل الغیـث) ە، لـە قورئانـدا ( الغیـث ) هەیـە ( المطـر) هەیـە، ئـەو بارانـەی کەلەوەرگا زیندوو ئەکاتەوەو بەهۆی ئەو بارانەوە پەڵەندا و ڕوومکـی تینـوو تێـر ئاو دەبێت و سوود بـەخش بـێ خـوای گـەورە لـە قورئانـدا نـاوی نـاوە ( الغیـث ) ، بـەلام مطـر بـەکارهاتووە بـۆ الغضب کـە بـاران زۆر بـوو ترسـای لێـی دوعایـەکی پێغەمبـەر هەیـە کەدەفـەرموێ ئێمـەش بڵـێین (اللهم حوالینـا لا علینـا) بـۆ ئـەم مەسەلەی بارانی پیشەسازی یە زاناکان هـەوریان پـۆلێن کـردووە، هـەموو هـەورێ

بارانی تیا نیه ئینجا ئەو هەورە کێ دروستی کرد؟ وە ئەو هەورە دەیانەوێ بارانەکەی بباریێ بەسەرناوچەیەکی دیاری کراودا، ئەگەر لەو جۆرە نەبێ کە بارانی پێ بێ هەتا بەیانی ئەو پاودەرەی بەسەرا بکەن باران ناباریێ، دروست کردنی هەورو هێنانی هەور ئەمڕۆ زانستێك هەیە (علم الریاح) ی پێ دەڵێن، تەنها لێکۆڵینەوە دەربارەی هەوا دەکات با چۆن دێت و چۆن دروست دەبێت. . ئەوە ئاستێکی دەبێتە "الغضب" ئەمناڵێنی پێوەی لە دەریای (کاریبی) و (ئەمەریکای لاتینی )دا زریانی سەیری لێوە پەیدا دەبێ، ماڵەکانیان وێران ئەکات دیومانە لە تەلەفزیۆندا ماڵەکانیان ئەبات بە ئاسمانا. . ئاوارە دەبن و ناتوانن چارەسەری بکەن، لە قورئانیشدا (ریح) هاتووە و (ریاح) یش هاتووە ( وأرسلنا الریاح لواقح) واتە ریاح ئەو جۆرە بایەیە کە سوود بەخشە هەڵاڵە نەقڵ دەکات و هەوای پیس لادەبا و ژینگە پاك دەکاتەوەو هەوای پاك دێتە شوێنی . . بەڵام ریح (ریح فیها عذاب الیم) یان (ریح العقیم)ئەم جۆرەیان "الغضب" لەو کاتەوەی ڕەشەباکە بەهێز دەبێ دوعای تایبەتی هەیە (اللهم جعلها ریاحا ولا تجعل هریحا).

ئەومەسەلەی بارانی پیشەسازییە پەیوەندی نیە بە ئایەتەکەوە، خوای گەورە هەورەکەی دروست کردووە. . خوای گەورە هەورەکە دەگوێزێتەوە بۆ ئەو شوێنەی خۆی دەیەوێ، وە ئەو بڕەش دەباریێ کە خوا دەیەوێ، ئەم ناوچەیە ئەومەندەی بەرئەکەوێ. هەتا لە ئاستی دڵۆپەو ژمارەی دڵۆپەکانیشن (وماتدری نفس ماذا تکسب غدا) کەس نازانێ سبەینێ چی ڕوودەدات. . ووردەکاریەکانی سبەینێ چییە، ووردەکاریەکانی داهاتوو چۆنە، بەداخەوە هەندێ لە تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە بۆ خوێندنەوەی داهاتوو ئەچن پەنا ئەبەن بۆ فاڵچی و جادوگەر و...ئەمانەی کە بەرگی ئیسلامەتی لەبەر دەکەن بەداخەوە هەندێکجار ئەو

کردارمیان بۆیەیەکی دینی پێوە دەکەن و دینیش دوورە لەوان، بێ لەروودامان ئەیلێم هەموو جۆرەکان بە خەواندنی موگناتیسیشەوە، بە خوێندنەوەی دەست، بە خوێندنەوەی ناوچاو، بە خوێندنەوەی ئاوێنە بە هەموو جۆرەکانیەوە ئیمان ئەدۆڕێنی ئەگەر باوەڕی پێ بکەی، پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ فەرموودەکەم باش لەبەر نیە بەس ئەو مانایە ئەبەخشێ. ئەمە ئەگرێتەوە ئەو کەسەی کە بچێ بۆ لای کەسێ فاڵی بۆ بگرێتەوە وە بە هەر جۆرێ بێ دەستی بۆ بگرێتەوە. لەسەر لم شتی بۆ بکا. شتی بۆ باس بکا ئەم باوەڕی پێ بکا و بڵێ بەڵێ ڕاست دەکەی (فقد كفر بما نزل على محمد ) واتە: کفری کردووە بە قورئان. چونکە قورئان دەفەرموێ: کەس نازانێ لە داهاتوودا چی ڕووئەدات.

تێبینی بکەن:

بێجگە ئەو پێنجەی کە باسمان کرد. غەیبی کاتی هەیە. هەندێ غەیب کاتێك دێت، دێتە دی لە دایك دەبێ، تا ماوەیەك لەمەوپێش یەك لەو هەسارانە کە پێی دەڵێن "بلۆتۆ" کە بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە نەدۆزرابوەوە، چەندساڵێك لەمەوبەر دۆزرایەوە، ئەمە غەیب بوو لای ئەوەی پێشوو بەلام لای ئێمە دۆزرایەوە بە هۆی ئامێرو بە هۆی هۆکاری زانستیەوە کەوتمان بە گوێرەی ئاستی وێناکردنی ئەو کۆمەڵگایە خوای گەورە هەندێ غەیبمان بۆ ئاشکرا دەکات. بۆ ئاسانکردنی ژیان بۆ ئاسانکردنی کاری ژیاری یان لە ڕوانگەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە دەڵێ ( إن الله عنده علم الساعة ) ساعة یەعنی قیامەت، وە لە فەرموودەی پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) (کۆمەڵە نیشانە ـ أشراط) ی بۆ دانراوە (أشراط ) کۆیە. تاکەکەشی شرط یەعنی نیشانە، ئاماژە، زاناکانی فەرموودە پۆلێنی ئەم ڕووداوانەیان کردووە. ئەم نیشانەیان کردووە. هەندێکیان ناویان ناوە نیشانە بچوکەکان، هەندێکیان ناو ناوە نیشانە گەورەکان

له نیشانه بچوکەکان هەندێکی هاتووەدی و کاتی بەسەرارۆیی وە هەندێکی ئێستا دێتە دی و بەشێکی هێشتا نەهاتۆتە دی، بەلام نیشانه گەورەکان وەك پەیدابوونی دوکەڵێ هەموو دونیا ئەگرێتەوە، وەك هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسا(علیه السلام) وەکو (دابه) حەیوانێ پەیدا دەبێ قسە لەگەڵ خەڵك دەکا، وەکو هەڵهاتنی خۆر لە ڕۆژئاواوە ئەمانە هیچیان نەهاتۆتەدی. . بەلام بچووکەکان زۆری هاتۆتە دی و کاتی بەسەرا ڕۆیشتووە و هەندێکیشی ئەوەتا جێبەجێ بووە هەندێ کەس بڵێ ئەم شتە ئایندەییە بۆچی باسی بکەین وخەڵکی پێوە سەرقاڵ بکەین، مەسەلەی غەیب مەسەلەیەکە ئیختیاری ئێمەی تیا نیە، مەسەلەیەکی عەقیدەییە، بیروباوەڕە، خوای گەورە کە درووود بۆ لەخواترسان دەنێرێ:

(الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدًى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ)[٤٥٠]

چەند خەسڵەتێك باس دەکات: یەکەمیان: باوەڕ بە غەیبە کە مەسەلەیەکی عەقیدەییە. . بۆیە باسی ئەکا. دووەم لەوغەیبانە ئەوەیە: کە بە عەمەلی دێنە دی و بەچاو ئەبینرێ ئیمان زیاد ئەکا، لە ئایەتێکی قورئاندا خوا ئەفەموێ:

(غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣)[٤٥١]

---

[٤٥٠] سورەتی البقرة ئایەتی ١-٣

[٤٥١] سورەتی الروم ئایەتی ٢-٣



ڕۆمانەکان شەڕێکی گەورەیان کرد لەگەڵ فارسەکان. . فارسە ساسانیەکان ئاگر پەرست بوون. . ئایینێکی ئاسمانیان نەبوو، ڕۆمانەکان نەصرانی بوون خاوەنی ئینجیلن پێغەمبەریان هەیە کە حەزرەتی (عیسا)یە علیه السلام ئیماندارەکان صەحابەکان لەمەککە حەزیان دەکرد ڕۆمانەکان بیبەنەوە، چونکە فقهێکی مەوازەنە بەکاردەهێنێ ئەم ئاگر پەرستەو بە هیچ شێوەیەك خاڵی هاوبەش نیە لە نێوان تۆو ئەودا، بەڵام ئەمیان چەند خاڵی هاوبەش هەیە لە نێواندا، پێیان ناخۆش بوو بەڵام عەرەبە موشریکەکان حەزیان ئەکرد فارسەکان بیبەنەوە چونکە بتپەرستن بتیان هەیە ئاگرپەرستن، کۆمەڵێ خواوەندیان هەیە. . بەڵام ئایەتەکە ئەفەرموێ (وهم من بعدی غلبهم سیغلبون فی بضع سنین) بەڵام پاش ئەم دۆڕاندنەیان پاش ئەوەی ژێرکەوتن لەچەند ساڵێکا شەڕێکی تر ئەکەن و ئەیبەنەوە (وهم من بعدی غلبهم سیغلبون فی بضع سنین) بضع ناگاتە ( ٩) ساڵ وابزانم لە (٧) ساڵا بوو. . شەڕێکی تر ڕوویداو ئینجا بردیانەوە موسڵمانەکان زۆریان پێخۆش بوو نەك لەم حاڵەتەدا لەبەرئەوەی کە ئەمانە نەصرانین، نەخێر لەبەر ئەوەی مانای ئایەتەکە هاتەدی. . باسی دوارۆژ دەکاو ئەڵێ دوای چەند ساڵێ ئەیبەنەوە، ڕووی داو بردیانەوە، پێغەمبەری خودا ئەفەرموێ لە نیشانەکانی قیامەت کۆمەڵەیەکی زۆر شت ئەفەرموێ بەڵام ئێمە ئەوانەمان وەرگرتووە کە صەحیحن یان لە بوخاری یان لە موسلیمدا لەو نیشانانە ئەفەرموێ: قیامەت دەست پێ ناکات تا ئەم شتانە ڕوو نەدات :

یەکێك لەوانە ئاگرێك بەرزدەبێتەوە لەحیجاز. . ئەو کاروانەی کەلەشامە حوشترەکانی ڕوو دەکەن بەرەو ئەو ئاگرە. . ئەمە ڕووداوێك بوو وابزانم لە لە (٥) ی شەعبانی ساڵی (٥٤) ك بوو. . مانگێك زیاتری خایاند، ئەم ئاگرە بە شێوەی بورکان بوو، نزیك مەدینە لای بەنی قورەیزە وە ئاگرەکە پەیا بوو. . بورکانێ

بوو. . چونکه بیابانـه لـه یەمـەنیش بینیوویانـه، ئـەوەی بیـەوێ زانیاری زیاتر وەرگرێ لەسەر ئەم نیشانانە کتێبێ هەیە بەناوی (القیامة الصغری) هی (د.عمر الاشقر) درێژەی ئەم بابەتەی تیایە.

بە نووسراوی فەرمی " رەسمی" لەمەدینـەوە نووسـراویان ناردووە بـۆ دیمەشق. . لـه دیمەشـقەوە نوسـیوویانه بـۆ ئـەملا هـەتا قاضـی یەمـەن بـە چـاوی خـۆی بینیویەتی. . نووسراویان نوسیووە وەصفی ئـەو ئـاگرە ئەکـەن و ئـەهلی مەدینـه هەموو پەنا ئەبەنە بەر مەرقەدی پێغەمبەر ((صلی الله علیـه وسـلم)) هەرچـەند پـێش ئـەوە بـەدوو ڕۆژ بوومەلەرزەیـەك ڕوویـداوە زۆرمـاڵ ڕووخـاوە. . ترسـاون کەئەمە قیامەت بێ.

پـەنایان بردۆتـه مەرقـەدی پێغەمبـەر(ﷺ ) ئینجـا ئاگرەکـه پەیـدا بـووە، روناکیەکی زۆر هەتا هەندێکیان دەڵێن ئێمە ئەم شـتانە دەنووسـین بەشـەو لەبەر ڕوناکی ئەو ئاگرە، ئێستاش بۆ ئەو ناوچەیە ئەچی بەردی وای تیایـە، بـەس لـەو ناوچەیە هەیە چونکە ئەمـە لـە ژێـر ئـەرز بـووە هاتۆتـەدەرێ گابـەردی سـەیری تیایـە لـەزۆر ڕیوایەتیـشدا ئەفـەرموێ (بحجـم الـبعیر) بـەردی وای تیایـە بەقـەد حوشترێ، ئەمە هاتەدی.

مانگ بوو بـە دووکـەرت. . هـەر لـە زەمـانی پێغەمبـەردا (ﷺ ) بـە دوو ڕیوایـەت یـەکێکیان عەبـدوڵای کـوڕی مەسـعود و وابـزانم ئـەوی تریـشیان ئەنەسـی کـوڕی مالیکە لە صەحیحی موسلیمدا هەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ ) دوعای کـرد کـە کافرەکـان پێیـان ئـەوت ئەگـەر پێغەمبـەرە شـتێکمان پیـشان بـدات، دوعـای کـرد یەکسەر مانگەکە بوو یە دوو کەرتەوە و هەموویان بینیان ووتیان: ڕێکەوتە هەتا لە ڕیوایەتەکەدا پێغەمبەر (ﷺ ) ئەفەرموێ (فشهدوا فشهدوا) شایەت بـن ئـەوەتا ئـەوەتا، بـەڵام ئـەوانی تـر دوای وەفـاتی پێغەمبـەر (ﷺ) ڕووی داوە هەرچـەندە

لەمەوبەر هەندێکمان باس کردن ئێستاش هەندێکی تری باس دەکەین: عەرەبێکی دەشتەکی لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەپرسێ: متى الساعه ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: إذا ضاعة ألأمانة فنتظر الساعة، کە ئەمانەت وون ئەبێ چاوەڕوانی قیامەت بە ئەویش ئەڵێ: وكيف إضاعتها؟ چۆن ئەمانەت وون ئەبێ. . ئەفەرموێ ( إذا وسيد الأمر إلى غير أهله فانتظر ساعة) کە کار و بەرپرسیاریەتی دەدرێتە دەست کەسانێك شایەنی ئەو شوێنەو ئەو پلەو پایە نین، چاوەڕوانی قیامەت بکە.

لە نیشانەکانی قیامەت لەوانەی هاتۆتەدی (الموت الفجاء) مردنی کتوپڕ ئەمە هاتۆتەدی، چەندەها خەڵك مردوون بە مردنی کتوپڕ.

لەو نیشانانە (ڕەشوە) زۆر ئەبێ. . پێغەمبەر (ﷺ) (لعن الله الراشي والمرتشي فى الحكم والرائيش الذى يسعى بينهما) نەفرینی خوا لەو کەسانەی کە ڕەشوە وەردەگرن. . لەو کەسانەی کە ڕەشوە ئەدەن. . لەو کەسانەی دەلاڵن لە نێوانیاندا، ئەمەش هاتۆتە دی نەك هەر لەبەر باسی وولاتی خۆمان. . باسی هەموو دونیا بکە. . وای لێ هاتووە تا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: قیامەت ڕوونادات تا ڕاستگۆ بەدرۆنەخرێتەوە و ئەمین بەچاوی خیانەت تەماشا نەکرێت و درۆزن بەڕاستگۆ حساب نەکرێ، ئەمڕۆ سەیری ئاژانسی دەنگ و باسی هەموو دنیا بکە من ئەڵێم پێغەمبەر (ﷺ) وا ئەفەرموێ ئەو ئەڵێ تەلەفزیۆن وای ووت زۆرجار هەیە، لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەڵێ کەسێك ناوی "ڕووەی بە یضە یە" قسە ئەکا.

ئەڵێن ڕوەی بە یضە کێیە. . ئەی پێغەمبەری خوا ؟ (الرجل تافه يتكلم فى الأمرالعامة ) وای لێ دێ دونیا، ئینسانێکی بێ نرخ چارەنووسی گەلانی بەدەستە. . واتە: ڕەوشتی تیا نییە. . بابەتی ئایینی تیانیە بابەتی ڕەوشتی بەرز ئەدگاری

ئینسانی تیانیە وەك: راستگۆیی و دڵسۆزی بۆ مرۆڤایەتی، رەحم، بەزەیی، ئەم بەها ئیمانیانەی تیا نییە. دێت باسی گەل ئەكاو باسی سیاسەت ئەكاو ئابلۆقە ئەخاتە سەر میللەتێك. ئابلۆقە لائەبا لەسەرئەم. سنوور دائەنێ. وولات دابەش ئەكا، گەورەیە، كە دێیتە سەریان شیتەڵیان ئەكەیت كوڕی كێیە. دایكی كێیە، برۆ بزانە كێسنجەر كێ بووە ؟ كە وای لە كورد كرد ؟ كێسنجەر دایكی لە تیاترۆ "مەلها" ئیشی كردووە. لەگۆڤارێكدا خوێندومەتەوە لە مەلها وێسكی تێ كردووە بۆ خەڵك ، ئەمە كوڕی ئەوە ئەبێ چی لێچاوەڕێ بكەی ؟

دیمان بەچاومان ئەم فەرموودە هاتە دی، بەگردەوە رووەی بیضە لەزۆر شوێنا قسە ئەكات بەناوی میللەتەوە. بەناوی گەلەوە. بەناوی بەرژەوەندی گشتی یەوە قسەئەكات. خۆشی بەتاڵە لە هەموو بەهایەكی ئاسمانی، ئەم جۆرە فەرموودانە كە واقعیەتی تیایە بەفراوێ ئەكا بەدڵی ئیماندارا ئیمان زیاد دەكا وەكو لەدەرسەكانی پێشوو نموونەی ئیعجازێكی زانستیمان ئەهێنایەوە، مەرج نیە ئێمە هەموو جارێ لەسەر ئیعجازی زانستی بڕۆین، با خەڵكێ لە ئیعجاز تێناگات بێبەش نەبن لەبەفراوی ئەم چەمكی فەرموودانە.

كۆنگرەیەكی ئیسلامیی لە ١٩٩٣/٦/٣ لەمۆسكۆ گیرا بانگهێشتی ئەكادیمای زانستی ڕوسیشیان كرد. ئامادەبوون لەوێ "سبحان الله" پاش ئەوەی كە ئەم زانایانە لەهەر بوارێكدا باسی گەورەیی قورئانیان كرد. یەكێك لەو ڕوسانە بەناوی (فلادمیرەوە) جاڕی ئیسلامەتی خۆی ڕاگەیاند، ئەوەی تەرجەمەكەی ئەكرد لە عەرەبیەوە بۆ ڕوسی، كابرایەكی ڕوسە لە ڕادیۆی مۆسكۆ لەبەشی عەرەبی ئیش دەكات. ئەویش مووسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند. هەر لەو كۆنگرەیەدا باسی شتێكی تازەیان كرد كە دۆزراوەتەوە لە زانستی گەردووناسیدا.

ئەم زەویەی خۆمان دەسوڕێتەوە بەدەوری چەقی ئەم مەجەڕمیا دێتەوە شوێنی خۆی (٢٥٠) ملیۆن ساڵی پێ ئەچێ، خوای گەورە بە شێوازێکی سانا کە هەموو کەسێ تێی دەگات. . بەلآم پڕ لە مەعنا دەفەرموێ: (وکل فی فلك یسبحون) واتە: ئەم خۆرە. . ئەم مانگە. . ئەم هەسارانە. . هەمووی ئۆربتی خۆی هەیە. . هەمووی گرێژنەی "تەومرەی" خۆی هەیە، کۆمەڵێك موسڵمان چووبوون بۆ لای زانایەکی یابانی ناوی (ستیودا) بوو لێیان پرسی: چیاکان هەرئەوەن کە ئەبینرێ یاخود بە شێکی لە ژێر ئەرزدایە ؟ ووتی: بۆچی ئەم پرسیارە ئەکەی ؟ووتی: ئێمە زانای ئیسلامین و لە ئایینەکەماندا ئەم شتانە هەیە. . ووتی: ئێوە پیاوی ئاینن نابێ بچن بەلای زانستدا. . پیاوی ئاینی گرفت دروست ئەکا. .. ئیتر دەستی کرد بەم قسانە.

ئەو موسڵمانەی کەلەناو ئەو کۆمەڵەدا بوو ووتی باشە (ئەتلەسی) و (واشۆ) بەرامبەر یەك ئەم هەموو چەکەیان کۆکردۆتەوەو لە ژێرزەویدا شاردوویانەتەوە و لە بۆشاییدا دایانناوە ئەمە هەمووی هۆکارەکەی ئایینە ؟ ئیتر کابرا قسەی ئەما، ووتیان ئێمە تەنها ئەو پرسیارەت لێ دەکەین وەلآممان بدەرەوە ئایا چیاکان رەگیان هەیە ؟

وتی بەڵێ. ئیتر وێنەی پیشان دان. . فیلمی پیشان دان. . ئایا چیاکانی سەر ووشکانی بێ یان چیاکانی ناو دەریا بێ. . هەمووی ڕەگی هەیە تازە دۆزراوەتەوە. . ووتمان لەرێگەی تیشکەوە وێنەی شاخەکە ئەگیرێ. . تەماشا ئەکەی چەندی بەدەرەوەیە ئەوەندەشی لەناو زەویەکەدایە خوای گەورەش ئەفەرموێ:

(وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ۝٧ )[٤٥٢]

---

[٤٥٢] سورەتی النباء ئایەتی ٧

رەگمان بۆ داناوە. . سبحان الله !

(وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ ﴿١٥﴾)[٤٥٣]

کابرا سەری سوڕما کە قورئان باسی ئەمانە دەکات. . ! لێیان پرسی. . ئایا ڕۆڵی هەیە بۆ جێگیرکردنی توێژی سەرەوەی زەوی. . (قشری ئەرزی) ؟

وتی: نازانین ؟ بەڵام لەم دواییانەدا زانایەکی گەورە لە ئەمەریکا، سەرۆکی ئەکادیمای زانستی ئەمەریکی ناوی (فرانك پرێس) ە ئەم فرانك پرێسە زانایەکی زۆر گەورەی جیۆلۆجی و راوێژکاری (کارتەر) بوو بۆ کاروباری زانستی. . کتێبێکی نووسیووە بەناوی (زەوی ـ earth) لە لاپەڕە (٤٨٨)دا دەڵێ: هەموو شاخێ ڕەگی هەیە. . هەموو شاخێ لەناوەوە ڕەگێکی هەیە شاخێکی ڕاگرتووە، بۆ قووڵاییەکی زۆر چووەتە ژێر زەویەوە. . وێنەکەی دەرخستووە، لە لاپەڕە (٤٣٥) دا ئەڵێ: ئەرکی چیاکان ئەوەیە کە ڕووی زەوی ڕابگرن و نەیەڵن بترازێ. . قورئانیش ڕێك وائەفەرموێ .

ئیتر هەندێ کەس ئەم ئیعجازە زانستیە ئیمانی زیاد ئەکا، هەندێ کەس ئیعجازی پراکتیکی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر کە ڕۆژ بەڕۆژ دێتە دی ئەوە ئیمانی زیاد دەکات. .

لەفەرمودەیەکدا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ (أن بين يده ساعة تسليم الخاصة وفشهد تجاره حتى تعين المرءة زوجها على التجارة وقطع الأرحام وشهادة الزور وكتمان الشهادة الحق وظهور القلب) لەم فەرمودەدا ئەڵێ لە نزیك بوونەوەی قیامەتدا سەلام نامێنێ لە یەکێکی بکەی نەی ناسی. . تەنها سەلام لەیەکێ ئەکەی

---

[٤٥٣] سورەتی النحل ئایەتی ١٥

بیناسی. . ئەمەش نیشانەی نزیك بوونـەوەی قیامەتـە. . چونکە سـەلام پێویـستە بکەی لەیەکێ ئەیناسی، نای ناسی. . ئەمەش هاتۆتە دی " سبحان الله ".

شایەتی درۆ مەرج نیە بـە زمـان بـێ. . دێـت بەلگەنامەیـەکت بـۆ دروسـت دەکا. . درۆیە ! رەگەزنامەیەکت بۆ دروست ئەکا. . هی تۆ نیە . . بەدرۆ ناوت ئـەگۆرێ. . ئەمانە هەمووی هاتۆتە دی.

(وکتمان الشهادە الحق) داپۆشینی راستی (وبهورا القلم) قەڵەم زۆر ئەبێ رۆژنامە و گۆڤار زۆر ئەبن لە جیهاندا بەهەزارەها جۆر.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێ: (وتکون أیة خروجە) باسی دەجال دەکا. . پێش ئەوەی دەجال دەرچێ ئەم شتانە روونەدا (ترکهم الأمر بالمعروف والنهی عن المنکر) فەرمان بەچاکەو نەهی لـە خراپـە هێمـای ئێمەیـە، ئایینەکـەمان واقیعیـە وەکو ئـاو و هـەوا وابـێ وایـە. . فـەرمان بەچـاکە و نـەهی لـە خراپـە کـە وازی لێ بهێنین ئیتر ژیارمان نامێنێ. . شارستانیەتەکەمان هەڵدەوەشێتەوە. . ئایینەکەمان ئەروا (کنتم خیر أمة أخرجت للناس) خوای گەورە کە بە ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەتایبەتی ئەوەی یەکەم باشترین و بەخێرترین ئوممەت بوون دەرکەوتن لەسەر زەویدا. . لە مێژوودا بۆچی؟ چونکە

تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴿١١٠﴾ )[٤٥٤]

پێش خستووە، تؤمنون بالله دواخستووە. . چونکە چەندین ئوممـەتی تـر ئیمـانی بەخوا هێناوە. . هێشتا لە خێردا نەگەیشتۆتە ئاستی ئێوە لەبـەر ئـەوەی فـەرمان ئەکەن بەچاکەو نەهی ئەکەن لە خراپـە، کـەوازتان لـەوە هێنـا ئـیتر ئەفـەوتێن. . پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئەفـەرموێ: (اتـأمرون بـالمعروف وتنهـون عـن المنکـر أو

---

[٤٥٤] سورەتی ال عمران ئایەتی ١١٠

ليوشكن الله أن يصلق عليكم شراركم فيدعوا خياركم ولا يستجاب لكم) فەرمان نەكەن بەچاكە و نەهی نەكەن لە خراپە یان خوای گەورە ناكەس بەچە ئەكا بەسەرۆكتان. . ئینسانی خراپ ئەكا بە خاوەن دەسەلآت بەسەرتانا (فلیدعوا خیاركم ولا یستجاب لكم) پیاوچاكان دەست هەڵدەبڕن خوا دوعایان قەبوڵ ناكا. . ئەوە تێكەڵ مەكەن كە لە پێشەوە باسمان كرد. .

ئێمە لە جیهانێكین چوارجیهان دەورەی داوین. . جیهانێكیان پێی دەوترێ فیكر. . چوونە ناو ئەم جیهانە. . هۆكاری خۆی هەیە. . میتۆدی خۆی هەیە. . ئەچیتە ناوی بۆ دۆزینەوەی حەق.

لەم لاوە جیهانێكی ترمان هەیە جیهانی سروشتی پێ ئەڵێن. . بیر لە پەپولەیەك ئەكەیتەوە. . لە تاڤگەیەكەوە. . لە ئاسكێكەوە . . لە سەوزاییەك بیر دەكەیتەوە. . ئەمانە بۆ ئەوەی بەهای جوانی هەست پێ بكەی. . هەست بە جوانی بكەی كە پێویستە بۆ دەروونی خۆت بۆ سۆزی خۆت.

جیهانی سێیەمیان جیهانی كەسەكانە پەیوەندی تۆ لەگەڵ تەلەبە. . لەگەڵ دراوسێ. . یا لەگەڵ هاورێیەكدا. . لەگەڵ مامۆستادا. . لەگەڵ دوكانداردا، سواری پاسێكی پۆڵۆنی بیت پەیوەندی تۆ بەوەوە دینارێكە. . ئەیدەیتێ و ئیتر گفتوگۆی فیكری لەگەڵ ناكەیت. . لەبیر و فیكری خۆت دانابەزی. . لەوكاتەدا ئەدەبێكی عام هەیە پارێزگاری بكەیت و تەواو .

جیهانی چوارەم جیهانی مادەیە. . ئەو مادەیەی كە مۆركی بلیمەتی ئینسانی پێوەیە. . عەقڵی و دەستی بەشداری كردووە تا تەلەفۆنێكی بۆ دروست كردویت. . بزانە بۆچی بەكاری ئەهێنی ؟

**ئێمە موسڵمانین ئیمانمان بە کەرامەت هەیە بە کەرامەتی ئەولیاو ئیمانمان هەیە بە (کن فیکون) ی خوای گەورە. . بەلاّم تێکەڵی مەکە لەگەڵ ژیانی کۆمەلاّیەتی (کن فیکون) ی خوای گەورە نایەتە ژیانی کۆمەلاّیەتیەوە.**

**خوا خۆی دەفەرموێ:**

(إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴿١١﴾)[455]

**(کن فیکون) نییە لە ژیانی کۆمەلاّیەتیدا، بەلاّم ئەولیایەك دوعایەك دەکا خوای گەورە وەلاّمی دوعاکەی دەداتەوە، لە زیندان ئازاد دەبێ. زاڵمەکە ئەفەوتێنێ. . ئەمانە هەمووی دەبن. . یەعنی دەکرێ ببن.**

**چەندان فەرمووودەمان دیووە کەراماتی تیایە کابرا لەگەڵ کۆمەڵێکدا چوونەتە ژووری سێدارەوە. . سەیر ئەکەی ئیعدام نەکراوە. . ئەمە تێکەڵ مەکە لەگەڵ ژیانێکی سیاسیدا. . ژیانێکی کۆمەلاّیەتیدا. .ئەگەر فلاّنەحزب هاتەسەر حوکم گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو ئەخۆنەوە. . یان فلاّنەکەس ئەگەر حوکممان بکات تاوانی نیە، پێشەوا عەلی بێنە بە (٢٤) سەعات ئەم میللەتە چاك نابێ. ..**

**ئەخۆشی چۆن چاك ئەبێ !**

**ئەم هەموو خوو رەوشتە ناشرینە چۆن بە (٢٤) سەعات چاك ئەبێ؟**

**ئەبێ پرۆگرامی بۆ دابنێت. . کتێبی بۆ بنووسی. . ئەم منالّە لە خوێندنگا ئەو شتە پوچەڵەی وەرگرتووە بگۆررێ بۆ شتێکی چاکتر. . میتۆد و بەرنامەی ئەوێ. . (کن فیکون) ی کەرامەتەکە تێکەڵ مەکە لەگەڵ ئەم حاڵەتی جیهانی کەسەکاندا..**

---

[455] **سورەتی الرعد ئایەتی ١١**

لە فەرموودەکەدا (وتهاون بالدماء) وای لێ دێ خوێنی مرۆڤ بەهای نامێنێ کوشتار زۆر ئەبێ، لە فەرموودەیەکی تردا باسی هەرەج دەکا هەرەج یەعنی کوشتن. . کوشتن زۆر ئەبێ. . بەشەر نرخی نامێنێ. . کوشتنەکەی ئاسان ئەبێ (وإذا ضیع الحکم) کە موسڵمانان حوکم وون ئەکەن لە دەستورا بابەتی ئیسلامی نامێنێتەوە. . لێی دائەبەزن. . ئاوا ڕووی بیضیە دێت و باسی مافی ئافرەت دەکا بە هەوەسی خۆی، وازلێهێنانی موسڵمان بۆ ئەمر بەچاکەو نەهی لە خراپە، موسڵمانێك کە (ربا) ئەخواو (سەلەم) ئەخوا ئەوە توشی ئەوحاڵەتە ئەبێ. . نیشانەی نزیك بوونەوەی قیامەتە (وشید البناء وشرب الخمور) ئیتر ئیهتمام ئەدەن بە بیناو بینا بەرزئەکەنەوە، خواردنەوە ئەبێتە حاڵەتێکی عام (وتخذوا القنات) گۆرانی بێژ پەیدا ئەبێ. . ئیتر پیاو ئاوریشم لەبەر ئەکا، (إظهروا بنت آل فرعون) مۆدێلاتی جلی والەبەر ئەکەن هەمووی فەخفەخەی تیایە. . هەژار لەژیانیدا بۆی ناکرێ. . (ونقض العهد وتفقه بغیر الدین الله) ئیتر پەیمان و بەڵێنیان نامێنێ. ..

پاشان ئیتر حاڵەتێك دروست ئەبێ دوور لە ئیسلام. . ئەمەش دیومانە بە چاوی خۆمان. .

ناوی (٥٠) ئەکتەر ئەزانێ. .!

ناوی (٥٠) گۆرانی بێژ ئەزانێ. .!

ناوی (٥٠) حاجی نازانێ. .!

ناوی (٥) زانای موسڵمان نازانێ !

ئەمەیە (وتفقه بغیر الدین الله)، ( وزین المساجد وخرب القلوب ) مزگەوت ئەڕازێننەوە بە بۆیاخ و ئەمانە نایڕازێننەوە بە مرۆڤی نوێژخوێن. . بە عیبادەتەکە. . لەئاستی حکومەتدا دێت بینایەك ئەکات. . بەڵام زەلامی خراپی بۆ

دائەنێ. . یان میتۆدێکی بۆ دانانێ خەڵکەکە فێری دینەکە ببێ. دەورە ناکاتەوە بۆ فێربوونی قورئان. . لە شوێنێکی تردا خوێندومەتەوە ئەڵێ وای لێ دێ لە مزگەوتەکاندا (ترفع فیها ألأصوات) دەنگ بەرزی پەیدا ئەبێ. . لە مزگەوتدا برۆ بزانە ئێستا لە زۆر وولاتا بڵندگۆکە نوێژەکە دەگوێزێتەوە. . تۆ تەلەبەی لە ماڵەوە دانیشتووی ئەتەوێ سەعی بکەی، ئەو ئەڵێ (سمع الله لمن حمده) بۆ ئەوەی نیگەرانت بکات. . بۆ ئەوەی رقت بێت لە دینەکەت. . بە بڵندگۆ چۆن نوێژ بەرز ئەکرێتەوە. . لە زۆر شوێن ئێستا ناوەهایە (وخرب القلوب) بە پرۆگرامی مەکتەب بە تەلەفزیۆن بە راگەیاندن. .. هتد. ئەو پاکیەتیە زگماکە ئەکوژن لە منداڵدا. . لە سوید منداڵی سەرەتایی وانەیەکیان هەیە بەڕووت و قوتی ئەبێ لەگەڵ یەك دانیشن کوڕو کچ، فێری وێنە ئەبن با جلەکانیان پیس نەبێ بە ڕووت و قووتی، ئەوەیە فەساد (وتشبه الرجال بالنساء والنساء بالرجال) ئیتر ژن لاسایی پیاو ئەکاتەوە، پیاو لاسایی ژن ئەکاتەوە، (فتکاف رجل بالرجال ونساء بالنساء) بابەتی سێکسیش ئەکەوێتە نێوانەوە، پیاو لەپیاو خۆی تێرئەکا و ژنیش لە ژن. . ئەمەش لە ئەوروپا هەیەو هاتۆتە دی و ئەم حاڵەتانە ڕوو ئەدا.

## باسی چل‌و هه‌شت
## قورئانی پیرۆز و زیکر کردن

قورئانی پیرۆز له (قرأ) وه هاتووه. . قرأ یه‌عنی خوێندنه‌وه. . خوای گه‌وره به‌رنامه‌یه‌کی بۆ ناردوین خۆمانی تێدا بخوێنینه‌وه. . خه‌ڵك بخوێنینه‌وه. . خه‌ون بخوێنینه‌وه. . دوا ڕۆژمان بخوێنینه‌وه. . مافی خه‌ڵك:

(يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ ﴿٩﴾)[٤٥٦]

هیدایه‌تی به‌شه‌ریه‌ت ئه‌دا، نه‌ك هه‌ر کۆمه‌ڵێك. . نه‌ك هه‌رگه‌لێك:

(إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٤﴾)[٤٥٧]

(وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٧﴾)[٤٥٨]

بۆ هه‌موو جیهان. . بۆ هه‌موو گه‌لان. . ئینجا خوێندنه‌وه‌ی فیکر خوێندنه‌وه‌ی بونیاده. . حیساب

---

[٤٥٦] سوره‌تی الاسراء ئایه‌تی ٩

[٤٥٧] سوره‌تی یوسف ئایه‌تی ١٠٤

[٤٥٨] سوره‌تی الانبیاء ئایه‌تی ١٠٧

کردنە بۆ بەرامبەر. . ئەو کەسەی کە ئەچێ بۆ حەج خوای گەورە لە گوناهی خۆش ئەبێ. . ئەو کەسەی کە شەهید ئەبێ خوای گەورە لە گوناهی خۆش ئەبێ. . تەنها قەرزار نەبێ !

پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر من چوم بەرگری لە ئایین بکەم و کوژرام ئەچمە بەهەشت ؟ خوا لەگوناهم خۆش ئەبێ ؟

ووتی: بەڵێ. . چەند هەنگاوێ ڕۆیشت وبانگی کردەوە. . ووتی: چیت ووت پرسیارەکەی دوبارە کردەوە فەرمووی بەڵێ (إلا دین) لە هەموو گوناهێ خۆش دەبێ تەنها قەرزاری نەبێ.

قەرزاری هەر ئەوە نیە پارەت لەیەکێ سەندبێ نەت دابێتەوە . . هەموو جۆرە مافێ ئەگرێتەوە یان هەندێ کەس هەن ئەڵێن: کەسانی وا هەن زوڵمی وایان کردووە دەچن بۆ حەج و دێنەوە. . خوا لە گوناهیان خۆش ئەبێ. . بابەتەکە ئاوەها نییە بەو سادەییە نییە . . یەکێك بازرگانی دەکا لە مادەبێهۆشکەرەکاندا. . یەکێك گزی "غش" ئەکا لە دەرماندا . . دەرمان نیە کە کەپسولەکەی دەکرێ شەکری تێ دەکا. . بە دەرمان دەیفرۆشێ یان لە هەندێ ڕەنگ دەگرێتەوە، ئەوە چۆن خوا لە گوناهی خۆش ئەبێ !؟

مافی خەڵکی لەلایە. . ئەمە ئەبێ خۆی پاك بکاتەوە. . تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکات. . بزانن هەموو گوناهێ ئیمان بریندار ئەکات. . تێبینی ئەم ئایەتە بکەن (إلا من تاب وآمن) مەعنای ئیمانەکەی بریندار بووە کە تەوبە ئەکا ئەبێ ئیمانەکەی تازەبکاتەوە. . ئەوە مەسەلەیەکی قەلبی یە.

چەند جارێ باسمان کردووە: سێ پلە هەیە جیای بکەنەوە:

یەکەم: (إجراە) بەحواس چاوت ئەبینێ. . گوێت شت ئەبیستێ. . بەزمان تامی شت ئەکەی . . بۆنی شت ئەکەی. . بەم ئامێرانەی کە خوای گەورە داوێتی پێمان پێی دەوترێ وەسائیلی (إجراە) ئەمانە کاریگەری دروست ئەکەن لە نەفسدا. . ئەو کاریگەریەی ناو نەفس. . یان ئەعجابە یان خۆشەویستی یە یان "بوغضە" ئیتر ئەبێ شتێ دروست بکا لە نەفسدا. . ئەمە پێی دەوترێ (ویژدان) واتە: نەفسەکە شتێ ئەدۆزێتەوە بە هۆی ئەم ئامێرانەوە، قۆناغی سێ یەم دروست ئەبێ کە پێی دەوترێ (نذور) چونکە کەسەکە هەوڵ ئەدات بۆ جووڵەیێ. . بەرامبەر بەو ویژدانە کە دروست بووە بۆ نموونە: گوڵێك ئەبینی چاوت وێنە جوانەکەی ئەگوێزێتەوە. . لوتت ئەو بۆنە خۆشەی ئەگوێزێتەوە. .

لەناو دڵتا چی دروست دەبێ ؟

ئیعجابێ دروست ئەبێ بەرامبەر بەو گوڵە. .

جووڵەیێ ئەکەی بەرەو گوڵەکە لێی بیکەیتەوە.

شەریعەت پەیوەندی بەو قۆناغەوە هەیە. . حەڵاڵ و حەرام. . بۆ ئەو قۆناغە هاتووە . . مافی خەڵك پێت دەڵێ ئەکەی ئەمە باخچەی فلانە کەسە بۆت نیە ئەو گوڵە لێبکەیتەوە، هەر بەو شێوەیە بۆ هەموو شتێ تر. . ئەم سێ قۆناغە هەیە.

تەوبەکە قۆناغی ویژدانەکەیە ئەبێ خۆت پاك بکەیتەوە. . ناوت لە تۆماردا نوسراوە لای خوای گەورە. . تیایدا نوسراوە ئەتناسێ. . تۆی خۆش ئەوێ. . پێش ئەوەی دروستت بکات. . بگەڕێرەوە بۆ لای ئەو. . بە دڵی شکاوەوە، بڵێ: خوایە گیان تەوبەم کردووە بۆم چاك بکەرەوە.

مەسئەلەی (ذکرة) شەریف ترین (ذکر) قورئانە، قورئانی پیرۆز وامان لێ ئەکا کە پەیوەندی خۆمان و نەفسی خۆمان ڕێك بخەین، خۆمان و خەڵکی خۆمان،

خوای گەورە و خۆمان. . گەردوون و خۆمان. ... ئەو خوایەی کە بەرنامەی بۆ هەمووشتیٚ داناوە:

(إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾)[٤٥٩]

ئێمە لە خانەیەکەوە هاتووین، خانەیەکی رەگەزی دایکمان وە خانەیەکی رەگەزی باوکمان. . بووینەتە ئەم ئادەمیزادە. . بەبەرنامەیەك صیفاتی باوکمان و صیفاتی دایکمان نیووە بە نیووە کۆبۆتەوە ناو خانەیەك. . ئینجا شێوەی زیادبوون بە پرۆگرامێکی دیاریکراو بووینەتە (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠)خانە واتە: ژمارە یەکێك و (١٣)سفری لاوەیە.

ئەو خانەی یەکەمە کە هاتووە چەند زانیاری پیٚ یە ؟

شریتێکە هەموو جۆرە خەسڵەتێکی دیار و پەنهانی ئەو دایك و باوکە لەناو ئەو شریتایە (٣٠٠٠) ملیۆن زانیاری تیایە بەچاویش نابینریٚ !

بەڵکو هەموو مرۆڤایەتی کۆبکەرەوە لە موستیلەیەکی دروومانا جێگەی ئەبێتەوە. . یەکێك لەو زکرانەی باسمان کرد قورئان زکرە کتێبەکانی پێشوو زکرە بیرخستنەوەش زکرە ئەم زکرەش سوودی هەیە. . خوای گەورە ئەفەرمویٚ:

( تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٥﴾ )[٤٦٠]

لەو زکرانە خوای گەورە بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەفەرمویٚ:

(ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ )[٤٦١]

---

[٤٥٩] سورەتی القمر ئایەتی ٤٩

[٤٦٠] سورەتی الذاریات ئایەتی ٥٥

[٤٦١] سورەتی مریم ئایەتی ٢

ئەی موحەممەد باسی زەکەریات بۆ ئەکەین. . چۆن ڕەحممان پێ کردووە !
جارێ لەسەر وشەی ڕەحمەت بووەستین: ئینسانێك کە ڕەحم بە ئینسانێك ئەکات کە (ئەجەلیاتی) ئەم ئینسانە دەگوێزرێتەوە بۆ ئینسانە ڕەحم پێکراوەکە بەمەرجێ لەبەرژەوەندی ئەو ئینسانە ڕەحم پێکراوبێ ئەگینا لەبەرژومندیەکەی بدات پێی ناوترێ ڕەحم ئەوە مەرجە ئەبێ ڕەحم لەبەرژەوەندی ئەو کەسەدا بێ.
ئینجا ئەبێ ڕەحمەتی خوای گەورە چۆن بێ بۆ ئینسان ؟!
ئەبێ ڕەحمەتی خوای گەورە چۆن بێ بۆ پێغەمبەرێك وەك زەکەریا، وشەی بەندە بەکارهاتووە لێرەدا (عبده زکریا) بەندایەتی زۆر شتێکی ناشرینە لە نێوان ئینسان بۆ ئینسان. . دیمان کە ئینسان دەیەوێ ئینسانێکی تر بکاتە کۆیلەی خۆی بیکاتە بەندەی خۆی . . بزانن چ کارەساتێك دروست بووە لە مێژوودا، بزانە داگیرکەری پورتوگال چی کردووە لە دونیا ؟ چۆن عەزیەتی ئینگلیسیای داوە. . بە تفەنگ و بەچەکی تازەی ئەو سەردەمە ئەکەوتنە ناو ئەفریقیەکانەوە. . بەسەدانیان لێ ئەگرتن. . بە زنجیر ئەیانبەستنەوە بە پاپۆڕ ئەیانبردن بۆ وولاتی خۆیان و ئیشیان پێ ئەکردن. . چەندجار لەو پاپۆڕەدا خۆیان خۆیان کوشتووە، هەموو پەنجا شەست کەسێك بە زنجیرەوە بەستراون ژن و پیاو و منداڵ، بیربکەرەوە تۆ یەکێکی لەوان چەند هەفتەیەك ئەمێنیتەوە لە شوێنی خۆتدا خواردنت بۆ ئەهێنن. . خۆت پیس ئەکەی لە هەمان شوێندا، کابرا لێرە دانیشتووە ژنەکەی لەوبەرەوە لە نێوان دوو پیاوی تردا ئەو پیاوە کە خەوی لێ ئەکەوێ سەرئەخاتە سەر ڕانی ژنی ئەم. . ئەوی تریش سەرئەخاتە سەر سنگی ژنەکەی، ئەمە چ حاڵەتێکی ناخۆش بوو ؟ چەند جار خەڵکەکە ڕاپەڕیوون خۆیان خستۆتە دەریاکەوە لەداخی پرتوگالیەکان.

ئینگلیز لەوان کەمتری نەکردووە (٥٠) ملیۆن کەس لەهەردوو جەنگی جیهانیدا فەوتا، ئێستا باسی مافی مرۆڤم بۆ ئەکەن. . مافی مرۆڤ !!

کوان موسڵمانەکانی ئیسپانیا. .؟

کوان دانیشتووە ڕەسەنەکانی ئەمەریکا. . هیندیە سورەکان ؟

ئەو وەختەی کە ئەو کیشوەرە دۆزراوەتەوە (٥) ملیۆن بوون کوان ؟

دانیشتوانی بەڕازیل کوان ؟

دانیشتوانە رەسەنەکانی ئوستوڕالیاو نیوزلەندا کوان؟

هەموو ئەمانە لەناوچوون.

ئەو کەسانەی کە ئەو خەڵکانەیان لەناو برد وویستیان بیان کەن بە بەندەی خۆیان ناڕازی بوون. . ئێستا ئەوانە باسی مافی مرۆڤ دەکەن !!

کە بەندایەتی ئەکەوێتە نێوان مرۆڤ و پەروەردگار، شتت دەست ئەکەوێ لە پەروەردگار بەڵام کە ئەبیتە بەندەی مرۆڤێك شتت لێ ئەسەنێ. . ڕێزو شەرەفە بەندایەتی بۆ خوای گەورە. . بەڵام زەلیلیە لەگەڵ ئینساندا

(إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ﴿٣﴾ )[٤٦٢]

بانگ کردن چەمکێکە لەنێوان مرۆڤ و مرۆڤدا. . بەڵام لەنێوان مرۆڤ و خوای گەورەدا بانگ کردن نیە. .

چونکە خوای گەورە

(وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ )[٤٦٣]

---

[٤٦٢] سورەتی مریم ئایەتی ٢

[٤٦٣] سورەتی ق ئایەتی ١٦

**بانگەوازی ئینسان بۆ خوای گەورە بریتیە لە پاڕانەوە بریتیە لە نزا و گازەو موناجات و دوعا و لالآنەوە و کرووزانەوە**

(قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّي وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا ﴿٤﴾ )[٤٦٤]

**ئەپاڕێتەوەو ئەڵێ: خوایە گیان سەرم سپی بوو (وهن العظم منی) یەکەم جار باسی ئێسقان ئەکا. . بەهێزترین پارچەبەش لە لەشی ئینساندا ئێسقانە، ئێسقانم پووکایەوە لاواز بوو. . ئەی خوای گەورە سەریشم سپی بوو. . ئەمە بارودۆخی منە (وکانت إمرأتی عاقراً) خێزانەکەشم نەزۆکە منالّی نیە، بەلآم کە داوای منالّ ئەکا. . لەبەر نەفسی خۆی نیە. . ئەمە پێغەمبەرێکە، لە قورئاندا وشەی (مخلص) مان هەیە، تەنها پێغەمبەرەکان دڵسۆزن . . دڵسۆز ئەو کەسەیە کە خۆی پالآوتە دەکات بۆ بەرنامەی خوای گەورە، هەموو غەریزە و ئارەزوویەك خوای گەورە داویەتی بە ئینسان سنوورێکی شەرعی هەیە. . ئەبێ بیپالێوی. . لەو سنوورە شەرعیە تێنەپەڕێ ئەگەر پالآوتت نەبێتە (مخلص)، پێغەمبەران خوا پاکی کردوونەتەوە ئەمانە دڵسۆزن. . ئینجا ئەمە بانگەوازێکی شەرعیە، نێوان پێغەمبەرێکی دڵسۆز کە حەزرەتی زەکەریایە لەگەڵ خوای گەورە، ئەمە حالّی خۆی و خێزانەکەیەتی**

---

[٤٦٤] **سورەتی مریم ئایەتی ٤**

(وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾)[٤٦٥]

ئەترسم ئەم ئايينە وون ببێ ئەوانەی دوای مـن دێـن لـە عەشـرەت و کـەس و کـار ئەوانیش شوێن من کەوتوون لاوازن. . ئەمین نین خوای گەورە

(يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴿٦﴾)[٤٦٦]

میراتیەکـەم وەرگـرێ میراتـی پێغەمبەرایـەتی نـەك میراتـی پـارە، پێغەمبـەرەکان میراتـی بـەجێ نـاهێڵن پێغەمبـەرخوا (صلی الله علیـه وسـلم) ئەفـەرموێ (نحـن معاشر الأنبياء لا نورا) میراتی بەجێ ناهێڵن نیانە ئەمە میراتی پێغەمبەرایەتیە. . ئەیـەوێ بیداتـە دەسـت یـەکێکی ئـەمین وەك خـۆی وەری گرتـووە لـە یـەعقوب (علیه السلام) (یرثنـی ویـرث مـن آل یعقـوب واجعلـه رب رضـیا) وای لێ بکـا خـوا ڕازی بێ.

جیهانی هۆکار خوای گەورە دروستی کردووە، دروستکراوانی خستووەتە نـاوی. . بەڵام لـە هـەمان کاتـدا دوو شـت تێکـەڵ مەکـە. . هـەموو پـشتبەستنێکت بـا تـەنها لەسەر بنەمای هۆکار نـەبێت. . ئـەبێ بزانـی هۆکـار شـتێکەو پـەروەردگار شـتێکی ترە. . تەوەکولی ڕاستەقینە ئەوەیە کە پشتت بـە خـوای گـەورە بەسـتبێ. . بـەڵام بڵێی خوایە ئەزانم ئەمە هۆکارە سوود و زیانی تیانیە. . بـەس فـەرمانێکی تۆیـە. . بۆیـە جێبـەجێی ئەکـەم. . نـەخۆش ئەکـەوێ دەرمـان ئـەخوێ. . بـەس شـیفا لەدەرمانەکەدا نیە شیفا لەلای خـوای گـەورەیـە. . چـەندان کـەس دەرمـانی چـاکی

---

[٤٦٥] سورەتی مریم ئایەتی ٥

[٤٦٦] سورەتی مریم ئایەتی ٦

خواردووه چاك نەبۆتـەوه. . ئـیرادەی خـوای لەسـەر نـەبووه. . ئەمـە دەرسـێكمان پێدەدات. . كە خـوای گـەوره هێزێكـی رەهـای هەیـە بەسـەر جیهـانی هۆكاریـشدا چونكە خۆی جیهانی هۆكاریشی دروست كـردووه. . بەرامبـەر بـەو تەوەكولـە بـەو پاڕانەوەیـە ئـەڵێ (ولم أكـن بـدعائك رب شـقیا) وای فێـر كـردوم خـوای گـەوره هەرچیەكم داوا كردبێ جێ بەجێی كـردووه بـۆم. . ئـەم جـارەش وەك جارەكـانی تر بێ خوایە وا داوای شتێ ئەكەم كە گوێرایەڵیە كە بریتی یە لە سپاردنی ئـایین. . یەكسەر خوای گەوره دوعاكەی قبوڵ كرد

(يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ ﴿٧﴾)[٤٦٧]

هەموو ئینسانێ كە لـە دایـك ئـەبێ كەسـێك نـاوی لێدەنێت. . بـەڵام ئـەم خـوای گەوره ناوی (یەحیا)ی لێنا بۆ ئەوەی مژدەبێ بۆ بـاوكی كە بەشـەهیدی ئـەڕوا . . لێكی ئەدەیتەوه ڕەحمەتێكی سەیری تیایە !

بیرلە ڕەحمەتێكی تر بكەرەوه. . ئەو ڕەحمەتەی باری بەسەر حەزرەتی نوحدا. . (٩٥٠) ساڵ بەگەلەكەی ئەوت لافاو هەڵدەسێ (٩٥٠) ساڵ تاوای لێهات ئـەو میللەتـە سەیری ئەو پیاوەیان نەئەكرد. !

قورئان دەفەرموێ

(وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ ﴿٧﴾ )[٤٦٨]

جلەكانیان ئەخستە سەرسەریان بۆ ئەوەی نەیبینن - مانایەكی تـری هەیـە بـەڵام جوان نیە لێرەدا باسی بكەین:

---

[٤٦٧] سورەتی مریم ئایەتی ٧

[٤٦٨] سورەتی نوح ئایەتی ٧








(جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ ۝٧ )[٤٦٩]

**پەنجەیان ئەخستە گوێیان بۆ ئەوەی گوێیان لێینەبێت.**

**لەو سەردەمەدا کە کەسێك ئەکەوتە کاتی گیانەلاّ بە نەوەکانی خۆی ئەوت: ئەم نوحە ئەی ووت لافاو هەڵدەسێ. ئەوە من تەمەنم ٣٠٠-٤٠٠ساڵێکە ئەلافاو هەستاو ئەهیچ، بە قوربانتان بم شوێنی ئەکەون. بۆ هەر نەوەیەك ئاوەها بوو. ئامۆژگاری دوای نەوەی خۆیان دەکرد. بۆیە تائەهات زیاتر دژایەتی ئەو پێغەمبەرە نازدارەیان ئەکرد، خوای گەورە ڕزگاری کرد لەو گەلە. پاش ئەوەی کە دوعاکەی کرد (٩٥٠) ساڵ نائومێد نەبوو لە گەلەکەی بەلاّم کە بۆی دەرکەوت. ئیتر ڕێژەی هاتنە ناو ئاینەوە بوو بە سفر (لم یلد إلا تافهە) نائومێدی پەیدا بوو. هیچ گەنجێك و هیچ لاوێك نەئەهاتە ناو دینەکەوە، باوەڕی بەنوح نەهێنا، ئینجا دوعای کرد، خوای گەورە دوعاکەی قبولکرد. بیرکەرەوە زەوی هەمووی بووبوو بە ئاو**

(وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا ۝١٢ )[٤٧٠]

**زەوی دیارنەما:**

(فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ ۝١١ )[٤٧١]

**ئاسمان هەموو دەرگاکانی کرانەوە بەباران.**

---

[٤٦٩] سورەتی نوح ئایەتی ٧

[٤٧٠] سورەتی القمر ئایەتی ١٢

[٤٧١] سورەتی القمر ئایەتی ١١

ئەبێ حەزرەتی نوح لەو کاتەدا لە کوێدا بێ چواردەوری هەموو ئاوە. . ژێرەوە ئاوە. . سەرەوە ئاوە:

(وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ ﴿٤٢﴾)[٤٧٢]

فی موج. . قورئان زۆر وورده. . نالێ ئەم کەشتی یە بەسەر شەپۆلەکانەوە ئەڕۆی وشەپۆلەکانیش وەك چیا وەك شاخەکان بەرز بوون، نەخێر ئەڵێ لەناویا ئەی بۆ نگرۆ نەبوو ؟

بەهەموو یاسایەکی فیزیا ئەبوایە نگرۆ بوایە بەلآم نەخێر.!

خوای گەورە ئەفەرموێ:

(تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا ﴿١٤﴾)[٤٧٣]

لەژێر چاودێری ئێمەدایە !!

لەژێردەستەلآتی ئێمەدایە. . نگرۆ نابێ ئەمە موعجیزەی حەزرەتی نوحە!

لەو کاتەدا ڕۆحی ئەم پێغەمبەرە نازدارە پەیوەستە بە ڕەزامەندی خوای گەورەوە. . فکرو هۆش و هەموو کیانی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە تەواف ئەکا بەدەوری ج کابەیەکا . . کابەی ڕەزامەندی خوایی. . ئەوە میعراجی ئەو پێغەمبەرەیە، هێندەی بەسە کەخوای گەورە خستیە ریزی (أولوا العزم من الرسل) لەناو دەیان هەزار پێغەمبەردا پێنجی هەڵبژارد یەکێکیان نوحە (٤٣) جار ناوی لە قورئانی پیرۆزدا تۆمارکراوە.

---

[٤٧٢] سورەتی هود ئایەتی ٤٢

[٤٧٣] سورەتی القمر ئایەتی ١٤

بێینە سەر باسی حەزرەتی ئیبراهیم "سەلامی خوای لەسەر"بزانین میعراجی ڕۆحی ئەو چۆن بووە ؟

بزانین ڕەحمەت و نیعمەتی خوای گەورە چۆن باریوە بەسەریدا ؟

هەموو ژیانی ئیبراهیم نارەحەتی بوو. . بە گەنجیەتی خوای گەورە تاقیکردنەوەیەکی کرد کە بریتی بوو لە ئاگر. . ئەویانی بەناو تاقی کردەوە ئەمیان بە ئاگر. . خرایە ناو مەنجەنیقێکەوە هەڵیاندا بۆ ناو ئاگرێك.

بیر بکەرەوە لەو کاتەدا ڕۆحی حەزرەتی ئیبراهیم لە کوێدایە ؟

لە ئاسمانێکەوە بۆ خوارەوە شیوێکە هەمووی دارە هەمووی ئاگرە بڵێسەی بەرزبۆتەوە. . خوای گەورە فریشتەکانی ناردەلای ئەی ئیبراهیم چی ئەفەرموی ؟

وتی: (علمه بحالي يغني عن سألي) ئەو ئەزانێ من حاڵم چۆنە ئیتر ئەوە بەسە.

داوای لەو فریشتانە نەکرد شتێکی بۆ بکەن، خوای گەورە بزانە چی کرد، بزانە چ حیکمەتێ لەم چیرۆکەدا هەیە ؟ ئەو چیرۆکەی کەلە ئایینەکانی پێش ئیسلامیشدا نوسراوە. . ئەتوانێ خوای گەورە وابکات ئەوان ئیبراهیمیان بۆ نەگیرێ. . بەڵام وای نەکرد. . ئایا خوای گەورە نەیئەتوانی نەیەڵێت ئەو خەڵکە دارببڕنەوەو ئەو شیوە پڕکەن لەدار ؟! ئایا خوای گەورە نەیئەتوانی کەبوو بەئاگر بارانێ ببارێنێ بیکوژێنێتەوە ؟!

ئەمانەی نەکرد با ئەم خەڵکە کافرانە هەمووی شوێن جیهانی هۆکار بکەون ئەگینادوایی ئەیان ووت ئاخ بۆمان نەگیرا. . بمانگرتایە وامان لێ ئەکرد، ئەگەر بارانەکە بباریایە ئەیان ووت ئاخ! ئەگەر بارانەکە نەبوایە خۆمان ئەمانزانی چۆن ئەیسوتێنین خوای گەورە ئەفەرموێ نەخێر ئەم هۆکارانە بەکاربهێنە بەئارەزووی خۆت.

**هەڵیاندایە ناوەڕاستی ئاگرەکەوە. . پرۆگرامی ئاگر وایە کە سوتێنەربێ خوای گەورە فەرمانی کرد لەیاسای خۆی دەرچێ**

(قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ )[٤٧٤]

**دوای حەوت ڕۆژ بە بەرچاویانەوە هاتەدەرێ !**

**ڕیوایەتێ هەیە ئەڵێ: لێیان پرسی ئەی پێغەمبەری خوا ئەرێ تۆ لەژیانتدا پشووتداوە و ماندوویەتیت دەرچووە ؟**

- **لە ژیانما حەوت ڕۆژ پشووم داوە و ئیسراحەتم کردووە. .**
- **کەی بووە ئەوە ؟**
- **ئەو حەوت ڕۆژەی ناو ئاگر خۆشترین حەوت ڕۆژی ژیانم بوو.**

**ئەوەیە هێزی ڕەهای خوای گەورە جیهانی هۆکار دەسەلاتی خوا ناگرێتەوە.**

**خەو بە نیسبەت مرۆڤەوە حوکمی لەسەر دروست نابێ (أحكام) لەسەرخەو دروست نابێ. . تەنها خەوی پێغەمبەران نەبێ. . چونکە وەحیە.**

**هات بە کوڕەکەی خۆی ووت:**

(إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلْمَنَامِ أَنِّيٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ ﴿١٠٢﴾)[٤٧٥]

**کوڕی خۆم لە خەوا پێم ووتراوە ئەبێ سەرت بڕم جا بیربکەرەوە بزانە چی ئەکەی:**

(قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ)[٤٧٦]

**باوکە گیان چی خوا ئەمرت پێ ئەکا جێبەجێی بکە پشت بەخوا من خۆگرم،**

---

[٤٧٤] **سورەتی الانبیاء ئایەتی ٦٩**

[٤٧٥] **سورەتی الصافات ئایەتی ١٠٢**

هێنای (وسل فلما اسلم دقت لسلحا اسلما) هەردوکیان تەسلیم بوون. . ئیبراهیم تەسلیم بوو بەئەو خەوە. . بەئەو فەرمانەی خوا. . ئیسماعیلیش تەسلیم بوو بۆ فەرمانی سەربڕینی (وتله للجبین).

ڕیوایەت هەیە ووتی: باوکە دەست و قاچم ببەستەرەوە نەبا لەقەفرێ بکەم و جلەکانت خوێناوی بێ. . دوایی بڕۆیتەوە دایکم دەست بکات بە گریان، چەقۆکەی هێنا بە ملیا نەی ئەبڕی ڕەزا بوون بەقەدەری خوای گەورە قەدەر لانەبا. . ئەمە یاسایەکی خوای گەورەیە کە قەدەرێکی ناخۆش ئەبارێ ڕازی بە پێی وەڵاهی لانەچێ، ئەگەر لاشنەچوو خوای گەورە حیکمەتەکانی ئەبارێنێ بەسەر دڵتا، ئەمانە لەبەر ئەوەی تەسلیم بوون:

(فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ )[٤٧٧]

خوای گەورە پێی فەرموو: ڕاستت کرد ئەی ئیبراهیم (قدصدقت الرؤیا) بەرامبەر بەوە کوڕەکەی بۆ هێشتەوە ئینجا (وبشرناه بأسحاق) کوڕێکی تریشت ئەدەمێنێ، نەك هەر ئەمەت بۆ ئەهێڵینەوە کوڕێکی تریشت ئەدەمینێ (ومن بعدی إسحاق یعقوب) لەدوای ئەو. . لەنەتەوەی ئەو یعقوبیش ئەهێنین. . ئینجا زنجیرەیەك لە پێغەمبەران بەرامبەر بەوەی کە سەرکەوتوو بوون لەم تاقیکردنەوەیە. . زنجیرەیەك پێغەمبەران لە ئیسحاق دێن و هیچ پێغەمبەرێکیش لەنەتەوەی ئەم نایەت تەنها فەخری عالەم نەبێ (صلى الله علیه وسلم). .

لەشەجەرەی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم (علیه السلام) چی پێغەمبەران هەن لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل وەك یەعقوب و یوسف و موسا و ذولکفل و. ..

---

[٤٧٦] سورەتی الصافات ئایەتی ١٠٢

[٤٧٧] سورەتی الصافات ئایەتی ١٠٣

ئەمانــە زنجیرێـك پێغەمبــەرانن لــەوەوە هـاتوون لـە ئیـسماعیلیش تــەنها (محمـد مصطفى) هاتووە. . بەرامبەر بـەم زنجیرە. . ئەمـە مـوژدەدانێ بـوو بـۆ حـەزرەتی ئیبراهیم. . ئەومیە نیعمەتی خوای گەورە. . ئەومیە نیعمەتی ڕازی بوون بەقەزاو قەدەری خوای گەورە.

ئەگەر ڕازی نـەبووی قەزاکە هـەر ئـەمێنێ و سزایـشی دێتـە سـەر، هەنـدێ کـەس حاڵـەتی مردنـی کـە تـووش ئـەبێ هـاوار ئـەکاو نـاڕەزایی دەرئـەبڕێ، یـەك تـۆز بیرکاتەوە ئەو کەسە ئێمە دڵمان نایە پێی بڵێین تۆ عەقڵت نیە حیساب بۆ حاڵەتە سۆزداریەکەی ئەکەی بیربکەرەوە ئەو کەسە لە جیهانی بەدیهێنراوان هاتۆتەدەرێ ئەچـێتە لای خـوای گـەورە. . ئـیتر تـۆ بۆچـی پێـت ناخۆشـە بەتایبـەتی ئەگـەر مردووەکە ئیمانداربێ واتە: پێت خۆش بێ ئـیتر لـە بەرپرسیاری ڕزگاری بـوو. . هەندێ لە ژنان ئەڵێن ئەوە مناڵ بوو خێـری نـەبینی لـە دونیـا، مناڵان شوێنیان نیە لەبەهەشتا هەموو شوێنێ بۆیان حەلاڵە خۆیـانی پیـا ئەکەن ئەچنە لای ئـەم پێغەمبەر ئەچنە لای ئەو پێغەمبەر لای ئـەم صـەحابی لای ئـەم شـەهید لای ئـەو صدیق، "ئەگەر گونجاو بێ" وەکو منـاڵێکی بـچکۆلە ئەیبـەیتـە کۆشـکی سـەرۆکی وولاتێك ئیتر خۆی ئەکا بـەم ژووردا و ئەچێتە سـەر مێـزو دەسـت کـاری ئـەو شـت دەکاو ئەم شت ئـەکا. . لۆمـەی ناکـەن لەبـەر ئـەوەی مناڵـە، ئـەو مناڵانـەی کـە لـە ئوممەتی پێغەمبـەرن ((صلی الله علیـه وسـلم) ) ئەمانـە (إن شـاءالله) ئـەوە پلەیانـە، ئــەوەش خەفــەتی نــاوێ بــەلام کــە بــەراوردی تاقیکردنــەوەی دووەم ئەکــەی هــی حەزرەتی ئیبراهیم کە بە پیری خوای گەورە تووشی کـرد سـووتاندنەکە گەنجیـەتی بوو هەڵدانە ناو ئاگرەکە لەزەمـەنی گەنجیـدا بـوو، ئەمـەیان لـە پیریـا تاقـە کـوڕەو ئاکامەکەی مردنە، مردنەکەشی چۆنە؟

بەدەستی خۆت ئەبێ سەری ببڕی! ئەمە چ تاقیکردنەوەیەکە بە گاڵتە پێی نەوتراوە (ابوا ألأنبياء) ئەم ئیسماعیلە (عليه السلام) لەوخەسڵەتانەی کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەکا (وكان يأمرأهله بالصلاة وزكاة) باشە ئەی پێغەمبەرانی تر فەرمانیان نەئەکرد بە کەسوکاریان بە نوێژکردن؟

- بەڵێ فەرمانیان ئەکرد. . بەڵام ئەم صیفەتە لەمدا زۆر دیار بووە و پێی ناسراو بووە. بۆیە خوا بەو صیفەتەوە ناوی ئەبا، فەرمانی ئەکرد بەکەس و کاری کە هەمیشە هەستن نوێژ بکەن، هەموو موسڵمانێ ئەتوانێ ئەو رەوشتی ئیسماعیلەی تیا دروست ببێ چ ژن چ پیاو. . پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ (رحم الله إمرأ قام) واتە (قام من ليل وصلى ركعتين) ڕەحمەتی خوا لەو پیاوەی کەبەشەو هەڵدەستێ دوو ڕەکات نوێژ ئەکاو پاشان خێزانەکەی هەڵدەستێنێ ئەگەر هەڵنەسا دەم و چاوی تەڕکا بە ئاو، ڕەحمەت لەو ژنەی کەبەشەو هەڵدەستێ و دوو ڕکات نوێژ ئەکاو مێردەکەی هەڵئەسێنێ ئەگەر هەڵنەسا دەم و چاوی تەڕ ئەکا. . ئەوەی وابکات بەر ڕەحمەتی خوا ئەکەوێ مانای رەوشتی حەزرەتی ئیسماعیلی وەرگرت، بەڵکو هەرچی زانستێ بیزانێ هەرچی حوکمێ بیزانێ لە قورئانی پیرۆزدا بە شێوازێکی گونجاو کەپڕ لە حیکمەت و پڕ لەئامۆژگاری باش بێ. . بە شێوازێکی جوانی هاوچەرخانە رۆڵی پێغەمبەرت بینیوە (صلى الله عليه وسلم) کە ئەفەرموێ: (بلغ ولو آية).

## باسی چلو نۆ

## *نەمانی دەوڵەتی ئیسرائیل*

## لەبەرواری ٥ / ٣ / ٢٠٢٢ی زایینی

**ئەم توێژینەوەیە لە سەنتەری "ن" وەرگیراوە "مركز للدراسات القرانية" لە فەلەستین، توێژەرەکە "د.بسام جوار"ە کە لەوەوپێش پشتمان بەستووە بە یەکێك لە لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە ئیعجازی ژمارەیی لە قورئاندا، بەتایبەت ژمارە ١٩ وەدووبارە ئەیلێمەوە سەبارەت بە ژمارە ١٩ هەندێ لە زانایانی ئیسلام ناوی دەنێن "بدعة الرقم تسعةعشر" هەرچەندە لە قورئاندا خوای گەورە ناوی ١٩ای بردووەو دەفەرمێ:**

﴿إِنَّهَا لَإِحۡدَى ٱلۡكُبَرِ ۝٣٥﴾[٤٧٨]

**بەڵام هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای حەفتاکان. "محمد رشاد الخليفه" توێژینەوەیەکی پێشکەش کرد سەبارەت بە ژمارە ١٩ لە دواییدا دەرکەوت بەشێکی زۆری راست نییە، لەهەمووی قورستر ئەوە بوو خۆی موسڵمان نەبوو "بهائی" بوو وە ژمارە ١٩ لای بەهائییەکان ژمارەیەکی پیرۆزە. . ئەوە وای لە موسڵمانان کرد بەراستی بترسن لە ژمارە ١٩ بەڵام لە راستیدا بنەمایەکی هەیە بناغەیەکی زۆر گەورەیە لە قورئانی پیرۆزدا. . ژمارەیەکی زۆر گرنگەو خوا گرنگی پێدەداتو**

---

[٤٧٨] **سورەتی المدثر ئایەتی ٣٥**

دەفەرمێ: "انها لاحدى الكبر". چ لە بواری قورئانی پیرۆزدا یان بواری زەوی یان فەلەك. ..

پێشەکی: پێش ئەوەی بچینە سەر بابەتەکەو نەمانی دەوڵەتی ئیسرائیل. . لەقورئاندا ٣٦٥جار ژمارەی "اليوم" بەتاك هاتووە، ئایا مرفوع بێت منصوب بێت ئەمەش پەیوەندییەکی راستەوخۆی هەیە لەگەڵ ژمارەی رۆژەکانی ساڵدا. . وشەی مانگ "شهر" بە تاك لە قورئاندا ١٢جارهاتووە ئەمەش راستەوخۆ پەیوەندیی هەیە لەگەڵ ساڵی قمریدا. . ئەوەی تر لەگەڵ ساڵی شمسی دا، ئەبێ بشزانین کە ساڵی خۆریی بریتییە لە ٣٦٥ رۆژو شتێ کەم (٢٤)و(٢٢) وەساڵی مانگی "سنة القمرية" (٣٥٤، ٣٦٧).

جیاوازیەك دروستدەبێت لەنێوان ئەم دوو ژمارەیەدا کە لەیەکی دەردەکەین بریتییە لە (٥٢،٨٧،١٠) ئەوجیاوازیە واتە: ١١ رۆژ شتێ کەم یان ١٠ رۆژو کسور دێین ٢٢،٢٤،٣٦٥ دابەشیدەکەین بەسەر ئەوجیاوازیەدا کەبریتییەلە (٥٢،٨٧،١٠) ئەکاتە ئەم ژمارەیە ٥٨،٣٣ ئەم ژمارەیە زۆر زۆر ژمارەیەکی گرنگە.. واتە: ٥٨،٣٣ساڵی خۆری "سنة الشمسية" ساڵێ پێش ئەکەوێ هەروەها هەموو ٥٨،٣٣ ساڵی مانگی ساڵێك دوائەکەوێ.

ئەمە زاناکان ناویانناوە (الدورة الخسوفية) واتە: دوای ٥٨،٣٣ داتاکانی زەوی لەگەڵ خۆر و مانگدا دەچنەوە هەمان شوێن.

ئێستا لەم چرکەیەدا پاش (٥٨،٣٣) شوێنی زەوی لەگەڵ مانگدا لەگەڵ رۆژدا هەمووی وەك یەکی لێ دێتەوە.

ئینجا ئەگەر لێرەدا تێبینی بکەین سەبارەت بە ژمارە ١٩ ئەم ژمارەیە لێکدانی ١٨ی دەکەین بزانین دەورە ١٩کەی دەست پێدەکات وە کەی کۆتایی دێت ؟

٥٨،٣٣ ★ ١٨ = ٦٠٤زایینی

که لێکدانی دەکەین دەکاتە ٦٠٤ی زایینی دوایئەوە چی دەست پێ ئەکات دەورەی ١٩:

٥٨،٣٣ * ١٩ = ٦٣٨زایینی

١. ئەمە دەورە ١٨ ی پێدەڵێن دەورەی ١٩

٢. ئەمە دەورە ٢٠ی پێدەڵێن

٥٨،٣٣ * ١٨ = ٦٠٤زایینی ــــــــــــــــچەق ــــــــــــــ ٥٨،٣٣ * ١٩ = ٦٣٨زایینی

ئەم پانتاییە بریتیە لە ٦٠٤ تاوەکو ٦٣٨

١. بالێرەدا شەش ساڵی بخەینە سەر: ژمارەکە دەکاتە ٦١٠زایینی.

٢. بالێرەش شەش ساڵی لێدەرکەین: ژمارەکە دەکاتە ٦٣٢زایینی.

* بەرواری یەکەم ٦١٠ زایینی بەرواری بەعسەی پێغەمبەرە(دروودی خوای لەسەر).

*چەقی دەورەکە ٢٣ ساڵی سروشی "وحی"پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر).

*کۆتاییەکەشی وەفاتی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر).

٢٣ساڵی وەحییەکە ئەکەوێتە چەقی دەورەی ١٩ ئەمە هەر بۆ نمونە هێنامانەوە. . هەروەها ئەگەر "یوم، یومین، ایام، یومئذ، یومکم" هەرچی لکێنراویش بێت لە قورئاندا هەمووی کۆکەینەوە ئەکاتە ٤٧٥جار وشەی (یوم)و موشتەقاتەکەی و بە لکێنراووتاك و کۆ و... ئەمانە ئایا ئەم ژمارەیەکە حیکمەتی تیایە؟

- بەڵێ حیکمەتی تیایە.

وەك لای بەڕێزتان روونە زەوی کە دەسوڕێتەوە بە دەوری خۆرداو تاگەڕێتەوە هەمان شوێن ٢٢،٢٤،٣٦٥ رۆژی پێدەچێت. . ئەوەندە دەورە دەکات بە دەوری خۆیدا تاوەکو یەك دەورەی تەواو ئەکات بە دەوری خۆردا. . بەلام ئەگەر زەوی ٤٧٥جار بە دەوری خۆیدا بسوڕێتەوە واتە ئەکاتە ساڵێك و کسور، کە خۆر ٤٧٥

رۆژی تەواو کرد ١٩جار بە دەوری خۆردا دەسورێتەوە واتە: ئەو ژمارەیەش رازی قورئانی تیایە، پەیوەندیی هەیە بە ژمارە ١٩ەوە. ئەمە هەر بەنموونە هێنامانەوە کە بنەمایەکی قورئانی هەیە.

بێینە سەر قورئانی پیرۆز کە باسی بەنی ئیسرائیل دەکات بێگومان لە سورەتی (اسراء) لە ئایەتی دووهەمەوە:

"اعوذ بالله من الشيطان الرجيم" "وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ وَجَعَلْنَـٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾"[٤٧٩]

لە ئایەتی دووەمەوە باسی بەنی ئیسرائیل دەکات هەتا ئایەتی ١٠٤، ئەو مامۆستا (بسام جوار)ە هەندێ شتی لەتائیفی زۆر جوانی بۆ دەرکەوتووە.. خوای گەورە باسی دوو ئیفساد و دوو(پەیمان)ئەکات لەهەمان کاتدا (افساد)ی یەکەم لەو بەروارەوەیە کە حەزرەتی سولەیمان وەفات دەفەرموێ. . بۆچی لەوێدا ئەو بەروارە دائەنرێت بە افسادی یەکەم ؟ چونکە بەنی ئیسرائیل دووبەرەکیان تێکەوت، دووبەرەکی گەورەترین فاکتەرەو دیاردەی فەسادە.

---

[٤٧٩] سورەتی الاسراء ئایەتی ٢-٤

له کتێبەکانی مێژودا ئاماژە بۆ بەروارێك دەکات کە ٩٣٥جار پێش زایین. . بەلام له هەندێ کتێبی تردا دوو ژمارەی تر هاتووه: یەکێکیان ئەڵێت ٩٢٦ و ئەویتریان دەڵێت: ٩٣٠.

- ئایا ئێمە شوێن کامیان بکەوین ؟

زۆرینەیان ئاماژە بۆ ٩٣٥ ئەکەن بەلام له شوێنێکدا ئەڵێ ٩٢٧ له شوێنێکدا ئەڵێ ٩٣٠ ئێمە چۆن بزانین ؟ چونکە زۆر پێویستمان بەو بەروارەیه.

تەنها له سورەتی (سباء) ئایەتی ١٤ باسی وەفاتی حەزرەتی سلێمان دەکات:

"فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ ﴿١٤﴾ .." [٤٨٠]

ئالەو (فاء)ەوە دەست پێدەکات (د.جوار) پیتەکانی له سەرەتای سورەتەکەوە ژماردووه.

تێبینی:

بیرمان نەچێت سورەتی(سباء) له دابەزیندا ساڵێ پێش کۆچی پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) دابەزیووه. . واتە: سورەتێکی مەکییەو راستەوخۆ دوای اسراء هاتوەته خوارەوه. . له زەمەندا نەك له زنجیرەبەندی ریزکردنی سوورەتەکانی قورئاندا. . چونکەله ژماردندنی سورەتەکانی قورئاندا ٣٤وه اسراء ١٧ یه. . زانایانی راڤەی قورئانی پیرۆز ئەفەرموون: سباء سورەتێکی مەکییه "نزلت بعد الاسراء".

- دکتۆر جوار هەڵساوه بەچی؟

---

[٤٨٠] سورەتی سبأ ئایەتی ١٤

هەڵسا بە ژماردنی پیتەکان لە ئایەتی ١ ەوە لە سورەتی (سباء) هەتا کۆتایی ئایەتی ١٣ئەکاتە ٩٣٤ پیت. . بەڵام ئەو ئایەتی چواردەهەمینە کە بە (فاء) دەست پێدەکات باسی مردنی حەزرەتی سولەیمان دەکات، لە زمانی عەرەبیدا (فاء) تعقیبیە، واتە: پەیوەندیەك هەیە لەنێوان رابردوو ئەوەی داهاتودا. . لەگەڵ ئەم فاء دا ئەکاتە ٩٣٥، ئێمەش کەواتە ئەو ژمارەیەی کە لەکتێبی مێژودا هەیە پەسەندی ئەکەین‌و دەڵێین ٩٣٥ی پێش زایین بەرواری وەفاتی حەزرەتی سولەیمانەو سەرەتای فەسادی بەنی ئیسرائیلە.

هەر راستەوخۆ دوای وەفاتی حەزرەتی سولەیمان تەنها ئەوەی (یەهودا) نەبێ مانەوە لە قودس و دەوڵەتەکەیان دەوڵەتی (یەهودا)ی ناوبوو.. زۆرینەی بەنی ئیسرائیل کۆچی کرد بۆ باکور. . لەوێ دەوڵەتێکیان دروستکرد ناویاننا "ئیسرائیل" ، تەورات رەخنە لەو کردارە دەگرێت لە "سفرالملوك الاول" دا.

باسی ئەوە دەکات کە خوێنی ئێوەم حەڵاڵکرد رێگەمدا بە داگیرکەر کە زەلیلتان بکەن‌و بە دیلی بتان بەن و عەزیەت‌و ئەشکەنجەتان بدەن، چونکە ئیشی خۆتان دایە دەست (یربعانی کوڕی ینباط) ئەمە سەرکردەیەك بوو عەقیدەی تێکدان سەریلێشێواندن‌و سەرەتای افسادەکە لەوساڵەوە دەست پێدەکات.

کەواتە بەنی ئیسرائیل دوای ئەم بەروارە دەوڵەتێکیان هەبوو لە باکور ناوی ئیسرائیل بوو وە دەوڵەتێکیان هەبوو لە قودس ناوی یەهودا بوو ئەم دەوڵەتە لەساڵی ٧٢٢ پ.ز ئاشوریەکان لەناویان برد، ئەم دەوڵەتە ١٣٦ ساڵ دوای ئەو واتە لە ٥٨٦ پ.ز لەناوچوو گرنگ ئەو ناکۆکیەیە دوای ئەم بەروارە دەستی پێکرد. .

بەنی ئیسرائیل دوای بەرواری ٩٣٥ دووبەرەکیان تێکەوت و بوونە خاوەنی دوو دەوڵەت:

١. دەوڵەتێکیان هەبوو لە باکوور ناوی ئیسرائیل بوو. . ئەم دەوڵەتە لەساڵی ٧٢٢ پ ز ئاسووریەکان لەناویان برد.

٢. دەوڵەتێکیان هەبوو لە قودس ناوی یەهودا بوو. . لە ٥٨٦ پ ز بەخت نەسری بابلیەکان لەناوی برد.

لە کتێبی (السیرة النبویة) ی (محمد ابو شغبە) جەخت ئەکاتە سەر ئەم بەرواره ١٠ / ١٠ / ٦٢٢ کە بریتیە لە شەوڕەوی پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم))کەخوای گەورە لە مەککەوە گواستیەوە بۆ قودس پاشان بڵندبوونەوەی ـ میعراج ـ پێکرد بۆ ئاسمانەکان. لە راڤەکانی قورئانی پیرۆزدا بەتایبەت "ئبن حەزمی زاهیری" جەخت ئەکاتە سەر ئەوەی کەوا رووداوی شەوڕەوی یەك ساڵ پێش کۆچ ـ هیجرەت ـ بوو. ئیتر دوو سێ مانگ زیاتر یا کەمتر کێشە نییە. . گرنگ ئەوەیە لە سنوری ساڵێك تۆزێ زیاتریش بووە. . وەك دکتۆر ئەفەرموێ کۆچ ٢٢ / ٩ / ٦٢٢ بووە. . بەڵام ئەم بەروارە ١٠/١٠ ٦٢١ی زایینی بەرواری شەوڕەویە کە پێغەمبەری خوا پێغەمبەرانی بۆ کۆکرانەوە لە قودس لە شوێنی وەفاتی پێغەمبەر سلەیمان ئیمامەتی کرد بۆیان (ﷺ).

ئێستا لێرەدا ئەوە بەرواری هاتنی رسول الله. . زیارەتی رسول الله بۆ قودس. . کۆتایی قۆناغی ئیفسادی یەکەمە، ئیفسادی یەکەم رویداو تاوانەکەشی "وعد اولاهما" رویدا ئینجا لێرەدا زاناکان کەمێك جیاوازیان هەیە لەنێواندا "عباداً لنا" کە بە پێنج شێوە هاتووە. . مەرج نییە ئاماژە بێت بۆ خواناسێکی یەکتاپەرستی رێکوپێك، هەرکەسێك بەندەیەکە لەبەندەکانی خوا بەڵام " اولی باس شدید" بوون. . خوای گەورە ئاشوریەکان و بابلیەکانی بۆ ناردن گرنگ ئەوەیە پەیمانی یەکەم کۆتایی هات لە پێش ئیسلامدا.

پەیمانی دووەم ١٩٤٨ کە روونە لای هەمووتان ١٩٤٨ دروستبوونی ئیسرائیلە بەڵام لە رووی فەرمیەوە ـ رەسمی ـ ١٩٤٨/٥/١٥ ئیسرائیل ئیعلانی دەوڵەتەکەی خۆی کرد. سوپای ئەردەنی و سووریی و عێراقی کردیان بە شەڕلەگەڵیا. . بەڵام جامعەی عەرەبی بڕیارێکی دەرکرد "وقف اطلاق النار" کە پێیدەوترێ هودنەی یەکەم واتە لە ١٩٤٨/٦/١٠.

واتە: بە فەرمی و لەسەر کاغەز ١٩٤٨/٥/١٥ دەوڵەتی جولەکە دروست بوو. .

پاش ٢٥ رۆژ و لەبەرواری ١٩٤٨/٦/١٠ بە کردەوە ـ پراکتیکی ـ دەوڵەتەکە دروست بوو.

"مامۆستا محمد ئەحمەد راشد" لە چەندین سەرچاوە خوێندومانەتەوە باسی روداوێك دەکات. . کاتێ گەنج بووە لە ئامادەیی بووە. . لە ١٩٤٨ پیرەژنێکی دراوسێیان کە جولەکە بووە، دیارە جولەکە لەو بەروارەدا لەهەموو شوێنێکی عێراقدا هەبوون ئەڵێ ئەو پیرەژنە دراوسێیەمان بە گریانەوە هات بۆلای دایکم، دایکم پێیووت پێویستە پێبکەنیت چونکە ئێوە بوونەتە دەوڵەت. وتی: ئاخر حاخامەکان وایان پێوتوین ئەم دەوڵەتە ٧٦ساڵ دەخایەنێت "، واتە: لەکتێبە ئاسمانیەکانیاندا نووسراوە کە ئەمجارە دەوڵەتی ئیسرائیل دروست دەبێتەوە بۆماوەی ٧٦ ساڵە.

د.جوار هەستاوە بەم حسابە مەعلومی بەڕێزتانە کە ساڵ لای یەهودەکان بەساڵی مانگی حساب دەکرێ وەکوتەقویمی عەرەبی وەهایە ١٩٤٨، ٧٦ساڵی مانگی بۆ زیاد بکەی:

٧٦٠ * ٣٦٧،٣٥٤ = ٨٩٢،٢٦٩٣١ رۆژ

ئا ئەمەندە رۆژ زیاد دەکرێ بۆ بەرواری دروستبوونیان ١٩٤٨/٦/١٠، دەکاتە ٢٠٢٢/٣/٥ ئەمە لەلای جولەکەکان کۆتایی دەوڵەتەکەیانە، ئێمەی موسڵمان کە

دەگەڕێینـەوە بـۆ قورئـانی پـیرۆز وەك د. بـسام جـوار ژمـارەی وشـەکانی سـورەتی اسراء لە ئایـەتی دووەوە کـە باسـی بـەنی ئیـسرائیل دەکـات "واتینـا الموسـی الکتـاب وجعلناه" لەوەوە حساب دەکات هەتا "لفیفا" "فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ جِئۡنَا بِكُمۡ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾ "[٤٨١] ئەم لفیفانەیە ئاماژەیە بـۆ ئـەوەی کـە بـەنی ئیـسرائیل دەبنە چەندین قەومیەت، دەبنە نزیکەی ٧٠ قەومیەت بـەڵام جـاران هـەموو یـەك قەومیەت بوون، خوای گەورە دەفەرمێ: لە وڵاتـانی جیهانـدا کۆتـان دەکەمـەوە لـە یەك شوێندا، لە سەرەتای سورەتەکەدا دەفەرمێ

"فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ لِيَسُـُٔواْ وُجُوهَكُمۡ وَلِيَدۡخُلُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوۡاْ تَتۡبِيرًا ﴿٧﴾ "[٤٨٢]

کـە سـزای دووەم و پـەیمانی دووەم دێـت خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ئـەو قەومـە خواناسەی کە دەیان نێرم سێ کار دەکەن لەگەڵتاندا:

یەکـەمیان: رووتـان رەش ئەکـەن، مەرجنییـە ئـەو روو رەشـییە بریتـی بێـت لـە خـەڵوزو بیـدەن لـە دەم‌و چـاوتان. . بریتییـە لـە شـکاندنی کەسـایەتیان لەماسمیدیاکانـدا، چـی پیلانیـان گێـڕاوە بـۆ خـەڵکی سـەر زەوی هـەمووی کەشـف دەبێ، بۆ هەموو خـەڵکی دەرئەکەوێ کـە چـەندین ساڵە یـەهود فێڵیـان کـردووەو راست نەبوون لەگەڵ خەڵکیدا.

---

[٤٨١] سورەتی الاسراء ئایەتی ١٠٤

[٤٨٢] سورەتی الاسراء ئایەتی ٧

خاڵی دووەم: "وليدخلوا المسجد كما دخلوه اول مره" ئەو دوژمنانەتان کە بریتین لە قەومێکی خواناس دێنە ناو ئەومزگەوتەوەو رزگاری دەکەن لە دەستان.

حاڵەتی سێیەم: (وليتبروا ماعلوا تتبيرا) هەرچی ئەپارتمانێکی بەرز لە بيت المقدس‌ودەوروبەری کەلەوانەیە"مستوطنات" ی ئەمڕۆ بگرێتەوە، ئەمە هەمووی دەڕوخێنرێ. کەواتە (لفيفا) ئاماژەیە بۆئەوەی کە ئەو دیاردەیە کە روویدا سزاکەش لەگەڵیایەتی لە هەمانکاتدا.

کە ژمارەی وشەکانی ئایەتەکان ئەژمێرێ "١، ٢، ٣" لفيفا ئاخر وشەیە لە ئایەتی ١٠٤ زنجیرەی ئەم وشەیە دەکات "١٤٤٣" یە.

یەکێك لەو نهێنیانە:

هەموو وشەیەك لەو وشانە ئاماژەیە بۆ ساڵێك لە ساڵەکان. . ئەمە دائەنرێ بە کۆچی واتە ٢٠٢٦ زایینی بەرامبەرە ١٤٤٣ کۆچی یە.

جا بەڵگەمان چییە؟

بەڵگەمان زۆر بەهێزە.

ئەم ١٩٤٨/٦/١٠ بریتی بوو لە ٣ شعبان ١٣٦٧ ئەگەر ئەم ژمارە رۆژانەی بۆ زیاد کەین ئەکاتە ٢/شعبان/١٤٤٣ ئەمە هەمووی نهێنی و رازی ریزبەندی قورئانە. .

## هەندێ زیادەو خاڵی جوانیتر

بێینەسەرهەندێ خاڵی تر:

* ئاشکرایە لای بەڕێزتان کە لە دامەزرانی دەوڵەتەکەوە ١٩٤٨ سەرەتای فەسادی دووەم بوو، لە لە ٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧ ئیسرائیل پەلاماری سوریاو سیناء و "ضف"ی غەربی داو هەمووی داگیرکرد. . گەورەی کرد. . لەسەر حسابی زەوی موسڵمانان. . لەو شەڕەدا ئیسرائیل سەرکەوت "٥، ٦، ٧، ٨، ٩ حوزەیران" هەموو

شـتێکی تـەواو کـردو لـە ١٠ی حـوزەیران ئاگربەسـت ڕاگەیـەنرا و هـەموو شـتێ براپـەوە ( ١٩٦٧/٦/١٠ ) ئەوکاتـە هـەمووی داگیرکـرا تـا ئـەمڕۆ. . سـینا نـەبێت کـە داویەتیەوە بە میصر، بە گوێرەی ڕێککەوتنێك ئەگەر تەماشا بکەین ١٩٤٨/٦/١٠ تا ١٩٦٧/٦/١٠ ڕێك ١٩ساڵە.

★ لە سورەتی سباء لە ئایەتی ١٤ کە لە "فاء"کەوە دەست پێدەکات:

"فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ ﴿١٤﴾ "[٤٨٣]

ئایەتەکانی پێش ئەو ١٩ وشەیە، ٨٤ پیتە. . ئەم ئایەتە باسی گەورەبوونی دەوڵەتی سولەیمان دەکات. .

باسـی ڕامبـوونی "جـن" دەکـات کـە کۆشـك و تـەلاریان کـردووەو کـەناڵی ئاویـان ڕاکێشاوەو کارگەیان داناوە کەلە توانای مرۆڤدا نییە.

ئەم ١٩ کەرەتی ٨٤ بکەین. . ئەم دوو ژمارەیە کە لێکدانی یـەکتری دەکـەین ئەکاتـە ١٥٩٦ لە تەوراتدا دەڵێ حـوکمی سـلێمان ٤٠ سـاڵ بـووە، ٤٠سـاڵی لێدەرکـەین دەکاتـە ١٥٥٦. ئایا ئەم ژمارەیە چییە؟

ئەم ژمارەیە بریتییە لە وەفاتی سـولەیمان ( س ) هـەتا هـاتنی پێغەمبـەر "(صـلی الله علیه وسـلم)" بـۆ قـدس ١٥٥٦ سـاڵی شمـسی یـە. ئـەو ژمارەیـە ئـەو حیکمەتـەی تێدایە.

★ وتەیەکی خۆشی تریش لێرەدا هەیە ئەگەر تاکەتاکەی ژمارەکانی ئەم پێکهاتەیە کۆبکەینەوە بەم چەشنە: ٦+٥+٥+١=١٧ ڕیزبەندی سورەتی اسراء لە قورئاندا ١٧ یە.

---

[٤٨٣] سورەتی سبأ ئایەتی ١٤

* جولەکەکان باوەڕیان بە "مذنبي هالی" هەیە کە لە ١٩٤٨ دا لە دورترین خاڵدا بوو لە خۆرەوە، لە ١٠/شباط/١٩٨٦ هەموو بە چاو بینیمان لە نزیکترین خاڵدا لە خۆرەوە. ئەم ئەستێرەی کلکداری هالیە هەموو ٧٦ساڵ جارێك دێت. . لە کتێبی ئایینی یەهودیدا پەیوەندی دروست بوونی دەوڵەتەکەیان بەوەوەیە.

بەڵام لێرەدا پرسیارێکی سەیر دروست دەبێت؟ کە حسابی نیو دەورە دەکەین ئەبێ ٣٨ ساڵی پێ بچێت نیوەکەی تریش ٣٨. ئەکاتە ٧٦.

بەگوێرەی ئاماری بیرکاری بێت ئەبێ ساڵی ٢٠٢٤ هالی بگەڕێتەوە چونکە لە ٢٠٢٤=٣٨+٨٦

بەڵام هەرچی کۆمپیوتەر هەیە کە زانیاری لەسەر "هالی" پێدراوە کە لێیدەپرسی کەی دەگەڕێتەوە ؟

- دەڵێ ساڵی٢٠٢٢ !! ئەمە نهێنیەکی سەیرە !

یەکێك لە کتێبە باوەڕپێکراوەکان "مایکرو کومبیوتر وعلم الفلك" کە دکتۆرێکی میسری دایناوە دەڵێ هەموو کۆمپیوتەرێك کە زانیاری و داتای پێویستی پێدرابێ دەڵێ: هالی ٢٠٢٢ جارێکی تر پەیدا دەبێتەوە.

دەرکەوت رۆشتنی هالی لە ١٩٤٨دا هەتا ١٩٨٦ دەکاتە ٣٨ ساڵی شەمسی، بەڵام ٣٨ساڵی قمری دێتەوە کە دەکاتە ٢٠٢٢.

- ئەگەر ئەو ماوەیە حساب بکەین کە لەنێوان درووست بوونی دەوڵەتی ئیسرائیل و رووخانیدا هەیە ٦٢١/١٠/١٠ هەتا ٢٠٢٢/٣/٥ ئەکاتە"١٤٠٠،٤"ساڵ.
- ١٥٥٦ کەماوەی فەسادی یەکەمە.
- ١٤٠٠،٤ کەماوەی فەسادی دووەمە.

ئەگەر ئەم دوو ژمارەیە جارێ کۆبکەینەوە، جارێ لێکی دەربکەین ئەنجامەکەی بەم شێوە دەبێت:

١٥٥٦+١٤٠٠،٤ = ٢٩٥٦،٤

١٥٥٦ - ١٤٠٠،٤ = ١٥٥،٦ ئایا ئەم دوو ژمارەیە پەیوەندیەك لەنێوانیاندا هەیە؟

بەڵێ. . پەیوەندی نێوان ئەم دوو ژمارەیە ئەوەیە ژمارەی یەکەم ١٩جار لەژمارەی دووەم گەورەترە !

١٩ بریتییە لە ١٠+٩

ئەگەر ١٥٥،٦ ★ ١٠ = ١٥٥٦ بەرواری فەسادی یەکەمە.

ئەگەر ١٥٥،٦ ★ ٩ = ١٤٠٠،٤ بەرواری فەسادی دووەمە.

واتە: ئەم ژمارانەش رازی خۆیان تێدایە.

★ رۆژی "سبت" لەلای جولەکەکان هەموو ٦ رۆژێك حەوتەمینەکەی ئەبێ پشوو بدەن. . ئەبێ واز لەکار بهێنن. هەموو ٦ ساڵێ بۆ حەوتەمەکەی نابێ زەوی بکێڵن. . نابێ قەڵەمی مێو بکەن. . نابێ هیچ جۆرە ئیشێکی بازرگانی.. کشتوکاڵی. . پیشەسازی بکەن به دەقی تەورات سزای لەسەرە.

"سەبوت" واتە پشودان. . سڕبوون. . سبت لەوەوە هاتووە.

ئێمە لێرەدا دوو بەروارمان دەرهێنا. بەرواری زایینیو کۆچی:

- ٢شعبانی/١٤٤٣ بەبەرواری کۆچی.
- یان ٢٠٢٢/٣/٥ بەبەرواری زایینی کەدەوڵەتی ئیسرائیل نامێنێ بە شەممە دەست پێدەکاتو بە شەممە کۆتایی دێت.

★ بێینە سەر بەرواری جولەکەکان خۆیان کەپێی دەوترێ "ساڵنامەی عبری" ئەم بەرواره ٢٠٢٢بە ساڵنامەی عبری ٥٧٨٢ ئەکات. . ٥٧٨٢ بێین ئەم ژمارمیە دابەشی ٧ بکەین. بۆئەوەی بزانین چەندجار سەبوت هاتووە بەسەریاندا ٨٢٦ دەرئەچێ.

٥٧٨٢ ÷ ٧ = ٨٢٦ بەگوێرەی شەریعەتی خۆیان ئەبوایە ٨٢٦ ساڵ پشوویان بدایە و ئیشیان نەکردایە !

ئێستا ئەم رستەیە بنووسین "سبت بنی اسرءیل" واتە: سڕبوونی بەنی ئیسرائیل. . بەڵام تێبینی بکەن بەپێی رەنووسی قورئانی پیرۆز "مصحف عوسمان" واتە "ا" ناکەین بۆ وشەی ئیسرائیل. . بە حسابی "ابجد" وەری بگرین دەکاتە ٨٢٦.

- شەممە ٥/ ئازار بەرواری لەناوچوونیانە "سبحان الله" ئەگەر بنووسین: "السبت ٥ اذار" بەحسابی ابجد وەریبگرین:

  ٤٩٣ +٥ + ٩٠٣ دەکاتە ١٤٠١

لە ٦٢١ زاینیەوە کەدەرچوونی پێغەمبەرە ( دروودی خوای لەسەر) بۆ قدس هەتا ئەم بەروارەی لێدەربکەین:

٢٠٢٢ – ٦٢١= ١٤٠١ دوای ١٤٠١ ساڵ لە بەرواری اسراء"وە دەوڵەتی ئیسرائیل نامێنێ.

ئەگەر ٢٠٢٢بە عەرەبی بنووسین وەکو رەنووسی مصحف عوسمان ئەڵێین:

"الفان واثنن وعشرون "ئەگەر ئەمە کۆبکەینەوە بە حسابی ابجد ئەکاتە ١٤٠١ سبحان الله.

بێینە سەر دوو لەتیفەی کۆتایی:

★ ئەو ئایەتەی کەوتمان کۆتایی هاتووە بە (لفیفا) ئایەتی (١٠٤) ی سورەتی (اسراء) "فاذا جاء وعد الاخرة جئنابکم لفیفا"

وشەکانی لە ئایەتی ٢ وە ژمێردران تا وشەی (لفیفا) کە ریزبەندیەکەی ١٤٤٣ بوو. . دوای ئەمە ئایەتی ١٠٥ دێت "وبالحق انزالنە وبالحق نزل" ووشەی (وبالحق) ریزبەندیەکەی ١٤٤٤ دەبێت. . ووشەی (انزالنە) ١٤٤٥ دەبێت. . بالحق ١٤٤٦. . نزل ١٤٤٧، ئەم ژمارانە کۆبکەینەوە ئەکاتە ٥٧٨٢ بە سالنامەی عبری واتە: لەناوچونتان بەسالی کۆچی ١٤٤٣ لە هەمووشی سەیرتر بەحسابی ابجد ئەم ئایەتە کۆبکەیتەوە (فاذا جاء وعد الاخرة" کە تۆڵەی کۆتایی خوا هات ئەکاتە ٢٠٢٢. . سبحان الله !

ئەبێ بزانین ململانێی جوولەکە بەردەوام دەبێت. . بەلام ئەمە تەنها لە روانگەیەکی زانستی قورئانیەوە بەرواری لەناوچونی دەولەتەکەیانە بەلام جوولەکە دەمێنێت. . بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ( دروودی خوای لەسەر ) دەجال و شوێن کەوتووەکانی زۆربەی جولەکە دەبن. . کێشەیان هەر درێژەی هەیە. . بەلام دەولەتیان لە ٥ / ٣ / ٢٠٢٢ نامێنێت.

## باسی پەنجا

## ئیعجازی زانستی لەچەند بوارێکدا

هەوڵدەدەین لەم دەرسەدا گەشتێك بكەین بەناو چەند ئایەتێك كە سروشتێكی زانستییان گرتوەتەخۆ كە پەرجووی زانستییان تێدایە. . چەند ئایەتێك لەو ئایەتانەی كە باس لە هەور دەكات وەیەك دوو ئایەتیش كە باسی دەریا دەكات. ئایەتێكیش كە ئیعجازێكی غەیبو مێژوویی‌و جوگرافی تێدایە.

***یەكەم: هەور.***

خوای گەورە دەفەرموێ: "وانزلنا من المعصرات ماء ثجاجا" جۆرێك لە هەور خوای گەورە ناوی ناوە "المعصرات" ناوی ناوە "گوشەر" كاتێك بە ویست و ئیرادەی خوا جل جلاله كاتی بارینەكەی دێت. . بەشێوەی بارانی ئاسایی نییە. . ئاوەكەی سانا ئایەتە خوارەوە بەڵكو بەشێوەی گوشراوێك و وەك لێزمە. . بەشێوەی بارانێكی بەخوڕ دێتە خوارێ.

لەفەرهەنگی عەرەبیدا لای فەیروز ئابادی لە قاموس المحیط واتە فیظان لافاو لە مفرداتی راغبدا نمونەیەك ئەهێنێتەوە فەرمودەیەكی پێغەمبەرە "(صلی الله علیه وسلم)" ئەفەرمێ: افضل الحج الهج والثلج .

واتە: باشترین شێوازی حەج ئەوەیە كە هەجی تێدابێت. واتە: تەلبیەی تێدابێ.. لبیك اللهم لبیك. . بەدەنگی بەرز تا ئەتوانی زۆر بیڵێی.

الثلج: بریتییە لە ئیدیۆمێك (الكنایة) بۆ خوێنڕشتن‌و قوربانیكردن واتە: شلەمەنیەكی بەخوڕ. "الثلج، الشجیج" ئەوە دەگرێتەوە، بابێین لێرەدا بپرسین لە







زانست ئایا زانست گەیشتۆتە ئەوەی کە ئەو جۆرە هەورانە بدۆزێتەوە؟ ئایا ئەو جۆرە هەورە کاتێ کە دەبارێ بەشێوەیەکی بەخوڕ دەبارێ ؟ بەلێزمەو "دفعە دفعە" دەبارێ ؟

لە وەڵامدا زانست ئەڵێ: بەڵێ..

لەو هەشتا جۆر هەورەی کە هەیەو دۆزراوەتەوە بە ئامێری پێشکەتوو بە ئەزموون دەرکەوتووە بووەتە زانست و حقیقەت یەکێك لەوانەی پێیدەوترێ تۆریندۆن.

ئەو جۆرە هەورانە کە "معصرات"ن، کاتێ کە وەختی بارینەکەی دێت فڵچەی سەیارەش فریای لادانی ناکەوێت، لێزمەیە، تێسکەیە، نەك قەترە. بەڵکو سەتڵ، سەتڵ ئەرژێ بەسەر ئەو جلەدا. . ئەو جامەدا. . جاری واش هەیە رەشەباو تۆفانی ترسناکی لەگەڵدایە ئەوەی کە لێرەدا لەتیفەیەکی قورئانییە ئایەتەکەی دوای ئەوە کە ئەفەرموێ:

( وَجَنَّـٰتٍ أَلۡفَافًا ﴿١٦﴾ )[484].

ئەو جۆرە بارانە خوا ئەفەرموێ:

بۆ مەبەستی هەندێ رووەك‌و هەندێ دانەوێڵەو لەگەڵ جنات الفافا نزارەو دارستانی چڕ ئەگەر تێبینی بکەین ئەوجۆرە بارانانە لەوناوچانەن هەمیشە درەخت‌و دارستانێکی زۆر ئەو ناوچانەی گرتۆتەوە. . لەو ناوچانە دەبارێ کە بۆتە هۆی دارستان‌و نزارە. . لە تەلەفزیۆنەوە زۆرجار لە هێڵی کۆپتەرەوە وێنەی ئەو دارستانانە ئەوەندە چڕن ژێرەکەی نابینرێ. تەنانەت بۆتە شوێنگەیەك بۆ خۆشاردنەوەی تاوانبارو ئەوانەی کە بازرگانی بە تلیاکەوە دەکەن، وەك لە

---

[484] سورەتی النبأ ئایەتی ١٦

کۆلۆمبیا که لەوێ خۆیان حەشار دەدەن، بونەته کێشه بۆ پۆلیس، دەبینین ئەو بارانه زۆره بۆته هۆی پەیدابونی ئەوجۆره دارستانانه.

حەز ئەکەم لێرەدا تیشك بخەینه سەر "جنات" وشەی "الجنة"و مشتقاتی له زمانی عەرەبیدا واته: دیار نییه بۆیه به جنۆکه ئەوترێ الجن واته دیار نییه یەکێك که عەقڵی دیار نەبێت پێیدەوترێ مجنون باخو باخاتێك ئەوەنده چڕبێو لقو پۆپی درەختەکان چڕوپڕ بنو ئەودیوی دەرنەکەوێ نەزانی لەودیو درەختانه چی هەیه بەو شوێنه دەوترێ "الجنة".

ئیعجازێکی تر که خوای گەوره له سورەتی "الروم" ئایەتی ٤٨ ئەفەرموێ:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَـٰلِهِۦ ۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾[٤٨٥]

خوای گەوره باسی جۆره هەورێك دەکاتو دەفەرموێ خۆمان "زاتی الله" که "مسبب الاسباب"ه پاڵ به هەندێ "با"وه دەنێو هەندێ "با" دەهێنێ، ئەبێته هۆی بڵاوبونەوەی هەورو رای ئەخات له ئاسماندا، بەویستی خۆی پاشان کەرت کەرتی ئەکات، پارچه پارچەی ئەکات. . ئەو پەڵه هەورەیه. . ئەو هەوره راخراوه، جۆره بارانێکی لێدەبارێ زۆر ورده "ودق" واته بارانی ورد. . نم نم. . کاتێکیش له هەر شوێنێك دەبارێ به ویستی خوا "فاذا اصاب به من يشاء" "اذا هم يستبشرون".

---

[٤٨٥] سورەتی الروم ئایەتی ٤٨

ئەوەی تێیدەگەین لە رووکەشی ئەم ئایەتەدا کە لەجۆرە هەورێکی راخراوەوە دێت زۆر پانتایی دەگرێتەوە . بارانەکەی زۆر نەرمە . هەمیشە سوود بەخشە وەك ئەویتر نییە، چونکە ئەویتریان لافاو دروستدەکات، سوودی هەیە بۆ دارستان بەڵام بۆ مرۆڤ "طوفان" دروست ئەکات دێتە ماڵانەوەو وەك لە تیڤی ئەیبینین زەرەر ئەدات. بەڵام ئەمجۆرەیان هەمیشە مژدەدەرە "یستبشر" دڵخۆشکەرە بۆ هەرکەسێك کە ئەم بارانەی بەرکەوێ ئەگەر قسە لە زانست بکەین ئایا لە زانستدا ئەو جۆرە هەورە هەیە کەپێی دەوترێ راخراو ؟

لە ٨٠جۆرەکەی زانستی هەوردا کە بەعەرەبیەکەی "الغیوم البسوطة" ی پێدەوترێت (هەورە راخراوەکان) بەڵێ ئەو هەورە دۆزراوەتەوە . پانتاییەکەی دەگاتە ٢٠٠کم هەمیشە بارانەکەی وردەو بارانەکەی بەنەرمی دەبارێو بەهیچ شێوەیەك زیانی نییە و زەرەر نادات.

ئایەتێکی دیکە دووبارە باسی هەور دەکات"اعوذ بالله من الشیطان الرجیم...الم تر ان الله یزجی سحابا ثم یؤلف بینە ثم یجعلە رکاما فتری الودق یخرج من خلالە وینزل من السماء من جبال فیها من برد فیصیب بە من یشاء ویصرفە عن من یشاء یکاد سنا برقە یذهب بالابصار "سورەتی نور ئایەتی ٤٣"

لە شوێنێکی تردا سورەتی الطور ئایەتی ٤٤ دەفەرموێ: "سحاب مرکوم" لە رووکەشی ئەم ئایەتەدا خوای گەورە ئەفەرموێ: ئێمە "با" دەنێرین بەشێوەی نەرمو نیان چونکە دوو جۆر "پاڵ" هەیە لە زمانی عەرەبیدا ئەگەر پاڵەکە توندوتیژ بوو پێیدەوترێ "وزع" " واذاهم یوزعون" پاڵیان پێوە دەنرێ بە توندوتیژی "الدفع بالعنف" ئەگەر پاڵەکە بەسووکی بێو بە نەرمو نیانی بێت پێی دەوترێ "اذ جاء" خوای گەورە ئەفەرموێ: "الم تر ان الله یزجی سحابا"

بڕوانن چۆن خوای گەورە بایەکی نەرمو نیان دێنێ پاڵ بە هەورەکانەوە دەنـێ بـە نـەرمونیانی "یؤلـف بینـە" بـە پێـچەوانەی ئـەوەی پێـشوەوە، جـۆرە راخراوەکـە بڵاودەبێتەوە.. بایەکە ئەو جۆرە بڵاو ئەکاتەوە وڕای ئەخات.

ئەمــەیان بــە پێــچەوانەی ئەوەوەیــە. . جــۆرە بایــەك دێــت ئــەم هەورانــە نزیکدەخاتەوە بۆیە ئەو کەسەی کە کتێبێك دادەنێ پێی دەوتـرێ "مؤلـف" واتـە: کۆکەرەوە "یؤلف بینـە" کۆکردنـەوە. . پاش ئـەوەی کـە ئـەم هەورانـە کۆدەبنـەوە بـەهۆی ئـەو بـا"یـەی کەبەویـستی خـوا هـاتووە. دوای ئەمـە دەفـەرموێ: ثـم "بـۆ تعقیب...

"ثم یجعلە رکاما"...

ئـەم هەورانـەی کـە کۆکراونەتـەوە کەڵەکـە ئـەبن بەسـەر یەکـدا. . خـوای گـەورە کەڵەکەیان ئەکا بەسەر یەکا "ثم یجعلە رکاما"... رکاما: واتە کەڵەکە کراو.

"ما یلقی بعضە علی بعض" ئەمە لە فەرهەنگدا کەڵەکە کـراوە هـەر بـە کـوردیش هەمان مانای هەیە، ئایەتەکە دەفەرموێ: "وینزل مـن السماء مـن جبـال فیهـا مـن برد" ئەمجۆرە هەورە لـە چیا دەچـێ. . لـە شـاخ دەچـێ و هـەڵگری تەرزەیـە، ئـەو خرۆکە بەفرینە وشکانەی کە پێیدەڵێن تەرزە. . ئەو هەورانەش لەچی ئەچن؟

- شێوەیان لەشاخ ئەچێ. . لەچیا ئەچێ. . لەکێوێك ئەچێ. . بەڵام بـەپێی ئـەوەی ئێمە لەژێرەوەین و ئەو لەسەرەوەیە چاومان لێی نییە شێوەکەی چۆنە..!

"ویصرفە عن من یشاء"

ئەمجۆرە هەورە زیانبەخشە لەهەمانکاتیشدا سودبەخشە بـەڵام تەرزەکەی ئەگـەر بەر خەڵکی بکەوێ زەرەرو زیان ئەدات بەر کشتوکاڵ بکەوێ زەرەر ئەدات...

لە حەفتاکاندا، ساڵێکیان لەو شارەزوورە، ئەو جۆرە تەرزەیە بـاری زۆر سـەیارەی قوپاند. . سەری خەڵکی شکاند " فیصرنە عن من یشاء "

ئەو بارینەش وەكو كۆكردنەوەكەی بە ئیرادەی خوایە بارینەكەشی. . كاتەكەی. . برەكەی. . شوێنەكەی. . هەمووی لەژێر فەرمانی خوایە جل جلالە بەبێ هاوەڵ.

بالێرەدا لە زانست بپرسین:

- ئایا لە زانستدا ئەمجۆرە هەورە هەیە كە لە شاخ بچێ. . هەڵگری تەرزەبێ. . بروسكەكەی "يكاد سنا برقه يذهب بالابصار"

"برقه" "هاء" ئەگەڕێتەوە بۆ"برد" ئەو راناوە "ضمير متصله"یەكە ئەگەڕێتەوە بۆ "برد" واتە: قورئان ئەفەرموێ بروسكەكە هۆكەی تەرزەكەیە نەك جۆرە كارەبایەك لەناو هەورەكەدا، بەڵكو جۆرە كارەبایەك لەناو خودی تەرزەكەدا.

بزانین زانست گەشتۆتە ئەوەی كە ئەم راستیانەی بۆ دەركەوێ بەئەزموون بە ئامێری پێشكەوتوو بە ئامێری تەكنۆلۆجی.

- لە وەڵامدا زانست دەڵێ: بەڵێ.. ئەو جۆرە هەورانە پێی دەوترێ "الغيوم الركاميه" سبحان الله واتە: هەورە كەڵەكە كراوەكان، جا ئەوەی كە لێرەدا سەرنجراكێشێ ئەو زانایانەی كە ئەمەیان پۆلێن كردووەو هەورەكانیان پۆلێن كردووە ئاگایان لە قورئان نییە. . خۆیان ناوەكانیان لێناوە كەوەریان دەگێڕێت و بەراوردیان دەكەیت لەگەڵ قورئاندا دەبینیت یەك مەبەستە و یەك چەمك. زانست ئەڵێ ئەو جۆرە هەورانەی كە هەڵگری تەرزەن بنكەكەی. . بنەكەی. . نزیكەی هەشت مەترە بەڵام بەرزیەكەی دەچێتە بیست كیلۆمەتر سەروتر. . واتە: لەشاخ دەچێت. . باران و بەفری لێدەبارێت وەهەڵگری تەرزەشە. . ئەوەشیان بۆدەركەوت هۆی هەورە بروسكە دەگەڕێتەوە بۆ بوونی تەرزە. . واتە: هەر هەورێك كە بروسكەی دا دڵنیا بە كە تەرزەشی هەیە.

لا باسێكی گرنگ تێبینی بكەن:

هەرچی هاتبێت لە تەفسیر و راڤەی قورئانی پیرۆزدا لە سەردەمەکانی رابردوودا. . هەمووی راستە و ئەوەی ئەمرۆ زانست دەیدۆزێتەوە و دەریدەخات ئەوەی رابردوو بەدرۆناخاتەوە. . بەڵکو زیادە زانیاریەکەو کرشەیەکە بۆ سەر خەرمانی بیر و مەعرفەی هۆگری قورئانی پیرۆز. . بەپێی ئەوەی ئەوان ئەو ئامێرە تەکنۆلۆجیە پێشکەوتووانەیان نەبووە. . نەگەیشتوونەتە ئەو زانستە نوێیانە. . وە لەسەردەمی ئەواندا ئەم داهێنراوە زانستیانە نەبوون بۆیە پێی نەگەیشتوون. . بۆیە ئەم پەرجووە زانستیانە زیادەیەکن بۆ سەر خەرمانی راڤەی پڕبەرەکەتی ئەوان و تەفسیریی ئەوان لانادەن بەڵکو دەوڵەمەندی دەکەن. . لاتنقظی عجائبة. . بۆ ئەوەیە ئێمە تێبگەین کەئەوەی ئەمرۆ دۆزراوەتەوە لوتکە و دواترۆپکی زانست نییە بەڵکو لەداهاتوودا ئەشێت زۆر لەمەزیاتر بدۆزرێتەوە و ئەمەی ئێمە پێویستی بەو قۆناغە نوێیەش ببێت و بەو هەنگاوە نوێیانەی کە زانست پێی دەگات و دەبێتە راڤەی نوێ بۆی.

***دووەم: دەریا.***

دەریا بەم جۆرە پێناسە کراوە: کل مکان واسع جامع للماء کثیر. لەمفرداتی راغبی ئەصفەهانی دا. . واتە: هەموو شوێنێکی فراوان کەئاوێکی زۆری گرتبێتە خۆی پێی دەوترێت دەریا. ئێمەش لە کوردیدا هەمان بەکارهێنانمان هەیە. . وەکو نموونەی: ئاوی دەربەندیخان و دووکان و. ... هتد کەلە حەوزێکی گەورە یان شیوێکی گەورەی ئاو پێك هاتوون و بڕێکی زۆر ئاویان تێدا کۆبووتەوە بۆیە پێیان دەڵێین: البحر ـ دەریا. . بەحرەکەی دەربەندیخان یان بەحری دووکان. . بەپێی ئەوەی گەورەیە با شیرینیش بێت. . عەرەبیش بەهەمان شێوە بەبڕی ئاوی

زۆری وتووه بەحر. . بەلام کاتێ وورد دەبینەوە لە قورئان. . وورد بوونەوە لە قورئان فەرمانی خوایە: - أفلا یتدبرون القرآن أم علی قلوب أقفالها. .

- خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات وورد ببنەوە لە قورئان. . بیر بکەنەوە لە قورئان. . پێوەی ماندوو ببن. . خۆتانی پێوە سەرقاڵ بکەن. . مێشکتانی پێوە خەریك بکەن. . بۆئەوەی ئەو گەوهەرانەی لێ دەربێنن. .

قورئان کاتێ باسی دوو دەریا دەکات یەکێکیان شیرین و ئەوی تریان سوێروەکو یەك باسیان ناکات. . بۆنموونە:

﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ۝١٩ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ۝٢٠ ﴾[٤٨٦]

مرج واتە: تێکەڵ مروج: تێکەڵ بوون.

بەرووکەش کە دەبینی دوودەریا تێکەڵ بوون. . دەگەن بەیەك یلتقیان. . بەلام بینهما برزخ لا یبغیان. . بەلام کۆسپێك دیوارێك هەیە لە نێوانیاندا ناهێڵێت بەشێوەیەکی بایۆلۆژی، بەشێوەیەکی کیمیایی تێکەڵ ببن. . هەر بەحرە و تایبەت مەندی خۆی دەپارێزێ – ئەمە کە باسی دوو دەریا دەکات کە هەردووکی سوێر بێت – ئەم راستیە لە ساڵی ١٨٧٣ دا تیپێکی زانستی بەریتانی بە ناوی تیپی چالنجەر گەران بەسەر دەریاکاندا و نموونەیان هێنا لە ئاوی دەریاکان لە تاقیگەکانی خۆیاندا تاقیان کردەوە و بۆیان دەرکەوت جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان ئاوێك و ئاوێکی تر و نموونەیەك و نموونەیەکی تردا واتە: دەریاکان بەیەك ناچن ساڵی ١٩٤٢ شوێنەکانیان دیاری کرد. . واتە: کاتێ لەسەر نەخشەیەك پەڵەیەك دەبینیت لەناو دەریایەکدا ئەوەنیشانە کراوە. . کەلەفلان شوێندا پەڵەیەك هەیە. . ئاوێك هەیە لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا تێکەڵ نەبووە سبحان الله.

---

[٤٨٦] سورەتی الرحمن ئایەتی ١٩ – ٢٠

. پلەی گەرمیەکەی، ڕێژەی ئۆکسجینی تەواوەی، سوێریەکەی جیاوازە لەگەڵ ئاوەکانی دووروبەریدا، ئەو بەکتریایانەی کەلێرە هەن لەگەڵ ئەوانەی دەوروبەردا جیاوازن . . هەروەها ئەو گژو گیا دەریاییەی لێرە ئەژی و ئەو جۆری ماسیانەی لێرە هەن و. .. جیاوازن لەگەڵ ئەوانی تردا. تاهەزار مەتر بەرەو خوار ئەزموون کراوە ئەو جیاوازیە هەر هەیە. . واتە تا قولایی هەزار مەتریش. . ئەو سنوورەی کە هەیەتی هی ئەو پەڵەیە دێت و ئەڕوا بەگوێرەی هەڵکشان و داکشانی (مد و جزر) مانگدا . . تادوایی بەهۆی مانگە دەستکردەکانەوە ئەو دیوارەیان دۆزیەوە لە "گەرووی تاریق" دا کە دەریای سپی ناوەڕاست بە زەریای ئەتڵەسی ئەگەیەنێت. .
لەوێدا ئەو جیاوازیانە دۆزرانەوە :
- پلەی گەرمی دەریای ناوەراست بەرزترە لە زەریای ئەتڵەسی و سوێریەکەی زیاترە و زیندەوەرانی و لایەنە بایۆلۆژیەکەشی زۆر جیاوازە لە زەریای ئەتڵەسی.
. هەرچەندە ملیۆنەها ساڵیشە بەرووکەش تێکەڵ بوون بەڵام خوا ئەفەرموێ: لایبغیان واتە: ئەم زاڵ نابێت بەسەر ئەودا و هەریەکەیان تایبەتمەندی خۆیان دەپارێزن.
ئەمە نموونەیەکە لەو نموونانەی کەدۆزراوەتەوە ئەگینا لەچەندین شوێنی تریشدا کەدوودەریا تێکەڵ دەبن دەرکەوتووە تایبەتمەندی خۆیان دەپارێزن.
لە ساڵی ١٩٨٤ دا زانایەك، لێکۆڵەرێك لە "زانکۆی قەتەر" بەناوی "محمد ئیبراهیم السهرە" لێکۆڵینەوەیەکی کرد لە خوارووی "کەنداوی عومان" دا کە ئەگاتە گەرووی هورمز. . نموونەی ئاوی دەریاکەی وەرگرت لەچەندین قولایی جیاوازدا، بەهەمان شێوە لەدوورایەکی زۆر کورتدا و لەو دیوو گەرووی هورمزەوە دووبارە چەند نموونەیەکی وەرگرت. . تێبینی کرد کە جیاوازیان لە پێکهاتەی ئاوەکاندا ئاسمان و ڕێسمانە. . پێش هورمز وپاش هورمز ئاوەکان جیاوازیان زۆر زۆر بوو

**لەرووی کیمیایی و بایۆلۆژیەوە. . ئەمەش جەختکردنەوەیەکی تری ئیعجازی (لایبغیان) بوو.**

***بێینە سەر بەیەك گەیشتنی رووبارێك و دەریایەك:***

**وەکو لە سوورەتی الفرقان ئایەتی ٥٣ خوا ئەفەرموێ:**

**"وهوالذی مرج البحرین هذا عذب فرات و هذا ملح أجاج وجعل بینهما برزخاوحجرا محجورا ".**

**خوای گەورە وشەی برزخ بەکار دەهێنێ لە نێوان دوو دەریای سوێردا، بەلآم ئەگەر لە نێوان دەریایەکی سوێر و دەریایەکی شیریندا بێت ئەوا بێجگە لە وشەی برزخ ئەفەرموێ وحجرا محجورا. . واتە ناوچەیەکی قەدەغەکراو. . ئەو روبارەی کەدێت ولەو ناوچەیەدا ئاوەکەی رۆدەکاتە دەریایەکەوە. . تا مەودایەك. . تا دووریەك. . سروشتی ئەو ناوچەیە کە ئاوەکان تیایدا تێکەڵ بوون ئامەودایەك نەلە روبارەکە دەچێت ونە لە دەریاکە. . بەڵکو ئەو جۆرە ماسیانەی کە لەو ناوچەیەدا ئەژین ئەگەربیان گوازیتەوە بۆ ناو دەریاکە دەمرن. . ئەو رووەکانەی کەلەوێدا شین بوون بیانگوێزیتەوە بۆ ئەملا یان ئەو لا ناژین. . خوا ئەفەرموێ: وحجرا محجورا. . ناوچەیەکی تایبەتمەندە. . قەدەغەکراوە. . نەتایبەتمەندی ئەم لای وەرگرتووە و نەهی ئەو لا هەرچەندە ملیۆنەهاساڵیش بێت ئەو روبار و دەریا یە پەیوەندی و تێکەڵیان هەبێت ئەو ناوچەیەیان بەو شێوەیە ماوەتەوە. .**

**شایانی ئاماژەپێکردنە: پێغەمبەری ئازیز " درودی خوای لەسەر" تا وەفاتی کرد دەریای نەبینی. .**

***سێیەم: ئیعجازێکی مێژوویی.. جوگرافی. . غەیبی:***

ئەم پەرجووە بریتیە لە سەرەتای سورەتی الروم. . لە قۆناغێکی مێژوویدا دووزلهێز هەبوون "ئیمپراتۆریەتی رۆم " و " ئیمپراتۆریەتی فارس" کێشەو ململانێیەکی زۆر هەبوو لە نێوانیاندا. . کاتێ پێغەمبەر " دروودی خوای لەسەر" هەوڵی بلاو بوونەوەی ئاینی خوای ئەدا و خەریکی بانگەواز بوو. . هێشتا ژمارەیەکی زۆر کەم باوەڕیان پێهێنابوو لەمەککەدا. . لەو کاتەدا جەنگێك روویدا لە نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریەتەدا. . شوێنی جەنگەکەش نزیك دەریای مردوو بوو، سنووری سووریاو فەلەستینی داگیرکراو. . جەنگەکە بە سەرکەوتنی فارسەکان و شکستی رۆمەکان کۆتایی هات. . ئیعجازەکە لەوەدایە کە رۆژی شەڕەکە و لەو کاتەدا و لەو لەحزەدا ئەو ئایەتە نازڵ بوو بۆ پێغەمبەر " دروودی خوای لەسەر" هەرچەندە پێغەمبەر و یارانی حەزیان دەکرد رۆمەکان بیبەنەوە، چوونکە هەڵگری پاشماوەی مەسیحیەتن، بەرووکەش هەڵگری رەوشتی حەزرەتی عیسان، شوێن کەوتووی ئەون، بەڵام فارسەکان خاوەنی دینێکی ئاسمانی نین. . هاوەڵ بڕیاردەرن بۆ خوا. . بتپەرستن. . ئاگر پەرستن. . وە بێباوەڕەکانی مەککەش حەزیان دەکرد فارسەکان بیبەنەوە. . هەواڵەکە هات کە رۆمەکان دۆڕاون موسڵمانان پێیان ناخۆش بوو. . بێباوەڕان پێیان خۆش بوو. . ئەمە خۆی لە خۆیدا ئیعجازێکی غەیبیە، چونکە لەوانەیە ئەمڕۆ بە هۆی سەتەلایتەوە راستەوخۆ ئەو هەواڵە بلاو بکرێتەوە. . بەڵام پێش زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ جەنگێك ببێت و لەهەمان لەحزەدا ئایەتێك نازڵ ببێت موعجیزەیە. . پاش مانگێك کاروانچیان هاتن و هەواڵەکەیان هێنا کە فلان رۆژ لە فلان مانگدا و لە فلان شوێندا کۆتایی بە جەنگی نێوان رۆمەکان و فارسەکان هات و فارسەکان تێیدا

سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. لێرەدا ئەم ئیعجازە غەیبییە هاتە دی. خوا ئەفەرموێ:

" بسم الله الرحمن الرحيم، الم، غلبت الروم " ئەمە هەواڵی یەکەمە. . "فی أدنی الارض" ئەمە شوێنەکەیەتی. .رووداوەکە لای دەریای مردووەوەیە کەنزمترین شوێنە لەئاستی رووی دەریاوە. . "وهم من بعد غلبهم سيغلبون، فی بضع سنين " پاش ئەم نسکۆیە سەرکەتن بەدەست دەهێنن لەچەند ساڵی داهاتوودا. . بۆیە ئەبوبەکری صدیق گرەوی کرد – ئەو کاتە گرەو حەرام نەکرابوو – لەسەر چەندین حوشتر لەسەر ئەوەی کە لەچەند ساڵی داهاتوودا رۆمانەکان ئەیبەنەوە. .

"بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥ "[٤٨٧]

پاش نزیکەی حەوت ساڵ لەجەنگی بەدردا کەموسڵمانان سەرکەوتن بەسەر بێباوەڕاندا رۆمەکانیش لە هەمان رۆژدا سەرکەوتن بەسەر فارسەکاندا، ئیعجازی دووەمی غەیبی ئەم ئایەتە هاتە دی.

لەروانگەیەکی ترەوە " فی أدنی الارض "واتە: نزمترینی زەوی. . ئەمرۆ بەشێوەیەك دەرکەوتووە لەرووی زانستیەوە کەئیتر هەڵە قبوڵ ناکات لەلای دەریای مردووەوەیە کە٣٩٢متر لەژێر ئاستی رووی دەریاوەیە. . ئەمەش ئیعجازێکی جوگرافیە هیواداریین کە ئەم بەڵگە و ئیعجازە زانستیانە ئیمانمان زیاد بکەن و ببنە هۆی زیاتر کردنی تەوژمی دینی خوا لەدڵ و دەروونماندا و ببنە رەوینەوەی تەمی گومان و دوودڵی لە لاوان و گەنجانی ئازیزدا. . هۆکارێك بێت بۆ جوڵاندنی ویژدانی ئەو کەسانەی کە لەگوماندا ئەژین. . هەست و ویژدانیان

---

[٤٨٧] سورەتی الروم ئایەتی ٥

بجولێنێت. . دڵ و دەروونیان بێنێتە جۆش وە شایەتومان بێنن کە ئەم قورئانە کەلامی خوایە. . خوای گەورە دەفەرموێ: "سیریکم ایاته فتعرفنها" بەبەردەوامی خوای گەورە ئایاتی خۆیتان پیشان دەدات. . بەبێباوەڕانیش ئەفەرموێ:

( سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ ﴿٥٣﴾ )[٤٨٨]

ڕۆژ بەرۆژ خوای گەورە ئایات بەبەردەوامی پیشانی بێباوەران دەدات، بۆ ئەوەی بۆیان دەرکەوێت کە ئەم قورئانە حەقە. .

تائێستا ڕاستیەکی زانستیمان نیە کە دژ بەقورئان بێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەبینی کە جولەکەکان باوەڕیان وابوو کە پێش (٢٠٠٠)، مانگایەکی سوور پەیدا دەبێت. . لە (٢٠٠٠) پەیکەری سولەیمان دەدۆزرێتەوە. . ئینجا ئەو مانگایە سەر ئەبڕن ئەیسوتێنن بە سوتووەکەی ئەو پەیکەرە پاك ئەکەنەوە کافرەکان لەناو ئەبەن – کافرەکان مەبەستیان موسڵمانەکانە واتە: شوێنکەوتوانی حەزرەتی محمد درودی خوای لەسەر – سەرکەوتن بەدەست دەهێنن لە ساڵی ٢٠٠٠ دا. . مەسیحیەکانیش بڕوایان وابوو کە عیسا لە ٢٠٠٠ دا دێتە خوارەوە. . ئیتر موسڵمان قەلاچۆ ئەکرێ و نامێنێ. . کامێرایان هێنا لە بیت الحم دایان نا سەدان هەزار کەس چوون بۆ ئەوێ لەسەر دەرگای قودسیش دایان نا بەتەما بوون حەزرەتی عیسا بێتە خوارەوە. . ئەم خورافاتانە هیچی نەهاتە دی.

بەڵکو بە "ئەندازەی جینی" مانگا سوورەکەیان دروستکرد. . لەباسێکی تردا باسمان کردووە کە ئێستا ئەو مانگایە ماوە و ئێشگگری تایبەتی هەیە. .

---

[٤٨٨] سورەتی فصلت ئایەتی ٥٣

هیچکام لەو شتانەی ئیدعایان دەکرا نەهاتنە دی. . لەژێر قودسدا ٢٥ تونێل لێدران بەمەبەستی دۆزینەوەی پەیکەری سولەیمان بەڵام تەنانەت بەڵگەیەکیشیان نەدۆزیەوە کە ئاماژە بەوە بکات کە پەیکەری سولەیمان لەوێ بووە. . هەرچەندە خۆیان بە لوتکەی بواری تەکنۆلۆجیا دەزانن لە جیهاندا کە چی دوای باوەڕی خورافاتی لەو شێوەیە دەکەون. .

بۆیە تەنها ڕێگای ڕزگاری پەنا بردنە بۆ قوئانی پیرۆز و گەڕانەوەیە بۆ لای ئیسلام. .

( وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾)[489]

ئەمە ڕایەڵی خوایە ئەم قورئانە. . ئەمە ڕایەڵێکە. . گوریسێکە سەرێکی لە ئاسمانەوەیەو ڕزگاریە. . سەرەکەی تریشی لە زەویدایە و بەختەوەریە. . کەرامەت و عیززەت و سەربەرزی و سەرفرازی وا لە قورئاندا. . خوا ئەفەرموێ: ئێوە یەك ئوممەتن:

(إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُونِ ﴿٩٢﴾)[490]

بەسیەتی جیاوازی و دووبەرەکی و بەسیەتی غەیبەت. . سەرقاڵبوون بە شتی لاوەکی و ئەم لاو لاوە. . کاتی ئەوە هاتووە جیاوازی و شتی بچووك بخەینە لاوە و برایەتی پەیکەڵ بکەین و یەکتریمان خۆش بوێت.

وأخر و دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

---

[489] سورەتی ال عمران ئایەتی ١٠١

[490] سورەتی الانبیاء ئایەتی ٩٢

# وتەی کۆتایی

بەڕێزکاك عادل شاسواری داوای لێ کردم کە شتێك بنووسم لەچاپی نوێی میحرابدا، پاش بیرکردنەوە بەباشم هەندێ خاڵی گرنگ ڕوون بکەمەوە.

- بەرنامەی میحراب تێگەیشتنێکی شەخسیە بۆ ئیسلام، لەبەر ئەوە زۆر ئاساییە کەهەڵەی تێدا دەرکەوێت، داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکەم.
- بەرنامەی میحراب ـ ڕۆژگار سەلماندی کە بەرنامەیەکی سەرکەوتوو بوو ـ وە هۆی سەرکەوتنەکەی (زاهیرییەکەی) دەگێڕمەوە بۆ ئەم هۆکارانە:

١. بوونی تینوێتییەکی ئیمانی لەناو زۆرینەی جەماوەری کورددا..

٢. وتاری هەینی و کتێب و ..... لەئاستی ئەو تینویەتیەدا نین.

٣. بەرنامەی میحراب ڕێژەیەکی تێراوکرد ـ بۆ ماوەیەك ـ .

٤. بەرنامەی میحراب ئیسلامی پێشکەش کرد لە چوارچێوەیەکی زانستی و ڕۆشنبیریەکی سەردەم.

٥. سوودم لە مامۆستایەتیەکەم ـ لەناوەندی و دواناوەندییەکانی سلێمانی ـ وەرگت و تەوزیفم کرد لەبەنامەکەدا (قسە بۆ دڵ) (قسە بەمەبەستی چاندن و فێرکردن نەوەك هەر قسە بێت).

٦. لەماوەی (٩) ساڵی بەرنامەکەدا وەزیفەم نەبوو، واتە: خۆم تەرخان کردبوو بۆ خوێندنەوە وئامادەکردنی.

٧. تێکەڵیم هەبوو لەگەڵ جەماوەر و لەنزیکەوە وردەکاری ژیانی زۆرکەسم دەزانی .. ئەمەش تەوزیف کرا لەبەرنامەکەدا و واقعیەتێکی پێدا.

٨. تەمەن و پاشخانی زانستی و رۆشنبیریم رۆڵێکی هەبوو بۆ دەوڵەمەندکردنی بەرنامەکە بەزانیاری.

٩. ئاسانی تۆمارکردنی بەرنامەکە و بڵاوکردنەوەی بە کاسێت و CDو لەچاپدانی ـ بەکتێب ـ بەهۆی کۆمەڵێك لاوی دڵسۆز و خۆبەخش.

١٠.وەرنەگرتنی هیچ شتێك (دیاری یاخود یارمەتی) بەرامبەر بەرنامەکە...یاخود کتێب و CD و شریتەکان.

وابزانم ئەمە گرنگترین هۆکار بوو لەگەڵ دوعای هەندێ بینەر و بیسەر، کەبووە هۆی بارینی رەحمەت و دۆشینی بەرەکەت لەگوانی کاتە پیرۆزەکانەوە.

هەروەها حەزئەکەم خوێنەری بەرێز بزانێت کەهەمیشە هەوڵمداوە تۆوی تێگەیشتن لە ئیسلام بچێنم لەدەروونی بینەران و بیسەراندا.

عەقیدەکەی و شەریعەتەکەی ، جیهانگیریی و ئینسانیەتەکەی، ئەخلاقیات و کەسایەتیەکانی و مێژووە جوانەکەی ...دوور لە تەفسیر و تێگەیشتنی تەسك، دوور لە توندوتیژی .. دوورلە موجامەلات...بە ئومێدی ئەوەی کوڕ و کچەکانمان زانستیانە، ژیر و حەکیمانە لەم ئایینە تێبگەن.

بەئومێدی ئەوەی نەوەی دوای خۆمان چەکداربکەین بەئیمانێکی راست و دروست، ئیمانێك کەدەبێ زۆر پتەوتر بێت لە ئیمانی ئێمە چونکە رۆژگاری ئەوان تەحەدداکانی سەختتر دەبێ ... بەئومێدی ئەوەی گەنجەکانمان حاڵی بن لە دەستووری (والعاقبة للمتقين) دوارۆژ چ لە دنیا و چ لە ئاخرەت بۆ لە خواترسانە (المتقين).

لەخواترساوانیش هەرگیز ستەمکار نین و نابن، هەرگیز هەڵە بەهەڵە راست ناکەنەوە و هەرگیز توندڕەو نین.

هەروەها حەز ئەکەم کە خوێنەری هێژا بزانێت کە من هیچ رۆژێك بەڵکو هیچ ساتێك ئەم ئەرکەم خۆش نەویستووە!!

(بەدڵ جێبەجێم کردووە) بەڵام حەزم لێنەکردووە چونکە هەمیشە دەورە دراوە بە دەریای (ریا) و تەنها چەند ملیمێك دوور بووە لێی.

بەڵام کاری پەروەردەیم خۆشویستووە بەتایبەت لەکاتی خەباتی ژێر زەمیندا، کە کۆدەبووینەوە لەگەڵ ئەندامانی (ئوسرە) ڕووبەڕوو سوودم لێیان وەردەگرت (لە نووری روخساریان و لە راستگۆیی وشەکانیان و لە دوعاکانیان) ئەمە لەکوێ؟!و .... ئاشکرا بوونی کۆڕی میحراب لە کوێ؟ کە کامێرا و هەزاران بینەر و هەندێکیان تەنها بۆ ئەوە دائەنیشن کە عەیبێك و کەم و کوڕییەك تۆمار بکەن.

برا و خوشکی ئازیز... ئەگەر میحراب بۆ خوا بووبێ ئەوا هیچم ناوێ... چونکە دەمێنێ و ژمێرەری چاکەکانمان (عداد الحسنات) بەردەوام دەبێ پاش چوونمان بۆ بەرزەخ.

لە کۆتاییدا زۆر پێویستە ئاماژە بە رۆڵی ئەو هەموو مامۆستایە بدەم کە ئیسلامیان فێرکردم کەناویان لەلای خوای گەورە ئاشرایە، خوا جەزای هەموویان بە لێبوردن و بەهەشت بداتەوە.

داواکارم لە خوای متعال بەرەکەت بخاتە ئەم کتێبەمەوە ( بۆ من و خوێنەران و هەموو ئەوکەسانەی بوونە هۆکاری بڵاوبوونەوەی) پاش مردنمان ببێتە ئاوێنەیەك لەبەرزەخەوە خوێنەرانی پێببین و بە خوێندنەوەیان صدقاتمان پێ بگات.

وما توفیق الا بالله

شەماڵ موفتی پیرخدری

١٥ / رەجەب / ١٤٢٩

١٨ / ٧ / ٢٠٠٨

## ناواخن

هەمیشە هەوڵمداوە تۆوی تێگەیشتن لە ئیسلام لەدەروونەکاندا بچێنم، عەقیدەکەی و شەریعەتەکەی، جیهانگیریی و مرۆڤایەتیەکەی، ڕەوشت و کەسایەتیەکانی و مێژووە جوانەکەی، دوور لە تەفسیروتێگەیشتنی تەسك، دوور لە توندوتیژی، دوورلە موجامەلات، بە ئومێدی ئەوەی کوڕ و کچەکانمان زانستیانە، ژیر و حەکیمانە لەم ئاینە تێبگەن، بەئومێدی ئەوەی گەنجەکانمان حاڵی بن لە دەستووری (والعاقبة للمتقين) دوارۆژ چ لە دنیا و چ لە ئاخرەت بۆ لە خواترسانە (المتقين). لەخواترساوانیش هەرگیز ستەمکارنین ونابن، هەرگیز هەڵە بەهەڵە ڕاست ناکەنەوە و هەرگیز توندڕەونین.

شەماڵ موفتی پیرخدری

٢٠٠٨/٧/١٨

